میکاڤالتاری

# سینوهە

## پزیشکی تایبەتی فیرعەون

وەرگێڕانی: عیمران هاواری

بەرگی دووەم

چاپی یەکەم

2011

**لەبڵاوكراوەكانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

**زنجیرە: (٣٢٧)**

## ناسنامەی كتێب


- **سینوهە/ پزیشكی تایبەتی فیرعەون**
- نوسینی: میكا ڤالتاری
- وەرگێڕانی: عیمران هاواری
- بابەت: ڕۆمانی مێژوویی
- نەخشەسازی و بەرگ : فواد كەولۆسی
- بەرگ: بەرگی‌دووەم
- نۆبەت وساڵی چاپ: یەكەم ، ٢٠١١
- شوێنی چاپ: چاپخانەی كەنج
- تیراژ: ١٠٠٠

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانەگشتییەكان ژمارە سپاردنی: ١٣٨٧ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە.

ناونیشان: سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣), (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)




# پێڕست

*بەشی سی و سێیەم*

## بەندەکەی پێشوم

بەڵام خوداکان وایان ویستبوو کە ئەو بەردەوام کچی ببێت و دوای ئەویش دوو کچی تری بوو، وەبوو بە خاوەنی شەش کچ.

لەسوریاوە هەواڵگەلێکی زۆر ترسناکمان پێدەگەشت و بەگەیشتنی هەر تەختە قوڕێکی سورکراوە یان قوڕی خۆشەکراو"قوڕی سەناعە"ی سورکراو، من دڕۆشتم بۆ تۆمارگای تەختە قوڕەکان بۆئەوەی بیانخوێنمەوە، چونکە خودی فیرعەون ئەم تەختە قوڕانەی نەدەخوێندەوە.

کاتێك من ئەو تەختەقوڕانەم دەخوێندەوە دەنگی گیزەی تیرم دەبیست کە بەلای گوێمدا تێدەپەڕین، هەروەها بۆنی ئاگرم دەکرد، لەهەمان کاتدا هاواری ئەو پیاوانەم بەرگوێ دەکەوت کە سەریان دەبڕین یان سکیان هەڵدەدڕین، لەهەمان کاتدا گوێم لەدەنگەدەنگ و گریانی منداڵیش دەبوو.

لەبەرئەوەی سەربازانی پادشای وڵاتی "ئامورو"دڕەندەن" وچاپۆشی لەکوشتنی منداڵیش ناکەن، بەتایبەت ئەوانەی کە ئەفسەرانی"هاتی"فەرمانڕەواییان دەکەن.

لەنێو ئەو تەختە قوڕانەی کە لەسوریاوە دەگەشتە دەستی"ئەخناتون"نامەکانی پادشای"ئۆرشەلیم"و پادشای"بیت لوس"یش بەرچاو دەکەوت و ئەم دوو پادشایە بەوەفایی خۆیان بۆ فیرعەونی میسر دەردەبڕی و دەیانوت کە ئێستا لەژێر هەڕەشەی پادشای"ئامورو"دان و دەڵێن"هاتی"هاوکاری پادشای"ئامورو"دەکات، بۆیە داوای هێزی سەربازی و چەکیان لەفیرعەون دەکرد.

بەڵام"ئەخناتون"بەشێوەیەك لەخوێندنەوەی ئەم نامانە تووڕە و بێتاقەت بوو بوو کە دوای ئەوە هەر نامەیەك بگەشتایەتە دەستی نەیدەخوێندەوە، بەڵکو ڕاستەوخۆ دەیسپاردن بە بەرپرسانی تۆمارگا و خەزێنەی نامەو بەڵگەکان بۆئەوەی تۆماری بکەن، ئەوکات منیش دەڕۆیشتم بۆ بارەگای تۆمارگا و خەزێنەی نامە و بەڵگەکان، بۆئەوەی ئەو نامانە بخوێنمەوە.

لەبەرئەوە تەنها دووکەس ئەونامانەی کە لەسوریاوە دەگەیشت دەیانتوانی بیخوێننە، یەکێکیان بەرپرسی تۆمارگا و خەزێنەی نامە و بەڵگەکان و ئەویتریان من بووم.

کاتێك ئورشەلیم لەبەرامبەر هێرشی پادشای"ئامورو"دا شکستی خوارد، فەرمانڕەوایانی تری سوریا کاتێك بینیان ناتوانن لەگەڵ پادشای"ئامورو"دا بجەنگن، پەیمانیان لەگەڵدا بەستن و بونە هاودەستیان.

ئـەوکات"هـورم هـب"-کـەتا ئەوکاتـە بـەنهێنی بـەناردنی کانزاکـان هاوکـاری فەرمانڕەوایانی سوریای دەکرد- لە"ممفیس"ەوە ڕۆشت بۆ شاری"ئاسۆ"بۆئەوەی چاوی بەفیرعەون بکەوێت و پێی وت: "ئەخناتون"ڕازی بە کە من سەد کەڕەتی سەد سەرباز کۆبکەمەوە و لەگەڵ سەد گالیسکەی جەنگیدا بڕۆم بۆ سوریا و تەواوی سوریات بۆ بگەڕێنمەوە.

"ئـەخناتون"کـە لەوکاتـەدا زۆر دڵگرانـی داگیرکردنـی"ئۆرشـەلیم" بـوو لەلایـەن پادشای "ئامورو"ەوە وتی:

پادشای ئۆرشەلیم کە من ناوەکەیم لەبیر چووەتەوە پیاوێکی پیرە و کاتێك منداڵ بوم لە "تبس" هات بۆ لای باوکم بینیم، ڕیشێکی درێژی هەبوو، ئێستاش کە"ئۆرشەلیم"کەوتووەتە ژێردەستی پادشای"ئامورو"من ئامادەم زیانی پادشای ئۆرشەلیم قەربوو بکەمەوە، سەرەڕای ئەوەی کۆکردنەوەی باج و سەرانە لەمیسردا بەو شێوەیەش باش نیە، من مانگانەیەك بۆ پادشای ئۆرشەلیم دیاری دەکەم و ملوانکەیەکی زێڕینی بۆ دەنێرم بۆئەوەی بیکاتە ملی و هەمیشە سەربەرز بێت.

"هورم هب"وتی: ئەو چیتر ناتوانێت سەربەرز بێت، لەبەرئەوەی سەریان لەلاشەیان کردووەتەوەو پادشای "ئامورو"بەسەری ئەو کاسەیەکی گەورەی بەڕوپۆشی ئاڵتونی

دروست کردووه و ناردوویەتی بۆ پادشای"هاتی"بۆئەوەی هەرکاتێك ویستی شەراب بخواتەوە ئەو کاسەیە بەکار بهێنێت.

"ئەخناتون" پرسی: تۆ لەکوێوە ئەم هەواڵەت بیست؟

"هورم هب"وتی: من لەڕێی سیخوڕەکانی خۆمەوە ئەم هەواڵەم پێ گەشتووە.

فیرعەونی وتی: من سەرم لەوە سوڕ دەمێنی کە بەچ شێوەیەك پادشای "ئامورو" کارێکی وای کردووە، چونکە ئەو یەکێك بوو لەهاوڕێکانم و"خاچی ژیانی"لەمن وەرگرتووە، بەلام لەوانەیە من بەهەڵە لەو تێگەشتبم و بەڕاستی پیاوێکی دڵ ڕەق بێت، دەربارەی ئەوەی دەیڵێیت کە سەد کەڕەت سەد سەرباز کۆبکەیتەوە و گالیسکەی جەنگی لەگەڵ خۆتدا ببەیت بۆ سوریا، ئەم داواکاریەت پەسەند کراو نیە، لەبەرئەوەی خەڵکی میسر بەهۆی ئەوەی لە سەرانە و خراپی بەروبوم ناڕازین، ناتوانرێت ئەو هەموو سەرباز و گالیسکە جەنگیانە فەراهەم بکرێت.

"هورم هب"وتی: سوێندت دەدەم بە"ئاتون" گەر ناتوانی لەئێستادا لەشکرێکی سەربازم پێبدەیت تا بەگالیسکەی جەنگی بڕۆم بۆ سوریا، هیچ نەبێ دە گالیسکە و سەد سەربازم پێبدە بۆئەوەی بڕۆم بۆ سوریا تا هیچ نەبێ ئەوەی تائێستا نەکەوتووەتە ژێر دەستی پادشای ئەمورووەوە، ڕزگار بکەم.

فیرعەون وتی: "ئاتون"ی خودای من خوێنڕێژی قەدەغە کردووە، لەبەرئەوە نامەوێت لە سوریادا بجەنگم و بەباشی دەزانم کە سوریا ئازاد و سەربەخۆ دەبێت، بەلام گەر جەنگ دروست نەبێت، دوای ئەوەی سوریا سەربەخۆیی وەرگرت و یەکێتیەکیان پێك هێنا، ئێمە ئەوکات بازرگانی لەگەڵ سوریادا دەکەین، چونکە سوریا ناتوانێت پێویستی بەئێمە نەبێت، جگەلەوەی کە ژیانی سریانیەکان پەیوەستە بەگەنمی ئێمەوە.

"هورم هب" توڕە بوبو، بەلام لەبەرئەوەی دەیتوانی بەسەر خۆیدا زاڵ بێت، ئەم توڕەییەی خۆی خواردەوە و وتی: "ئەخناتون"ئایا تۆ لەوباوەڕەدایت کەپادشای "ئامورو" دوای ئەوەی دەستی بەسەر هەموو سوریادا گرت، تەنها بەداگیرکردنی سوریا ڕازی دەبێت؟

کوشتنی هەر پیاو و منداڵێکی میسری و ژێر دەست کردنی هەر شارێك، هێزی لەخۆبایی بوونی زیاتر دەکات، دوای ئەوەی دەستی بەسەر سوریادا گرت، بیر

لەداگیرکردنی ولآتی"سینا"دەکاتەوە و ئێمەش لە کانزای مسی"سینا"بێبەش دەبین و چیتر ناتوانین بۆ تیر و نێزەکانمان نوکی تیژ دروست بکەین.

فیرعەون وتی: من جارێکیان پێم وتی هەرکاتێك داری نێزەکان بتاشن نوکێکی تیژی بۆ دروست دەبێت و چیتر پێویست بە نوکی تیژی مسین ناکات، ئەم قسانەی تۆ بیر و هەستم پەرتەوازە دەکات و دەبێتە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی کە ئەو گۆرانیە تازەیەی کە من بۆ"ئاتون"ی دەڵێم تەواو بکەم.

"هورم هب"وتی: "ئەخناتون"دوای ئەوەی پادشای ئامورو"سینا"ی داگیر کرد و هاتە ناو زەویەکانی میسرەوە، یەکسەر میسری خوارو داگیر دەکات، لەبەرئەوی سوریا بیٚ گەنمی "میسر" ناتوانێت بژی، ئەگەر تۆ لە سوریا ناترسیت لە"هاتی" بترسە، لەبەرئەوەی لەمرۆدا"هاتی"لەگەڵ پادشای"ئامورو" یەکی گرتووە، بەلآم من لەرێی سیخورەکانمەوە ئاگاداری بارودۆخی"هاتی"م و دەزانم کە پادشای"هاتی" بەتەنهایی دەتوانێت میسر داگیر بکات.

"ئەخناتون"وەك ئەو کەسە ژیرەی کە بەقسەی شێتێك پیٚ بکەنێت، پێکەنی و وتی: "هورم هب"لەو رۆژەوەی مرۆڤ هاتووەتە بون تا ئەمرۆ هیچ دوژمنێك پێی نەناوەتە خاکی میسر، لەبەرئەوەی میسر بەهێزترین و بەتواناترین ولآتی جیهانە.

بەلآم بۆئەوەی تۆ لەقۆزاخەی ئەم ترسەت بێیتە دەرەوە پێت دەڵێم کە"هاتی"یەکان خەڵکێکی دڕەندەن و لەکێوەکاندا دەژین و ڕانە ئاژەڵەکانیان لەدامێنی کێوەکاندا دەلەوەڕێنن و هەژارییان گەشتووەتە ڕادەیەك کە ناتوانن جەنگ لەگەڵ هیچ کەسێکدا بکەن و ولآتی"میتانی"ش کە دۆستی ئێمەیە دەکەوێتە نێوان ئێمە و ولآتی "هاتی"یەوە.

من"خاچێکی ژیانم"بۆ پادشای"هاتی"ناردووە، بەپێی ئەو داوایەی لێی کردوم بڕێك زێڕم بۆ ناردووە بۆئەوەی پەیکەری من لەپەرستگای خۆیان دابنێن و بۆئەوەی هەرکاتێك پێویستی بەزێڕ بێت لەمنی وەردەگرێت، هیچ کاتێك هێرش بۆ میسر ناکات.

منیش بینم کە ڕوخساری"هورم هب"بەڕادەیەك لەتوڕەییاندا سور وەرگەڕاوە کە لەوانەیە چیتر نەتوانێت خۆی ڕاگرێت، بۆیە بەناونیشانی ئەوەی پزیشکی فیرعەونم بەردەوامی ئەم گفتوگۆیە نالەبارە بەزیانی فیرعەونی دەزانم، چونکە لەوانەیە باری

نەرونی تێکبدات، بۆیە"هروم هب"م لەفیرعەون دور خستەوە و کاتێك لەکۆشکی "ئەخناتون"چوینە دەرەوە"هورم هب"وتی: ئەم پیاوە بەڕادەیەك لەبارودۆخی جیهان بێئاگایە کە بێدەرەتانترین نۆکەرانی ئێمە لەو باشتر ئاگاداری بارودۆخی جیهانن، فیرعەون وا دەزانێت بەناردنی"خاچی ژیان" یان زێر دەتوانێت ڕێ لەو کەسانە بگرێت کە چاویان بڕیوەتە خاکی میسر و بێئاگایە لەوەی کە میسر دەوڵەمەندترین وڵاتی جیهانە و وڵاتانی تر هەوڵی ئەوە دەدەن دەست بەسەر ئەم وڵاتەدا بگرن، بۆئەوەی زێڕو زیو و گەنمی میسر بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە.

سەیریش لەوەدایە کاتێك فیرعەون قسە لەگەڵ مندا دەکات، سەرەڕای ئەوەی دەزانم کە هەڵە دەکات، بەڵام خۆشم لەقسەکانی دێت، چونکە دەزانم لەکانگای دڵیەوە قسە دەکات و لەگوتارەکانیدا پەڵەی خۆنواندن"ڕیا" و فریودانی پێوە دیار نیە.

بۆیە لێم پرسی: ئێستا چی دەکەیت، ئایا لەشاری"ئاسۆ"دا دەمێنیتەوە یان دەگەڕێیتەوە؟

"هورم هب"وتی: ئەگەر لەم شارەدا بمێنمەوە و ڕۆژانە سەردانی کۆشکی فیرعەون بکەم و وەك کاربەدەستەکانی گوێم لەم قسانە بێت، دەترسم دوای چەند ڕۆژێکی تر وەك تەواوی کاربەدەستانی"ئەخناتون"مەمکم بۆ دروست ببێت و چاوەڕێی ئەوە لەمن بکەن کە شیر بەمنداڵان بدەم، بۆیە گەڕانەوەم بەباشتر دەزانم.

دوای ڕۆشتنی"هورم هب"زۆر دڵگران بوم، لەبەرئەوەی ئاگاداری ئەوەبووم کە هاوڕێیەکی باشی"هورم هب"و ڕاوێژکارێکی دڵسۆزی فیرعەون نیم.

من دەبوو ڕاستیەکان بەفیرعەون بڵێم، بۆئەوەی بزانێت کە هەڵە دەکات، چونکە ڕۆشتوم بۆ وڵاتی سوریاو "هاتی"وپادشای"ئامورو"م بینیوە کە وڵاتەکەی لەسوریادایەو بەچاوی خۆم بینیومە کە بەچ شێوەیەك لە"هاتی"دا خۆیان بۆ جەنگ ئامادە دەکەن، دەبوو فیرعەونم تێگەیەندایە کە"ئامورو"و"هاتی"دژمنێکی ترسناکن و ئەگەر بەرگریکاری نەبینن، میسر داگیر دەکەن.

بەڵام، بەهۆی ئەوەی دەمبینی کە جێگە خەوێکی نەرمم هەیە و چێشت لێنەرەکەم باشترین خواردنم لەگۆشتی مراوی و گیانەوەرە چوارپێکان بۆ دروست دەکات و ژیانێکی خۆشم هەیە، نەمدەویست ئەم ئاسودەییەی خۆم لەدەست بدەم.

من سەرەڕای ئەوەی ئارەزویی کۆکردنەوەی زێڕ و زیوم نەبوو، چێژم لەژیانی خۆشگوزەرانی بارەگای میسر وەردەگرت و دەمزانی ئەگەر ڕاستیەکان بەفیرعەون بڵێم، خەمناك دەبێت، سەرەڕای ئەوەی هیچ ڕقێکی لەدڵدا نیە، لەخەماندا من لەبارەگاکەی خۆی دەردەکات، بۆئەوەی جارێکی تر چاوی بەڕوخساری من کە بووەتە هۆی دڵتەنگی ئەو نەکەوێت.

چیتر دوای ئەوە بیرم لەوە دەکردەوە کە من پزیشکم و ئەرکی من چارەسەر کردنی نەخۆشیەکانە، نەك ڕێگرتن لە لەشکری ولاّتانی تر و کاتێك فیرعەون بۆچونەکانی فەرماندەی لەشکری خۆی بەواتا"هورم هب"ی پەسەند نەکرد، بەچ شێوەیەك گوێ لەقسەی پزیشکێکی وەك من دەگرێت؟

سەرەڕای ئەوەی فیرعەون دەزانێت"هورم هب"پیاوێکی سەربازیە، گوێ لەڕاکانی نەگرت و هەر وەك یەکەمجار وتم، گوێ بۆ ڕاکانی منیش کە پزیشکێکم ناگرێت و پێم دەڵێت: تۆ هیچ شارەزاییەکت لەبواری هونەری سەربازی و سیاسیدا نیە و باشتر وایە خۆت لەکاروبارێکەوە هەڵنەقورتێنی کە پەیوەندی بەتۆوە نیە.

لەمکاتەدا دووەمین کچی فیرعەون بەناوی"مك تاتون"نەخۆش کەوت و بەدەم"تا"وە دەقفی و لاوز بوو بوو.

منیش زۆر بەوردی پشکنینم بۆکرد و تێگەشتم کە توشی نەخۆشیەکی تایبەت نەبووە، بەڵکو نەخۆشیەکەی ئەو بەشێوەیەکی گشتی لەلاوازی جەستەیەوە سەرچاوە دەگرێت و بۆ بەهێزکردن و قەڵەو کردنی جەستەی چەند ئاوێتەی دەرمانێکم درخوارد دا.

فیرعەون بەنەخۆشی"مك تاتون"زۆر خەمگین بوو، چونکە کچەکانی خۆیی خۆش دەویست و کچی یەکەم و دووەمی ئەو، زۆربەی جار لەمیوانداررییە مەزنەکاندا لەگەڵیدا بون و هەرکاتێك فیرعەون شتێکی بەکەسانی تر بدایە، لەڕێی یەکێك لەم دوو کچەیەوە پێی دەدان.

دوای ئەوەی"مك تاتون"نەخۆش کەوت فیرعەون زیاتر بەهۆی ئەو کچەوە هەستی بەسۆز و خۆشەویستی کرد و ئەوەش شتێکی سروشتیە، چونکە باوك ئەو منداڵەی کە نەخۆش دەکەوێت زیاتر خۆش دەوێت.

فیرعەون ڕۆژی چەندجارێك پرسیاری تەندروستی کچەکەی لێ دەکردم و دەیوت، ئایا ئەم کچەم دەمرێت؟

منیش پێم وت: کچەکەت هیچ نەخۆشیەکی ئەوتۆی نیە کە بمرێت و نەخۆشیەکەی ئەو تەنها لە لاوازی جەستەیەوە سەرچاوە دەگرێت، و چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشیەی زۆر ئاسانە.

فیرعەونیش دەیوت: ئەگەر ئەو هەڵگری نەخۆشیەکی تایبەت نیە، بۆچی دەقفێت؟

منیش وەڵامم دایەوە: ئەمەش هەر لەلاوازی جەستەیەوە سەرچاوە دەگرێت.

فیرعەون بەهۆی خەمی نەخۆشی کچەکەیەوە لاوازبوو و منیش خۆم لەبەردەم دوو نەخۆشدا بینیەوە یەکێکیان فیرعەون ئەویتریشیان کچەکەی، بۆیە تەواوی کاتەکانم لەچاودێری ئەمانەدا تێدەپەڕاند، چونکە ئەو دوو نەخۆشە بەلای منەوە، لەتەواوی ئەو خەڵکەی کە لەو وڵاتەدا لەبرسیەتی و ئازاردا دەژیان گرنگتر بوو.

لەبەرئەوەش هەموو کاتێکم لە چاودێری و چارەسەرکردنی فیرعەون و کچەکەیدا تێدەپەڕاند و هەر لەبەرئەوەش ئەم دەتوانی کەسە وەجاخزادە و مەزنەکان کە نەخۆش دەکەوتن، بەوردی چارەسەر بکەم و دەیانوت: "سینۆهە" لەڕابردوودا داهێنەرترین پزیشکی میسر بووە، بەڵام ئێستا کەسێکی خۆ بەزلزانی لێدەرچووە، لەبەرئەوەی پزیشکی تایبەتی فیرعەونە وا هەست دەکات کەسانی تر شایستەی ئەوە نین چارەسەریان بکات. لەکاتێکدا کە وانەبوو و ئەو چاودێریە وردەی کە لەبارەی فیرعەون و کچەکەیەوە دەمکرد دەبووە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی بەباشی چاودێری لەکەسانی تر بکەم.

لەهەمان کاتدا من قەڵەو بوبوم و نەمدەتوانی وەك ڕابردوو بەگورج و گۆڵی ڕێ بکەم و قژی سەرم بەردەوام دەوەری و دەمزانی کە بەم زوانە سەرم کەچەڵ دەبێت و لەکاتی خەوتندا بەهۆی قەڵەویەوە دەپرخێنم، سەرەڕای ئەوەی لەماڵەکەمەوە تا کۆشکی فیرعەون ڕێگایەکی ئەوەندەش دور نەبوو، بەڵام بۆ ڕۆشتن بۆ کۆشکی فیرعەون سواری کەژاوە دەبوم.

دەمزانی تا وەرز نەگۆڕێت، تەندروستی کچی فیرعەون چاك نابێتەوە و هەرئەوەی ڕوباری "نیل" هەستا و ئاو و هەوای شاری "ئاسۆ" بەهۆی گەیشتنی وەرزی پایز فێنك

بویەوە، تەندروستی"مك تاتون"بەرەو باشتر دەڕوات، کچەکەی هەرچەنێك باشتر بوایەتەوە ئەویش بەهەمان ئەندازە چاك دەبویەوە.

کاتێك فیرعەون و کچەکەی چاك بونەوە، بەفیرعەونم وت: لەبەرئەوەی تۆ و"مك تاتون"چاك بونەتەوە، من ئێستا هیچ کارێکم لەشاری"ئاسۆ"دا نەماوە، ڕازی بە بەوەی من سەردانێکی شاری"تبس"بکەم، چونکە من زۆر بیری تبس و مەیخانەی "کلکی تیمساح"و "مریت"و بکرە"کاپتا"ی نۆکەری ڕابردووم دەکەم و تاقەتم بۆیان چووە.

فیرعەون وتی: من بەم ڕۆشتنەت ڕازیم، بەڵام لەڕێدا سڵاوی من بگەیەنە بەتەواوی ئەو جوتیارانەی کە لەزەوی"ئاتون"دا سەرقاڵی کاری کشتوکاڵن و لەکاتی گەڕانەوەدا، بارودۆخی ئەوان و هەواڵی خۆشم بۆ بهێنە.

ئەو زەویانە هەمان ئەو زەویانە بون کە لەڕابردوودا هی"ئامون"ی خودای ڕابردوو بوو و فیرعەون ئەم زەویانەی لە"ئامون"سەندەوە و دابەشی کرد بەسەر ئەوانەی دەیانەوێت کشتوکاڵ بکەن و منیش لەوکاتەدا ماڵئاواییم لەفیرعەون کرد و بەکەشتی بەرەو"تبس"ڕۆشتم.

***

لەڕێدا ڕۆژی چەندجارێك لەکەنارەکانی هەردوو لای ڕووباردا ڕادەوەستام و قسەم لەگەڵ لادێییەکاندا دەکرد بێ ئەوەی هەست بەماندویەتی وَ بێزاری بکەم، چونکە جێگای من لەناو کەشتیەکەدا لەژێر کەپرێکی زۆر خۆشدا بوو و چێشت لێنێرەکەشم هاتبوو لەگەڵمدا و چێشتی زۆر خۆشی بۆ لێدەنام، لەبەرئەوەی بە بەردەوامی دیاریان بۆ دەهێنایین، بەردەوام خواردنی تازەمان پێبوو.

ئەو ناوچانەی من لێیەوە تێدەپەڕیم، ئەو زەویانە بوون کە لەڕابردوو هی "ئامون"بوو.

من لەسەرەتای ئەم کتێبەدا وتم: لەبەرئەوەی خودای"ئامون"ماوەیەکی زۆرە لەمیسردا خودایی دەکرد، کاهینەکانی لەوەدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنابوو کە بەشێکی فراوانی زەویە کێڵگەییەکانی ئەمبەرە و بەری میسر بفرۆشن.

لەسەردەمی خودایەتی"ئامون"دا زۆربەی زەویە کێڵگەییەکانی میسر یان بە پەرستگای "ئامون"ەوە پەیوەست دەکرا و جوتیارەکانی"ئامون"لەو زەویانەدا

کشتوکاڵیان دەکرد، یان جوتیارەکان زەویەکانی"ئامون"یان بەکرێ دەگرت و خۆیان بەکشتوکاڵەوە سەرقاڵ دەکرد، لەمیسردا زەویە کێڵگەییەکان تەنها دەکەوێتە هەردوو لای ڕوباری"نیل"ەوە، لەشوێنەکانی تردا زەوی کێڵگەی کشتوکاڵی نیە، مەگەر بەشێوەیەکی دەگمەن ئەویش بەو مەرجەی کە کانی یان سەرچاوەیەکی ئاو لەو ناوچەیەدا بێت.

کاتێك فیرعەون زەویەکانی"ئامون"ی ڕابردووی بەسەر جوتیارەکاندا دابەش کرد، زۆرێك لەو خەڵکانەی کاریان کشتوکاڵ کردن نەبوو، لەو زەویانەی کە لەڕابردوودا بە"ئامون"ی خودای ڕابردووەوە پەیوەست دەکرا، خۆیان سەرقاڵی کشتوکاڵ کردن کرد و لەنێو ئەو جوتیارانەی کە من لەهەردوو لای"نیل"دا دەمبینین، لەو جۆرە کەسانەی تێدا بەدی دەکرا.

جوتیارەکان لاوازبون و ژنەکانیشیان سکاڵایان لەکەمی شیری مەمکیان و لاوازی منداڵەکانیان دەکرد و دانەوێڵە پوچەکانی خۆیانیان پێ نیشان دەدام و دەیانوت تەماشاکە ژەمە گەنمی ئێمە چەنێك کەمە و چیتر خودای ڕابردوو لێمان زویرە و نەفرەتی لەگەنمەکانی ئێمە کردووە.

کاتێك من تەماشای گەنمەکانیانم دەکرد پەڵەم بەگەنمەکانەوە دەبینی و وەك بڵێی دڵۆپە خوێن بەسەر ئەم گەنمەدا باریبێت.

جوتیارە تازەکان دەیانوت، کاتێك ئێمە دەستمان بەچاندن کرد، بینیمان گەنمەکانمان دوای ئەوە تۆوەکەی پێگەیشت ئەم شێوەیە لەخۆ دەگرێت، لەوباوەڕەدام لەبەرئەوەی ئێمە جوتیارێکی نەشارەزاین و شارەزاییەکی ئەوتۆمان لەبواری کشتوکاڵیدا نیە، ناتوانین گەنم بەباشی بچێنین.

بەڵام لەدواییدا ئاگاداری ئەوە بوین کە جوتیارە شارەزاکانیش وەك ئێمە بەدەست بەرهەمی خراپەوە دەناڵێنن و ئەوکات تێگەشتین، کەئێمە نەفرەت لێ کردوین لەبەرئەوەی زەویەکانمان بەخودای ڕابردوەوە پەیوەست کراوە.

سەرەڕای خراپی بەروبومی گەنم، چەند نیشانەیەکی تریش دەبینین کە ئەوەمان پێنیشان دەدات کە خودای ڕابردوو لەئێمە توڕە بووە و بەیانیان کاتێك لەخەو هەڵدەستین لەکێڵگەکانماندا جێ پێ دەبینین و دەبینین نەمامە تازەکانمان شکاون و لەبیرەئاوەکانماندا ئاژەڵی مردارەوە بوو دەبینین، هەڵبەت بەشێوەیەك کە ناتوانین

ئاوی ئەو بیرە بخۆینەوە و جۆگەلەی ئاوەکانمان بە خۆڵ پڕ دەکرێتەوە و ئاژەڵەکانمان بەهۆی نەخۆشیەوە دەمرن.

هەندێکمان نەفرەت لەفیرعەون و خوداکەی دەکەن و زەویەکانیان بەجێ دەهێڵن و دەڕۆنەوە بۆشار بۆئەوەی دەست بەکارە کۆنەکەی خۆیان بکەنەوە.

بەڵام ئێمە بەبۆنەی ئەوەی هێشتا هیوامان بە بەخودای فیرعەون و خاچەکەیەتی، ئێرەمان بەجێ نەهێشتوو و وا هەست دەکەین کە لەوانەیە خودای فیرعەون بتوانێت ئێمە لەزیانەکانی خودای ڕابردوو ڕزگار بکات.

بەڵام وا هەست دەکەین کە توانای خودای ڕابردوو لەخودا نوێکە زیاترە و ڕۆژێك دێت کە هەمووومان لەبرساندا بمرین، یان ناچار دەبین وەك ئەوانی تر ئەم زەویە نەفرەتیانە بەرەڵا بکەین و بڕۆین بۆ شار.

لەم گەشتەمدا سەردانی قوتابخانە تازەکانیشم دەکرد و کاتێك فێرکارەکان ملوانکە ئاڵتونیەکەی منیان دەبینی و چاویان بەخاچی ژیان دەکەوت کە بەگەردنمەوە شۆڕ بوو بوویەوە، تێدەگەشتن کە من یەکێکم لە بەرپرسە مەزنەکان و بەباشی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردم، بەڵام نەیاندەتوانی سکاڵا و ناڕازی بونی خۆیان بشارنەوە، بۆیە دەیانوت:

ئێمە لەپێناو ڕازی کردنی فیرعەون و خوداکەی کە نوسینێکی تازەی داهێناوە و بڵاوی کردووەتەوە، ئامادەین بەرگەی ئەرکە سەختەکانی بگرین، بەڵام ئەم جۆرە نوسینەی کە خودای تازە خۆشی دەوێت و دەڵێت دەبێت لەسەرەتای منداڵیەوە فێری منداڵان بکرێت، جۆرە نوسینێکی زۆر گەمژانەیە کە نە جوانیەکی تێدا بەدی دەکرێت و نە دەتوانرێت ئەو زانستەی ئێمە فێری بوین پێی بنوسرێتەوە.

بۆماوەی دوو هەزار ساڵ لەسەردەمی دروست بونی قوچەکیەکانەوە تا ئەمڕۆ، زانستەکانی ئێمە بەو جۆرە نوسینە کۆنە نوسراوەتەوە و ئەمڕۆ دەبێت دەست لەهەموو ئەمانە هەڵگرین و ئەو جۆرە نوسینە تازەیە بەزۆر فێری خەڵکی بکەین تەنها بۆئەوەی هەموویان کەسێکی خوێندەواریان لێ دەربچێت.

لەکاتێکدا بەهۆی نوسینە کۆنەکانەوە قوچەکیەکان دروستکران و بەهۆی ئەو نوسینە کۆنەوە بووە هۆی ئەوەی میسر ببێتە مەزنترین نەتەوەی ئەم جیهانە و بەزانستەکانی هەموو جیهان ڕوناك بکاتەوە.

ئێمە بۆ فێرکردنی ئەم جۆرە نوسینە نە تەختەمان هەیە و نە قامیش، بۆیە ناچارین بەدارێك لەسەر لم شێوەی نوسینە تازەکان بۆ منداڵان بکێشین و دایك و باوکی منداڵەکانیش بەهۆی ئەم نوسینە نوێیەوە کە بەداهێنانی خودای نوێ لەقەڵەم دەدەن، لەئێمە نارازین، لەکاتێکدا خودای تازە تاوانبارە نەك ئێمە. لەبەرئەوەی لەئێمە نارازین بەپێی پێویست موچەمان پێنادەن و ئەو کاسە گەنمانەی بەشایستەی ئێمەیان دەزانی ئێستا خاڵیە و زۆریش لەوە ورد دەبنەوە کە ڕۆنی زەیتونی خراپ و ئاوجۆی ترشمان پێبدەن.

یەکێك لەوشتانەی کە ئێمە تائێستا نەمانتوانیوە فێرعەون و خوداکەی تێگەیەنین ئەوەیە کە ئەم نوسینە تازەیە تەنها ئەو منداڵانە دەتوانن فێری ببن کە ئامادەکاری فێربونیان هەبێت. لەڕابردووشادا هەروا بوو و ئەومنداڵانەی ئەو ئامادەکاریەیان تێدا نەبوو، ئێستا نەخوێندەوارن.

یەکێکی تر لەو شتانەی کە خودای فێرعەون دەیڵێت ئەوەیە کە دەبێت کچانیش فێری ئەم جۆرە نوسینە بکەین، لەکاتێکدا فێرکردنی ئەم نوسینە هیچ سودێك بەکچان ناگەیەنێت، چونکە کچێك نەدەتوانێت ببێت بە پزیشکێك و نە دەتوانێت ببێتە نوسەر و ئەندازیارێك.

من هەندێکات هەندێك لەو مامۆستایانەم تاقی دەکردەوە و تێدەگەشتم کە زانیاریەکی زۆر کەمیان هەیە، بگرە ئەم نوسینە تازەیەش بەباش نازانن، بەڵام بۆ ئەوەی بتوانن بەئاسودەیی بژین"خاچی ژیان"یان پەسەند کردووە و خۆیان بەپەیڕەوی خودای نوێ دەزانن.

جوتیارەکان زۆر لە مامۆستاکان نارازی بون و پێیان دەوتم: "سینۆهە"لەبەرئەوەی تۆ لەفیرعەونەوە نزیکیت، پێی بڵێ ئێمە لەئەرکی قورس و زیانەکانی قوتابخانە ڕزگار بکات، لەبەرئەوەی فێرکارانی ئەم قوتابخانە لەتیمساحەکانی ڕوباری نیل پڕخۆتر و نەوسنترن و هەرگیز تێرناخۆن و هەرچەنێك ڕۆنی زەیتون و ئاوجۆیان پێبدەین هەر دەڵێن کەمە و ئەگەر بەفرۆشتنی گەنم ئەنگوستیلەیەکی مس بەدەست بهێنین، لێمان دەسێنن و پێستی گاکانیشمان لێ وەردەگرن و دەیفرۆشن بۆئەوەی شەرابی پێ بکڕن و بەڕۆژدا ئەوکاتانەی لەبیاباندا سەرقاڵی کشتوکاڵ کردنین، دەڕۆنە ناو ماڵەکانمان و کەلوپەلی ناو ماڵەکانمان دەدزن و بەردەوام باشترین و گرانبەهاترین شتەکانمان دەدزن

و کاتێك نارەزایی خۆمان دەردەبڕین و پێیان دەڵێین بۆچی سەروەت و سامانەکانمان دەدزن، دەڵێن خودای تازە وتویەتی هەمووتان یەکسانن، لەبەرئەوەش پیاوێك یەکسانە بەپیاوێکی تر، چیتر هیچ جیاوازیەك لەوەدا نیە کە ئەو پیاوەی شتێکی هەیە، هی خۆی بێت یان هی پیاوێکی تر بێت.

من ئەم جۆرە سکالآیانەم دەبیست و نەمدەتوانی بڕیارێك بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانیان بدەم، چونکە فیرعەون پێی نەوتبوم بڕیارێك بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانیان بدەم، بەڵکو تەنها پێی وتبوم کە سلآوی ئەویان پێ بگەیەنم.

بەلآم من سەرزەنشتم دەکردن و پێم دەوتن: کشتوکاڵ پێویستی بەهەوڵ و توانای جەنگینە لەگەڵ زیانە گشتوکاڵیەکاندا"ئافات"و ئێوەش لەتەمەڵیاندا لەگەڵ زیانە کشتوکاڵیەکاندا ناجەنگن، هەرلەبەرئەوەش بەروبومە کشتوکاڵیەکانتان بەوشێوەیە زیانمەند دەبێت، ئەگەر شەوانە چاودێریان لێ بکەن، ئەوا هیچ کەسێك نەمامەکانتان ناشکێنێت وئاژەڵی مردار هەڵنادەنە ناو بیرەئاوەکانتانەوە و جۆگەلەکانتان پڕ ناکرێتەوە. ئێوە لەبەرئەوە حەز ناکەن منداڵەکانتان بڕۆن بۆ قوتابخانە، بۆئەوەی کرێ بەمامۆستاکانیان نەدەن و لەهەمان کاتیشدا لەکاروباری کێڵگەکانتاندا سودیان لێ وەرگرن. ئەگەر من لەباتی فیرعەون بومایە، بەبینینی ئێوە شەرمەندە دەبوم، چونکە ئێوە ناتانەوێت سود لەو زەویانەی کە فیرعەون پێی داون وەرگرن، لەکاتێکدا ئەم زەویانە بەپیتترین زەویەکانی میسرە. چونکە خودای ڕابردو دەستی بەسەر ئەو زەویانەدا دەگرت کە لەهەموویان بەپییتتربوو و ئێستا ئەم زەویانە لەژێر دەستی ئێوەدایە، بەلآم ئێوە بەهۆی کەمتەرخەمیەکانتانەوە زەویەکانتان بەفیڕۆداوە و ئاژەڵەکانتان بەکوشت دەدەن، بۆئەوەی سود لەگۆشت و پێستەکەی وەرگرن.

بەلآم ئەمانە دەیانوت ئێمە نەماندەویست گۆڕانکاری بەسەر ژیانی ئێمەدا بێت، لەبەرئەوەی ئێمە خەڵکێکی هەژار بوین و باوکانی ئێمە دەیانوت، کاتێك مرۆڤ هەژار بێت، نابێت خوازیاری کودەتا بێت، چونکە هەموو کودەتا و گۆڕانێکی ژیان بەسودی دەوڵەمەندەکان و زیانی هەژاران کۆتایی دێت و لەدوای هەر گۆڕانێك، دەوڵەمەندەکان دۆڵەمەنتر دەبن و هەژارانیش هەژارتر، بەلآم لەکەنوی هەژاراندا ئاستی گەنم ڕو لەکەمی دەکات و ئاستی بەرزی ڕۆنیش لەگۆزەکانیاندا تا دێت دادەبەزێت.

من وا خۆم نیشان دەدا کە باوەڕم بەم جۆرە قسانە نیە، بەڵام لەناخەوە لایەنگری گوتەکانیانم دەکرد، لەبەرئەوەی دەزانم کە هەموو گۆڕانێکی مەزنی ژیانی کۆمەلایەتی، بەقازانجی دەوڵەمەندەکان و زیانی هەژاران کۆتایی دێت.

لەوانەیە بەشێوەیەکی کاتی هەندێك لە دەوڵەمەندەکان هەژار بن، هەروەك چۆن کاهینەکانی پەرستگای"ئامون" زەویەکانی خۆیان لەدەست دا و هەژار کەوتن.

بەڵام ئەم ڕوداوە زیانێکە تەنها لەچینێك دەکەوێت و لەدوای هەر گۆڕانێکی کۆمەلایەتی، هەموو بەرژەوەندی و تایبەتمەندیەك دەبێتە بەشی دەوڵەمەندەکان و هەژاران هەر بەوشێوەیە بەهەژاری دەمێننەوە یان هەژارتر دەبن.

فیرعەون خودای کۆنی لەناوبرد و زەویەکانی بەنێو جوتیارەکاندا دابەش کرد، بۆئەوەی جیاوازی لەنێوان هەژار و دەوڵەمەندا نەمێنێت، بەڵام لەمڕۆدا وەجاخزادە و کاربەدەستانی فیرعەون و کۆمەڵێك مرۆڤی مشەخۆر کە خۆیان بەلایەنگری"ئاتون" نیشان دەدەن، جێگەی کاهینە کۆنەکانیان گرتووەتەوە بێئەوەی هیچ کارێك بکەن، بەئاسودەیی ژیانی خۆیان دەکەن و منیش وەك ئەوانم لێهاتووە، چونکە منیش وەك ئەوان کارێکی بەسود ئەنجام نادەم وەك هەموو ئەو کاهینە تازانەی کە لایەنگری "ئاتون"ن، هەروەهاتەواوی فێرکارانی کەسانی نەخوێندەواروتەواوی وەجاخزادەکانی ئەمڕۆ، واخۆیان نیشان دەدەن کە باوەڕێکی تەواویان بە"ئاتون"ە، ئێمە بونەوەرگەلێکی مشەخۆرین وەك کێچ و گەنە کە بەسەر پێستی سەگەکانەوە بەدی دەکرێن.

ئەم کێچ و گەنانە بەردەوام بەسەر خوێنی سەگەکانەوە خۆیان دەژیەنن، بێئەوەی هیچ کارێکی بەسود ئەنجام بدەن، ئێمەش بەردەوام بەسەر خوێنی خەڵکی میسرەوە خۆمان دەژیەنین، بێئەوەی کارێکی بەسود ئەنجام بدەین و سودێکمان بۆ نەتەوەی میسر هەبێت.

ئەو کێچ و گەنانەی کە بەسەر پێستی سەگەوە دەژین، لەوانەیە والێکی بدەنەوە کە خۆیان لەسەگ بەپێشەنگتر بزانن و سەگ لەبەرئەوە هاتووەتە بون کە خۆراکی ئەم مشەخۆرانە دابین بکات و ئەوان بونەوەرێکی ڕەسەنترن لەسەگەکان و سەگیش بونەوەرێکی لاوەکیە، ئێمەش وا هەست دەکەین کە ئێمە بونەوەرگەلێکی ڕەسەنین و نەتەوەی میسریش بۆ ئەوە هاتونەتە بون کە خورد و خۆراکی ئێمە دابین بکەن، بەڵام

هەروەك چۆن سەگەكان بیّ ئەم كیّچ و گەنانە خۆشبەخت ترن، ئەگەر نەتەوەی میسریش لەدەردیسەری بونەوەرگەلیّكی مشەخۆری وەك ئیّمە ڕزگاریان ببیّت، خۆشبەختتر دەبن.

لەو ڕوانگەیەی كە منیش بونەوەریّكی مشەخۆر و مفت خۆرم زۆر بیّتاقەت و مەلول بوم و ئەوكات چاوپۆشیم لە تەمەڵی و تەوەزلی جوتیاران كرد.

كەشتیەكەم بەردەوامی دا بەڕۆشتنی بۆ شاری"تبس"تائەوەی كیّوە سیانەكان كە پاسەوانی بەردەوامی"تبس"ن دەركەوتن لەگەڵ كۆشك و باخەكان دا.

من زۆر بەبینینی"تبس"دوای چەند ساڵیّك دوری خۆشحاڵ بوم و وەك ئەو دەریاوانانەی كە لەناوچە دورەكانەوە دەگەڕیّنەوە، لەكاتی چونە ناو ڕوباری"نیل"ەوە دوو پیّك شەرابم بەسەر خۆمدا ڕشت و خۆمم پیّ شۆرد.

كەشتیەكەی من لە لەنگەرگا مەزنە بەردینەكانی"تبس" نزیك بویەوە و بۆنی تایبەتی لەنگەرگا و ئاوی مەنگ و بۆنی دەرمان و جەوگ[1] دەهات، بەواتایەكی دیكە بۆنی هەمیشەیی"تبس".

بەڵام كاتیّك ڕۆشتمەماڵەكەی خۆم، كەپیّش من ماڵی مسكەریّك بوو، كاتیّك چاوم بەدرەختی"نارونی"ئەو ماڵە كەوت ئەوەم هاتەوە یاد كە خۆم ئەو درەختەم ناشتووە، ئەو ماڵەم زۆر بەبچوك و بیّنرخ هاتە بەرچاو لەبەرئەوەی من لەشاری"ئاسۆ"دا لەماڵیّك كە بەئەندازەی كۆشكیّك دەبوو دەژیام و هەرلەبەرئەوەش ماڵی ڕابردووم خۆشحاڵی نەكردم، ئەوكات هەستم بە شەرمەزاری كرد، چونكە زانیم چیتر گەنیوم، چونكە تا ئەوكاتەی مرۆڤ نەگەنیّت ژیانی سادەی ڕابردوی كە ئاویّتەی هەوڵ و چالاكی و مرۆڤ دۆستیە، بەبیّسود و بیّهودە نایەتە بەرچاوی، هۆكاری ئەوەی ناوەندی كار و هاوكاری كردنی هەژاران و نەخۆشەكان بەشتیّكی هیچ و بیّنرخ دیّتە بەرچاوی، بۆ ئەوە دەگەڕیّتەوە كە ڕوكەشپەرستی و سەروەت و سامان ڕۆحی مرۆڤ تاریك دەكات و سەرچاوەكانی سۆزی وشك دەكاتەوە.

---

[1] جەوگ: شتیّكە كەزۆریّك لەدرەختەكان دەری دەكەن كە لەشیّوەی كەتیرەدایە، بۆنمونە چوالە و قۆخ و قەیسی و زۆریّك لەدرەختەكانی تر دەری دەكەن، ئەم ناوەش وشەیەكی پاراوی كوردیە..........وەرگیّڕ.

"کاپتا"ی نۆکەرم، لەماڵ نەبوو، بەڵام"موتی"ژنە خزمەتکارە پیرەکەم لەوێ بوو، کاتێك منی بینی وتی: ئەمڕۆ پیرۆز بکرێت، چونکە خاوەنەکەم لە ڕۆژێکی ئاوادا گەڕاوەتەوە، بەڵام ئەوەش بزانە لەبەرئەوەی من چاوەڕێی گەڕانەوەی تۆم نەکردووە، ژوورەکەتم ڕێك و پێك نەکردووە و فەرش و جێگە خەوەکانتم نەشۆردووە، بەڵام پیاوەکان لەهەموو شوێنێکدا لەیەك دەچن و لەناکاو دەڕۆن و کاتێکیش کە هیچ کەسێك چاوەڕێی گەڕانەوەیان ناکات دەگەڕێنەوە.

وتم: "موتی"لەبەرئەوەی ماڵ ئامادەی پێشوازی کردنی منی نیە، کەشتیەکەم دەکەمە مەنزڵگەم، تا ئەوکاتەی ماڵەکەم ئامادە دەبێت، ئایا"کاپتا"دەبینی و هەواڵی دەزانی؟

"موتی"وتی: "کاپتا"هەندێکات، بەڵام زۆر بەدەگمەن، لەبەرئەوەی دەزانێت ئەم ماڵە هی تۆیە جار جارێك سەردان دەکات، بەڵام لەمڕۆدا بووەتە پیاوێکی دەوڵەمەند و کاتێك لەگەڵ مندا قسە دەکات پێم دەڵێت کە لەگەڵ مندا زۆر جیاوازە و ئەگەر تۆش دەتەوێت بیبینی بڕۆ بۆ مەیخانەی"کلکی تیمساح".

منیش بەرەو مەیخانەی"کلکی تیمساح"ڕۆشتم و"مریت"هات بەپیریمەوە و منیش بینیم قەڵەو بووە، بەڵام جوانیەکەی هێشتا وەك خۆی ماوەتەوە.

لەبەرئەوەی من پۆشاکی گرانبەها و ملوانکەی ئاڵتون و"خاچی ژیان"م بەملمەوە هەڵواسرا بو و قژێکی دەستکردم کردبووە سەرم،"مریت"نەیناسیمەوە و وتی: ئایا شوێنێکت لەم مەیخانەدا بەکرێ گرتووە یان نە؟ ئەگەر شوێنێکت بەکرێ نەگرتبێت، من ناتوانم پێشوازیت لێ بکەم.

وتم: "مریت"ناحەقت نیە کە من نەناسیتەوە، چونکە ژنێك کە ماوەیەکی درێژخایەن لەپیاوێك دور بکەوێتەوە و لەو ماوەیەدا پیاو گەلێکی زۆر لەئامێز بگرێت، بەدڵنیاییەوە ئەو پیاوە فەرامۆش دەکات، بەڵام من لەڕێوە گەیشتوم و پێویستم بە پێکێك خواردنەوەی فێنکە، سەرەتا چوارپایەك بێنە بۆئەوەی لەسەری دانیشم و ئەوکات خواردنەوەیەکم بۆ بهێنە.

"مریت"بەسەرسوڕمانەوە هاواری کرد و تی: "سینۆهە"ئایا ئەوە تۆی.....ئەمڕۆ پیرۆز بکرێت...کە تۆی گەڕاندەوە بۆ ئێرە.

"مریت"بەپەلە چوارپایەکی هێنا و منی لەسەری دانیشاند و لەبەرامبەرمدا ڕاوەستا و بەوردی تەماشای کردم و وتی: "سینۆهە" قەڵەو بویت و چاوەکانت وەك جاران نادرەوشێنەوە، بەڵام لەبەژن و باڵاتدا نیشانەی ئارامی و ئاسودە خەیاڵی بەدی دەکرێت و وەك ئەو پیاوە وایت کە ئەوەی لەژیاندا ئارەزووی کردووە بەدەستی هێناوە، خۆت وا نیشان دەدەیت کە چیتر پێویستت بەهیچ شتێکی تر نیە.

دوای ئەوەی قژە دەستکردەکەی لەسەرم لابرد و دەستی بەسەرە کەچەڵەکەمدا هێنا و وتی: "سینۆهە"ئێستا وەك ژنە لاو و جوانەکان بویتە خاوەنی سەرێکی بێ موو، بەڵام من ئەم سەرەم لە سەری پڕمووی پیاوانی تر زیاتر خۆش دەوێت، ئێستاش چاوەڕێکە بۆئەوەی خواردنەوەت بۆ بهێنم.

وتم: مریت"کلکی تیمساح"م بۆ نەهێنی، چونکە نە گەدەم بەرگەی ئەو خواردنەوەیە دەگرێت و نە سەرم.

"مریت"ڕوخساری نەوازش کردم و وتی: "سینۆهە"مەگەر من ئەوەندە پیر و قەڵەو بووم کە تۆ کاتێك بەمن دەگەیت، بیر لەگەدە و سەری خۆت دەکەیتەوە، چونکە کاتێك پیاوێك ژنێکی خۆش بوێت، چیتر نە بیر لەگەدەی دەکاتەوە و نە لەسەری، بەڵام کاتێك سۆز و خۆشەویستی لەناو بچێت ئەوکات پیاو ڕەخنە لەخواردن و خواردنەوەکان دەگرێت و دەڵێت ئەم خواردنە خۆش نیە یان دەڵێت ئەم خواردنە قورسە و ئەو خواردنەوەیە زیان بەگەدەم دەگەیەنێت و توشی سەرئێشەم دەکات.

منیش پێکەنیم و وتم: "مریت"باوەڕ بکە کە من پیاوە لاوەکەی ڕابردوو نیم و تێپەڕ بونی ساڵەکان منی کردووە بە پیاوێکی لەجێگەدا کەوتوو، توکی سەرم هەمووی وەریوە و زۆریش ناخایەنێت هەموو ددانەکانیشم دەوەرن و دەبێت ددانی دەستکرد بخەمە دەممەوە، گەدەی پیرەمێردێك، هەڵگری هێزی گەدەی لاوێکی نیە.

"مریت"وتی: تۆ پیرەمێرد نیت، لەبەرئەوەی هەرئەوەی چاوم پێت کەوت ئارەزوی ئەوەم کرد لەگەڵتدا ڕابوێرم، ئەگەر پیاوێکی پیر بویتایە، ئەم ئارەزووە لەمندا دروست نەدەبوو و هیچ کەسێك وەك ژن ناتوانێت پەی بەجوانی و پیری پیاوێك ببات، ئەگەر ژنێك پیاوێکی بینی و لەناخەوە نەك تەنها لەبەر پارەکەی حەزی بەوە کرد لەگەڵیدا ڕابوێرێت، بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو پیاوە هێشتا لاوە، سەلیقەی ژن هیچ کاتێك

لەمبارەیەوە بەهەڵەدا ناچێت، ئێستا پێم بڵێ ئایا"کلکی تیمساح"ت بۆ بهێنم یان خواردنەوەیەکی تر.

من بەهەمان ئەو شێوەیەی کە پێشتر بەم ژنەم وت: سەرەتا نەمدەویست"کلکی تیمساح" بخۆمەوە، بەڵام دوای کاریگەری دەربڕینەکانی وتم: "کلکی تیمساح"م بۆ بهێنە، چونکە دوای ئەو هەموو ماوەیە کە لەتۆ درو بوم دەمەوێت تامەزرۆیی و چالاکی ڕابردووم لەخۆمدا نوێ بکەمەوە.

"مریت" ڕۆشت و پێکێك"کلکی تیمساح"ی بۆ هێنام و دای بەدستمەوە و منیش خواردمەوە و سەرەڕای ئەوەی قورگم ئاگری تێبەربوو و فرمێسك لەچاومەوە هاتە دەر، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم بەشێوەیەك خۆم بەهەڵگری چوست و چالاکی دەبینی کە دەستم خستە سەر دەستی"مریت"و وتم: "مریت" تۆ ڕاست دەکەیت، هێشتا پیر نەبوم، لەبەرئەوەی ئەم دڵەی من هێشتا لاوە و کاتێکیش چاوم پێت کەوت هەستم بەوە کرد کە وەکو ڕابردوو خوازیاری تۆم و دەبێت پێت بڵێم کە من تۆم هەرگیز لەیاد نەکردووە و لەماوەی ئەو ساڵانەی کە لەتۆوە دور بوم، هەرکاتێك پەڕەسێلکەیەکم ببینیایە بەرەو"تبس"دەفڕێت، پێم دەوت سڵاوی من بە"مریت"بگەیەنە.

"مریت"وتی: "سینۆهە"منیش بەردەوام لەبیری تۆدا بوم و هەرجارێك پیاوێك لەتەنیشتەمەوە دەخەوت و دەستی دەخستە سەر دەستم، تۆم دەهاتەوە بیر و دوای ئەوە خەمگین دەبوم، چونکە دەمزانی ڕابواردن لەگەڵ هیچ پیاوێکدا بەئەندازەی ڕابواردن لەگەڵ تۆدا چێژ بەمن نابەخشێت. هەندێکات بەخۆمم دەوت: تۆ منت فەرامۆش کردووە، چونکە لەکۆشکی فیرعەوندا لەشاری"ئاسۆ" ژنگەلێکی جوانی تێدایە و تۆ دەتوانی لەگەڵیاندا ڕابوێری.

وتم: "مریت"ڕاست دەکەیت کە لەکۆشکی فیرعەوندا ژنگەلێکی زۆری تێدایە، بەڵام تۆ تاکە دۆستی منی و من دوای درەچونم لە"تبس"هیچ ژنێکم نەکردووە بەدۆستی خۆم.

"مریت"وتی: هەرکاتێك"کاپتا"هەلێکی بۆ بڕەخسایە و لەمەیخانەکەدا دانیشتایە، من و ئەو باسی تۆمان دەکرد و"کاپتا"باسی چاکەکانی تۆی بۆ دەکردم و دەیوت: پیاوێکی دڵپاکی و ئەگەر ئەو لەوڵاتە دورە دەستەکاندا لەگەڵ تۆدا نەبوایە و تۆی لەهەڕەشەکان ڕزگار نەکردایە ئەوا بەکوشت دەدرایت.

منیش کە بەگەرمی"کلکی تیمساح"چوست و چالاك و ورووژابوم وتم: ئاه....
"کاپتا"ی خزمەتکاری کۆن و بەوەفام لەکوێیە بۆئەوەی لەئامێزی بگرم، چونکە سەرەڕای ئەوەی لەمڕۆدا لەئامێزگرتنی نۆکەرێکی دێرین لەلایەن کەسێکی وەك منەوە پەسەندکراو نیە، سەرەڕای ئەو هەموو شتانەش هەر خۆشم دەوێت.

"مریت"وتی: "کاپتا"بەڕۆژدا نایەتە مەیخانەوە، چونکە کاتەکانی ئەو لەڕۆژدا، لەفرۆشگای گەنم و ئەو مەیخانانەی کە مامەڵەی مەزنی تێدا دەکرێت بەسەر دەبات و ئەگەر تۆ چاوت پێی بکەوێت سەرت سوڕ دەمێنێ، چونکە"کاپتا"بەتەواوی ئەوەی فەرامۆش کردووە کە لەڕابردوودا کۆیلە بووە و ئەمڕۆ خۆی بەکەسێکی دەوڵەمەند و وەجاخزادەیەکی ڕاستەقینە لەقەڵەم دەدات و منیش لەبەرئەوەی بەخواردنەوەی "کلکی تیمساح" بەتەواوی ورووژابوم، مریت وتی: ئایا حەز دەکەیت بڕۆین کەمێك بەنێو شاردا پیاسە بکەین، بۆئەوەی هەوا بەر ڕوخسارت بکەوێت، لەهەمان کاتدا ببینی کە"تبس"لەنەبونی تۆدا تا چ ڕادەیەك گۆڕاوە.

وتم: بەڵێ...ئامادەم لەگەڵ تۆدا بڕۆم بۆ پیاسە، چونکە لەگەڵ تۆدا پیاسە کردن زۆر چێژ بەخشە... "مریت" ڕۆیشت و ئاڕایشتی ڕوخساری خۆی کرد و ملوانکەی ئاڵتونی لەمل کرد، کاتێك گەڕایەوە بینیم جوانتر بووە و ئەو بۆنە ڕۆح بەخشەی لێوە دێت کەتەنها لە"تبس"دا دەست دەکەوێت.

کەژاوەیەکیان هێنا و من و"مریت"سواری بوین و کەوتینە ڕێ تا ئەوەی گەیشتینە شەقامی"قۆچەکان"ی نزیك پەرستگای ڕابردوو و منیش بینیم بەپێچەوانەی قسەکانی"مریت"کە وتی"تبس"گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، وێرانەکانی جەنگی ڕابردووی هێشتا پێوە دیارە و هیچ کەسێك نۆژەنی نەکردووەتەوە و بەتازەی لەشوێنی ماڵە ڕوخاوەکاندا خەریکی دروست کردنی چەند خانوویەکن.

کاتێك گەشتینە لای پەرستگای پێشینی"ئامون"من بەسەرسوڕمانەوە بینیم هێشتا قەلەڕەشەکان لەو دەورو بەرەدا خەریکی فڕینن، چونکە ئەم باڵندە شومانە، لەدوای شەڕی ناخۆوە ئێرەیان بەجێ نەهێشتووە، چونکە خوویان بەوەوە گرتووە کە بەچواردەوری پەرستگای ڕابردوودا هەڵبفڕن.

من و"مریت"لەکەژاوەکە دابەزین و بینیمان پەرستگاکە چۆڵ دیارە و تەنها لەبەرامبەر"ماڵی ژیان"و مردووخانەدا چەند کەسێك دەبینرێت.

من دەمزانی کە"ماڵی ژیان"و مردووخانە هێشتا لەپەرستگای"ئامون"ی پێشوودایە، لەبەرئەوەی گواستنەوەی ئەم دوو ڕێکخراوە بۆ شوێنێکی تر ئەرکێکی زۆر لەخۆ دەگرێت و پێویستی بەبوجەیەکی زۆرە.

"مریت"پێی وتم: سەرەڕای ئەوەی"ماڵی ژیان"هێشتا ماوەتەوە، کەچی فیرعەون هیچ گرنگیەکی پێنادات و لەبەرچاو کەوتووە و هەندێك لەو پزیشکانەی بەردەوام لە"ماڵی ژیان"دا بون ئەوێیان بەجێ هێشتووە و لەناو شاردا نیشتەجێ بون.

باخە مەزنەکانی پەرستگای"ئامون"بەهۆی نەبونی چاودێریەوە وشك بووە و هەندێك لەدرەختە پیرەکان کەوتبوون، کاتێك بینیم ئەو پەرستگایە کەڕۆژانێك نێوەندی زانستی جیهان بوو، وای لێهاتووە، زۆر خەمم بۆ خوارد، چونکە سەردەمی لاویەتی خۆم لەو پەرەستگایەدا بەواتا لە"ماڵی ژیان"دا بەسەر بردووە و وا هەست دەکەم هەرکەسێك ئەو شوێنانەی سەردەمی لاویەتی تێدا بەسەر بردبێت، لەسەردەمی پیریدا بەوێرانی بیبینێت، زۆر بەداخ دەبێت بۆی.

پەیکەرەکان سەرنگون کراون و ناوی"ئامون"یان لەسەر دیوارەکان پاك کردبویەوە و کاتێك گەشتینە"ماڵی ژیان"، بینیم کەسانێك لەوێن کە بەتوڕەییەوە تەماشام دەکەن.

"مریت"وتی: "سینۆهە"ئەم"خاچی ژیان"ە لەملت دەربهێنە یان بیشارەوە، چونکە ئەمانە کاتێك چاویان بەم خاچەی تۆ دەکەوێت، وا هەست دەکەن کە تۆ لایەنگری "ئاتون"ی و لەوانەیە بەردت تێبگرن یان بەچەقۆ بتکوژن.

"مریت"ڕاستی دەکرد، خەڵکی لەخاچەکەی من توڕە بوبون، بەتایبەت ئەوانەی بەجلێکی سپی و سەرێکی تاشرا و چەور کراو، وەك کاهینەکانی ڕابردووی"ئامون" لەوێدا پیاسەیان دەکرد.

فیرعەون ئەوەی قەدەغە کردبوو کە کاهینەکانی خودای پێشوو پۆشاکی سپی لەبەربکەن و سەریان بتاشن و چەوری بکەن هەروەها سەردانی پەرستگای "ئامون" بکەن، بەڵام ئەم کاهینانە بەبوێریەکی شایستەوە بەجلی کاهینەکانی خودای پێشوو بەنێو خەڵکیدا ڕێیان دەکرد و لەکاتی تێپەڕبونی ئەم جۆرە کەسانە بەکۆڵانەکاندا خەڵکی کڕنوشیان بۆ دەبردن و بەوشێوەیەی من لێی تێگەشتبوم ئەگەر ئەوجۆرە

کاهینانە چاویان بە خاچەکەی من بکەویت و فەرمانی کوشتنی من بەخەڵکی بدەن یەکسەر خوێنم دڕێژن، بە تایبەت گەر بشزانن من پزیشکی تایبەتی فیرعەونم.

چونکە لەمیسردا تەنها یەك کەس پیرۆز و کوڕی خودایە، ئەویش فیرعەونە، هەرلەبەرئەوەش خەڵکی هیچکاتێك فیرعەونێك ناکوژن، بەڵام چواردەورەکەی بەکەسانێکی ئاسایی لەقەڵەم دەدەن و کوشتنیشیان بەشتێکی زۆر ئاسایی لێکدەدەنەوە.

من دەستم خستە سەر ئەو خاچی ژیانەی کە بەملمەوە هەڵمواسیبوو، بۆئەوەی خەڵکی چاویان پێی نەکەوێت و لەگەڵ"مریت"دا لە"ماڵی ژیان"دور کەوتینەوە و گەشتینە نزیك دیواری پەرستگا و بینیم چیرۆك بێژێك خەریکی گێڕانەوەی داستانێکە و ئەوانەی چواردەوریان گرتووە، هەندێکیان دانیشتون و هەندێکیشیان بەپێوە ڕاوەستاون، ئەوانەی کە نەدەترسان لەوە شەرواڵ یان کراسەکەیان پیس بکەن، بەدانیشتنەوە گوێیان لەداستانی ئەو چیرۆك بێژە دەگرت، هەروەها ئەوانەی دەترسان لەوەی جلەکانیان پیس ببێت، بەپێوە گوێیان لەگوتەکانی دەگرت.

ئەو داستانەی کە چیرۆك بێژەکە دەیگێڕایەوە بۆ خەڵکی، بەلای منەوە زۆر تازە بوو، سەرەڕای ئەوەی لەسەردەمی منداڵیدا دایکم تەواوی داستانەکانی میسری بۆ گێڕاومەتەوە، بەڵام تا ئەو ڕۆژە گوێم لەو داستانە نەبووە.

بەکورتیەکەی داستانی چیرۆك بێژ ئەوەبوو کە لەکۆندا ژنێکی جادوگەری ڕەش پێست کە لە"ست[2]" ئیلهامی وەردەگرت، لەسکی خۆیدا فیرعەونێکی درۆینەی هێنایە بون و ئەم فیرعەونە دوای ئەوەی گەشتە پلەی فەرمانڕەوایی بوو بەئەڵقە لەگوێ "ست"و هەرچی ئەو پێی بوتایە ئەنجامی دەدا و بەپێی فەرمانەکانی"ست" پەیکەرەکانی خودای میسری سەرنگون کرد و ئەوکات خودا نەفرەتی بەسەر نەتەوەی میسردا باراند و چیتر لەکێڵگەکانی میسردا گەنم نەدەڕوا یان ئەگەر بیشڕوایە گەنمێکی خراپ بەدەست دەهات و هەستان و هەڵچونی ڕوباری"نیل"لەباتی ئەوەی کێڵگەکانی بەپیت تر بکات، ماڵ و لادێکانی وێران دەکرد و هەموو ساڵێك کوللە بەرهەمی کێڵگەکانی میسری دەخوارد و ئاوی ناو گۆماوەکان وەك خوێنی لێدەهات.

---

[2] ست: لەمیسری کۆندا هەمان ڕۆڵی شەیتانی ئەم سەردەمە دەگێڕێت.

بەڵام سەرەڕای ئەوەی فیرعەون بەپێی فەرمانەکانی"ست"خودای میسری سەرنگون کرد، خەڵکی میسر دەستیان لەبیروباوەڕی خۆیان هەڵنەگرت و هەر باوەڕیان بەخودای ڕابردوی خۆیان بوو و کاتێکیش فیرعەون بەهۆی ڕسوایی و بەدبەختی ئەو ژن و پیاوە ڕەشپێستەی کە ئەویان هێنابووە بون کۆچی دوایی کرد، خودای ڕابردوو گەڕایەوە و تەواوی زەوی و زێڕ و زیوی فیرعەونی دابەش کرد بەسەر ئەو پەیڕەوانەی وەفایان بۆی هەبوو.

ئەم چیرۆکە زۆر خۆش بوو و کاتێك کۆتایی پێهات خەڵکی زانیان کە خودای ڕابردوو گەڕاوەتەوە و پاداشتی پەیڕەوە بەوەفاکانی خۆیی داوەتەوە و ئەو خەڵکەش کە گوێیان لەو پیاوە دەگرت بەشێوەیەك خۆشحاڵ بوون کە لەجێی خۆیاندا هەڵقون هەڵقون و هاواریان دەکرد و ئەنگوستیلەی مسیان دەدا بە چیرۆك بێژەکە و ئەویش ناچار بوو ئەنگوستیلەکانیان بخانە ناو پارچە قوماشێکەوە و لەگەڵ خۆیدا بیبات.

کاتێك خەڵکی بڵاوەیان لێکرد و ئێمەش ویستمان بگەڕێینەوە، لەو کاتەدا بە"مریت"م گوت: ئەم داستانە زۆر خۆش بوو، بەڵام بەشێوەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش لەم هەلومەرجەی ئێستا دەچێت، منیش سەیرم لەوە دێت کە بەچ شێوەیەك ئەم چیرۆك بێژە وێرای ئەم داستانە بگێڕێتەوە.

"مریت"وتی: ئەم داستانە درۆینە نیە و ئەم چیرۆك بێژە لەخۆیەوە ئەم داستانەی نەگێڕاوەتەوە، بەڵکو کاهینەکانی پەرستگای ڕابردووی"ئامون"ئەم داستانەیان لەکتێبە کۆنەکانی هەزار ساڵ پێش ئێستا دۆزیوەتەوە و ئەگەر بەرپرسانی فیرعەون بیانەوێت ببنە ڕێگر لەبەردەم ئەم چیرۆك بێژەدا، ئەوا ئەویش لەوەڵامدا پێیان دەڵێت ئەو داستانەی کە لەکتێبدا نوسراوەتەوە، ڕاستە و هیچ کەسێك ناتوانێت بەتاوانی درۆکردن سزای بدات.

وتم: من"هورم هب"کە فەرماندەی لەشکری سەربازی میسرە، باش دەناسم و دەزانم کە پیاوێکی سەخت گیرە و باوەڕی بەهیچ خودایەك نیە، بەڵام فەرمانەکانی فیرعەون دەستبەجێ جێبەجێ دەکات.

"مریت" وتی: "هورم هب"هەرچەنێك سەختگیر بێت، ناتوانێت ڕێ لە چیرۆك بێژێك بگرێت، جگە لەوکاتەی کە درۆ بکات و ئەم چیرۆك بێژە درۆی نەکردووە و ئەوەی باسی کرد، بابەتگەلێکە کە لەکتێبە کۆنەکاندا نوسراوەتەوە.

بەڵام خەڵکی تەنها گوێ لەم چیرۆکە ناگرن، بەڵکو ئەو پێشبینیانەش کە دەکرێن بۆ یەکتری دەگێڕنەوە، ئەگەر تۆ بەشەقامەکانی"تبس"دا ڕێ بکەیت، دەبینی کاتێك دوو کەس بەیەك دەگەن، لەبارەی پێشبینیەکانەوە لەگەڵ یەکتردا دەدوێن و ئەم پێشبینیانەش لەداهاتوی ڕەش ئاگادارمان دەکاتەوە و بارودۆخی میسر لایەنگری ئەم جۆرە پێشبینیانەیە، چونکە نرخی گەنم بەرز بووەتەوە و کاربەدەستانی کۆکردنەوەی باج و سەرانە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر ئازار بەخەڵکی دەگەیەنن و زەوی زۆر شوێنی ئەم وڵاتە نەفرەتی لێکراوە و گەنمێکی پۆچیان لێ دەڕوێت و جوتیارەکانیش نەدەتوانن ئەو گەنمە بفرۆشن و نە دەتوانن بیخۆن.

بەدەم ئەم قسانەوە من و"مریت"گەڕاینەوە بۆ مەیخانەی"کلکی تیمساح"و هێشتا نیو ترازو[3] لەگەشتنەوەی ئێمە تێنەپڕیبوو چرایان داگیرساند و دوای داگیرساندنی چرا"کاپتا" خۆی کرد بەمەیخانەدا.

بەڵام"کاپتا"ئەوەندە قەڵەو بوبو، کاتێك ویستی پێ بنێتە ناو مەیخانەکەوە بەلادا خۆی کرد بەناو بەمەیخانەکەدا، چونکە ورگە زلەکەی بەنێو دەرگای مەیخانەکەدا تێنەدەپەڕی.

ڕوخسارێکی وەك مانگ خڕ دەهاتە بەرچاو و پارچە ئاڵتونێکی خستبووە سەر چاوە کوێرەکەی و قژێکی دەستکردی شینیشی کردبووە سەر و بەدەست و گەردنیەوە ملوانکە و بازنەی ئاڵتونی بەدی دەکرا.

"کاپتا"پۆشاکێکی وەك وەجاخزادە مەزنەکانی"تبس"لەبەر کردبوو، وەك ئەو کەسانەی کە متمانەیەکی تەواویان بەمەزنی خۆیان هەیە، ئاوا بەمتمانە بەخۆبونەوە هەنگاوی دەنا.

بەڵام کاتێك چاوی بەمن کەوت، لەخۆشیاندا هاواری کرد و وتی: ئەمڕۆ پیرۆز بکرێت، چونکە من لەڕۆژێکی ئاوادا، خاوەنەکەی خۆم دەبینم.

ئەوکات ویستی کڕنوش بەرێت، بەڵام بەبۆنەی وەرگە زلەکەیەوە دەستەکانی نەدەگەشتە سەر ئەژنۆی و لەباتی ئەوە لەسەر زەوی دانیشت و هەردوو پێی گرتم و دەستی کرد بەگریان.

---

[3] بڕۆ بۆ پەراوێزی ژمارە"٧١"ی بەرگی یەکەمی سینۆهە.

منیش ئەوم لەزەوی بەرز کردەوە و لەئامێزم گرت و لوتی خۆم خستە سەر ڕوخسار و شانەکانی و ئەویش لوتی خۆی خستە سەر ڕوخسار و شانەکانم و بەدەم هاوارەوە بەکڕیارانی ئەو مەیخانەیەی وت: ئەمڕۆ یەکێکە لەڕۆژە خۆشەکانی من و بەوبۆنەیەوە هەریەك لەکڕیارانی ئەم مەیخانەیە بەخۆڕایی یەکی پێکێك شەراب بخۆنەوە، بەڵام ئەگەر ویستیان پێکی دووەم بخۆنەوە، دەبێت نرخەکەی بدەن.

دوای ئەوە"کاپتا"منی بردە یەکێك لەژورە تایبەتەکانی ئەو مەیخانەیە و بە"مریت"ی وت: تۆش لەگەڵ گەورەم بمێنرەوە، چونکە ئەو تۆی زۆر خۆش دەوێت و ئەگەر لێی دور بکەویتەوە، خەمبار دەبێت.

"مریت"لەتەنیشت منەوە دانیشت و"کاپتا"ش دانیشت و"کاپتا"فەرمانی دا مراویەکمان بۆ ببرژێنن و بۆمان بهێنن، دوای چەند ساڵێك، جارێکی تر مراوی برژاوی"تبس"م -کە لەهیچ شوێنێکی ئەم جیهانەدا خواردنێکی بەو جۆرە خۆش بونی نیە-خوارد.

دوای ئەوەی نان خورا"کاپتا"وتی: خاوەنە خۆشەویستەکەم، من دەزانم کە تەواوی ئەو نامەو سەرژمێریانەی کە من لەماوەی ئەم ساڵانەدا لە"تبس"ەوە بۆم ناردویت، لەشاری"ئاسۆ"دا گەشتووەتە دەستت و تۆش ئاگاداری چۆناییەتی کارەکانی خۆتیت و پێویست بەوە ناکات لەئێستادا باسی کار و سەرژمێری ڕابردووت بۆ بکەم، بەڵام هیوادارم ڕێم پێبدەیت بەهای ئەو خواردن و شەرابەی کە ئەمشەو بەناونیشانی شیرنی هاتنی تۆ دام بەکڕیارەکانی خۆم، هەموو لەسەر تۆ بێت و هیچ خەمت نەبێت، چونکە من بەڕادەیەك لەبارەی باج و سەرانەوە دەستم بەپارەکانتەوە گرتووەو بەرپرسانی کۆکردنەوەی باج و سەرانەشم بەشێوەیەك هەڵخەڵەتاندووە کە بەهای میوانداری ئەمشەو بەلای تۆوە هیچ گرنگیەکی نیە.

من دەزانم کە"کاپتا"سروشتێکی پارەپەرستی هەیە، بۆیە هیچ ڕەخنەیەکم لێنەگرت، دوای ئەوەش"کاپتا"وتی: ئایا ڕازیت لەو نامە و سەرژمێریانەی کە بۆم ناردیت؟

وتم: "کاپتا"من نامە و سەرژمێریەکانتم بەدەست گەیشت بەڵام نەمتوانی هیچ شتێك لەسەرژمێریەکان تێبگەم، لەبەرئەوەی بەڕادەیەك ژمارەی تێدابوو کە مرۆڤی

گێژو وێژ دەکرد، من هەرئەوەی تەماشای ئەم سەرژمێریانەم بکردایە یەکسەر سەرم گێژی دەخوارد.

"کاپتا"شەرابێکی زۆری خواردبویە پێدەکەنی و"مریت"یش لەگەڵیدا دەستی کرد بەپێکەنین. "کاپتا"دوای ئەوەی پێکەنینەکەی تەواو بوو وتی: خاوەنە بەڕێزەکەم، من زۆر خۆشحاڵم بەوەی کە دەبینم وەك جاران کەسێکی دڵپاك و سادەیت و سەر لەکارە جدی و بنەچەییەکان دەرناکەیت، سەرەڕای ئەوەی نامەوێت بتشوبهێنم بە بەرازێك، چونکە هێشتا تۆ وەك ئەو بەرازە وایت کە ملوانکەیەکی ئاڵتونی لەبەرامبەردا دانراوەو هەروەك چۆن بەرازەکە نازانێت چی لەو ملوانکە ئاڵتونە بکات، تۆش بەهەمان شێوە نازانیت بەچ شێوەیەك ئاڵتونەکانت بخەیتە گەڕ، بۆیە تۆ دەبێت سوپاسی خودای میسر بکەیت کە خزمەتکارێکی وەك منیان داوە پێت، چونکە ئەگەر دزێك ببوایە بەخزمەتکارت، لەماوەیەکی کورتدا بێ پارەی دەکردی، لەکاتێکدا من دۆڵەمەندترم کردوویت.

وتم: "کاپتا"وابزانم پێویست بەوە نەکات کە من سوپاسگوزاری خوداکانی میسر بم، چونکە ئەوەی بووە هۆی ئەوەی من تۆ بکەمە خزمەتکاری خۆم، سەلیقەی جۆری هەڵبژاردنی من بوو، ئایا لەبیرتە کە لەو ڕۆژەدا لەگۆڕەپانی کۆیلەفرۆشکاندا تۆیان بەپایەیەکەوە بەستبویەوە و تۆش بەو ژنانەت ڕادەبوارد کەلەوێوە تێدەپەڕین و داوای ئاوجۆشت لە پیاوەکان دەکرد و هیچ کەسێك ئاوجۆی پێ نەدەدایت. لەبەرئەوەی یەکچاو و کەسێکی لاواز بویت، هیچ کەسێك گرنگی پێ نەدەدایت و تۆیان نەدەکڕی، بەڵام کاتێك من هاتمە ناو بازاڕی کۆیلەفرۆشەکانەوە، تۆم کڕی، چونکە لەوکاتەدا پزیشکێکی جوان و هەژار بوم و نەمدەتوانی نۆکەرێکی گرانبەها بکڕم.

کاتێك"کاپتا"گوێی لەقسەکانم بوو زۆر خەمگین بوو و ڕوخساری مۆن کرد و وتی: گەورەم، باش نیە کە تۆ یادگاریە کۆنەکان تازە بکەیتەوە، چونکە ئەم یادگاریانە جگە لەوەی من دڵتەنگ بکات و ڕاموەشێنێت هیچ سودێکی تری لێناوەشێتەوە، بەڵام دەربارەی سەروەت و سامانەکەت هەر بەوشێوەیەی پێم وتی: سەرەڕای بونی زەحمەتی بەردەوامی بەرپرسانی کۆکردنەوەی باج و سەرانە، دەوڵەمەندم کردیت و دوو نوسەری سریانیم دامەزراندووە کە تەنها سەروەت و سامانی تۆ بژمێرن، لەلایەکی ترەوە لەبەرئەوە ئەم نوسەرە سریانیانەم دامەزراند کە یەکەم باج

کۆکەرەوەکان زۆر متمانەیان پێدەکەن، دووەم: هیچ کاربەدەستێکی باج و سەرانە سەر لەسەرژمێری سریانیەکان دەرناکات، بگرە"ست"یش ناتونێت سەر لەژمێریاری نوسەرێکی سریانی دەربکات، ئەگەر تەواوی کاربەدەستانی"هورم هب"ی دۆستت، هاوکاری بکەن.

لەڕاستیدا لەبەرئەوەی باسی"هورم هب"کرا، دەبێت ئەوە بڵێم کە بەپێی ڕاسپاردنەکانی تۆ، بڕێك زێڕ و زیوم بەقەرز پێدا و دوبارە بەپێی ڕاسپاردنەکانی تۆ، بۆ وەرگرتنەوەی ئەو بڕە کانزایە نابێت زۆر پێداگری لەسەر بکەم، چونکە دەمزانی ئەگەر پێداگریم بکردایە، ئەوا میانەی هاوڕێیەتیتان تێك دەچوو.

سەرەڕای ئەوەی دەمزانی تۆ پیاوێکی کە هیچ ئاگایەکت لەسەروەت و سامانی خۆت نیە، دەبێت ئەوەت پێڕاگەیەنم کە بەهۆی پارەپەرستی و خزمەتگوزاریەکانم، تۆ لەمڕۆدا یەکێکیت لەدەوڵەمەندە مەزنەکانی میسرو سەروەتو سامانەکانی تۆ سەروەت و سامانی ڕاستەقینەیە، نەك زێڕ و زیو.

زێڕ و زیو، بەهۆی تێپەڕبونی کاتەوە نرخی دادەبەزێت، بەڵام زەوی و ئاژەڵ و ماڵو کەشتی و نۆکەر، هەرگیز نرخیان دانابەزێت و هەرچەنێك نرخی زێڕ و زیو کەم ببێتەوە، ئەوا لەبەرامبەردا بەهای زەوی و ماڵ و ئاژەڵ و کەشتی و نۆکەرەکان بەرزتر دەبێتەوە.

من دەزانم کە تۆ ئاگات لەسەروەت و سامانی خۆت نیە، لەبەرئەوە بەشێك لەزەوی و ماڵەکانتم کردووە بەناوی خزمەتکار و نوسەرەکانتەوە بۆئەوەی ئەو ڕادە سەروەت و سامانە مەزنەی تۆ لەبەرچاوی کاربەدەستانی کۆکردنەوەی سەرانە بشارمەوە.

چونکە ئەو باجەی فیرعەون دایناوە بۆ کەسە دەوڵەمەندەکان، بەتەواوی فشاری بۆ هێناون و کەسە هەژارەکان دەبێت یەك لەسەر پێنجی گەنمی خۆیان وەك سەرانە بدەن، بەڵام یەك لەسەر سێی داهاتی گەنم وەك باج و سەرانە لەدەوڵەمەندەکان وەردەگرن.

لەدەستدانی سوریا هەروەها ئەم سەرانە زۆر و قورسە، میسری بەتەواوی هەژار کردووە، بەڵام چەنێك میسر هەژار بکەوێت دەوڵەمەندەکان دەوڵەمەندتر و هەژارەکان داماوتر دەبن، ئەم بارودۆخە ئەو وڵاتانەش دەگرێتەوە کە تۆشی ئەم هەژاریە دەبێت.

بەلاّم تۆ"سینۆهە" لەڕیزی دەوڵەمەندەکاندایت و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ساماناکەت زیاتر دەبێت، دەبێت ئەوەشت پێ بڵێم کە بەشێك لەم سەروەت و سامانەت لەڕێی کۆکردنەوە گەنم بۆ کاتی گرانی، بەدەست هێناوە.

"کاپتا" دوای ئەوە قوّمێکی تری خواردەوە و وتی:

گەورەم، ئەو وڵاتانەی بەرەو وێرانی دەڕۆن، هۆکارەکەی ئەوەیە کە بەشێك لەزەویەکانی هیچ کشتوکاڵێکی تێدا ناکرێت و هەر بەوشێوەیە دەمێنێتەوە، هەروەها ئەمڕۆ لەمیسردا بەشێك لە زەویەکانی ئامون بەبیٚ گشتوکاڵ ماونەتەوە، بۆیە نرخی گەنم لەمحاڵەتانەدا بەرز دەبێتەوە، من زۆر زوو ئاگاداری ئەم حاڵەتە بوم و پەیم بەوە برد کە گەنم کالاّیەکە هەرگیز زەرەری تێدا ناکەیت، لەبەرئەوە هەموو ساڵێك لەچاو ساڵی ڕابردوودا گرانتر دەبێت.

ئەوەبوو دەستم بەکڕینی گەنم کرد و دوای هەر ساڵێك گەنمم بەنرخێکی زیاتر دەفرۆشت. ئێستا تێگەشتم کە فرۆشتنی گەنم، لەساڵی پاردا هەڵەیە و دەبێت گەنم لەئامبارەکاندا هەڵبگیرێت، چونکە هەموو مانگێك لەچاو مانگی پێشوو بەهای گەنم گرانتر دەبێت و کەسێك ئەمڕۆ گەنمی خۆی بفرۆشێت، هەرچەنێك گرانیشی فرۆشتبێت، هەڵخەڵەتاوە، لەبەرئەوەی لەسبەینێدا بەهای گەنم گرانتر دەبێت.

ئەوەبوو تا لەتوانامدا هەبوو گەنمم کڕی و ئێستا خەزێنەکانی تۆ پڕن لەدانەوێڵە، بەلاّم نایانفرۆشم، چونکە دەزانم نرخی گەنم گرانتر دەبێت.

"کاپتا"خواردنەوەی بۆمن و"مریت"تێکرد و وتی: من زۆر سوپاسی فیرعەون دەکەم و لەخودا داواکارم سەد کەڕەت سەد تەمنی بداتیٚ، چونکە فیرعەون هەرچی زیاتر بژیت، خەڵکی هەژارتر دەکەون و هەرچەنێکیش خەڵکی هەژارتر بکەون زیاتر ناچار دەبن زەوی و ژن و کوڕ و کچانی خۆیان لەپێناوی چەند کاسەیەك گەنمدا بفرۆشن، هەر لەبەرئەوەش ئێمە بەخۆڕا زەوی خەڵکیمان دەست دەکەوێت و کچان و کوڕان و ژنەکانیشیان، دەکەینە کەنیز و نۆکەری خۆمان.

"کاپتا"کەبەهۆی ئەم قسانەیەوە چست و چالاك بوبو وتی: پایەدار بێت فیرعەون و خوداکەی "ئاتون"کە دەوڵەمەندەکان مانگ لەدوای مانگ دەوڵەمەندتر و وەرز لەدوای وەرزیش هەژران داماوتر دەکات, ئەو هەلەش بۆ ئێمە دەڕەخسێنێت تا بتوانین تەواوی کێڵگە و باخ و ماڵەکانی میسر بکڕین و ژن و پیاوەکان بکەینە کەنیز و

نۆکەری خۆمان، بەڵام تۆ ئەی خاوەنە بەڕێزەکەم، نابێت وا لێکی بدەیتەوە کە من لەمرۆدا زیاد لەڕۆژانی ڕابردوو دزیت لێدەکەم و لێشت ناشارمەوە هەندێکات بەداخ دەبم، چونکە ئەوەندە دەستپاك و دروستکارم، ئەگەر ژن و منداڵم هەبوایە، بەدڵنیاییەوە بۆڵەو و گلەییەکی زۆریان لیّ دەکردم کە بۆچی سەروەت و سامانەکەت نادزم، چونکە ئەی خاوەنە خۆشەویستەکەم، سینۆهەی مەزنی من، هێشتا خوداکانی میسر خاوەنێکی وەك تۆیان نەهێناوەتە بون کە هێندە سادە بێت، ئەوان بۆیە تۆیان هێناوەتە بون تا مرۆڤ دزیت لیّ بکات.

بەقسەکانی"کاپتا"پێدەکەنیم و"مریت"یش بەهەمان شێوە پێدەکەنی،"کاپتا" وتی: گەورەم من ئەو سامانەی کە لەمرۆدا هەتە لەقازانجی، دانانی باج و خەرجە جیاوازەکانەوە بەدەست هاتووە.

خەرجە جیاوازەکان بریتین لەو بەرتیلانەی کە من داومە بە کارمەندانی کۆکردنەوەی باج و خەراج، بۆئەوەی ئەوان بکەمە یارمەتیدەرت....بەشێکی تر لەخەرجە جیاوازەکان بریتین لەو شەرابانەی کە دەرخوادی کارمەندانی کۆکردنەوەی باج و سەرانەم داون، بۆئەوەی کاتێك ژمێریارانی ئابوری و نوسەرانی میسر دێن بۆ پشکنین، سەریان گەرم ببێت و چاویان زاق بێت تا بەجوانی چاویان بەژمێریاری دارایی تۆ نەکەوێت.

"کاپتا" بەم شێوەیە بەردەوامی بەقسەکانی خۆی دا:

تۆ نازانی ئەم کاربەدەستانەی باج و سەرانەیە، دەتوانن چەنێك شەراب بخۆنەوە، بێئەوەی مەست بن و چاوەکانیان زاق ببێت. خەرجی جۆراوجۆر بریتیە لەو گەنمەی کە من هەندێکات دەمبەخشی بەسەر هەندێك هەژاردا بەتایبەت ئەو هەژارانەی کە دەزانم دەڕۆن بۆ هەموو شوێنێك و قسەی زۆر دەکەن، بۆئەوەی لەهەموو شوێنێکدا باسی چاکەی تۆ بکەن و بڵێن کە"سینۆهە"تەواوی سامان و گەنمی خۆی دەبەخشێتە نەتەوەکەی خۆی. ئەم کارەش زۆر پێویستە و یەکێکە لەهونەرەکانی دەوڵەمەند بون. دەوڵەمەندێك هەموو ساڵێك سەدها خێزان لەناو دەبات و دەست بەسەر زەویەکانیاندا دەگرێت و ژنان و پیاوانی خێزانەکان دەکاتە کەنیز و نۆکەری خۆی و بەکۆکردنەوەی گەنم لەخەزێنەکانداو هەڵگرتنی تەواوی ئازوقەکانی تر، نرخی شتەکان بەرز

دەکاتەوەو سەدها کەس لەبرساندا لەناو دەبات و لەبەرامبەردا ژوورەکانی خۆی پڕ دەکات لە زێڕ زیو.

لەبەرامبەر ئەوهەموو سودەدا، مشتێك گەنم یان بڕێك زێڕوزیو بەدەمەقرەوە دەدەن بەو کەسانەی دەڕۆن بۆ هەموو شوێنێك بۆئەوەی باسیان بکەن، تەنها بۆئەوەی ئەمانە بڵێن کە فلان دەوڵەمەند هەموو شتێکی خۆی بە هەژاران دەبەخشێت و شەو و ڕۆژ، بۆ دابین کردنی کەرەستەی ئاسایش و ئارامی هەژاران تێدەکۆشێت.

سودی ئەم هونەرە ئەوەیە کە یەکەم هەژاران و ئەوانەی بەدەستی تۆ، بەواتا بەدەستی من ستەمیان لێکراوە و بونەتە کۆیلە و کەنیزەی من و دەوڵەمەندەکانی تر ئیرەییت پێنابەن کە بۆچی دەوڵەمەندتر بویت. دووەم لەو ڕۆژەوەی کە بارودۆخی میسر تێك چووە و خودای"ئامون"لەناو چوو، هیچ کەسێك هەوڵی ئەوەی نەدا ئاگر لەخەزێنە گەنمەکانی تۆ بەربدات و ماڵەکانت وێران بکات یان هەوڵی کوشتنی تۆ بدات، لەبەرئەوەی ئەم نەتەوەیە تۆ بەکەسێکی مرۆڤ دۆست و چاکەخواز لەقەڵەم دەدات.

دوای ئەوەی"کاپتا"کۆتایی بەقسەکانی خۆی هێنا، دەستی خستە سەر سینەی و ئاشکرا بوو چاوەڕێی ئەوەی دەکرد ستایشی کارەکانی بکەم.

منیش وتم: "کاپتا"بەقسەکانی تۆدا دیارە کە ئێستا بڕێکی زۆر گەنم لەناو خەزێنەکانی مندایە.

"کاپتا" وتی: بەڵێ، تۆ لەمڕۆدا یەکێکی لەمەزنترین خاوەن گەنمەکانی میسر.

وتم: "کاپتا" ئێستا کاتی چاندنی گەنمە...

"کاپتا" وتی: بەڵێ و هەر لەبەرئەوەش گەنم زۆر ڕەواجی پەیدا کردووە.

وتم: تۆ دەبێت هەر ئێستا بڕۆیت بۆ لای ئەو جوتیارانەی کە لەزەویە کۆنەکانی "ئامون"دا سەرقاڵی کاری کشتوکاڵین و گەنمەکەی من دابەش بکەیت بەسەر ئەو کەسانەدا کە پێویستیان بەگەنمە، چونکە ئەمانە گەنمیان بۆ وەشاندن نیە، لەبەرئەوەی گەنمەکەی ئەوان توشی ئافات بوو و من بەچاوی خۆم بینیم کە گەنمەکەیان پەڵەی سوری وەك پەڵەی خوێنی پێوە بووە.

"کاپتا"وتی: گەورە و بەڕێزم تۆ خۆت بەم جۆرە نەخشە زیانبەخشانەوە ماندوو مەکە و بهێڵە من لەباتی تۆ بیر بکەمەوە و بڕیاری ئەوە بدەم، سەرەتا کاتێك

جوتیارەکان لەزەویەکانی"ئامون"دا دەستیان بەکاری کشتوکاڵی کرد، ئەوانەی خاوەنی خەزێنەی گەنم بون، گەنمیان تاکاتی خەرمان کوتان بەقەرز پێدەدان و بڕیاریان دابوو لەبەرامبەر هەر کاسە گەنمێکدا لەسەر خەرماندا دوو کاسە گەنم لەجوتیارەکان وەرگرنەوە. لەبەرئەوەی جوتیارەکان توانای ئەوەیان نەبوو قەرزەکەی خۆیان بدەنەوە، بۆیە لەبەرامبەر ئەوەدا خاوەن گەنمەکان دەستیان بەسەر ئاژەڵەکانیاندا دەگرت و کابرای جوتیاریش لەبەرئەوەی چیتر ئاژەڵی نەبوو بەتەواوی ورەی دەڕوخا.

بەڵام لەمڕۆدا گەنم بەڕادەیەك گرانە کە ئەگەر لەسەر خەرماندا لەبەرامبەر ئەو گەنمەی بەکابرای جوتیارت داوە دەست بەسەر هەموو ئاژاڵەکانیدا بگریت، هێشتا سودێکی وایان لێنابینیت، بەڵام ئەگەر ئەو گەنمەی کە هەڵتگرتووە لەبازاڕدا بیفرۆشی، ئەوا لەدەست بەسەراگرتنی ئاژەڵی کابرای جوتیار زیاتر قازانج دەکەیت. سەرەڕای ئەوەش گەنم قەرزدان بە جوتیار بۆئەوەی بیوەشێنێت، لەدیدی بازرگانیەوە هەڵەیە، چونکە پیشەکەی ئێمە پێویستی بەوەیە کە ئەمساڵ بڕێك لەزەویەکان کشتوکاڵی تێدا نەکرێت، بۆئەوەی نرخی گەنم بەرزتر ببێتەوە. لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە ئێمە نابێت گەنم بەقەرز بدەین بە جوتیارەکان، بۆئەوەی لەزەویەکانیاندا نەیوەشێنن، چونکە یەکەم ناتوانن لەکاتی سەر خەرماندا قەرزەکەمان بدەنەوە، لەبەرامبەر ئەمەشدا ئێمە دەبێت دەست بەسەر ئاژەڵەکانیاندا بگرین، ئەم کارەش لەقازانجی ئێمەدا نیە. دووەم: لەڕوی هزر و بیرەوە، ئەگەر زەویەك کشتوکاڵی تێدا نەکرێت باشتر و بەپیتتر دەبێت و بەهای گەنمیش لەهەمان کاتدا بەرز دەبێتەوە. سێیەم: خاوەن خەزێنەکان لەبەرامبەر ئەو هەڵوێستەماندا ڕقیان لێمان دەبێت و دەست بەڕقەبەرایەتیمان دەکەن، تەنها لەبەرئەوەی قەرزمان بەجوتیاران داوە.

لەوەڵامی"کاپتا"دا وتم: ئەوەی پێت دەڵێم بیکە، ئەویش ئەوەیە کە گەنمەکەم بەنێو جوتیاراندا دابەش بکە و پێیان بڵێ ئەم گەنمە بەناوی"ئەخناتون"و خوداکەی "ئاتون"ەوە پێتان دەدەم، چونکە من فیرعەونم خۆش دەوێت و هەرلەبەرئەوەش ڕێز لەخوداکەی دەگرم. من ئێسقانی ئەو جوتیارانەم بینیوە لەژێرپێستیانەوە، وەك پێستی ئەو نۆکەرانەی کە لەکانە کانزاکاندا کاریان دەکرد دەرپەڕیبوو. هەروەها مەمکی ژنانی جوتیارانیشم بینیوە کە وەك مەشکەیەکی وشكو بێئاو شۆڕ ببوویەوەو

نەیاندەتوانی شیر بەمنداڵەکانیان بدەن و منداڵەکانیشیانم بینی کە چاوەکانیان لەبرساندا قوڵ بوبو.

هەرلەبەرئەوەش دەبێت گەنمەکەم بدەیت بەجوتیاران و بڵێیت کە فیرعەون و خوداکەی ئەو"ئاتون"ئەم گەنمەم بەقەرز دەدات بەئێوە، بۆئەوەی سودی لێ وەرگرن و لەزەویەکانتاندا بیوەشێنن.

بەڵام من حەز ناکەم ئەم گەنمەیان بەخۆڕایی پێبدەم، چونکە لەوەوپێش ئەوە تاقیکراوەتەوە، کاتێك خەڵکی شتێك بەخۆڕایی بەدەست بهێنن، قەدری ئەو شتەیان لەبەرچاو نابێت و هەر لەبەرئەوەش جوتیارانی میسر نەیان توانیوە سود لەزەوی و ئاژەڵەکانی"ئامون"کە فیرعەون بەخۆڕایی پێی داون وەرگرن، لەکاتێك ئەگەر فیرعەون ئەم زەویانەی بەنرخێکی ئاسای بفرۆشتایە بە جوتیاران و بەهای ئەو زەویەی بەوەرزانە لێ وەرگرتایە "قست" باشتر بوو. لەمکاتەدا جوتیارەکان ناچار دەبون سود لە زەوی و ئاژەڵەکان وەرگرن و تەمەڵی و بێحەوسەڵەییان وەلاوە نێن. ئەو قەرزەی تۆ دەیدەیت بە جوتیاران دەبێت قەرزی بێ "سوو" بێت و پێشیان بڵێ لەبەرامبەر هەر کاسە گەنمێکدا، لەکاتی سەرە خەرماندا دەبێت هەر یەك کاسە گەنممان پێ بدەنەوە، هەروەها چاودێری ئەوەیشیان لێ بکە کە دەبێت ئەو گەنمە بوەشێنن.

کاتێك"کاپتا"گوێی لەم قسانە بوو هاواری کرد و یەخەی خۆی دڕی و وتی: گەورەم دوبارە هاتیتەوە و منت گرفتاری بەدبەختی کردەوە. بەچ شێوەیەك من دەتوانم لەبەرامبەر هەر کاسە گەنمێکدا کە دەیدەم بە جوتیار، لەسەرە خەرماندا دەبێت هەر یەك کاسە گەنمی لێ وەرگرمەوە؟ ئەگەر من لەبەرامبەر هەر کاسە گەنمێکدا تەنها یەك کاسە گەنم وەرگرمەوە، ئیتر دەبێت لەکێ دزی بکەم؟چونکە من ناتوانم دزی لە سامانەکەی تۆ بکەم، بۆیە دەبێت دەست بۆ سامانی خەڵکی درێژ بکەم.

من ناتوانم گەنم بەناوی فیرعەون و خوداکەی ئەو"ئاتون"بەقەرز بدەم بەجوتیاران، لەبەرئەوەی"ئامون"من دوچاری نەفرەت دەکات.

من لەترسی فیرعەون و بەرپرسەکانی ناتوانم بەئاشکرا بانگەشەی ئەم کارە بکەم، بەڵام لەبەرئەوەی لێرەدا هیچ بێگانەیەك نیە، ئەم قسەیە دەکەم و دەڵێم"ئامون"کە خودای ڕابردووە زۆر بەتوانایە و کاهینەکانی گەرچی بەڕوکەش دەستەڵاتیان نیە،

بەڵام ئێستا نەفرەتیان لەتەواوی جوتیاران و"ئاتون"کردووە و هەر لەبەرئەوەش جوتیارانی"ئاتون"برسیانە و زیان لەگەنمەکانیان دەکەوێت.

کاتێك"کاپتا"سەرقاڵی قسە کردن بوو، من بەهۆی گەرماوە قژە دەستکردەکەم لەسەرم لابرد، کاتێك"کاپتا" چاوی بەسەرە کەچەڵەکەم کەوت وتی: ئای گەورەم، ئایا سەری تۆش کەچەڵ بووە؟.....ئایا حەز دەکەیت دەرمانێکت پێ بدەم کە دوبارە موی سەرت بڕوێنێتەوە و قژێکی جوانتر لەجاران بەدەست بهێنی؟

ئەو دەرمانە یەکێکە لەباشترین ئەو دەرمانانەی کە لەمیسردا هاتووەتە بون و دروست کراوە و هێشتا پزیشکانی"ماڵی ژیان" لەبارەی ئەو دەرمانەوە هیچ زانیاریەکیان نیە و هەرکەسێك ئەو دەرمانەی بەکار هێنابێت دەرئەنجامێکی باشی لێ بەدەست هێناوە و لەبەرامبەر ئەو کارەمدا ڕێزێکی زۆریان لێگرتوم و تەنها یەکێك لەوانە سکاڵای کرد و وتی: بەهۆی بەکارهێنانی ئەو دەرمانەوە، موگەلێك ڕوواوە کە لەشێوەی توکی گیانەوەرەکان دەچێت و وەك موی ڕەش پێستەکان لولە.

"کاپتا" لەبەرئەوە ئەم باسەی هێنایە ئاراوە بۆئەوەی من بڕیارەکەی خۆم فەرامۆش بکەم، بەڵام من تێمگەیاند کە لەبڕیاری خۆم پاشگەز نابمەوە و گەنمی من دەبێت بەنێو جوتیارەکاندا دابەش بکرێت.

"کاپتا"تێگەشت کە گاڵتە ناکەم، بۆیە وتی: گەورەم، ئایا سەگێکی هار قەپی لێگرتوی یان چزی دوپشکێك بەجەستەتدا چەقیوە، بۆیە وا شێت بویت؟ ئەو بڕیارەی کە تۆ دەتەوێت بیدەیت، شکست بەئێمە دەهێنێت و دوبارە دەبێت بۆ بەدەست هێنانی نانێك دەست بەئەرك و گرفتەکانمان بکەینەوە.

منیش وەك تۆ لەبینینی ئەو جوتیارانەی کە ئێسقانەکانیان لەژێر پێستیانەوە دەرپەڕیوە دڵگران بوم، بەڵام من ناڕۆم بۆ ئەو شوێنانەی کە ئەم جۆرە کەسانەی تێدا بێت، ئەگەر لەشوێنێکدا ڕوبەڕوی ئەم جۆرە کەسانە ببمەوە ڕویان لێ وەردەگێرم، چونکە مرۆڤ تەنها بەو شتانە کاریگەر دەبێت کە دەیانبینێت و ئەگەر چاوی بەشتێکی کاریگەریش نەکەوێت دوچاری خەمباری نابێت، بۆیە یەکێك لەو شتانەی کە بووەتە هۆی مایەی خەمباری من ئەوەیە کە تۆ دەڵێیت من دەبێت بڕۆم و گەنم بەنێو جوتیاراندا دابەش بکەم و ئەمەش کارێکی ماندوکەرە، چونکە کێڵگەکانی میسر، لەکەنار ڕوباری "نیل"دا قوڕ و زەلکاو و نەیجەڵانە و هەر بەوهۆیەوە پێم دەچەقێتە ناو

قوڕ و لیتەوە و دەکەوم، یان نوقمی یەکێك لە جۆگەلە ئاوەکان دەبم، لەبەرئەوەی ئێستا کەسێکی لاو نیم بۆئەوەی بتوانم بەرگەی ماندویەتیەکانی ڕابردوو بگرم.

وتم: "کاپتا"لەڕابردوودا درۆت دەکرد و من وام دەزانی لەبەرئەوەی ئێستا دەوڵەمەند بویت، دەستت لەدرۆ کردن هەڵگرتووە، بەڵام دەبینم هەروەکو ڕابردوو درۆزنی. تۆ ئێستا لەڕابردوو لاوتر دێیتە بەرچاو، چونکە لەڕابردوودا دەست و پێکانت دەلەرزین، بەڵام ئێستا دەستەکانت نالەرزن، لەڕابردوودا چاوەکانت سور وەردەگەڕا، بەڵام لەمرۆدا وەکوو جاران سور نابێتەوە، جگە لەو کاتانەی کە دەخۆیتەوە. لەبەرئەوەی من پزیشکم ئەم گەشتە بۆ تۆ کە زۆر قەڵەو بویت بەگرنگ دەزانم، چونکە قەڵەوی فشار دەخاتە سەر دڵت و هەناسە بڕکێت پێدەخات. بەڵام بەهۆی ڕێکردنەوە ئەم قەڵەویەت کەمتر دەبێتەوە و وەك ئێمە دەتوانی بەچالاکی ڕێ بکەیت. ئایا لەبیرتە کاتێك لەجادەکانی"بابل"دا پیاسەمان دەکرد، تۆ چەنێك چالاك بویت، ئایا لەبیرتە کاتێك بەنێو کێوەکانی"لوبنان"دا کۆچمان دەکرد، بەچ خێراییەك بەسەر کیوەکاندا سەر دەکەوتیت، ئەگەر پزیشکی تایبەتی فیرعەون نەبوایەم، لەگەڵ تۆدا کۆچم دەکردو سەردانی جوتیارانم دەکرد و گەنمم بەنێویاندا دابەش دەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی پزیشکی تایبەتی فیرعەونم، لەوانەیە هەموو ڕۆژێك کاری بەمن هەبێت و منیش ناتوانم"تبس"بەجێ بهێڵم. دواجار"کاپتا"خۆی دا بەدەستەوەو ڕازی بوو بەوەی بەپێی فەرمانەکەم ڕفتار بکات. ئێمەش تا ئەوکاتەی بەشێك لەشەو تێپەڕی بەیەکەوە خواردمانەوە و"کاپتا" باسی یادگاری گەشتەکانی ڕابردوی بۆ دەکردمەوەو هەندێجاریش من"مریت"م دەهێنایە پێکەنین و"مریت"یش سینەی خۆی ڕوت کردبویەوە بۆئەوەی من بتوانم دەست بەسەر سینە ڕوتەکەیدا بهێنم، کاتێکیش "کاپتا" بەتەواوەتی ماندوو بوو و دەیویست بڕوات بۆئەوەی بخەوێت...."مریت"یش پێی وتم: ناهێڵیت منیش بکەڕێمەوە بۆئەوەی بخەوم.

مریت گوزەی لەگەڵمدا نەشکاندبوو[4]، بەڵام لەوشەوەدا ئەوەند سۆزو خۆشەویستی خۆیی بۆ دەربڕیم کە وامدەزانی هەرکاتێك ژنێك گوزەم لەگەڵدا بشکێنێت بەوشێوەیە سۆز و خۆشەویستی خۆیم بۆ دەرنابڕێت.

---

[4] بەواتا نەبووەتە ژنی یاسایی ئەو.

کاتێك لەوشەوەدا لێم پرسی: "مریت"ئایا تۆ ئامادەی گۆزەم لەگەڵدا بشکێنی؟

ئەو ژنەش لەوەڵامدا وتی: "سینۆهە"لەبەرئەوەی تۆ پزیشکی فیرعەونیت، خۆم بەشایستەی تۆ نازانم، چونکە من بەخزمەتکارێکی مەیخانە لەقەڵەم دەدرێم و خوشکی تۆ"بەواتا هاوسەرەکەی تۆ" دەبێت ژنێك بێت کە ئەوت لە مەیخانە، لەکاتی خزمەتکردنی مەیخۆراندا نەبینیبێت.

بەیانی ڕۆژی دوایی دەبوو بڕۆشتمایە بۆ لای دایکی فیرعەون کە خەڵکی "تبس"زۆر لێی دەترسان، پێش ئەوەی بەرەو ڕوی کۆشکەکەی ئەو بکەومە ڕێ، گەڕامەوە بۆ لای کەشتیەکەم، بۆئەوەی پۆشاکێکی کەتانی لەبەربکەم و ئەوکات بەسەر ئەو جلە کەتانانەوە ملوانکەی زێڕین و"خاچی ژیان"م بەگەرندنمدا ئاوێزان بکەم.

کاتێك سەرقاڵی گۆڕینی جلەکانم بوم"موتی"خۆی کرد بەژوردا و وتی: گەورەم، ئەو ڕۆژە پیرۆز بکرێت کە تێیدا گەڕایتەوە بۆ"تبس"، بەڵام دوێنێ شەو تۆ وەك هەموو خەڵکی ڕەفتارت کرد و لەباتی ئەوەی بێیتەوە بۆماڵ و ئەو خواردنە خۆشانەی کە من بۆ تۆ ئامادەم کردبوو بخۆیت، ڕۆشتویت بۆ مەیخانە و کاتەکانت لەگەڵ ئەو ژنەدا–مەبەستی مریت بوو– گوزەراندووە.

من دوێنێ شەو دوای ڕۆشتنی تۆ، نۆکەرەکانم هانی پاککردن و ئامادەکردنی ماڵەکەی تۆداو ئەوەی تەمەڵی بکردایە بەقامچی دەکەوتمە گیانی تەنها بۆئەوەی ماڵەکەت زووتر بۆ ئامادە بکرێت و تۆ بتوانی لەشەودا بگەڕێیتەوە بۆ ماڵەکەت، بەڵام نەهاتیت و هەرلەبەرئەوەش ئێستا هاتم بەدواتدا و دەمەوێت بتبەمەوە بۆ ماڵ بۆئەوەی ئەو خواردنەی کە ئەمڕۆ بەیانیەکەی بۆم ئامادە کردویت بخۆیت، ئەگەر ناشتوانی لەم ژنە دور کەویتەوە، ئەوا باشتروایە ئەویش لەگەڵ خۆتدا بهێنیت بۆ ماڵەکەت، چونکە هێنانی ئەم ژنە بۆماڵ لەوە باشترە لەوەی بۆ سەردانی کردن و بینینی بڕۆیت بۆ مەیخانە و لەو ماڵەی کە بۆ تۆ جێی ئاسایش و ئارامیە دور بکەویتەوە.

من دەمزانی کە"موتی"ستایشی جوانی"مریت"دەکات و ئەو بەژنێکی شایستە هاوڕێیەتی لەقەڵەم دەدات، بەڵام خوی بەوەوە گرتبوو کە بەوشێوەیە قسە بکات و نەیدەتوانی شێوازی گفتوگۆ و قسەکردنی بگۆڕێت. هەرلەبەرئەوەش کەسێکم نارد بۆ مەیخانەکە بۆئەوەی بە"مریت"بڵێت زوو بکەوێتە ڕێ و بێت بۆ ماڵەکەی من،

چونکە"موتی"خزمەتکارم لەماڵەکەی مندا ئاهەنگێکی بچوکی بەبۆنەی گەڕانەوەم بۆ"تبس"ئامادە کردووە.

سواری کەژاوەکە بوم و بەرەوماڵ کەوتمە ڕێ و"موتی"یش لەتەنیش کەژاوەکەمەوە هەنگاوی دەنا و دەیوت گەورەم من وامدەزانی دوای ئەوەی لەشاری "ئاسۆ"دا نیشتەجێ بویت و شوێن نیشتەجێکەت ئامادە کرا، پیاوێکی ئارامت لێ دەردەچێت، بەلام دەبینم لەڕابردوو زیاتر ئاشقی و ئەوەندە بەژنانەوە پەیوەستی کە هەرئەوەی گەشتیتەوە"تبس"بەرەو مەیخانەکە ڕۆشتیت، بۆئەوەی خۆت بگەیەنێتە لای ژنەکان.

کاتێك تۆ لە"ئاسۆ"وە هاتی، چاوەکان درەوشاوە و گۆنایەکی خڕت پێوە بوو، بەلام بەهۆی ئەوەی تەنها شەوێکت لەگەڵ ئەو ژنەدا بردە سەر، گۆناکانت تەپین و چاوەکانیشت ڕەش داگەڕاون. ئەمە ئەوە نیشان دەدات کە تۆ لەبەرامبەر ژناندا ئارەزویەکی ناکۆتا و دانەمرکاوت هەیە، چونکە ئەو پیاوەی بەڕێك و پێکی لەگەڵ ژناندا ڕابوێرێت، لەشەوێکدا بەوشێوەیە گۆڕانکاری بەسەردا نایەت....بەلام زۆربەی پیاوەکان بەوشێوەیەن و حەز دەکەن بەردەوام لەگەڵ ژناندا ڕابوێرن.

تا ئەو کاتەی لەماڵ نزیك بوینەوە"موتی"هەر بەوشێوەیە خەریکی قسە کردن بوو، تا ئەوکاتەی پێم وت: ژنەکە، ئەوەی تۆ باسی دەکەیت، لەگوێی مندا وەك وزە وزی مێش دەنگ دەداتەوە، دە بێدەنگ بە.

"موتی"یش بێدەنگ بوو بەلام من دەمزانی کە خۆشحاڵە، چونکە توانیویەتی من بگەڕێنێتەوە بۆ ماڵ کە خۆی و نۆکەرەکان بەگوڵ ڕازاندبویانەوە و"موتی"بۆ دورکردنەوەی بەلاکان، لاشەی پشیلەیەکی تۆپیوی بەرەو ماڵی دراوسێکەمان فڕێدا و چەند منداڵێکی بۆ ئەوە ئامادە کردبوو کە کاتێك خۆم بکەمەوە بەماڵدا هەمویان پێکەوە بڵێن"پیرۆز بێت ئەو ڕۆژەی کە گەورەمانی تێدا گەڕاوەتەوە"

"موتی"لەبەرئەوە ئەم مندالانەی بۆ ئەم کارە ئامادە کردبوو، چونکە حەزی دەکرد من ببمە خاوەنی منداڵ و دەیوت، ئەو ماڵەی منداڵی تێدا نەبێت چوست و چالاکی و خۆشیشی تێدا بەدی ناکرێت.

بەلام ئەو بەمەرجێك ئارەزوی ئەوەی دەکرد ببمە خاوەنی منداڵ، کە هیچ ژنێك نەهێنمەوە بۆ ماڵ، چونکە"موتی"بەرگەی ئەوەی نەدەگرت لەماڵەکەمدا چاوی بەژنێك

بکەوێت، هەروەها لەبەرئەوەی بێ ژن منداڵ نایەتە بون، من نەمدەتوانی ببمە خاوەنی منداڵێك، لەهەمان کاتدا ئارەزوی "موتی" بهێنمە دی.

کاتێك منداڵەکان بەدەنگێکی بەرز ئەو ئاهەنگەیان چەندجارێك دوبارە کردەوە و وتیان: "پیرۆز بکرێت ئەو ڕۆژەی کە گەورەمانی تێدا گەڕاوەتەوە"...منیش چەند ئەنگوستیلە مسێکم بەنێویاندا دابەشکردو "موتی" چەندنانێکی شیرین کە بەهەنگوین لێنرابوو بەسەرمنداڵەکەکاندا دابەشکردو منداڵەکانیش لەوکاتە بەدڵخۆشیەکەوە ڕۆشتن.داوای ئەوەی خۆم کرد بەماڵدا، ئەو جۆرە خواردنانەی کە تەنها لە"تبس" لێدەنرێت و من هاوشێوەی ئەو جۆرە خواردنەم لەهیچ وڵاتێکی تردا نەبینیوە، ئامادە کردبوو.

منو"مریت" دەستمان کرد بەنان خواردنو"مریت"دووجار بەدڵسۆزیەوە دەستخۆشی لەخواردنی"موتی"کرد بەشێوەیەك کە ئەو ژنەی زۆر خۆشحاڵ کرد، بەڵام بۆئەوەی ئەم خۆشحاڵیەی خۆی بشارێتەوە، دەم و چاوی خۆی دابەیەکدا و وا خۆی نیشان کە دەستخۆشیەکانی ئەوی پێ خۆش نیە.

لەکاتێدا نانخواردن لەوماڵەدا-کەماڵی من و پێش منیش هی مسگەرێك بوو- بەشێوەیەك لەتەنیشت"مریت"ەوە بەلای منەوە بەخۆشی تێدەپەڕی، ڕومکردە کاتژمێرەکەو وتم: ئەی ترازوی ئاوی، میلی کاتژمێرەکانت ڕاوەستێنە، بۆئەوەی ساتەکان هەر بەوشێوەیە بمێنێتەوە و لەناو نەچێت، چونکە دەزانم هەرکاتێك ئەم ساتانە لەناو بچن لەوانەیە چیتر هاوشێوەی ئەم ساتانە بەدەست نەهێنمەوە.

خواردنی نان لەو ماڵەدا لەگەڵ"مریت" بەو شێوەیەش ڕوداوێکی گرنگ نیە کە من باسی بکەم، بەڵام لەبەرئەوە باسی ئەم بابەتەتان بۆ دەکەم کە مرۆڤ کاتێك بۆ بەدەست هێنانی خۆشبەختی دەکەوێتە ڕێ و سەرتاپای جیهان دەگەڕێت، کاتێك دەگەڕێتەوە بۆماڵ تێدەگات ئەو خۆشبەختیەی کە ئەو بەدوایدا دەگەڕێت لەماڵەکەی خۆیدایەتی و بێهودە بەجیهاندا گەڕاوە بۆئەوەی ئەو خۆشبەختیە بەدەست بهێنێت.

دوای ئەوەی نانەکەمان خوارد، بینیم کۆمەڵێك لە هەژارانی ئەو ناوچەیە و هەندێك لەو نەخۆشەکانی ڕابردوم، کە ئەوانیش لەڕابردوودا هەژار بون، بەڵام وادیارە هەندێکیان بونەتە خاوەن سامان و جلوبەرگی نوێیان لەبەرکردووە لەهەیوانەکەدا کۆبونەتەوە.یەکێك لەوانە بەنوێنەرایەتی ئەوانی تر وتی: "سینۆهە" تا ئەوکاتەی تۆ

لەم ناوچەیەدا بویت و بەخۆڕایی چارەسەرت دەکردین، ئێمە ڕێزو پێزانینمان بۆ ئەوکارە مرۆڤ دۆستانەیەت نەبوو، بەڵام دوای ئەوەی لێرە ڕۆیشتی تێگەشتین کە بونی تۆ چەنێك بۆ ئێمە بەسود بووە و ئێستاش کە گەڕاویتەتەوە بەبینینت زۆر خۆشحاڵین و ئەم ڕۆژە کە ڕۆژی گەڕانەوەی تۆیە بەپیرۆز دەزانین. دوای ئەوە ئەو دیاریانەی بۆ منیان هێنابوو پێیان دام. ئەو دیاریانە بەهایەکی ئەوتۆیان نەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی لەڕوی دڵسۆزیەوە ئەنجام دەدرا منی خۆشحاڵ کرد و ئاگاداری ئەوە بووم کە هەندێك لەهەژارانی ئەو گەڕەکە لەڕابردوو هەژارتر بون، چونکە خودای تازەی فیرعەون چەند گرفتێکی بۆ دروست کردون کە زیانی گەیاندووە بە کار و کاسپیان.

یەکێك لەهەژارەکان قاپێك ئاردی"سوس یان کەپك"[5]ی بۆ هێنام و"سوس یان کەپك"یش خواردنی ئەو کەسانە بوو کە توانای کڕینی گەنمیان نیە. هەژارێکی تر باڵندەیەکی بۆ هێنابوم کە بە بەرد ڕاوی کردبوو. پیاوێکی تر چەند خورمایەکی وشکی خستە بەردەمم و لاوێکی هەژاریش گوڵێکی پێ بەخشیم.

لەنێو نەخۆشەکانی خۆمدا، نوسەر و عەریزە نوسێکی بەتەمەنم لەنێویاندا بینی کە سەری دانەواندبوو، ئاوسانێك لەقوڕگیدا بەدی دەکرا، سەرم لەبینینی سوڕما، چونکە چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد کە ئەو تائێستا زیندوو مابێت، هەروەها ئەو نۆکەرەی کە تیماری پەنجەییم بۆ کردبوو بینی و ئەویش پەنجەی خۆیی پێنیشان دام بۆئەوەی بزانم بەتەواوەتی چارەسەر کراوە. یەکێکی تر لەنەخۆشە کۆنەکانم کچێکی لەشفرۆش بوو کە لەشی هەراج فرۆش دەکرد، من لەڕابردوودا چارەسەری چاویم کردبوو، ئەویش تەواوی هاوکارەکانی بۆلای من ناردبوو بۆئەوەی چارەسەری گرفتە جەستەییەکانیان بۆ بکەم. ئەو کچەی کەلەم چەند ساڵەی دواییدا ژنێکی تەواو و قەڵەوی لێ دەرچوبوو، بەیەکێك لە کەسە نەخۆشەکانی من لەقەڵەم دەدرا کە من ئەوم بە کەسێکی دەوڵەمەند دەهاتە بەرچاو، چونکە ئەو ژنە سامانێکی زۆری هەبوو و ئەو کانزایانەی لەڕێی لەش فرۆشیەوە کۆکردبوەوە و چەند فرۆشگایەکی پێکڕی بوو، یەکێك لەو فرۆشگایانەیەی کرد بە فرۆشگای عەتر فرۆشتن، لەهەمان ئەو کاتەی عەتری دەفرۆشت ناونیشانی ئەو ژنە جوانانەی کە ئامادە بون لەشفرۆشی بکەن و

---

[5] سوس یان کەپك: ئەو ئاردە بێژراوەیە کە لەکاتی بێژانی ئارددا لەناو هێڵەکی ئارد بێژانەکەدا دەمێنێتەوە.

لەشیان بەنرخێکی هەرزان هەراج بکەن، دەدا بەکرپیارەکانی. من دیاری هەمویانم بەخۆشحاڵیەکەوە ورگرت، لەبەرئەوەی هەندێك لەو هەژارانەی کە ئەو ڕۆژە هاتبون بۆ ماڵی من، نەخۆش بون و پێویستیان بە چارەسەرکردن دەکرد، بۆیە پێویستی بەوە کرد جلە کەتانەکانم داکەنم و دەست بەچارسەرکردنیان بکەم.

"مریت"یش جلێکی تری لەبەرکرد بۆئەوەی بتوانێت هاوکاریم بکات و برینی نەخۆشەکانی بۆ دەشۆردم و چەقۆکانیشم بۆئەوەی پاك ببنەوە دەخستە سەر ئاگر یان تلیاکی دەکردە ناوڕەگی خوێنبەری ئەوکەسانەی کەدەبوو ددانیان هەڵبکێشرێت، بۆئەوەی هەست بەئازاری هەڵکێشانیان نەکەن. من ئاگاداری ئەوە بووم کە نەخۆشکانم بگرە ژنەکانیش زۆر خۆشحاڵ بون بەوەی"مریت"یان دەبینی سەرقاڵی هاوکاری کردنی منە، چونکە "مریت" لەش و لارێکی جوانی هەبوو و هیچ جۆرە پۆشاکێك ڕێی لەبینینی جوانی لاشەی نەدەگرت.

کاتێك سەرقاڵی چارەسەرکردنی هەژاران بوم، لەناکاو خۆمم بەهەمان ئەو "سینۆهە"یە بینیەوە کە لەکۆندا هەژار بوو چارەسەری نەخۆشەکانی دەکرد، هەروەها لەبەرئەوەی من هێشتا بەهۆی سامان‌و پلەوپایەو نیشتەجێ بون لەدیواخانێکدا، کەسێکی بۆگەن وگەندەڵم لێدەرنەچووە، خۆمم بەکەسێکی زۆر خۆشبەخت دەبینی، هەروەها ئەوەی کە"مریت"ی جوان بۆ چارەسەرکردنی کەسە نەخۆشەکان هاوکاریم دەکات هەستی خۆشبەختی لا زیاتر کردم‌و دوبارە لەبەرخۆمەوە بەترازوم وت: ئەی ترازوو، ڕەوتی ئاوەکەی خۆت ڕاوەستێنە، چونکە ئێستا خۆم بەکەسێکی خۆشبەخت دەبینم و دەترسم ئەم ساتە خۆشبەختانەم تێپەڕن و بڕۆن و چیتر جارێکی تر بەدەستیان نەهێنمەوە. کاتێك دوای ئەوەی نەخۆشەکانم چارەسەر کردو لەماڵەکەم ڕۆشتنە درەوە، ئاگاداری ئەوە بوم کە خۆر لەئاسۆی ئاوابون نزیك بووەتەوە، لەکاتێکدا هێشتا نەڕۆشتوم بۆ ماڵی دایکی فیرعەون.

"مریت"زانی من دەبێت بڕۆم بۆ ماڵی دایکی فیرعەون، بۆیە ئاوی بۆ هێنام و منیش خۆمم پێ شۆری و لەجل لەبەرکردندا هاوکاری کردم و ئاڵتون و خاچی ژیانیشی کردە ملم، کاتێك ویستم لەماڵ بڕۆمە دەرەوە وتی: "سینۆهە"لەماڵی دایکی فیرعەون زۆر مەمێنەرەوە، هەوڵی گەڕانەوە بدەیت، چونکە حەسیری ماڵ چاوەڕێت دەکات.

*بەشی سی و چوارەم*

## دایکی فیرعەون

بۆ ڕۆشتنم بۆ ماڵی دایکی فیرعەون دەبوو سواری کەشتی بومایە، لەسەر کەشتیەکەدا دانیشتم و بە سەوڵ لێدەرەکانم وت، بەهەموو هێز و تواناتانەوە سەوڵ لێبدەن، ئەگەر پێش ڕۆناکبون و هەڵهاتنی ئەستێرەکانی ئاسمان، بگەیەننە کۆشکی دایکی فیرعەون، لەبەرامبەردا زێڕتان پێ دەدەم.

سەوڵ لێدەرەکانیش بەخێراییەك سەوڵیان لێ دەدا کە لوتی کەشتیەکە لەکاتی لەتکردنی ئاودا دوو دیواری ئاوی لەهەردوو لای کشتیەکەوە دروست دەکرد و هێشتا یەکەمین ئەستێرە لەئاسماندا دانەگیرسابوو، خۆم گەیاندە کۆشکی دایکی فیرعەون.

پێش ئەوەی بڵێم دایکی فیرعەون بەچ شێوەیك پێشوازی لێکردم و چی پێوتم، دەبێت ئەوە بهێمەوە یاد کە ئەو دوو جار لە"تبس"ەوە هاتووە بۆ شاری"ئاسۆ"، بەڵام لە"ئاسۆ"دا نەماوەتەوە، چونکە ڕقی لەو شارە بوو، وە ڕەوشی کوڕەکەی لەبارەی ئەو خودا تازەیەوە لا پەسەند نەبوو، دەیوت: خودای نوێ سیستەمی ژیانی لەمیسردا تێکئاڵاندووە، خەڵکی ناڕازی کردووە، بەڵام فیرعەون لەبەرئەوەی دایکی زۆر خۆش دەویست، هیچ کات دەمەقرەی لەگەڵدا نەدەکرد.

نەریت ئەوەیە کاتێك کوڕێك دەگاتە تەمەنی باڵق بون، لەبەرامبەر دایکیدا کەڕ و کوێر دەبێت، تا ئەو ڕۆژەی ژن دەهێنێت و ژنەکەی چاو و گوێی بۆ بکاتەوە، بەڵام"نفر تی تی"هاوسەری فیرعەون کە کچی"ئامی"کاهینی مەزنی"ئاتون"بوو بەهۆی باوکیەوە نەیدەتوانی چاو و گوێی فیرعەون بکاتەوە. چونکە دەیزانی باوکی کاهینی مەزن لەگەڵ"تی ئی"وەك خوشك و برا وابوون و هەموو جارێك کاهینی مەزن بۆئەوە دەڕۆشت بۆ کۆشکی فیرعەون، تا لەگەڵ"تی ئی"دا دەست بەگفت و گۆکردن بکات.

ئەم بابەتە هەموو کەسێك بگرە پاسەوانانی دەروازەی کۆشکیش-ئەو کۆشکەی کە دایکی فیرعەونی تێدا نیشتەجێ بوو-دەیانزانی و تەنها فیرعەون لەشاری "ئاسۆ" ئاگاداری ئەم بابەتە نەبوو و بگرە هەندێکەسیش دەیانوت دوایین کچی "تی ئی" منداڵی کاهینی مەزنە، نەك فیرعەون.

من لەوباوەڕەدا بوم لەو ڕۆژەوەی میسر و فیرعەون هاتووەتە بون، بێ لەبابەتە دەگمەنەکان، دایکی فیرعەونەکان خوڕەوشتێکی وایان هەبووە و لەمڕێیەوە بوونەتە خاوەنی چەند منداڵێکیش، بەڵام نەدەگەیشتە دەست ئەو کەسانەی کە لەئایندەدا دێن.

چونکە ئەو کەسانەی لەهەر سەردەمێکدا بن و ئاگاداری ئەم بابەتە بن، لەسەر کاغەزەکان تۆماریان ناکەن، بۆئەوەی ئەو کەسانەی کە لەئایندەدا دێن لێی ئاگادار نەبن، بەڵکو ئەم نهێنیەیان لەلای خۆیان دەپاراست و کاتێك دەمردن، نهێنیەکانیشیان لەگەڵیاندا لەناو دەچێت و لەهەموو قۆناخێکدا بۆنمونە لەم قۆناخەدا بەو شێوەیە و ئەوەی تێدا نانوسرێتەوە کە دایکی فیرعەون بەچ شێوەیەك ڕەفتار دەکات، بۆئەوەی خەڵکی و ئەوانەی لەئایندەدا دێن لێی ئاگادار نەبن، بەڵام لەهەموو قۆناخێکدا ئەوانەی کە لەدیواخانی میسردا دەژین، ئاگاداری ئەم بابەتەن و ئاشکرایە منیش کە پزیشکی فیرعەونم ئاگاداری ئەم بابەتەم.

لەو ڕۆژەوەی"ئەخناتون"خودای تازەی بەسەر خەڵکیدا سەپاندووە، کاهینەکانی خودای کۆن دەڵێن بگرە خودی"فیرعەون"یش کوڕی باوکی خۆی نیە و"تی ئی" ئەوکاتانەش کەباوکی "ئەخناتون" هێشتا نەمردبوو بەوشێوەیە ژیاوە و "ئەخناتون"ی کوڕیشی بەزۆڵی لەدایك بووە.

من ناوێرم لایەنگری ئەم بوختانە بکەم، چونکە من لەوباوەڕەدام فیرعەون کوڕی خوداکان و فەرمانڕەوایی میسرە و بریتیە لە بەهرەیەك کە خودایان داویانەن بە فیرعەونەکان.

بەڵام لەبیرمە کە لەسەردەمی ژیانی فیرعەونی ڕابردوودا-بەشێوەیەك کە هێشتا باسی خودای نوێ نەهاتبووە ئاراوە-بۆئەوەی کاهینەکانی"ئامون"دژایەتی فیرعەون بکەن، باسی ئەوە دەکرا کە ئەم کوڕە کوڕی باوکی خۆی نیە.

بەهەرحاڵ لەو ڕۆژەدا، دوای ئەوەی خۆم کرد بەکۆشکی فەرمانڕەواییدا"تی ئی"دایکی فیرعەون لەژورێکدا پێشوازی لێکردم کە قەفەسگەلێکی زۆری بەدیوارەکانیەوە هەڵواسی بوو، لەهەر قەفەسێکدا، چەند باڵندەیەکی تێدا بەدی دەکرا و هەندێکیشیان هەوڵی فڕینیان دەدا.

"تی ئی"ئەو سەردەمانەی کە کچێکی بچوك بوو، زۆر حەزی لە گرتنی باڵندە دەکرد و هەموو ڕۆژێك کەتیرەی لکێنەری بەلقەدارەکاندا دەسووی بۆئەوەی کاتێك باڵندەکان بەسەر چلەدارەکانەوە دەنیشتنەوە، نەتوانن جارێکی تر بفڕنەوە و ئەویش بیانگرێت و دوای ئەوە بیانخاتە ناو قەفەسەوە، لەوڕێگەیەشەوە هەندێکات خۆی بەم یاریەوە سەرقاڵ دەکات.

کاتێك خۆم کرد بەناو ژوری"تی ئی"دا خەریکی چنینی حەسیرێك بوو کە چەند نەخشەیەکی ڕەنگاوڕەنگی لەخۆ دەگرت، پێی وتم"سینۆهە"بۆچی ئەوەندە درەنگ هاتی؟ مەگەر بڕیار نەبوو ئەمڕۆ بەیانیەکەی بێیت بۆ ئێرە؟

وتم: کوڕەکەت هەندێك کاری پێ ڕاسپاردبوم و پێی وتبوم دوای ئەوەی گەشتمە "تبس" بەئەنجامیان بگەیەنم و دوای ئەوە بڕۆ بۆ لای دایکم، ئەگەر بەیانیەکەی بهاتایەم بۆ ئێرە، ئەوکات ناچار دەبوم فەرمانی کوڕەکەت لەکاتێکی درەنگتردا ئەنجام بدەم و تۆ دەزانی کە ئەم درەنگ پێکردنە کارێکی پەسەند کراو نیە.

"تی ئی"وتی: ئایا کوڕەکەم نەخۆشیەکەی بەتەواوی چارەسەر کراوە، یان وەکوو جاران هەر شێتە؟

وتم: مەبەستت چیە؟

"تی ئی"وتی: من وا دەزانم کە ئەو هێشتا شێتە، چونکە تەنها شێتێك، بەوشێوەیەك لەدەوروبەری"ئاتون"دا دەنگە دەنگ دەنێتەوە و دەبێتە مایەی ناڕەزایی خەڵکی.

ئەوکات پرسی: "سینۆهە" تۆ کە سەرکونتێکەری فەرمانڕەواییت، بۆچی کۆن ناکەیتە سەری و ئەم شێتیە لەسەریدا دەر بکەیت؟

وتم: فیرعەون نەخۆش نیە، تا سەری بۆ کون بکەن، و بۆئەوەی"تی ئی"درێژە بەم گفتوگۆیە نەدات، باسی بارودۆخی فیرعەون و یاری کچەکانی و ئاسك و سەگەکانی

کۆشکی فەرمانڕەوایی شاری"ئاسۆ" و لێخوڕینی بەلەم و کەشتی بەسەر ئاوی ڕوبار و هەندێ شتی ترم بۆ کرد.

بەشێوەیەك باسی ئەم جۆرە شتانەم بۆکرد کە"تی ئی"بابەتی شێت بونی فیرعەونی هەر لەبیر چویەوە، ئەوکات ڕێیدا لەبەرامبەر دەزگای حەسیر چنینەکەیدا دانیشم و بەخزمەتکارەکانی خۆی وت ئاوجۆم بۆ بهێنن.

"تی ئی"دەیتوانی بەخزمەتکارەکانی بڵێت کە شەرابم بۆ بهێنن و بەوشێوەیەش ژنێکی ئەوەندە ڕەزیل نەبوو کە بەهۆی ڕەزیلیەوە ئاوجۆم دەرخوارد بدات، بەڵام ئەو لەڕوی نەژادەوە ژنی چینی خەڵکێکی ئاسایی بوو و باوکی لەڕێی گرتنی باڵندەکانەوە بژێوی ژیان دابین دەکرد، بۆیە"تی ئی"لەوکاتەوە تەنها حەزی لەخواردنەوەی ئاوجۆ بوو، تائێستاش هەر ئاوجۆ دەخواتەوە، لەبەرئەوەی زیادەڕەوی لەئاوجۆ خواردنەوەدا دەکات جەستە و ڕوخساری ئاوساوە. لەبەرئەوەی لەنەژادێکی دوڕەگە بەواتا باوکی سپی و دایکی ڕەشە و ئێستاش کە هەر ئاوساوە، هەرکەسێك "تی ئی"ببینێت وا دەزانێت کە ڕەش پێستە و لە"تبس"بەجادوگەری ڕەشپێست بانگی دەکەن، چونکە زۆر حەزی لەجادوگەریە.

من هەرجارێك"تی ئی"ببینم سەرم لەوە سوڕ دەمێنێ کە ئەم ژنە بەچ شێوەیەك، توانیویەتی لەسەردەمی لاویەتیدا سەرنجی پیاوێکی وەك فیرعەون بەلای خۆیدا ڕاکێشێت و فیرعەونیش بیکاتە خوشکی خۆی، لەبەرئەوەی جوان نیە، بەپێچەوانەوە لەئێستادا زۆر ناشیرینە، خەڵکی دەڵێن لەڕێی جادوگەریەوە فیرعەونی فریو داوە، چونکە جێی باوەڕ نیە کە فیرعەون کچی پیاوێکی ئاسایی کە کاری گرتنی باڵندەکانە، بکاتە خوشکی خۆی.

لەکاتێکدا"تی ئی"ئاوجۆ دەخواتەوە، بەپێی ئەوەی کە پزیشك بوم، بێ هیچ خۆپارێزیەك قسەی لەگەڵدا دەکردم، لەبەرئەوەی ژنان لەگەڵ پزیشکاندا بێ هیچ خۆپارێزیەك قسە دەکەن و ئەوشتانەی بەکەسانی تری ناڵێن، بۆ پزیشکەکانی دەگێڕنەوە.

دایکی فیرعەون پێی وتم: "سینۆهە"دەزانم کە تۆ خوشکت نیە و دڵنیام لەوەی هەموو شەوێك لەگەڵ ژنێکدا ڕادەبوێری، چونکە لەشاری"ئاسۆ"ژنگەلێکی زۆر جوانی تێدایە و ژنانی شاری"ئاسۆ"بەوشێوەیەش خۆیان بەقورس ناگرن و سەختگیر نین

بۆیە ئامادەن لەگەڵ تۆدا ڕابوێرن. من تۆ بەپیاوێکی ئارام و جێگیر دەبینم و دەبینم کە ئارامی و جێگیری تۆ بەڕادەیەکە کە هەندێکات من دڵگران دەکات و بیر لەوە دەکەمەوە باشتر وایە سوژنێکت پێدا بکەم، بۆئەوەی بزانم بەچ شێوەیەك لەئازاری ئەو شوژنە ڕادەپەڕیت، بەڵام دەبێت ئەوە پەسەند بکەم کە تۆ پیاوێکی چاکیت و وەك بڵێی سەرم لەوە سوڕ دەمێنێ کە تۆ کەسێکی دانایت، چ سودێك لە چاکەی خۆت وەردەگریت، چونکە کەسێك کە دانا بێت، پێویستی بەچاکە نیە، ئەزمون فێری ئەوەی کردوم کە کەسە گەمژەکان و ئەو کەسانەی هیچ کارێکیان لێ ناوەشێتەوە، کەسانێکی چاکیان لێ دەردەچێت، بەڵام سەرەڕای ئەوانەش بەبینیی تۆ خۆشحاڵ دەبم، چونکە کاتێك چاوم بەتۆ دەکەوێت تێدەگەم کە تۆ لەو جۆرە پیاوانەیت کە بێ لەچاکە هیچ خراپەیەکم لەگەڵدا ناکەیت، هەر لەبەرئەوەش بابەتێکت بۆ باس دەکەم کە بۆ هیچ پیاوێکم باس نەکردووە و ئەو بابەتەش پەیوەستە بەتۆوە.

لەڕاستیدا خودای"ئاتون"من و"ئامی"دروستمان کرد و مەبەستی من و ئەو ئەوە بووە کە لەڕێی"ئاتون"ەوە خودای"ئامون"لەناو ببەین بۆئەوەی دەستەڵاتی خۆم و کوڕەکەم زیاتر بێت، بەڵام من و"ئامی"پێشبینی ئەوەمان نەدەکرد کە بابەتی"ئاتون بەو ڕادەیە گەورە دەبێت و دەبێتە مایەی ناڕەزای خەڵکی میسر.

وەك بڵێی دەزانی" ئەگەر نەشزانی ئەوا کەسێکی سادەیت" کە "ئامی"سەرەڕای ئەوەی برای من نیە لەگەڵمدا ڕادەبوێرێت، بەڵام زۆر خۆشم لەو نایەت، لەبەرئەوەی توانای جەستەی جارانی نیە. ئەو ڕۆژەی"ئامی"خودا تازەکەی هێنایە بون، من لەوباوەڕەدا نەبوم کە بەوشێوەیە کار لەکوڕەکەم بکات کە شەو و ڕۆژ لەبیری"ئاتون"دا بێت، بەڵام ئێستا وای لێهات و کوڕەکەم بەشێوەیەك کەوتووەتە ژێرکاریگەری "ئاتون"ەوە کە وا هەست دەکەین شێت بووە و دەبێت کون بکرێتە سەریەوە و ئەو شێتیە لەکاسەی سەری دەربکەین. بابەتێکی تر کە بووەتە مایەی سەرسوڕمانی من ئەوەیە کە"نفر تی تی"سەرەڕای ئەوەی جوانە، بۆچی بەردەوام بۆ فیرعەون کچی دەبێت. کاتێك ژنان جوان بن، پیاو بەتامەزرۆ و ئارەزووەوە لەگەڵیدا ڕادەبوێرێت و تۆ کە پزیشکی دەزانی کاتێك پیاوێك لەڕوی خواست و ئارەزوەوە لەگەڵ"نفر تی تی"دا ڕادەبوێرێت نابێت کچی ببێت.

شتێکی تر ئەوەیە کە من نازانم بۆچی خەڵکی ڕقیان لەجادوگەرە ڕەشەپێستەکانی منە، لەکاتێکدا ئەمانە ژن و پیاوگەلێکی باشن و سەری منداڵەکان درێژ دەکەنەوە لەسکی دایکیاندا لەکاتی لەدایك بوندا، هەروەها لێویان درێژ دەکەنەوە، بەڵام خەڵکی بەڕادەیەك ڕقیان لەم ژن و پیاوانەیە کە من ناچارم لەژێرزەمینی ماڵەکەی خۆمدا بیانشارمەوە، چونکە ئەگەر خەڵکی چاویان پێ بکەوێت دەست بەجێ دەیانکوژن.

من زۆر لەجادوگەری ئەم ڕەشپێستانە ڕازیم، چونکە شتگەلێکم بۆ ئامادە دەکەن کە توانای ژنانەی منیان لەڕابردوو بەهێزتر کردووە و من هەرچەنێك لەگەڵ پیاودا ڕابوێرم لێی تێر نەخۆم، بەڵام ئەگەر تۆ وابزانی من چێژ لەڕابواردن لەگەڵ"ئامی"دا وەردەگرم، بەهەڵەدا چویت و ئەگەر"ئامی"کاهینی مەزن لەبابەتی"ئاتون"دا هاوبەشی بەرژەوندیەکانی من نەبوایە هەر زۆر زوو لەخۆمم دور دەکردەوە، چونکە ئەم پیاوە چیتر وەك ڕابردوو ناتوانێت لەگەڵ ژنێکدا ڕابوێرێت.

"تی ئی"قومێکی درێژخایەن ئاوجۆی خواردەوە و ئەوکات وەك ژنە کرێکارەکانی کەنار ڕوباری"نیل"کە جلوبەرگەکانیان دەشۆرن، دەستی بەقا قای پێکەنین کرد و وتی: "سینۆهە"ئەم ڕەشپێستانە پزیشکەگەلێکی شارەزا و لێهاتون، بەڵام خەڵکی بەجادوگەریان دەزانن، لەبەرئەوەی ناتوانن پەی بەهونەرەکانیان ببەن، زۆریش ڕقیان لەڕەنگی ڕەش و بۆنی جەستەیان دەبێتەوە و ئەگەر تۆ بتتوانیایە ئەم نەفرەتە وە لاوە نێیت و خۆت بکەیت بەهاوڕێیان، دەتوانی سود لەزانستی پزیشکیان-ئەگەر نهێنی هونەری پزیشکیان بۆتۆ باس بکەن- وەرگریت، چونکە ئەمانە لەبەرامبەر پاراستنی نهێنی هونەری پزیشکی خۆیاندا زۆر توندڕەون.

من بەپێچەوانەی کەسانی ترەوە ڕقم لەڕەنگی ڕەشپێستەکان نیە و پیاوانی ڕەشپێست و لاوم لا پەسەندە و لە لاوانی سپی پێست زیاتر چێژیان لێ وەردەگرم و لەبەرئەوەی تۆ پزیشکیت، پێت دەڵێم کە لەگەڵ لاوانی ڕەشپێستدا ڕادەبوێرم و خودی پزیشکانی ڕەشپێست ئەم ڕابواردنەیان بۆ من بەڕەوا دەبینن و دەڵێن کە تۆ چوست و چالاکتر دەکات و خەمی ژیانت لێ دور دەکاتەوە.

من دەزانم کە هەندێك ژنی سپی پێستی میسری وەك ئەو کەسانەی کە هەموو جۆرە خواردنێکیان خواردووە، چیتر چێژ لەخۆراکە چەورەکان وەرناگرن و حەزیان لەخواردنی سادەیە، هەندێکات بۆ گۆڕینی ئارەزوەکانیان لەگەڵ پیاوانی ڕەشپێستدا

ڕادەبوێرن، بەڵام ڕابواردنی من لەگەڵ ڕەشپێستەکاندا لەو ڕوانگەیەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو من بەڕاستی چێژ لەڕابواردنیان وەردەگرم، لەبەرئەوەی ڕەشپێستێك لەسپی پێستێك زیاتر خۆر و ئاو و زەوی و هەوای بەرکەوتووە، بۆیە وا هەست دەکەم توانای سروشتی زیاتر لە سپی پێستەکانیان تێدا بەدی بکرێت، ئەگەر لاوێکی سپی پێست لەگەڵ لاوێکی ڕەش پێست بەراورد بکرێت، وەك ئەوە وایە زستان لەپاڵ هاویندا ڕاوەستابێت. لەزستاندا ڕۆژە گەرمەکان زۆرن، بەڵام هەرگیز ناگاتە گەرمی ڕۆژەکانی هاوین و وەك وەرزی هاوین مرۆڤ دوچاری گەرمی و خۆر و هەوا و خاوبونەوە ناکات.

منیش کاتێك لەگەڵ لاوێکی ڕەشپێستدا ڕادەبوێرم زۆر لێی ڕازی دەبم، من ئەم قسەیە بۆتۆ دەکەم هیچ ترسێکیشم لەدەربڕینی ئەم قسانەدا نیە، چونکە تۆ پزیشکیت و بەوە ڕاهاتویت کە نهێنی خەڵکی بپارێزیت. ئەگەر ئەمجارە نهێنی من ئاشکرا بکەیت، منیش نکوڵی لێدەکەم و دەڵێم کە: تۆ درۆ دەکەیت، چونکە لێرەدا هیچ کەسێك گوێ لەقسەکانی ئێمە ناگرێت، بۆئەوەی لەدواییدا گەواهی بۆ ڕاستی گوتەکانی تۆ بدات، بەڵام گەر خەڵکی لەدەمی تۆوە ئەوە ببیستن کە من لەگەڵ لاوانی ڕەشپێستدا ڕادەبوێرم، زۆر لە ئێستا لە من بەدبینتر نابن، لەبەرئەوەی خەڵکی ئەوەندە باسی خراپەی من دەکەن کە ئەم بەدگۆییە تازەیەش بەو ڕادەیەش بەلایانەوە گرنگ نابێت، سەرەڕای ئەوەش باشتر وایە تۆ ئەم باسە بۆ هیچ کەسێك نەگێڕیتەوە، من واهەست دەکەم کە بۆ کەسی ناگێڕیتەوە، چونکە پیاوێکی زۆر چاکی، لەکاتێك من ژنێکی خراپم.

ئەوکات دایکی فیرعەون بێدەنگ بوو و قومێکی ئاوجۆی خواردەوە و خۆی سەرقاڵی چنینی حەسیرەکەی خۆی کردەوە، من تەماشای دەستیم دەکرد و دەمبینی کە بەچ شێوەیەك دەزوی حەسیرەکە گرێ دەدات.

دوای ماوەیەك حەسیر چنین، دایکی فیرعەونی پێی وتم: سینۆهە لەبەرئەوەی تۆ پیاوێکی چاکی، دەبێت ئەوەت پێ بڵێم کە مرۆڤ بەکرداری چاکە ناگاتە هیچ شوێنێك و لەم جیهانەدا تاکە شتێك کە بەهای هەیە و مرۆڤ دەگەیەنێتە هەموو شتێك، خودی توانا و هێزە. بگرە زێڕ و زیویش بێ هێز و توانا هیچ بەهایەکیان نیە و تۆش بەچاوی خۆت بینیت کە"ئامون"ی خودای پێشوو سەرەڕای ئەوەی زێڕ و زیوێکی زۆری

هەبوو، لەبەرامبەر هێز و تواناداا شکستی خوارد و لەناو چوو، بەڵام ئەوانەی وەك کوڕەکەی من لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی لەدایك دەبن، ڕێز و بەهای فەرمانڕەوایی و دەستەڵات و هێزیان لەلا نیە، تەنها کەسانێکی وەك من کە لەسەر زەویدا لەدایك بوون قەدری هێز و توانا و دەستەڵات و فەرمانڕەوایی دەزانن کە چەنێك گرانبەهایە. منیش بۆئەوەی ببمە خاوەنی هێز و توانا، پەنام بۆ هەموو جۆرە کار و ڕەفتارێك بردووە و مەبەستیشم ئەوە بووە کە بەرهەمی خوێن و گۆشت و ئێسقانم بەواتا منداڵەکانم لەمیسردا فەرمانڕەوایی و دەستەڵات بگرنە دەست و تا جیهان و قوچەکیەکان هەبن ئەوان فیرعەونی میسر بن. لەوانەیە ئەو کارانەی من بۆ پارستی دەستەڵاتەکەم ئەنجامم داوە، لەدیدی خودایانی میسردا شایستەی سەرزەنشت کردن بێت، بەڵام چیت لێ بشارمەوە لەوکاتەوەی کە من بینیومە بەچ شێوەیەك دەتوانرێت خودایەك بەئاسانی لەناو ببرێت و خودایەکی تر لەجێگەکەیدا دابنرێت، بیروباوەڕم لەبەرامبەر خودایانی میسردا بەتەواوی سست بووە و وا بزانم ئەمانە هیچ هێزێکیان نیە، بەڵکو توانا و هێزی فیرعەون زۆر لەتوانا و هێزی خودایان زیاترە. ئەوەی لەم جیهانەدا من فێری بوم و تاقیم کردووەتەوە ئەوەیە کە کرداری چاکە و خراپە بەهیچ شێوەیەك بونیان نیە و چاکە و خراپە، خەیاڵپلاویە، چاکە و خراپەی کردارەکانی ئێمە، لەسەرکەوتن و شکستەکانماندایە....ئەگەر تۆ خراپترین کار ئەنجام بدەیت، بەڵام سەرکەوتن بەدەست بهێنی، هەموو کەسێك دەڵێت کە کردارەکانی تۆ باش بووە، بەڵام ئەگەر باشترین کار ئەنجام بدەیت، بەڵام سەرکەوتنی تێدا بەدەست نەهێنی، خەڵکی پێت دەڵێن کە کارێکی خراپت ئەنجام داوە. سەرەڕای ئەوەش هەندێجار کاتێك لێکی دەدەمەوە کە لەپێناو بەرفراوانکردنی دەستەڵات و هێزەکەم چ ڕەفتار و کردارگەلێکم ئەنجام داوە، لەرزم لێدێت و ترسم لێ دەنیشێت و لەوانەیە ئەم ترسەی منیش لەوەوە سەرچاوە بگرێت کە ژنم، چونکە ژن هەرچەنێك بەهێز و بێ بەزەیی بێت، لەهەمان کاتدا کەمێك خەیاڵ پەرستیشە.

یەکێك لەو شتانەی کە من دەترسێنێت، ئەوەیە کە هەرجارێك"نفر تی تی"شاژنی میسر و ژنی کوڕەکەم منداڵی ببێت و بزانم ئەو منداڵە کچە. من بۆئەوەی جارێکی تر کوڕی ببێت، داوای هاوکاریم لەتەواوی جادوگەرەکان کردووە کە هەرجارێك"نفر تی تی"سکی پڕ دەبێت، ئەو مژدەیە بەخۆم دەدەم کە ئەمجارەیان کوڕی دەبێت، بەڵام

کاتێك ئەو منداڵە لەدایك دەبێت، بارودۆخی من وەك ئەو کەسەی لێدێت کە جەستەی پشیلەیەکی خۆی لەماڵەکەیدا هەڵگرتبێت و فڕێی دابێتە ڕووباری نیلەوە و کاتێکیش دەگەڕێتەوە دەبینێت کە لاشەکەی لەوێیە، من وا هەست دەکەم کە توشی نەفرەتێك بووم، ئەگینا "نفر تی تی" بەبەردەوامی کچی نەدەبوو.

لەوکاتەدا کە دایکی فیرعەون قسەی دەکرد، من سەرقاڵی تەماشاکردنی حەسیر چنینەکەی بووم و لەناکاو ئاگاداری ئەوە بوم، ئەو گرێیانەی کە ئەو لەحەسیرەکەی دەدات، گرێگەلێکی بەناوبانگن بەناوی "پەڕسێلکە باز"ەکانە. ئەم گرێیە ئەو کەسانە ئامادەی دەکەن کە باڵندەکان بەخێو و ماڵی ڕاو دەکەن، بۆ ئامادەکردنی تەڵەی باڵندەکان و لەمیسری خوارووداا (بەگرێی پەڕەسێلکە بازەکان) بەناوبانگە.

ئەوەی بووەتە هۆی ئەوەی گرێکانی حەسیری دایکی فیرعەون سەرنجی من ڕاکێشێت، ئەوە بوو کە من ئەو سەبەتەیەم هاتەوە یاد کە منیان خستبوە ناوی و بەسەر ڕووباری "نیل"دا بەئاڕاستەی ڕەوتی ڕووباری نیل دەڕۆیشت و زڕدایکەکەشم ئەو سەبەتەیەی بەسەر ئاوەکەوە گرتەوە، ئەو سەبەتەیەش هەمان گرێی پەڕەسێلکە بازەکانی پێوە بوو.

من لەسەرتای ئەم کتێبەدا وتم: کە زڕدایکەکەم "بەدایکی ڕاستەقینەی خۆمی دەزانم" دوای ئەوەی منی لەناو ئەو سەبەتەیەدا دەرهێنا کە بەسەر ئاوەکەوە بوو، ئەو سەبەتەیەی لەلای خۆی پاراست و منیش لەتەواوی سەردەمی منداڵیمدا چاوم بەو سەبەتەیە دەکەوت و بەشی بەشی ئەو دیمەنانەم دەهێنایەوە بەرچاوی خۆم.

من دەمزانی کە ئەو گرێیانەی کە لەکاتی چنینی ئەو سەبەتەیەدا لێی دراوە، گرێی پەڕەسێلکە بازەکانە و لەو شەوەدا، کاتێك بینیم دایکی فیرعەون گرێی پەڕەسێلکە بازەکان لەحەسیرەکەی دەدات، ڕاوەشام و بیرێکی سەیر بەهزرمدا تێپەڕی، ئەو بیرۆکەیەش بەڕادەیەك سەرسوڕهێنەر بوو کە نەمتوانی لەئێستادا بڵێم چیە؟ بەڵام دەمزانی کە گرێی پەڕەسێلکە بازەکان لە میسری خوارووداا باوە، نەك لەمیسری سەرودا و ئەو سەبەتەیەی کە منی تێدا بوو، لە "تبس" بەواتا لەمیسری سەرو لەناو گیراوەتەوە.

میسری خوارو، دەکەوێتە خوار ڕەوتی ڕووباری نیلەوە و ئاو لەمیسری سەرووەوە دێت و دەڕوات بۆ میسری خواروو، ئاشکرایە ئەو سەبەتەیەی کە کەوتووەتە ئاوی ڕووباری نیلەوە، بەپێچەوانەی ڕەوتی ڕووباری نیل ناڕوات.

بەڵام سەرەڕای ئەو بیرەی کە بەهزرمدا هات، ئاگاداری ئەوە بووم کە باوکی"تی ئی"یش پەڕەسێلکە بازە، بەواتا باڵندە بەخێو دەکات و کچەکەی کەلە ئێستادا حەسیر دەچنێت، لەباوکیەوە فێری گرێی پەڕەسێلکە بازەکان بووە، بەڵام بەچ شێوەیەك ئەو سەبەتەی کە لەمیسری خواروو چنراوە، گەشتووەتە"تبس".

"تی ئی"نەیهێڵا بەردەوامی بەم بیرۆکەیەم بدەم و وتی: "سینۆهە" کاتێك من باسی کردارەکانی خۆمت بۆ دەکەم، لەوانەیە تۆ لەوکاتەدا من بەشایستەی سەرزەنشت کردن بزانی و بڵێیت من ژنێکی دڵ ڕەقم، بەڵام زۆرباشە گەر بارودۆخی من لەبەرچاو بگریت، بۆئەوەی بزانیت کە من ناچار بوم پەنا بۆ توندوتیژی ببەم.

چونکە کاتێك کچی پیاوێك کە بەخێوکەری باڵندەیە بچێتە ناو ماڵی فیرعەونەوە، پاراستنی دەستەڵات بەلایەوە زۆر دژوار دەبێت، چونکە هیچ هێزێکی مادی و ڕۆحی پێ لەگرنگی دانی فیرعەون بەو، پارێزگاری لەو ناکات و دژمنەکانی کە هەموویان لەناو ماڵ و بارەگاکەیدا جێگیرن، ئامادەن لەهەر ساتێکدا وەك مار پێیەوە بدەن و لەبەرچاوی فیرعەونی بخەن، بۆیە تاکە ڕێگای پاراستنی توانا و دەستەڵات و هێزی من ئەوەبوو کە نەهێڵم خۆشەویستی فیرعون لەبەرامبەر مندا لەناو بچێت، داوای هاوکاریم لەجادوگەرانی ڕەشپێست کرد و ئەوانیش شتگەلێکیان فێری من کرد کە توانیم لەڕێی ئەوشتانەوە سەرنجی فیرعەون بەلای خۆمدا ڕاکێشمو فیرعەونیش ئاگاداری ئەوە بوو کە هیچ یەك لەژنەکانی تری بەئەندازەی ڕابواردن لەگەڵ مندا چێژی پێ نابەخشێت. منیش دوای ئەوەی لەڕێی جادوگەریەوە، فیرعەونم شەیدای خۆم کرد، ویستم بەسود وەرگرتن لەم خۆشەویستیەی کە فیرعەون بۆ من هەیەتی، هەروەها بەسود وەرگرتن لەو دەستەڵاتەی کەهەیەتی دژمنەکانمی پێ لەناو ببەم. بۆیە شەو و ڕۆژ کاری من ئەوە بوو کە پلانی دژمنەکانم پوچەڵ بکەمەوە و بەردەوام ئەو تەڵە و داوانەی لەسەر ڕێی مندا دایاندەنا، پارچە پارچە بکەم و تۆڵە لەو کەسانەی کە نەمدەتوانی بیانکەمە دۆستی خۆم بکەمەوە.

یەکێك لەکارەکانی من ئەوەبوو کە نەهێڵم هیچ یەك لەژنانی ئەو ماڵە پێش من کوڕێکیان ببێت، تۆ نازانی من بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە چەنێك ئەرکم کێشاوە و زێرم بەخەڵکی بەخشیوە. سەرەڕای ئەوەی هەوڵی ئەوەم دەدا خۆم سکم پڕ ببێت، بەڵام سکم پڕ نەدەبوو، لەبەرامبەردا ژنەکانی تر منداڵیان دەبوو، هەرجارێك یەکێك لەژنەکانی سکی پڕ ببوایە، من بۆ ڕۆژێکیش ئاسوودە نەدەبووم تائەوڕۆژەی من کوڕێکم بەئارەزوی فیرعەون بوو. تۆ لەبەرئەوەی پزیشکی فەرمانڕەواییت، لەوانەیە بتوانی لەهزری خۆتدا ئەوە لێك بدەیتەوە کە من بەچ شێوەیەك ئەو کوڕانەی کە لەدایك دەبون دەمگۆڕین بەکچ و پێش تۆ پیاویکی سەر کونتێکەر"بەواتا پزیشکی فەرمانڕەوایی "هەبوو کە ماوەیەك بەسەر مەرگیدا تێدەپەڕێت. هەمان ئەو پیاوە بۆ گۆڕینی کوڕان بۆ کچان هاوکاریەکی زۆری کردم[6].

تا سەرئەنجام کاتێك فیرعەون پیربوو، ئەوازش و دڵئەواییەکانی من زیاتر هەڵی دەوەشاند، من کوڕێکم بوو کە ئێستا فیرعەونە. بەڵام ئەم فیرعەونە بێ لەچەند کچێکی نیەو هێشتاش نەبووەتە خاوەنی کوڕێك کە جێگەی بگرێتەوە. بۆیە ئەوەم بۆ باسکردی بۆئەوەی"سینۆهە"بزانیت کەمن ژنێکی بەتواناوشایستەمو بەلێهاتوییەکانی خۆم توانیم دەستەڵاتی خۆم بپارێزم و بەرفراوانیشی بکەم، ئەگەر من تواناکانی خۆمم بەگەڕ نەخستایە، لەمڕۆدا لەسەر تەختی میسر، کوڕەکەم وەك فیرعەون لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دانەدەنیشت.

وتم: "تی ئی"من دەزانم کە توانای تۆ تا چ ڕادەیەکە، لەبەرئەوەی لەشوێنێکی تردا کاریگەری تواناکانی تۆم بینیوە و تەماشادەکەم کە گرێی پەڕەسێلکە بازەکان لەحەسیرەکەی بەردەستت دەدەیت.

کاتێك"تی ئی"گوێ لەم قسەیە بوو، چاوەکانی کە بەهۆی خواردنەوەی ئاوجۆوە سور وەرگەڕابون ئاڕاستەی من کرد و وتی: "سینۆهە"مەگەر خەڵکی ئاگاداری نهێنیەکانی منن؟ یان ئەوەیکە خودی خۆت جادوگەریت و ئاگاداری نهێنیەکانی منی؟

---

[6] سینۆهە لەسەرتای ئەم کتێبەدا"بەواتا لەبەرگی یەکەمدا" باسی ئەوەی کرد کە بەچ شێوەیەك لەماڵی فیرعەوندا کوڕەکانیان دوای ئەوەی لەدایك دەبون، دوور دەخستەوە و کچێکیان لەباتیدا دادەنا.

وتم: من جادووگەر نیم، بەڵام دەزانم کە هیچ شتێك لەمرۆڤ ناشاردرێتەوە و دواجاری خەڵکی ئاگاداری هەموو شتێك دەبن، چونکە لەکاتی شەودا تۆ واهەست دەکەیت هیچ کەسێك بەخەبەر نیە و چاوی بەکردارەکانی تۆ ناکەوێت، مانگ و ئەستێرەکان بێدارن و تۆ دەبینن و"با"ش کە لەتەنیشت تۆوە دەشەکێتەوە، تێدەگات کە تۆ خەریکی ئەنجامدانی چ کارێکیت، تۆ دەتوانی زمانی خەڵکی ببەستیت، بەڵام ناتوانی ڕێ لەزمانی"با"و تەماشاکردنی ئەستێرەکان بگریت.

لەبەرئەوەی"تی ئی"لەم قسەیەی من تووڕە بوو، بابەتی گفتوگۆکەم گۆڕی و تم: ئەو حەسیرەی تۆ دەیچنیت زۆر جوانە، من حەز دەکەم ببمە خاوەنی حەسیرێکی وا.

دایکی فیرعەونیش وتی: کاتێك ئەم حەسیرە تەواو بوو، پێتی دەدەم، بەڵام تۆ لەبەرامبەردا چیم پێ دەدەیت؟

وەڵامم دایەوە: من لەبەرامبەردا زمانمت پێ دەدەم.

دایکی فیرعەون پرسی: بەچ شێوەیەك زمانی خۆتم پێ دەدەیت؟

وتم: ئایا تۆ نازانی ئەم گوتەیە واتای چی دەگەیەنێت؟ واتای ئەوە دەگەیەنێت کە من زمانی خۆم دەگرم و هیچ شتێك دژی تۆ باس ناکەم.

دایکی فیرعەون کە بەهۆی خواردنەوەی ئاوجۆوە سەرخۆش ببوو، وتی: ئەم دیاریەی کە تۆ دەتەوێت پێمی بدەیت، بەلای منەوە هیچ نرخێکی نیە، چونکە دیاریەکە کە بەخودی خۆمەوە پەیوست دەکرێت.

پرسیم: بەچ شێوەیەك ئەم دیاریە بەخودی تۆوە پەیوەست دەکرێت؟

دایکی فیرعەون وەڵامی دایەوە: نەك تەنها زمانت، بەڵکو دەستیشت هی منە و من دەتوانم بڵێم زمانت بۆ ببڕن و بۆم بهێنن، بۆئەوەی لەوەودوا نەتوانی باسی خراپەی من بۆ خەڵکی بکەیت، هەروەها دەستەکانیشت ببڕنەوە و بۆم بهێنن، بۆئەوەی نەتوانی دوای ئەوە نهێنیەکانم بنوسیتەوە، بۆئەوەی ئەوانەی لەئایندەدا دێن ئاگاداری نهێنیەکانی من بن.

وتم: "تی ئی"تۆ ئەمشەو ئاوجۆیەکی زۆرت خواردووەتەوە، هەرلەبەرئەوەش شتگەلێك دەڵێیت کە نابێت بیدرکێنی، بۆیە باشتروایە دەست لەخواردنەوەی ئاوجۆ هەڵگریت و بخەویت، بۆئەوەی خەوتن کاریگەری مەستیەکەت لەناو ببات، ئەگینا لەوانەیە شتگەلێکی وەك ئەسپی ئاوی لێرەدا ببینی، بەڵام سەرەڕای ئەوەی تۆ

مەستی و من هۆشیارم و ئاگام لەخۆمە دەڵێم ئامادەم زامانی خۆمت پێبدەم، بەواتا نهێنی تۆ بپارێزم، بەمەرجێك تۆش دوای ئەوەی چنینی ئەم حەسیرەت تەواو کرد پێم بدەیت.

دایکی فیرعەون پێکەنی و وتی: "سینۆهە" ئەگەر کەسێك بێ لەتۆ ئەم قسانەی لەگەڵ مندا بکردایە، نەمدەهێلا بەزیندوویی لەم کۆشکەی من بڕواتە دەرەوە، بەلام لەبەرئەوەی تۆ پزیشکیت و دەزانم کە نهێنی پارێزی من و کوڕەکەمی، هیچ کات هەوڵی کوشتنت نادەم و کاتێکیش چنینی ئەم حەسیرەم تەواوکرد، پێتی دەدەم.

لەوکاتەدا ماڵئاواییم لەدایکی فیرعەون کرد و لەکۆشك چومە دەرەوە و سواری کەشتیەکەی خۆم بوم، بۆئەوەی بگەڕێمەوە بۆ لای"مریت".

کاتێك بەسەر ئاوی"نیل"دا دەڕۆشتم ئەو شەوەم هێنایەوە یاد کە منداڵێکی تازە لەدایك بوویان خستووەتە ناو سەبەتەیەکەوە و بەڕوباری"نیل"یان سپاردبوو، لەو سەبەتەیەدا ئەو گرێیانە بەدی دەکران کە تەنها"پەڕەسێلکە بازەکان" دەتوانن ئەو جۆرە گرێیە لەسەبەتە و حەسیرەکان بدەن.

من دەمویست نهێنی ئەو منداڵە کە ئێستا بووەتە پیاوێکی تەواو و ناوی "سینۆهە"یە ئاشکرا بکەم، بەلام دەترسام، چونکە هەرچەنێك دانایی مرۆڤ لەبارەی شتە نەزانراوەکانەوە زیاتر بێت، خەمەکانی زیاتر دەکات، من نەمدەویست خەمەکانم لەوەیکە هەیە زیاتر بکەم.

*بەشی سی و پێنجەم*

# گەڕانەوە بۆ "ماڵی ژیان" لە"تبس"

**کاتێك فیرعەون لەشاری"ئاسۆ" لێی پرسیم: بۆچی دەتەوێت بگەڕێیتەوە بۆ "تبس"؟**

**وتم: لەبەرئەوەی من سەرکونتێکەری فیرعەونم، دەبێت دوای هەر ماوەیەك بگەڕێمەوە بۆ ماڵی ژیان و وانە بەخوێندکارەکانی بڵێمەوە.**

**فیرعەونیش ئەم بیانویەی پەسەند کردم و منیش دوای ئەوەی گەشتمە "تبس" بەڕاستی خوازیاری ئەوە بووم سەرێك لە"ماڵی ژیان" بدەم، چونکە لەتەواوی ئەو ماوەیەی کە لەشاری "ئاسۆ"دا بەسەرم برد، بگرە کونم نەکردە سەرێکیشەوە و دەترسام لێهاتوویی دەستەکانم لەدەست بدەم. هەروەها بەهیوای ئەوە بووم دوای چونم بۆ ماڵی ژیان، چەند زانیاریەك لەبارەی ئەو زانستانەوە بەدەست بهێنم کە لەسەردەمی ئێمەدا بونیان نەبوو. لەسەردەمی ئێمەدا هەرکەسێك بیویستایە لە"ماڵی ژیان"دا بخوێنێت، دەبوو یەکسەر ببوایە بەکاهینی پەرستگای"ئامون"، دوای ئەوەی بو بە کاهین و لەماڵی ژیاندا دەستی بەخوێندن کرد، چیتر ناتوانێت بپرسێت"بۆچی؟**

**لەسەردەمی ئێمەدا لەماڵی ژیاندا، کۆیلەئاسا زانستەکانیان پەسەنددەکرد و بەخوێندکارانیان دەوت زاناکانی ڕابردوو، باوەڕیان بەوەبوو، ئێوەش دەبێت بیروباوەڕی زانستی و شێوازی تیمارکردنی ئەوان پەسەند بکەن و ئێمەش ناچاربوین پەسەندی بکەین[7].**

---

[7] وەرگێڕی بێتوانا، زۆر لەوە بچوکترە کە بتوانێت بۆچونی خۆی لەبارەی ئەو زانستانەوە بخاتە ڕوو، ئەوەی ئێستا دەیڵێیت لەزمانی زانا هاوچەرخەکانی ئەورووپاوەیە کە لەکتێبەکاندا یان لەگۆڤارە بیانیەکاندا خوێندویانەتەوە، کە

بەڵام دوای ئەوەی خودای پێشوو سەرنگون بوو و خودای تازە جێگەی گرتەوە چیتر خوێندکارانی"ماڵی ژیان" ناچار نەبون ببنە کاهینی پەرستگای"ئامون"و بێ جێبەجێکردنی ئەم نەریتە، بەردەوامیان بەخوێندنی خۆیان دەدا و دەشیانتوانی بپرسن"بۆچی؟" لەبەرئەوەی من ئاگاداری ئەم بابەتە بووم، وام دەزانی زانست لە"ماڵی ژیان"دا زۆر پێش کەوتوو و بەرفراوان بووە و ئەو خوێندکارانەی کە دەتوانن ڕەخنە بگرن و پرسیار لەجۆرەکانی زانست بکەن، سەرکەوتنیان لەوەدا بەدەست هێناوە کە پێشکەوتنێکی تازە لەبواری زانستدا بخەنە ڕوو.

کاتێك ئێمە لەماڵی ژیاندا خوێندکار بوین، نەماندەتوانی ڕەخنە بگرین، ئەگەر پرسیارمان لەمامۆستاکەمان بکردایە کە بۆچی دەبێت بەوشێوەیە بێت، لەوەڵامدا دەیوت لەبەرئەوەی زانایانی ڕابردوو بەوشێوەیە کاریان کردووە یان دەیانوت"ئامون" وای ویستووە، لەسەردەمی خوێندنماندا دەیان گرفتمان بۆ دەهاتە پێش کە هیچ یەك لەو گرفتانە مامۆستاکانمان نەیاندەتوانی بۆمان شی بکەنەوە.

بەڵام ئەم خوێندکارە تازانە دەیانتوانی ڕەخنە بگرن و داوا لەمامۆستاکەی خۆیان بکەن کە گرفتەکانیان بۆ چارەسەر و شی بکەنەوە.

دوای ئەوەی چومە ناو ماڵی ژیانەوە بینیم کە هەم ئاست و چۆنایەتی خوێندن کەم بووەتەوە و هەم خوێندکارەکانیش نایانەوێت ببنە کەسێکی زانا، بەڵکو تەنها دەیانەوێت ناویان لەپەرتوکی ماڵی ژیاندا تۆمار بکرێت، بۆئەوەی بتوانن بەناونیشانی ئەوەی خوێندنیان لە ماڵی ژیاندا تەواو کردووە لەبواری پزیشکیدا دەست بەکار بن و کانزا بەدەست بهێنن. بگرە ژمارەی ئەو نەخۆشانەی کەسەردانی ماڵی ژیانیان دەکرد کەم بووەتەوە و وەکو ڕابردوو، باوەڕیان بەو قوتابخانە مەزنەی بواری پزیشکی نەبوو و بۆچارەسەرکردن سەردانی ئەوێیان نەدەکرد، چونکە

---

لەو گۆڤارەدا نوسراوە ئەوان باوەڕیان بەبۆچونەزانستیەکانی"ئەرستۆ" بووە، بەهۆی ئەم بۆچونە زانستیەی ئەوروپیەکانەوە، زانستیان لەوڵاتە خۆرئاواکاندا بەلایەنی کەم بۆ حەفدە سەدە دواخست، چونکە هیچ زانایەکی ئەوروپایی نەیوێراوە، بوچونێك بخاتەڕوو کە پێچەوانەی بۆچونەکانی ئەرستۆ بێت و ئەوەی"سینۆهە" لێرەدا باسی دەکات هاوشێوەی هەمان ئەو بابەتەیە کە کۆیلە ئاسا بۆچونەکانی ئەرستۆ پەسەن بکەیت، بۆنمونە بۆچونی جێگیربونی زەوی و سوڕانەوەی خۆر و ئەستێرەکانی تره بەچواردەوری زەویدا، کە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بێ ئەملا و لا لەلایەن زانا ئەوروپیەکانەوە پەسەند کرابوو.

دهیانزانی هەندێك لەو مامۆستایانە لەماڵی ژیان چونەتە دەرەوە و لەشاردا نەخۆشخانەیەکی بچوکیان بۆ خۆیان کردووەتەوە. من دوای گەڕانەوەم بۆ"تبس" لەماڵی ژیاندا، نەشتەرگەری سەر کونکردنی سێ کەسم ئەنجام دا و سەرەڕای ئەوەی خوێندکارەکان ستایشی لێهاتووییان کردم، بەڵام ئاگاداری ئەوە بووم کە دەستم خێرایی و وردبونەکەی جارانی نەماوە و بیناییشم ڕوی لەکزی کردووە، لەم سێ نەشتەرگەریە یەکێکیان من بەمەبەستی ئاسودە کردنی کەسی نەخۆش ئەنجامم دا، چونکە کەسی نەخۆش ئازارێکی زۆری هەبوو، منیش سەریم بۆ کونکرد، بۆئەوەی لەو ئازارە ڕزگاری بکەم.

دووەمیان پیاوێك بوو کە دوو ساڵ پێش ئەو بەروارە، شەوێکیان بەهۆی مەستیەوە ڕۆشتبووە سەربانی ماڵەکەیەوە و کاتێك ویستیان لەسەربانەکە بیهێننە خوارەوە، لەدەستیان هەڵهات و لەسەربانەکەوە کەوتە خوارەوە.

ئەوپیاوە، لەڕوکاری دەرەوەی جەستەیەوە هیچ برینێکی پێوە دیار نەبوو، بەڵام دوای چەند ڕۆژێك توشی نەخۆشی"پەرکەم"بوو و هەندێك جار لەزەویدا گرمۆڵە دەبوو و هاواری دەکرد و دیمەنگەلێکی خەیاڵاوی دەبینی یان ئارەقی دەکرد، منیش بەپێی ڕاسپاردەی ئەو مامۆستایانەی کە لەماڵی ژیاندا وانەیان دەوتەوە، لەکاتی نەشتەرگەری سەری ئەو پیاوەدا ناچاربوم داوا لەوپیاوە بکەم لەو نەشتەرگەریەدا ئامادە بێت، کە ئامادە بونی دەبووە هۆی ڕاوەستانی خوێنی ئەو کەسەی نەشتەگەری بۆ دەکرێت و خودی ئەو پیاوەش لەو پیاوە گەمژەتر بوو کە لەکۆشکی فیرعەوندا بوو، من لەم کتێبەدا باسی ئەو پیاوەم کردووە و وتومە کە کۆچی دوایی کردووە و بەئەندازەی ئەو پیاوە توانای ڕێگرتنی لەخوێن ڕێژان نەبوو و دەمبینی لەکاتی نەشتەرگەریدا هەندێکات تکێك خوێن لەو برینە دەهاتە دەرەوە. کاتێك سەری نەخۆشەکەم کردەوە بینیم هەندێك شوێنی مێشکی نەخۆش بەهۆی خوێنی مەییەوە ڕەش بووەتەوە، بۆیە بەوردی خوێنە مەیوەکەیم لەمێشکی جیاکردەوە و دەرمکرد، بەڵام دوای ئەوەی سەریم بەستەوە کەسی نەخۆشی"پەرکەم"ەکەی بەتەواوی لەناو چوو و ڕۆژی سێیەم کاتێك من چاوەڕێم دەکرد کۆچی دوایی کرد، سەرەڕای ئەوەی کەسی نەخۆش لەڕۆژی سێیەمدا کۆچی دوایی کرد، هیچ کەسێك سەری لەمردنی

سوڕ نەما، چونکە هەموویان دەیانزانی ئەوکەسەی کە سەری بۆ کون دەکەن بەدەگمەن بەزیندویی دەمێنێتەوە.

خوێندکارەکانیش دوای کۆتایی هێنانی ئەم نەشتەرگەریە، شتایشیان کردم، لەکاتێکدا من کارێکی ئەوتۆم ئەنجام نەدابوو کە جێی دەستخۆشی بێت و لەسەردەمی ئێمەدا، ناڵێین نەشتەرگریەکی بێنرخ بووە، بەڵام نەدەبویە مایەی سەرسوڕمانیش.

سێیەمین کەسیش کە نەشتەرگەریم بۆ سەری کرد، لاوێك بوو کە لەدەرەوە بەر هێرشی دزەکان کەوتبوو و هەرچی کانزای پێبووە لێیان فڕاندبوو و سەریشیان بۆ شکاندبوو.

کاتێك ئەو لاوەیان هێنایە ماڵی ژیانەوە، من لەوێ بوم و لەبەرئەوەی زانیم کە بارودۆخی ئەو نەخۆشە زۆر خراپە، بڕیارم دا یەکسەر نەشتەرگەری بۆ بکەم و ئێسقانە شکاوەکانی لەسەری جیا بکەمەوە و فڕێی بدەم و لەجێی شوێنی شکانی ئێسقانەکەش پارچە زیوێك کە خراوەتە سەر ئاگرو لەدواییدا سارد کراوەتەوە دابنێم و دوای ئەوە سەریم بۆ بەستەوە.

ئەو لاوە دوای دوو هەفتەی تر چاك بویەوە و گەرچی سەرەتا نەیدەتوانی دەست و پێکانی بەئاسانی بجوڵێنێت، کاتێك ختوکەی دەست و پێیان دەدا، هەستی بەهیچ شتێك نەدەکرد، بەڵام دوای ئەو ماوەیە چاك بویەوە و ژیانی ئاسایی جارانی دەست پێکردەوە.

سەرەڕای ئەوەی ئەم نەخۆشە زیندوو بویەوە، خوێندکارانی ماڵی ژیان لەوباوەڕەدا بون کە ئەو نەشتەرگەریەی پێش ئەو کوڕە کردم بۆ ئەو پیاوەی نەخۆشی پەرکەمی لەگەڵدا بوو زۆر لەم کوڕە گەنجە گرنگتر و سەرنج ڕاکێشتر بووە، لەبەرئەوەی توانیم خوێنی مەیوی ناوسەری لەمێشکی جیابکەمەوە، بێئەوەی لەکاتی ئەنجامدانی ئەو نەشتەرگەریەدا بمرێت.

مامۆستایانی ماڵی ژیانیش وەك خوێندکارەکان ڕێزیان لێدەگرتم، بەڵام لەبەرئەوەی لەشاری"ئاسۆ"وە هاتبوم و خاچی ژیانم لەملدابوو، خۆیان لێم دورە پەرێز دەگرت و لەبەرچاوی مندا هەندێك قسەی تایبەتیان نەدەکرد و وەك سەگێك کە بۆنی کەسانی تر دەکات، بۆنیان دەکردم بۆئەوەی بزانن ئایا دەتوانن متمانەم پێ بکەن یان نە؟

من هەرگیز لەبارەی"ئاتون"و بابەتە ئاینیەکان قسەم لەگەڵدا نەدەکردن، چونکە دەمزانی"ماڵی ژیان"هێشتا یەکێك لەقەڵا مەزنەکانی خودای ڕابردوی"ئامون".

دوای ئەوەی سێیەمین نەشتەرگەریم بەسەرکەوتویی کۆتایی پێهات"بەواتا کەسی نەخۆش لەکاتی نەشتەرگەریدا نەمرد، بەڵکو ماوەیەك دوای کۆتایی هێنان بەو نەشتەرگەریە کۆچی دوایی کرد و یەکێك لەو سێ کەسە بەزیندوویی مایەوە" یەکێك لەپزیشکانی ماڵی ژیان کە لەژورێکی چۆڵدا بووم هات بۆ لام و وتی:

ئەی"سینۆهە"تۆ پیاوێکی دانایت و لەڕابردوودا، لەهەمان ئەم قوتابخانەیەدا خوێندنت تەواوکردووە، ئایا سەرت لەوە سوڕنامێنێ کە نەخۆشەکان سەردانی ئێرە ناکەن؟

وتم: دەبێت بڵێم من سەرم لەمکارە سوڕماوە.

ئەو پزیشکەش وتی: هۆکاری ئەوەی کە کەسە نەخۆشەکانی سەردانی ئێرە ناکەنە ئەوەیە کە دەزانن لە"تبس"دا، پزیشکگەلێك هەن کە دەتوانن بێ بەکارهێنانی چەقۆ و ئاگر و دەرمان و برین پێچی چارەسەری نەخۆشەکان بکەن و ئەو پزیشکانەی شارەزاییان لەمجۆرە چارەسەرکردنەدا هەیە، داوایان لێکردم، سەردانت بکەم و بڵێم، ئایا حەز دەکەیت چاوت بەم جۆرە چارەسەرکردنە بکەوێت؟ ئەگەر حەز دەکەیت، ئێمە دەتبەینە نەخۆشخانەی ئەم جۆرە پزیشکانە، بەڵام بەمەرجی ئەوەیکە چاوەکانت ببەستین، بۆئەوەی نەزانی بۆ کوێ دەڕۆیت و بەڵێن بدە ئەوەی بەچاوی خۆت دەیبینی، بۆ کەسانی تری باس نەکەیت.

وتم: من دەربارەی شتگەلێك کە لەمڕۆدا خەڵکی"تبس"باسی دەکەن، یان وای بۆ دەچن هەندێك شتم بیستووە، بەڵام لەبەرئەوەی پزیشکم لەوباوەڕەدا نیم کە بتوانرێت بێ دەرمان و برینپێچی و چەقۆ و ئاگر، بتوانرێت نەخۆشەکان چارەسەر بکرێن، لەبەرئەوەش حەز ناکەم بچمە ناو ئەو فێڵ تەڵەکە بازیەوە، چونکە ئەگەر خۆم بکەم بەناو ئەم تەڵەکە بازیەدا، دەڵێن: پزیشکی تایبەتی فیرعەونیش بەچاوی خۆی بینی کە بێ دەرمان و برین پێچی و چەقۆ و ئاگر، نەخۆشەکانمان چارەسەر کردووە، من حەز ناکەم ناوی من بۆ گەواهی شتگەلێکی نەگونجاو و درۆ بەکار بهێنن.

ئەویش وتی: "سینۆهە"لەبەرئەوەی تۆ پیاوێکی دانایت و گەشتت بەوڵاتانی جیهاندا کردووە و فێری زانستگەلێکی تر بویت، ناتوانین تۆ بەفێڵ و تەڵەکەبازی فریو

بدەین، لەبەرئەوە بۆت دەسەلمێنم کە ئێمە دەتوانین بێ دەرمان و برین پێچی و هەندێك کاری تر چارەسەری نەخۆشەکان بکەین، بۆیە داوات لێدەکەم کە بێیت و شێوازی چارەسەرکردنی هەندێك لەپزیشکەکان ببینی، هەروەها تۆ لەکاتی نەشتەرگەری کردنی سەرێکدا سودت لەپیاوێك وەرگرت کە ئامادەبونی ئەو دەبووە هۆی ئەوەی رێ لەرشتنی خوێن بگرێت، لەکاتێکدا تۆ بۆ رێگرتن لەخوێن رشتن، نەسودت لە چەقۆ وەرگرت و نە لەئاگر، و نە لەپارچەی برین پێچی، سەرەرای ئەوە بەچ شێوەیەك چارەسەرکردنی کەسی نەخۆش بێ چەقۆ و ئاگر و برین پێچی بەفێڵ و تەڵەکە دەزانی؟

ئەو قسەیەی کاری تێکردم و وتم: زۆر باشە، من ئامادەم بێم و بزانم ئێوە بەچ شێوەیەك کەسە نەخۆشەکان چارەسەر دەکەن... ئەو پیاوەش کە پزیشکی ماڵی ژیان بوو. وتی: شەو بەکەژاوەیەکەوە دێت بۆ لات و لەگەڵ خۆیدا دەتبات، بەڵام وتیشی دەبێت چاوەکانم ببەستێت، بۆئەوەی نەزانم بۆ کوێ دەرۆم.

شەو هات و دوای ئەوەی منی سواری کەژاوەکە کرد چاوەکانی بەستم و کەژاوەکە کەوتە رێ.

دوای ماوەیەك کەژاوەکە راوەستا و نۆکەرەکان کەژاوەکەیان خستە سەر زەوی و ئەو پیاوەش منی لەکەژاوەکە هێنایە دەرەوە و دەستی گرتم، هەستم بەوە کرد کە چوینە ناو دالانێکەوە و دوای ئەوە بۆماوەیەك بەو دالانەدا رۆشتین و لەچەند پلیکانەیەکەوە تێپەرین، هەمان ئەو پیاوە چاوەکانمی کردەوە و من خۆم لەناو ژورێکدا بینیەوە کە چەند چرایەکی تێدا داگیرسابوو و کاهینێك لەشێوەی کاهینەکانی پەرستگای خودای پێشوو، بەسەری تاشراو و چەور کراو، لەوێ بوو.

هەمان ئەو کاهینە منی بەناوی خۆم بانگ کرد و دیاربوو کە دەزانێت ناوم چیە و دوای ئەوە ئاماژە بەگۆشەیەکی ئەو ژورە کرد و سێ کەسم لەو گۆشەیەدا بینی لەوێ راوەستابوون.

کاهین وتی: "سینۆهە"ئەم سێ کەسە نەخۆشن و بۆئەوەی بزانی کە هیچ فێڵێك لەکاردا نیە، برۆ و پشنینێکیان بۆ بکە.

منیش بەرەو رویان رۆشتم و دەستم کرد بەپشکنینیان و بینیم کە یەکێك لەنەخۆشەکان، ژنێکی لاو و لاوازە و ناتوانێت لەجێی خۆی تەکان بخوات و وەك بڵێی

تەنها چاوەکانی گیانیان تێدایە. ئەویتریان لاوێك بوو کە لەسەرتاسەری جەستەیدا، تلوقی گەورە گەورە و شێدار دەبینرێت و تەماشاکردنی ئەو کەسە دەبووە هۆی مایەی نەفرەتی کەسە ئاساییەکان، نەخۆشی سێیەمیش پیرەمێردێکی ئیفلیج بوو کە نەیدەتوانی هەردوو پێی خۆی تەکان بدات.

منیش بۆئەوەی دڵنیابم کە ئەو پیاوە بەڕاستی ئیفلیجە، سوژنێکم چەقاند بەپێیدا و ئەویش بەهیچ شێوەیەك هەستی بەو سوژنە نەکرد و ئەو کارە ئەوەی دەسەلماند کە بەتەواوی ئیفلیج بووە و هەردوو پێی هەم ناجوڵێت و هەم هەموو هەستێکیان لەدەست داوە.

بەکاهینەکەم وت: گومان لەوەدا نیە کە ئەم سێ کەسە نەخۆشن و ئەگەر من پزیشکی ئەم سێ کەسە بومایە، هەرسێکیانم ڕەوانەی "ماڵی ژیان"دەکرد، بەلام دەزانم کە ماڵی ژیان بەئەگەرێکی زۆر بەهێز تواناى چارەسەرکردنی ئەو ژن و مێردەی نیە، بەلام دەتوانێت ئەو لاوە لەڕێی ماڵینی گۆگرد بەسەر برینەکانی جەستەی و شۆردنی بەئاوێکی ئاوێتەی بەگۆگرد چارەسەر بکات.

کاهین شوێنی دانیشتنێکی پێنیشان دام و وتی: "سینۆهە"لێرەدا دانیشە و بزانە کە ئێستا ئێمە لەبەرچاوی تۆدا، ئەم سێ کەسە بەچ شێوەیەك چارەسەر دەکەین.

دوای ئەوە بەپێی فەرمانی کاهین، چەند نۆکەرێك خۆیان کرد بەو ژورەدا و ئەو سێ نەخۆشەیان لەگۆشەی ئەو ژورەدا بەرز کردەوە و لەناوەڕاستی ئەو ژورەدا دایاننان.

دوای ئەوە لەدەرەوە سرودێك کە لەڕێی چەند کەسێکەوە دەخوێنرا دەبیسترا و دوای چەند ساتێکیش کۆمەڵێك لەکاهینە کۆنەکانی ڕابردوو بەدەم خوێندنی سرودەوە خۆیان کرد بەو ژورەدا و چواردەوری ئەو سێ نەخۆشەیان دا.

دوای ئەوە بێ دابڕان سرودیان دەخوێند و هەڵقون هەڵقونیان دەکرد و جلەکانی بەریان داکەند و جەستەی خۆیان بەچەقۆی بەردین ڕوشاند، هەڵبەت بەشێویەك جەستەی خۆیان ڕوشاندبوو کە خوێن لەجەستەیانەوە دەچۆڕا.

من بەبینینی ئەم ڕەفتارانە سەرم سوڕما، لەبەرئەوەی جارێکیان ئەمەم لەسوریا بینیبوو، بەلام غەڵبە غەڵب و هەڵقون هەڵقونی کاهینەکان بەشێوەیەك زۆر بوو کە ترسی لا دروست دەکردی، لەکاتێکدا ئەمانە بەچەقۆکانی دەستیان کە زۆر لەهی

جادوگەری دەچوو بەردەوامی لەشی خۆیانیان پێ دەڕوشاند و لەناکاو دەرگایەك کرایەوە و چاوم بەپەیکەری"ئامون"ی خودای پێشوو کەوت و لەهەمان ئەوکاتەی پەیکەری ئەو خودایە دەرکەوت، هەموویان بێدەنگ بون.

ئەو بێدەنگیە، دوای ئەو هەموو غەڵبە غەڵبە گوێ هەژێنە، زۆر کاری تێکردم و وکاتێك خودای پێشوم بینی کە دەدرەوشایەوە شکۆمەندیەکم تێدا بەدی کرد.

کاهینێك کە لەسەرەتای ڕۆشتنم بۆ ئەو ژورە پێشوازی لێکردم، بەهەر سێ نەخۆشەکەی وت: ئێوە کە باوەڕتان بە"ئامون"ە هەستنەوە و بکەونە ڕێ، چونکە "ئامون"ئێوەی پیرۆز کردووە.

ئەوکات من بەهەردوو چاوی خۆم ئەو سێ نەخۆشەم بینی تەکانیان خوارد و لەحاڵێکدا کە تەماشای پەیکەری ئامونیان دەکرد، سەرەتا بەجوڵەیەکی لەرزۆك، لەسەر هەردوو ئەژنۆیان ڕاوەستان و ئەو پیاوەی کە هەردوو پێی ئیفلیج بوو، بەدەستەکانی دەیکێشا بەهەردوو پێیدا، ئەوکات بینیم کە وردە وردە هەستایە سەرپێ.

ژنەکەش وەك ئەو پیاوە هەستایەوە سەرپێ و دوو هەنگاوی نا و لەناکاو هەرسێکیان بەدەم گریانەوە ناوی"ئامون"یان هێنایە سەر زمان.

دوای ئەوە دەرگای ژوری پەیکەرەکەی ئامون داخرا و نۆکەرەکان چەند چرایەکی تریان داگیرساند بۆئەوەی بتوانم نەخۆشەکان باشتر بخەمە ژێر چاودێریەوە و بەسەرسوڕمانەوە بینیم نەك تەنها پیاوی ئیفلیج و ژن دەتوانن ڕێ بکەن، بەڵکو برینی جەستەی کوڕی لاویش لەناو چووە و جەستەی پاك و تەندروست بووەتەوە.

من زۆر سەرم لەو ڕوداوە سوڕما، چونکە بابەتی چارەسەرکردنی ئەو لاوە کە جەستەی لەژێر برینی ئاوڵەدا داپۆشرابوو، لەبەرچاوی مندا بەنهێنیەکی سەرسوڕهێنەر دەهاتە بەرچاو.

ئەو کاهینەی کە لەسەرتای چونم بۆ ئەو ژورە پێشوازی لێکردم وتی: "سینۆهە" ئایا لایەنگری ئەوە دەکەیت کە ئەم سێ کەسە بەتەواوی چارەسەر بون؟

وتم: چارەسەرکردنی ئەو دووانەیان، بەواتا ئەو ژن و پیاوە بەتەمەنە، لەڕوی زانستیەوە شایستەی ڕونکردنەوەیە، من دەتوانم وا لێکی بدەمەوە کە ئەو دوو کەسە، لەڕابردوودا بەهۆی ویستی جادوگەرانەوە یان بەشێوەیەکی سروشتی، لەبەکارهێنانی

پێکانیان بێبەش بون و ئێستاش ویستێکی جادوگەرانەی بەهێزیان بەکارهێنا و هێزی پێیانی بۆ گەڕاندەوە.

بەلاَم چارەسەرکردنی ئەو کوڕە لاوە، بەبۆچونی من زۆر سەرسوڕهێنەرە و من ناتوانم هیچ ڕونکردنەوەیەکی زانستی لەسەر بدەم، چونکە ناتوانرێت برینی جەستە بەجادووگەری و بەفشاری ویستی خود لەسەر کەسی نەخۆش، ئەویش لەو ماوە کورتەدا چارەسەر بکرێت.

من کاتێك چاوم بەبرین ئەم لاوە کەوت تێگەشتم کە برینی"گەڕیە"و خودی "گەڕی"ش چارەسەر ناکرێت، جگە لەوەی لەڕێی گۆگردەوە یان بۆ ماوەیەکی درێژ بەئاوی گەرم بیشۆری. بەکورتیەکە ئەم لاوە بیٚ بەکارهێنانی گۆگرد و شۆردنی لەناو گۆگرداودا، لەماوەیەکی کەمدا چارەسەر ناکرێت و ناچار دەبێت لایەنگری ئەوە بکەم کە ئەم چارەسەر کردنە، نەریتی سروشتی بەزاندووە و من تا ئەمڕۆ بەچاوی خۆم نەمبینیوە کە بتوانرێت بەوشێوەیە چارەسەر بکرێت.

کاهین وتی: ئەم لاوە و دووکەسەی تریش ئامون چارەسەری کردن، ئایا لایەنگری ئەوە دەکەیت کە ئامون پادشای خودایانە.

وتم: ناوی ئەم خودایە لەبەردەمی مندا بەدەنگێکی بەرز مەهێنەرە سەر زمان، لەبەرئەوەی فیرعەون ئەو خودایەی سەرنگونکردووە و قەدەغەیە ناوی بهێنرێت و من لەبەرئەوەی خزمەتی فیرعەون دەکەم، حەز ناکەم گوێم لەناوی بێت.

من ئاگاداری ئەوە بووم کە ئەم گوتانەم کاهینی توڕە کرد، بەلاَم لەبەرئەوەی پیاوێکی پایەبەرز بوو، خۆی بەسەر توڕەییەکەیدا زاڵکرد و وتی: ناوی من"هری بور"ە و من لەبەرئەوە ناوی خۆمت پیٚ دەڵێم کە بڕۆیت و من پیشانی فیرعەون بدەیت و ئەویش سەربازەکانی خۆی بنێرێت بۆئەوەی بێن دەستگیرم بکەن و بەدەم لێدانی قامچییەوە بمنێرن بۆ ناو کانە کانزاکان و لەویٚ کارم پیٚ بکەن، بەلاَم من نە لەفیرعەون دەترسم و نە لەسەرباز و قامچییەکانیان، هەرکەسێك باوەڕی بە"ئامون"بێت و بێت بۆ لای من، چاسەری دەکەم. لەبەرئەوەی من و تۆ هەردوکمان کەسێکی داناین، زۆرباشە گەر وەك دوو دانا لەگەڵ یەکدا گفتوگۆ بکەین، من داوای ئەوەت لێدەکەم بێیت بۆ ژوورەکەی من و پێکێك بخۆیتەوە، چونکە دەزانم ئەو شتانەی لێرەدا چاوت پێیان کەوت، ماندویان کردویت.

"هری بور"پزیشکی ماڵی ژیانی مەرەخەس کرد و منی لەپڕێەوە درێژخایەنە کانەوە تێپەڕاند و بەهۆی تەنگە نەفەسیمەوە زانیم کە لەژێر زەویدا ڕێ دەکەین و ئاگاداری ئەوە بووم کە ئێرە ئەو ژێر زەمینانەیە کە دەڵێن لەژێر پەرستگای پێشوی "ئامون"دا هەبووە، بەڵام ئەو کەسانەی جێی متمانە نین چاویان پێی نەکەوتووە.

دوای ئەوەی لەژێر زەمینەکانەوە تێپەڕین، گەشتینە ژورێکە کە کەرەستەی حەوانەوەی وەك شوێنی خەوتن و نوێن و چەند سنوقێك کە لە"ئابنوس[8]"دروست کراون لەوێدا دەبینرێت و"هری بور"ش بەڕێزەوە ئاوی ڕشت بەدەستمدا و دوای ئەوەی نانی شیرین و میوە و خواردنەوەی لەبەردەممدا دانا وتی: "سینۆهە" ئەوشەرابەی کە دەیخۆیتەوە، شەرابێکی کۆنە کە لەڕەزە دێمە کۆنەکانی "ئامون"دا دروست کراوە و ئەمڕۆ، لەمیسردا ئەم جۆرە شەرابە دروست ناکرێت، چونکە ڕزە دێمە پڕ بەرهەمەکانی"ئامون" لەناو چوون. دوای ئەوەی پێکێکی خواردەوە"هری بور"وتی:

"سینۆهە"ئێمە تۆدەناسین و دەزانین کە فیرعەونت خۆش دەوێت، بەڵام دەمارگیریت لەبەرامبەر خوداکاندا نیە و ئەوکاتانەی تۆ لە ماڵی ژیاندا دەتخوێند، زۆر گوێت بەبواری ئاین نەدەدا و زیاتر گرنگیت بەزانست دەدا، هەر لەبەرئەوەش ئەمشەو من سەبارەت بەئاین لەگەڵ تۆدا گفتوگۆ دەکەم و ئەم گفتوگۆیەی منیش بەفیرعەونەوە پەیوەست دەکرێت و دەزانم کە تۆ پیاوێکی مرۆڤ دۆستی و سەدان کەس لەو نەخۆشانەی هاتون بۆ لات گەواهی ئەوە دەدەن کە چارەسەری هەژارانت کردووە، بێئەوەی زێڕیان لەبەرامبەر ئەم چەرەسەرکردنەدا لێ وەرگری و ئەمڕۆش دوای ئەو هەموو ماوەیە کەئێرەت بەجێ هێشت و گەڕایتەوە بۆ"تبس" دوبارە بێئەوەی کانزایەك لەهەژاران وەرگری چارەسەریان دەکەیت.

کەواتە هیچ گومانێك لەوەدا نیە کە تۆ کەسێکی مرۆڤ دۆست و دڵسۆز و پارێزەری هەژارانی و بەرژەوەندی نەتەوەی میسرت دەوێت، لەبەرئەوە من دەتوانم پێت بڵێم کە"ئەخناتون"ی فیرعەونی میسر، بۆ ئەم وڵاتە بووەتە بەڵایەکی زۆر مەزن و لەو

[8]بڕۆ پەراوێزی ژمارە"٢٥"ی بەرگی یەکەمی سینۆهە.

وشکەساڵیەی کە خوداکەی ئەو بۆ ئەم میلەتەی هێنا هەرەشە ئامێزترە و بۆئەوەی ئەم نەتەوەیە لەوە زیاتر ستەم نەبینێت، دەبێت ئەم فیرعەونە و خوداکەی لەناو ببرێت.

من وتم: "هری بور"من لەسەردەمی لاویەتیدا زۆر گوێم بەخوداکان نەدەدا، لەبەرئەوەی دەمبینی هەرچی زیاتر خوداکانی میسر زیاتر بن، بەدبەختی خەڵکیش زیاتر دەبێت، بەڵام "ئاتون"ی خودای فیرعەون جیاوازیەکی زۆر مەزنی لەگەڵ خوداکانی تردا هەیە و ئەو جیاوازیەش ئەوەیە کە خوازیارە یەکسانیەك لەنێو خەڵکیدا بەرقەرار بکات و دەڵێت نابێت جیاوازی لە نێوان خاوەن و نۆکەرەکەیدا و خاوەن کار و کرێکارەکەیدا و دەوڵەمەند و هەژاردا هەبێت و دەبێت سامانیش بەشێوەیەك دابەش بکرێت کە هەموو خەڵکی میسر بەیەك ئەندازەی یەکسان سود لە زەوی و ئاو و خۆر وەرگرن، من لەو ڕۆژەوەی ئەم خودا تازەیەم ناسیوە، وا هەست دەکەم ساڵێکی نوێ لەم جیهانەدا دەستی پێکردووە و ئێمەش لەسەردەمێکدا دەژین کە درەوشاوەترین سەردەمی مرۆڤە[9].

چیتر لەجیهاندا ئەم هەلە بۆ مرۆڤ نارەخسێت کە پادشایەك بێت دەست بەسەر زەوی کەسانی تردا بگرێت و خەڵکی بکاتە نۆکەر و کەنیزەی خۆی و زێڕ و زیویان لەدەست بفڕێنێت، خۆی داهێنەری بەرقەرارکردنی یەکسانی و لەناوبەری جیاوازی دەوڵەمەند و هەژار بێت و زەوی خودای پێشوو بەنێو خەڵکیدا دابەش بکات و ئەو زێڕو زیوەی لەخەزێنەی خودای پێشودا دەستی بەسەردا گیراوە و بەوەوە پەیوەست دەکرێت، هەمووی لەدروستکردنی شاری تازەدا خەرج بکات. دەبێت سود لەم هەلە وەربگیرێت و لەنێو مرۆڤەکاندا یەکسانی و برایەتی بەرقەرار بکرێت.

"هری بور"وتی: لەو ماوەیەی کە فیرعەون بەو توندڕەویەوە یاساکانی خۆی لەکاتی خۆیدا جێ بەجێکرد، ئایا توانی جیاوازی نێوان دەوڵەمەند و هەژار لەناو ببات و لەنێو خەڵکیدا یەکسانی و برایەتی بەرقەرار بکات.

وتم: بەڵام دواجار، برایەتی و یەکسانی هەر بەرەقەرار دەکرێت.

---

[9] ساڵی جیهانی لەمیسری کۆندا، بیست و شەش یان بیست و حەوت هزار ساڵ بووە و کاتێك سینۆهە دەڵێت ساڵێکی نوێ لەجیهاندا دەستی پێکردووە، واتای ئەوە دەگەیەنێت کە سەردەمی بیست و حەوت هەزار ساڵی تازە لەجیهاندا دەستی پێکردووە.

"هری بور"وتی: "سینۆهە"تۆ پیاوێکی دانایت، بەڵام زۆر شارەزاییت لەبواری سیاسەتدا نیە و نازانی، ئەگەر یاساکانی خودای فیرعەون، شایستەی جێبەجێکردن بوایە، بەلایەنی کەم تائەمڕۆ هەندێکی لێ جێبەجێ دەکرا. بەڵام دەرئەنجامی جێبەجێکردنی یاساکانی خودای فیرعەون ئەوەبوو کە کاهین و خزمەتکار و کاربەدەستانی "ئامون"هەژار کەوتن، بەڵام لەباتی ئەوان کاهین و خزمەتکارانی خودای تازە دەوڵەمەند بون. چینێکی دەوڵەمەند لەناو چوو و لەباتی ئەوان چینێکی تازەی دەوڵەمەند هاتنە بون، ئەمڕۆ لەمیسردا جیاوازی نێوان هەژار و دەوڵەمەند زۆر زیاترە لەسەردەمی "ئامون".

"سینۆهە"تۆ پیاوێکی دادپەروەریت بۆیە داوات لێدەکەم بڕیار بدەیت، تۆ لەکۆندا کاهینی پەرستگای "ئامون"بویت و ئەگەر بەو پلەوپایە نەگەشتایەیت، ڕێیان پێ نەدەدایت لەماڵی ژیاندا بخوێنی، دوای کۆتایی هێنان بەخوێندنەکەشت، بویتە پزیشك، ئایا تۆ کە کاهینی کۆنی"ئامون"و لەماڵی ژیاندا خوێندنی پزیشکیت تەواو کردووە، ئامادەیت لەگەڵ نۆکەرێکدا یەکسان بیت؟ئایا ئامادەیت وەك نۆکەرێك بژیت و وەك ئەو لەسەر زەوی بخەویت و خواردنت بڕێك نان و قومێك ئاوجۆ بێت؟

وتم: "هری بور"بەهای من زۆر زیاترە لە نۆکەرێك، چونکە من چەند ساڵێك خوێندم تا بومە پزیشك، بەڵام نۆکەرێك کە نەیخوێندووە بەهای منی نیە.

"هری بور"وتی: لە"بابل"یشدا کەسانێك هەن کە دەڵێن ئێمە ساڵهایە ئەرك و زەحمەت دەکێشین و دانبەخۆداگریمان کردووە، تائەوەی هێڵامان ڕیشمان بەڕادەیەك درێژ ببێت کە بگاتە زەوی و لەبەرئەوەی خاوەنی ڕیشێکی درێژین، جیاوازین لەکەسانی تر و شایستەی ئەوەین لەکەسانی تر زیاتر سود لەکەرستەکانی ژیان وەرگرین و زێر و زیوێکی زیاترمان پێبدرێت.

وتم: ئەوکەسەی دەهێڵێت ڕیشی ئەوەندە درێژ ببێت تا دەگاتە زەوی، هیچ سودێك بەخەڵکی ناگەیەنێت و خزمەتی هیچ کەسێك ناکات، تا شایستەی زێڕ و زیوی زیاتر بێت لەخەڵکی، بەڵام ئەو پیاوەی کە خوێندنی لە ماڵی ژیاندا تەواو کردووە، دەتوانێت خزمەتی کەسانی تر بکات و سودیان پێ بگەیەنێت، لەبەرئەوە شایستەی ئەوەیە بڵێیت دەبێت لەکەسانی تر باشتر بژیت.

"هری بور"وتی: "سینۆهە"ئایا تۆ زیاتر خزمەتی خەڵکی دەکەیت یان ئەو جوتیارەی کە لە"بابل"یان لەمیسردا سەرقاڵی کاری کشتوکاڵیە و خواردن بۆ خەڵکی بەرهەم دێنێت. ئەگەر لەمرۆدا تۆ نەبیت خەڵکی لەبرساندا نامرن، بەڵام ئەگەر جوتیارێك نەبێت خەڵکی لەبرساندا دەمرن. ئایا تۆ زیاتر خزمەتی خەڵکی دەکەیت یان ئەو نۆکەرەی کە لەکانە کانزاکاندا سەرقاڵی دەرهێنانی زێڕ و زیوە و بەزێڕ و زیوی ئەو تۆ دەتوانی هەرچیت بوێت پێی بکڕیت. کەواتە بۆچی ئەو جوتیارەی کە لەتۆ زیاتر خزمەتی خەڵکی دەکات و سود بەخەڵکی دەگەیەنێت برسیەتی، هەروەها بۆچی ئەو نۆکەرەی کە بەبرسیەتی لەکانە کانزاکاندا دەبێت ئەرك بکێشێت تا دەمرێت؟ لەهەمان کاتدا بۆچی تۆ ئامادە نیت بەئەندازەی ئەو خزمەتەی ئەوان لەبەرامبەر خەڵکیدا دەیکەن پاداشتیان بدەیتێ؟

کەواتە ئەوەی دەبێتە هۆی ئەوەی لەنێو نەتەوەیەکدا دەوڵەمەند و هەژار بێتەبون ئەوە نیە کە دەوڵەمەندەکان لە هەژارەکان زیاتر خزمەتی خەڵکی دەکەن، بەڵکو جیاوازی نێوان هەژار و دەوڵەمەند، لەدوو هۆوە سەرچاوە دەگرێت، یەکێکیان خودا و ئەویتریان حکومەتە. لەهەر شوێنێکدا خودا و حکومەتێك هەبێت، بڕێك لەخەڵکی هەژار و بڕکەی تریان دەوڵەمەند دەبێت، چونکە کاهینەکانی خودای میسر ئەو مافە بەخۆیان دەدەن لەکەسانی تر باشتر بژین و دەوڵەمەندترین و کارمەندانی حکومەتیش خۆیان بەخاوەن ماف دەزانن کە هەڵگری هەموو تایبەتمەندیەك بن. ئەم دوو دەستەیە، بۆئەوەی جیاوازی نێوان خۆیان و کەسانی تر بەواتا لەنێوان دەوڵەمەند و هەژاردا بپارێزن، چەند یاسایەك لەکاتی خۆیدا جێبەجێ دەکەن کە بەوپەڕی هەوڵیانەوە هەژاران نەتوانن ببنە کەسێکی دەوڵەمەند و نەگەنە ئاستی ئەوان.

حکومەتی"بابل"یاسای ڕیش بۆ پاراستنی جیاوازی نێوان دەوڵەمەند و هەژار جێبەجێ دەکات و حکومەتی میسریش یاسای خوێندن لەماڵی ژیاندا جێبەجێ دەکات بۆئەوەی جیاوازی نێوان هەژارو دەوڵەمەند بپارێزێت، بەڵام لەمیسر و بابل و سوریا و هاتی و کریت و جێگاکانی تردا ئامانجی کاهینەکانی خودا و کارمەندانی حکومەت تەنها شتێکە، ئەویش ئەوەیە کە تایبەتمەندی کاهینەکانی خودا و کارمەندانی حکومەت بۆ ئەوان بمێنێتەوە، تا ئەوپەڕی توانا هیچ کەسێك نەبێتە هاوبەشی ئەوان.

"سینۆهە" تا ئەوکاتەی یەك خودا و یەك حکومەت لەمیسردا هەبێت، جیاوازی نێوان دەوڵەمەند و هەژاری هەر دەمێنێت لەبەرئەوەی میسر و وڵاتانی تر بێ خودا و حکومەت ناتوانن بژین، کەواتە بە بەردەوامی ئەم جیاوازیە بونی هەیە و فیرعەونەکەی تۆش کە دەیەوێت ئەم جیاوازیە لەناوببات، پەنای بۆ کارێکی شێتانە بردووە و لەبەرئەوەی ئەم کارەی"ئەخناتون"دەبێتە هۆی لەناوبردنی میسر، دەبێت لەناو ببرێت بۆئەوەی میسر ڕزگاری ببێت.

من کە بەبیستنی ئەم گوتانە پەشۆکابوم، بڕێکم خواردەوە بۆئەوەی ئەم پەشۆکاویەم لەناوببەم، "هری بور" وتی: "سینۆهە"تۆ پیاوێکی بێزیانیت، بەڵام کەسێکی میسریت و کەسێکی میسریش نابێت لەم جەنگەدا کە ئامانجی ڕزگارکردنی میسرە بەبێ لایەن بمێنێتەوە، چونکە بێلایەنی هەڵهاتنە لەئەنجامدانی ئەرك و ترسنۆکیە و ئێمەی پەیڕەوانی ئامون ئامادە نین بەنەرم و نیانی و ڕێزەوە ڕەفتار لەگەڵ کەسە بێلایەنەکاندا بکەین، چونکە ئێمە قوربانی دەستی کەسە بێلایەنەکانین.

ئەو ڕۆژەی فیرعەون بڕیاری دا خودای ئێمە لەناو ببات، بەهیوای ئەوە بوین کە نەتەوەی میسر، بەلایەنگری خودای خۆیان و دژایەتی کردنی خودای نوێ ڕاپەڕن و نەهێڵن خودا و داب و نەریتەکەی لەناو ببەن، بەڵام بینیمان زۆربەی خەڵکی ئەم وڵاتە بێلایەن بون و لەترسی گیانی خۆیان یان سامان وماڵیان، دەستیان خستە ناو دەستی یەکترەوە و بێدەنگ بون. ئەوە ئەم بێلایەنانە بون ئێمەیان لەناوبرد. ئەگەر ئێمە پێش ئەوەی فیرعەون لەگەڵ"ئامون"دا بجەنگێت، بمانزانیایە کە خەڵکی بێلایەنی هەڵدەبژێرن، بۆ ڕوبەڕوبونەوەی دوژمن سەربازمان لەوڵاتانی ترەوە بەکرێ دەگرت لەبەرئەوەی زێڕ و زیومان هەبوو دەمانتوانی سوپایەکی مەزن دروست بکەین، بەڵام بەهیوای ئەوەی هەموو میسر لایەنگری"ئامون"ن و ناهێڵن خوداکەیان سەرنگون ببێت، چاوپۆشیمان لەئەمادەکردنی هێزێکی سوپای سەربازی کرد.

ئێستا"سینۆهە" تۆ کە تا ئەمڕۆ بێلایەن بویت، دەبێت بڕیاری خۆت بدەیت و پێم بڵێیت کە ئایا دەبیتە دۆست یان دژمنی ئێمە، چونکە ئێمە تەواوی بێلایەنەکان بەدوژمنی خۆمان دەزانین و ئەوەی لەگەڵ ئێمەدا نیە دژمنی ئێمەیە، لەبەرئەوەی تۆ پیاوێکی سروشت چاکیت، بۆئەوەی بتوانی بڕیاری خۆت بخەیتە ڕوو، پێت دەڵێم کە فیرعەونی تۆ بۆ هەتا هەتایە نامێنێت. من ئەم قسانە بۆ کەسانی تر ناکەم، بەڵات

بەتۆی دەڵێم، چونکە تۆ دانایەکی بەتوانایت و دەتوانیت گوێ لەگوتەگەلێك بگریت کە کەسانی تر توانای بیستنیان نیە.

وتم: "خری بور"دەتەوێت چێم پێ بڵێیت؟

"هری بور"وتی: ئێمە بەرنامەیەکمان بۆ مەرگی فیرعەون داڕێژاوە و ئەو دەمرێت بەڵام بەم زوانە نا.

وتم: "هری بور"ئایا سەگێکی هار گازی لێگرتویت یان دوپشکێك پێوەی داویت، کە بەوشێوەیە قسەم لەگەڵدا دەکەیت.

"هری بور"ئەو چرایەی کە لەو ژورەدا بوو هەڵگرت و وتی: وەرە با شتێکت پێنیشان بدەم.

منیش هەستام و بەدوای ئەودا لەو ژورە چومە دەرەوە و بەڕێڕەوەکەدا تێپەڕین و دوبارە ئەو پیاوە منی لەو دالأنەوە تێپەڕاندەوە و گەشتینە لای ژورێك و دەرگاکەی کردەوە، کاتێك خۆمان کرد بەو ژورەدا چاوم بە بەستە زێڕ و زیوەکان کەوت.

بینینی ئەو کانزایانە منی هێنایە بزە و سەرم لەسادەیی"هری بور"سوڕما.

ئەویش زەردەخەنەکەی منی بینی و وتی: "سینۆهە"من منداڵ نیم کە بمەوێت تۆ لەڕێی زێڕ و زیوەوە فریو بدەم و بتکەمە هاودەستی خۆم، من دەزانم کە تۆ پزیشکی فەرمانڕەواییت و لەدیدی پزیشکێکی فەرمانڕەواوە زێڕ و زیو هیچ بەهایەکیان نیە، چونکە هەرچەنێکی بوێت دەتوانێت کانزا گرانبەهاکان بەدەست بهێنێت، بەڵکو من لەبەرئەوە تۆم هێنایە ئەم ژورە کە ناچاربوین لەوێوە تێپەڕین و خۆمان بکەین بەژورێکی تردا.

دوای ئەوەی دەرگایەکی مسینی قورسی کردەوە و منی کرد بەژورێکی تردا و بەڕوناکی چراکەی دەستی شتێکی پێشانی من دا، سەرەڕای ئەوەی خۆم بەکەسێکی ئەفسانە پەرست نازانم، بەبینینی ئەو شتە لەرزم لێهات.

لەو ژورەدا لەسەر تاوێرە بەردێکی گەورەدا، وەك کورسیەکی درێژ پەیکەری مۆمیای فیرعەونی"ئەخناتون"ی داناوە کەچەندتیرێکیان بەسەرو سینەیدا چەقاندبوو.

"هری بور"وتی: "سینۆهە"ئێمە بەناوی"ئامون"بڕیاری مەرگمان بۆ فیرعەونەکەی تۆ دەرکردووە و ئەم تیرانەی کە دەیانبینی، تیرگەلێکی پیرۆزن کە بەناوی"ئامون" پیرۆز کراوە و بەدڵنیاییەوە فیرعەونی تۆ دەمرێت، بەڵام بەداخەوە ئێمە ناتوانین بەم

زوانە بیکوژین، چونکە بۆ ماوەیەك درێژە دەكێشێت، تا ئەوكاتەی ئەو بەهۆی ئەو برینانەی کە ئێمە لێرەدا لەسەر پەیکەری نمونەیی ئەودا دروستی دەکەین بمرێت و تا ئەو ماوەیەش شێتی ئەم پیاوە میسر بەدبەختر و وێرانتر و لاوازتر دەکات.

"سینۆهە"لەبەرئەوە ئەم دیمەنە پیشانی تۆ دەدەم کە بزانی بەرژەوەندی تۆ لەوەدایە کە دەست لەم بێلایەنیە هەڵگریت و ببیتە هاوڕێی ئێمە، چونکە"ئەخناتون" دەمرێت و تۆش بێ فیرعەون دەمێنیتەوە و ئەو پلەوپایەیەی کەئێستا هەتە، لەدەست دەدەیت.

"هری بور"منی لەو ژورە هێنایە دەرەوە و دەرگاکەی داخست و گەڕاینەوە بۆ ئەو ژورەی کە شەرابمان تێدا دەخواردەوە، ئەو پێکێکی بۆ داکردم و وتی: ئێمە بۆئەوەی فیرعەون بکوژین، دوای دروست کردنی ئەم پەیکەرە مۆمیاییە، بڕێك موی سەری و ناخونی ئەومان لەشاری"ئاسۆ"دا بەدەست هێناوە و لەم پەیکەرەدا بەکارمان هێناوە و ئەو کەسانەی موی سەر و وردە ناخونیان بۆ هێناوین، لەپێناو زێڕ و زیودا ئەم کارەیان نەکردووە، بەڵکو لەبەرئەوەی باوەڕیان بە"ئامون"ە و تەنها مەبەستیان هاوکاری کردنی ئێمەیە.

دوای ئەوە"هری بوری"وتی: تواناى خوداى ئێمە ساڵ لەدواى ساڵ زیاتر دەبێتو تۆ خۆت ئەمشەو لێرەدا بینیت کە ئێمە توانیمان بەپشت بەستن بەتوانای خودای خۆمان"ئامون"کەسە نەخۆشەکان بێ دەرمان و برینپێچی و چەقۆ و ئاگر چارەسەر بکەین و تواناکانی"ئامون"لەڕۆژانی ئایندەدا لەئێستا بەهێزتر دەبێت و زیاتر وڵات و نەتەوەی میسر دوچاری نەفرەت دەکات، چونکە"ئامون" زۆر لەوڵات و نەتەوەی میسر توڕەیە.

فیرعەون هەرچەنێك بژیت توڕەیی"ئامون"لەبەرامبەر نەتەوەی میسردا زیاتر دەبێتو ئەگەر فیرعەون بمرێت، نەتەوەی میسر لەبەدبەختی ڕزگاری دەبێت و تۆ کە پزیکشی تایبەتی ئەویت، دەزانی کە فیرعەون سەرئێشەی لەگەڵدایە و ئەم سەرئێشەیەش تواناکانی ئەو هەڵدەوەشێنێتەوە، تا ئەوکاتەی دەیکوژێت و باشتریش وایە زوتر ئەمە ڕوو بدات و ئەگەر تۆ حەز بکەیت من ئامادەم دەرمانێکت پێبدەم کە فیرعەون لەسەرئێشە و تەواوی ئازارەکانی ئێستا و ئاینده چارەسەر بکات.

وتم: "هری بور"مرۆڤ تا زیندوو بێت، لەوانەیە نەخۆش بکەوێت و دوای ئەوەی چووە قۆناخی پیریەوە، نەخۆشیەکانی زیاتر دەبن، لەبەرئەوە ناتوانی دەرمانێك دەرخواردی کەسانێك بدەین کە لەبەرامبەر نەخۆشیەکانی ئێستا و ئایندەدا بیپارێزێت، تەنها مەرگە کە مرۆڤ لەتەواوی نەخۆشیەکان ڕزگار دەکات.

"هری بور"وتی: ئەو دەرمانەی کە من پێتی دەدەم، بۆئەوەی درخواردی فیرعەونی بدەیت، ئەو لەتەواوی ئازارەکان ڕزگار دەکات، بێئەوەی شوێنەوارێك لەجەستەیدا بەجێ بهێڵێت، بگرە دوای ئەوەی جەستەی سپێدرا بە مۆمیاگەران، کارمەندانی مۆمیاکردنیش ناتوانن ئەوە دەستنیشان بکەن کە ئەو بەهۆی دەرمانەوە کوژراوە، چونکە هیچ شوێنەوارێك لەجگەری ڕەش و گەدە و ڕیخۆڵەیدا بەجێ ناهێڵێت.

دوای ئەم گوتەیەی، پێش ئەوەی وەڵامی بدەمەوە،"هری بور"وتی: "سینۆهە" ئەگەر تۆ ئەم کارە ئەنجام بدەیت و فیرعەون لەڕێی ئەم دەرمانە خەوێنەرەوە کە دواجار دەبێتە هۆی مەرگی، بینێریتە جیهانی خۆرئاوا[10]، ناوی تۆ لەلایەن "ئامون"و پەیڕەوانیەوە بەنەمری دەمێنێتەوە، لەبەرئەوەی ناوت بەنەمری دەمێنێتەوە، وەك ئەوە وایە کە ژیانێکی جاویدانەت هەبێت و ئێمەش بەواتا"ئامون"و پەیڕەوانی، پارێزگاری لەتۆ و نەوەکانت دەکەین و تا ئەو ڕۆژەی میسر هەیە و تیشکی خۆری لێ هەڵدێت، نەوەکانت بەخۆشی و ڕێزەوە ژیانی خۆیان بەسەر دەبەن، ئەگەر تۆ پیاوێکی تەماع یان هەژار بویتایە، من زێرم پێدەدایت بۆئەوەی فیرعەون بۆ بارەگایەکی تر بگوازیتەوە، بەڵام تۆ لەوە مەزنتری کە بتوانن بەزێر چەشتەت بکەن، بۆ کەسانێکی وەك تۆ تەنها شایستەی پاداشتێکی ئەویش، مانەوەی ناوتە.

ئەوکات"هری بور"چاوە درەوشاوەکانی.ئاڕاستەی چاوی من کرد و کاتێك من تەماشای چاوانی ئەوم دەکرد، دوچاری حاڵەتێکی خاوبونەوە بوم و هەستم بەوە کرد کە کەوتومەتە ژێر ویستی ئەو پیاوەوە، بەڵام ڕۆحم ئامادە نەبوو ڕاسپاردەکانی پەسەند بکات.

"هری بور"درێژەی پێداو وتی: "سینۆهە"تۆ لەبەرئەوەی داناو پزیشکیت، دەزانی کە دەتوانرێت تاڕادەیەك ویستی کەسانی تر بخەیتە ژێر فەرمانی خۆتەوە، من ئەگەر

---

[10] جیهانێکی تر بەپێی بیروباوەڕی میسریە کۆنەکان، دەقاودەق جیهانێکی هاوشێوەی بەهەشتی ئێمە بووە.

ئێستا پێت بڵێم دەست بەرز بکەرەوە، تۆ بەرزی دەکەیتەوە و ئەگەر پێت بڵێم هەستە سەر پێ، تۆ هەڵدەستیت، بەڵام ناتوانم تۆ هانی ئەنجامدانی کارێك بدەم کە ڕۆحت پەسەندی ناکات. من ناتوانم تۆ وات لێبکەم کە باوەڕ بە"ئامون"بهێنی، مەگەر ئەوەی خودی خۆت ئارەزوی ئەوە بکەیت"ئامون"بپەرستیت، هەروەها ناشتوانم تۆ هانی ئەوە بدەم ئەو دەرمانەی من دەرخواردی فیرعەونی بدەیت، مەگەر ئەوەی خودی خۆت خوازیاری ئەوە بیت ئەم کارە ئەنجام بدەیت، بەڵام وڵات و نەتەوەی میسر داوات لێدەکات ئەم دەرمانەی کە من ئامادەم کردووە، وەرگریتو لەفیرعەوندا بەکاری بهێنیو نەتەوەی میسر ڕزگار بکەیت.

تا ئەوکاتەی"هری بور"بەشێوەیەکی تایبەت لەچاوانی من ڕامابوو، من نەمدەتوانی دەستەکانم ڕاتەکێنم، بەڵام دوای ئەوەی چاوی لێهەڵبڕیم توانیم دەستەکانم بجوڵێنم وتم: "هری بور"من لەئێستادا هیچ بەڵێنێکت پێنادەم، بەڵام دەرمانەکەتم پێبدە، با لەلای من بێت، لەوانەیە خودی فیرعەون ڕۆژێکیان نەیەوێت لەخەو هەستێتو ڕازی بێت بەدەرمانێکی لەتلیاك بەهێزتر بیخەوێنم، بێئەوەی چیتر بێداری بەدواوە بێتو دوای بێداربونەوەشی ئازار نەکێشێت.

"هری بور"شوشەکەی بۆ هێنام و وتی: ئەو دەرمانەی کە پێتی دەدەم، لەناو شوشەدایە و ئێستا کە تۆ ئەم شوشەیەم لێوەردەگریت، ئایندەی میسر لەدەستی تۆدایە و ئێمە دەتوانین بەشێوەیەکی تر فیرعەون لەناو ببەین، چونکە ئەویش مرۆڤە و کاتێك نێزە یان چەقۆیەك دەکەین بەجەستەیدا خوێنی لێ دەڕژێت و دواجاریش دەمرێت، بەڵام نابێت ئەم ڕوداوە بێتە پێش، چونکە ئەگەر خەڵکی تەنها بۆ جارێك ببینن کە دەتوانرێت فیرعەون بەکوشت بدرێتو دوای کوشتنیشی هیچ شتێك ڕونەدات، لەمکاتەدا مەرگی فیرعەون لەم جیهانەدا لەمەرگی کۆیلەیەك کاریگەرتر نابێت، ئەوا لەم حاڵەتەدا هەوڵی ئەوە دەدەن فیرعەونەکانی تریش بکوژن، بەم هۆیەوە لەئایندەدا دەستەڵاتی میسر دوچاری پەشێوەیەك دەبێت و بەردەوام لەم وڵاتەدا نائارامی و بێبەند وباری فەرمانڕەوا دەبێت، بۆیە باشتر وایە فیرعەون بەشێوەیەك لەناو ببرێت کە خەڵکی وا بزانن ئەو بەمەرگێکی سروشتی مردووە و تۆ دەتوانی ئەم ڕوانگەیە لەخەڵکیدا بهێنیتە بون و ئێستا تۆ، تەنها کەسێکیت کە توانای ڕزگار کردنی میسری هەیە و چارەنوس لەدەستی تۆدایە.

وتم: "هری بور"تۆ سەرەڕای ئەوەی وا هەست دەکەیت ئاگاداری هەموو شتێکیت، بەڵام لەهەندێك شت بێئاگایت و نازانی کە چارەنوسی میسر لەدەستی کەسێکدا بوو کە سەبەتەی دەچنی.

"هری بوری"پرسی: مەبەستت لە چنینی سەبەتە چیە؟

وتم: ئەم بابەتە داستانێکی دور و درێژە، بەهەرحاڵ ئێستا دەرمانەکەی تۆ لەلای منە، بەڵام ئەوەت لەیاد بێت کە من بەڵێنم پێنەداویت.

"هری بور"وتی: بەڵام ئەگەر میسر ڕزگار بکەیت، پاداشتێکی مەزنت پێدەدرێت.

ئەوکات بێئەوەی چاوەکانم ببەستێت، لەو ژێر زەویانەی کە لەژێر پەرستگای پێشووی"ئامون"دا هەبوو هێنایە دەرەوە و پێش ئەوەی لەو ژێر زەمینە بێمە دەرەوە، پێی وتم: "سینۆهە"تۆ پیاوێکی دەست پاك و نهێنی پارێزی و من بەپێویستی نازانم کە ئەوەت پێڕاسپێرم نهێنی بونی ئەم ژێر زەویانە و بەتایبەت ڕێگای هاتنە ژورەوەی بۆهیچ کەسێك باس بکەیت، چونکە لەوانەیە لە"تبس"دا کەسانێك هەن کە دەزانن لەپەرستگای"ئامون"ژێرزەمینگەلێك هەبێت، بەڵام هیچ کەسێك ناتوانێت خۆی بکات بەو ژێر زەمینانەدا.

وتم: "هری بور"لەوانەیە ڕۆژێك بێت بڵێم کە لەژێر پەرستگای پێشوی"ئامون"دا ژێرزەمینگەلێك هەبن، بەڵام هەرگیز ڕێگای چونە ژورەوەی ئەو ژێر زەمینانە بەهیچ کەسێك ناڵێم، چونکە ئەوەیان پەیوەندی بەمنەوە نیە.

****

چەند ڕۆژێك دوای ئەوە"تی ئی"دایکی فیرعەون لەکۆشکەکەی خۆیدا بەهۆی ژەهری مارێکی ژەهراوی کۆچی دوایی کرد.

دایکی فیرعەون کە بەهۆی خووەکانی سەردەمی لاویەتی، بەپێی ئەو زانیاریانەی کە لەباوکیەوە فیری بوبو، باڵندەکانی لەڕێی داوەوە دەستگیر دەکرد، ڕۆژێکیان بۆئەوەی سەر لەداوەکانی بدات، ڕۆشت بۆ ناو باخی کۆشك و ئاگاداری ئەوە نەبوو کە لەوشوێنەی باڵندەیەکی بچوك هەبێت، لەوانەیە مارێکیش هەبێت، دوچاری ژەهری مارێکی بچوکی ژەهراوی بەناوی"سراست" بوو. دوای ئەوەی مارەکە گەستی، چزوی مارەکە ڕۆچووە ناو جەستەیەوەو هاواری کردو خزمەتکارەکانی ڕایانکرد و ویستیان پزیشکەکەی بانگ بکەن، بەڵام پزیشکە تایبەتەکەی بەشێوەیەکی هەمیشە لەمجۆرە

کاتانەدا ئەگەری ئەوە هەیە کە لەویٚ نەبێت، لەبەرئەوە منیان هێنایە سەر جێگە خەوەکەی، بەڵام من دەمزانی کە ئەو مردووە.

چونکە کەسێك دوچاری ژەهری ماری"سراست"ببێت، تەنها لەیەك حاڵەتدا زیندوو دەبێت، ئەویش ئەوەیە پێش ئەوەی دڵی سەد ترپە لێبدات شوێنی گەستنەکە هەڵدڕن و بەشی سەرووی ئەو شوێنەی کە مارەکە گەستویەتی بەپەتێك ببەستن و بهێڵن خوێنێکی زۆر لەو پیاوە یان ئەو ژنە مارگەستە بێتە دەرەوە.

بەڵام لەکۆشکی"تی ئی"دا کەسێك بیری لەوە نەرکردووەتەوە و کاتێك من گەشتمە ئەویٚ: بینیم دایکی فیرعەون مردووە و وتم: چیتر هیچ کارێك لەمن ناوەشێتەوە و دەبێت لاشەکەی بدەن بەمۆمیاکەرەکان، بۆئەوەی مۆمیای بکەن.

"ئامی"کاهینی مەزنی پەرستگای"ئاتون"کاتێك بیستی دایکی فیرعەون مردوە دەستەکانی خستە سەرگۆنای"تی ئی"و وتی: باشتروابوو کە بمرێت، چونکە"تی ئی"سەرەڕای ئەوەی هێشتا لاو و جوان بوو، پلانی دژی من دادەڕێژا و ئێستاش کە ئەو مردووە، هیوادارم خەڵکی بەئارامی بژین.

من لەوباوەڕەدا نەبوم کە"ئامی"ئەوی کوشتبێت و گەرچی کاهینی پەرستگا "ئاتون"دایکی فیرعەون کە ژنێکی پیر بوو خۆش نەدەویست، بەڵام هاودەستی یەکتری بون و دەیانزانی کە سود بەیەکتری دەگەیەنن و لەم جیهانەدا یەکێتی بەرژەوەندیەکان لەعیشق زیاتر مرۆڤەکان لەیەکتری نزیك دەکاتەوەو بەردەوامی و یەکانگیری بەرژەوەندی زۆر لەئیشق بەهێزترە.

کاتێك هەواڵی مردنی"تی ئی"لە"تبس"دا بڵاو بویەوە، خەڵکی ئاهەنگیان گێڕاو بەخۆشی مەرگی دایکی فیرعەون شەرابیان خواردەوەو بەدەنگێکی بەرز دەیانوت ئێمە لەشەڕی جادوگەران ئاسودە بکەیت.

"ئامی"بۆئەوەی خەڵکی ڕازی بکات، پێنج جادوگەری ڕەشپێست کە یەکێکیان ژنێکی قەڵەو بوو، لەکۆشکی"تی ئی"دەرکرد و خەڵکی بەیەکجار و پێکەوە ڕژان بەسەریاندا، سەرەڕای ئەوەی ڕەشپێستەکان جادوگەر بون، نەیانتوانی لەڕێی جادووەکەیانەوە خۆیان لەدەستیان ڕزگار بکەن، بۆیە بەکوشتیان دان.

دوای مەرگی جادوگەران"ئامی"تەواوی کەرەستەی جادوگەرەکانی تێکشکاند و ئاگری تێبەردان و من لەم ڕۆوداوە زۆر بەداخ بوم، چونکە حەزم دەکرد بزانم

ڕەشپێستەکان چ دەرمانێك بەکار دەهێنن و بەچ شێوەیەك کەسانی تر چارەسەر دەکەن.

هیچ کەسێك لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا بۆ مەرگی"تی ئی"و جادوگەرە ڕەشپێستەکانی نەگریاو نەهاتنە سەر جێگەکەی و تەنها شازادە خانم"باکتاتون"ی کچی"تی ئی"خۆی گەیاندە جێگە خەوەکەی دایکی.

ئەوە هەمان ئەو کچە بوو کە"تی ئی"پێی وتم پێش فیرعەون ئەم کچەی بووە و منیش تا ئەو کاتە چاوم پێی نەکەوتبوو.

شازادە خانم"باکتاتون"کاتێك منی لەتەنیشتی لاشەی دایکی مردویدا بینی پرسی: ئایا تۆ "سینۆهە"یت؟

وتم: بەڵێ.

وتی: ئایا تۆ نەتدەتوانی ڕێ لەکوشتنی ڕەشتپێستەکان بگریت؟

وتم: "باکتاتون"تۆ دەزانی کەمن لە"تبس"دا هیچ دەستەلاتێکم نیە و لەم شارەدا دەستەلات لەدەستی"ئامی"کاهینی مەزنی پەرستگای"ئاتون"و"هورم هب"فەرماندەی هێزی سەربازی میسردایە، ئەگەر من ڕێم لەکوشتنی ڕەشپێستەکان بگرتایە، خودی خۆشم بەدەستی خەڵکی بەکوشت دەدرام، بێئەوەی کوشتنی من ڕێ لەکوشتی ڕەشپێستەکان بگرێت، چونکە خەڵکی دەزانن من پزیشکی فیرعەونم و وا هەست دەکەن کە من لەگەڵ دایکتدا هاودەست بووم و دژایەتی خودای پێشوو دەکەم.

شازادە خانمیش لایەنگری ئەم گوتەیەمی کرد، دوای ئەوە وتی: ئەو ڕەش پێستە داماوانە هیچ تاوانێکیان نەبوو و نەیاندەویست جادوگەری بکەن، ئەگەر ئازاد بونایە دەگەڕانەوە دارستانەکانی خۆیان و لەوێدا دەژیان، چونکە ئەوان وەك گیانەوەرە کێویەکانی دارستان وابوون و نەیاندەتوانی لەشاردا بژین، دایکم بەزۆر ئەوانی لەمشارەدا ڕاگرتبوو و لەژێرزەوی ئەم کۆشکەدا زیندانی کردبون و من سەرم لەوە سوڕ دەما، بۆچی"هورم هب" ڕێی لەکوشتنیان نەگرت.

دوای ئەوە شازادە خانم"باکتاتون"دەربارەی ژنهێنانی"هورم هب" قسەی کرد و وتی: من سەرم لەوە سوڕ دەمێنێ ئەم پیاوە بۆچی ژن ناهێنێت بۆئەوەی ببێتە خاوەنی خێزان و منداڵ.

وتم: کەسانی تریش ئەم پرسیارەیان لێکردوم و من هیچ وەڵامێکم نەداونەتەوە، بەڵام وەڵامی ئەم پرسیارەی تۆ دەدەمەوە، لەبەرئەوەی ئەو وەڵامەی من بەتۆوە پەیوەست دەکرێت. "هورم هب"دوای ئەوەی هاتە ناوشاری"تیس"ەوە و بۆیەکەمین جار پێی نایە کۆشکی فەرمانڕەوایی، چاوی بەتۆ کەوت و کاتێك جوانی بێوێنەی تۆی بینی چیتر نەیتوانی تەماشای هیچ ژنێکی تر بکات، لەبەرئەوەی چاوی بەهەر ژنێك بکەوتایە بەناشیرن دەهاتە بەرچاوی و هەرلەبەرئەوەش تا ئەمڕۆ نەیتوانیوە لەگەڵ هیچ ژنێکدا گۆزە بشکێنێت.

بەڵام"باکتاتون"تۆ بۆچی شوو ناکەیت بۆئەوەی ببیتە خاوەنی منداڵگەلێکی زۆر؟ مەگەر تۆ نازانی کە درەخت، بەبەردەوامی گوڵ و میوە نابەخشێت و ڕۆژێك دێت باشترین درەخت کە لەکەنار زەلکاوەکانی ڕوباری"نیل"دا گەشەیان کردووە، لەگوڵ و میوە بەخشین دەکەون.

شازادە خانم وتی: "سینۆهە"تۆ دەزانی کە خوێنی من خوێنی فەرمانڕەواییە، بەواتا لەخودایان و پاکترین کەسە مەزنەکانی میسرە، ئەوان بۆ هاوسەری من بچوکن، چ بگات بە"هورم هب"بۆیە تەنها یەك کەس شایستەی ئەوەیە ببێتە هاوسەری من ئەویش فیرعەونی برامە، بەڵام فیرعەون ژیانی هاوسەری لەگەڵ"نفر تی تی"دا پێك هێناوە. سەرەڕای ئەوەش خۆشم حەزم بەشوکردن نیە، لەبەرئەوەی بیستومە کاتێك پیاوان بیانەوێت لەگەڵ ژنەکاندا ڕابوێرن توندوتیژی لەخۆیان دەنوێنن و لەهەندێك ژنیشم بیستووە ئەو چێژەی کە دەڵێن ژن لەکاتی ڕابواردن لەگەڵ پیاوێکدا بەدەستی دەهێنێت هەمووی درۆ و زیادەڕۆییە و لەچێژی خواردن و خواردنەوە زیاتر نیە.

کاتێك"باکتاتون"بەوشێوەیە قسەی دەکرد، تەماشام دەکرد و دەمبینی کە ڕوخساری سور وەرگەڕاوە و هەناسە بڕکێی تێکەوتووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لەناخەوە بۆچونی لەبارەی پیاوانەوە بێچەوانەی ئەوەیە کە دەیهێنێتە زمان، چونکە هەستم بەوە کرد کە شازادە خانم چێژ لەم گفتوگۆیە وەردەگرێت، بۆیە بەردەوامیم دا بەو گفتوگۆیە و وتم: "باکتاتون"ئەو توندوتیژیەی کە لەکاتی ڕابواردندا لەبەرامبەر ژناندا بەکاری دەهێنن، توندوتیژی ڕاستەقینە نیە، بەڵکو لەخۆشەویستیەکی زۆرەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەبەرامبەر ژناندا هەیانە و تەواوی ژنەکان ئەم جۆرە توندتیژیەیان لا پەسەندە، بەڵام لەبەرئەوەی"هورم هب"هێشتا گۆزەی لەگەڵ هیچ

ژنێکدا نەشکاندووە، تۆ دەتوانی بەو شێوەیەی کە خۆت حەزت لێیەتی پەروەردەی بکەیت، چونکە پیاو هەرچەنێك بەهێز و ئازا بێت، تا ئەوکاتە لەگەڵ ژنێکدا گۆزە نەشکێنێت، لەبارەی ئەو بابەتانەی کە بەرابواردنی ژنانەوە پەیوەست دەکرێت، لەگەڵ منداڵێکدا جیاوازی نیە و ژنەکەی دەتوانێت بەو شێوەیەی کە خۆی حەزی لێ بێت پەروەردەی بکات، بۆئەوەی بەپێی خواست و ئارەزووەکانت لەگەڵیدا رابوێرێت، تۆش دەتوانی"هورم هب"ی بەهێز و ئازا لەتەنیشت خۆتەوە لەوە ئاگادار بکەیتەوە کە بەنەرم و نیانی مامەڵەت لەگەڵدا بکات، وکاتێك لەگەڵ تۆدا کات بەسەر دەبات، وا بیهێنەرە بەرچاوت کە بەپەڕی سینەی مراوی نەوازشی جەستەت دەکات.

"باکتاتون" وتی: "سینۆهە" من حەز ناکەم باسی"هورم هب"م بۆ بکەیت، چونکە ئەو لەسەر زەوی لەدایك بووە، و نەژادێکی ڕەسەنی نیە و منیش خۆشم لەناوی نایەت، سەرەڕای ئەوەش باش نیە لەپاڵ لاشەی دایکمدا ئەم قسانە بکەین.

ویستم پێی بڵێم: تۆ دەستت بەم گفتوگۆیە کرد، بەڵام بەباشترم زانی کە ئەم گوتەیە نەڵێم.

دوای ئەوە وەك کەسێك کە ئاگاداری بارودۆخی کۆشکی فەرمانڕەوایی و ئەو نەفرەتەی کە دانیشتوانی کۆشك لەبەرامبەر"تی ئی"دا هەیانبوو نەبێت وتم: "باکتاتون"بۆچی هیچ یەك لەژنەکانی کۆشك نایەن بۆ ئێرە، بۆئەوەی بۆمەرگی دایکت بگرین؟

کاتێك دایکت دەبەن بۆ مردووخانە، بۆئەوەی لاشەی مۆمیای بکەن، هەندێك بەکرێگیراو هەن کە لەکاتی بردنی لاشەدا دەست بەشیوەن و گریان دەکەن و خۆڵەمیش دەکەن بەسەریاندا، بەڵام لەبەرئەوەی تەرمی دایکت یەکسەر ناگوێزرێتەوە بۆ مردووخانە، پێویست بەوە دەکات کەسێك لێرەدا بۆ ئەو بگریت. من لەبەرئەوەی پزیشکم ناتوانم بگریم، لەبەرئەوەی پزیشك ئەوەندە مەرگ دەبینێت کە دەبێتە هۆی ئەوەی فرمێسکەکانی وشك بکەن و چیتر توانای گریانی نامێنێت و دوای ئەوەی ماوەیەك بەسەر تەمەنیدا تێپەڕی، چیتر چێژ لەگۆرانی و موزیکیش وەرناگرێت، چونکە ئەو پزیشکەی هەموو تەمەنی لەپاڵ ساردی مردوویەکدا بردووەتە سەر، ئەو گەرمیەی کە بۆ سود وەرگرتن لە موزیك و گۆرانی پێویستی پێیەتی لەدەستی دەدات....دوای ئەوە وتم: ئەی شازادە خانمی میهرەبان کە هێشتا هاوسەرێکت بۆ خۆت هەڵنەبژاردووە، ئەوە بزانە کە لاویەتی وەك ڕۆژی گەرمی هاوین وایە و پیریش وەك ڕۆژی گەرمی پاییز و مەرگیش وەك ڕۆژی ساردی زستانە، ئەگەر کەسێك سود

لەڕۆژانی گەرمی هاوین و ڕۆژانی نیوە گەرمی پاییز وەرنەگرێت، دوای ئەوەی ڕۆژە ساردەکانی زستان و مەرگ دێت، چیتر ناتوانێت سودیان لیّ وەرگرێت.

"باکتاتون"وتی: "سینۆهە"لەگەڵ مندا لەبارەی مەرگەوە مەدویّ، چونکە حەز ناکەم بیر لەمەرگ بکەمەوە، لەبەرئەوەی هێشتا لاوم و هەنگوێنی ژیان لەدەمی مندا شیرینە، منیش وەك تۆ ناتوانم بگریم، لەبەرئەوەی من لەخوداکان هاتومەتە بون و کەسێك کە لەخوداکانەوە لەدایك ببێت، نابێت بگریت، سەرەڕای ئەوەش گریان دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو کەرستانەی کە بۆ جوانی لەڕوخساری خۆمم داوە، هەموو بشۆرێتەوە و لەناو بچێت، بەڵام لەبەرئەوەی دەبێت کەسێك بۆ مەرگی دایکم بمرێت، ئێستا دەڕۆم و ژنێك دەنێرم بۆ ئێرە بۆئەوەی بگریت و فرمێسك بۆ دایکم بڕێژێت.

وتم: "باکتاتون"لەو ساتەوەی من تۆم بینی و چاوم بەو جوانیەت کەوت، بەشێوەیەك وروژام کە ئەگەر تۆ ئێستا ژنێکی لاو بۆ گریان بنێریت بۆ ئێرە من بۆ ساتێکیش لێرە نامێنم. کەواتە بڕۆ و ژنێکی پیر بنێرە بۆ ئێرە، بۆئەوەی بۆ مەرگی دایکت بگریت.

"باکتاتون"بەگاڵتەوە وتی: "سینۆهە"من بیستبوم کە تۆ باوەڕت بەخودایان نیە، بەڵام لەوباوەڕەدا نیم کە ڕێز لەمردووەکانیش نەگریت، لەبەرئەوەی دایکم مردووە نابێت لەپاڵ تەرمەکەی ئەودا باسی ئەم جۆرە شتانە بکەیت....بەڵام لەئاوازی گاڵتەکەی ئەو و ئەو خۆشیەی کە بەهۆی گوتەکانی منەوە لەودا وروژا، ئەوەی بۆمن ئاشکرا کرد کە چێژی لەقسەکانی من وەرگرتووە.

من بەئەنقەست ئەم قسانەم لەگەڵ خوشکی فیرعەوندا کرد و مەبەستێکم لەم قسانەدا هەبوو.

"باکتاتون"ڕۆشت و یەکێك لەژنەکانی کۆشکی فەرمانڕەوایی نارد و بینیم هەمان ئەو ژنەی کە ناردویەتی پیرە.

لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا بیّ لەژنە لاوەکان، بەردەوام کۆمەڵێك ژنی پیر لەوێدا دەژین، ئەوانەش بریتی بون لە ژنەکانی فیرعەونی پێشوو"ژنەکانی هاوسەری تی ئی"و دایەن و پەرستیارانی منداڵانی فەرمانڕەوایی و خزمەتکاران و کەنیزە پیرەکان.

بەڵام زۆربەی ژنەکان، خۆیان بەلاو دەزانی و لەبەرئەوەی لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا ژیانیان بەسەر دەبرد، هیواداربون بەو بۆنەیەوە، پیاوێك بێتەوە هۆش و لەگەڵ ئەواندا کۆزە بشکێنێت.

*بەشی سی و شەشەم*

## بەچ شێوەیەك پەیم بەناسنامەی خۆم برد

ئەو ژنە بەتەمەنەی کە ئەوڕۆژە هات بۆئەوەی بگری ناوی"مهو نفر"بوو و کاتێك چاوم بەڕوخساری کەوت زانیم لەو ژنانەیە کە پیاوانی خۆش دەوێت و"مهو نفر" لەبەشی دووەمی ناوەکەیدا دیاربوو کە لەڕابردوودا زۆر جوان بووە، دوای ئەوەی هات دەستی کرد بەگریان.

منیش ڕۆشتم و گۆزەیەك خواردنەوەم هێنا و پێکێکم پێدا و وتم"مهو نفر"ئەمە بخۆرەوە، چونکە زۆر سودت پێ دەگەیەنێت.

ئەویش خواردیەوە و چیتر دوای ئەوە نەگریا و منیش بۆئەوەی قسە لێ دەربهێنم، پرسیاری جوانی ڕابردویم لێکرد و لێم پرسی: ئایا ڕاستە کە لەنێو ژنەکانی فیرعەونی پێشوو دا تەنها "تی ئی"کوڕێکی بۆ هێناوەتە بوون بەڵام ئەوانی تر هەر کچیان بووە؟

"مهو نفر"بەترسێکەوە تەماشایەکی کردم و ئاماژەی بەوەدا کە بێدەنگ بم و وەك ئەوەی لەوە بترسێت، ئەگەر من قسە بکەم، مردوو گوێی لە پرسیارەکانی من و وەڵامەکانی ئەو ببێت.

من بۆئەوەی ئەو بهێنمە قسە زیاتر باسی جوانی ڕابردویم دەکرد و وتم: "مهو نفر"تۆ لەمرۆشدا هەر جوانی و چاوەکانیشت وەك چاوی کچە لاوەکانە و ئەگەر تۆ و کچێکی لاو لەبەرامبەر پیاوێکدا ڕاوەستن، ئەو پیاوە چاوپۆشی لەکچی لاو دەکات و ئارەزوی ئەوە دەکات لەگەڵ تۆدا ڕابوێرێت، بەڵام ژنەکان هەرچەنێك پیر و ناشیرینیش بن باوەڕ بەم جۆرە قسانە دەکەن، تەنانەت گەر بشزانن کەسی بێژەر بۆ گاڵتەکردن ئەم قسانە بکات، چونکە لەکانگای دڵیانەوە حەز دەکەن باوەڕ بەم جۆرە قسانە بهێنن.

هەر لەبەرئەوەش"مهو نفر"بوو بەهاوڕێم و کاتێك لاشەی"تی ئی"یان ڕەوانەی مردووخانە کرد بۆئەوەی مۆمیای بکەن، ئەو ژنە منی بانگێشتی ژورەکەی خۆی کرد، بۆئەوەی خواردنەوەی لەگەڵدا بخۆمەوە و منیش لەبەرئەوەی دەمویست چەند زانیاریەکی لێ وەرگرم، ئەم بانگێشتەیم پەسەند کرد و ڕۆشتم بۆ ژورەکەی و کەمێك لەخواردنەوەکانی ئەوم خواردەوە و ئەوم هانی ئەوەدا زیاتر بخواتەوە بۆئەوەی مەست ببێت.

کاتێك مەست بوو بەدەم پێکەنینەوە وتی: "تی ئی" لەهەڵبژاردنی پیاواندا سەلیقەیەکی سەیری هەبوو، چونکە زۆر ڕقی لە لاوە میسریەکان بوو کە هەمویان جوان و بەژن و بالآیەکی ڕێك و پێکیان بوون و خاوەنی پێستێکی ناسك و گەنم ڕەنگ بون، هەروەها بۆنێکی خۆش لەجەستەیانەوە دەهات، لەبەرامبەردا ڕشپێستە کەتەکانی بۆ ڕابواردن هەڵدەبژارد و دەیوت، چێژ لە بۆنی توندی جەستەیان و توندوتیژیان لەکاتی ڕابواردندا وەردەگرم.

کاتێك ئەو ژنە پیرە ئەم قسانەی دەکرد لەمن نزیك بویەوە و بۆنی شان و سینەی کردم، بەڵام من ئەوم لەخۆم دور کردەوە و وتم: بیستومە کە"تی ئی"وەستایەکی چنینی زبردەست بووە و چەند سەبەتەیەکی جوانی تائێستا چنیوە و ئایا تۆ بەچاوی خۆت نەتبینیوە، ئەوجۆرە سەبەتانە لەشەودا بدات بەدەم ئاوەوە.

پیرەژن وتی: لەبەرئەوەی"تی ئی"مردووە و لەهەڕشەکانی ئاسودە بوم، دەتوانم پێت بڵێم کە لەسەردەمی ژیانی فیرعەونی ڕابردوودا، سێ کوڕی نەوزاد، لەڕێی"تی ئی"وە خراوەتە ناو سەبەتەیەکەوە و دراوە بەدەم ئاوەوە و "تی ئی" لەوە دڵنیابوو هەرکەسێك چاوی بەم سەبەتانە بکەوێت، وادەزانێت ئەو منداڵە تازەلەدایك بووەی کە تێیدایەتی، منداڵی یەکێك لەماڵە هەژارەکانە و لەبەرئەوەی دایکوباوکی نەیانتوانیوە چاودێری لەمنداڵەکەیان بکەن، بۆیە خستویانەتە ناو سەبەتەیەکەوە و داویانە بەدەم ئاوی ڕوباری "نیل"ەوە.

لەو کاتانەی کە"تی ئی"کوڕە تازە لەدایك بووەکانی لەژنەکانی فیرعەون دەفڕاند و دەیخستنە ناو سەبەتەیەکەوە و دەیدا بەدەم ئاوی ڕوباری"نیل"ەوە، ئەوکاتانە بوو کە"تی ئی"هێشتا لەخوداکان دەترسا و ترسی لەکوشتنی منداڵە لەدایك بووەکان هەبوو، بەڵام دوای ئەوەی "ئامی"شیوازی بەکاری هێنانی ژەهری فێری"تی ئی"کرد،

ئەویش منداڵە تازە لەدایك بووەکانی-ئەوانەی لەژنانی فیرعەونی ڕابردوو لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا لەدایك دەبون-دەکوشت.

بەڵام کاتێك کچی پادشای"میتانی"و هاوسەری فیرعەون کوڕێکی بوو، هێشتا"تی ئی"فێری شێوازی بەکارهێنانی ژەهر نەبوبو، لەبەرئەوە کوڕەکەی خستە ناو سەبەتەیەکەوە و دای بەدەم ئاوی ڕوباری"نیل"ەوە.

وتم: "مهو نفر"لەبەرئەوەی تۆ دەزانی من پیاوێکی بێئەزمونم، ئەم جۆرە قسانەم لەگەڵدا دەکەیت، بۆئەوەی فریوم بدەیت، چونکە من بیستومە کچی پادشای "میتانی"و هاوسەری فیرعەونی ڕابردوو هیچ کات کوڕی نەبووە.

ژنی پیریش وتی: "سینۆهە"تۆ پیاوێکی بێ ئەزمون نیت، بەڵکو هەڵگری ئەزمونێکی زۆریشیو چاوەکانیشت گەواهی ئەوە دەدەن، کاتێك دەڵێیت هیچ ئەزمونێکم نیە، درۆ دەکەیت. ئەگەر"تی ئی"زیندوو بوایە ئەمەی پێ نەدەوتی و ئەو نهێنیەی بۆ ئاشکرا نەدەکردی، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو مردووە، دەتوانم ئەوت پێ بڵێم، کەتاکە کەسێك کە نەهێڵێت کچی پادشای میتانی ببێتە جێنیشنی میسر، خودی"تی ئی" بوو.

تۆ ئاگاداری ئەوەیت کە لەکۆنەوە نەریت وابووە کە فیرعەونەکان، ژنێك لەخێزانی فەرمانڕەوایانی میتانی هەڵبژێرن لەبەرئەوەی خێزانی فەرمانڕەوای"میتانی"ئارەزوی ئەوەیان دەکرد کچی خۆیان بدەن بەفەرمانڕەوایانی میسر، کچەکانیان هەر لەسەردەمی منداڵیەوە دەنارد بۆ میسر، بۆئەوەی لەدیوەخانی میسردا گەورە بن و فیرعەون بتوانێت بەئارەزوی خۆی پەروەردەیان بکات، دوای ئەوەی گەورە دەبون بەژنی فیرعەون.

لەو سەردەمەدا کچی تەمەن بچوك لە"میتان"ەوە هات بۆ میسر و لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا، بەواتا لێرە نیشتەجێ بوون، بۆئەوەی دوای ئەوەی گەورە بوون ببنە هاوسەری"ئەخناتون"، بەڵام چیت لێ بشارمەوە ئەو کچە مرد.

کچی پادشای میتانی و هاوسەری فیرعەونی پێشوو بەناوی"تادو-هپا" کاتێك هات بۆ ئێرە ئەوەندە منداڵ بوو کە لەگەڵ بوکەڵەدا یاری دەکرد و بۆماوەی چەند ساڵ فیرعەونی پێشوو لەگەڵ کچەدا یاری بوکەڵەی دەکرد، تا ئەوکاتەی گەورە بوو و ئەندامەکانی جەستەی گەشەی کرد و گەشتە تەمەنی چواردە ساڵی.

"تی ئی"زۆر هەوڵی ئەوەی دەدا کە نەهێڵێت فیرعەونی پێشوو ئەم کچە وەك ژنەکانی تر بکاتە خوشکی خۆی، بەڵام نەیتوانی، چونکە کاتێك پیاوێك لەبەرامبەر ژنێکدا دەژیت کە ئەندامەکانی جەستەی بەگەشەی خۆی گەشتووە، بەڕادەیەك تینوی ئەوەیە لەگەڵیدا ڕابوێرێت کە هیچ کەسێك ناتوانێت ڕێ لەم ئارەزووەی بگرێت، بەتایبەت ئەگەر بزانێت ئەو کچە ژنی ئەوە، بەدڵنیاییەوە لەگەڵیدا ڕادەبوێرێت.

دوای ئەوەی"تادو-هیا" بوو بە ژنی ڕاستەقینە فیرعەون و سکیشی لێی پڕبوو، ئەوکات بەهەموو کەرەستەیەك هەوڵی ئەوەی دا کە کچی پادشای"میتانی"هانی ئەوە بدات کە منداڵەکەی لەبار ببات، بەڵام نەیتوانی.

"تی ئی"لەبەرامبەر ژنەکانی تری فیرعەوندا هەمان کاری دەکرد و ئەوانی هانی ئەوە دەدا کە کۆرپەکانیان لەبار ببەن، لەبەرئەوەی ئەو ژنانە خێزانێکی مەزنیان نەبوو لە"تی ئی"دەترسان و لەترسی ئەویش فەرمانی جادوگەرە ڕشپێستەکانی"تی ئی"یان بۆ لەبارخستنی منداڵەکەیان جێ بەجێ دەکرد یان بەوە ڕازی دەبون ئەگەر ئەو منداڵەی دەیانبێت کوڕ بێت،"تی ئی"ئەو کوڕەیان لێ ببات و کچێك لەجێگەکەیاندا دابنێت یان بانگەوازی ئەوەی بۆ بکات کە منداڵەکەی مردووە.

بەڵام کچی پادشای"میتانی"ژنێکی خانەدان و خاوەنی خێزانێکی مەزن بوو، لێرەشدا کۆمەڵێك لەکەسە مەزنەکان کە پلەوپایەو سەروەت و سامانی خۆیان بەوەوە پەیوەست کردبوو، پارێزگاریان لێ دەکردو بەهیوای ئەوە بون کوڕێکی ببێت، بۆئەوەی کوڕەکەی ببێت جێنشنی میسر.

لەهەمان ئەم کاتەدا کچی پادشای"میتانی"سکی پڕ بوو، "تی ئی"یش لەهەمان کاتدا سکی پڕ بوو، بەڵام من دەزانم کوڕەکەی ئەو لەفیرعەون نەبوو، بەڵکو هی "ئامی"بوو.

کاتێك"تی ئی"زانی سکی پڕ بووە، بڕیاری دا، بەهەر شێوەیەك بووە، منداڵی کچی پادشای"میتانی"لەناوی ببات.

بۆئەومەبەستەش"ئامی"کە لە"شاری خۆر"[11]"دەژیا، هێنایی بۆ"تبس"و تەواوی خزمەتکارەکانی ئەو کۆشکەی لەڕێی زێڕ و زیووەوە یان لەڕێی هەڕەشەوە کردنی بەگوێڕایەڵی خۆی.

لەکاتی منداڵ بونی شازادە خانمی"میتانی"تەواوی دۆستان و خزمەتکارانی"تی ئی"بەناونیشانی هێورکردنەوەی ئازارەکانی ئەو شازادە خانمە، چواردەوریان گرتبوو و کاتێکیش منداڵی بوو، منداڵەکەی کوڕبوو، بەڵام دوای ئەوەی هاتەوە هۆش خۆی و ویستی چاوی بەمنداڵەکەی خۆی بکەوێت، منداڵێکی کچی مردوویان پێنیشان دا و وتیان ئەمە منداڵی تۆیە، من دەزانم کە منداڵی ئەو شازادە خانمە کوڕ بوو و هەمان ئەو شەوە خستیانە ناو سەبەتەیەکەوە و دایان بەدەم ئاوی ڕوباری"نیل"ەوە.

وتم: "مهو نفر"تۆ لەکوێوە زانیت کە"تی ئی"دوای ئەوەی کوڕی شازادە خانمی"میتانی"لەدایك بوو، خستیە ناو سەبەتەیەکەوە و دای بەدەم ئاوی ڕوباری "نیل"ەوە؟

پیرەژنیش وتی: لەو شەوەدا خۆم چومە ناو ئاوەکەوە و سەبەتەکەم دا بەدەم ئاوی ڕوباری نیلەوە، چونکە"تی ئی"لەبەرئەوەی سکی پڕ بوو، نەیدەتوانی خۆی بخاتە ناو ڕوبارەکەوە و ئەگەر سەبەتەکەیان لەنزیك قەراخ ڕوبارەکەوە بدایە بەئاودا، بۆی هەبوو لەناو زەل و قامیشی کەنار ڕوباری نیلدا گیر بکات و بەهۆیەوە لەو ناوچەیە دور نەکەوێتەوە. ئەوەبوو بەمنی وت: من بچمە ناو ئاوی ڕوبارەکەوە و سەبەتەکە لەشوێنێکدا بدەم بەدەمی ئاوەکەوە کە بەر خوڕەی ئاوەکە بکەوێت و لەو ناوچەیە دور بکەوێتەوە.

کاتێك من ئەم قسەیەم بیست، بەڕادەیەك توڕە بووم کە هەستامە سەرپێ و خواردەنەوەکەم ڕشتە سەر زەوی و پێشێلم کرد، کاتێکیش"مهو نفر"چاوی بەم توڕەییەی من کەوت، دەستی گرتم و داینیشاندمەوە و وتی: من باسی ئەم سەرگوزەشتەیەم بۆ هیچ کەسێك نەکردووە، بەڵام لەبەرئەوەی خۆشم لەتۆ دێت، بۆم

---

[11]"شاری خۆر: لەمیسری کۆندا یەکێك بوو لەپێنج شارە گەورە و بەناوبانگەکەی میسر و یۆنانیەکان دوای ئەوەی مێژووی میسریان نوسیەوە، ئەم شارەیان بە"هلیو پولس" بانگ دەکرد، کە –"هیلیو لەزمانی یۆنانیدا بەواتای خۆر دێت و "پۆلیس"ش بەواتا شار دێت- هەر لەبەرئەوەش "شاری خۆر" لەمێژووەکانی جیهاندا بە"هلیوپولیس" بەناوبانگە.

باسکردی. لەنێو هەموو خزمەتکارانی کۆشکی فەرمانڕەواییدا"تی ئی"تەنها متمانەی بەمن بوو، چونکە ئاگاداری نهێنیەکانی ژیانی منە و دەیزانی ئەگەر خیانەتی لێ بکەم، دەتوانێت لەناوم ببات. من بەچاوی خۆم ئەو سەبەتەم بینی کە کوڕی نەوزادەی شازادە خانمی"میتان"یم خستە ناویەوە، کە لەلایەن خودی"تی ئی"ەوە چنرابوو، کاتێك ئەو منداڵە خرایە ناو سەبەتەوە زیندوو بوو. کاتێك من ئەو سەبەتەیەم دا بەدەم ئاوەوە و ئاو لەگەڵ خۆیدا بردی، زۆر لەو باوەڕەدا نەبوم کە ئەو کوڕە بەزیندویی بمێنێتەوە و ژن یان پیاوێك ئەو سەبەتەیە لەو ڕوبارە بگرێتەوە و ئەو منداڵە پەروەردە بکات، چونکە تیمساحێکی زۆر لەڕوباری"نیل"دا هەیە و تیمساحەکان ئەم جۆرە منداڵانە بەیەك قەپ قوت دەدەن یان باڵندە گۆشت خۆرەکان دەیکەنە ژەمی خواردنی خۆیان.

شازادە خانمی"میتانی"کاتێك هاتەوە هۆش خۆی و بینی کچێکی مردوویان لەپاڵیەوە داناوە، دەستی کرد بەشیوەن و گریان و وتی: ئەم کچە منداڵی من نیە، چونکە نە ڕەنگی پێستی ئەو وەك ڕەنگی پێستی منە و نە سەری لەسەری من دەچێت.

ئەو ژنە ڕاستی دەکرد، چونکە شازادە خانمی"میتانی"وەك هەرژنێکی تری وڵاتەکەی خۆی ڕەنگێکی ڕون و سەرێکی بچوك و جوانی هەبوو، لەکاتێکدا ئەو منداڵە ڕەنگێکی تاریکی دەنواند.

شازادەخانم بەدەم گریانەوە وتی: "تی ئی"و جادوگەرە ڕەشپێستەکانی کوڕەکەی منیان بەکەرەستەی جادوگەری گۆڕیوە....بەڵام "تی ئی" وتی: کاتێك ئەم ژنە بینی منداڵێکی مردوی بووە، شێت بووە.

فیرعەونیش گوتەی"تی ئی"پەسەند کرد و لەو ڕۆژە بەدەواوە شازادە خانمی "میتانی"لاواز و نەخۆش کەوت و من بەدوری نازانم کە"تی ئی"ژەهری پێدابێت، لەبەرئەوەی دەترسا جارێکی تر سکی پڕ ببێتەوە و کوڕێکی تری ببێت، چونکە سەرەڕای ئەوەی خۆی سکی پڕ بوو، وای دەزانی ئەمجارەیشیان وەك جاری پێشوو کچێکی تری دەبێت.

شازادە خانم چەند جارێك بەو حاڵەوە هەوڵی ئەوەی دا لەکۆشکی فەرمانڕەوایی هەڵبێت و بڕوات بەدوای منداڵەکەیدا بگەڕێت، هەرلەبەرئەوەش ئەو گوتەیان پەسەند

کرد کە"تی ئی"دەیوت شێت بووە و باشیش لەباروdۆخی ئەو ژنە گەشتووە. شازادە خانم بۆماوەیەك نەخۆش بوو تائەوکاتەی کۆچی دوایی کرد.

کاتێك ئەو ژنە پیرە قسەی دەکرد، من تەماشای دەستەکانی خۆمم دەکرد و بینیم کە سپیە. کاتێك ئەو ژنە کۆتایی بەقەسەکانی هێنا، لێم پرسی: ئایا ڕوخساری شازادە خانمی"میتانی"سپی بوو.

ژنی پیریش وتی: بەڵێ.

وەتم: "مهو نفر"دەتوانی پێم بڵێیت ئەم بەسەرهاتە کەیی ڕویداوە و لەچ کاتێکدا ئەو کوڕەی خستووەتە ناو سەبەتەیەکەوە و داویەتی بەدەم ئاوەوە؟

ژنی پیریش وەڵامی دایەوە: بەبۆچونی تۆ ئایا جێگەی داخ نیە کە ئێمە لەباتی ئەوەی بخۆین و بخۆینەوە کاتی خۆمان بەم قسانەوە بەسەر بەرین؟

وتم: من حەز دەکەم بزانم لەچ کاتێکدا ئەو کوڕە لەدایك بووە و خراوەتە ناو سەبەتەوە و دراوە بەدەم ئاوی ڕوباری نیلەوە؟

ژنیش وەڵامی دایەوە: ئەم بەسەرهاتە لە بیست و دووەمین ساڵی فەرمانڕەوایی فیرعەونی مەزن لەوەرزی پایزدا ڕویدا، لەوکاتەی ڕوباری"نیل"هەڵدەچێت. ئەگەر لێم بپرسی بەچ شێوەیەك من ئاگاداری ئەم بابەتەم، دەڵێم لەبەرئەوەی هەرگیز ئەو بەسەرهاتە لەبیر ناکەم کە"ئەخناتون"ی فیرعەونی ئێستا و کوڕی"تی ئی"ماوەیەك دوای ئەو بەسەرهاتە لەدایك بوو.

پیرە ژن ئەوەندە ئاڕایشتی لەڕوخساری خۆی دابوو کە چینێکی ئەستوری ڕەنگکاری بەسەر ڕوخسار و لێویەوە دەبینرا، لێم نزیك بویەوە و وتی: "سینۆهە"تۆ وتت ئەگەر من و کچێکی لاو لەبەرامبەر پیاوێکدا ڕاوەستین، ئەو پیاوە من بەهاوسەری خۆی هەڵدەبژێرێت، ئێستاش من دەڵێم ئەگەر تۆ بتەوێت من حەز دەکەم ببمە هاوسەری تۆ! بەڵام لەوکاتەدا بەشێوەیەك نوقمی ئەندێشەکانی خۆم بووبووم کە هیچ وەڵامێکم نەدایەوە و تەنها بیرم لەخۆم دەکردەوە.

چونکە ئەگەر قسەی ئەو پیرەژنە ڕاست بێت، من هەمان ئەومناڵەم کە لەسکی شازادە خانمی"میتانی"و لەپشتی فیرعەونی مەزنەوە هاتوومەتە ئەم جیهانە، بەواتا من لەنەوەی خودایانم و خوێنی فەرمانڕەوایی لەڕەگ و ملولە خوێنەکانی مندا لەحاڵی خرۆشاندایە و بۆ فەرمانڕەوایی میسر من لە"ئەخناتون"زیاتر شایستەی ئەو

فەرمانڕەواییەم، چونکە کوڕە گەورەی فیرعەونم و بەدڵنیاییشەوە کوڕی ڕاستەقینەی ئەوم.

لەکاتێك"ئەخناتون"لەدوای من لەدایك بووە و هەر بەوشێوەیەی پیرەژن باسی کرد، کوڕی"ئامی"یە، نەك کوڕی فیرعەون، یان مەگەر گومانێك لەباوکایەتی ئەودا هەبێت.

ئەوکات تێگەشتم، بۆچی من لەسەرتای لاویەتیدا گۆشەگیر بوم و بەردەوام خۆم بەتەنهایی دەبینی، چونکە ئەو کەسەی لەڕەگ و ملولەکانیدا خوێنی فەرمانڕەوایی پێدا تێپەڕێت تەنها دەبێت، چونکە هیچ کەسێك بەئەندازەی پادشایەك تەنها نیە.

ئەوکات پەیم بەوە برد بۆچی هەرگیز زێڕ و زیو بەلای منەوە، ئەو بەهایەی کە لەدیدی کەسانی تردا هەیە نەبوو، چونکە کەسێك کە لەنەوەی خودایان بێت و خوێنی فیرعەون لەڕگ و ملولەکانی بخرۆشێت، پایەبەرزە و بەو ڕادەیەش گرنگی بەزێڕ و زیو نادات.

ئەوەندە ئەو پیرە ژنە قسەی کرد لەو ژورەدا و ئەوەندە ئەمبەرە و بەری کرد کە ڕشتەی بیر و هزرمی بچڕاند، بۆیە ڕوم تێکرد بۆئەوەی بەقسەکانی بیر و هزرم لەوە زیاتر پەرێشانتر نەکات، پێم وت: باشتروایە شتێك بخۆمەوە. ئێمە بڕێکی ترمان خواردەوە و پیرەژن دوبارە دەستی کردەوە بەقسە کردن و وتی: ئەگەر من پەسەندی بکەم، ئەو دەبێتە هاوسەرم و لەکۆتاییشدا بۆئەوەی دەستبەردارم بێت تلیاکم ڕشتە ناو خواردنەوەکەیەوە و دەرخواردم دا، تا ئەوکاتە خەوی لێکەوت.

کاتێك لەکۆشکی"تی ئی"هاتمە دەرەوە، بینیم کە حزمەتکارەکانی کۆشك من نیشانی یەکتری دەدەن و پێدەکەنن، بۆیە لەم پێکەنینەیان زۆر بێزار بوم، بەڵام سەرم لێیان سوڕ نەما، چونکە بەردەوام کەسە سەرشۆڕو نەزانەکان کە هیچ شکۆمەندیەکیان نیە، لەڕوی ئیرەییەوە بەپیاوانی بەرجەستە و شکۆمەند پێدەکەنن و وا دەزانن کە بەم کارەیان دەتوانن قەرەبوی سوکایەتیەکانی خۆیان بکەنەوە.

کاتێك گەڕامەوە بۆماڵ، بینیم"مریت" لەماڵ چاوەڕێم دەکات، بۆئەوەی ئاگاداری شێوازی کۆچی دوایی کردنی دایکی فیرعەون بێت.

هەرئەوکاتەی پێم نایە ماڵەوە خزمەتکارەکەم"موتی"دەستی خستە سەر دەمی و وەك کەسێك کە لەناکاو بەهۆی ڕوداوێکی سەرسوڕهێنەرەوە سەری سوڕمابێت، بەئاماژەیەك"مریت"ی پیشانی چاوەکانم دا.

"مریت"یش دوای ئەوەی چاوی پێم کەوت زۆر سەری سوڕما و خزمەتکارەکەشم پێی وت: ئایا ئێستا لایەنگری ئەوە دەکەیت کاتێك پێم وتی، قسەکەم بەڕاست دەرچوو، تەواوی پیاوەکان لەیەك دەچن و ناتوانرێت متمانە بەهیچ پیاوێك بکرێت.

وتم: ئەمڕۆ یەکێکە لەڕۆژە ماندوکەر و بێزارەکانی من و دوای ئەم ڕۆژە پێویستم بەحەوانەوەیە. لەبەرئەوەش ناتوانم ئەوشتانە کە "موت"ی لەبارەی مردووەکانەوە باسی کرد بۆتانی بگێڕمەوە.

لەناکاو ڕوخساری"مریت" ڕەش داگەڕا، بۆیە بەڕاکردن ئاوێنەکەی هێنا و دای بەدەستمەوە و هاواری کرد:

"سینۆهە"من پێت نالێم کە خۆت لەڕابواردن لەگەڵ ژنانی تردا بپارێزە، چونکە ئەو ژنەی لەمبارەیەوە ئامۆژگاری پیاوێك بکات، گەمژەیە، ئەگەر پیاو ئەو هەلەی بۆ بڕەخسێت کە لەگەڵ ژنی لاو و جواندا ڕابوێرێت، مەحاڵە بتوانێت خۆی لەم خۆشیە بێبەش بکات، بەڵام بەشێوەیەك لەگەڵ ژنانی تردا ڕابوێرە کە من ئاگام لێی نەبێت، بۆئەوەی ڕۆحم بریندار نەبێت و تۆش کە دەڵێیت ئەمڕۆ یەکێکە لەڕۆژە ماندووەکانی تەمەنی تۆ تەماشایەکی ڕوخساری خۆت بکە بۆئەوەی بزانی، درۆکەی تۆ لەسەر ڕوخسارت، وێنە کێشراوە.

کاتێك ڕوخساری خۆم لەناو ئاوێنە زیوینەکەدا بینی، منیش وەك ژنەکان لەتەماشاکردنی ئەوەی بەرچاوم دەکەوێت سەرم سوڕما، چونکە ڕوخسارم بەشێوەیەك ڕەنگاوڕەنگ بوبو کە وەك بڵێی وێنەکێشێك بەو شێوەیە ڕەنگی کردووە.

لەلای ڕاست و چەپی ڕوخسارم، هەروەها لەسەر چەناکە و گەردنم جێگەی لێوی ئەو ژنە جنۆکە ڕەنگە بەواتا"مهو نفر" بەشێوەیەکی بەرجەستە بەڕەنگێکی ئەرخەوانی دەبینرا، لەبەرئەوەی ئەو ژنە ڕوخساری خۆی بەمنداماڵیبوو، وەك بڵێی وەستا دیوارێك بەگەچ و ماڵە ڕوخساری منی سور و سپی کردبێت.

ویستم ئاوێنە زیویەکە فڕێ بدەم، بەڵام"مریت"ئاوێنەکەی لەدەست گرتم و لەبەرامبەری ڕوخسارمدا ڕایگرت، بۆئەوەی بەڵگەی نکوڵی لێنەکراوی بێوەفایی خۆم لەبەرامبەر ئەودا ببینم.

کاتێك ڕوخساری خۆمم شۆرد و پاکم کردەوە، بە"مریت"م وت: دەبینم تۆ دوچاری هەڵەیەکی زۆر مەزن بویت، چونکە وادەزانی من لەگەڵ ژنێکی تردا ڕامبواردووە، لەبەرئەوەش بۆتی ڕوندەکەمەوە کە.....

"مریت"وتی: من پێویستم بەهیچ ڕونکردنەوەیەك نیە، تاقەتی ئەوەشم نیە گوێ لەهیچ شتێك بگرم، لەبەرئەوەی لەگەڵ مندا بێوەفا بویت و دەتەوێت دەمت بەم ڕونکردنەوە درۆیانە ئاڵودە بکەیت، لەکاتێکدا هیچ گۆمانێك لەم جۆرە بابەتانەدا ناکرێت، چونکە ڕوخسارت ئەوە نیشان دەدات کە تۆ لەگەڵ ژنەکانی تر و بەئەگەرێکی زۆر بەهێز لەگەڵ ژنەکانی کۆشك و دایکی فیرعەوندا ڕاتبواردبێت. من زۆر لەوە بەداخم کە بەشێوەیەك منت فەرامۆش کردبوو کە ئەوەت لەبیرچوبو من لەماڵدا چاوەڕێی گەڕانەوەی تۆم، ئەگینا پێش ئەوەی بێیتەوە بۆماڵ ڕوخساری خۆت پاك دەشۆرد، بۆئەوەی بەم ڕوخسارە ڕەنگاو ڕەنگەوە نەیەیت بۆ لام. لەوانەشە لەبەرئەوە ڕوخساری خۆت نەشۆردبێت بۆئەوەی من شوێنەواری ڕابواردنەکانی تۆ لەگەڵ ژنانی کۆشکی دایکی فیرعەوندا ببینم و بزانم کە تۆ بەڕادەیەك سەرنجی ژنانت بەلای خۆتدا ڕاکێشاوە کە شازادە خانمەکانی ئەو کۆشکەش کاتێك چاویان بەتۆ دەکەوێت، دەستەڵاتی خۆیان لەدەست دەدەن و بێئاگا خۆیان هەڵدەدەن باوەشتەوە. یان ئەوەندە مەست بویت کە ئەوەت فەرامۆش کردبێت دوای هەر ڕابواردنێك لەگەڵ ژنانی کۆشکی دایکی فیرعەوندا دەبێت ڕوخسارت بشۆریت؟

لەکاتێکدا"مریت"بەم قسانە، سەرزەنشتی دەکردم"موتی"ی خزمەتکارم، وەك ئەوەی بەڵگەی خیانەتی هاوسەرەکەی ئاشکرا کردبێت، فرمێسکی دەڕشت و دەگریاو بەدەم گریانەوە نەفرەتی لەهەموو پیاوێك دەکرد.

من ئاگاداری ئەوە بووم کە هێورکردنەوە و باوەڕپێهێنانی"مریت"زۆر دژوارترە لە"مهو نفر"ە، چونکە"مهو نفر" لەڕێی ئەو تلیاکەی کە ڕشتمە ناو شەرابەکەیەوە خەواندم، بەڵام نەمدەتوانی"مریت" هێور و ئارام بکەمەوە.

سەرئەنجام پێم وت: "مریت"ماوەیەکە تۆ من دەناسی و ئاشنایەتی ئێمە لەوکاتەوە دەستی پێکرد کە من هێشتا نەڕۆشتبوم بۆ شاری"ئاسۆ"و دوای گەڕانەوەم بۆ"تبس"هاتم بۆلات و ئەم ئاشنایەتیە درێژخایەنە دەبێت جێی متمانەی تۆ بێت لەبەرامبەر مندا، چونکە ئەگەر ژنێك دوای ساڵها ئاشنایەتی و ئیشق و خۆشەویستی

پیاوێکی نەناسی، دەبێت ئەوە بڵێم کە هەرگیز هیچ ژنێك هیچ پیاوێك ناناسێت، بەڵام هۆکاری ڕەنگاوڕەنگ بونی ڕوخساری من، بەنهێنییەکی مەزنەوە پەیوەست دەکرێت کە ئەگەر ئەم نهێنیە تەنها بەمنەوە پەیوەست بکرایە، بەدڵنیاییەوە هەر ئێستا بۆم باس دەکردی، بەڵام ئەم نهێنیە بەکۆشکی فەرمانڕەوایشەوە پەیوەست دەکرێت، هەر لەبەرئەوەش نابێت ئاشکرا بکرێت، بۆیە باشتر وایە تۆ ئاگاداری ئەم نهێنیە نەبیت.

"مریت"لەوەڵامدا، بەزمانێك کە بەئەندازەی چزوی سورپیاز ئازار بەخش بوو وتی: "سینۆهە"من لایەنگری ئەوە دەکەم کە تۆ پیاوێکی دانایت و دانایەکیش کاتێك لەگەڵ ژنێك یان چەند ژنێکدا ڕابوێرێت، دەبێت نهێنیەکانیشیان بپارێزێت، چونکە زۆرێك لەو ژنانە کاتێك پیاوێکی تازە لەئامێز دەگرن، حەز ناکەن کەسانی تر بزانن کە ئەمانە ئاشقێکی تازەیان بەدەست هێناوە، بۆیە پاراستنی نهێنی ژنانی لاو و جوان یەکێکە لەهێماکانی ئەمانەت و پیاوەتییە، من وام دەزانی پەیم بەقوڵاییەکانی ڕۆحت بردووە، بەڵام ئێستا تێدەگەم کە زۆر هەڵەبوم و لەڕۆحی تۆدا گۆشە و داڵانگەلێکی تێدایە کە زۆر تاریکن و ناتوانرێت پەی بەوە ببرێت کە چی لەو گۆشە و داڵانە تاریکانەدا هەیە؟ هەروەها زۆریش خۆشحاڵم بەوەی گۆزەم لەگەڵ تۆدا نەشکاندووە و ئازادی خۆم لەدەست نەداوە.

من زۆر سادە بووم کاتێك تۆ دەتوت: بێ لەمن هیچ ژنێکی ترت خۆش ناوێت، زۆریش باوەڕم بەم قسەیەت دەکرد، بێگومان ئەمڕۆش لەکۆشکی دایکی فیرعەونیشدا هەمان ئەم قسانەت بەگوێی ژنانی لاو و جواندا دەچرپاند.

ویستم نەوازشی"مریت"بکەم بۆئەوەی لەڕێی ئەم نەوازشمەوە کەمێك لەئازارەکانی کەم بکەمەوە، بەڵام ئەو هاواری بەسەرمدا کرد و وتی: لێم نزیك مەبەرەوە، چونکە تۆ لەمڕۆدا بەڕادەیەك ماندوو بویت کە دەبێت شەو و ڕۆژێك بخەویت و تا ئەوکاتەی ژنە لاو و جوانەکانی کۆشکی"تی ئی"هەبن، من بەلاتەوە سەرنج ڕاکێش نیم.

هەریەکە لەو قسانە -وەك ئەو سەرە تیرانە وابوو کە لە"ماڵی ژیاندا"بۆ نەشتەرگەری بەکاریان دەهێنا- دەچەقینە دڵمەوە و دوای ئەوەی"مریت"هەرچی ویست وتی و دڵی منی ئازاردا، لەماڵ ڕۆشتە دەرەوە. ئەگەر بەهۆی ئەوشتانەی کە ئەو ڕۆژە لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا بیستبوم، هزرم ئەوەندە تێك نەئاڵایە، ڕۆشتنی "مریت"زۆر لە گوتەکای زیاتر خەمگینی دەکردم.

بەڵام بیر و هزرم لەو شتانەی کە لەو ڕۆژەدا بیستبوم دور نەدەکەوتەوە، کاتێک"مریت"ویستی بڕوات، من ڕێم لەڕۆشتنی نەگرت و دڵنیابووم لەوەی کە ئەو سەری لەم هەڵوێستەی من سوڕماوە.

ئەو شەوە من نەخەوتم و هەمووی لەبیری ئەوشتانەدا بووم کە ڕۆژی پێشوو لەکۆشکی فەرمانڕەوایی بیستبوم.

تائەوکاتەی مەستی ئەو خواردنەوەیە لەسەرمدا بوو، لایەنی سەرسوڕهێنەری ئەو بەسەرهاتە بەوشێوەیە بەلامەوە گرنگ نەبوو، بەڵام دوای ئەوەی ئەم مەستیەم لەناوچوو، لەکاتێکدا گوێم لە خوڕەی ئاوی ترازوەکە دەگرت، نوقمی دەریای ئەندێشەکان دەبوم و خۆمم بەخەمگینی بینی.

بەخۆمم وت: "سینۆهە"تۆ لەژیاندا بێبەش لەهەموو شتێکی ئەم جیهانە لەدایک بویت و یەکەمین کاتژمێر کە پێت نایە ئەم جیهانە، لەتەختی فەرمانڕەوایی دوریان کردیتەوە و لەناو سەبەتەیەکدا، فڕێیان دایتە ناو ئاوی"نیل"ەوە.

ئـەوکات ئـەو ژنـەی کـە هاوسـەری پزیـشکێکی هـەژار بـوو، تـۆی لـەڕوباری "نیل"گرتەوە. لەبەرئەوەی ئەو ژن و پیاوە وەجاخ کوێر بون و منداڵیان نەبوو، تۆیان وەک کـوڕی خۆیـان پەسـەند کـرد و گـەورەیان کردیـت، و ناردیتیـان بـۆ قوتابخانـە بۆئـەوەی کەسـێکی خوێنـدەوارت لێدەربـچێت، ئـەو پزیـشکەش سـەرەڕای ئـەوەی سـامانێکی ئـەوتۆی نـەبوو تـۆی بـرد بـۆ پەرسـتگای"ئـامون"بۆئـەوەی بتـوانی لەقوتابخانەی "ماڵی ژیان"دا خوێندن تەواو بکەیت و ببیتە پزیشک، بەڵام تۆ لەباتی ئەوەی پاداشتی چاکەی ئەو ژن و پیاوە بدەیتـەوە، لەپێناو ژنێکی پـارە پەرسـت و بەرەڵادا بەشێوەیەک ئەوانت خـەمبار کـرد کە پێش کـاتی خۆیـان مـردن و لاشـەیان بێ گۆڕ مایەوە.

ئەوکات ئاشقی ژنێک بویت بەناوی"مینا"و لەگەڵ ئەودا ڕۆشتیت بۆ"کریت"و پێت نایە ناو ماڵی خودای"کریت"و بینیت کە خودای"کریت"مارێکی دەریایی مەزنە کە مردبوو، بەڵام "مینا"یان کردبووە قوربانی ئەو و بینیت کە لاشەی"مینا"لەبنی دەریاکەدا لەنزیک کەناری ئەو دەریاوە کەوتبووە ژێر پەلاماری قرژانگە دەریاییەکانەوە.

دوای ئەوەی گەڕایتەوە بۆ میسر و بۆیتە تەماشاچی جەنگی نێوان دوو خودا و ئەوکات لە"تبس"ەوە کۆچت کرد بۆ شاری"ئاسۆ"و چەند ساڵێك لەو شارەدا مایتەوە و قژەکانی سەرت وەرین و سەرت بەتەواوی کەچەڵ بوو و هاوسەنگی جەستەشت لەدەست دا و خواردنی و ئاسودەیی شاری"ئاسۆ" تۆی قەڵەو کرد.

لەمڕۆدا دوای تەمەنێك تێدەگەیت، بۆچی بەردەوام گۆشەگیر بویت و بۆچی بەردەوام هەستت بەتەنهایی دەکرد، و بۆچی نەتدەویست وەك کەسە دەوڵەمەندەکان بەردەوام بەشداری کۆڕە خۆشەکان بکەیت، ئەم ڕەفتارانەشت گەشتنە ڕادەیەك کە زۆرێك لەئاشنایانت پێیان دەوتی"سینۆهە"ی کوڕی کەر پیاوێکی گۆشەگیرە. بەڵام تەواوی ئەمانە خودایان و ئەستێرەکان بۆیان تۆمار کردویت کە ڕوویدەن و تۆ نەتدەتوانی گۆڕانکاریان بەسەردا بهێنی و بەناچاریش دەبوو هەروا بێت.

بەڵام ئایا ئێستا دەتوانی بیسەلمێنی کە تۆ کوڕی فیرعەونی مەزن و لەسکی شازادە خانمی"میتانی"ەوە لەدایك بویت؟

هیچ گرفتێك لەوەدا نیە کە بیسەلمێنی تۆیان لەڕوباری نیل گرتووەتەوە، چونکە کاتێك گەورە بویت زڕ باوکەکەت ئەم بابەتەی بۆ گێڕاویتەتەوە. زۆرێکیش لەوکەسانەی کە هێشتا لەژیاندان ئەم بابەتەیان لەزڕ باوکەکەی تۆوە بیستووە و دەتوانن گەواهی ئەو بابەتەش بدەن، بەڵام بەچ شێوەیەك دەتوانی بیسەلمێنی کە تۆ کوڕی فیرعەونیت.

لەوکاتەوەی هەژارانی میسر ڕاهاتون بەوەی منداڵەکانیان بەڕوباری"نیل"بسپێرن، هەموو شەوێك چەند منداڵێك دەسپێدران بە ڕوباری"نیل"و هەندێکیشیان دەبونە نێچیری تیمساحەکان و هەندێکیشیان ڕزگاریان دەبوو، بەڵام ئەم بابەتە بەڵگەی ئەوە نەبوو کە بیسەلمێنی تۆ کوڕی فیرعەونی، گرێی"پەڕەسێلکە بازەکان"یش کە لەسەبەتەکەی تۆدا بەدی دەکرێت بەڵگەی سەلمێنەری ئەم بابەتە نیە، چونکە ئەم گرێیانە لەمیسردا بەناوبانگە و لەوانەیە زۆرێك لەو وەستایانەی کە لەمیسری خوارووەوە ڕۆشتون بۆ میسری سەروو، بەوشێوەیە گرێ لەکەرەستەی چنینەکانیان دەدەن.

بگرە ڕەنگی ڕونی پێستی تۆش ناتوانرێت ببێتە بەڵگەی ئەوەی تۆ لەسکی شازادە خانمی"میتانی"ەوە لەدایك بوویت، چونکە ژنە سریانی و میتانیەکان کە هەڵگری

پێستێکی ڕوونن، لەمیسردا زۆر زۆرن و ژنی سپی پێست لەمیسردا، تەنها تایبەت نەبوو بەتاکە کەسێکەوە.

بەم بیرۆکانەمەوە ئەو شەوەم تا بەیانی بردە سەر و خۆر هەڵهات و جیهان ڕوناک بویەوە و لەڕۆناکی ڕۆژدا، بەبۆنەی ئەوەی پەردەی خەیاڵ هەڵدەدرێتەوە، زیاتر ئەوەم بۆ دەرکەوت ناتوانم بیسەلمێنم کە من کوڕی فیرعەونی مەزنم و لە سکی شازادە خانمی"متیانی"ەوە هاتومەتە ئەم جیهانەوە.

دوای هەڵهاتنی خۆر، بەیانیەکەی خۆمم شۆرد و پۆشاکی کەتانیم لەبەرکرد و "موتی"یش بۆ نانی بەیانیم ماسی سوێر و ئاوجۆی بۆ هێنام و بینیم دوبارە دەستی کردووەتەوە بەگریان و چاوەکانی سور وهەڵگەڕابون.

دوای ئەوەی هەندێك ماسی سوێرم خوارد و قومێك ئاوجۆم خواردەوە سواری کەژاوەکە بوم و بەرەو ماڵی ژیان بەڕێ کەوتم بۆئەوەی پشکنین بۆ نەخۆشەکان بکەم، لەبەرئەوەی هیچ کەسێك لەوێ نەبوو بۆئەوەی نەشتەرگەری سەری بکەم، گەڕامەوە و لەبەرامبەر پەرستگای پێشووی"ئامون"ەوە کەهیچ کەسێکی تێدا بەدی نەدەکرا تێپەڕیم و بینیم کە لەسەربانی پەرستگای چۆڵدا پۆلێك قەلەڕەشەی قەڵەو دەستیان کردووە بە قارە قارکردن.

پەڕەسێلکەیەك لەپێشمەوە فڕی و بەرەو ڕوی پەرستگای"ئاتون"ڕۆشت، منیش بەرەو ڕوی هەمان پەرستگا ڕۆشتم، لەپەرستگای خودای تازەدا سەرقاڵی خوێندنی سرودە ئاینیەکان بون و بخورد و گەنمیان پێشکەشی خودا دەکرد.

من بینیم کۆمەڵێك میسری لە پەرستگای"ئاتون"دا ئامادەن و لەکاتی خوێندنی سرود دا دەستیان بەرز دەکەنەوە بۆئەوەی"ئاتون"بەرز ڕاگرن.

هەرکەسێك ئەمانەی ببینیایە وای دەزانی هەموویان پەیڕەوی لە"ئاتون"دەکەن، لەکاتێکدا وا نەبوو و من دەمزانی لەبەرئەوەی"تبس"شارێکی مەزنە و بەردەوام گروپێك لەکۆچەران لەڕێی کەشتیەوە یان لەڕی وشکانیەوە دێن بۆ "تبس"حەز دەکەن چاویان بەپەرستگای"ئاتون"و کاهینەکانی خودای نوێ بکەوێت.

لەکاتێکدا سەرقاڵی خوێندنی سرود بون، تەماشای پەیکەری"ئەخناتون" فیرعەونی میسرم دەکرد کەبەسەر پایەکانەوە بوو و بینیم کە چاوەکانی لەخۆشی و سەرنجڕاکێشیدا زۆر ترسناك بووە، ئەم پەیکەرانە بە بەشێك لەبەرهەمی هونەری

تازەی میسر لەقەڵەم دەدرێن و پەیکەرساز لەدروست کردنی ئەم پەیکەرانەدا زۆر گرنگی بەشێوازی کۆنی پەیکەرسازی نەداوە، بەڵام پەیکەرەکانی ڕابردوو بەواتا پەیکەرەکانی پێش"ئەخناتون" دەقاودەق بەپێی شێوازە کۆنەکانی پەیکەرسازی دروستکراون، بۆیە مرۆڤ دەتوانێت هەر لەیەکەمین تەماشاکردندا خاوەنی هەر پەیکەرێك بناسێتەوە.

بۆنمونە پەیکەری"ئامنوفیس"فیرعەونی مەزن"فیرعەونی پێشوو"سەرنج ڕاکێش بوو و هەرکەسێکیش چاوی پێی بکەوتایە ئاگاداری ئەوە دەبوو کە پیر و پەك کەوتەیەو تاجی زێڕینی فەرمانڕەوایی میسر بەسەر سەریەوە زۆر قورس دەنوێنێ و لەکەنار"تی ئی"ی شاژنی میسردا دانیشتووە.

لەنێوان ئەندامانی خێزانی فیرعەونی پێشوو، پەیکەری"تادو-هپا"شازادە خانمی "میتانی" دەبینرا کە بۆ خودای"ئامون"ی پێشوو سەرقاڵی قوربانی کردنە.

بەڵام بەشێوەیەك دەستکاری نوسراوەکانی تەنیشت ئەو پەیکەرەیان کردبوو کە وەك بڵێی شازادە خانمی میتانی قوربانی پێشکەشی خودای نوێ دەکات، لەکاتێکدا ئەو شازادە خانمە لەژیاندا بوو"ئاتون"ی خودای نوێ هێشتا فەرمانڕەوایی میسری نەگرتبووە دەست تا کەسێك قوربانی پێشکەش بکات.

لەبەرئەوەی پەیکەرسازە کۆنەکان پەیڕەوی شێوازی هونەری کۆنیان دەکرد بۆئەوەی هەموو پەیکەرێك دەقاودەق لەخاوەنەکەی بچێت، بۆیە بەشێوەیەك پەیکەری شازادە خانمی"میتانی"یان لەشێوەی خۆی دروست کردبوو کە بەش بەشی ئەندامی جەستەی بەجوانی بەدی دەکرا.

من لەتەماشاکردنی جوانی ئەودا سەرم سوڕما و هەرچی زیاتر تەماشام بکردایە، زیاتر ئەوەم بۆ ئاشکرا دەبوو کە ئەو لەتەواوی ئەو نمونانەی کە من تا ئەوکاتە بنیومە، بگرە لە"مینا"و"نفر تی تی"جوانتر بوو. هەرجارێك ئەوەم بهێنایەوە بیر خۆم کە ئەو شازادە خانمە لاو و ناسك و جوانە دایکی من بووە، و"تی ئی" لەڕێی ژەهر یان لەخەم و خەفەتاندا کوشتویەتی، ڕۆحم لێوانلێوی خەم دەبوو و ئەوەندە شەیدای ڕوخسار و بەژن و باڵای دایکم بوو بووم کە نەمدەتوانی بۆ ساتێکیش چاوی لێ هەڵبڕم.

هەندێکات پەڕەسێلکەیەك بەلا سەرمەوە دەفڕی و جیقەیەکی دەکرد و منیش بەهۆی بیستنی دەنگی ئەو پەڕەسێلکەوە بەدەم گریانەوە نامۆیی و تەنهایی دایکمم دەهاتەوە یاد کە لەولاّتی"میتانی"ەوە هاتووە بۆ میسر، بۆئەوەی گرفتاری کینە و تاوانەکانی"تی ئی" بێت.

هەندێکات بەخۆمم دەوت: بەچ شێوەیەك ئەکرێت پیاوێکی وەك من کەسەرم بەتەواوی کەچەڵ و ورگم قەڵەو بووە هەروەها چرچ و لۆچی کەوتووەتە ڕوخسارمەوە، کوڕی شازادەخانمێکی ئاوا جوان و ناسك و لاوم. دوای ئەوەش بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر دایکم زیندوو بوایە، ئێستا لەمن پیرتر بوو، چونکە بەتێپەڕبوونی کات هەموو کەسێك دوچاری گۆڕانکاری دەبێت و لەلاویەتیەوە بەرەو پیری پەلکێش دەکرێت.

بیری ئەو دایکەی کە چاوم پێی نەکەوتووە، کە دڵنیا نەبووم لەوەی دایکم بێت، منی لەشوێن زێدی خۆی بەواتا ولاّتی"میتانی"ئاگادار کردەوە، من ئەوکاتانەی لەدەرەوەی میسر خەریکی کۆچ و گەشتی خۆم بوم، بەم ولاّتەدا تێپەڕیوم و چاوم پێی کەوتووە-کەپێشتر لەم کتێبەدا باسم کردووە- و ئەوەشم هاتەوە یاد کە خانوو گەلێکی جوانی تێدابوو.

لەوکاتەدا من نەمدەتوانی لەوە تێبگەم کە شازادە خانمی"میتانی"دایکی من بووەو ئەگەر ئاگاداری ئەم بابەتە بومایە ئەوا دیمەنی ولاّتی"میتانی"بەشێوەیەکی تر دەهاتە بەرچاوم.

بۆماوەیەك لە پەرستگای"ئاتون"دا -ئەو پەیکەرانەی کە بەسەردەمی فیرعەونی پێشووەوە پەیوەست دەکران و لەپەرستگای"ئامون"ەوە هێنابویان بۆ ئێرە-بەدەم گریانەوە سەرقاڵی تەماشاکردنی پەیکەری شازادە خانمی"میتانی"بوم.

ئەوکات لەبەرئەوەی ڕۆژ بەرەو دەمەو ئێوارە دەچوو، ڕێگای مەیخانەی"کلکی تیمساح"م گرتە بەر، بۆئەوەی لەگەڵ"مریت"دا ئاشت ببمەوە.

بەلاّم"مریت"وەك کڕیارێکی ئاسایی پێشوازی لێکردم و بێئەوەی قسەم لەگەڵدا بکات، خواردن و خواردنەوەی پێدام و دوای ئەوەی نانم خوارد، لێم نزیك بویەوە و پرسی: ئایا ئەمڕۆ چاوت بەخۆشەویستەکەی خۆت کەوت؟

منیش وتم: من بێ لە"مریت" هیچ خۆشەویستێکی ترم نیە، تا ئەمڕۆ نەڕۆشتووم بۆ لای هیچ ژنێکی تر و دوای دەرچونم لەماڵی خۆم، بەرەو ماڵی ژیان ڕۆیشتم و

ئەوکات ڕێگای پەرستگای"ئاتون"م گرتەبەر و بۆ ماوەیەکی درێژخایەنیش لەوێ مامەوە.

مریت بەپێکەنینەوە -کە ئاماژەی بەوە دەکات بەگاڵتەپێکردنێکەوە گوێ لە قسەکانم دەگرێت- وتی: من دەمزانی کە ئەمڕۆ نەڕۆشتویت بۆ لای ژنەکانی تر، چونکە پیاوێکی وەك تۆ کە تاڵێك قژ بەسەریەوە نەماوە و قەڵەو بووە، دوای ڕابواردنی ڕۆژی پێشوو، ناتوانێت ئەمڕۆش لەگەڵ ژنەکاندا ڕابوێرێت، بەڵام خۆشەویستەکەت بەشێوەیەك لەدوری تۆ ئارامی لێبڕابوو،کە ناچار هاتبوو بۆ ئێرە بۆئەوەی چاوی پێت بکەوێت.

من بەبیستنی ئەم قسەیە لەجێی خۆم هەستام و وتم: "مریت"ئەوە چی دەڵێیت و خۆشەویستی من کێیە؟ کێ هاتووە بۆ ئێرە.

"مریت" لەڕوی گاڵتەجاڕیەوە پێکەنی و وتی: ئەمڕۆ خۆشەویستەکەت، لەکاتێکدا خۆی وەك کچێکی لاو ڕازاندبویەوە، هات بۆ ئێرە و منیش کاتێك چاوم بەڕوخساری کەوت سەرم لێی سوڕما، چونکە بینیم ئەوەندە سوراو و سپیاوی لەڕوخساری داوە کە هەرکاتێك پەنجە لەڕوخساریەوە بدەم، پەنجەم وەك قوڕ دەچەقێتە ناو سپیاوەکەیەوە. کاتێك ژنێکی پیر و قەڵەو بەشێوەیەکی قێزەون ئاڕایشتی خۆی بکات، ترس لەدڵی خەڵکیدا دروست دەکات، بۆیە کڕیارانی مەیخانە بەبینینی ترسیان لێ نیشت و دوای ئەوەی ناوی تۆی هێنایە زمان و تۆی لەوێ نەبینی، نامەیەکی پێدام بۆئەوەی پێتی بدەم.

ئەوکات"مریت"ئەو نامەیەی کە بەلێواری تەختە لول کرابوو دا بەدەستمەوە و منیش پاپیرۆسەکەم-کاغەزی ئەوسای میسر- کردەوە و لەکاتێك ڕق و نەفرت لەخوێنبەرەکانمدا هەڵدەقولا، نامەکەم بەم شێوەیە خوێندەوە:

لەلایەن"مهو نفر"نیشتەجێی کۆشکی زێڕینی فەرمانڕەوایی بۆ"سینۆهە"- گوێرەکە جوانەکەم ئەمڕۆ کاتێك لەخەو هەستام، سەرم ئێشی دەکرد، بەڵام ڕۆحم لەسەرم زیاتر دوچاری ئەم ئازارە بوبو، چونکە بینیم شوێنی تۆ لەتەنیشتمەوە خاڵیەو منیش بۆنی تۆ ناکەم، خۆزگە من پشتێنێك بومایە بۆئەوەی بمتوانیایە بەردەوام لەچواردوری تۆدا بم، خۆزگە عەترێك بومایە بۆئەوەی بتوانم لەسەر جەستەت بمێنمەوە، خۆزگە من خواردنەوە بومایە بۆئەوەی هەمیشە لەدەمی تۆدا جێگیر

بومایە"سینۆهە"من شەقام بەشەقام و ماڵ بەماڵ بەدوای تۆدا دەگەڕێم و واز ناهێنم تا نەتدۆزمەوە، چونکە جەستەم بەسەختی پێویستی بەتۆیە و بێ تۆ بگرە بۆ ساتێکیش ئارام نیم، تۆ بۆچی نایەیت بۆ ماڵی من بۆئەوەی لەگەڵ مندا ڕابوێری، ئەگەر شەرم دەکەیت"چونکە دەزانم تۆ کەسێکی شەرمنی"ئەوەش بزانە کە تەواوی خزمەتکارانی کۆشکی فەرمانڕەوایی دەزانن کە من تۆم خۆش دەوێت و هەموویان حەز دەکەن تۆ بێیت بۆ کۆشك بۆئەوەی من بەبینینت خۆشحاڵ ببم...سینۆهە هەر ئەوەکاتەی ئەم نامەیەت وەرگرت بەباڵی پەڕەسێلکە وەرە بۆلام، ئەگەر تۆ نەفڕیت بۆ لام، من دەبمە پەڕەسێلکە و بەرەوڕوت دەفڕم و تا نەتدۆزمەوە واز لەگەڕان ناهێنم- ئەو کەسەی کە ئارەزوی ئەوە دەکات تۆ ببیتە برای...."مهو نفر".

من دووجار ئەم نامەیەم کە لەخوێندنەوەی هەر دێڕکیدا لەرق و نەفرەتدا دەلەرزیم، خوێندەوە و نەم دەزانی چی بڵێم."مریت"لەناکاو"پاپیرۆس"ەکەی لەدەست سەندم و تەختەی لێوارەکانی شکاند و خودی پاپیرۆسەکەشی دڕی و خستیە ژێر پێی و وتی:

"سینۆهە" ئەگەر ئەم ژنە لاو و جوان بوایە، من دەمتوانی خۆم بەوە ڕازی بکەم کە ژنێکت لەمن لاوتر و جوانترت بەدەست هێناوە و لەمن بەباشتری دەزانی، بەڵام ئەم ژنە ئەوەندە ناشیرینە ئەگەر مەیمونەکان چاویان پێی بکەوێت لێی دەتۆقێن و هەڵدێن و لەوناوە نامێنن کە ئەوی لێیە، پێم بڵێ تۆ بەچ شێوەیەك توانیوتە پەیوەندی لەگەڵ ئەم ژنە پیر و شپرزەیەدا دروست بکەیت، ئایا تەماشاکردنی کۆشك مێشکی لێ سەندویت؟ کە دور نیە وا نەبێت، چونکە تۆ پزیشکی فیرعەونی و بەردەوام لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا ژیاویت و تەماشاکردنی یەکێك لەکۆشکەکانی فەرمانڕەوایی میسر بەلای تۆوە بابەتێکی تازە نیە کە بەو شێوەیە خۆتی تێدا ون بکەیت.

من لەتوڕەیی و بێدەستەڵاتیدا جلە کەتانیەکانی بەرم دڕاند و وتم: "مریت"من لەکۆشکی فەرمانڕەوایی ئەوکاتەی بۆ تیمارکردنی دایکی فیرعەون بانگێشتی ئەوێ کرام، بەڵام چونی من بۆ ئەوێ بێسود بوو، چونکە ئەو بەهۆی گەستنی مارێکەوە مردبوو، هەروەها ناچاربوم بۆ بەدەست هێنانی هەندێك زانیاری کە بەلای منەوە زۆر گرنگە، چەورەیی بۆ ئەم پیرە ژنە بکەم و بەداخەوە ئەم ژنە وادەزانێت کە لەکانگای دڵمەوە چەورەییم بۆ کردووە و حەزم لێی کردووە.

لەکاتێکدا من بەسەختی لێی بێزارم، بەڵام دەزانم کە ئەو وازم لێ ناهێنێت و لەنامەکەی خۆیدا نوسیویەتی بەباڵی پەڕەسێلکە بەرەو ڕوم دەفڕێت، لەبەرئەوە تۆ دەبێت بڕۆیت و بەسەوڵ لێدەرەکانی من بڵێت بەپەلە خۆیان بۆ ڕۆشتن ئامادە بکەن، بۆئەوەی لە"تبس"بڕۆم چونکە ئەگەر لە"تبس"دا بمێنمەوە، دڵنیام کە ئەم ژنە وازم لێناهێنێت و منیش لەبیری ئەوەی کە ڕۆژێك بێت لەگەڵ ئەم ژنەدا جوت بم لەرز سەرتاپام دادەگرێت، جوتبون لەگەڵ لاشەی مردووەکانی"مردووخانە" زۆر پێ باشترە.لەچاو جوتبون لەگەڵ ئەودا.

مریت زەردەخەنەیەکی ژەهراوی کرد و وتی: من دەزانم کە ویستوتە چ زانیاریەك لەم ژنە بەدەست بهێنی، چونکە ئەم ژنە سێ ئەوەندەی من بەتەمەنترە و هەر لەبەرئەوەش زۆر لەمن زیاتر ئەزمونی لەڕابواردندا هەیە و تۆ دەتویست بزانی کە ڕابواردن لەگەڵ ژنێك کە سێ ئەوەندەی من ئەزمونی هەیە، هەڵگری چ چێژێکە.

من وتم: "مریت"وانیە و تۆ هەڵەیت، من هیچ کاتێك نەمویستووە لەگەڵ ئەم ژنەدا ڕابوێرم. لەبەرئەوەش چەورەییم بۆ کردووە کە ناچاربوم چەند زانیاریەکی لێ بەدەست بهێنم، لەم مەیخانەدا ناتوانم پێت بڵێم کە ویستومە چ زانیاریەکی لێ دەربکێشم، وەرە با بڕۆینەوە بۆماڵ، بۆئەوەی تۆ لەو نهێنیە مەزنە ئاگادار بکەمەوە، بۆئەوەی بزانی کە من مەبەستی ئەوەم نەبووە لەگەڵ ئەم ژنە قەڵەو و ناشیرینەدا ڕابوێرم.

"مریت" بەکونجکاویەکەوە[12]سواری کەژاوەکەم بوو و دوای ئەوە کەوتینە ڕێ تا ئەوکاتەی گەشتینە ماڵ. لەوێ منیش نهێنی لەدایك بونی خۆم بەوشێوەیەی لەزڕدایك و زڕباوکمەوە بیستبوو بۆ گێڕایەوە و دوای ئەوە وتم: بەچ شێوەیەك دایك و باوکی شیریم سەیریان لەوە دەهات کە ڕەنگی پێست و جەستەم ڕونترە لە ڕەنگی پێستی دانیشتوانی میسر و دەیانوت بێگومان یان دایك و باوکت یان یەکێکیان سپی پێست بون.

دوای ئەوە چۆنایەتی چاوپێکەوتنم لەگەڵ"تی ئی"دا کە بۆ یەکەمین جار بینیم کە ئەو لەکاتی چنینی حەسیردا، گرێی پەڕەسێلکە بازەکانی دەدا لەحەسیرەکە

[12] بڕۆ بۆ پەراوێزی ژمارە"٢١"ی بەرگی یەکەمی سینۆهە.

بۆ"مریت" گێڕایەوە و وتم: لەبەرئەوەی ئەو سەبەتەی کە منی تێدا بوو و درابوو بەدەم ئاوی ڕوباری نیلەوە، گرێی پەڕەسێلکە بازەکانی پێوەبوو، ئەو بابەتەی بەبیر هێنامەوە.

ئەوکات ئەو زانیاریانەی کە لە"مهو نفر"بەدەستم هێنابوو، بۆ"مریت"م گێڕایەوە و وتم: چەند بەڵگەیەکی بەهێز ئەوە دەسەلمێنێت کە من کوڕی فیرعەونی پێشوو و لەسکی خانمی وڵاتی پێشوو هاتومەتە ئەم جیهانەوە، بەڵام دڵنیا نیم لەوەی زادەی فیرعەون و شازادە خانمی میتانی بم.

کاتێک"مریت"گوێی لەم قسانە بوو، هیچ گومانێکی لەبەرامبەر مندا نەما و چیتر گاڵتەی پێ نەدەکردم و دەنگی پێکەنینی گاڵتەئامێزیم بەرگوێ نەدەکەوت و بەوردی تەماشای کردم و وتی: "سینۆهە"هەر لەیەکەمین جار کە هاتیت بۆ مەیخانەی"کلکی تیمساح"و چاوم پێت کەوت پەیم بەوە برد کە تۆ لەپیاوەکانی تر جیاوازتری و من تۆ بە پیاوێکی شەرمن و بیرمەند و گۆشەگیر دەبینی و هەرجارێك کە بیرم لەو دەکردەوە کە گۆزە لەگەڵ تۆدا بشکێنم، بۆئەوەی تۆ بکەمە برای خۆم، ئاگاداری ئەوە دەبووم کە شایستەی ئەوە نیم ببمە خۆشکی تۆ.

"سینۆهە"منیش نهێنیەکم هەیە و لەم ڕۆژانەی دواییدا چەند جارێك ویستم باسی ئەم نهێنیەت بۆ بکەم، بەڵام ئێستا سوپاسی خوداکان دەکەم کە ڕێیان لێگرتم ئەم نهێنیەت بۆ بگێڕمەوە، چونکە نهێنیەك کە لەدەم بێتە دەرەوە چیتر متمانەی ئەوەی لێ ناکرێت بەنهێنی بمێنێتەوە.

بەڵام"سینۆهە"هەر بەوشێوەی خۆت باست کرد، هیچ بەڵگەیەکت بەدەستەوە نیە کەئەم بابەتەی پێ بسەلمێنی و باشتروایە کە نهێنی خۆت فەرامۆش بکەیت، منیش بەهەمان شێوەی تۆ فەرامۆشی دەکەمو وا لێکی بدەرەوە کە ئەو دیمەنو گفتوگۆیانەت لەخەودا بنیوە، بەتایبەت ئەوەیکە لەکۆتا قۆناخی ژیانی مرۆڤدا دەمێنێتەوە جگە لەئەندێشە و خەیاڵ هیچی تر نیە.

تۆ پیاوێکیت کە گەشتت بەتەواوی جیهاندا کردووەو وڵاتانی"میتانی-بابل-هاتی-کریت-"ت بینیوەو لەیەکەم ڕۆژی پزیشکیتەوە تا ئەمڕۆ سەدان نەشتەرگەریت بۆ نەخۆشەکان ئەنجام داوە یان سەریانت بۆ کۆن کردون، ئایا ئەمڕۆ لەو هەموو دیمەنە کە لەگەشتەکانتدا بینیوتە و ئەو هەموو چارەسەریانەی کە ئەنجامت داوە

جگە لە خەیاڵ و ئەندێشە و یادگاریەك كە هیچ جیاوازیەكی لەگەڵ ئەو شتەی خەوت پێوە بینیوە نیە، هیچ شتێكی تری لێ بەدەست هێناوە؟

وتم: نەخێر.

مریت وتی: هەموو كەسێك لەژیاندا وەكو تۆ وایە و كۆی هەموو ڕوداو و یادگاری ژیانی ڕابردوو، یەكسانە بەو شتەی لەخەوتدا بینیوتە.

هەندێ كەس لەڕوی كۆكردنەوەی سەرەوەت و سامانەوە، هەڵبەت بەو هیوایەی سودێكی تەواو لەژیانیان وەرگرن، هەموو ڕۆژێك بڕێك زێڕ و زیو پاشەكەوت دەكەن و لەكڕینی كێڵگە زەویەكان و ماڵ و فرۆشگاكاندا خەرجی دەكەن و شانازی بەخۆیانەوە دەكەن كە دەرئەنجامی ژیانی ئەوان خەو و خەیاڵ نیە، بەڵكو زێڕ و زیو و كێڵگە زەویەكان و ئاژەڵ و ماڵ و فرۆشگایە.

ماوەی چەند سەد ساڵێك كاهینەكانی"ئاتون"وایان دەكرد و بەڕادەیەك زێڕ و زیو و زەویە كێڵگەییەكان و ئاژەڵ و ماڵ و فرۆشگایان كۆكردەوە كە تا دواساتی ژیانیان بە دەوڵەمەندی و بەهێزی بمێننەوە، بەڵام ڕۆژێكیان خودای میسر گۆڕا و خودای تازە فەرمانی دا كە هەموو ئەو زێڕ و زیو و زەوی كشتوكاڵ و ئاژەڵ و ماڵ و فرۆشگایانەی بەكاهینەكانەوە پەیوەست دەكرێت، لێیان بەسەنرێتەوە و ئەوانیش لەناكاو ئاگاداری ئەوە بوون كە بەرهەمی چەندساڵ ڕەزیلی و تەماعی كۆكردنەوەی سەمانەكەیان، جگە لەخەو خەیاڵ هیچی تر نەبووە.

وتم: "مریت" ئەوە بۆ یەكەمین جارە كە من شتێك لەتۆوە ببیستم كە چاوەڕێم نەدەكرد لەتۆی ببیستم.

"مریت"وتی: لەبەرئەوەی تائەمڕۆ ئەوەم بەچاوی خۆم نەبینیبو كە لەبەرامبەر كارەساتێكی بێوێنەدا پێویستت بەدڵنەوایی بێت و پێویستیشی بەوە نەدەكرد كە ئەم قسانەت بۆ بكەم، بەڵام ئەمڕۆ تێگەشتم كە تۆ بەهۆی ئەو بابەتەی كە تۆ وا لێكی دەدەیتەوە نهێنیەكی مەزنە، لەوانەیە خۆت بەدبەخت بكەیت و شەو و ڕۆژ سەرت لەنێوان هەردوو دەستتدا ڕابگریت و خەمی بۆ بخۆیت كە بۆچی ناتوانی بیسەلمێنی كە تۆ كوڕی فیرعەونیت و هەرلەبەرەئەوەش ئەم بابەتەم بۆ گێڕایتەوە بۆئەوەی لەئایندەدا خۆت نەدەیت بەدەست خەمەكانتەوە.

ئەوکات"مریت"لێوەکانی خستە سەر دەستم و وتی: "سینۆهە"بمبەخشە کە دوێنێ و ئەمڕۆ ئازارم دایت، چونکە من ژنم و ژنێکیش کاتێك ببینێت ڕوخساری ئەو پیاوەی خۆشی دەوێت لەسوراو و سپیاوی ژنێکدا ڕەنگا و ڕەنگ بووە، هەروەها ئاگاداری ئەوە بێت ئەو ژنەش نامەی ئاشقانە بۆ بنوسێت. ناتوانێت بەسەر ئیرەیی و توڕەیی خۆیدا زاڵ بێت و ئیرەییش بەشێوەیەك بەسەریدا زاڵ دەبێت کەبگرە بابەتە سادە و ساکارەکانیشی لێ بشارێتەوە.

وتم: "مریت"تۆ وتت نهێنیەکت هەیە کە دەتویست بۆم بگێڕیتەوە....ئەو نهێنیەت چی بوو؟

"مریت" وتی: لەوانەیە ڕۆژێك بێت من ئەم نهێنیەت بۆ بگێڕمەوە، بەڵام ئێستا کاتی گێڕانەوەی ئەو نهێنیە نیە و ئێستاش تۆ دەبێت خۆت لەشەڕی ئەو ژنە ڕزگار بکەیت، چونکە ئەم جۆرە ژنە پیر و شەهوەتبازانە، کاتێك گوێیان لەگوتەی شیرین یان چەورەیی پیاوێك دەبێت، وا دەزانن کە ئەو پیاوە شەیدایان بووە و دوای ئەوەی ئاگاداری ئەوەبوون پشتگوێیان خستون، ئەم جۆرە حاڵەتە بەخیانەتی پیاو لەقەڵەم دەدەن، بەواتا وا دەزانن پیاو یەکسەر ئاشقی ئەوان بووە، بەڵام لەدواییدا ژنێکی تری پەیداکردووە و خیانەتی لەوان کردووە.

من دڵنیام ئەگەر تۆ لە"تبس"دا بمێنیتەوە ئەم ژنە دەستبەردارت نابێت و بەهەرشێوەیەك بووە، وات لێدەکات کە لەگەڵیدا ڕابوێریت و لەوەش خراپتر گۆزەی لەگەڵدا بشکێنی.

کەواتە لێرە بڕۆ، بەڵام پێش ڕۆشتنت نامەیەك بۆ ئەم ژنە بنوسە کە چیتر لێت بێهیوا ببێت، ئەگینا بەدواتدا دەگەڕێت و لەوانەیە تا"بابل"یش بێت بەدواتدا تەنها بۆئەوەی لەگەڵیدا جوت بیت.

چونکە مرۆڤ هەرچەنێك پیرتر ببێت، دوو تەماع لەودا زۆر بەهێزتر دەبێت، یەکێکیان تەماعی ڕابواردن لەگەڵ پیاودا"ئەگەر ژن بێت"و ڕابواردن لەگەڵ ژندا"ئەگەر پیاو بێت". ئەویتریان تەماعی کۆکردنەوەی سەمانە و تۆش دەست لەو شتە هەڵگرە کە لەوانەیە خوێنی خودایان لەخوێنبەرەکانتدا بخرۆشێت چونکە تۆ کوڕی فیرعەونیت و تۆ بونەوەرێکی دەگمەنیت، بەڵام کەسانی تر هەرچی زیاتر پیرتر بن زیاتر ئەم دوو تەماعەیان بەسەردا زاڵ دەبێت.

ئاگاداری ئەوە بوم کە"مریت"قسەی ژیرانە دەکات و ئەو ژنە گەر لە"تبس"دا بمێنمەوە دەستبەردام نابێت.

بە"موتی"م وت: کەلوپەلی کۆچکردنم ئامادە بکات و نۆکەرێکیشم نارد بۆئەوەی سەولْ لێدەرەکانم لە مەیخانە و سۆزانی خانەکان کۆبکاتەوە و دوای ئەوەش لەسەر"پاپیرۆس"نامەیەکی بەڕێزانەم لەوبارەیەوە بۆ"مهو نفر" نوسی، چونکە نەمدەویست سوکایەتی پێبکەم.

"لەلایەن"سینۆهە"پزیشکی تایبەتی فیرعەون بۆ"مهو نفر"دانیشتوی باخی زێڕین و فەرمانڕەوایی لە"تبس"-"مهو نفر" بەداخەوە کە دەربڕینەکانی ئەو ڕۆژەم بووەتە هۆی ئەوەی تۆ لەبارەی هەستەکانمەوە دوچاری هەڵە بیت و وا هەست بکەیت کە من جارێکی تر حەز دەکەم چاوپێکەوتنت لەگەڵدا بکەم، لەکاتێکدا پێش ئەوەی چاوپێکەوتن لەگەڵ تۆدا بکەم، من ڕۆحی خۆم بەژنێکی تر بەخشیوە و ئەگەر لەگەڵ تۆدا ڕابوێرم، ئەوا خیانەتێکی مەزنم لەو ژنە و ڕۆحی خۆم دەکەم.

سەرەڕای ئەوەش من ناچارم کە گەشتێکی درێژخایەن بکەم و چیتر ناتوانم تۆ ببینم، بەڵام دۆستانە لەتۆ جیا دەبمەوە بۆئەوەی دیاریەکت پێشکەش بکەم، گۆزەیەکی پڕ لەخواردنەوەی"کلکی تیمساح"ت بۆ دەنێرم، بۆئەوەی بەخواردنەوەی سەرگەرم بیت. "مهر نفر" من دەبێت ئەوەت پێ بڵێم کە تۆ سەرەڕای ئەوەی بەهەڵە هەستەکانی منت لێکداوەتەوە، بەهەمان شێوە لەبەرامبەر توانای جەستەیی منیشدا دوچاری هەڵەیەکی گەورە بویت، چونکە من پیاوێکی پیر و ماندو و سست و خاوەنی جەستەیەکی قەڵەو و ورگێکی دەرپەڕیو و سەرێکی کەچڵم، بۆیە ناتوانم کەرەستەی ڕازیکردنی ژنان فەراهەم بکەم، چ بگات بەوەی لەگەڵ ژنێکی وەك تۆ کە ڕازیکردنی کارێکە کە پێویستی بەکوڕێکی لاو و بەهێزە. من زۆر خۆشحاڵم کە بەهۆی پیری و لاوازیمەوە کارێکمان ئەنجام نەدا کە لەدواییدا من زۆر بەسەختی لێی پەشیمان دەبومەوە لەبەرئەوەی بەدڵنیاییەوە پیاوێکی پیر و لاواز جێگای ڕق و نەفرەتی تۆیە، بۆیە باشتر وایە کە ئێمە یەکتری نەبینین.

دوای ئەوەی ئەم نامەیەم نوسی دام بە"مریت" بۆئەوەی بیخوێنێتەوە و بۆچونی خۆیم لەبارەی ئەو نامەیەوە پێ بڵێت.

"مریت" وتی: "سینۆهە" تۆ لەم نامەیەدا بۆ ڕێزگرتن لەو ژنە خۆت بەکەسێکی پیر داوە لەقەڵەم و دەترسم ئەم ژنە پیرەش بەهەڵە لەناوەڕۆکی ئەم نامەیە تێبگات و دەستبەردارت نەبێت، بۆیە باشتروابوو ئەم نامەیەت ڕاستگۆیانەتر بنوسیایە لەبەرئەوەی ئەو پیرە و خاوەنی ڕوخسارێکی دزێو و نەفرەتبارە و هیچکاتێك هیچ پیاوێك، ڕازی نابێت لەگەڵ ژنێکی وەك ئەودا ڕابوێرێت، تۆ لەبەرئەوە لەم شارە هەڵهاتی بۆئەوەی تا لەژیاندا ماوی چاوت پێی نەکەوێتەوە.

وتم: "مریت"ئەم کەسە ژنە، بۆیە پیاوێکی پەروەردە کراوی وەك من نابێت بەژنێك بڵێت کە تۆ پیر و ناشیرینی، چونکە ژن هەموو قسەیەکی ناشیرین و جنێوێك دەبەخشێت، بەڵام ئەم قسە ناشیرینە کە ڕاستی لەخۆ دەگرێت هیچ کاتێك لێی نابورێت.

سەرەڕای ئەوەی"مریت"لەشێوازی داڕشتنی ئەو نامەیە ناڕازی بوو و دەیوت دەبێت زمانێکی زبر لەخۆ بگرێت، بۆئەوەی ئەو ژنە بەتەواوی بێزار بکات، دوای ئەم قسانەی نامەکەی دایەوە دەستم بۆئەوەی سەری نامەکەی بۆ ببەستم و منیش نامەکەم بۆ بەست و نۆکەرێکم بانگ کرد کە ئەو نامەیە ببات بۆ باخی زێڕین و بیدات بەدەستی"مهو نفر"، بەڵام لەڕێدا خۆی بکات بەمەیخانەی"کلکی تیمساح"دا و گۆزەیەك شەرابی بەناوبانگی ئەو مەیخانەیە بکڕێت، بۆئەوەی نامەو و گۆزەی خواردنەوەکە لەیەك کاتدا بگاتە دەستی"مهو نفر".

*بەشی سی و حەوتەم*

## وەك هەڵهاتنێك لە"تبس"دەرچون

ماوەیەك بوو كە شەو داهاتبوو و ئەستێرەكانیش لەئاسماندا دەدرەوشانەوە. "موتی" پێی وتم: كە كەلوپەلی كۆچی بۆ ئامادەكردووم و هەركاتێك ئارەزوم لیٚ بێت، دەتوانم باریان بكەمە سەر كەشتیەكە،"مریت"یش بەجێی نەهێشتم و نەڕۆشت بۆ مەیخانە و هەركاتێكیش تەماشام بكردایە دڵتەنگ دەبوم، چونكە بەهۆی گەمژەییمەوە كەرەستەی جیابونەوەم لە"مریت"ئامادە كردبوو، ئەگەر لەڕوی نەزانیەوە، بەوشێوەیە زمانچەوریم بۆ ئەو ژنە نەكردایە، دەمتوانی تا ئەو ماوەیەی كە خۆم بمویستایە لە"تبس"بمایامەتەوە و بەبینینی مریت خۆشحاڵ بومایە.

"مریت"یش كەسێكی بیرمەند بوو و جارێكیان وتی: "سینۆهە"ئایا تۆ منداڵت خۆش دەوێت، ئەم پرسیارە چاوەڕوان نەكراوە ڕایوەشاندم و"مریت"یش كە تەماشای دەكردم وتی: مەترسە، چونكە نامەوێت منداڵگەلێكت بۆ بهێنمە بون، بەڵام دۆستێكم هەیە كە خاوەنی منداڵێكی تەمەن چوارساڵانە و ئەم دۆستەم كە ژنە پێی وتوم كوڕەكەی حەزی لەوەیە بەسەر ڕوباری"نیل"دا گەشت بكات و لەوەرگای سەرسەوزی تێر و لەوەرگای سەرسەوزی ڕون و مانگا و مەڕ و مراوی و قازەكان ببینێت، ئایا حەز دەكەیت ئەم كوڕە تەمەن چوارساڵەیە لەگەڵ خۆتدا ببەیت؟

وتم: "مریت"من دەزانم ئەگەر ئەم كوڕە بچوكە لەگەڵ خۆمدا ببەم، لەم كۆچەمدا هەرگیز ئاسودە خەیاڵ نابم، چونكە بەردەوام دەبێت ئاگام لێی بێت لەكەشتیەكەوە نەكەوێتە ناو ئاوەوە و نەخنكێت یان تیمساحێك قوتی نەدات.

"مریت"زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: "سینۆهە" کاتێك ئەم کوڕە لەدایك بوو، من خودی ئەو منداڵەم لەدەستی وەرگرتووە و بردومە بۆئەوەی خەتەنەی بکەن و ئەو ژنەی منداڵەکە دەبات بۆئەوەی خەتەنەی بکەن، لەبەرامبەر ئەو منداڵەدا ئەرکگەلێکی وەك دایك لەبەرامبەردا لەئەستۆ دەگرێت. لەبەرئەوە ناچارم بۆ پاراستنی ئەم منداڵە لەشوێنێکدا دانیشم و بە بەردەوامی پەرستیاری ئەو منداڵە بکەم، لەبەرئەوەی چاودێری ئەو منداڵە دەکەم، چیتر ترسی ئەوەی لێ ناکرێت کە بکەوێتە ناو ڕوبارەکەوە و تیمساحیش ناتوانێت ئەو منداڵە بخوات.

کاتێك من ئەم قسەیەم بیست بەشێوەیەك خۆشحاڵ بوم کە هەردوو دەستم دا بەسەری خۆمدا وتم: "مریت" ئەگەر تۆ بۆ پەرستاری ئەو منداڵە بیت، ئەوا ڕێت پێدەدەم لەباتی منداڵێك تەواوی منداڵەکانی قوتابخانەی سەرەتایی پەرستگای "ئاتون"لەگەڵ خۆتدا بهێنیت لەبەرئەوەی بۆ چاودێرکردنی ئەو منداڵە دێیت، هیچ کەسێك بەهۆی ئامادەبونی تۆ لەکەشتیەکەی مندا سەرسوڕماو نابێت و ئەمەش ناوبانگی چاکەی تۆ ناڕوشێنێت.

من لەترسی ژنی پیر و شەهوەت پەرست بریارم دا بەیانی زوو دەست بەکۆچەکەم بکەم. "مریت" پێش بەڕێکەوتنی کەشتیەکەمان ڕۆشت و منداڵەکەشی هێنا کە خەوتبوو لەگەڵ خۆیدا، بەڵام دایکی منداڵ نەهات، من حەزم دەکرد چاوم بەدایکی ئەو منداڵەش بکەوێت، چونکە بیستبوم کە ناوی کوڕەکەی ناوە"تهوت" و بینینی ئەو ژنەی کە ئەو ناوەی لەمنداڵەکەی خۆی ناوە زۆر بەسود بوو. چونکە"تهوت"ناوی یەکێکە لەخوداکان و لەمیسردا بەدەگمەن دایك و باوکان دەوێرن ناوی یەکێك لەخوداکان بنێن لەمنداڵەکانیان، ئەویش ناوی خودای"تهوت"کە خودای نوسین و زانیاری مرۆیی و یەزدانیە.

منداڵیش بێئەوەی هەست بەوە بکات کە چ ناوێکی قورسی لێنراوە، خەوی لێکەوتبوو و بێئەوەی بێدار بێتەوە ئێمە بەڕێکەوتین، بەڵام دوای ئەوەی ئەو کێوانەی کە وەك بڵێی پاسەوانی بەردەوامی"تبس"ن لەبەرچاومان ون بوو، منداڵەکە لەخەو هەستا.

"تهوت"منداڵێکی جوان و قژ نەرم و ڕەش بوو کە بەسەر نێوچەوانیەوە لول بوبون، بەشێوەیەك بەچاوە ڕەشەکانی تەماشای دەکردم کە وەك بڵێی ساڵهایە دەمناسێت.

من زۆر زوو خۆم بەم منداڵەوە گرت و لەسەر ئەژنۆم دامنیشاند و بەقامیشی کەنار ڕوباری نیل سەبەتگەلێکی بچوکم بۆ چنی و بەوە ڕازی بوم کە یاری بەکەرەستە پزیشکیەکان بکات و بۆنی دەرمانەکانم بکات.

"تهوت"لەو گەشتەدا نەبووە مایەی سەرئێشەمان و نەکەوتە ناو ئاوی ڕوبارەوە و تیمساحیش نەیخوارد، بەڵکو ئێمەی زیاتر خۆشحاڵکرد، هەرشەوێك من و "مریت" لەتەنیشت یەکەوە دەخەوتین، دەنگی یەکبین و ڕێکی هەناسەی کە لەنزیك ئێمەوە خەوی لێکەوتبوو دەبیسترا و بەرەبەیانان کاتێك لەخەو هەڵدەستاین، ئەو هێشتا لەخەو هەڵنەدەستابوو.

من هەرگیز ئەو کۆچەی لەگەڵ"مریت"و"تهوت"ی بچوك کەبەسەر ڕوباری"نیل"دا ئەنجامم دا فەرامۆش ناکەم و بەردەوام خۆشی و هیواداری، بەشێوەیەك منی مەست کردبوو کە بە"مریت"م وت:

وەرە با گۆزەیەك پێکەوە بشکێنین و بۆ هەتا هەتا پێکەوە بژین و تۆش کوڕگەلێکی جوانی وەك"تهوت"م بۆ بهێنەرە ئەم جیهانەوە.

من ئەو ڕۆژە خوازیاری ئەوە نەبووم کە منداڵم ببێت، بەڵام ئێستا هەست دەکەم کە خوێنم لەخرۆشی سەردەمی لاویەتی کەوتووە و سوڕی پیریم هاتووە و هەرجارێك"تهوت"م دەبینی ئاگاداری ئەوە دەبووم کە باشتر وایە منداڵێکی وەك ئەوم هەبێت.

بەڵام"مریت"بەدەستی دەمی گرتم و وتی: "سینۆهە" تۆ دەزانی من ژنێکم کە لەمەیخانەدا خزمەت دەکەم و لەناو مەیخانەدا گەورە بووم و پێش تۆ چەند پیاوێك لەگەڵ مندا ڕایبواردووە و شایستەی ئەوە نیم کە ببمە خوشکی پزیشکی تایبەتی فیرعەون و لەوەش والاتر کوری فیرعەونی مەزن بم، چونکە ڕۆژێکیان لە"تبس"دا تۆ پێت وتم کە وا هەست دەکەیت کوڕی فیرعەونی بیت و لەنەوەی خودایانیت. چیتر دیار نیە دوای ئەوەی بومە خوشکت، بتوانم کوڕت بۆ بوێنم یان نە. منیش وەك تۆ ئەم کوڕە بچوکەم خۆش دەوێت و وا هەست دەکەم کە من و تۆ بەبونی ئەم کوڕە لەم کەشتیەکەدا ڕۆژگەلێکی خۆشی تر چاوەڕێمان دەکات، وا لێکی بدەرەوە کە تۆ باوکی ئەم منداڵەیت و منیش دایکی، لەبەرئەوەی ئەو منداڵە وەك تەواوی منداڵەکانی تر

ڕۆژانی ڕابردوو فەرامۆش دەکات، و من دەتوانم وەهای پەروەردەی بکەم کە تۆ بە"باوك" بانگ بکات و واهەستی بکەیت کە باوکی ڕاستەقینەی ئەو منداڵە بیت.

لەو ڕۆژە بەدواوە"تهوت"ی بچوك، دەستی لەملم دەئالاند و ڕوخساری لەسەر ڕوخسارم دادەنا و منی بابە بانگ دەکرد و منیش چێژم لەنەوازشی قژە لولەکانی وەردەگرت.

لەو ڕۆژانەی بەکەشتی بەسەر ڕوباری"نیل"دا تێدەپەڕین، ئەوەندە خۆشحاڵ بوم کە ئاگام لەبرسیەتی و بەدبەختی جوتیارانی میسری هەردوو لای ڕوباری"نیل" نەما، بەواتا نەمدەویست بەتەماشاکردنی ڕوخساری باریك و ئەندامی لاواز و بیستنی ناڵەیان خۆشی خۆم بشێوێنم.

ئەمڕۆ کاتێك بیری ڕۆژە خۆشەکانم دەکردەوە، فرمێسك لەچاوانمدا قەتیس دەما و ئاه لەسینەمەوە دەهاتە دەرەوە و بیرم لەوە دەکردەوە کە مرۆڤ بۆچی بەشێوەیەك هاتووەتە بون کە ڕۆژە خۆشەکانی بەخێرایی تێپەڕێت و بەپێچەوانەی ڕۆژە بەدبەختیەکان کە ئەوەندە بەخاوی تێدەپەڕێت کە هەرگیز کۆتاییان نایەت.

کۆتایی بەم کۆچەمان هات و ئێمەش پێمان نایە شاری"ئاسۆ"وە و کاتێك چومە ناو شارەوە، سەرەڕای ئەوەی ماوەیەکی زۆرە ئەوێم بەجێنەهێشتبوو، هەستم کرد کە لەشاری"ئاسۆ"دا ڕاستیەکی تازە هاتووەتە بون کە من چاوم پێی ناکەوێت.

خۆری شاری"ئاسۆ"هەمان خۆر بوو،ماڵەکانیش هەمان ماڵ و درەختەکانیش هەمان درەخت بون، بەڵام من هەستم دەکرد کە ڕاستیەکی تازە لەشاری ئاسۆدا هاتووەتە بون کە من چاوم پێی ناکەوێت. لەناکاو ئاگاداری ئەوە بووم کە ئەو ڕاستیەی لەبەرچاوی مندا گۆڕانکاری بەسەر شاری"ئاسۆ"دا هێنابوو، بریتیە لە وشکەساڵی و بەدبەختی و تاوانگەلێك کە لە وشکەساڵی و هەژاریەوە سەرچاوە دەگرێت.

"مریت"و"تهوت"ی بچوك زۆر لەئاسۆدا ڕانەوەستان و گەڕانەوە بۆ"تبس"منیش دوبارە تەنها بومەوە، خەمی تەنهاییش کە لەکۆچ و گەشتەکەمدا لێم دور کەوتبووەوە سەرلەنوێ بۆم گەڕایەوە.

چەند ڕۆژێك دوای ئەوەی"مریت"و"تهوت"لەشاری"ئاسۆ"دەربچن و بگەڕێنەوە بۆشاری "تبس"، ئەخناتونی فیرعەونی میسر کە ئامادە نەبوو ئەو ڕاستیانەی

پەیوەستە بەشارەکەی خۆیەوە ببینێت، دواجار ناچار بوو تەماشای یەکێك لەو ڕاستیانە بکات.

بەمشێوەیەی"هورم هب"فەرماندەی هێزی سەربازی میسر، کۆمەڵێك لەو میسریانەی کە لەسوریاوە هەڵهاتبون لەشاری"ممفیس"وە ناردبوو بۆ شاری "ئاسۆ" بۆئەوەی خۆیان پیشانی فیرعەون بدەن و بزانێت کە کەمتەرخەمی و ئاشتی خوازی و یەکسانی خوداکەی ئەو چی بەسەر ئەو میسریانەی کە لەسوریادا بون هێناوە.

ئەو ڕۆژەی ئەم میسریە هەڵهاتوانە لەسوریاوە خۆیان کرد بەشاری"ئاسۆ"دا خەڵکی بەجۆرێك بەتەماشاکردنی ئەمانە تۆقی بوون کە دوای بینینیان خۆیان کرد بەماڵدا و دەرگایان لەدوای خۆیان داخست.

ئەمانە دەیانویست خۆیان بکەن بەکۆشکی فیرعەوندا، بەڵام پاسەوانانی کۆشك ڕێی چونە ژورەوەیان لیگرتن و هەڵهاتووەکان دەرگا و دیواری کۆشکیان بەشێوەیەك بەردە باران کرد کە فیرعەون ناچاربوو ڕێیان پێبدەن بێنە ژورەوە و گوێ لەڕاوبۆچونەکانیان بگرێت.

کاتێك ئەمانە خۆیان کرد بەناو کۆشکدا، من لەوێ بوم و کاتێك لەفیرعەون نزیك بونەوە، هاواریان کرد ئەی"ئەخناتون"ئەمڕۆ سەروەت و هێزی فیرعەونی میسر لەسوریادا وەك ئەو کەسەی لێهاتووە کە لەحاڵی گیانەڵاندا بێت و بەم زوانەش لەگۆڕ دەنرێت و تۆش لێرەدا نازانی کە قۆچ[13] و گالیسکەی جەنگی و ئاگر و شمشێر و نێزە لەسوریادا چی بەمیسریەکان دەکات و بەچ شێوەیەك خوێنی ئەو کەسانەی کە بەمتمانەی تۆ لەسوریادا دەژیان لەشارەکانی سوریادا ڕێژرا.

لەناکاو هاواری ئەوانە گۆڕا بۆ شیوەن و غەڵبەغەڵب و ئەو کەسانەی دەستیان لە ئارنجیانەوە بڕابویەوە دەستی خۆیان بەرز کردەوە و وتیان ئەی فیرعەون ئێمە دەستمان هەبوو و متمانەکردنمان بەهێزی فەرمانڕەوایی تۆ ئێمەی بێدەست کردووە و لەمڕۆ بەدواوە دەبێت تا کۆتایی ژیانمان سواڵ بکەین.

ئەو لاو و پیرانەی کە چاویان دەرهێنابون یان زمانیان بڕیبون هاتنە پێشەوە و وەك گیانەوەرەکان بەهاوار و ناڵەوە وتیان ئەی فیرعەون باوەڕ و متمانەمان بەتۆ و

[13] بڕۆ بۆ پەراوێزی ژمارە"٧٤"ی بەرگی یەکەمی سینۆهە.

خوداکەت ئێمەی بەم ڕۆژە گەیاندووە و ئەگەر ئێمە بمانزانیایە تۆ ئەوەندە سست و لاوازی، ئەوا پێش ئەوەی فەرمانڕەوایانی سوریا شوڕش و دەست بەکوشت و کوشتاری ئێمە بکەن لەو ولاتەی هەڵدەهاتین، سەرەڕای ئەوەی ئێمەیان بەم ڕۆژە ڕەشە گەیاندووە، هێشتا لە ژن و کچەکانمان خۆشبەختترین، چونکە تەواوی کچ و ژنەکانمان گرفتاری دەستی سەربازانی پادشا"ئامورو"و "هاتی"ن و تا ئەوکاتەی زیندون، وەك ئەو ژنانەی خۆیان هەڕاج فرۆشیان دەکەن و دەبنە مایەی خۆشگوزەرانی سەربازە دڕندەکانی سوریا و هاتی.

کاتێك فیرعەون دەستی بڕاو و کاسەی بێ چاو و دەمی بێ زمانیانی بینی، دەموچاوی بەهەردوو دەستی داپۆشی و ئەوکات باسی"ئاتون"ی خۆدای خۆی کرد و وتی: "ئاتون" ڕقی لە خوێنڕشتن و ئازاردانی کەسانی تر و درۆ کردنە و دەڵێت هەموو خەڵکی دەبێت لەبەرامبەر یەکدا یەکسان بن و یەکتریان خۆش بوێت.

کاتێك هەڵهاتووە بەدبەختە میسریەکان گوێیان لەم قسەیە بوو، بەڕادەیەك توڕە بون کە دەستیان کرد بە جنێودان و وتیان: ئەی فیرعەون تۆ نەفرەتئامێزترین پادشای میسری و هیچ کەسێکیش تائێستا نەیبیستووە کە پادشایەك ئەوەندە لەبەرامبەر شوێنکەوتەکانیدا کەمتەر خەم بێت و بیان سپێرێت بە دژمنەکانی، ئایا دەزانی کە ئەو"خاچی ژیان"انەی کە تۆ ناردوتن بۆ فەرمانڕەوایانی سوریا چیان پێکردون، ئەوان ئەم خاچانەیان کردووەتە ملی ولاخ و ئەسپەکانیانەوەو لەئۆرشەلیمیشدا پێی کاهینانی خودای"ئاتون"یان بڕیوەتەوە، سەرەڕای ئەوەی چیتر پێیان نیە، ناچاریشیان کردون لەبەرامبەر خوداکەی تۆدا سەما بکەن.

کاتێك"ئەخناتون"گوێی لەم قسانە بوو، هاواری کرد و دوای ئەوە لەهۆش خۆی چو، هەندێکات دوچاری ئەم حاڵەتانە دەبێت و دەکەوێتە سەر زەوی و لەهۆش خۆی دەچێت.

پاسەوانانی کۆشك کاتێك بینیان فیرعەون کەوتە سەر زەوی و لەهۆش خۆی چووە ویستیان هەڵهاتووە میسریەکان لەکۆشك دەربکەن، بەڵام ئەمانە هەموو شتێکیان لەدەست داوە، چیتر هیچیان بۆ دۆڕان بەدەستەوە نەمابوو، بۆیە زۆر بەسەختی بەرنگاریان کردن و لەنێوان ئەمان و پاسەوانەکاندا شەڕ و کێشمەکێش دروست بوو و زەوی لەخوێنی میسریە هەڵهاتووەکان سور وەرگەڕا و ئەو کەسانەی کە لەستەمی

فەرمانڕەوایانی سوریا هەڵهاتبون، بەو هەموو بەدبەختیەوە پەنایان بۆ لای فیرعەون بردبوو، بەڵام لەکۆشکی فیرعەوندا بەکوشتیان دان و لاشەیان فڕێ دانە ڕوباری "نیل"ەوە.

کاتێك پاسەوانەکان سەرقاڵی ڕشتنی خوێنی میسریە هەڵهاتووەکان بون"نفر تی تی"شاژنی میسر و کچەکەی لەژورەکەی خۆیانەوە چاویان بەو کوشت و کوشتارە کەوت و لەبەرئەوەی یەکەمین جارە ببینن کە جەنگ و هەڵهاتن و بەدبەختی بە چ شێوەیەکە هەرگیز فەرامۆشی ناکەن.

لەکاتێك لەهەیوانی کۆشکدا، کوشتنی ئەو خەڵکە بێدەرەتانە بەردەوام بوو، من فیرعەونم بردەوە ژورەکەی خۆی و پارچەیەك کە لەئاوی سارد هەڵکێشرابوو، پێچام بەسەریەوە و دەرمانی هێورکەرەوەم کردە قوڕگیەوە، بۆئەوەی بێتەوە هۆش خۆی، دوای ئەوە بەهۆی ئەو لاوازیەی کە بەرۆکی جەستەی گرتبوو خەوی لێکەوت.

دوای ئەوەی فیرعەون لەخەو هەستا بەڕوخسارێکی بێڕەنگ و چاوێکی لاوازەوە وتی: "سینۆهە" ئەم بارودۆخە نابێت بەوشێوەیە بەردەوام بێت، بۆیە دەبێت چاك بکرێت.

من لەدەمی"هورم هب"ەوە بیستومە کە دەیویت، تۆ پادشای"ئامورو"کە ئێستا هێرشی کردووەتە سەر میسریەکان باش دەناسی، بۆیە یەکسەر بڕۆ بۆلای و گفتوگۆی کڕینی ئاشتی لەگەڵدا بکە و هەرچەنێك زێڕ و زیوی لێداواکردی، لەپێناو ئاشتیدا پەسەندی بکە، چونکە من ئامادەم تەواوی زێڕ و زیوی میسر ببەخشمە پادشای"ئامورو"تەنها بۆئەوەی لەگەڵ میسریەکاندا ئاشت بێتەوە، ئەگەر دوای ئەم ڕێکەوتنە میسریش هەژار بکەوێت ڕازیم.

وتم: "ئەخناتون"من دەڵێم کە باشترین ڕێگای کڕینی ئاشتی بریتیە لەوەی تۆ زێڕ و زیوی میسر بدەیت بە "هورم هب"بۆئەوەی گالیسکەی جەنگی و نێزە و شمشێر و قۆچ دورست بکات و سەربازگەلێکی زۆر بۆئەم جەنگە پەروەردە بکات، ئەوکات تۆ دەتوانی لەوە دڵنیا بیت کە ئاشتی بەدەست دێت و جارێکی تر میسر دوچاری سوکایەتیەکی ئاوا نابێت.

فیرعەون سەری بەهەردوو دەستی گرت و وەك کەسێك کە سەری قورسایی بۆ ملی دروست کردبێت ڕوخساری دا بەیەکدا، دوای ئەوە وتی: "سینۆهە"بزانە کە بەرهەمی

کینە و ڕق هەر کینە ڕقە و تۆڵەش دەبێتە هۆی ئەوەی تۆڵە بسەنرێتەوە و خوێنڕێژیش دەبێتە هۆی خوێنڕێژیەکی لەو سەختتر. هەرجارێك ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت تۆڵە لەکەسانی تر بکەنەوە، تۆوی کینە و تۆڵەی مەزنتر لەواندا دەچێنن، بەڵام ئەوەی کە وتت کڕینی ئاشتی، جگە لەسوکایەتی هیچ شتێکی تر بۆ میسر ناهێنێت و جگە لە ئەفسانە هیچ شتێکی تر لەخۆناگرێت و ئەم گوتەیەت لەڕۆحی دەغەزنی و تۆڵە سەندنەوەوە سەرچاوە دەگرێت....ئەوەی پێتم وت پەسەندی بکە و بڕۆ بۆ لای پادشای"ئامورو"و پێی بڵێ کە من ئامادەم هەرچەنێك زێڕ و زوی بوێت پێی دەدەم، بۆئەوەی ئاشتی لێ بکڕم.

من دەمزانی بەرپا کردنی ئاشتی لەڕێی زێڕ و زیوەوە مامەڵەیەکی شێتانەیە، لەبەرئەوەی کاتێ فرۆشیاری ئاشتی دەستی بەسەر زێڕ و زیوی میسردا گرت و زانی کە میسر هەژار کەوتووە، بەمتمانە و بوێریەکی زیاترەوە پەنا بۆ جەنگ دەبات و بۆئەوەی وا لەفیرعەون بکەم دەست لەم مامەڵەیە هەڵگرێت یان خۆم نەبمە هۆی ئەنجامدانی ئەم مامەڵە سوکە، وتم:

"ئەخناتون" تۆ ئەوەندە باسی ئاشتیت کرد و جەنگت لەهەموو شتێکدا بێبەش کرد، بووە هۆی ئەوەی خو و نەریتی جەنگاوەری و پێویستی ئەم خوورەشم کە گەشتە درێژخایەنەکانە لەدەستداوە و چیتر ناتوانم بە چوارپێ و گالیسکە گەشتە درێژخایەنەکانی خۆم ئەنجام بدەم.

سەرەڕای ئەوەش، من بگەمە لای پادشای"ئامورو"سەربازەکانی دەستم دەبڕن و چاوەکانم لەکاسەی چاوم دەردەهێنن. من پیاوێك نیم کە بتوانم درۆت لەگەڵدا بکەم و ناتوانم مامەڵە لەگەڵ کەسانێکدا کە لەمنداڵیەوە فێری درۆ و ساختە بون بکەم و دانیشتوانی"ئامورو"خەڵکانێکی درۆزن و ساختەچین، دەبێت کەسێك مامەڵەیان لەگەڵدا بکات کە بتوانێت درۆ بکات، لەبەرئەوە کەسێکی تر لەباتی مندا بنێرە بۆلای.

بەڵام فیرعەون وتی: "سینۆهە"ملکەچی ئەو شتە بە کە پێتی دەڵێم و بڕۆ بۆ سوریاو ئاشتی لە پادشای وڵاتی ئامورو بکڕە.

دوای دەرچونم لە ژورەکەی فیرعەون چاوم بەو بڕە میسریە هەڵهاتووە کەوت کە بەدەستی پاسەوانەکان بەکوشت درابون و بینیم کە چاو یان دەستیان نیە و تێگەشتم

لەوەی ئەگەر منیش بڕۆم بۆ سوریا، وەك ئەوانم بەسەردا دەهێنن و ئاژاوەگێڕەکانی سوریا هەردوو دەستم بۆ دەبڕنەوە و چاوەکانم لەکاسەی چاوانم دەردەهێنن.

باشتروایە بڕۆمەوە بۆماڵ و خۆم بکەم بەنەخۆش، بۆئەوەی کەمێك بیر و هزری فیرعەون گۆڕانی بەسەردا بێت و بابەتی ناردنی من بۆ سوریا لەبیر خۆی بباتەوە.

کاتێك پێم نایە دەرەوەی دەروازەی کۆشکی فیرعەون، بۆئەوەی بڕۆمەوە بۆماڵ بینیم نۆکەرەکەم بەپەلە دێت و کاتێك چاوی پێم کەوت وتی: من لەبەرئەوەی وام دەزانی کە لەوانەیە تۆ ئەمشەویش نەگەڕێیتەوە بۆ ماڵ، بۆیە هاتم بۆ ئێرە، بۆئەوەی تۆ لەهەواڵێکی تازە ئاگادار بکەمەوە.

لێم پرسی: هەواڵە تازەکەت چیە؟

وتی: هەرئێستا کەشتیەك لە"تبس"ەوە خۆی کردووە بەم شارەدا و لەنزیك ماڵەکەی تۆدا ڕاوەستا و ژنێکی لێ دابەزی و خۆی کرد بەماڵەکەی تۆدا، ئەم ژنە سەرەڕای ئەوەی بەتەمەنە، خۆی وەك کچێك کە دەیەوێت هاوسەرێك بۆ خۆی هەڵبژێرێت، ڕازاندووەتەوە و سورا و سپیاوێکی تێری داوە لەڕوخساری و بۆنی عەترێکی توندیشی لێوە دێت. ئەو پێی وتم: خاوەنەکەت "سینۆهە"خوازیاری منە و هۆن هۆن فرمێسك بۆ بینینم دەڕێژێت!

پرسیارم لەنۆکەرەکەم کرد: ئایا ناوی خۆی پێ وتی؟

نۆکەرەکەشم وەڵامی دایەوە: بۆچی نا وتی کە ناوی "مهو نفر"ە و ئێستا من هاتوم کە پێت بڵێم کەمێك زوتر بڕۆیتەوە بۆماڵ، چونکە"مهو نفر" چاوەڕێت دەکات.

کاتێك بیستم کە"مهو نفر"بەکەشتی بەدەوای من دا لە"تبس"ەوە هاتووە بۆ شاری"ئاسۆ" سەرتاپام لەترس و نەفرەتدا دەلەرزی.

ئەوکات گەڕامەوە بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی و بەفیرعەونم وت: من بڕیارم دا کە بۆ ئەنجامدانی ئەو فەرمانەی تۆ، هەر ئێستا بڕۆم بۆ سوریا و زۆر زوو بە نوسەرەکانی خۆت بڵێ کە تەختە قوڕێك بۆ پادشای"ئامورو"بنوسن، بۆئەوەی ئەو پەی بەپلەوپایەی من ببات و بزانێت کە من لەلایەن تۆوە هاتوم.

فیرعەون بانگی نوسەرەکانی خۆی کرد و پێی وتن کە: نوسراوەکانی من ئامادە بکەن..دوای ئەوە پێی وتم: هەرئەوەی ئەم نوسراوانە ئامادە بون، لەگەڵ بڕێك ئاڵتوندا بۆت دەنێرم بۆئەوەی بۆ ئەم گەشتەت لەگەڵ خۆتدا بیبەیت.

منیش لەبەرئەوەی دەترسام لەوەی بگەڕێمەوە بۆ ماڵ بەفیرعەونم وت: من لەکارگای پەیکەرسازی"توتمس"ی هاوڕێم کەلەکۆشکی فەرمانڕەواییدایە چاوەڕێ دەبم و هەرئەوەی ئاڵتون و نامەکان ئامادە بون، پێیان بڵێ بیهێنن بۆئەوێ بۆم.

کاتێك دەمویست بڕۆم بۆ کارخانەی پەیکەر سازی"توتمس"بینیم نۆکەرەکەم چاوەڕێم دەکات، منیش پێم وت: بڕۆ بە"مهو نفر"بەواتا هەمان ئەو ژنە پیرەی لە"تبس"ەوە بەکەشتی هاتووە بۆ ئێرە، بڵێت کە فیرعەون منی ناردووە بۆ سوریا و من لەوێ کوژراوم، بۆئەوەی ئەو بەتەواو لەمن بێهیوا ببێت و بزانێت من چیتر زیندوو نیم.

کاتێك ئەم قسەیەم کرد دەمزانی کە درۆناکەم، چونکە دڵنیابوم کە دوای ئەوەی پێم نایە سەرخاکی سوریا دەکوژرێم.

بەنۆکەرەکەی خۆمم وت: دوای ئەوەی بە"مهو نفر"ت وت کە من لەسوریادا کوژراوم، دەبێت بەکەشتی بیگەڕێنیتەوە بۆ"تبس"و ئەگەر نەشی ویست لەماڵ بڕواتە دەرەوە، بەزۆر بیگەڕێنەرەوە و ئەوەش بزانە ئەگەر لەسوریا بگەڕێمەوە و ببینم ئەم ژنە لەماڵی مندایە گوێی تۆ و تەواوی نۆکەرەکانی تر دەبڕم و بەبێ خواست و ئارەزوی خۆشتان دەتاننێرم بۆ ئەوەی لەکانە کانزاکاندا کاربکەن.

ئەوە یەکەمین جارە نۆکەرەکەم لەو جۆرە هەڕەشانە لەمن ببیستێت، منیش ڕاستگۆیانە ئەو گوتانەم هێناوەتە زمان و ئەویش سوێندی بە"ئاتون"خوارد کە ئەو ژنە لەماڵ و شاری ئاسۆ دەربکات.

دوای ئەوەی لەوە دڵنیابووم کە نۆکەرەکەم فەرمانەکەم جێبەجێ دەکات، خۆمکرد بەکارخانەی"توتمس"ی پەیکەرسازی فەرمانڕەوایی هاوڕێمدا.

"توتمس"لەکۆندا پەیکەرێکی"هورم هب"ی دروست کردبوو و هەر ئەو ڕۆژەی کە من خۆم کرد بەو کارخانەیەدا، بینیم کە پەیکەرێکی تری"هورم هب"ی لەبەردی خورمایی، بەشێوازێکی تازە دروست کردووە.

گەرچی لەم پەیکەرەدا"توتمس"بۆ دەرخستنی هەندێك بەشی جەستەی"هورم هب" زیادەڕەوی کردووە و بەتایبەت ماسولکەکانی سینە و بازوی"هورم هب"ی بەڕادەیەك قایم و ئەستور نیشان داوە کە هەرکەسێك چاوی بەو پەیکەر بکەوێت، وا دەزانێت کە پەیکەری زۆرانبازێکە، نەك فەرمانده و سوپاسالاری لەشکری سەربازی.

بەڵام شێوازی تازەی هونەر، وا دەخوازێت کە لەهەندێك بەشی جەستەدا کە دەرپەڕینێکی پێوە دیارە، زیادەڕەوی تێدا بکرێت، بۆئەوەی ناشرینی لەچاو جوانی دا زیاتر دەربکەوێت.

لەکۆندا هونەرمەندان هەوڵی ئەوەیان دەدا کە شوێنە نەنگەکان بشارنەوە و تەنها شوێنە باشەکان نیشان بدەن، بەڵام لەهونەری تازەدا وا دەخوازرێت کە تا ئەوشوێنەی بوار هەبێت، شوێنە نەنگەکانی مرۆڤ بەشێوەیەکی بەرجەستە دەربکەوێت و بگرە شوێنە چاکەکانیشی بەهۆی زیادەڕەویەوە زۆر ناشیرین دەربکەوێن.

لەبەرئەوەی هونەری تازەی مرۆڤ، جگە لەچەند هێڵ و شێوەیەکی ئەندازەیی، هیچ شتێکی تری تێدا نابینرێت و جوانی لەدیدی هونەرمەندی ئەم سەردەمەدا، بێ ناوەڕۆکە و تەنها هەوڵی ئەوە دەدات کە بتوانێت هێڵ و شێوەی ئەندازەیی بەڕونی بخاتە ڕوو.

هونەری کۆن مرۆڤی بەجوانترین بونەوەری جیهان دەزانی و هونەری تازەش لەوباوەڕەدا بوو کە مرۆڤ یەکێك لەناشیرینترین گیانەوەرانی جیهان، بەتایبەت لە لەڕووەك و بێگیانەکانیش ناشیرینترە.

کاتێك"توتمس"منی بینی پارچە قوماشێکی تەڕی هەڵگرت و جوان پەیکەرەکەی "هورم هب"ی پێ سڕی، بۆئەوەی ئەوەم پێ نیشان بدات کە بەچ شێوەیەك ماسولکەی ئەو پەیکەرە بریسکە دەداتەوە. کاتێکیش زانی من بەپێی فەرمانی فیرعەون دڕۆم بۆ سوریا، وتی: منیش بۆ گەیاندنی ئەم پەیکەرە بەپەرستگای " هت نت سوت[14]" لەگەڵ تۆدا دێم، بۆئەوەی پێی بڵێم کە پەیکەری"هورم هب" لەشوێنێکی شایستەی ئەو پەرستگایەدا دابنێم، لەهەمان کاتدا لەم گەشتەمدا کەمێك شنەی ڕوبار لێم دەدات، چونکە ماوەیەکە گەشتم نەکردووە و ڕابواردن و گەشتکردن زۆر سود بەمن دەگەیەنێت.

نوسەرانی فیرعەون، تەختە قوڕ و بوجەی ئەم گەشتەیان بۆ هێنام و ئێمەش پەیکەری"هورم هب"مان گواستەوە بۆ کەشتی فەرمانڕەوایی کە تایبەت بوو بەم

---

[14]"هت نت سوت" شارێکە کە لەمرۆدا بەناوی "ئەلمینا" بانگ دەکرێت.

گەشتەی ئێمەوە، دوای ئەوە بەرەو ڕوی"هت نت سوت"کەوتینە ڕێ و لەوێشەوە من بڕۆم بۆ سوریا.

کاتێك بەڕێ کەوتین"توتمس"وتی: "سینۆهە" لەبەرئەوەی تۆ دەڕۆیت بۆ وڵاتێك کە لەوێدا بڵێسەی جەنگە، کەمخۆری لەخوردنەوەدا مەکە، چونکە دیار نیە لەو ڕۆژانەدا ئایا هەلی خواردنەوەت بۆ دەڕەخسێت یانە نە؟

منیش پەیڕەویم لەم ئامۆژگاریەکانی"توتمس" کرد و کاتێك کەشتیەکەمان بەدرێژایی ڕەوتی"نیل"بەرەو ڕوی ئەو شوێنە ڕۆشت کە ڕوبار دەڕژێتە ناو دەریاوە، کەمخۆریم لەخواردنەوەدا نەکرد.

*بەشی سی و هەشتەم*

## بەفەرمانی فیرعەون ڕۆیشتن بۆ سوریا

کاتێك من دەمویست کاپتا ڕاسپێرم کە بڕوات و گەنمەکەم بەنێو خەڵکی"ئاتون"دا دابەش بکات، ئەو پێشبینی ڕودانی کارەسات و نەهامەتیەکی کرد و وتی: ئەم فیرعەونەی تۆ، بە بەردەوامی دانی ئەم ڕەوشەی گرتویەتە بەر، ئێمە بەدبەخت دەکات، هەروەها لە خواردن و ماڵ و شوێنی خەوتنی خۆش بێبەشمان دەکات.

کاتێك بەرەو سوریا دەڕۆشتم پێشبنی"کاپتا"ی نۆکەری پێشوم بوو بەڕاست و من لەماڵی خۆش و شوێنی خەوتنی نەرم بێبەش بووم و لەبەر فیرعەونیش دەبێت بڕۆم و ڕوبەڕوی هەڕەشەکانی جەنگی سوریا ببمەوە.

ئەگەر"کاپتا"بەدابەشکردنی گەنمەکەی من، لەماڵ و خواردن و شوێنی خەوتنی خۆش بێبەش ببێت، بەڵام سەرەڕای ئەوەش گیانی دوچاری هەڕەشەی مەرگ نابێتەوە، لەکاتێکدا من بۆ شوێنێك دەڕۆشتم کە دڵنیابووم چیتر لەوێوە ناگەڕێمەوە بۆ شوێنی خۆم، جگە لەحاڵەتێك ئەویش یان بێدەست یان بێ چاو، یان بێ هەردوکیان دەگەڕێمەوە.

مرۆڤ نابێت لەکاتی قسە کردندا پێشبینی ڕوداوە خراپەکان بکات، لەبەرئەوەی ڕوداوە خراپەکان زوو دێنە پێش، لەکاتێکدا ڕوداوە چاکەکان، زۆر درەنگ ڕو دەدەن، یان هەر ڕونادەن.

بەدەم ڕێوە باسی ئەو بەدبەختیانەم دەکرد کە لەسوریادا چاوەڕێم دەکەن، بەڵام"توتمس" پێی وتم: بێدەنگ بە و بهێڵە با شێوەت بکێشم.

ئەوکات وێنەی شێوەی کێشام و بینیم ڕوخسارم زۆر ناشیرین بووە، بۆیە گلەییم لێکرد و وتم: تۆ هاوڕێی من نیت، چونکە ئەگەر هاوڕێی من بویتایە، بەوشێوەیە وێنەی ڕوخساری منت نەدەکێشا.

"توتمس"یش وتی: من پیاوێکی هونەرمەندم، و کاتێك هەونەرمەندیش پەیکەرێك دروست دەکات یان وێنەیەك دەکێشێت، نە هاوڕێی کەسێکە و نە دوژمنی هیچ کەس، تەنها دەبێت گوێڕایەڵی چاوی خۆی بێت و ئەوەی چاوەکانی دەیبینێ، پەیکەرێك یان وێنەیەکی لێ بکێشێت.

زۆر زوو گەشتینە شاری"هت نت سوت"و ئەم شارەش شارۆچکەیەکی بچوکی کەنار ڕوباری"نیل"ە و هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ لادێدا نیە، چونکە بینیم مەڕ و مانگاکان لەکۆڵانەکانی شاردا هاتوچۆ دەکەن و پەرستگای شاریشیان بەخشت دروست کردووە.

کاتێك کاربەدەستانی شار زانیان من پزیشکی تایبەتی فیرعەونم و"توتمس" پەیکەر سازی فەرمانڕەواییە، بەڕێزەوە پێشوزیان لێکردین و"توتمس"پەیکەری" هورم هب"ی لە پەرستگادا دانا.

ئەم پەرستگایە، لەڕابردوودا بۆ خودای"هوروس"دروست کرابوو و"هوروس" خودایەکە کە سەری لەشێوەی"واشە"دایە.

بەڵام دوای ئەوەی فیرعەون خودای نوێی ناساند بەخەڵکی، ئەم پەرستاگایەیان تایبەت کرد بە"ئاتون"ەوە و پەیکەری خودای"هوروس"یان لەشوێنەکەی خۆیدا لابرد.

دانیشتوانی شار، دوای لابردنی پەیکەری خودای"هوروس"چیتر هیچ پەیکەرێکی تریان نەبوو، بۆیە بەبینینی پەیکەری"هورم هب"زۆر خۆشحاڵ بون، منیش وا لێکی دەدەمەوە کە ئەویان بەخودای نوێ لێکدابێتەوە یان لەباتی خودای پێشوو دایاننابێت، چونکە دانیشتوانی ئەم شارە نەخوێندەوار بون و نەیاندەتوانی لەوە تێبگەن کە لەوانەیە خودایەکی بێ شێوە و پەیکەر بونی هەبێت، لەکاتێکدا خوداکەی فیرعەون"ئاتون"بێ شێوە و پەیکەر بوو.

لەو شارەدا چاومان بە دایك و باوکی"هورم هب"کە شوێنی نیشتەجێ بونی بەردەوامیان لەوشارەدا بوو کەوت و دایك و باوکی"هورم هب"یش بەبەشێك لەو

خەڵکە ئاساییە لەقەڵەم دەدران، دوای ئەوەی"هورم هب"بوو بەفەرماندە و سوپاسالاری سەربازی میسر، هەوڵیدا دایك و باوکی بکاتە بەشێك لەخێزانە وەجاخزادەکان، بۆئەوەی خەڵکی بڵێن"هورم هب" لەنەوەی وەجاخزادەکانە.

"هورم هب"بەڕادەیەك لە فیرعەونەوە نزیك بوو کە داوای هەرچی لێ بکردایە فیرعەون پێی ڕازی دەبوو، هەر لەبەرئەوە فەرماندە و سوپاسالاری سەربازی میسر، باوکی خۆی کرد بە یەکێك لەکاربەدەستانی فەرمانڕەوایی، دایکیشی کرد بە مانگا بەخێوکەری فەرمانڕەوایی، چونکە دایکی بێ لە لەوەڕاندن و دۆشین مانگاکان، نەیدەتوانی هیچ کارێکی تر ئەنجام بدات، هەروەها خوێندەواری نەبوو، بۆئەوەی بتوانێت بەرپرسیاریەتیەکی تری بۆ دەستنیشان بکات.

بەڵام کاتێك باوکی"هورم هب" بوو بەیەکێك لەکاربەدەستانی فەرمانڕەوایی، لەبەرئەوەی ئەویش خوێندەواری نەبوو، چاودێری کردنی کۆشکەکانی"ئاتون"کە لەئەستۆی هەندێك خوێندەواردا بوو بەوی سپارد، کاری ئەو تەنها لایەنێکی مەزن ڕاگرتنی باوکی بوو و بەرپرسیاریەتیەکی ڕوکەشی لەخۆ دەگرت و لەبنەچەدا هیچ کارێکی ئەنجام نەدەدا، بەڵکو ئەندازیار و وەستادیوارەکان هەڵدەستان بەئەنجامدانی ئەوکارە.

هەرئەوەی دایك و باوکی"هورم هب"چونە ڕیزی کاربەدەستانی فەرمانڕەوایی میسرەوە، لەتەواوی میسردا خەڵکی وایان دەزانی کە"هورم هب"لەنەژادی وەجاخزادەکانە.

ئەوکاتانەی شەو و ڕۆژ بەسەر ئاوی ڕوباری"نیل"دا گەشتمان دەکرد، من بەسەر سەکۆی کەشتیەکەوە دادەنیشتم و بەلاسەرمەوە ئاڵای پرشنگداری[15] فیرعەون شەپۆلانی دەدا.

ئەوکاتەی بەسەر سەکۆی کەشتیەکەوە دانیشتبوم، تەماشای نەیجەلانی کەنار ڕوبار و فڕینی باڵندە و ڕۆشتنی ئاوم دەکرد، ئەوکاتەی خۆر وردە وردە گەرم دەبوو و مێشەکان دەستیان بەگەستنم دەکرد، بەخۆمم وت: "سینۆهە"چاو بەتەماشاکردنی

---

[15] ئاڵای پرشنگدار: بریتیە لەئاڵایەکی درێژ و باریك کە لەباتی ئاڵاکانی ئێستا بەسەر منارەی کەشتیەوە هەڵیان دەواسی و هێشتا لەهەندێك وڵاتدا هەڵواسینی ئاڵایەکی درێژ و باریك بەسەر منارەی کەشتیەکەیانەوە باوە و کاتێك با هەڵدەکات دیمەنێکی شکۆمەند بەکەشتی دەبەخشێت.

بەردەوام ماندوو دەبێت و گوێش لەبیستنی گوتەگەلێکی زۆر هەست بەماندویەتی دەکات و ڕۆحیش هەرگیز بەوە ڕازی نابێت کە هیچ کەسێك لەژیاندا بەتەواوی ئارەزووەکانی خۆی نەگات و ناتوانرێت کەسێك بەدی بکرێت کە بتوانێت بڵێت من بەتەواوی ئارەزووەکانی خۆم گەشتوم.

کەواتە لەم حاڵەتەدا مرۆڤ بۆچی لەپێناو لەدەستدانی ئەم ژیانەدا کە هەرگیز تێیدا هەستی بەخۆشبەختی تەواو نەکردووە دەڵتەنگ دەبێت. ئەگەر کەسانی تر لەمەرگ دەترسن، ئەوا"سینۆهە" تۆ کەپزیشکیت نابێت لەمەرگ بترسیت، چونکە ئەوەندە مەرگت بەچاوی خۆت بینیوە کە بەلای تۆوە بووەتە شتێکی ئاسایی و دەزانی لەوساتەی کە مەرگ دێت تەواو چەرمەسەری و بەشمەینەتی و ئارەزووەکانی ژیان لەناو دەچن و ڕۆژێك ژیان بەئازاری جەستەیی و ڕۆحیەوە، زۆر سەختترە لەوەی مرۆڤ بۆ هەتا هەتا لەگۆڕێکدا جێگیر ببێت، چونکە لەو هەتا هەتاییەی کە مۆرڤ لەناو گۆڕێکدا جێگیر دەبێت، هەست بەهیچ جۆرە ئازار و بەشمەینەتیەك ناکات.

کاتێك بۆماوەیەك سەرقاڵی ئەم جۆرە بیرۆکانە بوم، چێشت لێنەری کەشتی هاواری کرد خواردن ئامادەیە و منیش هەستام و لەگەڵ"توتمس"دا دەستمان بەخواردن دەکرد، دوای ئەوە کەمێك حەوامەوە و خەوتم.

بەم شێوەیە کەشتەیەکەمان گەشتە"ممفیس"[16].

"هورم هب"کە لە"ممفیس"نیشتەجێ بوو، کاتێك ئاگاداری ئەوە بوو من گەشتومەتە ئەوێ، لەبەرئەوەی کرابووم بە نوێنەری میسر بۆئەوەی بڕۆم بۆ لای پادشای"ئامورو"لەسوریا، زۆر بەڕێزەوە پێشوازی لێکردم و بینیم زیادەڕەوی لەڕێزگرتنمدا دەکات.

هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە بڕێك لەمیسریە هەڵهاتووەکانی سوریاو ئەو سریانیانەی کە لایەنگری میسر بون و لەو وڵاتە هەڵهاتبون، هەروەها دەوڵەمەندانی وڵاتانی تریش لە"ممفیس"دا دەژیان. کاتێك"هورم هب"ئاگاداری ئەوە بوو من دەمەوێت بڕۆم بۆ سوریا، ویستی من زۆر بەمەزنی پیشانی خەڵکی بدات، بۆئەوەی خەڵکی بزانن بەهۆی

---

[16] ممفیس: یەکێکە لەشارە کۆنەکانی میسر و شوێنی ئەو شارە دەکەوێتە باشوری قاهیرەی ئێستاوە و وێرانە و کەلاوەکانی ئەم شارە هێشتا لەوشوێنانەدا بەدی دەکرێت.

مەزنی و بەڕێزی فیرعەونەوە"هورم هب"بەوشێوەیە پێشوازی لەنوێنەرەکەی دەکات و"هورم هب" لەبەرچاوی خەڵکیدا هەردوو دەستی خستە سەر ئەژنۆی و سوژدەی بۆ بردم.

بەڵام دوای ئەوەی خەڵکی بڵاوەیان لێکرد و ئەویش منی بردە ماڵەکەی خۆی و پێم نایە ماڵەکەیەوە، خزمەتکارەکەی مەرەخس کرد، لەکاتێکدا یاری بەقامچی دەسك ئاڵتونیەکەی دەکرد وتی: "سینۆهە" سەرەڕای ئەوەی نازانم تۆ بۆچی دەڕۆیت بۆ لای پادشای وڵاتی"ئامورو"، بەڵام دڵنیام تۆ لەپێناو یەکێك لەکارە شێتانەکانی فیرعەون سەردانی ئەویٚ دەکەیت.

منیش باسی هۆکاری ڕۆشتنەکەمم بۆکرد و وتم: هەربەوشێوەیکە بیستت، فیرعەون پێی وتم: بەهەر بەهایەك بووە ئاشتی لە"ئازیرو"ی پادشای وڵاتی"ئامورو" بکڕە.

"هورم هب"کاتێك گوێی لەم قسەیە بوو، بەشێوەیەك بەتوڕەییەوە هاواری کرد کە منی ترساند و وتی: من زانیومە کە شێتیەکەی فیرعەون لەجاران توندتر و بەهێزتر بووە، بەڵام لەوباوەڕەدا نەبووم کە ئەو بەو ڕادەیە شێت بوبێت کە وابزانێت دەتوانێت ئاشتی بەبڕێك زێڕ و زیو بکڕێت، چونکە ئەو کەسەی ئاشتی بەزێڕ و زیو لە دژمنێکی چەکدار بکڕێت، هەم زێڕ و زیوەکەی لەدەست دەدات هەم وڵاتەکەشی،"سینۆهە" باش بزانە سەرەڕای ئەوەی"ئازیرو" پادشای "ئامورو"دەستی بەسەر سوریادا گرتووە، بەڵام من لەوەدا سەرکەوتنم بەدەست هێناوە کە لەپێناو میسردا پارێزگاری لەناوچەی"غەزە"بکەم، ئەم ناوچەیەش جێگایەکی باشە بۆ ئەو ڕۆژەی ئێمە بمانەوێت سوریا بخەینەوە ژێر فەرمانڕەوایی خۆمان، چونکە بەشوێن پێ و سەرەتای هێرشێکی باش بۆ هێرش بردنە سەر سوریا لەقەڵەم دەدرێت.

"هاتی"دوای ئەوەی جیٚ پێی خۆی لە وڵاتی"میتانی"دا جێگیر کرد، یان هێرش بۆ"بابل" دەکەن یان بۆ میسر.

هزرێکی تەندروست دەڵێت لەبەرئەوەی"هاتی"یەکان دەبینن"بابل"یەکان سەرقاڵی کۆکردنەوەی خۆبەخش و سەربازەکانی خۆیەتی، بۆئەوەی خۆی بەهێزتر بکات، بۆیە هێرش ناکاتە سەر"بابل"یەکان، بەڵام لەبەرئەوەی میسر بەبیٚ هیزی سەربازی و لاواز

دەبینێت، ئەگەرێکی زۆری ئەوە هەیە هێرش بکاتە سەر ئێمە و ڕۆژی خەڵکی میسر و فیرعەن ڕەش بکات.

"ئازیرو"ی پادشای وڵاتی"ئامورو"ش کاتێك دەبینێت"هاتی"یەکان بەهێزن و میسریەکان لاوازن، تێدەگات کە یەکگرتنی لەگەڵ میسریەکاندا هیچ سودێك بەو ناگەیەنێت، لەکاتێکدا ئەگەر لەگەڵ"هاتی"یەکاندا یەك بگرێت ئەوا سودێکی زیاتری پێدەگەیەنێت.

هەر پیاوێکی ژێر لەجێی"ئازیرو"دا بوایە هەمان کاری دەکردو لەمیسر دور دەکەوتەوە و پەیوەندی بە"هاتی"یەکانەوە دەکرد.

"هورم هب"پێی وتبوم کەمن دەتوانم "ئازیرو" لەنێوان ناوچەکانی"سینا"و "غەزە"دا پەیدا بکەم، چونکە ئێستا ئەو لەو شوێنانەدایەو لەگەڵ پارتیزانەکانی میسردا دەجەنگێت و بەردەوام کۆمەڵێك لەسیخوڕەکانی ئێمە"سیخوڕەکانی هورم هب" لەشێوەی مارگرتن[17]و هەندێك فڕوفێڵ و فرۆشیاری ئاوجۆ و کڕینی ئەو شتومەکانەی کە لەشەڕدا دەستیان بەسەردا گیراوە، لەگەڵ هێزە سەربازیەکانی ئازیرۆدان.

"ئازیرو"ش هەندێك سیخوڕی هەیە کە لەشێوەی کاری مارگرتن و فێڵ و تەڵەکە و فرۆشتنی ئاوجۆ و کڕینی کەنیز و نۆکەرەوە دوای پارتیزانەکان دەکەون یان لەگەڵ پاسەوانانی سنوری میسر هاوڕێیەتی دروست دەکەن و لەم ڕێیەوە زانیاریان لێ دەردەکێشن.

کۆمەڵێك لەسیخوڕەکانی "ئازیرو"ش لەخودی میسرو"ممفس"دان و لەوێدا زانیاری لەسەر هەلومەرجی سیستەمی سەربازی میسر کۆدەکەنەوە و هەڕشەئامێزترینیان ژنانی لاو و سپی پێست و چاوڕەشەکانیانە کە لەسوریاوە هاتون بۆ میسر.

ئەم ژنانە، بەڕوکەش لەسۆزانیخانەکاندا بەمەبەستی لەشفرۆشی هاتون بۆ میسر، بەڵام لەناوەڕۆکدا بۆ سیخوڕی کردن لەمیسردا دەژین و لەبەرئەوەی سەربازو ئەفسەرە

---

[17] لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە بە مەبەستی"مارگرتن" لەدەشت و دەردا دوای هێزە سەربازیەکانی"ئازیرو"بکەون بۆئەوەی زانیاریەکی تەواویان لێیانەوە دەست بکەوێت، بۆئەوەی بزانن دەیانەوێت بۆ کوێ بڕۆن و هێرش بۆ کوێ دەبەن......وەرگێڕ.

میسریەکان لەگەڵیاندا ڕادەبوێرن، ئەوانیش کاتێك ئەفسەرێك یان هەر سەربازێکیان بەخۆیانەوە پەیوەست کردبێت، هەر جۆرە زانیاریەك کە خۆیان بیانەوێت لە ئەفسەر و سەربازەکانی دەردەکێشن، خۆشبەختانە لەبەرئەوەی ئەم ژنە هەرشەئامێزانە هیچ شارەزاییەکیان لەبواری سەربازیدا نیە، ناتوانن پرسیارگەلێکی بەسود لە ئەفسەر و سەربازەکانی ئێمە بکەن، بۆیە زۆربەی پرسیارەکانیان زۆر منداڵانەیە.

هەندێك سیخوڕی ئازاش هەن کە هەم بۆ میسر کار دەکەن و هەم بۆ"ئازیرو"و سود لەهەردوکیان وەردەگرن و خیانەتیش لە هەردوکیان دەکەن.

ئێمە"بەواتا هورم هب" ئاگاداری ئەم بارودۆخەین، بەڵام لەبەرئەوەی سود لەزانیاریەکانیان وەردەگرین، ناچارین بەرگەی بونی ئەم جۆرە سیخوڕە دوڕوانە بگرین.

وتم: "هورم هب" لەبەرئەوەی تۆ لەڕێی سیخوڕەکانتەوە ئاگاداریەکی تەواوت لەبارودۆخی هێزی سەربازی"ئازیرو"هەیە، پێم بڵێ لەچ ڕێیەکەوە دەبێت خۆم بگەیەنمە لای"ئازیرو"و چ نەهامەتیەك هەڕشەی مەرگم لێدەکات.

"هورم هب"وتی: تۆ دەتوانی لەڕێی دەریاوە یان لەڕێی وشکانیەوە بڕۆیت بۆ "غەزە"، چونکە بەو شێوەی پێم وتی"ئازیرو" لەنێوان "غەزە" و "سینا"دایە.

ئەگەر لەڕێی دەریاوە بڕۆیت بۆ"غەزە"کەشتیە جەنگیەکانی"کریت"پارێزگاریت لێدەکەن، بەڵام بەمەرجێك چاویان بە کەشتیەکانی سوریا نەکەوێت.

چەنکە ئەگەر چاویان بە کەشتیە زۆرەکانی سوریا بکەوێت و بزانن ڕێژەیان زۆرە، یەکسەر ئەو کەشتیەی کە تۆی هەڵگرتووە بەجێ دەهێڵن و هەڵدێن. ئەوکات تۆ دەتوانی بەرگری لەخۆت بکەیت یان خۆت بدەیت بەدەستەوە. ئەگەر بەرگری لەخۆت بکەیت کەشتیەکەت نوقم دەکەن و تۆش لەئاودا دەخنکێیت، ئەگەر خۆت بدەیت بەدەستەوە، زۆرت لێدەکەن کە لەکەشتیەکانی ئەواندا سەوڵ لێبدەیت و لەبەرئەوەی بەزۆری قامچی سەوڵت پێ لێدەدەن، لەوانەیە دوای چەند ڕۆژێك بەهۆی ماندویەتی و ئازار کێشانەوە گیان لەدەست بدەیت.

بەڵام ئەگەر بتناسنەوە و بزانن کە یەکێکی لەکەسە مەزنەکانی میسر، ئەوا سەوڵت پێ لێنادەن بەڵکو بەزیندویی پێستت دەکەنن و بەپێستەکەت تورەکەیەك دروست دەکەن بۆئەوەی پارچە زێڕ و زیوەکانی خۆیانی تێدا هەڵگرن. من نامەوێت بتترسێنم،

بەڵام لەبەرئەوەی داوات لێکردم کە زانیاریەکی تەواوت پێبدەم، منیش ناچاربوم زانیاری ڕاست و دورستت پێبدەم.

سەرەڕای ئەوەش لەوانەیە ئەو کەشتیەی کە تۆی هەڵگرتووە، بێ هیچ ڕووبەڕوبونەوەیەك بگاتە"غەزە"و تۆ لەوێ لەو کەشتیە پیادە بیت، بەڵام من نازانم دوای ئەوەی لەو کەشتیە پیادە بویت، بەچ شێوەیەك خۆت دەگەیەنیتە لای"ئازیرو"، چونکە جەنگ لە"غەزە"دا بارودۆخێکی ناجێگیری هەیە، بۆیە ناتوانم لەئێستادا پێت بڵێم کە ئەو لەوێیە، چونکە کاتێك تۆ دەچیتە ناو"غەزە"وە کەس نەزانێت لەکوێی ئەو شارەدا نیشتەجێیە.

وتم: "هورم هب"ئایا باشتر نیە لەڕێی وشکانیەوە بەواتا لەڕێی"سینا"[18] و غەزە"وە بڕۆم.

"هورم هب"وتی: من دەتوانم بۆ پاراستنت کۆمەڵێك سەرباز و چەند گالیسکەیەکی جەنگیت لەگەڵدا بنێرم بۆ ئەوەی لەڕێی وشکانیەوە بڕۆیت بۆ"غەزە"، بەڵام هەر ئەوەی سەربازەکانم ڕوبەڕوی سوپای"ئازیرو"بونەوە بەجێت دەهێڵن و هەڵدێن و تۆش بەتەنهایی دەمێنیتەوە.

ئەوکات سەربازەکانی"ئازیرو"دەستگیرت دەکەن و بەڕێوڕەسمی خەڵکی"هاتی" لەسیخت هەڵدەکێشن و تۆش بەئازارەوە گیان لەدەست دەدەیت.

گریمانەیەکی تریش هەیە ئەوەیش ئەوەیە ئەگەر بکەویتە دەستی پارتیزانەکانی خۆمانەوە و لەبەرئەوەی ئەوان پابەند نین بەهیچ یاسایەکەوە، هەرچیت پێیە لێت دەسێنن و دوای ئەوە دەتبەستنەوە بە ئاشەوە و تا زیندویت دەبێت ئاشیان بۆ بگێڕیت، بۆئەوەی گەنمی پارتیزانەکان بکەیت بەئارد و لەوانەشە کوێریشت بکەن، بۆئەوەی بیر لەهەڵهاتن نەکەیتەوە، ئەوەی جێی گومان نیە ئەوەیە کە لەڕۆژانی یەکەمدا کە هێشتا خووت بەکاری ئاشەوە نەگرتووە و ناتوانی لەبەیانیەوە تا ئێوارە بەخێرایی ئاشەکە بگێڕیت، لەوانەیە تا ئەوکاتەی گیان لەدەست دەدەیت لێت بدەن.

---

[18] سینا: ناوی تازەی ناوچەیەکە کە لەمڕۆدا بەنیمچە دورگە بانگ دەکرێت و ئەم ناوچەیە لەکۆندا چەند ناوێکی هەبووە کە یەکێك لەو ناوانە"تانیس" بووە و لەبەرئەوە ناوە تازەکەیمان لەم کتێبەدا بەکار هێناوە بۆئەوەی خوێنەری بەهۆی خوێندنەوەی ئەو ناوە نامۆیەوە بەهەڵەدا نەچێت.

سەرەڕای ئەوەی وەرزی هاوینە و ئاو و هەواش گەرم بووە، من بەبیستنی قسەکانی"هورم هب"لەرز گرتمی و پێم وت: سەرەڕای ئەوەی من بەپێی فەرمانەکانی فیرعەون دەبێت بڕۆم بۆئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ"ئازیرو"دا بکەم و گەشتن بەو پیاوە یەکسانە بەمەرگ، باشتروایە ئەم کارە زووتر ئەنجام بدرێت، چونکە جگە لەڕۆشتن هیچ ڕێگەچارەیەکی ترم لەبەردەستدا نیە، بۆیە لەڕێی وشکانیەوە دەڕۆم و تۆش هەندێك پاسەوانم پێبدە کە بمگەیەننە لای سەربازەکانی "ئازیرو"، بەڵام ئەگەر بیستت دیل کراوم، بێ ئەملاو لا پارە بدەن بەو کەسانەی کە منیان گرتووە، بۆئەوەی ئازادم بکەن، چونکە من پیاوێکی دەوڵەمەندمو نۆکەرەکەی پێشوم"کاپتا"کە ئێستا بەرێوبەری کارەکانی منە لە"تبس"دایە، بۆ کڕینی من پێویستیان بەهەرچەنێك زێڕ و زیو بێت، پێیان دەدات.

"هورم هب"وتی: من دەزانم کە تۆ کەسێکی دەوڵەمەندی و هەرلەبەرئەوەش لەنۆکەری پێشوت"کاپتا"و دارایی تۆ بڕێك زێڕو زیوم بەقەرز وەرگرتووە، لەبەرئەوەی نەمدەویست تۆ لەشانازیەکانی بەشداری کردنت لەقەرزدان بۆ هاوکاری کردن و بەهێز کردنی میسردا بێبەش بیت.

بەڵام"سینۆهە"ئەوەش بزانە کە من قەرزی هیچ دەوڵەمەندێکی میسر نادەمەوە، هەروەها قەرزەکەی تۆش نادەمەوە، ئەگەرڕۆژێك بێتو داوای قەرزەکەتم لێ بکەیتەوە، نێوەندی هاوڕێیەتیمان تێك دەچێت، لەوانەیە بەیەکجاریش لەناو بچێت.

ئێستابڕۆ کاتێك گەشتیتە زەوی‌وسنورەکانی"سینا"وە کۆمەڵێك لەپاسەوانەکانی من کە لەوێن لەگەڵ خۆتدا ببە، ئەگەر دیلیش کرایت، من زێڕ و زیو لە"کاپتا" وەردەگرم و تۆی پێدەکڕمەوە، ئەگەر بەکوشتیشت بدەن، ئەوا لەتۆڵەی خوێنی تۆدا کۆمەڵێك لەبکوژانت دەکوژم، بۆیە ئەوەت پێدەڵێم بۆئەوەی تا ئەوکاتەی نێزەکە دەکەن بەورگتدا نائومێد مەبە و دڵنیابە لەوەی کە خوێنت بەفیڕۆ ناڕوات.

وتم: "هورم هب"ئەگەر من بکوژرێم، تۆ کاتی خۆت بەتۆڵەسەندنەوەی منەوە بەفیڕۆ مەدە، چونکە ئەگەر من بکوژرێم، ئەوا لاشەم لەبیاباندا بەجێ دەمێنێت و دوای چەند هەفتەیەك جگە لەئێسقان هیچ شتێکی تر لە لاشەم نامێنێتەوە، ئەگەر تۆش لەتۆڵەی مندا بەئەندازەی ڕوباری"نیل"خوێن بەسەر ئێسقانەکانی مندا بڕێژی، ئەوا دڵنیابە لەوەی کە بەڕشتنی ئەو هەموو خوێنە ئێسقانەکانم خۆشحاڵ نابن.

لەبەرئەوەی"هورم هب"بەقسەکانی ئازارێکی زۆری دام و منی ترساندبوو، منیش ویستم هەمان ڕەفتار لەبەرامبەریدا بکەم، بۆیە وتم:

بەڵام ئەگەر من کوژرام سڵاوی من بەشازادە خانم"باکتاتون"ی خوشکی فیرعەون بگەیەنە، چونکە ئەو کەسێکی جوان و خۆشویستراوە، بەڵام کەمێك خۆ بەزلزانە و ئەو ڕۆژەی دایکی مرد بەسەر لاشەی مردوی دایکیەوە لەبارەی تۆوە قسەی لەگەڵدا کردم.

دوای ئەم قسەیەم-کە دەمزانی کارێکی زۆر لە"هورم هب" دەکات، چونکە ئاگاداری ئەوە بووم ئەو"باکتاتون"ی خۆشدەوێت- "هۆرم هب"م بەجێ هێشت و بەرەو نوسینگەی فەرمانڕەوایی "ممفیس" ڕۆشتم، بۆئەوەی مەرگنامەی"وەسیەت نامە"خۆم بنوسم و لەوێدا وەك ئەمانەتێك دایبنێم.

لەو مەرگنامەیەدا نوسیبوم ئەگەر لەسوریادا بەکوشت درام، دوای دڵنیابون لەکوشتنم، سامانەکەم بەسەر"کاپتا"ی نۆکەری پێشوم و"مریت" و هاوڕێی کۆنم "هورم هب"دا دابەش بکرێت، ئەوکات وەك ئەو کەسەی جگە لە ڕۆشتن بەرەو مەرگ هیچ کارێکی تری بەدەستەوە نیە، سواری کەشتی بوم و ڕێگای میسری خواروم گرتە بەر و لەنزیك بیابانی"سینا"دا لەکەشتی دابەزیم و بەکەژاوەکەی خۆم ڕێگای بیابانی"سینا"م گرتە بەر.

لەوێ لەژێر خۆری سوتێنەردا سەربازەکانی"هورم هب"م لەناو قەڵایەکدا بینی و بینیم زۆربەی کاتی خۆیان بە خواردنەوەی ئاوجۆ و ڕاوکردنی گیانەوەری بیابان، بەتایبەت بەڕاوکردنی ئاسك تێدەپەڕێنن و ناڕەزایی خۆیان لەبەرامبەر ئەم ژیانە دژوارە و کۆمەڵێك ژندا دەردەبڕن کە لەو جۆرە ژنە سوکانەی خۆیان هەڕاج فرۆش دەکەن و ڕۆژ و شەو خۆیان پیشانی سەربازەکان دەدەن.

لەوێ ئاگاداری ئەوە بووم کە تەواوی سەربازەکان ئارەزوی ئەوە دەکەن"هورم هب"بیانێرێت بۆ سوریا، بۆئەوەی بڕۆن لەوێ خۆیان بەجەنگەوە سەرقاڵ بکەن و هۆکاری ئەمەشتان پێ دەڵێم بۆئەوەی لەمەبەستم تێبگەن. کاتێك پاسەوانەکانم خۆیان ئامادە ڕۆشتن کرد، ئاگاداری ئەوە بووم ڕێکخستنێکی سەربازی سەختگیر دەستی بەسەر ئەو قەڵایەدا کێشاوە و تەنها ئەو سەربازانە دەتوانن بڕۆن بۆ ڕاو و لەگەڵ ژنەکاندا ڕابوێرن کە لەحاڵی ئێشکگری و پاسەوانیدا نەبن، هەموو سەربازێکیش تا ئەوکاتەی لەحاڵی ئیشکگریدا بێت هەموو کاتێکی بە مەشقی سەربازی و بێگاریەکانی ناو قەڵا و مەشق لەسەر چەکەکان تێدەپەڕێنێت.

ئەم بابەتەش منی لەبابەتێك ئاگادار كردەوە كە پەیوەستە بە هونەری فەرماندەیی سەربازانەوە، ئەوەیش ئەوەیە ئاگاداری ئەوە بووم كە فەرماندەیەكی شایستەی جەنگ، بریتیە لەو فەرماندەیەی كە نەهێڵێت سەربازەكانی یەك ترازوو"مەبەست كاتژمێرێك" بێكار دانیشن و بەردەوام هانی ئەوەیان بدات خۆیان سەرقاڵی مەشقی سەربازی و مەشق لەسەر چەكەكان و بێگاریەكان بكەن و بەشێوەیەك سیستەمی سەربازیان بەسەردا بسەپێنن، كە سەربازەكان شەو و ڕۆژ ناچار بن پەیڕەوی لەیاسا تایبەتەكان بكەن.

بەدڵنیاییەوە ئەم سەربازانە بەهۆی مەشقی بەردەوام و بەردەوام كاركردنەوە كەسێكی لێهاتوو بەهێزیان لێدەردەچێت‌و چیتر هەست بەماندویەتی ناكەن، كاتێكیش ئاگاداری ئەوە دەبن كە جەنگ دەستی پێكردووە و دەبێت خۆیان بۆ گۆڕەپانی جەنگ ئامادە بكەن، بەڕادەیەك بەبیستنی ئەم هەواڵە خۆشحاڵ دەبن كە وەك بڵێی بەئەندازەی قوچەكیەك زێڕو تەواوی ژنە جوانەكانی جیهانت پیٚ بەخشیون.

هۆكاری ئەوەی ئەم جۆرە سەربازانە بەبیستنی هەواڵی جەنگ و ڕۆشتن بۆ گۆڕەپانی شەڕ خۆشحاڵ دەبن ئەوەیە كە دەزانن ڕۆشتن بۆ گۆڕەپانی جەنگ، ئەوان لەپابەندبونە سەربازیەكان و كاری بەردەوامی ناو سەربازخانە ڕزگار دەكات، وەك ئەوەی مۆڵەتێكی درێژخایەنت پێدابن، بۆئەوەی بڕۆن بۆ هەر شوێنێك كە خۆیان بیانەوێت، بگرە ئەگەر بیشزانن لەگۆڕەپانی جەنگدا دەكوژرێن، ئەوا سەرەڕای ئەوەش بەبیستنی هەواڵی جەنگ، تەنها بەبۆنەی ئەوەی كە ئەوان لە یاسای سەربازی و كاری بەردەوامی سەربازخانە ڕزگار دەكات، هەست بەخۆشحاڵیەكی زۆر دەكەن. هەرلەبەرئەوەش"هورم هب"زۆر جەخت لەسەر ئەوە دەكات كە سەربازەكانی بێكار نەبن، بگرە ئەگەر لەبیابانی"سینا"شدا نیشتەجیٚ بن.

بەندە بەپێی فەرمانەكانی"هورم هب"سەربازەكانی لەشوێنی چونە ناو بیبانی "سینا"وە دە گالیسكەی جەنگیان بۆ ئامادە كردم كە هەر گالیسكەیەك بەدوو ئەسپەوە بەسترابویەوە و گالیسكەیەكی یەك ئەسپیش كەلوپەل و خوراكی لیٚ نرابوو و لەهەر گالیسكەیەكدا بیٚ لە لێخوڕەكەی، دوو كەسی تر سواری بوبو، كە یەكێكیان نێزەدار و ئەویتریان قەڵغان بدەست بوو.

فەرماندەی ئەم دە گالیسكە جەنگیە، هات بۆ لام و بینیم كە تەنها پارچەیەكی لەكەمەریەوە پێچاوە و جگە لەو پارچەیە هیچ جلێكی تری لەبەردا نیە، دوای ئەوەی لێم نزیك بویەوە هەردوو دەستی خستە سەر ئەژنۆی و سوژدەیەكی بۆ بردم.

لێم پرسی ناوی چیە بیستم کە بە"ژو –ژو" بانگی دەکەن و وتی: "سینۆهە"ئەگەر تۆ دەتەوێت دوای ئەوەی ڕووبەڕووی سەربازەکانی"ئازیرو"بویتەوە، هیچ ئازار و زیانێکت پێ نەگەیەنن، بەستەیەك لقی درەختی خورما لەگەڵ خۆتدا ببە بۆئەوەی کاتێك چاوت بەسەربازەکانی "ئازیرو"کەوت بەرزیان بکەیتەوە و بەلاسەرتەوە ڕایان وەشێنیت، چونکە لقی خورما نیشانەی ئاشتیە، کاتێکیش ئەوان بینیان تۆ لقە خورمایەك بەلاسەرتەوە ڕادەوەشێنیت، تێدەگەن کە ناتەوێت شەڕیان لەگەڵدا بکەیت.

بۆیە بەسەربازەکانی"ژو–ژو"م وت: بڕێك لقە خورما کە لەچواردەوری قەڵای سەربازخانەکەدا بوو، ببڕن و بیخەنە ناو کەژاوەکەی منەوە و دوای ئەوە بەڕێ بکەوین.

کاتێك"ژو ژو"ئاگاداری ئەوە بوو کەدەمەوێت بەکەژاوەکەم دەست بەم گەشتەم بکەم دای لە"قاقا"ی پێکەنین و وتی: "سینۆهە"ئەو شوێنەی ئێمە بۆی دەڕۆین بیابانی"سینا"یە و تاکە هەلی ڕزگاربونی ئێمە ئەوەیە بەهۆی ئەم گالیسکانەوە خێرا ئەم بیابانە ببڕین، بەڵام ئەگەر بەم کەژاوەیە کە زۆر خاو ڕێ دەکات دەست بەم کۆچەمان بکەین، هەموومان دەمرین.

چیتر لەسەر ڕێماندا هیچ کەرەستەو خواردنێك بەدی ناکرێت و ئەوەی پێویستمانە دەبێت لێرە لەگەڵ خۆماندا بیبەین، بۆ نمونە دەبێت ئالیکی ئەسپەکانیش لەگەڵ خۆماندا هەڵگرین: بۆیە من شلیفێك ئالیك دەخەمە ناو گالیسکەکەی تۆوە، بۆئەوەی لەسەری دانیشیت و بەهۆی ڕاوەشاندنی گالیسکەکەوە ئازاری زۆرت پێ نەدرێت.

وتم: من لەڕابردوودا سواری گالیسکە بووم، ئەویش جارێکیان بەگالیسکەی جەنگی ڕۆشتم بۆ وڵاتی"ئامورو"، بەڵام لەوکاتەدا لاو بوم و لەڕاوەشانی گالیسکەکە نەدەترسام، سەرەڕای ئەوەی لەمڕۆدا پێمناوەتە تەمەنی پیریەوە، دەتوانم بەرگەی ڕاوەشانی گالیسکەکان بگرم.

"ژو ژو"ئەو چڵە خورمایەی کە سەرتا لەکەژاوەکەمدا دانرابوو، لەوێوە گواستیەوە بۆ گالیسکەکەی خۆی، بەڵام ڕۆژی دوایی چلە خورماکەی گواستەوە بۆ ناو گالیسکەکەی من و منیش سواری گالیسکەکەم بوم و گالیسکەکانیش بەخێرایی بەسەر جادەیەکی باریکی بیابانی سینادا کەوتنە ڕێ.

*بەشی سی و نۆیەم*

## گرفتە ئازاربەخشەکانم

یەکەم ڕۆژ ئەو جادەیەی کە ئێمە پێیدا تێدەپەڕین، تاڕادەیەك تەخت و ڕێك بوو و ڕاوەشاندنی گالیسکەکە ئازاری پێ نەدەگەیاندم و منیش بەسەر شلیفێك ئالکەوە دانیشتبوم.

بەڵام ڕۆژی دووەم کۆتایی بەجادەی ڕێك و تەخت هات و ئێمە چوینە ناو بیابانێکی بێجادەوە و بەڕادەیەك تەکان و ڕاوەشاندنی گالیسکە ئازاری پێدەگەیاندم کە ناچار بوم هەستمە سەر پێ.

بەڵام نزیکی نیوەڕۆ بەهۆی ڕاوەشانێکی بەهێزەوە، هەردوو پێم لەگالیسکەکە جیابویەوە و هەڵدرامە دەرەوەی گالیسکەکەوە و کەوتمە سەر زەوی لماوی بیابانەوە و ڕوخسارم بەهۆی دڕك و داڵەوە بریندار بوو.

کاتێك شەو بۆ پشودانی ئەسپ و خۆمان ڕاوەستاین"ژو ژو"ڕوخساری خوێنینی منی بەئاو شۆرد و وتی: ئەگەر بەو خێراییە بەردەوام بین، لەوانەیە ڕۆژی چوارەم بگەینە ئوردوگای سەربازەکانی"ئازیرو".

ڕۆژی سێیەم لەشوێنێکەوە تێپەڕین کە زۆریش ناهموار نەبوو، بەڵام چاومان بەدیمەنێکی دڵتەزێن کەوت، چونکە لەوکاتەدا گەشتینە ئوردگای پارتیزانەکانەوە کە تەواوی پارتیزانەکانی ئەو ئوردوگایە بەدەستی سەربازەکانی"ئازیرو"وە کوژرابوون، بگرە بەوانیشەوە نەوەستابون، منداڵەکانیشیان کوشتبوو.

کاتێك ئێمە گەشتینە ئەوێ، سەدان باڵندەی گەورەی لاشە خۆر سەرقاڵی خواردنی مردووەکان بون و بارودۆخی لاشەکان ئەوەی نیشان دەدا کەزیادلەدوو ڕۆژ لەکوشتنی ئەوان تێنەپەڕیوە.

ئەم بابەتە ئەوەی بۆ ئاشکرا کردین کە سەربازەکانی"ئازیرو"زۆر لەئێمەوە دور نین، چونکە دوو ڕۆژ لەوەوپێش لێرەدا دەستیان بەم کوشت و کوشتارە ترسناکە کردووە.

شەوی چوارەم لەسەرتای شەودا، لەدورەوە مەشخەڵی ئاگرێك دەرکەوت و"ژو ژو"پێی وتم: ئەوە ئاگری ئوردوگای سەربازەکانی"ئازیرو"یە، چونکە لەوێدا هیچ لادێیەك نیە تا بڵێین سەربازەکانی"ئازیرو"ئاگریان تێ بەردابێ.

"ژو ژو"بەچاکی زانی کەمێك ڕاوەستین بۆئەوەی ئەسپەکان ئالیك بخۆن و ماندویەتیان دەربکەن، دوای ئەوەی لەژێر ڕوناکی مانگدا لەسەرخۆ کەوتینە ڕێ.

بەهۆی لەسەرخۆ ڕێکردنی گالیسکەکانەوە، من کە لەسەر شلیفە ئالیکەکەدا دانیشتبووم، خەوم لێکەوت و کاتێك بەئاگا هاتمەوە بینیم"ژو ژو" منی لەخەو هەڵ ئەستاند.

کاتێك چاوم کردەوە بینیم خۆر هەڵهاتووە و پێش ئەوەی لە"ژو ژو"بپرسم لەکوێم، ئەو من و جانتاکەم کە نوسراوی تەختە قوڕ و پارچە زێڕ تێدا بوو هەروەها چڵە خورماکەمی لەگالیسکەکەوە هەڵدایە خوار و من خۆم لەسەر لمی بیاباندا بینی و بینیم گالیسکەی"ژو ژو"و گالیسکەکانی تریش، پشتیان لەمن و ڕویان لەخۆرئاوا کردووە و بەپەلە لێم دور کەوتنەوە.

سەرم لەم ڕەفتارەی"ژو ژو" سوڕما، بەڵام دوای ساتێکی تر ئەو سەرسوڕمانەم نەما، چونکە بینیم لەبەشی خۆر هەڵاتەوە دەستەیەك گالیسکەی جەنگی بەخێرایی بەرەو ڕوم دێن، وەك ئەوەی بیانەوێت دوای گالیسکەکانی"ژو ژو" بکەون.

ئەوکات گوتەی"هورم هب"م هێنایەوە بیر خۆم کە دەیوت: کاتێك ئەو سەربازانەی پاسەوانی تۆ دەکەن چاویان بەسەربازانی"ئازیرو"کەوت هەڵدێن.

منیش کاتێك چاوم بەنزیك بونەوەی گالیسکەکان کەوت چڵە خورماکەم-وەك بڵێی وشك بوبێت- هەڵگرت و بەلاسەرمەوە دەستم کرد بەڕاوەشاندنی، بۆئەوەی سەربازەکانی"ئازیرۆ"بزانن من مەبەستی شەڕکردنم نیە، بەڵام ئەوان هیچ گوێیەکیان بەمن نەدا و دوای گالیسکەکانی"ژو ژو" کەوتن.

بەڵام"ژۆ ژۆ" و هاوڕێکانی بەشێوەیەك هەڵهاتن کە لەچاو ون بون، ئەوکات گالیسکەکانی "ئازیرو" گەڕانەوە و لەنزیکمەوە ڕاوەستان و منیش لەوکاتەدا چڵە دارەکەم هەر بەلاسەرمەوە ڕادەوشاند.

چەند سەربازێك لەگالیسکەکانیان پیادەبون و بەرەو ڕوم هاتن و منیش لەوکاتەدا پێموتن ناوم"سینۆهە"یە و نازناوم"کوڕی کەر"ە و نوێنەری فیرعەونی میسرم و بەفەرمانی فیرعەون هاتوم چاوم بە"پادشا"کەی ئێوە بکەوێت و چەند نوسراوێکی تەختە قوڕ لەم جانتایە دایە کە دەیسەلمێنێ من نوێنەری فیرعەونی میسرم، بەڵام سەربازەکان هیچ گرنگیەکیان نە بەناوی من و نە بە نوسراوەکانی فیرعەون نەدا و ڕوتیان کردمەوە و هەموو زێڕ و کەرەستەکانی تریان لێسەندم، ئەوکات منیان بەپەتێك بەدوای یەکێك لەگالیسکەکانیانەوە بەستەوە و کەوتنە ڕێ.

ئەگەر ئوردوگاکەیان نزیك نەبوایە، ئەوا نەمدەتوانی بەخێرایی گالیسکە جەنگیەکان ڕابکەم، دوای یەك کاتژمێر لەپێ دەکەوتم و دەکەوتمە سەر زەوی و لەدوای گالیسکەکانەوە بەسەر زەویدا دەکێشرام و بەهۆی بەردی بیابانەوە جەستەم پارچە پارچە دەبوو، بەڵام ئەوەی بووە هۆی ئەوەی من بەزیندویی بمێنمەوە، ئەوەبوو کە زۆر زوو گەشتنە ئوردوگاکەیانەوە.

ئەوان ئوردوگایەکی مەزن و پڕ لەگالیسکەی جەنگی یان هەبوو، ئەو گالیسکانەی بە"گا" کان دەکێشران، کاتێك گەشتینە ئەوێ، من هێشتا بەپەتێك بە یەکێك لە گالیسکەکانەوە بەسترابومەوە، لەهۆش خۆم چوم و لەژێر تیشکی خۆردا کەوتمە سەر زەوی.

کاتێك هاتمەوە هۆش خۆم، هەستم بەوە کرد کە چەند کەسێك ئاوم بەسەردا دەڕێژن و جەستمەیان بەڕۆنی ڕوەکی چەور کرد و دەرکەوت کە یەکێك لەئەفسەرانی ئوردوگا خوێندەواری هەیە و نوسراوەکانی منی خوێندووەتەوە و تێگەشتووە لەوەی کە من نوێنەری فیرعەونم و فەرمانی دا بەڕێك و پێکی ڕەفتارم لەگەڵدا بکەن و جلەکانم پێ بدەنەوە.

هەرئەوکاتەی توانیم لەسەر پێی خۆم ڕاوەستم وتم: من ببەن بۆ لای"ئازیرو".

**"ئازیرو"لەچادرێکدا دەژیا و هەر ئەوەی نزیك بونەوەی منی بینی لەچادرەکەی هاتە دەرەوە و بینیم کە ملوانکەیەکی ئاڵتونی لەمل کردووە و ڕیشی لەناو کیسەیەکی تاڵ زیویدا داناوە.**

**"ئازیرو"لەچادرەکەیدا لەتەنیشت خۆیەوە داینیشاندم و وتی: "سینۆهە"بۆچی ئەوکاتەی چاوت بەسەربازەکانی من کەوت، خۆت پێ نەناساندن و نەتوت کە نێردراوی فیرعەونی، هەروەها بۆچی چڵە خورماکانت بەلاسەرتەوە ڕانەوەشاند، بۆئەوەی سەربازەکانم ئاگاداری ئەوە بن کە تۆ ناتەوێت لەگەڵیاندا بەشەڕ بێیت.**

**سەربازەکانم دەڵێن، هەرئەوکاتەی تۆ چاوت پێیان کەوتووە، بەچەقۆیەکەوە پەلامارت داون و هەوڵی کوشتنی ئەوانت داوە، سەربازەکانی منیش بۆ پاراستنی گیانیان ناچاربون تۆ ببەستنەوە.**

**دەستەکانم کە بەپەت بەسترابونەوە هێشتا ئازاری هەبوو و برینەکانی جەستەشم کە بەهۆی کێشانم بەسەر زەویدا دروست بوبون دەیکزاند، لەوکاتەدا بە"ئازیرو"م وت: تەماشام بکە و بزانە ئایا من پیاوێکم کە بتوانم هێرش بکەمە سەر سەربازەکانی تۆ، ئەویش ئەو سەربازانەی کە بەسەر گالیسکەی جەنگیەوە چەکداربون.**

**هەمویان درۆ دەکەن و بۆئەوەی نکوڵی لەتاوانەکانی خۆیان بکەن، منیان تاوانبار کردووە، هەروەها کاتێك من چاوم پێیان کەوت دەستم بەڕاوەشاندنی چڵە خورماکەم کرد و خۆمم پێناساندن و نوسراوەکانی فیرعەونم پێ نیشاندان، بەڵام ئەوان چڵە خورماکەیان شکاندم و تفیان کردە سەر نوسراوە تەختە قوڕەکانم و هەرچیم هەبوو لێیان سەندم، دوای ئەوەش منیان بەدوای گالیسکەیەکەوە بەستەوە، هەرلەبەرئەوەش تۆ دەبێت فەرمان بدەیت کە شەلاقکاری ئەو سەربازانە بکەن، بۆئەوەی لەمەو دوا ڕێز لەنێردراوەکانی فیرعەون بگرن.**

**"ئازیرو"وتی: "سینۆهە"لەوانەیە خەوت بینیبێت، یان بەبۆنەی ئەوەی لەکاتی ڕێکردنتدا کەوتبیت و دەست و پێت بریندار و ڕوشابێت ئەم جۆرە قسانەم لەگەڵدا دەکەیت، لەبەرئەوەی من حەزناکەم سەربازەکانی خۆم لەپێناو پیاوێکی میسریدا شەلاقکاری بکەم، ئەوەی تۆ باسی دەکەیت، لەگوێی مندا وەك وزە وزی مێش وایە.**

**وتم: "ئازیرو"تۆ تا دوێنێ پادشای وڵاتی"ئامورو"بوی و ئەمڕۆش پادشای سەرتاسەری سوریایت، هەروەها فەرمانڕەوایی چەند پادشایەك دەکەیت، بۆیە**

پادشای پادشاکانی، لەکاتێکدا تۆ دەبێت لەهەموو کەسێك زیاتر ڕێز لەفەرمانڕەواکان بگریت و یەکێك لەپێویستیەکانی ڕێزگرتنی فەرمانڕەوایان ئەوەیە ڕێز لەنوێنەرەکانی بگریت.

سوکایەتی کردنی نوێنەرێکی پادشا، وەك ئەوە وایە کە سوکایەتیت بەخودی پادشا کردبێت، چونکە پێویست بەوە ناکات پێت بڵێم کە ئەمڕۆ من لەئۆردوگاکەی تۆدا هیچ دەستەڵاتێکم نیە و تۆ دەتوانیت بەکوشتم بدەیت، بەڵام ئەگەر ئەمکارە لەگەڵ مندا بکەیت وەك ئەوە وایە سوکایەتیت بە فیرعەون کردبێت، ئەگەر سوکایەتیش بە فیرعەون بکەیت، بەدڵنیاییەوە یەکەم جار سوکایەتیت بەخۆت کردووە، چونکە گەر پادشایەك سوکایەتی بەپادشاکانی تر بکات، ئەوا سوکایەتی بەخودی فەرمانڕەوا کردووە ئیتر چ فەرمانڕەواییەك بێت، تۆش کە دەتەوێت فەرمانڕەوایی سەرتاسەری سوریا بکەیت، دەبێت ئەگاداری ئەم ڕاستیانە بیت.

کاتێك منیان بەپەتێکەوە بەپشت گالیسکەیەکەوە بەستبوو و منیش ناچاربوم لەگەڵ ئەو گالیسکەدا ڕابکەم بۆئەوەی بەدوای گالیسکەکەوە بەسەر زەویدا پەلکێش نەکرێم، پیاوێکی ئەسپ سوار بەدوامەوە بوو بە نێزەکەی دەستی کۆممی بەنەقیزە کون کون کرد. تۆش ئەگەر ناتەوێت تەمێی سەربازەکانت بکەیت، هیچ نەبێ ئەم سەربازەیان بەسزای ئەوەی سوکایەتی پێکردوم و برینداری کردوم، بەقامچی لێی بدەن، هەروەها ئەوەش بزانە کە من دیاریەکی مەزنم لەلایەن فیرعەونەوە بۆ هێناویت، ئەو دیاریەش بریتیە لە ئاشتی چونکە فیرعەون حەز دەکات لەگەڵ تۆدا ئاشتی بەرپا بکات.

"ئازیرو"وتی: ئاشتی فیرعەون بەلای منەوە هیچ بەهایەکی نیە–لەکاتێکدا من دەمزانی کە ئەو لەناخەوە ئەم پێشنیاری ئاشتیەی پێ خۆش بوو– چونکە ناخود ئاگا من ئەوم بۆئەوە هانداوە کەلەبەرامبەرمدا کڕنوش بەرێت و داوای ئاشتیم لێ بکات، بەڵام دەربارەی ئەو پیاوەی بەنێزەکەی دەستی کۆمتی کون کون کردووە، من لایەنگری تۆ دەکەم و ئەو نەدەبوو بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ نوێنەری پادشایەکی وەك تۆ کە هاوڕێی منیشی بکات، هەر لەبەرئەوەش هەرئێستا بەسزای خۆی دەگەیەنم.

هەمان ئەو ڕۆژە"ئازیرو"فەرمانی دا سەربازەکانی کۆ ببنەوە و بەئامادەبونی هەمویان بەقامچی دەستی کرد بەلێدانی ئەو پیاوە، من وام دەزانی سەربازەکانی "ئازیرو"بە بینینی لێدانی هاوڕێکەیان خەمبار دەبن، بەڵام ئەوان زۆر خۆشیان بەو دیمەنە دەهات و بەردەوام پێدەکەنین، چونکە سەربازە نەخوێندەوار و سادەکانی سەرتاسەری جیهان لەیەك دەچن، لەبەرئەوەی لەژیانی نەگۆڕیاندا هیچ خۆشی و ڕابواردنێکی تێدا بەدی ناکرێت، هەموو شتێك بەخۆشی و خۆشگوزەرانی لێکدەدەنەوە، بگرە ئەگەر بەبەرچاویانەوە دارکاری هاوڕێیەکیشیان بکەن.

کاتێك بینیم خوێن لەجەستەی ئەو پاوەوە دەچۆڕێت و قامچیەکە گۆشتی جەستەی لەت لەت کردووە، دەستم بەرز کردەوە و داوام لە"ئازیرو"کرد کە کۆتایی بەتەمێکردنی ئەو پیاوە بهێنێت.

دوای ئەوە ئەوم بردە ناو ئەو چادرەی کە"ئازیرو"تایبەتی کردبوو بەحەوانەوەی من و کاتێك سەربازەکان بینیان من ئەو پیاوە دەبەمە چادرەکەی خۆمەوە، وایان دەزانی من بۆئەوەی ئازاری بدەم بردومەتە ناو چادرەکەی خۆمەوە، بۆیە بەو ڕەفتارەم زۆر خۆشحاڵ بون، بەڵام من برینەکانی ئەو پیاوەم تیمار کرد و پێچام و دەرمانی هێورکەرەوە و دواتر ئاوجۆم پێدا بۆئەوەی بیخواتەوە، ئەو پیاوەش گەشتە ئەو باوەڕەی کەمن شێتم.

شەو"ئازیرو"بانگی کردم بۆئەوەی پێکەوە نان بخۆین و منیش خۆم کرد بە چادرەکەی ئەودا و دوای ئەوە خواردنیان بۆ هێناین. بینیم بێ لە ئەفسەرانی لەشکری"ئازیرو"کۆمەڵێك ئەفسەری "هاتی"یش لەوێدا ئامادە بون و هێمای ئەفسەرانی"هاتی"ئەوە بوو کە لەسەر سینەیان وێنەی دوو تەوری یەکتربڕ و خۆرێك بەلاسەری هەردوو تەورەکەوە، لەشێوەی خۆرێکی باڵداردا وێنەی کێشابوو.

خواردنی ئەو ئێوارەیە بریتی بوو لەمەڕی سورکراوە و نانێك کە لەناو ڕۆندا برژاندبویان. هەموویان بەسۆزەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردم، چونکە من ڕۆشتبوم لەلایەن فیرعەونەوە ئاشتیان پێشکەش بکەم، لەکاتێك خودی ئەوان خوازیاری ئاشتی بون، ئەگەر فیرعەون چەند مانگێکی تر دانی بەخۆیدا بگرتایە"ئازیرو"ناچار دەبوو بۆ بەرپا کردنی ئاشتی دەستپێشخەری بکات.

دوای خواردنی نانی ئێوارە، بینیم کەئەفسەرانی"هاتی"زیادەڕەوی لەخواردنەوەی مەیدا دەکەن، بۆیە پێشبینی ئەوەم کرد لەوانەیە کارەساتێکی خراپ ڕووبدات.

هەرواش بوو، ئەفسەرانی"هاتی"دوای ئەوەی مەست بون، لەگەڵ ئەفسەرانی وڵاتی"ئامورو" بەشەڕ هاتن، هەر بەوبۆنەیەوە ئەفسەرێکی"هاتی"چەقۆکەی خۆی دەرهێنا و ملی یەکێك لەئەفسەرانی"ئامورو"یی پێ بریندار کرد.

من پشکنینم بۆ پیاوی بریندار کرد و بینم کە دەتوانم چارەسەری بکەم و برینەکەیم بۆ پێچا و خەواندم، بەڵام ئەو پیاوە لەنیوە شەودا سەربازە خزمەتکارەکانی خۆی کۆکردەوە و وتی: بڕۆن و تۆڵەی من لە ئەفسەرانی هاتی کە منیان بریندار کردووە بکەنەوە، ئەوانیش دوای قسەکەی ڕۆشتن و ئەو ئەفسەرەیان کوشت.

ڕۆژی دوایی دوای ئەوەی"ئازیرو"ئاگاداری ئەو ڕوداوە بوو، پیاوی برینداری سەرەوخوار هەڵواسی و تائەوکاتەی گیانی لەدەستدا، چونکە نەك تەنها"ئازیرو" لەئەفسەرەکانی"هاتی" دەترسا و بەم سزایەی ویستی ئەوان ڕازی بکات، بەڵکو زۆریش خوازیاری ئەوە بوو لەناو لەشکرەکەی خۆیدا پارێزگاری لەسیستەم و یاسا سەربازیەکان بکات.

بەڵام لەو شەوەدا یەکێك لەئەفسەرەکانی"هاتی"یەکێك لەئەفسەرکانی"ئامورو"ی بریندار کردبوو، دوای کۆتایی هێنانی ئەو کێشەیە و بڵاوەکردنی سەرباز و ئەفسەرەکان و چۆڵبونی ناو چادرەکە"ئازیرو"کوڕەکەی خۆیی پێنیشان دام.

من دەمزانی کە ئەو کوڕە لەسکی کەنیزەکی پێشوی من کە پێشتر وتم پێشکەشی پادشای"ئامورو"م کردبوو لەدایك بووە، بەڵام سەرەڕای ئەوەی ئەو کوڕە تەمەنی لەحەوت ساڵ زیاتر نەبوو، لەگەڵ باوکیدا دەڕۆشت بۆ بەرەی جەنگەکان.

گۆنای کوڕەکەی"ئازیرو"سور و وەك قۆخ خاوەنی مویەکی نەرم بوو، هەروەها قژێکی ڕەش و لولی وەك ڕیشی باوکی هەبوو، کاتێکیش تەماشای پێستی سینەیم دەکرد، لەبەرخۆمەوە دەموت کە ڕوخساری سپی لەدایکیەوە بۆماوەتەوە.

"ئازیرو"لەهەمان ئەوکاتەی کوڕەکەی پێنیشان دەدام وتی: "سینۆهە"ئایا تۆ تا ئەمڕۆ کوڕێکی حەوت ساڵەت بینیووە کە لەکوڕەکەی من جوانتر و بەهێزتر بێت.

کوڕەکەم لەئێستادا خاوەنی چەند وڵاتێکە و لەدوای منیش لەوانەیە ببێتە پادشای سوریا و چەند وڵاتێکی تر و منیش کارێك دەکەم دوای من هیچ کەسێك نەتوانێت

دژایەتی فەرمانڕەوای و فەرمانەکانی ئەو بکات، چونکە لەناو خودی سوریادا تەواوی سەرۆك خێڵ و ئەو فەرمانڕەوایانەی کە لەوانەیە لەئایندەدا دژایەتی کوڕەکەم بکەن، لەناو بردووە یان لەناویان دەبەم.

کوڕی من دەتوانێت بخوێنێتەوە و بنوسێت و شمشێر بوەشێنێت و چەند ڕۆژێك لەوەوپێش ئەو نۆکەرەی کە بێڕێزی لەبەرامبەردا نواندبوو بەشمشێرەکەی خۆی کوشتی، من ئەو لەگەڵ خۆمدا دەبەم بۆ هەموو جەنگێك، بەڵام کاتێك ئەو لەشەڕەکاندا بەشداری پێدەکەم کە ئێمە دەست بەتاڵانی و وێرانکردنی ئاواییەکانی دوژمن دەکەین و دەزانم کە لەوجۆرە شەڕانەدا هیچ کەسێك بەرگری لەخۆی نیشان نادات و هەوڵی کوشتنی کوڕەکەم نادەن.

دوای ئەوە"ئازیرو"باسی کەنیزەی پێشوی خۆمی بۆکردم کە من لەڕابردوودا پێشکەشم کردبوو و لەئێستادا ژنی ئەوە و ناوی"کفتیو"یە و وتی: ئێستا ئەو لە "ئامورو"دا دەژیت و منیش زۆر بێتاقەتی دوری ئەوم، چونکە پێویستم بەوەیە لەگەڵیدا ڕابوێرم.

سەرەڕای ئەوەی من لەگەڵ ئەو کچە سوریانەی کە بەدیل دەگیرێن، ڕادەبوێرم، بەڵام ڕابواردن لەگەڵ "کفتیو"دا چێژێکی تری هەیە و من وەك"کفتیو"چێژ لەڕابواردنی هیچ ژنێك وەرناگرم و ئەو لەئێستادا ئەوەندە جوان بووە، ئەگەر چاوت پێی بکەوێت نایناسیتەوە.

کاتێك سەرقاڵی گفتوگۆ بوین، لەدورەوە دەنگی هاواری ژنەکان دەبیسترا و "ئازیرو"وتی: ئەوە دەنگی ئەو ژنانەیە کە لە لایەنە ئەفسەرانی"هاتی"ەوە بەدرەفتاریان لەگەڵدا دەکرێت، چونکە کاتێك"هاتی"یەکان لەگەڵ ژنە بەدیل گیراوەکاندا ڕادەبوێرن، ناتوانن وەك پیاوێکی ئاسایی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، بۆیە ئازار بەژنەکان دەگەیەنن، هەندێجاریش بریندداریشیان دەکەن، منیش ناتوانم ڕێیان لێبگرم، چونکە هێشتا پێویستم بە"هاتی"یەکانە، بەڵام دەترسم ئەفسەر و سەربازەکانم فێری نەریتە دڕندەییەکانی"هاتی"بن.

منیش ئەم هەلەم قۆستەوە و وتم: "ئازیرو"دۆستایەتی و یەکێتی لەگەڵ"هاتی" لەئایندەدا بەزیانی تۆ کۆتایی دێت و دواجار"هاتی"ئەو وڵاتانەی تۆ دەستت بەسەردا

گرتون، لیّ زەوت دەکات، بۆیە باشتروایە"هاتی"یەکان پشتگویّ بخەیت و لەگەلّ میسردا یەك بگریت.

ئیّستا"هاتی"لەولاّتی"میتانی"دا سەرقالّی شەڕە و"بابل"یش هیّزی سەربازی خۆی ئامادە دەکات، چونکە دەزانیّت کە لەکۆتاییدا لەگەلّ"هاتی"یدا هەر بەشەڕ دیّتو تۆش لەگەلّ"هاتی"دا یەکت گرتووە، چیتر دوای ئەوە ناتوانیت گەنم لە "بابل"یەکان وەرگریت و لەئایندەشدا برسیەتی و وشکەسالّی، وەك گورگیّکی برسی لەو ولاّتانەی کە دەستت بەسەردا گرتون سەرهەلّدەدات، بەلاّم ئەگەر لەگەلّ میسردا یەك بگریت، هەرچەنیّك گەنمت بویّت دەتوانیت لەفیرعەونی وەرگریت.

"ئازیرو" لەوەلاّمدا وتی: "هاتی"یەکان خەلّکانیّکن کە بۆ دوژمنەکانیان هەڕەشەئامیّزن، بەلاّم بۆ هاوڕیّکانیان زۆر بەسودن، ئەگەر کەسیّك ببیّتە دۆستیان، زیانیان لیّ نابینیّت.

ئیّستا من و ئەوان دۆست و هاوڕیّی یەکترین، بەلاّم لەنیّوان ئیّمەدا، هیچ پەیمانیّك بونی نیە کە من نەتوانم لەگەلّ کەسانی تردا ئاشتی بکەم یان ببمە دۆستیان، پادشای "هاتی"هەندیّکات دیاریم بۆ دەنیّریّت، بەتایبەت ئەو چەکانەی کە بۆم دەنیّریّت زۆر سەرنج ڕاکیّشن، چونکە ئەم چەکانە لەکانزایەك دروست کراون کە زۆر لەمس و مەفرەغ تیژترە.

من نکولّی لەوەدا ناکەم کە زۆر نیگەرانی شیّوازی ڕەفتاری"هاتی"یەکانم و لیّشیان ڕازی نیم، چونکە ئەوان لە هەندیّك لە لەنگەرگاکانی سوریادا کە لەئیّستادا یەکیّکە لەو ناوچە و ولاّتانەی کە لەژیّردەستەلاّتی مندایە، بەشیّوەیەك ڕەفتاری تیّدا دەکەن کە وەك بلّیّی ئەو لەنگەرگایانە هی ئەوان بیّت.

وتم: "ئازیرو"ئەوان کە لەئیّستادا لەگەلّ تۆدا دۆستن، ئەم لەنگەرگایانە بەهی خۆیان دەزانن، چ بگات بەو ڕۆژەی دەبنە دوژمنت.

"ئازیرو"وتی: ئەو ڕۆژەی دەبنە دوژمنم، تەختی زەویان دەکەم.

وتم: "ئازیرو"تۆ دەزانی لەڕیشە هەلّکیّشانی"هاتی" لەلایەن تۆوە، ئەگەر مەحالّ نەبیّت، ئەوا زۆر دژوار و گرفت ئامیّزە، چونکە خەلّکی"هاتی"لەناوچەیەکی بەرفراوانی کویّستانی دور لەسوریا دەژین و تۆ بۆئەوەی"هاتی"ەکان ڕیشەکیّش بکەیت، دەبیّت لەشکرەکەی خۆت لەسوریاوە ببەیت بۆ ولاّتەکەی ئەوان، ئەوانیش

لەڕێگا کوێستانیە سەختەکاندا لەشکرەکەی تۆ لەناو دەبەن، من دەزانم کە "هاتی"جۆرێك کانزای هەیە کە ناوی"ئاسن"ە و ئەو شمشێرانەش کەبەم کانزایە دروست دەکرێن، شمشێرە مسیەکان بەیەك لێدان دەکەن بەدوو کەرتەوە و تیرە ئاسنینەکانیان بەڕادەیەك تیژە، کە کاتێك دەیهاوێژن ئەگەر بەر جەستەی هەرکەسێك بکەوێت و بچەقێتە ناو سینەی هەر کەسێکەوە ئەوا لەپشتیەوە دەردەچێت.

زاڵ بون بەسەر نەتەوەیەکی ئاوادا، کە دەکەونە ناوچەیەکی کوێستانی سەختی ئەوا فراوانەوە کە بەوڵاتی ئەوان لەقەڵەم دەدرێت بەلایەنی کەم شتێکی مەحاڵە، چونکە ئەگەر تۆ ئەوەندە بەهێز بیت کە بتوانی تەنگیان پێ هەڵچنیت، پایتەختی خۆیان بەجێ دەهێڵن و دەڕۆن بۆ ناوچەیەکی تر و ساڵها تۆ سەرگەردانی دۆڵ و ڕێگا کوێستانیەکان دەکەن، ئەویش بەمەرجێك بتوانی بەرگەی سەرمای بەهێزی زستانی وڵاتی"هاتی"بگریت، چونکە لەوەرزی زستاندا ئاو و هەوا لەناوچە کوێستانیەکانی "هاتی"دا ئەوەندە سارد دەکات کە بەسەر کێوەکانەوە ناتوانیت ئاگر داگیرسێنیت، بۆیە هەر لەوسەرمایەدا سەربازەکانت دەمرن.

لەبەرئەوە"ئازیرو"تۆ دەبێت کارێك بکەیت، بۆ ئەوەی ئەگەر ڕۆژێك "هاتی"هێرشی بۆ کردیت، کەرەستەیەکت بەدەستەوە بێت، ئەو تاکە کەرەستەیەش واتای یەکگرتنی تۆ دەگەیەنێت لەگەڵ فیرعەوندا.

تۆ بەتەنهایی ناتوانیت لەبەرامبەر"هاتی"ەکاندا بەرگری لەوڵاتی خۆت بکەیت، بەڵام ئەگەر لەگەڵ فیرعەوندا یەك بگریت، فیرعەونی میسر ئەوەند سەربازت بۆ دەنێرێت کە بتوانی پاشەکشە بە"هاتی"یەکان بکەیت.

"ئازیرو"کە بەوردیەکی زۆرەوە گوێ لەقسەکانم دەگرت، نەیدەویست دان بەوەدا بنێت کە لە"هاتی"یەکان دەترسێت و وتی: من خوازیاری ئاشتیم و ئاشتی لەجەنگ بەباشتر دەزانم، لەبەرئەوەش دەجەنگێم بۆئەوەی ئاشتیەکی شەرافەتمەندانە بەدەست بهێنم، ئەگەر فیرعەون ناوچەی"غەزە"کە بەفێڵ لەمنی داگیرکردووە، بۆم بگەڕێنێتەوە و بەناردنی گەنم و ڕۆنی ڕوەکی و زێر قەرەبوی زیانەکانی سوریا بداتەوە–چونکە زیانەکانی ئەم جەنگە خودی فیرعەون هێناویەتە بون* – ئەوا لەگەڵ ئەودا ئاشت دەبمەوە.

کاتێك بینیم"ئازیرو"بەدەم پێکەنینەوە باسی زیانەکانی جەنگ دەکات، زانیم کە دەتوانم گاڵتەی لەگەڵدا بکەم، بۆیە پێم وت:

"ئازیرو"ئەی پیاوی"چەتە" و ئەی جەلادی کەسانی بێدەرەتان، تۆ بەچ شێوەیەك دەتوانی باسی قەرەبوی زیانەکان بکەیت، لەکاتێکدا کە تۆ بویت لەسوریادا هێرشت کردە بنکە سەربازیەکانی میسر و ژن و پیاو و منداڵەکانت کوشت و ژنەکانیت بەدیل گرت و ئێستاش هەمان ئەو ژنانەت داوەتە دەستی ئەفسەرانی"هاتی"ەوە و ئەوانیش ئەو ژنە بەدبەختانە دەخنە ژێر ئەشکەنجە و ئازارەکانیانەوە.

تۆ لەوڕووەوە باسی قەرەبوی زیانەکان دەکەیت کە وا دەزانی میسر لاوازە، لەکاتێکدا ئێستا لەسەرتاسەری میسری خواروودا، پیشەگەران سەرقاڵی دروستکردنی شمشێر و چەقۆ و نێزە و تیر و گالیسکەی جەنگین و"هورم هب" کە تۆ باش ئەو دەناسی یان هیچ نەبێت ناویت بیستووە، بێ هیچ سەختگیریەك زێر دەدات بەسەربازەکانی خۆی و ئەو ڕۆژەی ویستم بێم بۆ لای تۆ و داوای ئاشتیت لێ بکەم، بەشێوەیەك ڕوخساری گۆڕا کە من لەو کاتەدا لەدڵی خۆمدا وتم ئێستا دەمکوژێت.

بەڵام فیرعەون پەیڕەوی لەخودای خۆی"ئاتون"دەکات، خوازیاری ئاشتیە و ڕقی لەخوێنڕێژیە، هەر لەبەرئەوەش پێی وتم: بێم بۆ لای تۆ و پێشنیاری ئاشتیت لێ بکەم.

بەڵام لەبارەی"غەزە"وە تۆ دەزانی کە ئەمڕۆ فیرعەون هیچ جۆرە دەستەڵاتێکی لەو ناوچەیەدا نیە، تا بتوانێت بۆتی بگەڕێنێتەوە، بەڵام تۆ دەتوانی چەتەکانی "غەزە"بەتواناکانی خۆت لەناو ببەیت و بیخەتە ژێر ڕکێفی خۆتەوە و خۆشت باش دەزانی ئەو چەتانە کەسانێکن کە بەهۆی ستەم و بێبەزەیی تۆوە لەسوریا هەڵهاتون.

تەنها داوایەك کە فیرعەون بۆ ئاشتی لەتۆی دەکات ئەوەیە کە دیلە میسریەکان ئازاد بکەیت و قەرەبوی زیانی بارەگا سەربازیەکان بکەیتەوە.

"ئازیرو"وەك سەوداگەرێکی پارەپیس و تەماعی سریانی کە لەکاتی مامەڵەکردندا جلەکانی بەری دەدڕێت، یەخەی خۆی دڕی و بەدەم هاوارەوە وتی:

"سینۆهە"مەگەر سەگی هار قەپی لێگرتویت کە ئەم جۆرە قسانە لەگەڵ مندا دەکەیت؟"غەزە"خاکی سوریایە و دەبێت بگەڕێتەوە بۆ سوریا، بەڵام لەگەڵ دیلە میسریەکاندا کە لەئێستادا بەدیل گیراون بەپێی نەریتە باوەکان مامەڵەیان لەگەڵدا

دەکرێت و ئێمە دەیانفرۆشین و ئەگەر فیرعەونیش خوازیاری دیلەکانی خۆیەتی بۆ کڕینیان ئاڵتونی هەیە، دەتوانێت لێم بکڕێت، بەڵام دەربارەی زیانی بازرگانە میسریەکان تۆ قسەیەك دەکەیت کە تەنها کەسێك کە سەگێکی هار قەپی لێگرتبێت قسەی وا دەکات.

ئەو بازرگانانەی تۆ باسیان دەکەیت زیانیان پێگەیەنراوە، لەکوێ بون بۆئەوەی زیانمەند بن؟ ئەگەر ئەوانە لەمیسردا بون و ئێمە هاتوینەتە ناو میسرەوە و بەهۆی هاتنی ئێمەوە زیانیان بینیبێت، تۆ مافی خۆت بوو بڵێیت ئێمە دەبێت قەرەبوی زیانەکانیان بکەینەوە.

بەڵام ئەم بازرگانە میسریانە کە دەبێت لەوڵاتی خۆیاندا بازرگانی و قازانج بکەن، هاتون و وڵاتی ئێمەیان کردووە بەماڵی خۆیان و لەباشترین ماڵەکانی ئێمەدا نیشتەجێ بون و دەستیان بەسەر باشترین کێڵگەکانماندا گرتووە و کاڵا میسریەکانیان لەوڵاتی خۆیانەوە هێناوە بۆ ئێرە و بەچەند بەرامبەر بەخەڵکی سوریای دەفرۆشنەوە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئەمانە دەوڵەمەندتر دەبن و دانیشتوانی سوریاش هەژارتر، هەرلەبەرئەوەش ئەوەی خەڵکی لەدەستڕەنجی کارە ڕۆژانەکانیاندا بەدەستیان دەهێنا دەیاندا بەکاڵا میسریەکان کە جگە لە گەنم هیچ یەك لەو کاڵایانەی بۆ خەڵکی سوریا پێویست و بەسود نەبوو.

ئەم ڕەوشە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لەسوریادا بەردەوام بوو و کار گەشتە شوێنێك کە لەسەرتاسەری سوریادا ماڵێکی باش و کێڵگەیەکی باش و کارێزێکی باش نەبوو پەیوەست نەبێت بە بازرگانێکی میسریەوە، یان بەشی تێدا نەبێت، ئێستاش کەخەڵکی سوریا بەمافی ڕەوای خۆیان گەشتون، دەبێت بۆ قەرەبو کردنەوەی زیانی بازرگانەکانی زێڕوزیویان بدەینێ؟

ئاگاداری ئەوە بووم ئەگەر درێژە بەگفتوگۆی قەرەبوی زیانی بازرگانەکان بدەم، ئاوا ناتوانم درێژە بەگفتوگۆکانم بدەم[19].

بۆیە بابەتی گفتوگۆکەم گۆڕی و وتم: "ئازیرو"ئەگەر تۆ لەگەڵ میسردا ئاشت ببیتەوە، دەتوانی دیوار و حەسارگەلێکی بەرز بەچواردەوری شاردا دروست بکەیت و

---

[19] لێرەدا مەبەستی ئەوەیە ئەگەر درێژە بەم گفتوگۆیە بدەن دەیکوژن.

بازرگانی وڵاتەکەت، بەهۆی ئاڵوگۆڕکردنی بازرگانی لەگەڵ میسریەکاندا، دەوڵەمەند ببن، ئەگەر"هاتی"یش پەلامارت بدات، بەهاوکاری سەربازی و کانزا دەبیتە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی"هاتی"یەکان بتوانن دەستدرێژیت بکەنە سەر.

سەرەڕای ئەوەش، ئەوەی ڕویدا تێپەڕی و دەبێت لەمڕۆدا بڕیار بدەیت و هەڵوێستی لەبەرامبەردا وەرگریت و منیش لەوباوەڕەدام، ئەو ئاشتیەی ئەمڕۆ فیرعەون پێشنیاری تۆی کردووە، بۆ تۆ نەك تەنها ئاشتیەکی شەرافەت مەندانەیە، بەڵکو لەبەرژەوەندی تۆشدایە، چونکە فیرعەون داوای ئەو وڵاتانەی کە لەسوریادا دەستت بەسەرداگرتون لێناکاتو بەم ئاشتیەی فیرعەون، تۆ لەبەرامبەر "هاتی" یەکاندا بەهێزتر دەکات.

گفتوگۆی ئەو شەوە لەوشوێنەدا کۆتایی پێهات، بەڵام دوای چەند ڕۆژ و شەوێك، دوبارە لەبارەی ئاشتیەوە گفتوگۆم لەگەڵ"ئازیرو"دا کرد و ئەویش چەندجارێکی وەك سەوداگەرە سریانیەکانی یەخەی خۆی هەڵدەدڕی و بەدەم هاوارەوە دەیوت: فیرعەون دەیەوێت فریوم بدات و کوڕەکەم لەفەرمانڕەوایی سوریا بێبەش بکات.

جارێکیان وەك ناڕەزاییەك لەچادرەکەی ئەو چومە دەرەوە و وا خۆم نیشان دا کە مەبەستی گەڕانەوەم هەیە و هەواڵی ئەوەم بۆ نارد کە کەژاوەیەك و دەستەیەك سەرباز بۆ پاسەوانی کردنم لەگەڵدا بنێرێت، بۆئەوەی بگەڕێمەوە بۆ میسر.

"ئازیرو"منی بانگێشتی چادرەکەی خۆی کرد و دوبارە گفتوگۆکەمان دەستی پێکردەوە و من ئاگاداری ئەوە بووم کە تێپەڕبونی کات لەبەرژەوەندی فیرعەوندایە، چونکە بەتێپەڕبونی هەر ڕۆژێك لە ئۆردوگای"ئازیرو"دا ناکۆکیەکی زیاتر دەکەوتە نێوان ئەفسەرەکانی"هاتی"و ئەفسەرەکانی "ئامورو"ە و ئەفسەرانی"هاتی" ئەفسەرانی لەشکری"ئازیرو"یان وەك نۆکەری خۆیان تەماشا دەکردن و دەیانوت ئەگەر ئێمە نەبوینایە، ئێوە نەتاندەتوانی دەست بەسەر هەموو سوریادا بگرن، هەروەها دەیانوت، دەبێت سوریا بۆ ئێمە بێت، نەك بۆئێوە.

لەخودی سوریاشدا ناکۆکی کەوتە نێوان"ئازیرو"و فەرمانڕەواکانی تری سوریادا، پادشاکانی تری سوریا ئیرەییان بە توانا و دەستەڵاتی"ئازیرو"دەبرد و نەیاندەویست ببنە گوێڕایەڵی ئەو.

"ئازیرو" پێشنیاری ئەوەی لێکردم، لەبەرئەوەی بۆ گرێبەستی ئاشتی نێوان ئەو و فیرعەون جگە لە"غەزە" هیچ ناکۆکیەکی تریان لەنێواندا نیە و بارودۆخی ئەو ناوچەیەش وا دەخوازێت کە حەسار و دیواری چواردەوری شاری"غەزە"-کە ناوچەی غەزە بەناو ئەوشارەوە بانگ دەکرێت- بڕوخێنرێت.

دوای ئەوەش لەلایەن"ئازیرو"وە پادشایەك بۆ"غەزە"دەستنیشان بکرێت، بەڵام ئەم پادشایە بەپێی ئەو خواست و فەرمانەی کە فیرعەون دەستنیشانی دەکات لە"غەزە"دا فەرمانڕەوایی دەگرێتە دەست و کەشتیە میسریەکان بێئەوەی هیچ باجێك بدەن خۆیان دەکەن بەشاری"غەزە"دا و بازرگانە میسریەکانیش بەئازادی لەوێدا بازرگانی خۆیان دەکەن.

من تێگەشتم کە مەبەستی"ئازیرو"لەم پێشنیارەدا ئەوەیە کە بەفێڵ و دوڕویی "غەزە" لەدەستی میسر دەربکێشێت و کاتێکیش حەساری چواردەوری غەزەیان وێران کرد، چیتر دوای ڕوخانی ئەو حەسارە، لەڕوی ستراتیژی سەربازیەوە بەهای خۆی لەدەست دەدات.

بۆیە منیش ئەم ڕێگەچارەیەم پەسەند نەکرد و وەك ڕابردوو لەم بابەتەدا بێدەستەڵاتی خۆمم نواند و وتم: کە فیرعەون لە"غەزە"دا هیچ دەستەڵاتێکی نیە بۆئەوەی بتوانێت حەسار و دیواری شار وێران بکات و ڕاوێژکارێك بۆ پادشای "غەزە"کە خۆی دەستنیشانی بکات هەڵبژێرێت.

"ئازیرو"بەشێوەیەك لەم خۆ دزینەوەیەی من توڕە بوو کە منی لەچادرەکەی خۆی کردە دەرەوە و منیش دوبارە ویستم بگەڕێمەوە بۆ میسر، بەڵام دوبارە ڕێی ڕۆشتنی لێگرتم، بێئەوەی بڕیارێکی یەکلایی کەرەوەی ئاشتیم پێبدات و منیش بۆماوەی چەند ڕۆژێکی تر لەئۆردوگاکەی ئەودا مامەوە و کاتی خۆم بەچارەسەرکردنی نەخۆش و بریندارەکانەوە تێدەپەڕاند، بەتایبەت ئەو ژنانەی کە لەلایەن ئەفسەرەکانی"هاتی"ەوە بریندار و ئازار و ئەشکەنجە درابوون چارەسەر دەکرد، تلیاکیشم دەرخواردی ئەو کەسانە دەدا کە لەحاڵی گیانەڵاندا بون، بۆئەوەی بێ هەستکردن بەهیچ ئازارێك، لەخەوێکی خۆش و چێژبەخشدا گیانیان لەدەست بدەن و لەئازاری ئەو ژیانەی تێیدابوون ڕزگاریان ببێت، لەو دەرمانانەی کە لەمیسردا بۆ مردن بەکارم دەهێنا، هیچ کامیان لەتلیاك بێئازارتر نیە، چونکە تەنها تلیاك و هاوشێوەکانی بێ هیچ ڕەنج و

ئازارێك لەحاڵی خەودا کەسێك ڕەوانەی وڵاتێکی تر دەکات، هەرلەبەرئەوەش نابێت بخرێتە بەردەستی ژنان و لاوان و ئەوکەسانەی لەوانەیە بەهۆی توڕەیی یان نائومێدیانەوە، دەست لەخۆکوژیەوە بدەن.

سەرەڕای چارەسەرکردنی نەخۆش و بریندار و ئاسودە کردنی هەندێك لەو ژنانەی کە لەئازاردا دەژیان، لەو ڕۆژەی کەمن لەئوردوگای"ئازیرو"دا بوم، کۆمەڵێك لەدیلە میسریەکانم بەکڕینیان ئازاد کرد.

شەوێکیان دوو کەس هەوڵی کوشتنی"ئازیرو"یان دا "ئازیرو"ش یەکێکی لەوانە کوشت و ئەویتریان بەدەستی کوڕەکەی بریندار بوو، ڕۆژی دوایی"ئازیرو"بانگی کردم و دوای ئەوەی باسی نیگەرانی و دڵگرانیەکانی خۆیی بۆکردم وتی: من ئامادەم لەگەڵ فیرعەوندا ئاشت ببمەوە.

پەیمانی ئاشتی لەهەمان ئەو ڕۆژەدا لەنێوان فیرعەونی میسر لەلایەك و"ئازیرو" و تەواوی فەرمانڕەوایانی سوریا لەلایەکی ترەوە مۆرکرا و"ئازیرو"بەنوێنەرایەتی فەرمانڕەواکانی تری سوریا، ئەو پەیمانەی مۆر کرد.

بەپێی ئەو پەیمانە"غەزە"بۆ میسر مایەوە و فیرعەون هیچ پەیمانێکی بۆ کوشت و کوشتارکردنی چەتەکانی"غەزە" لەئەستۆ نەگرت، بەڵام ڕازی بوو بەوەی دیلە میسریەکان لە "ئازیرو" بکڕێتەوە.

لەو پەیمانەدا ئەوەیان نوسی کە ئەم پەیمانە لەنێوان فیرعەون و"ئازیرو"دا دانی پێدا نراوە، بۆ بەردەوامی و پاراستنی ئەم پەیمانەش خستیانە ژێر پارێزگاری هەزار خودای میسر بۆنمونە "ئاتون"و هەزار خودای سوریاوە.

کاتێك ئەم پەیمانە لەسەر تەختە قوڕە خۆشەکراوەکان نوسرانەوە"ئازیرو" لەکاتی مۆرکردنی ئەو پەیمانەدا وا خۆی نیشان دا کە زۆر خەمیگینە و بەمۆرکردنی ئەو پەیمانە زیانێکی زۆری بەخۆی گەیاندووە، منیش کاتێك ئەو پەیمانەم مۆر کرد یەخەیی خۆمم دڕی و دەستم کرد بەگریان و هاوارکردن بۆئەوەی"ئازیرو"بزانێت لەو پەیمانەی کە زیان بەمیسر دەگەیەنێت زۆر ناڕازیم، بەڵام لەناخەوە هەم ئەو بەم پەیمانە ڕازیبوو هەم منیش.

کاتێك خۆم بۆ گەڕانەوە بۆ میسر ئامادە کرد"ئازیرو"چەند دیاریەکی پێ بەخشیم و منیش پێم وت: دوای ئەوەی گەشتمەوە میسر بەیەکەمین کەشتی میسری

کە لەدوای ئەم ڕێکەوتنە بەرەو "غەزە"بەڕێ دەکەوێت، چەند دیاریەك بۆ ئەو و ژنەکەی و کوڕەکەی دەنێرم.

لەکاتی بەڕێکەوتندا"ئازیرو"لەئامێزی گرتم و منی بەناونیشانی هاوڕێی خۆی بانگ کرد و منیش کوڕەکەیم لەئامێزگرت و ماچم کرد، بەڵام هەردوکمان دەمانزانی کە ئەو پەیمانی ئاشتیەی کە لەنێوان فیرعەون و "ئازیرو"دا بەستراوە بەئەندازەی ئەو قوڕە خۆشەکراوەی کە ئەو پەیمانەی لەسەر نوسراوەتەوە و مۆر کراوە نرخی نیە.

"ئازیرو" لەترسی"هاتی"یەکان ناچاربوو ئەو پەیمانە لەگەڵ فیرعەوندا مۆر بکات و فیرعەونیش بەهۆی پێداگری خوداکەی "ئاتون"ئەو پەیمانەی لەگەڵ"ئازیرو"دا بەست.

بەڵام پایەداری و بەردەوامی ئەم پەیمانە بە"هاتی"یەکانەوە پەیوەست دەکرا، ئەگەر "هاتی"ەکان لەئایندەدا بۆ"ئازیرو"نەبونایەتە مایەی هەڕەشە، ئەوا ئەویش ئەو پەیمانەی پێشێل دەکرد و جەنگی لەگەڵ میسردا بەرپا دەکرد، سەرەڕای "هاتی"ە کان، بارودۆخی پادشای"کریت"یش لەم جەنگانەدا زۆر کاریگەر بوو، چونکە ئەگەر هێزی دەریایی"کریت" پارێزگاری لەکەشتیە میسریەکان نەکردایە، ئەوا کەشتیە میسریەکانیش نەیاندەتوانی گەنم و زێڕ و چەك بگەیەننە شاری"غەزە"وە، ئەوکات ئەوکەسانەی کە لە"غەزە"دا دەجەنگان خۆیان دەدا بەدەستەوە.

"ئازیرو"دوای بەستنی پەیمانی ئاشتی پێی وتم: کە بڵاوە بەلەشکرەکەی خۆی دەکات و دەستەیەك سەربازیش لەگەڵ مندا دەنێرێت بۆئەوەی بمگەیەننە"غەزە"ەوە، هەروەها"ئازیرو"لەڕێی فەرماندەی ئەو دەستەیەی لەگەڵ مندا دێت، نامەیەکی نارد بۆ هێزەکەی خۆی لە"غەزە"، بۆ ئەوەی کۆتایی بە"گەمارۆ"دانی شاری"غەزە" بهێنن، چونکە ئاشتی لەنێوان میسر و "ئامورو"یەکاندا بەرقەرار بووە.

کاتێك ئێمە گەشتینە"غەزە"و چاوم بە حەساری"غەزە"کەوت ئەوکات تێگەشتم "ئازیرو" بۆچی ئەوەندە پێداگری لەسەرئەوە دەکرد دەست بەسەر غەزەدا بگرێت یان حەساری ئەوشارە وێران بکات.

حەساری"غەزە"یەکێکە لەقەڵا بەهێزەکانی جەنگ، سەرەڕای ئەوەی ماوەیەك بەسەر گەمارۆدانی ئەو شارە لەلایەن"ئازیرو"ە تێدەپەڕێت، گەمارۆدراوەکان لەڕێی

دەریاوە کەرەستە و خۆراکیان وەردەگرت، هەرلەبەرئەوەش توانیان دان بەخۆیاندا بگرن.

لەبەرئەوەی من نوێنەری پادشای"میسر"بووم، کاتێك چڵە خورماکەم بەلاسەرمەوە ڕاوەشاند بۆئەوەی خۆم بکەم بەناو شاری"غەزە"دا، بەڵام لەباتی ئەوەی دەروازەی شار بەڕومدا بکەنەوە، بەشێوەیەك تیرباران و وردە تیریان تێگرتم کە وام زانی دواین ساتی ژیانم گەشتووە.

بەڵام پێش ئەوەی لەحەساری"غەزە"نزیك ببینەوە، سەربازەکانی"ئازیرو"قەڵخانە گەورەکانی خۆیان بەرزکردبویەوە و ئێمەش خۆمان لەژێر ئەو قەڵخانانەدا شاردەوە، ئەگەر وامان نەکردایە دەکوژراین.

بگرە دوای ئەوەی من بەدەنگێکی بەرز خۆم پێ ناساندن، فەرماندەی بەرگریکارەکانی "غەزە"وتی: ئێمە فریوی ئەو جۆرە قسانە ناخۆین و بەهیچ بیانویەك دەروازەی شار ناکەینەوە، ئەگەر ئەو پیاوە"سینۆهە"ی پزیشك و نوێنەری فیرعەونە، ئەوا ئێمە لەڕێی سەبەتەیەکەوە هەڵیدەکیشینە سەر سەحاری شار.

هەمان کاریشیان ئەنجامدا، لەکاتێکدا کە سەربازەکانی"ئازیرو"پێدەکەنین منیان بەو سەبەتەیە هەڵکێشایە سەر حەسار و دوای ئەو هەڵکێشانە خۆم کرد بەناو شاردا، فەرماندەی بەرگریکارانی"غەزە"وتی: من ئەوەندە درۆ و فێڵم لەسریانیەکان بینیوە، کە بووەتە هۆی ئەوەی باوەڕ بەهیچ شتێکیان نەکەم، ئەوکات تێگەشتم کە چۆن شاری"غەزە"تا ئەوکاتە لەبەرامبەر لەشکری"ئازیرو"دا بەرگری لەخۆی کردووە و خۆی نەداوە بەدەستەوە، چونکە فەرماندەی بەرگریکاران و ئەوانی تر، پیاوگەلێکی ئازاو دلێر و پایەدار و هۆشیار بون کە نە فریویان دەخوارد و نە لەسریانیەکانیش دەترسان.

ئەوکات کەشتیەك منی بەرەو میسر برد و کاتێکیش خۆمان کرد بەناو ڕوباری "نیل"دا و دانیشتوانی میسر ئاگاداری ئەوە بون کە لەسوریادا ئاشتی بەرپا بووە، زۆر خۆشحاڵ بون.

دوای ئەوەی خۆمان کرد بەناو"ممفیس"دا من نیگەران بوم و لەوە دەترسام کە "هورم هب" لێم تورە ببێت و بڵێت بەرقەرارکردنی ئاشتی دژی بەرژەوەندیەکانی میسرە، بەڵام ئەوم بەڕو خۆشی و خۆشحاڵی بینی.

ئاشکرابوو کە هێزی دەریایی"کریت"چیتر پارێزگاری لەکەشتیە میسریەکان ناکات و کەشتیە جەنگەیکانی میسریش گەڕاونەتەوە بۆ میسر.

لەبەرئەوە ئەگەر جەنگ لە"غەزە"دا بەردەوام بوایە، شاری"غەزە"لەبەرامبەر بەرنگاریەکاندا شکستی دەهێنا، چونکە چیتر"هورم هب" نەیدەتوانی لەڕێی دەریاوە خواردن و کەرەستەی پێویست بگەیەنێتە ئەو شارە، چونکە کەشتیە جەنگیەکانی سوریا، ئەو کەشتیە میسریانەیان نوقمی دەریا دەکرد کە باری کەرەستە و خۆراك و چەکیان هەڵگرتبوو و بەرەو"غەزە"دەڕۆشتن.

ئەوەبوو"هورم هب"لەبەرقەرارکردنی ئاشتی و ئەوەی"غەزە" بۆ میسر بمێنێتەوە زۆر خۆشحاڵ بوو و یەکسەر چەند کەشتیەك کەرستە و پێداویستی و خۆراك و سەربازی بۆ بەهێزکردنی بارەگای سەربازی"غەزە"نارد و پاریتزانەکان کە لەبیاباندا نیشتەجێ بون بەهێزتر کرد.

کاتێك من لە"ممفیس"دا بوم باڵوێزێك لەلایەن"بورا بوریاش"ی پادشای "بابل"هاتبوو بۆ میسر و منیش ئەوم سواری کەشتیەکەی خۆم کرد کە کەشتی فەرمانڕەوایی بوو و پێکەوە بەرەو بارەگای فیرعەون بەڕێ کەوتین، لەبەرئەوەی باڵوێزی"بابل"پیرەمێردێکی دانا بوو، من چێژم لەگوتەکانی- بەتایبەتی لەبارەی ئەستێرەناسی و پێشبینیکردنی ڕوداوەکانی ئاینده- وەرگرت.

باڵوێزی"بابل"دەیوت: من لەبەهێزبونی بەردەوامی"هاتی"دەترسم و وا لێکی دەدەمەوە کە"هاتی"ەکان دوای ئەمەش لەمڕۆ بەهێزتر دەبن، بەڵام تواناى "هاتی"سنورێکی هەیە، چونکە ئەستێرە ناسەکانی"بابل"پێشبینی ئەوەیان کردووە کە سەدەیەکی تر توانای"هاتی"بەرەو کزبون دەڕوات و لەخۆرئاواوە خێڵگەلێکی سپی پێست و دڕەندە و کێوی دەکەونە ڕێ و هێز و دەستەڵاتی"هاتی"ەکان لەناو دەبەن.

بەڵام ئەستێرەناسەکانی"بابل"نەیانوت لە چ بەروارێکدا خێڵە سپی پێست و دڕندەکانی خۆرئاوا بۆ لەناوبردنی"هاتی"ەکان دەکەونە ڕێ، بەڵام هیچ گومانێکیان لەوەدا نیە کە ئەمە بەسەر"هاتی"یەکاندا ڕوو دەدات.

منیش سەرم لەم گوتەیە سوڕما، چونکە دەمزانی لەبەشی خۆرئاوادا، جگە لەدەریاو دورگەیەك هیچ شتێکی تر نیە و نەمدەتوانی لەوە تێبگەم، بەچ شێوەیەك خێڵە دڕندەکان لەوێوە دێن و هێز و دەستەڵاتی "هاتی"ەکان لەناو دەبەن.

بەڵام تێگەشتم کە ئەستێرەناسەکانی"بابل"پێشبینیەکانیان ڕاستە، چونکە خودی خۆم لە"بابل"دا هەندێك شتم لەوان بینیبوو کە زۆر سەرم لێی سوڕ دەما.

دوای ئەوە باڵوێزی"بابل"وتی: ئەو سەردەمەی ئێمە تێیدا دەژین، کۆتایی پێدێت و دوای ئەویش سەردەمێکی تازە دەست پێدەکات و لەسەردەمی نوێدا هەندێك لەنەتەوەکانی ئەمڕۆ لەناو دەچن، هەروەك چۆن نەتەوەی"میتانی" بەدەستی "هاتی"یەکان لەناو چووە، هەروەها ئەو خودایانەی کە لەمڕۆدا فەرمانڕەواییان لەدەستدایە لەناو دەچن و چەند خودایەکی تر جێگەیان دەگرنەوە.

دوای ئەوە لەبارەی"ئاتون"ەوە پرسیاری لێکردم منیش و پێم وت: ئاتون خودایەکە کە خۆی پیشانی فیرعەونی میسر داوە و ئەو ئەرکەی بە فیرعەونی میسر سپاردووە کە یەکسانی لەناو میسردا بەرپا بکات و هەموو جیاوازیەکی نێوان دەوڵەمەند و هەژار لەناو بچێت و کۆتایی بەجەنگ بهێنێت.

کاتێك من ئەم قسانەم دەکرد، باڵوێزی"بابل"ڕیشی سپی خۆی نەوازش دەکرد و دوای ئەوە وتی: من وا لێکی دەدەمەوە کە دەرکەوتنی ئەم خودایە، یەکێکە لەبەڵگەکانی کۆتایی هاتنی ئەم سەردەمە، چونکە هیچ کەسێك بیروباوەڕێکی ئاوا سەیری نەبیستووە و پەیدابونی ئەم بیروباوەڕەش بەسە بۆئەوەی ئەم سەردەمەی پێ لەناو ببرێت.

*بەشی چل هەم*

## هەوڵی کوشتنی فیرعەونیان دا

کاتێك من لەبارەگای میسر دورکەوتبومەوە، سەرئێشەکەی فیرعەون دوبارە سەرلەنوێ سەری هەڵدابویەوە و نیگەرانیەکان بەسەر ڕۆحیدا زاڵ بوبون.

"ئامی"کاهینی مەزنی پەرستگای"ئاتون"بۆئەوەی فیرعەون هێور بکاتەوە بڕیاری دا دوای کۆکردنەوەی بەروبوم ئەوکاتەی ڕوباری"نیل"هەڵدەچێت، ئاهەنگێکی سی ساڵە بۆ فیرعەون بەرپا بکات.

فیرعەون زیاد لەسیانزە ساڵ فەرمانڕەوایی نەکردبوو، بەڵام هیچ گرفتێك لەوەدا نەبوو کە جەژنی سی ساڵەی بۆ بگێڕن، چونکە هەر لەکۆنەوە، ئەوە لەمیسردا نەریت بووە کە فیرعەون هەر کاتێك خۆی بیەوێت دەتوانێت ئاهەنگی سییەمین ساڵی فەرمانڕەوایی خۆی بگێڕێت.

کاتێك گەشتمەوە میسر خەریکی کۆکردنەوەی بەروبوم بون و جوتیارەکانیش بەبۆنەی زۆری بەروبومەوە، لەساڵانی ڕابردوو ڕازی تر بون.

لەبەرئەوەش دەڵێم"ڕازی تر"بون کە بەتەواوی لێی ڕازی نەبوون، چونکە تۆوی گەنم وەك ڕابردوو پەڵەی پێوە بوو و دێنشینەکان هەروەك جاران بەنەفرەت و ترسەوە گەنمەکانیان بۆ خواردن بەکار دەهێنا.

کاتێك منیش گەڕامەوە بازرگانەکانی میسر زۆر خۆشحاڵ بون بەوەی کە پەیمانی ئاشتی لەنێوان فیرعەون و "ئازیرو"دا بەستراوە، چونکە بەهۆی بەستنی ئەم پەیماننامەی ئاشتیە بازرگانی بازرگانەکانی میسرو سوریا دووبارە سەری هەڵدەدایەوە.

لەدیدی سیاسیەوە هاتنی باڵوێزی"بابل"بۆ میسر گرنگیەکی زۆر لە خۆدەگرت، چونکە باڵوێزی"بابل"یەکێك لەخوشکەکانی"بورابوریاش"ی پادشای خۆی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا بۆئەوەی بیکاتە هاوسەری فیرعەون، هەروەها دەیویست ئەو داوایە لەفیرعەون بکات کە یەکێك لەکچەکانی خۆی بکاتەی هاوسەری"بورابوریاش".

ئەم ژن بەژنەی نێوان"ئەخناتون"و"بورابوریاش"ئەوەی دەسەلماند کە پادشای "بابل"دەیەوێت لەبەرامبەر هەڕەشەی"هاتی"یەکان لەگەڵ میسردا یەك بگرێت.

دوای ئەوەی میسریەکان بیستیان پادشای"بابل"داوای دەستی کچی فیرعەون دەکات بۆئەوەی بیکاتە هاوسەری خۆی زۆر دڵگران بون، چونکە بەپێی دروشمەکان خوێنی پیرۆزی ئەندامانی خێزانی فیرعەون، نەدەبوو ئاوێتەی خوێنی بیانیەکان ببێت، بەڵام فیرعەون ئەم پێشنیارەی ڕەت نەکردەوە، من تێگەشتم کە لەناخەوە لەوەیکە کچەکەی لەمیسر دور دەکەوێتەوە و دەڕوات بۆ"بابل" زۆر بەداخ بوو، چونکە فیرعەون ئەوەی هێنایەوە یاد خۆی کە شازادە خانمکەلێکی منداڵی"میتانی" بۆ هاوسەرگیرکردن لەگەڵ فیرعەوندا هاتون بۆ میسر و لێرە گیانیان لەدەست داوە و ئەویش بەهەمان شێوە ترسی ئەوەی لێ نیشتبوو کە کچەکەی ئەمیش لە"بابل"دا بمرێت، سەرەڕای ئەوەش دۆستایەتی پادشای"بابل"ی زۆر بەرز دەنرخاند، بۆیە ڕازی بوو بەوەی کچەکەی خۆی لەپێناو ئەم دۆستایەتیەدا بکاتە قوربانی.

بەڵام تەمەنی ئەو کچەی کە دەبوو ببێتە هاوسەری"بورابوریاش"ی پادشای "بابل"لەوکاتەدا دوو ساڵان بوو، بۆیە فیرعەون بەباڵوێزی"بابل"ی وت: کچەکەی خۆی لە میسردا دەدات بە"بورابوریاش"بۆیە باڵوێز لەلایەکەوە و فیرعەونیش لەلایەکی ترەوە بەنوێنەرایەتی پادشای "بابل"و کچی"فیرعەون"لەلایەکی ترەوە گۆزەی هاوسەری دەشکێنن، بۆئەوەی بۆرابوریاش بزانێت کە کچی فیرعەون ژنی پادشاکەیەتی و دوای ئەوەی گەشتە تەمەنی باڵغ بون، ڕەوانەی"بابل"ی دەکات، باڵوێزی"بابل"یش ئەم ڕێگەچارەیەی پێباش بوو.

کاتێك من گەشتمەوە شاری"ئاسۆ" فیرعەون بەدەست سەرئێشەوە دەیناڵاند، بەڵام بەگەشتنی هەواڵی بەستنی پەیمان نامە لەگەڵ"ئازیرو"دا، هەروەها یەکگرتنی "بابل"و میسر گاریگەریەکی باشی کردە سەر فیرعەون و ئەوی بۆ بەشداری کردنی یادی سییەمین ساڵەی فەرمانڕەوایی ئامادە کرد.

"ئامی"کاهینی مەزنی پەرستگای"ئاتون"ئامادەکاری بۆ بەرپاکردنی ئاهەنگی سیەمین ساڵی فەرمانڕەوایی"ئەخناتون"ی بەشکۆمەندیەکی لەڕادەبەدەر بینی و داوای لەدانیشتوانی باشوری میسر کرد کە نوێنەرانی خۆیان بۆ بەشداری کردن لەم ئاهەنگەدا بنێرن و ئەوانیش نوێنەرانی خۆیان بە وڵاخگەلێکی هێڵ هێڵ کراو[20] و زەڕافە نارد و هەندێك لەو نوێنەرەکانەش مەیمونێکی بچوکیان بەدەستەوە بوو کە مەیمونەکانیش"توتی"یەکیان لەسەر دەست بوو.

نوێنەرانی دانیشتوانی باشوری میسریش، چەند نۆکەرێکیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو کە ئەمانیش بەنوێنەرایەتی دانیشتوانی ئەو ناوچەیەوە"ئاڵتون و عاج و سنوقگەلێك کە لە داری"ئابنوس[21]"دروست کرابون و پەڕی نەعامە"یان پێشکەشی فیرعەون کرد، بەڵام من دەزانم کە"ئامی"ئەو کەرستانەی لەخەزێنەی فیرعەوندا دەرهێناوە و داویەتی بەنوێنەرانی دانیشتوانی باشور بۆئەوەی پێشکەشی فیرعەونی بکەن، هەریەك لەو خەڵکە سەبەتەیەکی بەسەرەوە بوو و پیشانی یەکتریان دەدا و دەیانوت کە پڕیەتی لەئاڵتون، بەڵام من دەمزانی کە خاڵین. بەڵام فیرعەون ئاگاداری ئەم فێڵە نەبوو و وای زانی بەڕاستی خەڵکی باشوری میسر ئەو دیاریانەی پێشکەش دەکەن و وەفاداری ئەون - لەوەیکە خەڵکانی ئاسایی دەوڵەمەند بون ئەگینا نەیاندەتوانی ئەو هەموو دیاریانە پێشکەشی ئەو بکەن- زۆر خۆشحاڵ بوو. بەڵام دیاریەکانی باڵوێزی"بابل"ڕاستەقینە و گرانبەهابوو. بەبۆنەی سیەمین ساڵی فەرمانڕەوایی فیرعەون باڵوێزگەلێك لەلایەن"کریت"و"ئازیرو"ە هاتبون.

باڵوێزی"کریت"چەند گۆزە شوشەیەکی ڕازاوە و چەند کاسەیەکی ئاڵتونی کە بەشێوەیەکی زۆر جوان بەگەوهەری جۆراوجۆر ڕازێنرابویەوە پێشکەشکرد، هەروەها چەند گۆزەیەك ڕۆنی ڕوەکی بەتام و بۆنداریشی هێنابوو کە ئەم جۆرە ڕۆنە تەنها لە"کریت"دا دەست دەکەوت.

"ئازیرو"ش دیاریگەلێکی ناردبوو، چونکە بەهیوای ئەوە بوو لەبەرامبەردا چەند دیاریەك لەفیرعەون وەرگرێت، هەروەها دەیویست لەڕێی باڵوێزەکەیەوە کە چەند

---

20 وڵاخی هێڵ هێڵ کراو: مەبەست کەری کێویە کە لەئەفریقادا دەژیت و زیاتر بەکۆمەڵ بۆ لەمەلاو لا کۆچ دەکەن بەئینگلیزی پێی دەڵێن زێبرا"zebra"....وەرگێڕ

21 بڕۆ بۆ پەراوێزی ژمارە"٢٥"ی بەرگی یەکەمی سینۆهە.

دیاریەکی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو، چەند زانیاریەکی دروست لە میسردا بەدەست بهێنێت و بزانێت کە نەخۆشی و شێتی فیرعەون-چونکە بیستبوی کە فیرعەون شێت بووە-تا چ ڕادەیەك ڕاست و دروستە.

دوای کۆتایی هێنانی ئەو ئاهەنگە"ئەخناتون" لەگەڵ کچە دوساڵەکەیدا ڕۆشت بۆ پەرستگای"ئاتون" منیش لەگەڵیدا ڕۆشتم.

لەپەرستگادا، فیرعەون کچەکەی خۆی لەتەنیشت باڵوێزی"بابل"ەوە ڕاوەستاند، ئەوکات کاهینی مەزن، بەپێی نەریتی ژن و مێردایەتی، گۆزەیەکی لەنێوان کچی فیرعەون و باڵوێزدا شکاند.

کاتێك گۆزەکە شکا، من ڕوخساری باڵوێزی"ئازیرو"م بینی لەخەماندا ڕەش داگەڕا، چونکە دەیزانی کە چەمك و ناوەڕۆکی شکاندنی گۆزە ئەوەیە کەچیتر دوای ئەوە خێزانی فەرمانڕەوایی میسر و خێزانی فەرمانڕەوایی"بابل"یەکدەگرن و کاتێکیش"ئازیرو"بیەوێت هێرش بکاتە سەر میسر، پادشای"بابل"بۆ هاوکاری کردنی فیرعەون دژی"ئازیرو"بەشداری لەو جەنگەدا دەکات.

دوای ئەوەی ئەو گۆزەیە شکا، کچی فیرعەون چەمایەوە و پارچەیەکی لەو گۆزە شکاوەی هەڵگرت، لەوکاتەدا هەموو ئامادەبوان ئەم ڕەفتارەیان بەکارێکی چاك لێکدایەوە و وتیان لەئایندەدا ژنێکی خۆشبەختی لێدەردەچێت.

دوای ئەوەی لەپەرستگا گەڕاینەوە، من فیرعەونم هانی ئەوە دا کە بڕوات لەسەر جێگە خەوەکەی ڕاکشێت بۆئەوەی کەمێك بحەوێتەوە، بەڵام ئەو بەڕادەیەك وروژابوو کە نەیدەتوانی لەجێگە خەوەکەیدا بمێنێتەوە.

من دەرمانی هێورکەرم دەرخوارد دا، بۆئەوەی کەمێك لەوروژان و هەڵچونەکانی کەمبکاتەوە، بەڵام ئەو دەرمانە کاری تێنەکردو نەیخەواند، بۆیە لەجێگە خەوەکەی هەستابویە سەرپێ و دەیوت: سینۆهە....سینۆهە....ئەمڕۆ یەکێکە لەڕۆژە خۆشەکانی ژیانم، چونکە دەبینی"ئاتون"بەهێزو توانای خۆی ئەم هەموو خەڵکەی لەمیسردا هێناوەتە بوون و شارو لادێکانی دروست کردووەو کێڵگەکانی بوژاندووەتەوە و بەئاوی ڕوباری"نیل" کە خۆی هەڵکەری ئەم ئاوەیە،ئاو دەدرێن.

هەندێکات فیرعەون، دەستی بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە و بەشێوەیەك ڕایدەوەشاند -کەوەك بڵێی دەیتوانی بەڕاوەشاندنی دەستی، ستەم و بەدبەختیەکان لەناو ببات- و دەیوت:

ئەی"ئاتون"تۆ لەڕۆژدا وەك خۆر ڕوناکی خۆت بەزەوی دەبەخشیت و تەواوی چاوەکان تۆ دەبینن، بەڵام ئەوەندە درەوشاوە و ڕوناکیت، ناتوانرێت ڕاستەخۆ چاوەکان ئاڕاستەت بکرێن، ئەگینا بەهۆی درەوشاوەیی و ڕوناکی تۆوە کوێر دەبن، بەڵام کاتێك ئاوا دەبیت و شەو دادێت، و چیتر خەڵکی چاویان بەتۆ ناکەوێت، چاو دەنوقێنن بۆئەوەی بخەون، ئەوکاتە لەڕۆژی ڕوناك درەوشاوەتر لەڕۆحی مندا هەڵدێیت.

فیرعەون بەڕادەیەك وروژابوو کە من گوێم لەترپەی دڵی بوو و لەخۆشیاندا دەستی کرد بەگریان و ئەوکاتە دەستی بەرز کردەوە و بەوروژانێکی لەڕادەبەدەرەوە ئەم سرودەی بۆ"ئاتون" خوێند:

کەسێك نیە کە تۆ بەڕاستی بناسێت-تەنها ئەخناتونی پەرەسێڵکە تۆ دەناسێت- و تۆش بە بەردەوامی لەدڵی ئەودا هەڵدێیت و شەوانەش وەك ڕۆژ هەر بەدرەوشاوەیی دەمێنێتەوە.

تۆ مەبەستەکانی خۆت تەنها بەکوڕەکەت ئەخناتون دەڵێیت، هەموو جیهان لەژێر دەستی تۆدایە، هەروەك چۆن تۆ دروستت کردووە بەبەردەوامیش بەڕێوەی دەبەیت.

کاتێك تۆ هەڵدێیت مرۆڤ زیندوو دەبێتەوە، کاتێك تۆ ئاوا دەبیت مرۆڤ دەمرێت، تەنها تۆ پێوری ژیانی مرۆڤت لەدەستدایە و مرۆڤ بێ تۆ توانای ژیانی نابێت.

فیرعەون بەشێوەیەك ئەم دروشمانەی بەدڵپاکی و وروژانەوە خوێندەوە کە کاری لەمنیش کرد.

بەڵام لەبەرئەوەی پزیشکی ئەو بوم، نەمدەتوانی تا نیوە شەو گوێ لەسرودەکانی بگرم، بۆیە بەهەر شێوەیەك بوو ئەوم لەسەر جێگە خەوەکەی خۆی ڕاکشاند، بەڵام دوبارە نەیدەتوانی بخەوێت و چیتر دوای ئەوە نەمهێڵا هەستێتەوە.

ئەو شەوە من بەسەر جێگە خەوەکەی فیرعەونەوە وەك ئەو بێدار بوم.

فیرعەون لەسپێدەی بەرەبەیاندا لەژوری خەوتنەکەی ڕۆشتە دەرەوە و چوو بۆ ناو باخ و لەوێ دەستی کرد بەپیاسە کردن، هەندێکات لەگومێکی مەزن کە لەناوەڕاستی ئەو باخەدا بوو نزیك دەبویەوە و تەماشای فڕینی مراویەکانی دەکرد.

کاتێك یەك لەسەر چواری ڕۆژ تێپەڕی دوو کەس لەکەنار ئەو گۆمەوە پەلاماری فیرعەونیان دا بۆئەوەی بیکوژن.

هیچ یەك لە پاسەوانانەی کۆشك لەوێ نەبون، تەنها یەکێك لەخوێندکارەکانی "توتمس"کە وێنەی مراویەکانی دەکێشا لەوێ بوو، چونکە "توتمس" سوربوو لەسەر ئەوەی دەبێت خوێندکارەکانی گیانەوەرەکان لەسەر شێوە ڕاستەقینەکەیان بکێشن، نەك لەسەر ئەو شێوانەی کە لە کەسە کۆنەکان ماوەتەوە.

کاتێك ئەو وێنەکێشە بینی دوو کەس هەوڵی کوشتنی فیرعەون دەدەن خۆی هەڵدایە بەردەمیان و هاواری کرد دز و بانگی پاسەوانەکانی کرد.

خۆهەڵقورتاندنی کابرای وێنەکێش بووە هۆی ئەوەی فیرعەون لەمەرگ ڕزگاری ببێت و تەنها کەمێك شانی بریندار بوو، بەلاّم کابرای وێنە کێش لەو نێوەندەدا کوژرا و خوێنی ئەو جلەکانی فیرعەونی سور کرد.

کاتێك ڕۆشتم بۆئەوەی پشکنینێك بۆ برینی فیرعەون بکەم و بیپێچم، چاوم بەو دوو کەسە کەوت، یەکێك لەو دوانە سەری پاك تاشی بوو و ڕۆنی لەسەر و چاوی مالیبوو، من لەو کاتەدا وا لێکم دایەوە کە دەبێت لەپەیڕەوانی خودای پێشووی "ئامون"بێت.

ئەویتریان هەردوو گوێی نەبوو و دیار بوو کە لەڕابردوودا تاوانێکی ئەنجام داوە و هەر لەبەرئەوەش گوێیان بڕیبێت.

پاسەوانانی کۆشك ئەو دوانەیان بەستەوە و بۆئەوەی بزانن بەچ شێوەیەك بیریان لەکوشتنی فیرعەون کردووەتەوە دەستیان کرد بەلێدان و ئازاردانیان، بەلاّم ئەو دوو کەسە بێئەوەی لەئازاردا بناڵێنن، بەبەردەوامی ناوی"ئامون"ی خودای پێشوویان دەهێنایە زمان، من لەو کاتەدا تێگەشتم کە کاهینەکانی"ئامون"ئەو دوو کەسەیان بەهێزێکی نادیار، لەبەرامبەر ئازارەکاندا بێهەست کردووە.

پەلاماردانی ئەو دوانە بۆئەوەی فیرعەون بکوژن، ڕوداوێك بوو کە لەمیسردا وێنەی نەبوو، لەوکاتەوەی میسر هاتووەتە بون و فیرعەونەکان فەرمانڕەواییان تێدا کردووە، تا ئەو ڕۆژە، ڕوینەداوە کە کەسێك بەئاشکرا هەوڵی کوشتنی فیرعەون بدات.

گەرچی زۆرێك لەفیرعەونەکان لەکۆشکەکانی خۆیاندا بە ژەهر دەرمانخوارد کراون و هەندێکی تریان لەکۆشکدا بەپەت خنکاندونیان یان ئێسقانی کاسەی سەریان بەمەبەستی ئەوەی نەخۆشن و پێویست بەوە دەکات سەریان کون بکەن، نەشتەرگەریان بۆکردون بۆئەوەی بمرن، بەڵام تەواوی ئەم تاوانانە بەشێوەیەکی نهێنی لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا ئەنجام دراوە و بەردەوام مەرگی فیرعەونی کوژراو وەك مەرگێکی سروشتی لێکدراوەتەوە.

بەڵام هیچ کاتێك ئەوە ڕوینەداوە کە لەمیسردا بەشێوەیەکی ئاشکرا مەبەستێکی خراپیان لەبەرامبەر فیرعەوندا هەبێت و هەوڵی کوشتنی بدەن.

باڵوێزی"بابل"مافی خۆی بوو کە دەیوت: کۆتایی بەسەردەمی ئێمە دێت و سەردەمێکی تر دەست پێدەکات و یەکێك لە هێماکانی دەستپێکردنی سەردەمێکی نوێ کە هیچ گومانێك لەخۆ ناگرێت، ئەوەیە کە بەئاشکرا بیانەوێت هەوڵی کوشتنی فیرعەون بدەن.

هەوڵیان دا ئەو دوو کەسە لەبەردەم فیرعەوندا دان بەتاوانەکەیاندا بنێن و بڵێن کەسانی تر فەرمانیان پێداون هەوڵی کوشتنی فیرعەون بدەن.

بەڵام ئەمانە هیچ وەڵامێکیان نەدانەوە و پاسەوانەکان بەقامچی دەستیان کرد بەلێدانی ئەو دوو کەسە، بۆئەوەی ناوی ئەو کەسانەیان پێ بڵێن کە هانی کوشتنی فیرعەونیان داون، بەڵام ئەوان بەبەردەوامی ناوی خودای"ئامون"یان دەهێنایە زمان و نەفرەتیان لەخودای نوێی "ئاتون"دەکرد و بە"ئەخناتون"یان دەوت، ئەی فیرعەونی درۆزن، دەرئەنجام بەسزای تاوانەکانی خۆت دەگەیت و نەفرەتی هەمیشەییت لێ دەکرێت.

ئەو دوو کەسە ئەوەندە نەفرەتیان لە"ئاتون"کرد کە بووە هۆی ئەوەی فیرعەون تووڕە بێت و فەرمانی دا ئەشکەنجەیان بدەن.

بەڵام ئەشکەنجەدانی ئەمانە بگرە بەکێشانی ددانەکانیشیان هیچ کارێکی تێنەکردن، چونکە هەر بەوشێوەیە نەفرەتیان لە"ئاتون" دەکرد و دەیانوت هەی

فیرعەونی درۆزن، تۆ وادەزانی ئێمە لەتۆ و خودای نەفرەتکراوت دەترسین، ئێمە کەسانێکین کە باوەڕمان بەخودای ڕاستەقینەی"ئامون"ە و ئەو کەسەی باوەڕی بە"ئامون"بێت هەست بەهیچ ئازارێك ناکات.

کاتێك فیرعەون زانی ئەمانە هەست بەهیچ ئازارێك ناکەن، زۆر لەئەشکەنجەدانی ئەو دوانە پەیشمان بوو، بۆیە بەپاسەوانەکانی وت: وازیان لێ بهێنن، چونکە کاتێك هەست بەهیچ ئازارێك نەکەن، ئەوا ئاگایان لەوەش نیە کە چی دەڵێن.

بەڵام کاتێك دەستی ئەو دوو کەسەیان کردەوە و پێیان وتن ئازادن و دەتوانن بڕۆن بۆ هەرشوێنێك کە خۆیان بیانەوێت، لەوکاتەدا دەستیان کرد بەجنێودانی بەفیرعەون و وتیان فیرعەونی درۆزن و فێڵباز بمانکوژە، بۆئەوەی ژیانی هەتاهەتایی بەدەست بهێنین و بەردەوام لەگەڵ "ئامون"دا بژین.

کاتێك بینیان پاسەوانەکانی کۆشك دەیانەوێت بەزۆر لەوێ دەریان بکەن، خۆیان لەپاسەوانەکان دەربازکرد و بەشێوەیەك سەریان کوتا بەدیواردا کە سەریان شکا و مردن.

ئەو ڕۆژە من تێگەشتم کە"ئامون"ی خودای پێشوو، سەرەڕای ئەوەی لەلایەن فیرعەونەوە سەرنگون کراوە، هێشتا چەنێك کاریگەری بەسەر ئەو خەڵکەوە هەیە و بەچ شێوەیەك فەرمانڕەوایی ڕۆحی لایەنگرەکانی خۆی دەکات.

لەو ڕۆژە بەدواوە هەموویان دەیانزانی کەگیانی"فیرعەون"بەبەردەوامی لەهەڕەشەدایە و ئەگەر ئاگایان لێی نەبێت دەیکوژن.

هەر لەبەرئەوەش دۆستان و پاسەوانەکانی فیرعەون بەبەردەوامی بگرە ئەوکاتانەش کە دەیانویست لەباخەکەی خۆیدا پیاسە بکات لەگەڵیدا دەڕۆشتن و لێی دور نەدەکەوتنەوە.

خەڵکی بەوردەکاریەکانیەوە ئاگاداری هەوڵی کوشتنی فیرعەون بون، ئەم هەواڵەش هەم توڕەیی لایەنگرانی"ئاتون"ی وروژان و هەم لایەنگری"ئامون"خودای پێشوو و هەردووکیشیان ئەگەر بیانتوانیایە درێخیان لەئازاردانی یەکتری نەدەکرد.

لەڕۆژی ئاهەنگی سییەمین ساڵی فەرمانڕەوایی فیرعەوندا-کە لەڕاستیدا سیانزەهەمین ساڵی فەرمانڕەوایی ئەو بوو- لەشاری"تبس"دا خەڵکی بەبینینی" زەڕافە و کەری هێڵ هێڵکراو و مەیمون و توتی" خۆشحاڵی خۆیان دەربڕیی‌و چەند

کێشمەکێشێکیش لەڕێگەوبانەکاندا ڕویدا و هەرکەسێکیان بە"خاچی ژیان"ەوە ببینیایە لیان دەدا و جنێویان پێدەدا و دوو کەسیان لەکاهینەکانی "ئاتون"کە لەناوەڕاستی خەڵکیدا گیریان خواردبوو کوشت.

لەوەش خراپتر باڵوێزە بیانیەکان لەمیسردا بون و بینیان کە مەبەستێکی خراپیان لەبەرامبەر فیرعەوندا هەبوو ویستیان بیکوژن، هەروەها ئەوەشیان بەچاوی خۆیان بینی کە فیرعەونیش پیاوێکە وەك هەر پیاوێکی تر و هەرکەسێك بیەوێت دەتوانێت بیکوژێت و ئەگەر بیشکوژرێت، هیچ شتێك ڕونادات و ئەم جیهانەش بەهۆی مردنی فیرعەونەوە وێران نابێت.

من دڵنیام کە باڵوێزی"ئازیرو"سەرەڕای ئەوەی چەند دیاریەکی بۆ پادشاکەی وەرگرتبوو، بگرە هەندێك هەواڵی سەرنج ڕاکێشیشی بردەوە بۆ"ئازیرو"ی پادشای "ئامورو".

منیش دیاریەکەم نارد بۆ"ئازیرو"هەروەها کۆمەڵێك یاری منداڵانەشم نارد بۆ منداڵەکەی، ئەو یاریانەش بریتی بوون لە کۆمەڵێك سەربازی تیروکەوان و نێزە بەدەست کە پیشکەرانی پێشوی پەرستگا"ئامون" لەدار دروستیان کردبون و من پێم وتبون کە با نیوەیان بەڕەنگی سەربازەکانی سوریا بێت و نیوەکەی تریان بەڕەنگی سەربازەکانی"هاتی"بۆئەوەی کوڕە بچوکەکەی"ئازیرو" بتوانێت ئەم دوو دەستە سەربازە بەشەڕ بدات و یاریان پێ بکات.

ئەو پیشەگەرانەی کە لەڕابردوودا لەپەرستگای خودای پێشوودا کاریان دەکرد، لەبەرئەوە ئامادەبوون کە کارگەلێکی وەك تاشینی ئەو سەربازانە لەئەستۆبگرن، چونکە بێکاربون و بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانیان، پەنایان بردبووە ئەم جۆرە کارانەوە.

لەڕابردوودا کاری ئەم جۆرە پیشەوەرانە ئەوە بوو کە لەتەختە کەشتی و خزمەتکار بۆ دەوڵەمەندەکان دروست دەکرد، بۆئەوەی لەگۆڕەکانیاندا دایبنێن، بۆئەوەی دوای مەرگیان بۆگەشتنیان بە"نیشتمانی خۆرئاوا" سواری کەشتی بن و خزمەتکارەکانیش لەجیهانەکەی تردا خزمەتکردنیان لەئەستۆبگرن.

بەڵام دوای ئەوەی"ئامون"سەرنگون بوو، کۆتایی بەنەریتی دانانی کەشتی و خزمەتکارەکان لەگۆڕستانەکاندا هات، ئەوکات پیشەوەرەکانی"ئامون" ناچاربون پەنا

بۆ کارگەلێکی تر ببەن، بۆنمونە سەرقاڵی ئەوە بوون سەرباز بۆ منداڵەکان دروست بکەن بۆئەوەی یاریان پیٚ بکەن.

دوای ئەوەی فیرعەون لەم هەوڵی کوشتنە ڕزگاری بوو، وا لێکیدایەوە کە ئەم هەوڵی کوشتنە، هەڕەشەیەك بوو کە لەلایەن خودای"ئاتون"ەوە نێردراوە بۆئەوەی بانگەشەی بڵاوکردنەوەی خودای نویٚ چالاکتر بکات.

ئەوکات بۆ یەکەمین جار تامی تۆڵە-بەڵام تۆڵەی ئاتون بکاتەوە نەك خۆی-لەدەمی "ئەخناتون"دا زۆر چێژ بەخش بوو و بەناوی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی خودای نویٚ، فەرمانی دا کە تەواوی کاهینەکانی خودای پێشوو لەناو ببەن و تەواو لایەنگران"ئامون"بنێرن بۆ کانە کانزاکان بۆئەوەی بێگاریان پیٚ بکەن و ئاشکرایە کە وەك هەمیشە، کەسانی هەژار و لاواز و بێدەستەڵات و سادەکان گرفتاری دەستی کاربەدەستانی فیرعەون بونەوە و بگرە دانەیەکیش لەکاهینەکانی "ئامون"دەستگیر نەکران.

چونکە ئەوانە لەشوێنێکدا دەژیان کە هیچ کەسێك نەیدەتوانی دەستیان پیٚ بگات و کاربەدەستە زلەکانی فیرعەونیش ئاگاداری ئەوە بوون کە کاهینەکانی "ئامون"لایەنگر و سەربازگەلێکی خۆبەخشیان هەیە و کاربەدەستەکانی فیرعەونیش بۆئەوەی وەفاداری و ملکەچی خۆیان بسەلمێنن، کەوتنە گیانی کەسە هەژار و بێدەرەتان و کەسانی بێتاوانیان بەتاوانی ئەوەی ناوی"ئامون"یان هێناوەتە زمان دەستگیر کردووە و دەیانناردن بۆ کانە کانزاکان و هەرجارێکیش کاتێك کۆمەڵێك کەسانی بێتاوانیان دەناردە کانە کانزاکانەوە بۆئەوەی بێگاریان پێبکەن، توڕەیی و کینەی خەڵکیان دژی فیرعەون زیاتر دەورووژاند و لەناخیانەوە داوایان لەخودای پێشو دەکرد کە گیانی فیرعەون بکێشێت، بۆئەوەی لەستەمەکانی ئاسودە بن.

لەبەرئەوەی فیرعەون کوڕی نەبوو، بۆئەوەی لەدوای خۆیەوە فەرمانڕەوایی میسر بگرێتە دەست، بۆ دابین کردنی ئایندەی فەرمانڕەوایی، دوو کچی خۆی دا بە دوو کەسی وەجاخزادەی خەڵکی میسر، بەوشێوەیەش"مریتاتون"ی کچی بۆ لاوێك بەناوی"سمن خکر"کە لەبارگای فیرعەوندا خزمەتی دەکرد دەستنیشان کرد.

ئەم لاوە جوان و قسەخۆشەش، یەکێك بوو لە باوەڕدارانی توندڕەوی"ئاتون"و ئەویش وەك فیرعەون هەندێکات لەهۆش خۆی دەچوو و لەحاڵی لەهۆشچوندا واهەستی دەکرد کە"ئاتون" دەبینێت و دەنگیشی دەبیستێت.

کاتێك فیرعەون"سمن خکر"ی بەکەسێکی بڕوادار بینی، بەشێوەیەك لێی ڕازی بوو کە یەکسەر کچەکەی خۆی پێدا و تاجی پادشایەتی خستە سەر و ئەوی بەجێنشینی خۆی دانا و وتی: دوای من "سمن خکر"دەبێت ببێتە پادشای میسر.

کچەکەی تری فیرعەون بەناوی"ئانکس تاتون"دا بەکوڕێکی دەساڵە بەناوی "توت" کە کوڕی یەکێك لەوەجاخزادەکانی میسر بوو و دوای ئەوەی"توت"بوو بە برای"ئانکس تاتون"پلەی بەرپرسیاریەتی گەوری فەرمانڕەوایی پێ بەخشی.

"توت"یش وەك زاواکەی تری فیرعەون جوان بوو، بەڵام زۆرتەمەڵ بوو، بەردەوام حەزی لەخەوتن بوو و کاتێکیش لەخەو هەڵدەستا یاری بەبوکەڵەکان دەکرد و بەردەوامیش داوای شیرینی دەکرد. بەڵام فیرعەون بەوشێوەی من لێی تێگەشتم، لەبەرئەوە دوو لاوی گوێڕایەڵ و بێدەستەڵاتی وەك زاوای خۆی هەڵبژاردووە کە لەئایندەدا نەتوانن ڕەخنە لەڕاکانی بگرن و هەر شتێك بڵێت بێ ئەملاولا جێبەجێی بکەن. من واهەست دەکەم سێ شت بووە هۆی ئەوەی کە فیرعەون دوو کچەکەی خۆی بدات بەو دوو لاوە:

یەکەم: لەبەرئەوەی هەردوکیان لەباوەڕدارانی ڕاستەقینەی"ئاتون"بون.

دووەم: لەبەرئەوەی ئەم دوو لاوە بە دوو خێزانی وەجاخزادەی پلە یەك و مەزن کە لایەنگرێکی زۆریان هەبوو پەیوەست دەکران و لقێك بون لەو خێزانە ڕەسەنە و فیرعەونیش بەم دوو پەیوەست بونەوە، دوو خێزانی پلە یەك و مەزن و پڕ لایەنگرەی میسری بە خێزانی فەرمانڕەوایی میسرەوە دەبەستەوە.

سێیەم: لەبەرئەوەی یەکێك لەو دوو لاوە هیچ دەستەڵاتێکی لەبەرامبەر فیرعەوندا نەبوو و نەیدەتوانی بەپێچەوانەی بیروبۆچونی پادشای میسر ڕەفتار بکات.

سەرەڕای ئەوەی ئەم دوو پەیوەست بونە ئایندەی خێزانی"ئەخناتون"ی دابین دەکرد، بەڵام بەداخەوە توندەڕەوی فیرعەون لەبەرامبەر خودای"ئاتون"و سەختگیری کاربەدەستانی، خەڵکی لەشاری"ئاسۆ"دا بێزار کردبوو.

کاتێك لەماڵ دەچومە دەرەوە و بەکەژاوەیەك لەشەقام و جادەکانەوە تێدەپەڕیم، ئاگاداری ئەوە بووم کە شەقامەکان بێدەنگن.

لەسەرەتادا پەیم بەبێدەنگی شەقامەکان نەبردبوو، بەڵام لەدواییدا هەستم بەوە کرد کە شەقامەکان بێدەنگن و چیتر خەڵکی وەك جاران پێناکەنن و بەدەنگی بەرز قسە لەگەڵ یەکتریدا ناکەن و لەسۆزانیخانەکانەوە دەنگی موزیك نەدەهات و شار وەك"مردوخانە"نوقمی بێدەنگی بوو.

هەرکەسێك لەشەقامەکاندا ڕێی بکردایە بەترسەوە تەماشای چەپ و ڕاستی خۆی دەکرد نەوەك گرفتاری دەستی کاربەدەستانی فیرعەون بێت و سەری ڕێی لێبگرن و بڵێن زێر یان زیومان پێبدە ئەگینا بەتاوانی ئەوەی لەباوەڕدارەکانی"ئامون"یت دەتنێرینە کانە کانزاکانەوە بۆئەوەی بێگاریت پێبکەن.

دواجار بەڕادەیەك ترس بەسەر خەڵکیدا زاڵ بوو کە بگرە لەماڵەکانیشیان نەدەهاتنە دەرەوە، منیش هەندێکات لەماڵەکەی خۆمدا گوێم ڕادەگرت بۆئەوەی گوێم لەدەنگی شار بێت، بەڵام پەیم بەوە برد کە شار بەڕادەیەك بێدەنگە جگە لە چکەی ئاوی کاتژمێرەکەم گوێم لەهیچ شتێکی تر نەبوو و تەنها دەنگی کاتژمێرەکە گەواهی ئەوەی دەدا کە هێشتا ژیان بەردەوامە، بەڵام وەك ئەوەی ئەم کاتژمێرەش پێم بڵێت: من دواین چرکەکانی ئەم سەردەمە دەژمێرم.

شاری"ئاسۆ"بەڕاستی مردبوو، ئەگەر جارناجارێك گالیسکەیەك لەشەقامەکانەوە تێپەڕیایە بەشێوەیەك دەنگی خڕەی ئەو گالیسکەیە دەهات، کە لەگوێی مندا وەك هەورە گرمە وابوو، هەرکاتێکیش چێشتلێنەرەکەم"قاز"ێکی بگراتایە بۆئەوەی سەری ببڕێت، دەنگی ئەو قازە، بێدەنگی ڕەهای منی دەهێنایە لەرزین.

لەکاتێکدا شاری"ئاسۆ" لەسەرەتای دروست بونیدا، یەکێك بوو لەجوانترین و دڵڕفێنترین شارەکانی جیهان و هەرکەسێك سەردانی ئەو شارەی بکردایە، وای دەزانی پێی ناوەتە شارێکەوە کە وڵاتی خۆشی و خۆشبەختیەکانە.

بەڵام هەروەك چۆن کاتێك کرمێك لەناو میوەیەکدا دێتە بون، ئەوا یان ئەو میوەیە لەناو دەبات یان دەیگەنێنێ، تێپەڕبونی کاتیش وەك ئەو کرمە وایە کە خۆشی و شادیەکان لەناو دەبات، ئەگەر ستەم و زۆرداریەکانیش ببنە هاودەستی تێپەڕبونی کات، ئەوا خۆشی و شادیەکان زوتر لەناو دەچن.

ژینگەی شاری"ئاسۆ"بەڕادەیەك خەمگین بوو کە من زۆر ئارەزوی ئەوەم دەکرد بگەڕێمەوە بۆ"تبس"، کۆمەڵێك لەوەجاخزادەکانی دانیشتوی شاری"ئاسۆ"بەبیانوی کاری کشتوکاڵی یان بازرگانیەوە، یان پێویستی بەشودانی کچەکانیان، دەگەڕانەوە بۆ"تبس"و چیتر دوای ئەو ڕۆشتنەیان نەگەڕانەوە، لەکاتێکدا لەوانەبوو ئەم ڕۆشتنەیان ببێتە هۆی ئەوەی فیرعەون لێیان توڕە ببێت.

بەلأم ئەمانە زۆرتر لە"ئامون"دەترسان تا ئەوەی لە فیرعەون و"ئاتون"بترسن و ڕۆشتن بۆ"تبس"بۆئەوەی بۆنەکانی خۆیان لەگەڵ"ئامون"دا دۆستانە بکەنەوە.

من پەیامێکم بۆ"کاپتا"نارد کە نامەیەکم بۆ بنێرێت و داوام لیٚ بکات بۆ ئەنجامدانی هەندێك ئیش و کاری خۆم بگەڕێمەوە بۆ"تبس"بۆئەوەی بتوانم ئەو نامەیە پیشانی فیرعەون بدەم و بتوانم لەشاری"ئاسۆ"دەربچم.

"کاپتا"نامەکەی بۆ نوسیم و منیش پیشانی فیرعەونم دا و وتم: بۆ ئەنجامدانی هەندێك ئیش و کاری خۆم دەبێت بگەڕێمەوە بۆ"تبس"، ئەویش بەم ڕۆشتنەم ڕەزامەندی خۆی دەربڕی و منیش سواری کەشتی بوم و شاری خەم لێنیشتو و مردوی"ئاسۆ"م بەجیٚ هێشت و بەرەو باشور، بەواتا بەرەو"تبس" کەوتمە ڕیٚ.

کاتێك کەشتی بەپێچەوانەی ئاڕاستەی ڕوباری"نیل" ڕێگای باشوری گرتەبەر، وەك ئەوە وابوو کە دڵی من لەهەموو خەمێك ڕزگاری بوبێت.

کاتێك من لەشاری"ئاسۆ"وە بەڕیٚ کەوتم وەرزی بەهار بوو و پەڕەسێلکەکان لەئاسماندا سەمایان دەکرد.

کۆتایی بەهەڵچونی ڕوباری"نیل" هاتبوو[22] و تەڕی و خوساوی ژیانبەخش تەواوی زەوی داپۆشیبوو و من وەك ئاشقێك کە تامەزرۆی بینینی خۆشەویستەکەی خۆی بێت، ئاوا پەلەم بوو زووتر خۆم بگەیەنمە"تبس".

---

[22] لەبەرئەوەی سەرچاوەکانی ڕوباری"نیل" لە کێوەکانی ناوەڕاستی ئەفریقاوە بۆ نمونە کێوی"حەبەشە"و ناوچەکانی جەقی کیشوەری ئەفریقاوە هەڵدەقوڵێت، لەو ناوچانەدا لەوەرزی پاییزدا بارانێکی زۆر و بەهێز دەبارێت، هەر لەبەرئەوەشە ڕوباری"نیل" بەپێچەوانەی ناوچەکانی تر لەوەرزی"پاییز"دا هەڵدەچێت و لەوەرزی بەهاردا دەنیشێتەوە و کەم دەبێت، بۆیە سینۆهە دەڵێت کە لەوەرزی بەهاردا هەڵچونی ڕوباری"نیل" کۆتایی پێدێت و دەنیشێتەوە.

مرۆڤ دەبێتە نۆکەری هەستەکانی خۆی هەروەها دەبێتە کۆیلەی ئەو کەسەی کە خۆشی دەوێت، ئیتر ئەو کەسە مرۆڤ بێت یان گیانەوەر یان ڕوەك یان شتێکی بێگیان بێت.

منیش"تبس"م خۆشدەویست، چونکە شوێن لەدایك بونی من بوو و من لەویٚ گەورە بووم و خوێندنم تەواو کردووە. سەرەڕای ئەوەش دوای ئەوەی لەشاری "ئاسۆ"دەرچوم، وەك ئەو باڵندەیەی کە لەهێلانەکەی هەڵهاتبێت، خۆشحاڵ بوم و وەك بڵێی تازە لەزیندان ئازاد کراوم.

لەبەرئەوەی من لەشاری"ئاسۆ"دا زیاد لەدانیشتوانی ئەو شارە پابەندی بڕیارەکانی فیرعەون بوم، بەهۆی ئەوەی نەتەوەی میسر فیرعەونیان بەکوڕی خودا لەقەڵەم دەدا، بۆیە وەك خودایەك تەماشایان دەکرد. گوێڕایەڵی فەرمانەکانیشی بەلای نەتەوەی میسرەوە بەکارێکی ئاسایی لەقەڵەم دەدرا، چونکە وا لێکیان دەدایەوە کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودایان بەئەرکی خۆیان دەزانی.

بەڵام فیرعەون بۆ من کە پزیشکی ئەو بووم، تەنها کەسێکە لەئەندامەکانی مرۆڤ و من ناتوانم ئەو بەخودا لەقەڵەم بدەم، سەرەڕای ئەوەش لەشاری"ئاسۆ"دا ناچاربوم وەك کەسانی تر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بم. هەر لەبەرئەوەش دڵگرانی ئەم کۆیلایەتی و گوێڕایەڵی بونە بوم، چونکە خەڵکانی تر گوێڕایەڵی خودایەکیان دەکرد، بەڵام منیش گوێڕایەڵی مرۆڤێکی وەك خۆم دەکرد.

بەڵام دوای ئەوەی دوو ڕۆژ لەکۆچەکەم تێپەڕی و من لەشاری"ئاسۆ"دور کەوتمەوە و توانیم لەژینگەیەکی دور لەو شارە خوێندنەوەیەك بۆ فیرعەون بکەم، پەیم بەوە برد "ئەخناتون"پیاوێکی مەزنە و خاوەنی خودایەکی مەزنە. ئەوەی بووە هۆی ئەوەی من ئەو و خوداکەی بەمەزن ببینم، بەراوردی نێوان خودای ئەو و خودای پێشوو بوو. خودای پێشوو"ئامون"خودایەکی ئەفسانە پەرست و خوێن مژ و بێبەزەیی و پارێزەری دەوڵەمەندەکان و زۆردار بوو.

خودای پێشوو ڕێی بەهیچ کەسێك نەدەدا بپرسێت"بۆچی؟"بگرە ئەو پرسیارەشی بە کفر دەزانی، لەبەرئەوەی دەیزانی ئەگەر خەڵکی توانای ئەوەیان هەبێت بپرسن "بۆچی"چیتر ناچنە ژێر باری ستەم و زۆرداری ئەوەوە. بەڵام خودای نویٚ مرۆڤەکانی

ئازاد دەکرد بەوەی هەرپرسیارێکیان دەوێت بیکەن و هەرچیان دەوێت ئەنجامی بدەن، بەلام بەمەرجێك ئازاری هیچ کەسێك نەدەن.

خودای پێشوو خەڵکی لەئەفسانە و نەزانی و ترس ڕزگار کرد، بەلام ئەفسانە و نەزانی و ترس بەشێوەیەك خۆی بەسەر ڕۆحی خەڵکیدا زاڵکردبوو کە بگرە بەلەدەستدانیشیان دەترسان.

ئەگەر خودای تازە خاوەنی شێوەیەکی تایبەت بەخۆی بوایە، خەڵکی زووتر باوەڕیان پێدەهێنا و دەیانپەرست، بەلام میسریەکان ناتوانن لەوە تێبگەن کە لەوانەیە خودایەکی بێ شێوە و پەیکەر ئەگەری بونی هەیە.

خەڵکی ناتوانن لەوە تێبگەن کە خودای نوێ، وەك سروشت وایە کە لەهەموو شوێنێك ئامادەیە، بەلام هیچ کەسێك نایبینێت، شوێنەوار و جێدەستی لەهەموو شوێنێکدا بەدی دەکرێت، بێئەوەی شێوەیەك لەخۆ بگرێت.

خەڵکی ناتوانن لەوە تێبگەن کە تەواوی ئەو خودایانەی کە تا مرۆ هاتون، تەنها لەپێناوی کاروبارێکی دنیایی هاتون و تەنها "ئاتون"ە کە سەرەڕای کاروبارە دنیاییەکان خۆشبەختی جاودانی خەڵکیش مسۆگەر دەکات.

خەڵکی بەهۆی هەزاران ساڵ ئەفسانە پەرستیەوە، ناتوانن لەوە تێبگەن کاتێك فیرعەون دەڵێت "ئاتون" لەبونایەتی ئێوە و دڵی ئێوەدایە، نەك لەشوێنێکی تایبەتدا، واتای چی دەگەیەنێت؟

ئەمانە خوویان بەوەوە گرتبوو کە خودا لەشێوەی پەیکەرێك لەدەرەوەی خۆیاندا ببینن و خودای نەبینراو کە لەهەموو شوێنێکدایە بۆنمونە لەناو دڵی مرۆڤدایە، بەلای ئەوانەوە جێی باوەڕ و پەسەندکردن نیە.

فیرعەون وای دەزانی کە هەموو خەڵکی بەئەندازەی ئەو هەست و پەیبردنیان هەیەو دەتوانن لەوە تێبگەن کە ئەو چی دەڵێت و ئاگاداری ئەوە نیە کە لەهەزاران ساڵ پێشترەوە، لەدروستبونی قوچەکیەکانەوە تا ئەمڕۆ خەڵکی، نەزان و خەیاڵپەرست بونو ئەم قوناخە دوورودرێژەی نەزانی و ئەفسانە پەرستی خەڵکی لەئاژەڵەکانیش بێهەست تر کردبوو و نەیاندەتوانی پەیی بەوە ببەن کە خودا لەدڵی مرۆڤدایە.

بۆنمونە یەکێك لەوشتانەی کە فیرعەون باسی دەکات ئەوەیە کە هەموو کەسێك، خودایەکی لەدڵدایە، وبە بەڕێژەی مرۆڤەکان خودا هەیە و هەر میسریەك کاتێك گوێی

لەم قسەیە دەبێت، وا دەزانێت کە فیرعەون شێت بووە و لەدڵی خۆیدا لەگەڵ خۆیدا دەدوێت و دەڵێت: ئەگەر بەژمارەی مرۆڤەکان خودا هەبێت، کەواتە کێ دەبێت ئەم خودایانە بپەرستێت، چونکە خودا ئەوەندە زۆرە کە بۆ پەرستنی هەر خودایەك تەنها یەك کەس هەیە.

لەوانەیە فیرعەون بتوانێت قوچەکێکی وەك ئەم قوچەکە مەزنەی ئێستا دروست بکات، بەلاَم ناتوانێت ئەو ئەفسانە و خەیاڵپلاَویەی کە هەزاران ساڵە لەڕۆحی خەڵکی پاك و دوریان بکاتەوە، لەبەرئەوەی دورخستنەوەی ئەفسانە لەڕۆحی نەتەوەیەك لەدروست کردنی قوچەکیەکی مەزن سەختترە، لەو کۆچەمدا بینیم کە زەویەکانی میسر بەچ شێوەیەك دوای هەڵچونی ڕوباری نیل، بە بەکار نەهێنراوەی ماوەتەوە و لەباتی گەنم، گیای گەزنە و جۆرەها هەرزە گیای تری لەسەر ڕواوە.

سەرەڕای ئەوەی کاتی وەشاندنی تۆو بوو، جوتیارەکان بەدەستەپاچەیی مابونەوە و تۆوی خۆیان نەدەوەشاند و هەندێك لەجوتیارانیش، کلێگەکانیان بەجێ هێشتبوو و ڕێگای شاریان گرتبووە بەر، چونکە وا لێکیان دەدایەوە کە کێڵگەکانیان لەلایەن ئامونەوە نەفرەتی لێکراوە و جگە لە گەنمێکی بێسود هیچی تری لێ ناڕوێت.

پرسیارم لەو جوتیارانە کرد کە لەماڵی گڵینەکانیاندا دانیشتبون: ئێوە بۆچی تۆوی خۆتان ناوەشێنن و بۆچی بەم تەمەڵەیەتان خۆتان توشی برسیەتی دەکەن.

لەوەلاَمدا وتیان: تۆو وەشاندنی ئێمە بێسودە، چونکە دوای ئەوەی کاتی درەوکردنی هات، جگە لە گەنمی پەڵەدار، هیچ شتێکی تر نابێتە بەشمان و منداڵەکانمان بەهۆی خواردنی ئەو نانەی کە لەم گەنمە دروست کراوە مردون.

هیچ کەسێکی شاری"ئاسۆ"ئاگاداری ئەو نەخۆشیە نەبوو کە لەگەنمی پەڵەدارەوە سەرچاوە دەگرێت و منیش بۆیەکەمین جار لەوێدا ئەم جۆرە نەخۆشیەم بیست.

ئەم نەخۆشیە تەنها توشی منداڵەکان دەبوو و ژن و پیاوە باڵخەکانیش توشی ئەو جۆرە نەخۆشیە نەدەبون، ئەم نەخۆشیە ورگی منداڵەکانی دەئاوسان و پزیشکەکانیش نەیاندەتوانی چارەسەریان بکەن، منداڵەکانیش بەهۆی بەرگەگرتنی ئازارێکی زۆرەوە گیانیان لەدەست دەدا، من لەوباوەڕەدا نەبووم کە ئەم نەخۆشیە لەگەنمی پەڵەدارەوە سەرچاوە بگرێت، بەڵکو ئەوە یەکێکە لەو نەخۆشیانەی کە لەئاوەوە بلاَو دەبێتەوە، کە لەپایز و زستاندا بەهۆی هەڵچونی ڕوباری"نیل"وە

لەمیسردا بڵاو دەبێتەوە، بەڵام جوتیاران دەیانوت ئەو نەخۆشیە لەڕێی گەنمی پەڵەدارەوە، لەمنداڵەکاندا دەردەکەوێت.

من دەمزانی کە فیرعەون هیچ تاوانێکی لەبەرامبەر ئەم نەخۆشیەدا نیە، چونکە ئەو نەیدەویست ئەو نەخۆشیە بێتە بون، بەڵکو تاوانی"ئامون"ی خودای پێشووە کە ئەو جۆرە نەخۆشیەی هێناوەتە بون یان کاهینەکانی دەستیان لەم تاوانەدا هەیە و بەهۆی بەکارهێنانی هەندێك کەرەستەوە بونەتە هۆی پەیدا بونی ئەم جۆرە نەخۆشیە.

لەبەرئەوەی من پەلەم بوو بۆئەوەی زووتر بگەمە"تبس" بەسەوڵ لێدەرەکانم وت: خێراتر سەوڵ لێبدەن و دوای ئەوە بڕێك زێر و زیوم پێدان، بۆئەوەی لەنێو خۆیاندا دابەشی بکەن.

دوای چەند ساتێك بیستم کە سەوڵ لێدەرەکان لەنێو خۆیاندا قسە دەکەن و دەڵێن بۆچی دەبێت خێراتر سەوڵ لێ بدەین، بۆئەوەی ئەم پیاوە کە بەئەندازەی بەرازێك قەڵەوە زووتر بگاتە شوێنی خۆی؟

ئەو باوەڕی بەخودایەکە کە هەموو کەسێك بەچاوێکی یەکسان تەماشا دەکات و هیچ جیاوازیەك لەنێوان پزیشکی فیرعەون و سەوڵ لێدەرێکدا نیە، ئەگەر ئەم پیاوە ڕاست دەکات و باوەڕی بەیەکسانیە، دەبێت خۆشی وەك ئێمە بێت و سەوڵ لێبدات، بۆئەوەی دەستی بلوق دەربکات و بزانێت کە ناتوانێت بلوقی دەستەکان بەچەند دڵۆپ ئاوجۆ یان کەمێك زێڕ و زیو چارەسەر بکات.

من دەمتوانی دوای بیستنی ئەم جۆرە قسانە، گاڵۆکەکەی خۆم بەشان و باڵ و پشتیاندا بکێشم، بەڵام ئەم کارەم نەکرد، بەڵکو بەرەوڕویان ڕۆشتم و وتم: سەوڵێکم پێبدەن، بۆئەوەی بۆ لێخوڕینی ئەم کەشتیە هاوکاریتان بکەم.

ئەوانیش سەوڵێکیان پێدام، منیش سەرێکی ئەو سەوڵەم خستە ناو ئاوەکەوە و سەرەکەی تریم گرت بەدەستمەوە و وەك ئەوان دەستم بەسەوڵ لێدان کرد، دوای ئەوەی دە جارێك سەوڵم لێدا، زانیم کە سەوڵ لێدان کارێکی زۆر دژوارە و زۆر زوو مرۆڤ ماندو و شەکەت دەکات و تەنها کەسانێك دەتوانن سەوڵ لێبدەن کە ماوەیەك مەشقیان لەسەر کردبێت.

زۆری نەخایاند کە ناومشتم لەبنی پەنجەکانمەوە بلوقی دەرکرد و توشی پشت ئێشەش بوم و بەڕادەیەکیش ئازارم هەبوو کە خەریك بوو لەهۆش خۆم بچم.

ویستم دەست لەسەوڵ لێدان هەڵگرم، بەڵام ئاگاداری ئەوە بووم کە دەبمە مایەی گاڵتەجاری سەوڵ لێدەرەکانی تر و ئەوانیش تائەوکاتەی دەگەینە نزیك شاری"تبس"ەوە پێم پێدەکەنن، ئەوەبوو لەو ڕۆژەدا هەر سەوڵم لێدا تا لەهۆش خۆم چوم، دوای ئەوە کرێکارەکانی کەشتی منیان بردەوە ژورەکەی خۆم و لەسەر جێگەخەوەکەی خۆمدا خەواندمیان.

ڕۆژی دوایی سەرەڕای ئەوەی دەستەکانم چەند پینەیەکیان پێوە بوو هەروەها پشتیشم بەهۆی سەوڵ لێدانی ڕۆژی پێشوو ئازاری دەکرد، بەڵام دوبارە دەستم کردەوە بەسەوڵ لێدان. ئەو ڕۆژە هەستم کرد کە سەوڵ لێدەرەکان بەچاوی ڕێزەوە تەماشام دەکەن و پێیان وتم: تۆ سەرگەورەی ئێمەی و ئێمەش نۆکەری تۆین. بۆیە تۆ نابێت سەوڵ لێبدەیت، ئەگینا بنی ئەم کەشتیە دەبێت بە بنمیچ و ئێمەش کاتێك سەرمان بەرەوخوار دەبێتەوە، دەست بەڕێکردن دەکەین.

یەکێك لەسەوڵ لێدەرەکان وتی: "سینوهە"خوداکان جێگای هەموو کەسێکیان دیاری کردووە و جێگای تۆش سەوڵ لێدان نیە، چونکە تۆ کەسێکی خاوەنداریت و ئێمەش کە نۆکەرین دەبێت سەوڵ لێبدەین. بەڵام من گوێم لەقسەکانیان نەگرت و بەردەوام سەوڵم لێدەدا تا لەڕۆژی سێیەمدا هەستم بەوە کرد کە سەوڵ لێدان بەلای منەوە زۆر ئاسانتر بووە و چیتر پشتم ئێش ناکات.

وردە وردە ئەو ئێشەی بەهۆی سەوڵ لیدانەوە لەجەستەمدا دروست بوبو کۆتایی پێهات و منیش پەییم بەوە برد کە سەرەڕای ئەوەی کێشم دابەزیوە، بەڵام بەئاسودەیی ڕێدەکەم و هەناسە دەدەم و وەك بڵێی لاویەتی لەدەستچوم بۆ گەڕابێتەوە.

خزمەتکارەکانم کە لەناو کەشتیەکەدا بون، گاڵتەیان پێدەکردم و دەیانوت کە دوپشکێك "سینوهە"ی گەستووە، یان ئەویش وەك تەواوی دانیشتوانی شاری "ئاسۆ"شێت بووە، ئەگینا پیاوێك کە پزیشکی تایبەتی فیرعەونە، لەپاڵ سەوڵ لێدەرەکاندا دانانیشێت و وەك نۆکەرەکان سەوڵ لێنادات. بەڵام من شێت نەبوم و نەمدەویست بەبەردەوامی سەوڵ لێبدەم، چونکە دەمزانی هەر ئەوکاتەی گەشتمەوە "تبس"دەست لە سەوڵ لێدا هەڵدەگرم.

بەمشێوەیە ئێمە گەشتینە شاری"تبس"و هێشتا بەتەواوی لە"تبس"نزیك نەبوبوینەوە شنەی"با"کان بۆنی تایبەتی ئەو شارەی پێکەیاندین و چێژی پێ

بەخشیم، چونکە ئەو کەسەی چاوی لە"تبس"دا هەڵهێنابێت و تێیدا گەورە بوبێت، هیچ کاتێك بۆنی تایبەتی ئەو شارە فەرامۆش ناکات.

پێش ئەوەی خۆم بکەم بەشاری"تبس"دا خۆم شۆرد و عەترم لەجەستەم دا و جلێکی باشم لەبەرکرد، بەڵام جلەکەکانم لەبەرمدا گەورە بوبون، خزمەتکارەکانم خەمباری ئەوە بوون کە من کەمێك لاواز بوم، لەکاتێکدا من خەمی لاوازیم نەدەخوارد.

یەکێك لە خزمەتکارەکانی خۆمم نارد بۆ ماڵەکەم لە"تبس" بۆئەوەی "موتی" لەهاتنم ئاگادار بکەنەوە.

چونکە دوای ئەو جارەی کە بێ ئاگاداری ئەو خۆم کردبوو بەماڵدا و"موتی" لێم تورە بوو، چونکە بێ هیچ ئاگادارکردنەوەیەکی ئەو گەڕابومەوە. بۆیە نەموێرا پێش ئەوەی ئاگاداری بکەمەوە بڕۆمەوە بۆ ماڵ.

دوای ئەوەی زێڕ و زیوم بەنێو سەوڵ لێدەرەکاندا دابەشکرد، وتم: ئەوە بێ لەموچەکەتان، خەڵاتێکە لەلایەن منەوە بۆئێوە، بۆیە بڕۆن و خواردنەوەی پاك و پاراو بخۆنەوە، چونکە "ئاتون"خۆشگوزەرانی سادەی خەڵکی خۆش دەوێت و زیاتر بەخۆشحاڵی و خۆشگوزەرانی کەسە هەژارەکانی خۆشحاڵ تر دەبێت، لەبەرئەوەی هەژاران بەسادەیی کاتی خۆیان بەخۆشی بەسەر دەبەن.

کاتێك سەوڵ لێدەرەکان زێر و زیوەکەیان لێ وەرگرتم، دەموچاویان دا بەیەکدا و یەکێکیان وتی: ئێمە لەزێڕ و زیوی تۆ دەترسین.

پرسیم: بۆچی؟

ئەویش وتی: لەبەرئەوەی تۆ ناوی"ئاتون"ت هێنایە زمان و ئێمە لەوە دەترسین کە زێڕ و زیوەکەت نەفرەتی لێکرابێت و ببێتە مایەی بەدبەختی ئێمە.

تێگەشتم کە ئەم قسەیەیان لەو متمانەیەوە سەرچاوە دەگرێت لەبەرامبەر مندا هەیانە، چونکە دوای ئەوەی لەگەڵ ئەواندا سەوڵم لێدا، سۆزیان لەبەرامبەر مندا بزوا و متمانەیەکی تایبەتیان لەبەرامبەر مندا پەیدا کردووە.

منیش پێم وتن: ئاسودە خەیاڵ بن لەوەی ئەم زێڕ و زیوە نەفرەت لێکراو نیە لەبەرئەوەی زێڕ و زیوی بێخەوشە و تێکەڵی مسی شاری"ئاسۆ"نەکراوە، ئەگەر لەوە دەترسن کە زێڕ و زیوەکەم نەفرەتیان لێکرابێت، هەرئێستا بڕۆن و بیگۆڕنەوە و بەخواردنەوەیەکی پاك و پاراو، بەڵام ترسی ئێوە لە"ئاتون" بێبنەمایە، چونکە

"ئاتون" خودایەکی ترسناك نیە. ئەوانیش وتیان"سینۆهە"ئێمە لە"ئاتون"ناترسین، چونکە هیچ کەسێك لەخودایەکی بێدەستەلات ناترسێت، بەڵکو ئێمە لەفیرعەون دەترسین، چونکە دەزانین ئەگەر ئەو بزانێت کە ئێمە خودای ئەو ناپەرستین، بمانگرێت و ڕەوانەی کانە کانزاکانمان بکات. ئەوکات سەوڵ لێدەرەکان، لەکاتێکدا خەریکی گۆرانی وتن بون، ڕێگای مەیخانە و سۆزانیخانەکانیان گرتە بەر.

منیش زۆر حەزم دەکرد وەك ئەوان گۆرانی بڵێم، بەڵام کەسایەتی و پلەوپای من ڕێگرم بوو.

کاتێك خزمەتکارەکانم ئاگاداری ئەوەبوو کە من دەمەوێت لەکەشتیەکە دابەزم، پێیان وتم: کەمێك دان بەخۆتدا بگرە بۆئەوەی کەژاوەیەکت بۆ بهێنین، بەڵام من چاوەڕێی کەژاوەکەم نەکردو ڕێگای مەیخانەی"کلکی تیمساحم"گرتە بەر و دوای ماوەیەك"مریت"م لەو مەیخانەیەدا بینی.

"مریت"چیتر وەك ڕابردوو لاو نەبوو، بەڵام بەژنێکی جوان لەقەڵەم دەدرا و کاتێك چاوم پێی کەوت ئاگاداری ئەوە بووم کە هیچ کاتێك ئەوم بەو ڕادەیە خۆش نەویستووە.

کاتێك"مریت"چاوی پێم کەوت هەردوو دەستی خستە سەر ئەژنۆکانی و سەری بۆ دانەواندم، دوای ئەوە لێم نزیك بویەوە و دەستی بەشان و پشت و سینە و ورگمدا هێنا و وتی: "سینۆهە"چی ڕویداوە کە ئەوەندە لاواز بویت و چاوەکانت دەدرەوشێنەوە.

وتم: درەوشانەوەی چاوەکانم لە ئیشقەوە سەرچاوە دەگرێت، لەبەرئەوەش لاوازبوم کە دەمویست زووتر خۆم بگەیەنمە تۆ و لەگەڵتدا ڕابوێرم.

"مریت" وتی: مەگەر خێرایی مرۆڤ لەکۆچکردندا لاواز دەکات؟

وتم: بەڵێ، چونکە کاتێك مرۆڤ خێرا ڕێ دەکات، چەوری جەستەی دەتوێنێتەوە و لاوازی دەکات.

"مریت"وتی: "سینۆهە"سەرەڕای ئەوەی دەزانم کە درۆ دەکەیت، چێژم لەم درۆیەت وەرگرت، چونکە هەرچی لەبەرژەوەندی ئیشقدا بێت، ئەگەر درۆش بێت چێژبەخشە.

بەڵام تۆ لەکاتی خۆیدا هاتیت، چونکە ئێستا وەرزی بەهارە و لەبەهاردا، زەوی و ئاسمان و هەموو بونەوەرێکی گیاندار هانی ئیشقبازی دەدات.

ئەگەر من لاوازبوبێتم، ئەوا لەبەرامبەردا"کاپتا"ی نۆکەری پێشوم، لەجاران قەڵەوتر بووە و بینیم کە جلێکی گرانبەهاتری لەبەرکردووە و چەند ملوانکەیەکی ئاڵتونیشی لەمل کردووە و پارەچە زێڕێکیشی بەسەر چاوە کوێرەکەیەوە هەڵواسیوە و بەچەند گەوهەرێکیش ئەو پارچە ئاڵتونەی ڕازاندوەتەوە.

کاتێك"کاپتا"چاوی پێم کەوت لەخۆشیاندا دەستی کرد بەگریان و هاواری کرد ئەم ڕۆژە پیرۆزە بکرێت، چونکە خاوەنەکەم لەمرۆدا گەڕاوەتەوە.

ئەوکات"کاپتا"منی بردە یەکێك لە ژورە تایبەتەکانی ئەو مەیخانەیە و لەسەر فەرشێکی ئەستور و نەرم داینیشاندم و مریتیش باشترین خواردنی مەیخانەی بۆهێنانین، لەکاتێکدا سەرقاڵی نان خواردن بوین"کاپتا" وتی:

گەورەم"سینۆهە"ئەو ڕۆژەی پێت وتم گەنمەکەت بۆ دابینکردنی تۆوی جوتیارانی میسر بەنێو جوتیاراندا دابەش بکەم و لەکاتی خەرماندا لەبەرامبەر هەر کاسەیەك گەنمدا تەنها یەك کاسەیان لیٚ وەرگرین، وام دەزانی شێت بویت. بەڵام ئەو کارەی تۆ ئێمەی لەشکست هێنان ڕزگار کرد، چونکە دوای ئەوەی من گەنمەکەی تۆم بەنێو جوتیارەکاندا دابەش کرد و ئەوانیش وەشاندیان، "ئامی"کاهینی مەزنی پەرستگای "ئاتون"یش بۆئەوەی گەنم بۆ جەنگاوەرانی میسر لە"غەزە" یان ئەو کەسانەی لایەنگری میسریەکانن و لەویٚ شەڕدەکەن، فەرمانی دا دەست بەسەر گەنمی سەرمایەداراندا بگرن.

لەئەنجامدا لەلایەن"ئامی"یەوە بەفەرمانی فیرعەون و خوداکەیەوە دەستی بەسەر گەنمی سەرمایەدارەکاندا گرت، بەڵام هیچ کەسێك ناتوانێت دەست بەسەر گەنمی تۆدا بگرێت، چونکە ئێمە دابومان بەجوتیارەکان و ئەوانیش وەشاندبویان و دوای ئەوەی بەروبومی خۆیان کۆکردەوە، هەمان ئەو گەنمەی پێمدابون لێم وەرگرتنەوە، بۆیە ئەم کارەی تۆ بووە هۆی ئەوەی گەنمی ئێمە وەك خۆی لەخەزێنەدا بمێنێتەوە.

دوای ئەوەش ئاگاداری ئەوەبووم کە تۆ بەفەرمانی"فیرعەون"ڕۆشتویت بۆ میسر بۆئەوەی پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ سوریادا مۆر بکەیت و هەواڵی مۆرکردنی ئاشتی بەهای گەنمی کەمکردەوەو منیش وا لێکمدایەوە دوای بەرپا بونی ئاشتی

بازرگانەکانی میسر بڕێکی زۆر گەنم دەنێرن بۆ سوریا و بەو هۆیەوە نرخی گەنم بەرز نەبێتەوە، بۆیە پڕی خەزێنەکانمان گەنمم کڕی و هەر ئەوکاتەی تۆ لەسوریا گەڕایتەوە و چویت بۆ شاری"ئاسۆ"و پەیماننامەی ئاشتیت دا بە فیرعەون، کەشتی میسریەکان کە پڕبون لەگەنم ڕێگای سوریایان گرتە بەر و دوای ئەوە نرخی گەنم بەرز بویەوە. بەڵام گەنم لەوە گرانتریش دەبێت، چونکە سەرتاسەری زستانی ئەمساڵی میسر ساڵێکی بێبەروبوم دەبێت، چونکە جوتیارە میسریەکان خۆیان لەوەشاندنی گەنم -بەهۆی ئەوەی"ئامون" نەفرەتی لە جوتیار و بەروبوم کردووە- دەپارێزن.

لەکاتێکدا من دەزانم نەفرەت کردنی گەنم هیچ ڕاستیەك لەخۆ ناگرێت و ئەو پەڵانەی کە بەسەر گەنمەوە دەبینرێت، لەخوێن یان لەمادەیەکی ترەوە سەرچاوە دەگرێت کە کاهینەکانی "ئامون"و موریدەکانیان بەسەر گەنمی جوتیاراندا دەیپرژێنن، بۆئەوەی جوتیارەکان بترسن، بەڵام ئەگەر من و تۆ ئەم بابەتە بەجوتیارەکان بڵێین، باوەڕمان پێناکەن، چونکە ئەوان دڵنیان لەوەی"ئامون"ی خودای پێشوو نەفەرەتی لەکێڵگەکانی ئەوان کردووە.

"کاپتا"پێی وتم: "سینۆهە"ی گەورە و بەڕێزم، ئێمە لەسەردەمێکدا دەژین کە دەوڵەمەندەکان بەجۆرەها شێوە دەوڵەمەند دەبن، بگرە دەتوانن سود لەگۆزەی کۆنیش بۆ بەدەست هێنانی زێڕ و زیو وەرگرن، بۆیە دەبێت ئەوەشت پێ بڵێم کە لەدوایین زستاندا من سەد کەڕەتی سەد گۆزەی کۆنم فرۆشتووە.

وتم: "کاپتا"تۆ ئەو هەموو گۆزە کۆنەت لەکوێوە هێنا بۆئەوەی بیانفرۆشی؟

"کاپتا"وتی: هەرئەوەی من ئاگاداری ئەوە بووم کە کۆمەڵێك سەرقاڵی کڕینی گۆزەی کۆنن، یەکسەر ئەوەم بەنۆکەرەکانی خۆم ڕاسپارد کە بڕۆن و لەمیرنشینەکاندا گۆزە کۆنەکانم بۆ بکڕن و بۆم بنێرن، ئەوانیش بەکەشتی گۆزە کۆنەکانیان بۆ ناردم و من لەوێوە بارم دەکردن بۆ میسری خوارو و لەوێ دەم فرۆشتن.......منیش وتم: گۆزە کۆنەکان لەمیسری خواروودا بەکەڵکی چی دێن؟

"کاپتا"وتی: لێرە ئەوە بڵاو بوبویەوە کە لەمیسری خواروودا، بۆهەڵگرتنی ماسی لەئاوی سوێردا، ڕێگایەکی تازە دۆزراوەتەوە، کە پێویستی بە بەکارهێنانی گۆزەی کۆنە، بەڵام دەزانم ئەم هەواڵە درۆیە، چونکە لەمیسردا سود لەگۆزە کۆنەکان

وەرناگیرێت، بەڵکو لەرێی کەشتیەوە دەیگوازنەوە بۆ سوریا و هیچ کەسێك نازانێت گۆزەی کۆن لەسوریادا بەکەڵکی چی دەخوات.

بابەتی گۆزە کۆنەکانی میسر کە بۆ سوریا بار دەکرا، زۆر مایەی سەرسوڕمان بوو، چونکە هەرچی بیرم لیٚ دەکردەوە نەمدەتوانی لەوە تێبگەم کە سریانیەکان چ سودێك لەگۆزە کۆنە میسریەکان وەردەگرن، بەڵام لەبەرئەوەی بابەتی گەنمەکە گرنگ تر بوو، بەو هۆیەوە بابەتی گۆزەکەم فەرامۆش کرد و بە"کاپتا"م وت: تا دەتوانی گەنم بکڕە، بەڵام دەبێت خۆت گەنمەکە بکڕیت، بۆئەوەی خۆت چاوت بە گەنمەکە بکەوێت، بۆئەوەی نەوەك گەنمێکی کۆن بکڕیت یان گەنمێك بکڕیت هێشتا کاڵ و پێنەگەیشتووە.

ئەگەر بۆ کڕینی گەنم پێویستت بە زێڕ و زیو بوو، هەرچیم هەیە بیفرۆشە و زێڕ و زیوی پێویست بۆ کڕینی گەنم بەدەست بهێنە، چونکە کێڵگە بەرەڵاکانی میسرم بەچاوی خۆم بینی و دڵنیام کە لەزستانی ئایندەدا، بێبەروبومیەکی سەخت ڕوو لەمشارە دەکات، هەروەها لەبەرئەوەی بیستومە بڕێکی زۆر گەنم ڕوانەی سوریا کراوە، ئەگەر بتوانی بڕێك لەو گەنمەش لەبازرگانەکانی سوریا بکڕیتەوە و بیگەڕێنیتەوە بۆ میسر.

"کاپتا"وتی: گەورەم تۆ ڕاست دەکەیت، بەڵام ئێمە ئەگەر گەنم بکڕین، تۆ لەئایندەدا دەبیتە دەوڵەمەندترین پیاوی میسر و سامانی تۆ لەسامانی فیرعەون زیاتر دەبێت.

بەڵام بازرگانەکانی سوریا گەنمی ئێمەیان بەناونیشانی ئەوەی کە ئاشتی لەنێوانماندا بەرقەراربووە لیٚ دەکڕن و لەژێر دەستی ئێمەدا دەریان کێشاوە و لەئێمە ئازا و زیرەکترن و دان بەخۆیاندا دەگرن، بۆئەوەی کاتێك وشکەساڵی و بێبەروبومی باڵی بەسەر میسردا کێشا، ئەوکات گەنمەکە دەگەڕێننەوە بۆ میسر و دە ئەوەندەی نرخی پێشووی پێمان دەفرۆشنەوە و ئەم"ئامی"یە گەمژەیەی کاهینی مەزنی"ئاتون" ناتوانێت لەوە تێبگات کە بارکردنی ئەو هەموو گەنمە بۆ سوریا، ئەم وڵاتەی لەدانەوێڵە خاڵی دەکات.

دوای چەند ساتێکی تر بەهۆی ئەوەی"مریت"خۆی کرد بەژوردا، من بابەتی گەنم و وشکەساڵی و بێبەروبومی ئایندەی میسرم فەرامۆش کرد.

دوای هاتنی"مریت"نۆکەری پێشوم ڕۆشتە دەرەوە، چونکە کاتی خەوتنم هاتبوو، کاتێك "مریت"لەو ژورە ڕۆشتە دەرەوە بۆئەوەی من کەمێك بحەوێمەوە هەستم بەوە کرد کە بەبونی ئەم ژنە هەست بەتەنهایی ناکەم و چیتر نابێت من بە"سینۆهە"ی گۆشەگیر بانگ بکەن.

ڕۆژی دوایی"تهوت"ی بچوکم بینی و بەرەو ڕوم ڕایکرد و بەدەستە بچوکەکانی باوەشی بەملمدا کرد، چونکە هەر بەو شێوەیەی"مریت"لەکەشتیەکەدا فێری کردبوو، منی بەباوکی خۆی بانگ کرد و منیش بەهۆی بیرەوەری بەهێزی ئەو منداڵە کە هێشتا منی لەبیر نەچووەتەوە سەرم سوڕما.

"مریت"وتی: دایکی ئەم منداڵە کۆچی دوایی کردووە، لەبەرئەوەی من بردومە بۆئەوەی خەتەنەی بکەم، ئەرکی بەخێوکردنیشی لەئەستۆی مندایە، منیش ناچارم چاودێری لێبکەم.

"تهوت"زۆر زوو لەلای هەموو کڕیارانی مەیخانەی"کلکی تیمساح"دا خۆشەویست بوو و هەریەك لە کڕیارە هەمیشەییەکانی مەیخانە، بۆئەوەی من خۆشحاڵ بکەن، بەپێویستیان دەزانی کە دیاریەك یان کەرەستەی یاریەك بۆ ئەو منداڵە بکڕن.

ئەوکات"تهوت"هات بۆماڵەکەی خۆم و"موتی"خزمەتکاریشم کە بەردەوام دەیویت من دەبێت ببمە خاوەنی منداڵێك، بۆیە بەبینینی ئەو منداڵە زۆر خۆشحاڵ بوو.

کاتێك من"تهوت"م دەبینی کە لەژێر درەختەکاندا یاری دەکات یان لەگەڵ منداڵەکاندا لەکۆچە و کۆڵاندا ڕادەکات، سەردەمی منداڵی خۆم لە"تبس"دا دەهاتەوە یاد و ئەوەم بەبیر خۆم دەهێنایەوە کە منیش وەك"تهوت" لەسەردەمی منداڵیدا زۆر حەزم لەیاری دەکرد.

"تهوت"بەهۆی مانەوەی لەماڵەکەمدا زۆر خۆشحاڵ دیار بوو و منیش لەشەودا ئەوم لەتەنیشت خۆمەوە دادەنیشاند و سەرەڕای ئەوەی هێشتا منداڵ بوو وانەم پێ دەوت.

زۆر زوو ئاگاداری ئەوە بووم کە "تهوت" منداڵێکی زۆر زیرەك و هۆشیارە و زۆر زوو فێری وێنە و هێماکان دەبوو، بۆیە بڕیارم دا بینێرمە باشترین قوتابخانەی شاری"تبس"بۆئەوەی لەو قوتابخانەیەدا لەگەڵ منداڵە وەجاخزادەکاندا بخوێنێت، "مریت"یش بەبیستنی ئەم بڕیارەی من زۆر خۆشحاڵ بوو.

"موتی"هەموو ڕۆژێك بەهەنگوین شیرینی بۆ دروست دەکرد و خواردنی خۆشی پێدەدا و لەباوەشیدا دەیخەواند و چیرۆکی بۆ دەگێڕایەوە بۆئەوەی خەوی لێ بکەوێت.

ئەگەر بارودۆخی کۆمەڵایەتی"تبس"بەوشێوەیە تێك نەچوایە، من لەم ژیانە ئارامەدا هەستم بەخۆشبەختیەکی زۆر دەکرد. بەڵام بارودۆخی"تبس"تا دەهات خراپتر دەبوو و ڕۆژێك نەبوو لەشەقامەکاندا بەهۆی"ئامون"و "ئاتون" لەنێوان لەخەڵکیدا نەبێت بەشەڕ و یەکتری بریندار نەکەن.

بەرپرسانی فیرعەونیش ئەو کەسانەیان دەستگیر دەکرد کەلەشەڕەکاندا بەشداریان لەبەرگری کردنی خودای پێشووی"ئامون"دا دەکرد و بەکەشتی یان لەڕێی وشکانیەوە دەیانناردن بۆ کانە کانزان، ئەگەر ژن بوایەن ئەوا دەیانناردن بۆ کێڵگەی"ئاتون" بۆئەوەی لەوێ خۆیان بەکاری کشتوکاڵەوە سەرقاڵ بکەن. بەڵام کاتێك ئەم ژن و پیاوانەیان لە"تبس"دور دەخستەوە، ئەوان وەك پاڵەوانێکی شەهید ڕێگای کانە کانزاکانیان دەگرتە بەر و خەڵکی گوڵیان بۆ هەڵدەدان و سوژدەیان بۆ دەبردن و دورخراوەکانیش دەستیان بۆ ڕادەوەشاندن و دەیانوت: ئێمە دەگەڕێینەوە و بەشێك لەخوێنی"ئاتون"دەڕێژینە سەر زەوی و بەشێکیشی دەڕێژینە ناو پێکەوە و وەك ئاوجۆ دەیخۆنەوە.

خەڵکی بەشێوەیەك پشتگیریان لەدور خراوەکان دەکردن کە سەرەڕای ئەوەی جنێو و قسەی سوکیان بە بە"ئاتون"دەوت، پاسەوانەکان نەیاندەوێرا بەهۆی ئەو قسانەیان لێیان بدەن، چونکە دەیانزانی لەهەمان ئەوکاتەدا بەدەستی خەڵکی بەکوشت دەدرێن.

*بەشی چل و یەکەم*

## لە"تبس"دا جەنگ لەنێوان"خاچ و شاخ"دا بەرپا بوو.

هێمای پەیرەوانی"ئاتون"ی خودای نوێ"خاچی ژیان" بوو و ئەم خاچەش یان بەشێوەی ملوانکەیەك دەیانکردە ملیان یان لەسەر جلەکانیان وێنەی خاچێکیان دەکێشا.

پەیرەوانی"ئامون"ی خودای پێشووش،"شاخ"ێك هێمای سەرەکیان بوو، فیرعەونیش نەیدەتوانی شاخ لەسەرکردن قەدەغە بکات، چونکە لەو ڕۆژەوەی نەتەوەیەك لەمیسردا هاتووەتە بون، هەڵگرتنی شاخ یەکێکە لەجوانکاریەکانی پیاو و هیچ خودا و فیرعەونێك نەیدەتوانی ئەم جوانکاریە سروشتیە قەدەغە بکات.

پیاوەکان شاخێك هەندێکاتیش دوو شاخیان لەسەر دەکردو شاخ یان شاخەکانیان لەشەڕەکاندا، بەچەکێکی هەڕەشە ئامێز لەقەڵەم دەدرا.

من لەسەرەتادا نەمدەزانی پەیرەوانی"ئامون"بۆچی شاخیان کردووەتە هێمای سەرەکی خۆیان، بەڵام لەدواییدا ئاگادار بووم کە شاخ یەکێکە لە ناوە مەزنەکان و واڵاکانی"ئامون"[٢٣].

پەیرەوانی"ئامون"بەشاخەکانیان پەلاماری دەرگای فرۆشگای پەیرەوانی "ئاتون" یان دەدا و دەیانکردەوە و سەبەتگەلێکی پڕ لەمیوە و سەوزیی و ماسیان ژێراوژور دەکرد و هاواریان دەکرد ئێمە شاخمان هەیە و ورگی"ئاتون"پارچە پارچە دەکەین....

---

[23] لەکۆندا خوداکانی میسر دوو جۆر ناویان هەبوو یەکێکیان ناوێکی ئاسایی کە هەموو خەڵکێك پێی ئاشنا بوو و هەر بەو ناوەش بانگیان دەکرد، ناوەکەی تریان ناوێکی تایبەت یان ناوێکی واڵا بوو کە کاهینەکانی ناوی خودایان بەو ناوە بانگ دەکرد و هەندێك لەخودا کۆنەکانی ئەو سەردەمەی میسر تا بیست ناوی واڵایان هەبوو.

ئێمە پەیڕەوانی"ئامون"ین و"ئامون" شاخی پێداوین، بۆئەوەی سینە و ورگی دژمنانی پێ هەڵدڕین.

کاتێك ئاژاوەگێڕی شاخدارەکان گەشتە ئاستێك کە پەیڕوانی"ئاتون"بینیان ناتوانن بەوشێوەیە بژین، بۆیە هەوڵی ئەویان دا خاچگەلێك لەکانزاکان دروست بکەن کە سەری درێژی ئەو خاچە وەك چەقۆ بێت.

لەبەرئەوە هەندێك چەقۆیان دروست کرد کە دەستگیرەکەی وەك دوو شاخەی خاچەکە وابوو و خودی چەقۆکەش سەری درێژی ئەو خاچە بێت و ئەم چەقۆیانە لەژێر شەرواڵ یان لەژێر کراسەکەیانەوە دەیانبەست بەکەمەریانەوە و هەرئەوەی شاخدارەکان هەوڵی ئازاردانیان بدایەن، چەقۆکانیان دەردەهێنا و پەلاماری شاخدارەکانیان دەدا.[24]

ناکۆکی نێوان"ئاتون"و"ئامون"و شاخ و خاچ، بەشێوەیەك لە"تبس"دا بەرفراوان بوو کە بەهۆی ئەم ناکۆکیەوە کوڕ لەباوك و ژن لەهاوسەر لەیەکتر جیادەبونەوە.

ئەو ڕۆژەی خۆم کرد بە"تبس"دا وام دەزانی کە"تبس"شاری"ئامون"ە و لەوێدا هیچ کەسێك لایەنگری"ئاتون"نیە، بەڵام دوای ئەوەی خۆم کرد بەشاری"تبس"دا و چەند ڕۆژێك مامەوە پەیم بەهەڵەکەی خۆم برد و ئاگاداری ئەوە بووم کە خودای نوێ لە"تبس"دا لایەنگرێکی زۆر بەتایبەت لەنێو لاوان و نۆکەران و کرێکارەکاندا هەیە.

خودای نوێ لەبەرئەوە لەنێو لاو و کرێکار و نۆکەراندا لایەنگری پەیدا کردبوو چونکە شتگەلێکی دەوت کە ئەم جۆرە چینە زۆر پێیان خۆش بوو ئەم جۆرە قسانە ببیستن. بۆ نمونە لاوەکان بۆئەوەی دژایەتی پیرەکان بکەن لایەنگری ئەو بیروباوەڕە نوێیەیان دەکرد و کرێکار و نۆکەرەکانیش بۆئەوەی دژایەتی دەوڵەمەندەکان بکەن پەیوەندیان بەخودای نوێوە دەکرد و خودای نوێش بەتایبەت لەنێوان کۆڵبەرانی لەنگەرگای"تبس"و کرێکارانی چنین و دەباغخانە(کارگەی پێست خۆشە کردن) و نۆکەراندا لایەنگرێکی توندڕەوی زۆری پەیدا کردبوو، چونکە ئەم چینانە زیاد لەچینەکانی کرێکاران زەحمەتیان دەکێشا و هەستیان بە بەشمەینەتی دەکرد، ئەوان

[24] تائێستاش دەستەی شمشێر و کێردی هەندێك لەمیرنشینەکانی ئەورووپا لەشێوەی خاچدایە و ئەم نەریتە لەمیسر و "کریت"ەوە بەشوێنەکانی تردا بڵاو بووەتەوە و خاچ ماوەیەك پێش"مەسیح"یش هێمای سەرەکی ئاینی نەتەوەکان بوو.

نەیانبیست کە خودای نویێ وتویەتی دەبێت جیاوازی لەنێوان دەوڵەمەند و هەژار و خاوەندار و نۆکەر و کرێکار و خاوەنکاردا لەناو ببرێت و وایان دەزانی دوای ئەوە دەست بەسەر سەروەت و سامانی دەوڵەمەندەکاندا دەگرن کرێکاری و نۆکەرایەتیان پێدەکەن.

لەنێوان پەیڕەوانی توندڕەوی خودای نوێدا، من هیچ چینێکم لەچینی دزەکانی گۆڕستانی شاری مردووەکان"گۆڕستانی تبس" وەفادارتر نەبینی، دزی گۆڕستانەکان دەیانزانی بەهۆی ئەوەی فیرعەون ڕقێکی زۆری لەخودای پێشووە، چیتر پارێزگاری لەشاری مردووەکان ناکات، لەبەرئەوەی ناوی خودای پێشو بەسەر گۆڕ و کاسە و جلوبەرگ و کەشتی مردووەکاندا هەڵکۆڵراوە.

ئەمانە دەیانوت ئێمە دەڕۆین بۆئەوەی ناوی"ئامون"لەسەر گۆڕەکان پاك بکەینەوە، بەڵام مەبەستی ئەوان تاڵانکردنی شتومەکی گرانبەهای گۆڕەکان بوو و شتە کێش سوکەکانیشیان دەهێنا بۆ مەیخانەی"کلکی تیمساح"و لەژوری تایبەتی ئەو مەیخانەیەدا دەیانفرۆشت بەسەوداگەرو بازرگانەکان.

کۆمەڵێکی تریان کە فەرمانەکانی خودای نوێیان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان دەقۆستەوە، ئەو کەسانە بون کە پەیڕەوانی خودای پێشویان پیشانی کاربەدەستانی فیرعەون دەدا، بۆئەوەی دەست بەسەر سەروەتو سامانیاندا بگرن. بەڵام کاربەدەستانی خودای نوێش دەیانزانی ئەگەر ڕۆژێك گۆڕانکاری بەسەر بارودۆخدا بێت و خودای نویێ سەرنگون ببێت و خودای پێشوو دەستەڵات بگرێتەوە دەست، بێ ئەملا و لا دەیانکوژن.

ئەوەبوو بۆئەوەی پارێزگاری لەحکومەتی خودای نویێ بکەن، هەوڵیان دەدا کەسە لاواز و هەژارەکان بەبەردەوامی بەناونیشانی ئەوەی لایەنگری خودای پێشوون، پیشانی کاربەدەستانی فیرعەون بدەن، کاربەدەستانی"تبس"یش دەقاودەق وەك کاربەدەستانی شاری"ئاسۆ"کاریان دەکرد.

ئەمانە شاخدارە بەهێزەکانیان-کە بەئاشکرا لایەنگری خۆیان بۆ خودای پێشوو دەردەبڕی-دەستگیر نەدەکرد، چونکە دەترسان بکوژرێن یان بریندار بکرێن، بەڵام کرێکارێك یان کاسپکارێکی هەژار کاتێك بێ هیچ مەبەستێك ناوی"ئامون"ی بهێنایەتە زمان، دەستگیریان دەکرد و ڕەوانەی کانەکانزاکانیان دەکرد.

شەوانە لایەنگرانی شاخ یان خاچ لە مەیخانە تایبەتەکانی خۆیانەوە دەهاتنە دەرەوە، چونکە پەیڕەوانی"شاخ و خاچ" لەمەیخانەیەکی تایبەت بەخۆیان ئاوجۆیان دەخواردەوە و ئەم دوو دەستەیە، لەشەقامەکانی"تبس"دا دەستیان دەکرد بەهاتوچۆ کردن و چرای سەر شەقامەکانیان سەرنگون و مەشخەڵەکانیان خامۆش دەکرد و بەدڕەفتاریان دەنواند، ئەگەر دو دەستەی دژ بەیەك بگەیشتنایە بەیەکتری، لەگەڵ یەکتردا بەشەڕ دەهاتن و چەند کوژراوێکیان لەدوای خۆیانەوە بەجێ دەهێشێت.

ئەوکەسانەی کە لەشوێنە گشتیەکاندا سەرقاڵی کارکردن بوون، یان لەشەقامەکان بەدوای کارێکدا بگەڕایەن، بەردەوام شاخ و خاچێکیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵدەگرت، ئەگەر بیانزانیایە خاوەنکارە کاتیەکەیان شاخدارە، شاخەکەیان پێنیشان دەدا و کاتێکیش بیانبینیایە کابرای خاوەنکار خاچدارە خۆیان بەپیڕەوانی خاچ پێ دەناساند.

لەنێوان لایەنگرانی خودای نوێ و کۆندا کەسانێك هەن کە هەم لە"ئامون"بێزار بون و هەم لە"ئاتون". ئەمانە ئارەزوی ئەوەیان دەکرد کە ئاشتی و ئارامی لە"تبس"دا بەرقەرار ببێت بۆئەوەی بتوانن خۆیان بەکار و کاسپیەوە سەرقاڵ بکەن، بەڵام بەم ئارەزووەی خۆیان نەدەگەشتن.

ئەم چینە نەیاندەتوانی پارێزگاری لەبێلایەنی خۆیان بکەن، چونکە لەهەردوو لاوە هێرشیان بۆ دەکرا و ناچار دەبون بەلەبەرچاوگرتنی بارودۆخی ژیان و بەرژەوەندی و پارێزەران و دۆستانی خۆیان، یان لایەنگری شاخ بن یان لایەنگری خاچ.

"کاپتا"ماوەیەك لەبەرامبەر هەردوو دەستەدا بەرگری لەخۆی کرد و هیچ هێمایەکی بۆ مەیخانەکەی خۆی هەڵنەبژارد. ئەو"کلکی تیمساح"ی بەباشترین هێمای مەیخانە دەزانی، بۆئەوەی بتوانێت هەم باج لە شاخدارەکان وەرگرێت هەم لە هەڵگرانی خاچ.

بەڵام شاخدارەکانی دەیانزانی کە مەیخانەکەی ئەو شوێنی کۆبونەوەی کۆمەڵێکی زۆری دزەکانی گۆڕستانە، بۆیە نەیاندەهێڵا"کاپتا"بۆ ساتێکیش ئاسودە بێت، بەکورتیەکەی نەیاندەوێرا ڕۆژ یان شەو هێرش بۆ مەیخانەکەی ئەو ببەن. چونکە دەیانزانی کە کەسانێکی بەهێز پارێزگاری لە مەیخانەکەی"کاپتا"دەکەن، بەڵام لەشەودا بەسەر دیوارەکانەوە وێنەی شاخیان بەشێوەیەکی گاڵتەئامێز دەکێشا، بۆیە

بۆماوەیەکی زۆر"کاپتا" هەموو بەیانیەك ناچاربوو خەریکی کوژاندنەوەی ئەم جۆرە وێنانە بێت.

دوای ئەوەی لە"تبس"دا نیشتەجێ بوم، ئاگاداری ئەوە بووم کە تەنها نەخۆشە کۆڵەبەرەکانی لەنگەرگا و نۆکەرکان سەردانم دەکەن، لەکاتێك جاران نەخۆشەکانی ئەم ناوچەیەش سەردانیان دەکردم.

ڕۆژێکیان دوو کەس لەپیاوانی دانیشتوی ناوچەکەی ئێمە لەشوێنێکی چۆڵدا چاویان بەمن کەوت و وتیان: "سینۆهە" ئێمە زۆر لەتۆ دڵگرانین و منداڵ و ژنەکانیشمان نەخۆشن و پێویستمان بەزانستی تۆیە، بەڵام دەترسین سەردانت بکەین، چونکە تۆ لەژوری پزیشکیەکەتدا خاچێکت بەملتەوە هەڵواسیوە، ئەمەش بۆ ئێمە هەڕەشە ئامێزە، ئەگەر ئێمە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانمان سەردانت بکەین، لایەنگرانی شاخ ڕقمان لیّ هەڵدەگرن.

ئێمە لەنەفرەتی"ئامون"ناترسین، چونکە بەتەواوی لەجەنگی خوداکان بێزار بوین و نازانین ئەم خودایانە چییان لەگیانی ئێمە دەوێت و بۆچی وازمان لیّ ناهێنن کە بەوشێوەیەی خۆمان حەزی لیّ دەکەین بەردەوامی بەژیانی خۆمان بدەین.

بەڵام ئەگەر شاخدارەکان بزانن کەئێمە بۆچارەسەرکردن سەردانی نەخۆشخانەکەی تۆ دەکەین، بەکوشتمان دەدەن یان ئەو کاتانەی ئێمە لەماڵ نین و لەدەرەوە سەرقاڵی کارێکین دێن لەمنداڵەکانمان دەدەن یان دەرگای ماڵەکەمان دەشکێنن، چونکە هەموو کەسێك دەزانێت کە تۆ پزیشکی تایبەتی فیرعەونیت و لایەنگری خودای"ئاتون"ی و ئەو خاچەی کەلەملت کردووە، پێناسەی بیروباوەڕی تۆ دەکات. بەڵام کۆڵبەرەکان لەنگەرگاو نۆکەرەکان بێئەوەی لەشاخداران و هەڵگرانی خاچ بترسن سەردانی نەخۆشخانەکەمیان دەکرد و هەر ئەوکاتە گەر بمویستایە بڵێم مرۆڤ ئەگەر کۆڵبەر بێت یان نۆکەر دەتوانێت بەئازادی بژیت، ئەوانیش لەوڵامدا دەیانوت: "سینۆهە"تۆ هێشتا هەستت بەئازاری دارکاری و قامچیت بەپشتتەوە نەکردووە، ئەگینا تێدەگەشتی کاتێك مرۆڤ کرێکار بێت یان نۆکەر مەحاڵە بتوانێت بەئازادی بژی، تائەوکاتەی مرۆڤ کار بۆ کەسانی تر بکاتو بەرهەمی کاری خۆی بداتە دەست کەسانی ترەوە و لەبەرامبەردا تەنها تیکەیەك نانو جامێك ئاوجۆ لەبەرامبەر کاری ئەو ڕۆژەی وەك موچەیەك وەرگرێت، ئازاد نیە.

سەرەڕای ئەوەش ئێمە تۆمان خۆشدەوێت، چونکە تۆ کەسێکی سادە و باشیت و بێئەوەی هیچ دیاریەکمان لێوەرگریت، چارەسەرمان دەکەیت و ئەو ڕۆژەی جەنگ لە"تبس"دا بەرپا دەبێت و لایەنگرانی"ئامون"و "ئاتون" دەست بەکوشتنی یەکتری دەکەن-چونکە ئەو ڕۆژە هەردێت- تۆ وەرە بۆ ناوچەی لەنگەرگا، بۆئەوەی لەوێ بتشارینەوە و لەهەڕەشەی مەرگ یان برینداربون بتپارێزین.

سەرەڕای ئەوەی هەموویان دەیانزانی من لایەنگری"ئاتون"م، نە هیچ کەسێك پەلاماری دەدام و نە بەسەر داروديواری ماڵەکەمدا وێنەی گاڵتەئامێزیان دەکێشا، چونکە هێشتا فیرعەون بەلایانەوە زۆر بەڕێز بوو، بۆیە وەك ئەو ڕێزیشیان لەپزیشکە تایبەتەکەشی دەگرت.

سەرەڕای ئەوەش تەواوی دراوسێکانم منیان دەناسی و پارێزگاریان لێدەکردم و کاربەدەستانی سەربازی فیرعەونیش لە"تبس"دا پاسەوانی منیان دەکرد، بۆیە شاخدارەکان نەیاندەوێرا هێرش بۆ کەسێك بکەن کە هەموو خەڵکی پارێزگاری لێدەکات.

ڕۆژێکیان"تهوت"بەدەم گریانەوە لەکۆڵانەوەی خۆیی کرد بەماڵدا و"موتی"بینی کە خوێن لەلوتی ئەو منداڵە دەڕژێت و دانێکیشیان شکاندووە.

کاتێك"موتی"منداڵەکەی دەشۆرد بۆئەوەی خوێن لەسەر و سینەی پاك بکاتەوە بەدەم گریانەوە لێی دەپرسی: بۆچی بریندار بویت؟

"تهوت" وتی: منداڵانی"چنین" کە هاوڕێی و هاویاری من بون، لێیاندام و ددانێکیشیان بۆ شکاندم و وتیان لەبەرئەوەی تۆ لایەنگری"ئاتون"یت دەبێت دارکاری بکرێیت.

"موتی"دارێکی گرت بەدەستیەوە و کەوتە ڕێ و وتی: هەرچی منداڵی"چنین"هەیە چ لایەنگری "ئامون" بن یان لایەنگری"ئاتون" دەبێت دارکاری بکرێن.

دوای ئەوە یەکسەر هاواری پێنج منداڵی"چنین" لەکۆڵان بەرز بویەوە و کاتێك دایك و باوکی منداڵەکان هاتن بۆئەوەی منداڵەکانیان لەلێدان بپارێزن"موتی" کەوتە دارکاری کردنی ئەوانیش و کاتێکیش گەڕایەوە بۆماڵ، بینیم لەتوڕەییاندا ڕوخساری ڕەشداگەڕاوە، لەوکاتەدا ویستم تێیگەیەنم کە کینە و ڕەقەبەرایەتی باش نیە، چونکە

تورەیی دەبێتە هۆی وروژانی تورەی‌و کینەش دەبێتە هۆی وروژانی کینە، بەلام"موتی"گوێ بەقسەکانی من نەدا.

ڕۆژی دوایی"موتی"دوای ئەوەی تورەییەکەی نیشتەوە، نانی شیرین کە بەهەنگوین لێی نابوو برد بۆ منداڵانی چنین و دایك و باوکیان و دوای ئەوە لەگەڵیاندا ئاشت بویەوە.

چیتر لەو ڕۆژە بەدواوە خێزانەکانی چنین بونە هاوڕێی"موتی"و"تهوت"و منداڵەکانی چنینیش بەبەردەوامی لەگەڵ"تهوت"دا یاریان دەکرد، بێئەوەی لێیی بدەن و بریینداری بکەن و "موتی"یش هەرکاتێك شیرنی بە"تهوت" بدایە، بەشی منداڵەکانی چنینیشی دەدا.

کاتێك مانەوەم لە"تبس"دا درێژەی کێشا، جارێکیان بەفەرمانی فیرعەون سەردانی کۆشکی زێڕینم"کۆشکی فەرمانڕەوایی"کرد، ئەگەر فیرعەون فەرمانی پێ نەدایام بۆئەوەی بڕۆم بۆ ئەوێ، لەترسی"مهو نفر" پێم نەدەنایە ئەو کۆشکەوە، بەلام لەبەرئەوەی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی فیرعەون بوم، ناچاربوم بەنهێنی، بێئەوەی"مهو نفر" بزانێت خۆم بکەم بەو کۆشکەدا، بۆئەوەی چاوم بە"ئامی"کاهینی مەزنی"ئاتون"بکەوێت.

ئەو ڕۆژەی خۆم کرد بەناو کۆشکدا وەك ئەو کەروێشکەی کە لەترسی شەهێن لەچڕەدارێکەوە دەڕوات بۆ چڕەدارێکی تر، منیش لەترسی"مهو نفر"خۆم لەژێر درەختەکاندا شاردەوە تائەوکاتەی چاوم بە"ئامی"کاهینی مەزن کەوت.

کاهینی مەزنی"ئاتون"پێی وتم: "سینۆهە"سەرەڕای ئەوەی من سەرۆکی کاهینەکانی پەرستگای"ئاتون"م، بەلام ڕەفتاری فیرعەونم پێ باش نیە و پەسەندی ناکەم، چونکە وا دیارە ئەم پیاوە نەزانێت چی دەڵێت و دەرئەنجامی ئەو فەرمانانەی کە دەریدەکات چیە؟ ئەگەر دەتوانی بیخەرەوە سەر ڕێی ڕاست و ئەگەر ناشتوانی، لەڕێی دەرمانە خەوهێنەرەکانەوە بیخەوێنە بۆئەوەی بەبەردەوامی خەوی لێبکەوێت، بۆئەوەی نەتوانێت ئەم فەرمانە سەیرانە دەربکات.

لەمڕۆدا بەهۆی بڕیارە سەیرەکانی فیرعەونەوە، دەستەلاتی حکومەت لەدەست دەرچووە، چونکە فیرعەون سزای لەسێدارەدانی لابردووە و وتویەتی چیتر گوێ دز و پیاوکوژەکان نەبڕن و دارکاری نۆکەرانی هەڵهاتوو نەکەن. لەمحاڵەتەدا بەچ شێوەیەك

دەتوانرێت چاوەڕێی ئەوە بکرێت کە خەڵکی ڕێز لەیاساکان بگرن، ئەویش ئەو یاسایانەی کە هەموو ڕۆژێك بەئارەزوی فیرعەون گۆڕانکاریان تێدا دەکرێت.

لەلایەکەوە فیرعەون پەیمانی ئاشتی لەگەڵ سوریادا مۆر دەکات و منیش بەپێی ئەو فەرمانە ئەوەم لەسەرە کە گەنم بنێرم بۆ سوریا. لەلایەکی ترەوە"هورم هب" ئەو کەشتیانەی گەنمیان بارکردووە و دەبێت بڕۆن بۆ سوریا لە"ممفیس"دا ڕایان دەگرێت، کاتێك لێی دەپرسین بۆچی ناهێڵێت ئەو کەشتیانە بڕۆن، دەڵێت فیرعەون فەرمانی داوە چیتر لەمەودوا نابێت گەنم لەمیسرەوە بڕوات بۆ سوریا.

خۆزگە من هەر لەیەکەم ڕۆژەوە لە"شاری خۆر"دەرنەچومایە و بەپێی هاندانی دایکی فیرعەون کەخودی"سینۆهە"ئاگاداری مەرگی بوو، بیرم لەبەدەستهێنانی پلەوپایە و پلەوپایە خواز نەدەکردەوە، بۆئەوەی لەمڕۆدا خۆم لەگرفتاریەکاندا نەبینیایە.

"سینۆهە"کەسێك پەیی بەچێژی فەرمانڕەوایی برد، بەبەردەوامی خوازیاری دەستەڵات و فەرمانڕەواییەکی زیاتر دەبێت و پلەوپایەخوازیش یەکێکە لە مەزنترین غەریزەکانی مرۆڤ، گەرچی لەهەموو کەسێکدا نیە، بەڵام ئەو کەسانەی کە هەڵگری ئەم غەریزەیەن، هیچ کاتێك بەئاسودەیی دانانیشن و کەسێکی پلەوپایەخواز بۆ بەدەست هێنانی پلەوپایە و دەستەڵات، پەنا بۆ هەموو کارێك دەبات تەنانەت ئەوەی تۆ بیرت بۆی ناڕوات، بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێین کاتێك مرۆڤ گەشتە پلەوپایەی خۆی، مەزنترین چێژ لەژیان وەردەگرێت، ئەگەر من لەمیسردا دەستەڵات و پلەوپایەم بەدەست بهێنایە، نەمدەهێڵا بارودۆخی میسر بگاتە ئەو ڕادەیە و ناکۆکیەکانم لەناو دەبرد، سەرەڕای ئەو ڕقەبەرایەتیەی کە لەنێوان"ئامون"و"ئاتون"دا هەیە، ئابڕو و کەسایەتی فیرعەنم بەرز ڕادەگرت و یەکێك لەو کارانەی کە ئەرکی منە ئەوە دەبوو کە"ئاتون"م دەکردە خاوەنی شێوە و پەیکەرێك، چونکە نەتەوەی میسر ناتوانن خودایەك کە هیچ شێوەیەکی نیە و نابینرێت بپەرستن.

منیش لە"ئامی"م پرسی: ئایا بیرت لەجێنشینی فیرعەون کردووەتەوە و دەتەوێت کەسێکی تر بخەیتە جێگەکەی؟

"ئامی"سەری لەم قسەیە سوڕما و دوای ئەوەی دەستی بەرز کردەوە وتی: "سینۆهە" من کەسێکی خیانەتکار نیم کە بمەوێت فیرعەون لەدەستەلات بخەم و کەسێکی تر لەباتیدا دابنێم.

گەرچی هەندێکجار لەگەڵ کاهینەکاندا باسی فیرعەون دەکەم، بەلام ئەو جۆرە قسانەم بەمەبەستی بەهێزکردنی دەستەلاتی فیرعەونە، نەك سەرنگونکردنی تەختی فەرمانڕەوایی ئەو، بەلام"هورم هب"بەوشێوەی من هەستم پێکردووە بیر لەوە دەکاتەوە کە دەتوانێت ڕۆژێك ببێتە پادشای میسر. ئەم پیاوە سەرەڕای ئەوەی پشت بەنێزە دەبەستێت، بیر لەوە دەکاتەوە کە دەتوانێت هەرچی بوێت ئەنجامی بدات. بێئەوەی ئاگای لەوە بێت کە تەنها کەسێك کە هەڵگری خوێنی فیرعەونە و لەنەژادی فەرمانڕەوایانە دەتوانێت ببێتە پادشا و "هورم هب"یش لەنەژادی فەرمانڕەوایان نیە. من ئەگەر هەندێکات بیر لەئایندەی فەرمانڕەوایی بکەمەوە و بڵێم کە فیرعەون دەبێت لەڕوی هزر و ژیریەوە فەرمانڕەوایی بکات لەبەرئەوەیە کە باوکی"نفر تی تی"ی شاژنی میسرم و بەیەکێك لەئەندامانی فەرمانڕەوایی لەقەڵەم دەدرێم، بەلام"هورم هب"مافی ئەوەی نیە خەیاڵپلاوی دانیشتن لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی لەهزریدا پەروەردە بکات.

من زۆر سەرم لەم قسانە سوڕما و وتم: ئایا"هورم هب"دەیەوێت ببێتە پادشای "میسر"و فەرمانڕەوایی میسری خوار و سەرو بکات؟ ئەگەر ئەو پیاوە ئەم ئەندێشەیە لەهزریدا پەروەردە بکات، زۆر مایەی سەرسوڕمانە، چونکە خۆم ئەو ڕۆژەی کە"هورم هب"بۆیەکەم جار خۆی کرد بەکۆشکی فەرمانڕەواییدا بینی و بینیم کە جلوبەرگی هەژارانی لەبەردایە و جگە لە واشەیەك لەپێشیەوە دەفڕی، هیچ شتێکی تری نەبوو.

"ئامی"بەچاوەکانی لێم مۆڕ بویەوە، چونکە برۆیەکی پڕی هەبوو و بۆ ماوەیەك تەماشای کردم و وتی: "سینۆهە"هیچ کەسێك ناتوانێت ئەو نهێنیانەی لەڕۆحی ئەودا شاردراوەتەوە ئاشکرا بکات کە بیر لەچی دەکاتەوە، بەلام ئەگەر"هورم هب" بیەوێت بەرز بفڕێت، من لەئاسمانەوە دەیخەمە خوارەوە و دەیدەم بەزەویدا.

دوای ئەم گفتوگۆیە ماڵئاواییم لە"ئامی"کرد و دوبارە بەپێی فەرمانی فیرعەون ڕۆشتم بۆئەوەی چارم بەژنە جوانەکەی، شازادە خانمی"بابل"ی کە لە"بابل"ەوە بۆیان ناردبوو بکەوێت.

پادشای"بابل"هەرئەوەی مەراسیمی مارەبڕینی بەوەکالەت ئەنجامدا، شازادە خانمی ناوبراوی نارد بۆمیسر، بۆماوەی چەند ڕۆژێك شازادە خانم لەشاری"ئاسۆ"دا مایەوە، بەڵام"نفر تی تی"شاژنی میسر، فیرعەونی هانی ئەوەدا کە شازادە خانم لەشاری"ئاسۆ"وە بنێرێت بۆ"تبس"و لەکۆشکی زێڕینی فەرمانڕەواییدا نیشتەجێی بکات، چونکە"نفر تی تی" بەوشێوەی من هەستم پێکردبوو لەوە دەترسا کە شازادە خانمی"بابلی"ئەگەر لەشاری"ئاسۆ"دا بمێنێتەوە و فیرعەون لەگەڵیدا ڕابوێرێت سکی پڕ دەبێت و لەوانەیە کوڕێکی بۆ بهێنێت.

من خۆم کرد بەژورەکەیدا و وتم: شازادە خانم من لەلایەن فیرعەونەوە هاتوم، بۆئەوەی بزانم ئایا تۆ تەندروست و باشیت؟

شازادە خانمی بابلیش کە کەمێك فیری زمانی میسری بوبو، بەدەربڕینێکی شیرین قسەی دەکرد و لێی پرسیم: تۆ کێیت؟

وتم: من"سینۆهە"م پزیشکی تایبەتی فیرعەونم.

شازادە خانم کە بەپێی نەریتی ژنانی میسر دەژیا، بەواتا تاڕادەیەك جلی لەبەردا نەبوو وتی: سینۆهە تەماشاکە من چەنێك تەندروستم؟ و سەرم لەوە سوڕ دەمێنێ کە فیرعەون بۆچی سودی لەو تەندروستی و جوانیەی من وەرنەگرتووە و لەگەڵ مندا ڕای نەبوارد. من زۆر حەز دەکەم فیرعەون لەگەڵ مندا ڕابوێرێت، بۆئەوەی چیتر من بەکچێنی نەمێنمەوە و ئەوەشم بیستووە کە لەمیسردا ژنان دەتوانن لەگەڵ هەر پیاوێکدا کە پێیان خۆش بێت ڕابوێرن.

وتم: شازادە خانم کێ بەتۆی وتووە کە لەمیسردا ژن دەتوانێت لەگەڵ هەر پیاوێك کە خۆی حەزی لێبکات ڕابوێرێت؟

من ئەم قسانەم لەدەمی چەند ژنێك بیستووە و ئەوانە پێیان وتم: ژنی میسری دەتوانێت لەگەڵ هەرپیاوێك کە خۆی پێی خۆشە ڕابوێرێت، بەڵام بەمەرجێك پەیی بەم پەیوندیەی ئەو لەگەڵ پیاوانی تردا نەبرێت.

وتم: شازادە خانم، زۆر بەدەگمەن ڕوو دەدات کە ژنێك جیا لەهاوسەرەکەی خۆی لەگەڵ پیاوانی تردا ڕابوێرێت و کەسانی تر پەی بەم پەیوەندیەی نەبەن، بەتایبەت لەکۆشکی فەرمانڕەوایی میسردا، ئەم جۆرە پەیوەندیانە زۆر زوو خەڵکی لێی ئاگادار دەبن، لەبەرئەوەی هەر شازادە خانمێك کە لەیەکێك لەکۆشکەکانی فەرمانڕەواییدا

دەژیت، خاوەنی کۆمەڵێك خزمەتکارە کە ئەوانەش شەو و ڕۆژ لەچواردەوری ئەودان و چاویان بەپەیوەندیەکانی دەکەوێت کە لەگەڵ پیاوانی تردا دەیکات و تێدەگەن چ پیاوانێك بۆ بینینی سەردانی کۆشك دەکەن، ئەگەر شازادە خانمیش لەکۆشك بڕواتە دەرەوە دوبارە دەزانن بۆ کویێ دەڕوات و دەچێتە باوەشی چ پیاوێکەوە، بۆیە تۆ ناتوانی لەگەڵ پیاوێکدا هاوخەو بیت و بەهیوای ئەوە بیت ئەم بابەتە بەنهێنی بمێنێتەوە.

شازادە خانمی بابلی پێکەنی و وتی: کاتێك گەڕایتەوە بۆ شاری"ئاسۆ"لەزمانی منەوە بەفیرعەون بڵێ لەبەرئەوەی گۆزە لەنێوان من و ئەودا شکاوە، بەکچێنی مانەوەی من بێسودە و بێتاقەت و بێزارم دەکات و ئەویش دەبێت هەرچی زووتر لەم بێزاریە ڕزگارم بکات.

ئەوکات بابەتی گفتوگۆکەی گۆڕی و وتی: "سینوهە" کاتێك لەشاری"ئاسۆ"دا بوم لەدەمی ژنانی ئەویێ بیستم کە تۆ پزیشکێکی زۆر لێهاتویت، ئایا دەتوانی چارەسەری من بکەیت؟

وتم: شازادە خانم، مەگەر تۆ نەخۆشیت؟

کچی لاویش وتی: نەخێر بەڵام خاڵێکی بچوك بەجەستەمەوەیە، ئەگەر لەنزیکەوە تەماشای نەکەیت، ناتوانیت چاوت پێی بکەوێت و من حەز دەکەم تۆ ئەو خاڵەم بۆ لەناو ببەیت، چونکە بیستومە کە تۆ بەڕادەیەك لەنەشتەگەریدا لێهاتویت، کاتێك نەشتەرگەری دەکەیت نەخۆش چێژ لەو نەشتەرگەریەت وەردەگرێت، ئێستا پێم بڵێ ئایا حەز دەکەیت ئەم نەشتەرگەریەم بۆ بکەیت یان نا؟

تێگەشتم کە بابەتی خاڵ تەنها بیانویەکە و شازادە خانمی لاو دەیەوێت هانی ئەوەم بدات لەگەڵیدا ڕابوێرم و پەیم بەوە برد کە لەو ساتە بەدواوە وەستان لەژوری شازادە خانمدا زۆر هەڕەشە ئامێزە، چونکە ژنێکی لاو کاتێك بڕیاری ئەوە بدات پیاوێك فریوی خۆی بدات، لەماوەی نیو ترازوودا-بەواتا لەماوەی نیو کاتژمێردا- فریوی دەدات و پیاویش دەبێت هەر لەساتی یەکەمدا لێی هەڵبێت، ئەگینا بەدڵنیاییەوە شتێك ڕوو دەدات کە نابێت ڕوو بدات و من نەمدەتوانی لەگەڵ ژنێکدا ڕابوێرم کە خوشکی فیرعەون بێت.

ئەوەبوو وتم: من ناتوانم ئەم نەشتەرگەریەت بۆ بکەم، چونکە کەرەستەی نەشتەرگەریەکانم لەگەڵ خۆمدا نەهێناوە و پێش ئەوەی شازادە خانم شتێکی تر بڵێت لەو ژورە چومە دەرەوە و لەکۆشکی زێڕینی فەرمانڕەوایی هەڵهاتم.

سەرەڕای ئەوەی بەهۆی گەشتنی وەرزی هاوین و هەوای"تبس"یش زۆر گەرم بوبو، ویستم هەر لێرە بمێنمەوە، بەڵام فیرعەون لەشاری"ئاسۆ"وە بانگی کردم و پەیامی ئەوەی بۆ ناردبوم کە سەرئێشەکەی زیاتر بووە، دەبێت چارەسەری بکەم.

منیش بە"کاپتا"م وت: فیرعەون پەیامی ئەوەی بۆ ناردوم کە دوبارە توشی سەرئێشە بووە و هیچ گومانێك لەوەدا نیە کە ڕاست دەکات، چونکە فیرعەون درۆزن نیە، پێویستیشی بەوە نیە درۆ بکات، لەبەرئەوە من ماڵئاواییت لێدەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ شاری"ئاسۆ".

"کاپتا"وتی: گەورەم، من تا ئەو شوێنەی لەتوانامدایە گەنمم بۆ کڕیویت و دانەوێڵەکەم لەخەزێنەی چەند شارێکی جیاوازدا هەڵگرتووە کە ئەگەر خەزێنەی یەکێك لەگەنمەکان لەناو چوو ئەوانی تر بمێننەوە.

منیش بۆ تەنگانە بڕێك گەنمم کڕیوە و شاردومەتەوە، چونکە لەوانەیە بەهۆی وشکەساڵی ئایندەوە، دەست بەسەر هەموو خەزێنەکانتدا بگرن و بەسەر خەڵکی هەژاردا دابەشی بکەن، ئەگەر ئەمەش ڕوو بدات ئەوا تۆ سەرەڕای ئەوەش خاوەنی بڕێك گەنمی کە کاربەدەستانی فیرعەون ناتوانن بیدۆزنەوە.

من لەوباوەڕەدام کە لەمانگەکانی ئایندەدا کارەساتگەلێکی دڵتەزێن ڕوو دەدات، چونکە فیرعەون ناردنی گۆزەی خاڵی کۆنەکانی بۆ سوریا قەدەغە کردووە، هەروەها ناردنی گەنمی بۆ سوریا بەیەکجاری قەدەغە کردووە، بەڵام ئەگەر ناردنی گەنمیان بۆ سوریا قەدەغە نەکردایە، سەرەڕای نەبونی ئەو بڕیارەش هیچ کەسێك بیری لەناردنی گەنم بۆ سوریا نەدەکردەوە، چونکە گەنم لەبازاڕدا نەماوە بۆئەوەی کەسێك بیکڕێت و بینێرێت بۆ سوریا. من نازانم بۆچی ناردنی گۆزەی خاڵی کۆنیان بۆ سوریان قەدەغە کردووە و ئێمەیان لەم قازانجە بێبەش کردووە، بەڵام دەتوانین ئەم قەدەغەیە بەفێڵێك پێشێل بکەین، چونکە ئەگەر گۆزەکان پڕکەین لەئاو، چیتر یاسای گۆزەی خاڵی نایگرێتەوە و دەتوانین بیانێرن بۆ سوریا، بەڵام تێچونی بارکردن و گواستنەوەی گۆزەکان زیاتر دەبێت.

دوای ئەوەی ماڵئاواییم لە"کاپتا"کرد،هەروەها ماڵئاواییشم لە"مریت"و"تهوت"ی منداڵیش کرد و وتم: بەداخەوە ناتوانم ئێوە لەگەڵ خۆمدا ببەم بۆ"ئاسۆ"، چونکە فیرعەون فەرمانی داوە بەخێرا بگەڕێمەوە و ئەم ڕۆشتنە خێرایەشم ڕێی ئەوەم لێدەگرێت کە ئێوە لەگەڵ خۆمدا ببەم.

"مریت" وتی: ئەگەر تۆ بەپەلەش نەگەڕێتەوە، باش نەبوو من لەگەڵ خۆتدا ببەیت.

پرسیم: بۆچی؟

مریت وتی: ئەگەر گیایەکی بیابانی لەبیابانەوە بهێنیت بۆ ناو شار و لەزەویەکی بەپیتدا بینێژیت و هەموو ڕۆژێك ئاوی بدەیت، دوای چەند ڕۆژێك وشك دەبێت، چونکە ئەو گیایە بۆ بەردەوامی ژیانی پێویستی بە هەواو و خۆر و بۆنی بیابانە؟

ئیشقی من و تۆش بۆئەوەی بەبەردەوامی بمێنێتەوە نابێت تێکەڵی ژینگەی شاری"ئاسۆ" ببێت، چونکە لەوێ تۆ بەردەوام چاوت بەژنانی کاربەدەست و پاشاکان دەکەوێت و ئەوانیش بەبەردەوامی پێت دەڵێن کە لەنێوان من و ئەوان جیاوازیەکی زۆر هەیە، سەرەڕای ئەوەش بۆ پلەوپایەو کەسایەتیشت باش نیە کە لەشاری "ئاسۆ"دا لەگەڵ ژنێکدا بژیت کە خزمەتکاری مەیخانە بووە و پێش تۆ پیاوانی تر لەگەڵیدا ڕایانبواردووە.

وتم: "مریت"تائەوکاتەی لەپاڵ تۆدا بم خۆم بەئاسودە دەبینم، بەڵام کاتێك لێت دور دەکەومەوە، تێدەگەم کەوەك ئەو کەسە تینوەی کە پێویستی بەئاوە، منیش بەهەمان شێوە پێویستم بەتۆیە، و لەنێوان ئەو ژنانەی کە تائێستا ناسیونم، تەنها تۆیت کە من لەتەنیشت تۆدا هەست بەتەنهایی ناکەم، بەڵام لەلای ژنەکانی تردا هەست بەتەنهایی دەکەم و بەهیوای ئەوەم کە بتوانم بەزویی بگەڕێمەوە بۆ لات و چیتر لە"تیس"دور نەکەومەوە.

"مریت"وتی: من دەزانم ئەگەر بڕۆیت بۆ"ئاسۆ"ناگەڕێیتەوە بۆ ئێرە.

وتم: ئایا لەوباوەڕەدایت کاتێك من دەڵێم لەوێوە دەگەڕێمەوە بۆ ئێرە، درۆت لەگەڵدا دەکەم.

"مریت"وتی: نەخێر..."سینۆهە"تۆ کەسێکی درۆزن نیت، بەڵام من بیستومە کە فیرعەون توشی نەخۆشیەکی سەخت بووە و کۆمەڵێك لەلایەنگرانی ئەویان بەجێ

هێشتووە، بەڵام تۆ کەسێك نیت کە لەڕۆژی نەخۆشی و بەدبەختدا فیرعەون بەجێ بهێڵێت، بۆیە لەشاری"ئاسۆ"دا دەمێنیتەوە و هەر لەبەرئەوەش ناتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ"تبس".

وتم: "مریت"من ئامادەم لەگەڵ تۆدا ئەم شارە بەجێ بهێڵم و لەشوێنێکی تردا منو تۆو "تهوت" بەخۆشبەختی بژین و چیتر من لە جەنگی خودای تازە و کۆن و شێتیەکانی فیرعەون بێزار بوم و وا هەست دەکەم کە لەشوێنەکانی تردا بێجگە لە میسر، دەتوانین بژین.

"مریت"زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: "سینۆهە"من چێژم لەو قسانەی تۆ وەرگرت، لەبەرئەوەی ئەم گوتەیەت ئەوە دەسەلمێنێت کە منت خۆش دەوێت، بەڵام تۆ کاتێك ئەمانە دەهێنیتە زمان بیر لەدەرئەنجامەکانی ناکەیتەوە و ئاگاداری ئەوە نیت کە ئەو کەسەی لەمیسردا گەورە بووە و ئاوی"نیل"ی خواردبێت، بەتایبەت ئەگەر لەخودی "تبس"یشدا گەورە بوبێت، بێجگە لەئێرە لەهیچ شوێنێکی تردا هەست بەخۆشبەختی ناکات.

چیتر دوای ئەوەی لەگەڵ تۆدا ئەم وڵاتە بەجێدەهێڵم و بەتێپەڕبونی تەمەنم قەڵەو و پیر دەبم و وەك میوەیەکی وشك کراوە چرچ و لۆچتر دەبم و تۆش هەرکاتێك تەماشام بکەیت دەتۆقێیت و گلەیی لەخۆت دەکەیت کە بۆچی لەگەڵ مندا میسرت بەجێهێشت و خۆشی و ئاسودەیی خۆت لەنیشتمانەکەتدا کردە قوربانی ئارەزویەکی زووتێپەر.

وتم: "مریت"نیشتمانی من تۆیت و من لەپاڵ تۆدا هەست بەئاسودەیی دەکەم و ئاوی"نیل"یش کاتێك لەدەمی مندا پاراو و خۆشە کە لەتەنیشت تۆوە بم. تۆ دەڵێیت کاتێك پیر بویت لەوە پەشیمان دەبمەوە کە بۆچی هەموو تەمەنی خۆم لەگەڵ تۆدا تێپەڕاند یان لەگەڵ تۆدا میسرم بەجێهێشتووە، بەڵام دەبێت کەسانێك ئەم جۆرە بیرانە بێت بەهزریاندا کە تازە بەیەك گەشتبن و دۆستایەتی یەکتریان تاقی نەکردبێتەوە. ئەگەر بڕیار بوایە ژنان و ژینگەی دەوروبەر بتوانن من لەبەرامبەر تۆدا بێوەفا بکەن، ئێستا ئەو کارەیان کردبوو، لەبەرئەوەش هەرگیز تێرت لێناخۆم و ئەو ڕۆژە نایەت کە لێت پەشیمان ببمەوە کە بۆچی لەگەڵ تۆدا ژیانم بردووەتە سەر......

"مریت"وتی: کاتێك دەڵێم ڕۆژێك دێت گلەی لەخۆت دەکەیت کە بۆچی لەگەڵ مندا دەژیت، چونکە ژیان نەگۆڕە و دوبارەبونەوەی هەمان ساتەکانی پێشووە،

"سینۆهە"پیاو بەشێوەیەك لەلایەن خوداوە دروست کراوە کە لە دە ساتی جیاوازی یەك لەدوای یەکدا خۆشترین و خۆشبونترین خواردن بخوات، ئارەزوی ئەوە دەکات کە خواردنەکانی تریش تاقی بکاتەوە، ئەگەر لەخواردنەکانی دوێنێ و پێرێش ناخۆشتر بێت. پیاویش هەروەك چۆن لەخواردنە دوبارە بووەکان تێردەبێت، بەهەمان شێوە بێزار دەبێت لەوەی بەردەوام لەگەڵ تەنها ژنێکدا کات بەسەر ببات، بەتایبەت ئەگەر بزانێت ئەو ژنە زۆر پیر و قەڵەو بوبێت. سەرەڕای ئەوەش ئەگەر نهێنیەك بونی نەبوایە، ئەوا من لەگەڵ تۆدا دەهاتم بۆئەوەی میسر بەجێ بهێڵین و لەوڵاتێکی تردا بژین، بەڵام ئەم نهێنیە ڕێ لەم ڕۆشتنەم دەگرێت و لەوانەیە تۆ ئاگاداری ئەو نهێنیە ببیت، چونکە من بەبۆنەی تۆوە تا ئەمڕۆ هەوڵی پاراستنی ئەم نهێنیەم داوە نەك لەبەر خۆم.

لێم پرسی ئەو نهێنیەی چیە؟ بەڵام"مریت"خۆی لەئاشکرا کردنی ئەو نهێنیە دزیەوە و تەنها وتی: لەوانەیە ڕۆژێك بێت کە ئەم نهێنیە لەناخم دەربهێنم و بۆتی بگێڕمەوە.

ئەوکات ماڵئاواییم لە ئەو و "تهوت" کرد و بەکەشتی ڕێگای"ئاسۆم" گرتەبەر.

من لەم سەرگوزەشتەیەدا زۆر باسی مانەوەی خۆمم لە"تبس"دا کرد، لەکاتێکدا هیچ ڕوداوێکی گرنگی تێدا نەبوو، بەڵام هەندێك لەیادگاریەکانی ڕابردوو، بۆ مرۆڤ شیرنترە لەیادگاریەکانی تر و گێڕەرەوەش گەر لەگێڕانەوەی ئەو بەشە یادگاریانەدا بەوردیەکی زیاترەوە باسی بکات زیاتر چێژی لێ وەردەگرێت.

*بەشی چل و دووەم*

## سەرەتای هێرشەکانی"هاتی"بۆ میسر

**دوای ئەوەی گەڕامەوە بۆ شاری"ئاسۆ" بینیم کە"ئەخناتون" بەڕاستی پێویستی بەچارسەرکردنە.**

**گۆناکانی فیرعەون تەپیبون و ملیشی لەلاوازیاندا درێژ بوبو و لەمەراسیمە سەرەکیەکاندا نەیدەتوانی بەرگەی قورسایی تاجی میسری سەرو و خوارو بەسەر سەریەوە بگرێت.**

**من بینیم کە هەردوو ڕانی فیرعەون ئاوسابون و چەند دومەڵێکی پێوە دەرکەوتبوو و مچی پێکانی زۆر لاواز بوبون و چواردەوری هەردوو چاوی بەهۆی بێ خەویەوە بازنەیەکی ڕەشی دروست کردبوو.**

**فیرعەون لەکاتی قسەکردندا بەشێوەیەك لەبیری خودای خۆیدا بوو کە چیتر تەماشای ڕوخساری کەسەکانی چواردەوری نەدەکرد و ئەوەی لەبیر دەچوو کە لەحاڵی قسە کردندایە، سەرەڕای ئەوەی بەدەست سەرئێشەوە ئازاری دەچەشت و هاواری دەکرد. بەڕێکردن لەژێر تیشکی خۆردا بێ کڵاو و چەترێك دەبووە هۆی زیادبونی سەرئێشەکەی و کاتێك من ڕێم لێدەگرت، دەیوت: تیشکی خودا بەرەکەتم پێ دەبەخشێت و من ناتوانم خۆم لەتیشکی ئەو بێبەش بکەم.**

**بەڵام ئەو تیشکە لەباتی ئەوەی بەرەکەتی پێبدات، بەڕادەیەك ئازاری دەدا کە فیرعەونی دوچاری وڕێنە دەکرد و خەوی ئاشێو پاشێوی وای دەبینی کە خودای فیرعەون وەك خودی "ئەخناتون"وایە و بەزەیی خۆی بەشێوەیەك توند و تیژانە بەسەر خەڵکیدا دەڕێژێت کە بووەتە هۆی مایەی بەدبەختیان.**

بەڵام کاتێك من دەمبردەوە سەر جێگە خەوەکەی و دەمخەواند و پارچە قوماشێکم بەئاوی سارد تەڕ دەکرد و دەمخستە سەر نێوچاوانیەوە و دەرمانی هێورکەرم پێدەدا، کەمێك لەبریسکەی چاوەکانی کەم دەبویەوە و بەچاوە تیژەکانی بەشێوەیەك تەماشای دەکردم کە تەماشاکردنەکانی کاری لەدڵم دەکرد.

سەرەڕای ئەوەی فیرعەون پیاوێکی نەخۆش و لاوازو توشی نەخۆشی "مالیخولیایی"[25] بوبو لەوکاتەدا کە تەماشای دەکردم، خۆشەویستیم لەبەرامبەر ئەودا دەوروژا و ئارەزوی ئەوەم دەکرد بتوانم کارێکی بۆ ئەنجام بدەم کە لەوە زیاتر بێزار نەبێت.

فیرعەون لەو جۆرە حاڵەتانەدا دەیوت، ئایا ئەو شتانەی کە وەك ئیلهام بۆم دەهات هەروەها ئەوانەی دەمبینین درۆ بون؟ ئەگەر وابێت ئەوا ژیان زۆر لەوە ترسناکترە کە من بیری لێدەکەمەوە و دیارە کە جیهان لەڕێی ئیشق و هەستەکانەوە بەڕێوە نابرێت، بەڵکو هێزێکی ترسناك و ئازاربەخش ئەم جیهانە بەڕێوە دەبات، بەڵام لەبەرئەوەی مەحاڵە کە هێزێکی شێتانە و ئازاربەخش جیهان بەڕێوە ببات، من دڵنیام ئەوەی وەك ئیلهامێك بۆ من دابەزیوە یان بینیومە ڕاستیەکی حاشاهەڵنەگرە و ئەگەر چیتر لەمەودوا خۆر لەدڵمدا هەڵنەیەت من هیچ گومانێکم لەو ڕاستییەدا نیە کە وەك ئیلهامێك بۆم دادەبەزێت. من بەڕادەیەك بەهۆی ئیلهامەکانی "ئاتون"ەوە ڕاست بین بوم کە دەتوانم پەی بەدڵی خەڵکی ببەم، بۆنمونە دەزانم کە تۆ واهەست دەکەیت من شێت بوم، بەڵام من بەهۆی ئەو جۆرە بیرکردنەوانەت لەبەرامبەر مندا دەتبەخشم، لەبەرئەوەی هیچ کاتێك ئەوە فەرامۆش ناکەم کە تۆ لەو کەسانە بویت کە ڕوناکی ڕاستیەکانی "ئاتون"لەدڵتدا هەڵهات.

بەڵام کاتێك دەردەکانی ئازاریان دەدا و لەئازاردا دەستی بەهاوارکردن دەکرد، دەیوت: "سینوهە" کاتێك گیانەوەرێك بریندار دەبێت بۆئەوەی لەئازارەکانی کەم بکنەوە، دەیکوژن، بەڵام کەسێك ئامادە نیە مرۆڤ بکوژێت، بۆئەوەی کۆتایی

---

[25] مالیخولیا: وشەیەکە لەیۆنانیەوە وەرگیراوە، وجۆرێك نەخۆشی مێشکە و دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ توشی هەندێك بیر و خەیاڵی بێهودە ببێت و هەندێکات ئەو نەخۆشیە ئەوەندە توند و سەخت دەبێت کە وا لەکەسی نەخۆش دەکات لەبەرامبەر هەموو شتێکدا بەدبین و کەمتەرخەم بێت و هەندێکاتیش هەوڵی خۆکوژی دەدات. هەم "ماخول و ماخولیا و مالنخ و ملانکولی"شی پێدەوترێت...... ﴿فەرهەنگی عەمید﴾ وەرگێڕ.

بەئازارەکانی بهێنێت، من لەمەرگ ناترسم لەبەرئەوەی دەزانم من خۆرم و دوای مەرگیش بەخۆر کۆتاییم دێت، بەڵام لەوە دەترسم کاتێك بمرم کە"ئاتون"دەستی بەسەر هەموو میسردا نەگرتبێت.

لەوەرزی پاییزدا بەهۆی کەمی تینی گەرمای خۆر و فێنکی ئاو و هەواو و چارەسەریەکانی منەوە تەندروستی فیرعەون باشتربوو، بەڵام هەندێکات وا لێکم دەدایەوە گەر ئازاد بوایەم ئەوم بەو حاڵەوە بەجێ دەهێشت بۆئەوەی بمرێت، بەڵام ئەگەر پزیشکێك بتوانێت چارەسەری نەخۆشێك بکات یان کەمێك لەئازارەکانی کەمبکاتەوە، ڕەوا نیە دەستبەرداری ببێت بۆئەوەی بەو حاڵەوە بمرێت، لەبەرئەوەی پزیشك دەبێت چاك و خراپ و پیاوی دەستپاك و پیاوی خراپەکار بەیەك چاو تەماشا و چارەسەریان بۆ بکات و هاوڕێ و دڵسۆزی هەردوکیان بێت.

دوای ئەوەی باری تەندروستی فیرعەون باشتربوو، وەك ڕابردوو ڕۆچووە ناو هزری خۆیەوە و بە بەردەوامی بیری لەخودای خۆی دەکردەوە و لەبەرئەوەی دەیزانی کە باوەڕهێنان بە"ئاتون"بەپێی خواست و ئارەزوی بەرەو پێش ناڕوات، کەمێك لەوانەی لەچواردەوریدا بوون بەد بین دەبوو.

لەمکاتەدا"نفر تی تی"شاژن کچی پێنجەمی بوو و ئەوەندە لەم بەسەرهاتە توڕە بوو کە بڕیاری دا تۆڵە لەفیرعەون بکاتەوە، چونکە فیرعەونی بەتاوانبار دەزانی و وای لێك دەدایەوە کە ئەو بەهۆی کەموکورتی جەستەییەوە، بەئەنقەست وا دەکات کە کچی ببێت.

ئەو تۆڵەی"نفر تی تی"لەفیرعەونی کردەوە ئەوەبوو کە کاتێك بۆ شەشەمین جار سکی پڕ بوو، ئەو منداڵە لەنەوەی فیرعەون نەبوو، چونکە"نفر تی تی" ڕازی بوو کە تۆوێکی دەرەکی سکی پڕ بکات. ئەو بەڕادەیەك بێشەرم بوبو کە لەگەڵ هەموو کەسێکدا ڕای دەبوارد.

"توتمس"پێی وتم: کاتێك ئەو لەگەڵ"نفر تی تی"دا ڕایدەبوارد، ئەو ژنە پێی وتبوو کە بەئەنقەست بەهۆی ئەو جوانیەی کە هەیەتی سەرنجی ئەوکەسانەی کە نهێنی پارێزی فیرعەونن بەلای خۆیدا ڕاکێشێت بۆئەوەی لەفیرعەون دوریان بکاتەوە.

"نفر تی تی"ژنێك بوو کە بۆ ئەنجامدان و بەرەوپێش بردنی مەبەستەکانی خۆی، سودی لەجوانی خۆی وەردەگرت و لەبەرئەوەی خوێنی فەرمانڕەوایی لەخوێنبەرەکانیدا

هاتوچۆی دەکرد-لەبەرئەوەی ئەو کچی ئامی بوو- گرنگی بەوە نەدەدا کە لەگەڵ پیاوانی بێگانەدا ڕابوێرێت.

من دەبێت بڵێم پێش لەدایك بونی کچی پێنجەم"نفر تی تی"ژنێکی داوێن پاك بوو، سەرەڕای ئەوەی زۆرێك لە کاربەدەستانی میسر زۆریان خۆشدەویست و لایەنگری بون و دیاریگەلێکی گرانبەهایان پێشکەش دەکرد، بەڵام ئەو لەگەڵ هیچ یەك لەوانە ڕای نەدەبوارد و فیرعەونی هاوسەری لەهەمویان بەباشتر دەزانی.

هەرلەبەرئەوەش هەندێ کەس لادانی شاژن"نفر تی تی"یان بەکارەساتێکی شوم لەقەڵەم دا و ئەویان بەیەکێك لەدیاردە بەدبەختیەکانی نەتەوەی میسر و دانیشتوانی شاری"ئاسۆ" دەبینی، بەتایبەت ئەوەی بڵاو بویەوە کە"نفر تی تی"تەنها لەگەڵ پیاوانی کاربەدەستی دەوڵەتدا ڕاینەدەبوارد، بەڵکوسەربازە"لیبی"و کرێکارەکانیشی دەبردە ژورەکەی خۆیەوە و لەگەڵیاندا ڕای دەبوارد، من باوەڕم بەم بوختانە نەکرد، چونکە دەمزانی کە خەڵکی حەز دەکەن زیادەڕەوی لەقسەکانیاندا بکەن و ئابڕوی ژنی دەستەڵاتداران بەدناو بکەن.

فیرعەون ئاگاداری بەدڕەفتاریو لادانەکانی ژنەکەی خۆی نەبوو هەروەها تێکەڵاویو هاوڕێیەتی لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەدەکرد بۆئەوەی چەند زانیاریەکی لێ بەدەست بهێنێت.

"ئەخناتون"بێ لەنان و ئاوی ڕوباری"نیل"هیچی تری نەدەخوارد و نەدەخواردەوە و دەیوت من دەبێت لەڕێی ڕۆژوگرتن لە خواردنە خۆشتامەکان خۆم پاك بکەمەوە، بۆئەوەی"ئاتون"باشتر خۆیم پێنیشان بدات، هەروەها لەبەرئەوەی گۆشت و شەراب و ئاوجۆ مرۆڤ مەست و بێهۆش دەکات، دەبێتە ئاستەنگێك لەبەردەم ئەوەی ڕاستیەکان بەجوانی لەمن هەڵبێن.

لەوڵاتە بیانیەکانەوە هەواڵگەلێکی ناخۆش و نەخوازراو دەگوازرایەوە بۆ میسر و "ئازیرو"لەسەر هەندێك تەختەخوڕی خۆشەکراودا نوسیبوی کە: سەربازەکانی من حەز دەکەن بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانی خۆیانو مەڕەکانی خۆیان بلەوەڕێننو لەکێڵگەکانیاندا کشتوکاڵ بکەن، بەڵام کۆمەڵێك چەتە کە لەناوچەی"غەزە"و"سینا"دا نیشتەجێن چەکی میسریان پێیە و ئەفسەرانی میسریش فەرمانڕەواییان دەکەن و بەردەوام هێرش دەکەنە سەر وڵاتی سوریا و لەبەرئەوەی هەڕەشەیەکی بەردەوامیان بۆ

سوریا دروست کردووە ئەویش بەو هۆیەوە ناتوانێت سەربازەکانی خۆی مەرەخەس بکات.

چیتر فەرماندەی شاری"غەزە"بەپێچەوانەی نوسراو و ڕۆحی ئەو هاوپەیمانیەی کە لەنێوان میسر و سوریادا مۆرکراوە ڕەفتار دەکات و ڕێگری لەبازرگانە سوریەکان دەکات بچنە ناو"غەزە"وە و کاروانی ئەو سریانیانەی کە دەبێت خۆیان بکەن بەناو شاردا، دەگەڕێنێتەوە، بۆیە ئەم جۆرە ڕەفتارانە زیانێکی زۆر لەدواکەوتوانی سوریا دەگەیەنێت.

ئەگەر هەرکەسێکی تر لەجێی مندا بوایە تائێستا دانی بەخۆیدا نەدەگرت و پەنای بۆ جەنگ دەبرد، بەڵام لەبەرئەوەی ئێمە خوازیاری ئاشتین، تائێستا هیچ کاردانەوەیەکی دژمان لەخۆمان نیشان نەداوە، سەرەڕای ئەوەش دانبەخۆداگری ئێمەش سنوری خۆی هەیە و کاتێك لەسنوری خۆی تێپەڕی، ناتوانین ڕێ لەسەرباز و ئەفسەرانی سوریا بگرین.

پادشای"بابل"یش کە حەزی دەکرد گەنم بۆ سوریا بنێرێت، سکاڵای لەڕکابەرە میسریەکانی ناو بازاڕ دەکرد، چونکە سەرەڕای ئەوەی گەنمی میسر نەدەمرۆشت بۆ سوریا، ئەوەندە گەنمی میسر لەبازاڕەکانی سوریادا بوو کە بازرگانە"بابل"یەکان نەیاندەتوانی گەنمی خۆیان بەئاسانی بفرۆشن.

باڵوێزی"بابل"لەسوریادا، ڕیشی بەدەستی دەگرت و بەوروژانەوە دەیوت: گەورەی من پادشای بابل وەك شێرێك وایە کە لەکولانەکەی خۆیدا دانیشتبێت، بۆنی هەوا دەکات بۆئەوەی بزانێت شنەی"با" لەکوێوە بۆنی نێچیرەکەی بۆ دەهێنێت. دوای ئەوەی بۆنی شنەی بایی میسری کرد، هیواداربوو کە دۆستی و یەککگرتنی لەگەڵ میسردا، سودی پێ بگەیەنێت. لەکاتێکدا تا ئەمڕۆ گەورەی من هیچ سودێکی لەم یەککگرتنە وەرنەگرتووە.

ئەگەر میسر ئەوەندە هەژارە کە ناتوانێت زێڕ بۆ"بابل" بنێرێت، بۆئەوەی پادشای"بابل" سەربازگەلێکی بەهێز بەکرێ بگرێت و گالیسکەگەلێکی جەنگی دروست بکات، ئەوا من نازانم دەرئەنجامی ئەم یەکێتیەی میسر و "بابل" چی دەبێت؟

گەورەم حەز دەکات لەگەڵ میسرێکی بەهێزدا یەك بگرێت، چونکە دەزانێت کە ئەم یەکێتیە ئاشتی بۆ جیهان دابین دەکات، لەبەرئەوەی"بابل"و"میسر"هەردووکیان دوو

ولاتی دەوڵەمەندن و پێویستیان بەجەنگ نیە و لەبەرئەوەی بەهێزن، هەموو کەسێك لەم یەکێتیەیان دەترسێت و جەنگیان لەگەڵدا ناکەن، بەڵام یەکگرتن لەگەڵ میسرێکی لاواز و هەژاردا، نەك تەنها هیچ سودێك بەگەورەم ناگەیەنێت، بەڵکو بەکۆڵی "بابل"ەوە دەبێتە بارێکی قورس، هەروەها کاتێك پادشای"بابل" بیستی فیرعەون بەوئاسانیە سوریای پشتگوێ خستووە و ئەوێی بۆ ئازیرو و یەکگرتوانی"هاتی"بەجێ هێشتووە بێتاقەت بوو. من زۆر میسرم خۆش دەوێت هەروەها خۆشبەختی فیرعەون و نەتەوەکەیم دەوێت، بەڵام لەبەرئەوەی باڵوێزی"بابل"م ناچارم بەرژەوەندەیەکانی "بابل" لە بەرژەوەندیەکانی میسر لەبەرچاوتر بگرم و دەزانم کە بەم زوانە پادشای "بابل"بانگم دەکاتەوە بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ ئەوێ، چونکە باڵوێزی من لێرەدا هیچ سودێکی نیە و من بێ ئەوەی ئەرکی خۆم ئەنجام بدەم دەبێت بگەڕێمەوە بۆ"بابل"، چونکە من حەزم دەکرد کە یەکێتی میسر و"بابل"سنوری قسە و گفتوکان ببڕێت و بچێتە بواری کرداریەوە.

ئێمەش لایەنگری قسەکانی باڵوێزی"بابل"مان دەکرد، لەبەرئەوەی دەمانزانی ڕاست دەکات و لەگەڵ ولاتێکی لاواز و هەژاردا یەکگرتن، سود بەهیچ پادشای و نەتەوەیەك ناگەیەنێت.

"بورابوریاش"ی پادشای"بابل"کە تا ئەوڕۆژە بەردەوام یاری مندالان و هێلکەی ڕەنگاوڕەنگی[26] بۆ ژنە سێ ساڵانەکەی کە"کچی فیرعەون"بوو دەنارد، چیتر دەستی لەناردنی ئەو جۆرە دیاریانە هەڵگرت و ئاشکرا بوو کە دەیوست پەیوەندی خۆی لەگەڵ میسردا ببچڕێت، لەکاتێکدا دەیزانی لەخوێنبەری شازادە خانمی منداڵی میسردا خوێنی فەرمانڕەوای تێدایە، بەواتا خوێن خوداکان لەخوێنبەرەکانیدا هات و چۆ دەکات.

لەهەمان ئەوکاتەدا باڵوێزێکی"هاتی"هات بۆ میسر. ئەندامانی ئەو باڵوێزە کۆمەڵێك وەجاخزادە و نەجیبزادە بون و دەیانوت هاتون بۆئەوەی دۆستایەتی کۆنی نێوان و "هاتی"و "میسر"تازە بکەینەوە و لەگەڵ ڕەوشت و نەریتی میسریەکان کە

---

[26] سەرتا لەوە سوڕ نەمێنێ کە بۆچی پادشای"بابل" هێلکەی ڕەنگاوڕەنگ کراوی دەنارد بۆ ژنە سێ ساڵانەکەی، چونکە لەوکاتەدا لەمیسردا مریشك نەبوو و میسریەکان، نە مریشکی ماڵیان دەناسی و نەچاویشیان پێی کەوتبوو.

لەجیهاندا ناوبانگیەکی زۆری هەیە ئاشنا بن و چەند وانەیەك لەیاساکانی هونەری هێزی سەربازی میسر وەرگرن.

ئەندامانی ئەم باڵوێزە پیاوانێك بون، بەرِوکەش خورِەوشتێکی باشیان هەبوو و چەند دیاریەکیاندا بەکاربەدەستانی فیرعەون، بۆنمونە چەقۆیەکیان لەکانزای تازە بەناوی "ئاسن" پێشکەشی"توت"زاوای فیرعەون کرد و"توت"لەوەرگرتی ئەو دیاریە زۆر خۆشحاڵ بوو، چونکە بینی دەتوانێت بەو چەقۆیە چەقۆکانی میسر بکات بەدوو کەرتەوە.

من کەلەکۆندا، ئەوکاتانەی گەشتم بەنێو وڵاتانی بیانیدا دەکرد، چەقۆیەکی ئاسنینم لەگەڵ خۆمدا هێنابوو، بۆیە بە"توت"م وت: باشتروایە وەك سریانیەکان ئەو کانزا گرانبەها و تیژە تازەیە بەرِوپۆشی زێرِ بیرِازێنێتەوە..."توت"یش هەمان ئەو کارەی ئەنجامدا کە من پێم وت و وتی: حەزدەکات ئەم چەقۆ ئاسنینە بخاتە گۆرِەکەی خۆیەوە، چونکە"توت"واهەستی دەکرد کە بەم زوانە دەمرێت و سەرکەوتن لەوەدا بەدەست ناهێنێت کە تەمەنێکی سروشتی تێپەرێنێت.

ئەندامانی باڵوێزی"هاتی"کە پیاوانێکی بەهێز و خاوەنی چاوێکی درەوشاوەی وەك چاوی گیانەوەرە درِەندەکان بون و ژنانی"ئاسۆ"یان شەیدا خۆیان کردبوو، چونکە ژنەکان چێژیان لەهەموو شتێکی تازە وەردەگرت و پیاوانی کاربەدەستانی میسریش، بانگێشتی ماڵەکانی خۆیان دەکردن و ئەوانیش لەمیوانداریەکاندا دەیانوت: ئێمە دەزانین کە بەشێوەیەکی ترسناك باسی وڵات و نەتەوەی ئێمە کراوە، بەڵام هەموو ئەو قسانەی کە بیستوتانە هەمووی بوختانە و تاوان دەدرێتە پاڵ ئێمە و ئەوکەسانەی ئیرەیی بەخۆشبەختی ئێمە دەبەن، ئەم جۆرە قسە پرِ و پوچانە لەسەر ئێمە بڵاو دەکەنەوە، ئێمە نەتەوەیەکین کە دەتوانین بنوسین و بخوێنینەوەو بەپێچەوانەی ئەوەی باسیان کردووە، حەزمان لە گۆشتی کاڵ و خوێنی منداڵان نیە، بەڵکو حەز لەخواردنی سریانی و میسری دەکەین. ئێمە خەڵکێکی ئارام و ئاشتی دۆستین و رِقمان لەجەنگەو لەبەرامبەر ئەو دیاریانەی کە پێماندان جگە لەهەندێك زانست و زانیاری ئەویش بۆئەوەی ئاستی زانست و پیشەسازی نەتەوەکەی خۆمان بەرزبکەینەوە، هیچی ترمان لێتان ناوێت. ئێمە زۆر حەز دەکەین ببینین کە سەربازانی"لیبی"کە لەرِیزی سەربازەکانی میسردان، بەچ شێوەیەك چەکەکانیان

بەکاردەهێنن، هەروەها حەزدەکەین چاومان بەمانۆڕی گالیسکە زێڕین و تونڕەوکانتان بکەوێت و بزانین گالیسکەکانی ئێمە لە گالیسکەکانی ئێوە قورستر و خاوتر دەڕوات. ئێمە دەزانین کە هەڵهاتوانی "میتانی"دوای ئەوەی هەڵهاتون و هاتون بۆ ئێرە باسی ئێمەیان بەشێوەیەکی ترسناك کردووە و ئێوەش نابێت باوەڕ بەقسەکانیان بکەن، چونکە ئەم جۆرە قسانە لەتوڕەیی و نائومێدیانەوە سەرچاوە دەگرێت، کەئەمیش لەترسەکانیانەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەگەر ئەو جۆرە کەسانەی کە ئێستا لەمیسردا نیشتەجێ بون لەولاتی میتانیدا بمایانەتەوە، هیچ ئازارێکیان پێ نەدەدراو ئێستاش دەتوانن بگەڕێنەوە ولاتی خۆیان و ئەو دڵنیاییەیان پێدەبەخشین کە بەهۆی ئەو بوختانانەی کەبۆئێمەیان هەڵواسیوە هیچ ئازارێکیان نەدەین و هەوڵی تۆڵە کردنەوەشیان نادەین، لەبەرئەوەی ئێمە دەزانین لەنائومێدیاندا ئەو بوختانانەیان بۆ ئێمە هەڵواسیوە.

بەلام هۆکاری ئەوەی بۆچی ئێمە چوینە ناو ولاتی میتانیەوە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ژمارەی دانیشتوانی ولاتی ئێمە زۆر زۆرە و پادشاکەی ئێمەش حەز دەکات نەتەوەی ئێمە زیاتر ببێت، هەرلەبەرئەوەش ژیانی نەتەوەی ئێمە بەهۆی کەمی شوێن زۆر تەنگ بووەتەوە و کوڕانی نەتەوەکەشمان پێویستیان بەزەوی بوو کە تێیدا کشتوکاڵی تێدا بکەن، هەروەها پێویستیان بە لەوەڕگا بوو بۆئەوەی ئاژەڵەکانیان تێدا بلەوەڕێنن و لەخودی ولاتی ئێمەشدا، ئەو جۆرە لەوەڕگایانە دەست ناکەون، بەلام بەپێچەوانەوە لەولاتی"میتانی"دا زەویگەل و لەوەڕگاگەلێکی باش و جوانی تێدایە و دانیشتوانی"میتانی"ش کەمە و لەوێدا هەموو خێزانێك زیاد لەیەك کوڕ یان دوو کوڕی نیە، سەرەڕای ئەمانەش ئێمە نەماندەتوانی ئەوە پەسەند بکەین کە لەولاتی"متیانی"ستەم فەرمانڕەوایی بکات و خەڵکی لەژێر فشاری حکومەتێکی زۆرداردا بێت، لەبەرئەوەی خودی خەڵکی ئەوێ بۆ ڕزگاربونیان لەم ستەمە داوای هاوکاریان لێکردین، ئێمە چوینە ناو میتانیەوە و دەبێت ئەوەش بزانن کە ئێمە بەناونیشانی داگیرکردن نەچوینەتە ناو"میتانی"ەوە، بەڵکو ڕۆشتوین بۆئەوەی ئەو نەتەوەیە لەستەم و زۆرداری ڕزگار بکەین، ئەمڕۆ بەڕادەی پێویست زەویمان بۆ کشتوکاڵ و لەوەڕگامان بۆ لەوەڕاندن هەیە، چیتر پێویستمان بەوە نیە کە دەست

لەولاتانی ترەوە وەربدەین، بەتایبەت لەبەرئەوەی ئێمە نەتەوەیەکی ئاشتی خوازین، دەمانەوێت بەبەردەوامی لەئاشتی و ئارامیدا ژیان بەسەر ببەین.

کاتێك ئەندامانی باڵوێز ئەم قسانەیان دەکرد و پێکە شەرابەکانیان دەخواردەوە، بەشێوەیەك هەستی هاوڕێیەتی لەواندا هەست پێدەکرا، کە سەرنجی هەموو پیاوانیان بەلای خۆیاندا ڕادەکێشاو زۆر بەزویی بەم قسانەیان تەواوی پیاوانی کاربەدەستی بارەگای فیرعەونیان کردە هاوڕێی خۆیان و ڕێیان پێدان بڕۆنە هەموو شوێنێکەوە. بەڵام من لەبەرئەوەی وڵاتی ئەوانم بینیبوو کە بەچ شێوەیەك خەڵکیان لەسیخ دەدا و کوێریان دەکردن، نەمدەتوانی وەك پیاوەکانی تر باوەڕ بەقسەکانیان بکەم و زۆر نیگەرانی مانەوەیان بووم لە شاری"ئاسۆ"دا و هەر لەبەرئەوەش لەگەڕانەوەی ئەوان بۆ وڵاتی خۆیان زۆر ڕازی بوم، چونکە دەمزانی هەرجۆرە زانیاریەك کە لەبارەی بارودۆخی میسرەوە بەدەستی دەهێنن، لەوانەیە ڕۆژێك بێت بەزیانی میسریەکان بەکاری بهێننەوە.

کاتێك گەڕامەوە بۆ"ئاسۆ"بینیم گۆڕانکاری بەسەر بارودۆخی شاردا هاتووە.

کاتێك لە"ئاسۆ"ە دەڕۆشتم بۆ"تبس"شار بێدەنگ بوو و خەڵکی تاقەتی ژیانیان نەمابوو، بەڵام دوای ئەوەی گەڕامەوە بینیم تابەیانی مەشخەڵ و چراخانەکان داگیرساون و لەمەیخانە و سۆزانیخانەکانەوە هاواری شادی دەبیسترێت و لەماڵی وەجاخزادە و دۆڵەمەنەکانەوە کۆڕی خۆشی دەگیرێت و نۆکەرانیش بەشداری لەخۆشی خاوەنەکانیاندا دەکەن. بەڵام ئەوە ژیان و خۆشیەکی دروستکراو و ساختە یان ناچاری بوو و وەك بڵێی خەڵکی هەستیان بەوە کردبێت کە بارودۆخی جیهان دەگۆڕێت و کارەساتێك ڕوو دەدات کە چیتر ڕێیان پێنادات خۆشی و شادی خۆیان دەربڕن و دەبێت سود لەدوایین هەلەکانی ژیانیان وەرگرن کە بۆیان ڕەخساوە و کاتەکانیان بەخۆشی تێپەڕێنن بۆئەوەی خەم بۆ هەلە لەدەستچووەکانیان نەخۆن، چونکە هیچ سودێکیان لەژیانی ڕابردویان وەرنەگرت.

ئەوەی دەیسەلماند کە ئەو خۆشیەی دەری دەبڕن سروشتی نیە ئەوەبوو کە هەندێکات، لەناکاو شار دوبارە گرفتاری بێدەنگی دەبویەوە و چیتر هیچ ئاوازێك نەدەبیسترا و وەك بڵێی خەڵکی لەنێوەندی خۆشیەکانیاندا لەناکاو ئاگاداری ئەوە بوبێتن کە ئایندەیەکی دڵتەزێن چاوەڕێیان دەکات و لەترسی ئایندەش بێدەنگ دەبون.

هونەرمەندانیش وەك دەوڵەمەندەكان دوچاری چالاكیەكی لەناكاو و ناچاری بوبون، بۆنمونە ئەگەر شتكەلێكی نوێ دانەهێنن، ئەوا كات لەنێوان پەنجەكانیانەوە دەچۆڕێتە خوارەوە و لەدەستیان دەردەچێت و ئەو كاتە گرانبەهایەی كە لەدەستیان داوە چیتر بۆیان ناگەڕێتەوە.

هونەرمەندان ڕاستیەكانیان بەوێنەگەلێكی زیادەڕۆ بەرجەستە دەكرد و لەئەنجامدا وێنەكانیان خەڵكێكی شێوە"كاریكاتۆر"یان لەخۆ دەگرت. سەرەڕای ئەوەی ڕوداوە ڕاستەكانیان بەشێوەیەكی سادە دەخستە ڕوو بۆنمونە هەندێك لەوانە لەباتی كێشانی وێنەی تەواوی كەسێك، تەنها خۆیان بەچەند هێڵ و خاڵێك بۆكێشانی وێنەی ئەو كەسە ڕازی دەكرد.

ئەم هونەرمەندانە بۆ كێشانی وێنەی فیرعەون، بۆ ئاوەژوو كردنی ڕاستیەكان جەستەیان بەشێوەیەك دەكێشا كە كاتێك مرۆڤ چاوی پێی دەكەوت لێی دەترسا.

ڕۆژێكیان لەمبارەیەوە قسەم لەگەڵ"توتمس"دا كرد و وتم: فیرعەون چاكەی لەگەڵدا كردویت و تۆی لەزەویەوە هەڵگرت و كردیتی بەدۆستی خۆی، باشە تۆ بۆچی وێنەی ئەو بەشێوەیەك دەكێشی كە وەك بڵێی دوژمنت بێت؟

"توتمس"لەوەڵامدا پێی وتم: "سینۆهە"تۆ كەسێكی پزیشكی و هیچ زانیاریەكت لەبارەی هونەری وێنەكێشانەوە نیە، كاتێكیش زانیاریت لەبارەی شتێكەوە نەبێت، بیروبۆچونی خۆشت لەبارەیەوە مەخەرە ڕوو.

هەوەرها وتی: لەوانەیە ڕقەبەرایەتیەك لەنێوان من و فیرعەوندا هەبێت، هەندێجار شتی وا ڕوودەدات كە پیاوێكی هونەرمەند لەكاتی ڕەقەبەرایەتیدا دەتوانێت بەرهەمێك بهێنێتەبون كە لەكاتی دۆستایەتیدا تواناى بەدی هێنانی بەرهەمی وای نەبێت، من پیاوێكی داهێنەرم و ئەوەی دەیهێنمە بون هونەری منە كە بەپێی خواست و ئارەزو ئامادەكاریەكانم دەیهێنمە بون و ئەوەی من دەیهێنمە بون بەجاویدانی دەمێنێتەوە. فیرعەون دەمرێت و"ئاتون"لەناو دەچێت، بەڵام من دەمێنمەوە، بەواتا ئەوەی لەڕێی منەوە هاتووەتە بون، هونەرەكەمە كە بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە.

كاتێك"توتمس" قسەی دەكرد تەماشای چاو و ڕوخساریم دەكرد و تێدەگەشتم كە ئەو هەر لەبەرەبەیانەوە شەرابی خواردووەتەوە، بۆیە لەبارودۆخێكی سروشتیدا

ناژیت و ئەو جۆرە قسانە لەڕوی مەستیەوە دەکات، بۆیە نەسەرم لەقسەکانی سوڕما و نە ڕقم لێی هەڵگرت.

دوای ئەوە وەرزی پایز هات و ئاوی ڕوباری"نیل" هەڵچویەوە و دوای ئەوەش زستان هات.

بەگەشتنی وەرزی زستان، بەوشێوەی کە خەڵکی پێشبینیان دەکرد، وشکەساڵی لەمیسردا دەستی پێکرد و لەسوریاشەوە هەواڵگەلێکی ترسناك گەشت و ئاشکرابوو کە"ئازیرو" دەروازەگەلێکی زۆری شارەکانی سوریای بەڕوی لەشکری"هاتی"دا کردووەتەوە و گالیسکە جەنگیەکان بەشێوازی لەشکری سەربازی لەزەوی"سینا"وە تێپەڕیوە و هێرشی بۆ شاری"تانیس" کرد و تەواوی ئەو ناوچەیان وێران کردووە.

* * *

بەهۆی گەشتنی ئەم هەواڵە ترسناکە"ئامی"لەشاری"تبس"و"هورم هب"لەشاری "ممفیس"ەوە هاتن بۆ شاری"ئاسۆ"بۆئەوەی لەبارەی ئەم ڕوداوانەوە قسە لەگەڵ فیرعەوندا بکەن و منیش بەشداریم لەو کۆڕی گفتوگۆکردنەدا کرد، بۆئەوەی ئەگەر بەهۆی بیستنی بیروبۆچونی ئەو دوو کەسەوە، تەندروستی فیرعەون تێك بچێتەوە چارەسەری بکەم.

"ئامی"وتی: ئەی"ئەخناتون"ئێمە ئەمساڵ نەمانتوانی باج و سەرانەی ناوچەکانی باشوری میسر کۆبکەینەوە، لەبەرئەوەی خەڵکی ئەوێ بەهۆی وشکەساڵیەوە بەڕادەیەك هەژار بوون کە توانای ئەوەیان نەبوو باج و سەرانەمان پێبدەن و ئێستاش خەزێنەی دانەوێڵەکانی فیرعەون خاڵین و ناتوانرێت بۆ تێرکردنی خەڵکانی برسی سود لەم جۆرە خەزێنانە وەرگرین. خەڵکی لەبرساندا پیشکی گیاو توێکڵی درەختەکان، بگرە کولە و قورواق"یش دەخۆن و تائێستا کۆمەڵێکیان لەبرساندا مردون و لەمەو دواش هەر لێیان دەمرێت، چونکە دانەوێڵەی فیرعەون بەڕادەیەك کەم بووەتەوە کە هەرچەنێکیش لەژەمی خەڵکی کەم بکەینەوە، سەرەڕای ئەوەش هەر ناتوانین ڕێ لەمەرگیان بگرین. هەندێك لەسەوداگەرەکان خاوەنی دانەوێڵەن، بەڵام ئەوەندە گران دەیفرۆشن کە خەڵکی ناتوانن لێیان بکڕن. دانیشتوانی دێهاتەکانیش لەبیابانەکانەوە ڕویان لەشارەکان کردووە و دانیشتوانی شارەکانیش بەرەو بیابان

هەڵدێن و هەموویان دەڵێن کە ئێمە گرفتاری نەفرەتی "ئامون"نین و تەواوی چەرمەسەری و بەدبەختیەکانمان لەخودای فیرعەونەوە سەرچاوە دەگرێت، لەبەرئەوەش من ئەی فیرعەون پێت دەڵێم کە تواناکانی"ئامون"بگەڕێنەرەوە و بیکەرەوە بەخودای میسریەکان، بۆئەوەی کاهینەکانی ئامون و خەڵکی لەم ترسە ڕزگاریان ببێت و جوتیارەکان بتوانن لەزەویەکانی"ئامون"دا کشتوکاڵ بکەن، چونکە هیچ کەسێك لەزەویەکانی تۆدا کشتوکاڵ ناکات، لەبەرئەوەی جوتیارەکان لەوباوەڕەدان کە زەویەکانی خودای تۆ نەفرەتیان لێکراوە.

ئەگەر تۆ هەرئێستا لەگەڵ"ئامون"دا ئاشت بیتەوە، ئەم وشکەساڵیە ترسناکە لەناو دەچێت، ئەگینا هەموو خەڵکی لەبرساندا دەمرن و منیش ناتوانم هیچ شتێك بۆ ڕزگارکردنیان ئەنجام بدەم.

"هورم هب" وتی:

ئەی فیرعەون من ئاگاداری ئەوەم کە"بورابوریاش"ی پادشای"بابل"بۆئەوەی لەهەڕەشەی "هاتی"خۆی بپارێزێت لەگەڵ تۆدا ئاشت بووەتەوە و"ئازیرو"ش لەترس ئەوان دەروازەی تەواوی شارەکانی سوریای بەڕوی "هاتی"یەکاندا کردووەتەوە.

ئەمڕۆسەربازەکانی"هاتی"لەسوریادا بەئەندازەی ڕێزوخۆڵی بیابانەکانەوژمارەی گالیسکەکانی لەشکری سەربازی سوریاش بەئەندازەی ئەستێرەکانی ئاسمان دەبێت.

من هیچ گومانێکم لەوەدا نیە کە"هاتی"لەوەرزی بەهاردا یەکەمین هێرشی بۆ میسر دەست پێدەکات، چونکە لەسەرتاسەری بیابانی نێوان سوریا و میسر، گۆزەی ئاویان داناوە بۆئەوەی لەوەرزی بەهاردا لەشکری"هاتی" کاتێك لەبیابانەوە تێدەپەڕن تینویان نەبێت.

هەموو ئەو گۆزانەشیان لەمیسر کڕیوە و بازرگانانی میسر بەڕوانگەی ئەوەی قازانج لەم کاسپیەدا دەکەن، هەرچی گۆزەی بەکار هاتوی ئەم وڵاتە بوو بە "هاتی"ەکانیان فرۆشت و بێئاگابون لەوەی کە کەرەستەی لەناوچونی خۆیانیان فەراهەم کردووە.

ئەفسەران و سەربازەکانی"هاتی"بەڕادەیەك ئازان کە سەرەڕای ئەوەی زستانە هێرشیان برد بۆ"تانیس"و گەرچی لەوێدا وێرانکاریان ئەنجام نەدا، بەڵام من لەمیسردا بوختانی ئەوەم بۆ دروست کردن کە لەوێدا تاوانگەلێکی زۆر قێزەونیان

ئەنجام داوە، بۆئەوەی تورەیی و ڕقی خەڵکی میسر لەبەرامبەر ئەواندا بوروژێنم و خەڵکی هانی ئەوە بدەم بەهەموو هێز و توانایەکیانەوە لەگەڵ"هاتی"دا شەڕ بکەن. ئەی فیرعەون هێشتا کاتی زۆرمان بەدەستەوەیە و دەتوانین ڕێ لە"هاتی"و"ئازیرو" کە بەداخەوە لەگەڵ"هاتی"دا یەکی گرتووە بگرین.

ئەی"ئەخناتون" فەرمان بدە کە فوو بەبوقەکان بۆ دەست پێکردنی جەنگ بکەن و داوا لەهەموو پیاوانی"بالخ" بکە کە بێنە ڕیزی لەشکری سەربازی میسرەوە، هەروەها فەرمان دەربکە کە هەرچی مس هەیە لە دروست کردنی شمشێر و چەقۆدا بەکاری بهێنن و من بەڵێنت پێدەدەم کە هەرکاتێك دەست بەجەنگ بکەیت و پێشنیارەکانی من پەسەند بکەیت، دەتوانین هەم پاشەکشە بە"هاتی"بکەین و هەم سوریاشت بۆ دەگەڕێنمەوەو ئەم جەنگ سودێکی تر بەوڵاتی ئێمە دەگەیەنێت ئەویش ئەوەیە لەبەرئەوەی خەڵکی لەدەرەوەی وڵاتدا سەرقاڵی جەنگن، "ئامون"و ئاتون"و وشکەساڵی فەرامۆش دەکەن.

کاتێك"ئامی"گوێی لەم قسەیە بوو کەمێك دودڵ بوو لەوەی چی بڵێت و دوای ئەوە وتی: ئەی فیرعەون پێشنیارەکانی"هورم هب"پەسەند مەکە، لەبەرئەوەی دیارە کە دەیەوێت تۆ فریو بدات، چونکە ئەم پیاوە دەیەوێت دەستەڵاتت لێ زەوت بکات و تۆ لەفەرمانڕەوایی میسر لا ببات و خۆی لەجێگەی تۆدا لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دانیشێت.

بۆیەمن پێم باشە کەتۆ هەرئێستا لەگەڵ کاهینەکانی"ئامون"دا ئاشت ببیتەوە و زەویەکانیان بۆ بگەڕێنیتەوە، دوای ئەوەش ئەگەر ویستت دەتوانیت دژی"ئازیرو"و "هاتی"شەڕ بەرپا بکەیت، بەڵام فەرماندەی لەشکری سەربازیەکەت مەدە بە"هورم هب"، بەڵکو بیدە بەیەکێك لەسوپاسالارە بەتەمەن و ئەزموندارەکان کە ئەزمونێکی تەواویان لەهونەری سەربازی کۆندا هەیە و شێوازی جەنگی فیرعەونە کۆنەکانیان لەسەر"پاپیرۆس" بخوێننەوە، بەڵام بەو مەبەستە بۆ ئەو بەرپرسیاریەتیە هەڵیان بژێرە کە بزانی هەوڵی ئەوە نادەن کودەتات بەسەردا بکەن.

"هورم هب"وتی: ئەگەر لەمکاتەدا ئێمە لەبەردەمی فیرعەوندا نەبوایەین، ئەوا دەستێکم بەڕوخسارتدا دەهێنا، "ئامی"تۆ کە کاهینێکی درۆزن و فێڵبازیت، وا هەست دەکەیت هەموو کەسێك وەك تۆیە و من دەزانم کە تۆ ژێر بەژێر و بەنهێنی

لەگەڵ کاهینەکانی "ئامون"دا کۆبونەوە و گفتوگۆت کردووە و بەڵێنت پێداون کە هانی فیرعەون بدەیت سەردەمی خودای "ئامون"نوێ بکاتەوە، بەڵام من هەوڵی فریودانی فیرعەون نادەم و چاوم نەبڕیومتە دەستەڵاتەکەی، هەروەها من هەمان ئەو کەسەم کە کاتێك ئەو بچوك بوو، لەبیاباندا جلەکانی خۆم داکەند و ئەوم پێداپۆشی بۆئەوەی سەرمای نەبێت، ئەو پیاوەش-بەدەستی ئاماژەی بۆ من کرد- لەوێ بوو و بینی کە من بەجلەکانی بەرم ئەوم داپۆشی و ئامانجی من ئەوەبوو کە"میسر" لەناو نەچێت و ئەوەی دەیڵێم بۆ پاراستنی ئابرو و مەزنی میسرە و دەزانم کە لەدوای من هیچ کەسێك ناتوانێت پارێزگاری لەئابڕو و مەزنی میسر بکات.

فیرعەون لێی پرسین: ئایا کۆتایی بەقسەکانتان هات؟... ئەو دوانەش وتیان بەڵێ کۆتایی بەقسەکانمان هات. ئەوکات فیرعەون وتی: من پێش ئەوەی وەڵامی ئێوە بدەمەوە، دەبێت شەو بەبێداری بمێنمەوە و ڕاوێژ لەگەڵ خودای خۆمدا بکەم، بەڵام ئێوە بۆ بەیانی بانگی هەموو خەڵکی بکەن و پیان بڵێن کە هەموویان هەر لەهەژارەوە بگرە تا دەوڵەمەند و هەر لەخاوەنەوە تا نۆکەر و بگرە ئەو نۆکەرانەی کە لەکانە کانزاکاندا کاردەکەن بێن بۆ ئێرە، چونکە سبەی دەمەوێت لەگەڵ نەتەوەکەی خۆمدا قسە بکەم و بڕیاری خۆمیان بۆ ئاشکرا بکەم. ئەو فەرمانە جێبەجێ کرا و لەڕۆژی دواییدا خەڵکی لەبەرامبەر کۆشکی فیرعەوندا کۆبونەوە.

شەوی ڕابردوو تا بەیانی لەکۆشکدا هەر هاتوچۆی دەکرد و نانی نەخوارد و لەگەڵ هیچ کەسێکیشدا قسەی نەکرد، بەشێوەیەك کە ترسی ئەوەم لێ نیشت نەوەك باری تەندروستی دوبارە وەك جاران خراپ ببێتەوە، بەڵام لەڕۆژی دواییدا، کاتێك ئەو لەبەرامبەر خەڵکیدا لەسەر تەختی فەرمانڕەوایدا دانیشت و دەستی بەرز کردەوە و دەستی کرد بەقسە کردن، بینیم کە ڕوخساری لەورژاندا دەدرەوشێتەوە و دوای ئەوە فیرعەون بەم شێوەیە هاتە گۆ: من پیاوێکی لاواز بوم و بەهۆی لاوازیمەوە وشکەساڵی لەمیسردا دروست بوو، هەروەها بەهۆی ئەم لاوازیەمەوە، دوژمن بڕیاری ئەوەی داوە کە هێرش بۆ وڵاتی میسر بکات، ئێستاش لەشکری"هاتی"لەسوریادا خۆی ئامادەی هێرشکردنە سەر خاکی ڕەش[27] دەکات.

[27] مەبەست لە"خاکی ڕەش" خاکی میسرە.

**من لەبەرئەوە لاواز بوم کە دەنگی خودام بەجوانی نەبیستبوو، هەروەها ئەویشم بەڕونی نەبینی بوو، بەڵام لەدواییدا خودای من خۆیی بۆ ئاشکرا کردم و ئاگری ئەو لەسینەی مندا داگیرسا و پەییم بە هۆکاری لاوازیەکانی خۆم برد؟ئەویش لەبەرئەوە لاواز بوم کە دوای لەناوبردنی "ئامون"ی خودای درۆینە، تەواوی خوداکانی ترم پشت گویێ خست بۆئەوەی بەهەر شێوەیەك کەخۆیان بیانەوێت بژین. من نەمدەزانی کە ئەم خودایانە کە هەزاران ساڵە دەستیان بەسەر میسردا گرتووە، بانگەشەکارە مەزنەکانن کە دژی خودای تاك و تەنها ڕاوەستاون و ناهێڵن"ئاتون" بەئاسودەیی لەمیسردا خودایی خۆی بکات. لەبەرئەوەش دەڵێم کە لەمڕوە بەهەموو توانایەکەوە خوداکانی میسر لەناوببرێن و ئەم بونەوەرانە کە هەزاران ساڵە"خاکی ڕەش"یان کردووەتە بارەگای خۆیان لەناو بچن. ئەی نەتەوەی میسر، لەمڕۆ بەدواوە تەنها یەك خودا لەجیهاندا فەرمانڕەوایی دەکات و ئەویش"ئاتون"ە و بێ لەڕوناکی"ئاتون"هیچ ڕوناکیەکی تر لەجیهاندا هەڵنایەت.**

**خەڵکی کاتێك بیستیان کە فیرعەون دەیەوێت تەواوی خوداکانی ئەوان لەناو ببات، لەترساندا لەرزیان لێ نیشت و هەندێکیش لەوانە کڕنوشیان برد.**

**ئەوکاتەی فیرعەون دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردبووەوە بەدەنگێکی بەرزتر هاواری کرد:**

**ئەی نەتەوەی میسر...ئەی ئەو کەسانەی کە منیان خۆش دەوێت...لەم ترازووە بەدواوە....ئالێرەوە....بکەونە ڕێ و تەواوی خودا کۆنەکانی میسر سەرنگون بکەن و میحرابەکانیان وێران بکەن و کاسەی پڕ لەئاو یان ڕۆنی خودایانی داگیرکەر سەرنگون بکەن و پەرستگاکانیان لەناو ببەن و هەوڵی ئەوە بدەن کە ناویان لەهیچ پەرستگا و نوسراوێکدا نەمێنێت. من ڕێتان پێدەدەم کە بۆ لەناوبردنی ناوی ئەم خودا زۆردارانەدا گۆڕەکانیان هەڵکەنن و پەیکەرەکانیان تێك بشکێنن، بۆئەوەی میسر لەستەم و دوزمانی و ئاژاوەنانەوە و ڕق و تەماعی ئەم خودایانە ڕزگاری ببێت. گورز و تێڵا بەدەستانەوە بگرن و ئێوەش ئەی هونەرمەندانی پەیکەرسازو وێنەکێش، قەڵەمی هەڵکۆڵین و وێنەکێشان فڕێ بدەن و قۆچی[28] کوتانی دیوارو دەروازە گەورەکان**

---

[28] بڕۆ بۆ پەراوێزی ژمارە"٧٤"ی بەرگی یەکەمی سینۆهە.

بەدەستەوە بگرن... ئێوەش ئەی کرێکاران، پیك و چەکوشەکانتان فڕێ بدەن و نوێڵێك بۆخۆتان پەیدا بکەن، ئێوەش ئەی جوتیاران داسەکانتان فڕێ بدەن و بکەونە ڕێ و لەشار و لادێکانی میسردا هەرجۆرە هێمایەکی خودا کۆنەکانتان بەرچاو کەوت لەناوی ببەن. ئەم خودایانە هەزارەها ساڵە لەم وڵاتەدا خوداییان کردووە، زاو و زێیان کردووە و پڕی ئەم شارە خودازادەیان وێناوە و مەحاڵە بتوانن دەست لەم نەریت و تایبەتمەندیەی خۆیان هەڵگرن و بهێڵن جیاوازی نێوان دەوڵەمەند و هەژار و خاوەن و نۆکەر لەناو بچێت، ئەمانە مەحاڵە بهێڵن لەم وڵاتەدا زەویەکان بەیەکسانی لەنێوان خەڵکیدا دابەش بکرێت. بۆیە تا نەژادی ئەمانە لەمیسردا لەناو نەبەین، ئەم وڵاتە لەبونی خودایانی زۆردار و تەماع پاك نابێتەوە. ئەی نەتەوەی میسر لەمڕۆوە هیچ کەسێك نە خاوەنە و نە نۆکەر و نە ئاغایە و نە خزمەتکار و هیچ کەسێکیش مافی ئەوەی نیە ئەویتر ناچاربکات کە لەزەویەکانیدا کوشتوکاڵی بۆ بکات و هیچ کەسێك مافی ئەوەی نیە ئەویتر هانی ئەوە بدات کە لەکانە کانزاکەیدا کاربکات. هەموو کەسێك ئازادە کە بۆ هەرکوێ خۆی حەزی لێبکات بڕوات و هەرکارێك کە خۆی دەیەوێت بیکاتە پیشەی خۆی و تەواوی خەڵکی میسر لەبەرامبەریەکتردا لەبەردەم "ئاتون"دا یەکسانن.

کاتێك ئەم دوایین قسانەی هێنایە زمان، هاواری کرد کۆتایی بەگوتەی فیرعەونی ئێوە هات و دەتوانن بڕۆن و خوداکانی میسر سەرنگون بکەن.

خەڵکی ئەوەی لەدەمی فیرعەونیان بیست، بەڕادەیەك بەلایانەوە سەیربوو کە نەیاندەتوانی باوەڕی پێبکەن، بەڵام فیرعەون بەگەرمی و پاکیزەییەکەوە قسەی بۆ دەکردن کە بووە هۆی ئەوەی کار لەخەڵکی بکات و وتیان، هیچ گومانێکی تێدا نیە کە خوداکەی قسەی لەگەڵدا کردووە، چونکە ئەگەر خوداکەی ئەو بڕیارەی نەدابایە، ئەوا قسەکانی بەوشێوەیە کاری لەئێمە نەدەکرد، بۆیە ئێمەش ئەو ئەرکەمان لەسەرە کە ملکەچی فەرمانەکانی بین.

خەڵکی کاتێك بڵاوەیان لێکرد"ئامی"وتی: "ئەخناتون"ئێستا تۆش تاجی فەرمانڕەوایی بەسەرتەوە لا ببە و گاڵۆکی فەرمانڕەوایی دەستت بشکێنە و فڕێیان بدەن، چونکە ئەوەی وتت دەبێتە هۆی ئەوەی فەرمانڕەوایی تۆ لەناو ببات.

فیرعەون وەڵامی دایەوە: ئەوەی من باسم کرد دەبێتە هۆی ئەوەی ناوی من بە جاویدانی بمێنێتەوە و دوای ئەوەش دەستەڵاتی من تاکۆتایی جیهان لەڕۆحی خەڵکیدا زیندو دەبێت.

"ئامی"بەسوکایەتیەکەوە تفێکی کردە سەرزەوی و وتی: ئەگەر وابێت من لەبەرامبەر شێتێکدا دەست لەفەرمانڕەوایی خۆم هەڵدەگرم و دەڵێم کە ناچارنیم ڕێز لەفیرعەون بگرم.

ئەوکات"ئامی"کەوتە ڕێ بۆئەوەی بڕوات، بەڵام"هورم هب"دەستی گرت و وتی: "ئامی"بۆچی تفت کردە سەرزەوی، هەروەها بۆچی ئەم قسانە دەکەیت. مەگەر ئەم پیاوە فیرعەون نیە و تۆ ئەرکی ئەوەت لەسەر نیە کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بیت؟

"ئامی"ئاگاداربە ئەگەر بتەوێت خیانەت لەفیرعەون بکەیت، من بەشمشێرەکەم ورگت هەڵدەدڕم، سەرەڕای ئەوەی ئامادەم بۆ ئەمکارە گەر ناچار بم لەشکرێك ئامادە بکەم، لەوانەیە زانیبێتت کە من درۆ ناکەم. من لایەنگری ئەوە دەکەم ئەوەی فیرعەون باسی دەکات، بەڕادەیەك سەیرە کە زۆر لەقسەی شێتەکان دەچێت، چونکە تا ئەمڕۆ هیچ کەسێك ئەوەی نەبیستووە کە تەواوی خوداکانی تر لەپێناو تاکە خودایەکدا سەرنگون بکرێت.

بەڵام گوتەکانی ئەو، لەڕویەکەوە زۆر ژیرانەیە، چونکە دەبێتە هۆی ئەوەی تەواوی چینە هەژارو برسیەکانی میسر ببنە لایەنگری فیرعەون. ئەگەر ئەو تەنها بیوتایە دەبێت خوداکانی میسر سەرنگون بکرێت، ئەوا لەم وڵاتەدا شەڕی ناوخۆ هەڵدەگیرسا، بەڵام لەبەرئەوەی وتی هەموو جیاوازیەکی نێوان دەوڵەمەند و هەژار و خاوەن و نۆکەردا لەناو ببرێت، تەواوی چینە هەژارەکان دەبنە لایەنگری فیرعەون و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی شەڕی ناوخۆ هەڵنەگیرسێت.

دوای ئەوە"هورم هب"ڕوی کردە فیرعەون وتی: ئێستا بڵێ کە چی لە"هاتی" بکەین؟

فیرعەن کە هەردوو دەستی خستبووە سەر ئەژنۆی هیچ وەڵامێکی نەدایەوە.

"هورم هب"وتی: "ئەخناتون"گەنم و ئاڵتون و چەك و گالیسکەی جەنگی و ئەسپم پێبدە و ڕێم پێدە هەندێك سەرباز دابمەزرێنم، بەڵێنت پێدەدەم پاشەکشە بە"هاتی" دەکەم.

فیرعەون سەری بەرز کردەوە و بەچاوەکانی کە بەهۆی بێخەویەوە سور وەرگەڕابون، تەماشایەکی ڕوخساری"هورم هب"ی کرد و وتی: من حەزناکەم تۆ بانگەوازی جەنگ بکەیت، بەڵام ئەگەر خەڵکی بیانەوێت بەرگری لە"خاکی ڕەش" بکەن، من ڕێیان لێناگرم، بەڵام سەبارەت بەگەنم و زێڕ و چەکەو، من هیچ یەك لەوانەم نیە بۆئەوەی پێتی بدەم، ئەگەر هەشمبێت پێم نەدەدایت، لەبەرئەوەی نامەوێت بەخراپە وەڵامی خراپە بدەمەوە، بەڵام تۆ دەتوانیت بەهەرشێوەیەك کە خۆت دەتەوێت کەرەستەی بەرگری"تانیس" فەراهەم بکەیت، بەمەرجێك خوێنڕێژی نەکەیت.

"هورم هب"وتی: زۆرباشە، من کەرەستەی بەرگری"تانیس"فەراهم دەکەم و لەوێ دەمرم، چونکە سوپاسالارێك کە نە گەنمی هەیە و نە زێڕ و نەچەك، سەرەڕای ئەوانەش دەبێت بەرگری لەو ناوچەیە بکات، ناچارە بەهۆی لەناوبردنی خۆیەوە بەرگری لەوێ بکات، بەڵام هیچ گومانێکم لەوەدا نیە، کاتێك بڕیارم دا کارێك ئەنجام بدەم، ئەنجامی دەدەم.لەئێستاشدا"ئەخناتون"ماڵئاوا...و هیوادارم تەندروستی خۆت بپارێزیت. "هورم هب"دوای ئەو قسانەی ڕۆشت و"ئامی"ش کەوتە ڕێ و دور کەوتەوە. ئەوکات فیرعەون چاوە سور وەرگەڕاوەکانی ئاڕاستەی من کرد و وتی: دوای ئەوەی قسەی خۆم کرد هەست بەلاوازی دەکەم. دوای ئەوە بەزردەخەنەیەکەوە وتی: "سینۆهە"ئایا منت خۆشدەوێت؟

وتم: هەڵبەت کە تۆم خۆش دەوێت. تۆ لەوباوەڕەدایت ئەگەر تۆم خۆش نەویستایە، ئامادەبوم بەرگەی ئەم شێتیەی تۆ بگرم؟

فیرعەونیش وتی: ئەگەر تۆ منت خۆش دەوێت دەبێت بزانیت، دەبێت چی بکرێت؟

تێگەشتم کە فیرعەون دەیەوێت چی بڵێت، چونکە ئەو فەرمانی دابوو کە هەموو دواکەوتەکانی دەست لەکارەکانی خۆیان هەڵگرن و بڕۆن پەیکەری خودایانی میسر سەرنگون بکەن و ناوەکانیان پاك بکەنەوە، هەروەها چاوەڕێی ئەوەی دەکرد منیش بڕۆم هەمان کار ئەنجام بدەم، بۆیە وتم: ئەی فیرعەون من پزیشکی تۆم و وام دەزانی کە تۆ لەبەرئەوە منت لە"تبس"ەوە بانگ کردووەتەوە کە پێویستیت بەچارەسەریە پزیشکیەکانی منە، بەڵام ئێستا دەبینم حەز ناکەیت لەلای تۆ بمێنمەوە، بۆیە دەڕۆم و لێت دور دەکەومەوە، سەرەڕای ئەوەی دەستەکانم ئەو هێزەیان تێدا نەماوە کە پیك و تێڵا بوەشێنم، بەڵام بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکەی تۆ دەڕۆم بۆ"تبس"، چونکە هیچ

شارێك بەئەندازەی"تبس" خودای تێدا نیە و من دەزانم بەهۆی ئەوەی دەست بەشکاندن و وێرانکردنی خوداکانی میسر دەکەم، ورگم هەڵدەدڕن و سەرکوتم دەکەن، دوای ئەوە بەدیوارەوە سەرەوژێر هەڵم دەواسن، بەڵام من بۆ جێبەجێکردنی فرەمانکانی تۆ خوێنی خۆم دەکەم بەقوربانی.

ئەوکات بێئەوەی قسەیەك بکەم، لەفیرعەون درو کەوتمەوە و ئەویش هیچ قسەیەکی نەکرد.

زۆر خەمبار بوم، بۆیە پێش دەرچونم لەکۆشکی فەرمانڕەوایی بڕیارم دا بڕۆم بۆ لای"توتمس"و دەردی دڵی خۆمی بۆ هەڵڕێژم، بەڵام بینیم کە"توتمس"لەکارگاکەی خۆیدا لەگەڵ"هورم هب"و هونەرمەندێکی پیر و بەدمەست بەناوی"بك"خەریکی خواردنەوەن. خزمەتکاری"توتمس"سەرقاڵی کۆکردنەوەی کەلوپەلی کۆچکردنی ئەوبوو و ئاشکرا بوو کە ئەویش دەیەوێت بڕوات و پەیکەری خودایانی میسر سەرنگون بکات.

"توتمس"بەئاوازێك کە دیاربوو لەناڕەزاییەوە سەرچاوەی دەگرت وتی: سوێن بە"ئاتون"چیتر دوای ئەوە لەمیسردا، نە وەجاخزادە بونیان دەبێت و نەخەڵکی بۆرەپیاو و ئاسایی، منیش کە تائێستا کارم ئەوەبووە کە گیان بە بەردە بێگانەکان ببەخشم و بیانگۆڕم بەپەیکەرگەلێك کە زیاد لەگیاندارەکان زیندووتربن، چونکە بەها و جوانی هونەری ئەمانە زۆر لە گیاندارەکان زیاتر و زۆرترە، بەڵام چیتر لەمەودوا دەبێت تێلایەك بگرم بەدەستمەوە و پەیکری خوداکانی پێ لەناو ببەم...هاوڕێیان... ئەم هەلە بقۆزینەوە و بخۆینەوە،چونکە دەزانم ئەوەندە تەمەنمان بەبەریەوە نەماوە و بەمزوانە هەمووومان دەمرین. "بك"پێکی خۆی هەڵدایەوە و وتی: من دەزانم کە دەمرم، بەڵام ناتوانم خۆم لەجێبەجێکردنی فەرمانی ئەخناتون بدزمەوە، چونکە فیرعەون من کە هونەرمەندێکی گومناوبوم و کاڵا هونەریەکانم هیچ کڕیارێکی نەبوو، منی لەناو چاڵکاودا هەڵگرت و هێنامیە ئێرەوە و هەرجارێکیش کە دارایی خۆم یان هەندێك کات بەجلەکانی خۆشم خواردنەوەم دەکڕی و بەڕوتی دەمامەوە، بەڵام فیرعەون زێڕی پێبەخشیم و هەرگیز سەری لەوە سوڕ نەدەما کە بۆچی من بێپارەو ڕوتم. من دەزانم کاتێك بگەڕێمەوە بۆ شوێنی خۆم و هەوڵی ئەوە بدەم خوداکانی میسر لەناو ببەم، جوتیارانی ئەوی بەداسەکانیان ورگم هەڵدەدڕن و لاشەکەشم فڕێدەدەنە ناو ئاوی

ڕوباری نیلەوە و دەبمە ژەمی خواردنی تیمساحەکان، بەڵام پیاوێکی پیرم و ئەوەندە هۆگری خواردنەوەم کە ناتوانم وەك پێشوو کار بکەم و هەرچی زووتر بمرم بۆ خۆم باشترە.

"هورم هب"وتی: ئەگەر من فەرماندەی سوپاسالاری نەتەوە نەبوایەم، پێم دەوتی، کارێکی باش دەکەیت کە دەمریت و گرفتاری هێزەکانی"هاتی"نابیتەوە، چونکە سەربازەکانی "هاتی" بەڕادەیەك بێبەزەیین کە دڵتەزێنترین مەرگی ئێمە لەچاو ئەشکەنجەکانی ئەواندا وەك لاواندنەوە وایە. بەڵام لەبەرئەوەی متمانەیەکی تەواوم بەبەختی خۆم هەیە، دەڕۆم ڕێیان لێدەگرم، لەکاتێکدا دەزانم کە ڕێگرتن لەسەربازەکانی"هاتی" بەبۆنەی ئەوەی ئێمە دەستمان خاڵیە و گەنم و ئاڵتونمان نیە بۆ ئێمە زۆر گرفت و سەختە، چونکە ئەوان کەسانێك نین کە لەهاوار و دەنگی دەهۆڵ بترسن یان کاتێکیش بە"بەرزەقانی"بەردیان تێبگرین لەدەستمان هەڵبێن.دواتر وتی: یەکێك لەوشتانەی کە دەبێتە مایەی سەرسوڕمانی من ئەوەیە کە ئێمە سەرەڕای ئەوەی دەزانین فیرعەون مێشکێکی تەواوی نیە و بڕیارگەلێکی شێتانە دەردەکات، بەڵام هەر خۆشمان دەوێت و ملکەچی فەرمانەکانی دەبین.

"بك"وتی: من هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەم پیاوە هیچ ڕقێکی لەنەتەوەی میسر نیە و زۆر باوەڕی بەوشتانەیە کە دەیانهێنێتە زمان لەبەرئەوەی مرۆڤ هەست بەوە دەکات کە گوتەکانی لە کانگای دڵیەوە دەهێنێتە زامان، گوتەکانی پەسەند دەکات و خۆشی دەوێت.

"توتمس"وتی: بەڵام من ئەوم خۆش ناوێت و بگرە زۆر ڕقیشم لێیەتی. منیش وتم: کەواتە بۆچی دەتەوێت هەرئێستا کارگاکەی خۆت بەجێ بهێڵیت و بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی دەڕۆیت بۆئەوەی پەیکەری خوداکانی میسر بشکێنیت و تێك و پەکانیان بدەیت. "توتمس"وتی: لەبەرئەوەی دەزانم ئەم کارە لەناوبردنی فیرعەون خێراتر دەکات و ئێمەش چیتر لەشێتیەکانی ڕزگارمان دەبێت.

"هورم هب"وتی: "توتمس"تۆ درۆ دەکەیت و ڕقیشت لەفیرعەون نیە، ئەگەر ڕقیشت لێی بێت، کاتێك چاوت بەو دەکەوێت ئەم نەفرەت و ڕقەت لەناودەچێت و خۆشەویستی جێگای دەگرێتەوە، چونکە"ئەخناتون"بەشێوەیەك تەماشای مرۆڤ دەکات، کەمەحاڵە مرۆڤ لەبەرامبەریدا هەست بەکینە و ڕق بکات و زۆرجار ئەوە ڕویداوە کە من بەتوڕەییەوە خۆم کردووە بەبارەگاکەیدا و ویستومە شەڕ لەگەڵ

فیرعەوندا بکەم، بەڵام هەرئەوەی چاوم بە چاو و زەردەخەنەکانی کەوت، توڕەیی خۆم فەرامۆش دەکرد، سەرەڕای ئەوەی دەمزانی ئەو شێتە خۆشم دەوێست.

ئێمە لەکارگاکەی"توتمس"دا ئەم جۆرە قسانەمان دەکرد و دەمانخواردەوە و ئەو کەشتیانەی کە بەسەر ڕوباری"نیل"دا دەڕۆشتن دەمانبینی کە هەندێك لەوەجاخزادەکان بەسواری کەشتیەکانیان هەڵدەهاتن، بۆئەوەی خۆیان لەئاژاوە دور بکەنەوە، چونکە دەیانزانی کە گرفتاری ڕق و توڕەیی خەڵکی ئاسایی دەبن و هەندێکی تریش بەپیك و تەور و کوتەك ڕێگای شاری "تبس"یان گرتەبەر، بۆئەوە لەوێ پەیکەری خوداکان بشکێنن. ئەمانە لەکاتی ڕۆشتنیان لە شاری"ئاسۆ"وە بۆ"تبس"سرودی"ئاتون"یان دەخوێندو"توتمس"یش دەیوت: هەرئەوکاتەی ڕوبەڕوی خەڵکی ئاسایی ئەو شارە دەبنەوە، ئەو سرودە لەناو دەمیاندا خامۆش دەبێت. ئێمە ئەو ڕۆژە لەکارگای"توتمس"دا تاشەو خواردمانەوە، بەڵام لەباتی ئەوەی خۆشیمان پێ ببەخشێت، دەبووە هۆی مایەی وروژاندنی خەمەکانمان، لەبەرئەوەی دەمانزانی کە ئایندەیەکی تاریك چاوەڕێمان دەکات. شەو"هورم هب"منی کێشایە لاوە و وتی: "سنیۆهە"من سبەی لێرەوە دەڕۆم بۆ"ممفیس"و لەوێوە دەڕۆم بۆ"تانیس" بۆئەوەی بەرگری لێ بکەم، لەکاتێکدا نە ئاڵتونم هەیە و نە گەنم، لەبەرئەوەی تۆ پیاوێکی دەوڵەمەندیت، دەبێت هاوکاریم بکەیت.

وتم: منیش سبەی لێرەوە دەڕۆم بۆ"تبس"و دوای ئەوەی گەشتمە ئەوێ، تا ئەوشوێنەی بتوانم ئاڵتونت بۆ کۆدەکەمەوە و بۆتی دەنێرم هەروەها نیوەی گەنمەکانی خۆمت بۆ دەنێرم، چونکە نیوەکەی تریشی پێویستم پێی دەبێت بۆئەوەی سکی خەڵکی هەژاری میسری پێ تێر بکەم.

"هورم هب"دوای ئەوەی دڵنیا بوو کە من زێڕ و گەنمی بۆ دەنێرم، لەبەربەیاندا ڕۆشت، منیش لەگەڵ"توتمس"دا ڕێگای"تبس"م گرتە بەر. دوای چەند ڕۆژێك ڕوباری"نیل"چەند دیاریەکی لەشێوەی لاشەی ژن و پیاوو منداڵی بۆ هێناین و سەری هەندێك لەلاشەکان تاشراوبوو، ئێمەش لەوکاتەدا تێگەشتین کە ئەمانە کاهینەکانی "ئامون"ن و جلی گرانبەهاش لەبەری هەندێك لەمردوەکاندا دەبینرا و زانیمان کە ئەمانەش بەشێکە لەکەسە وەجاخزادەکان.

جەژنی مەزنی تیمساحەکانی ڕوباری"نیل"دەستی پێکرد و تیمساحەکانیش گیانەوەرگەلێکی ژیربون، بەهۆی زۆری لاشەکانەوە گرفتیان بۆ دروست بوبو، بۆیە

لاشەی پیرەکانیان نەدەخوارد، بەڵکو تەنها لاشەی منداڵ و ژنانی لاویان دەخوارد. من لەوباوەڕەدام ئەگەر تیمساحەکانیش وەك مرۆڤەکان خواپەرست بونایە، ئەوا شەو و ڕۆژ سوپاسگوزاری"ئاتون"دەبون، چونکە بەهۆی زاڵبونی"ئاتون"بەسەر خودایەکی تردا، ئەوهەموو خەڵکە بەکوشت دەدران و دەبونە ژەمی تیمساحەکان. کاتێك گەشتینە"تبس"بینیم لەچەند ناوچەیەکی شارەوە بۆنمونە لەشاری مردووەکانەوە– گۆڕستانی تبس– دوکەڵگەلێکی ستون ئاسا بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوە، چونکە لایەنگرانی "ئاتون"بۆئەوەی شێونەواری خوداکانی تر لەناو ببەن، هێرشیان کردووەتە سەر گۆڕەکان و لاشەی مۆمیاکراوەکان دەسوتێنن. ئەوکات سوپاسی خودام کرد کە دایك و باوکم گۆڕیان نیە، چونگە ئەگەر بیانبوایە، من لاشەی مۆمیاکراوی دایك و باوکمم لەگۆڕادا دەناشت، ئەوکات خەڵکیش لاشەی مۆمیاکراوی ئەوانیان لەگۆڕ دەردەهێنا و دەیانسوتاندن. لەوکاتەدا، پەیم بەوەبرد کە فیرعەونە کۆنەکانی میسر کە بۆ ناشتنی لاشەی خۆیان قوچەکیان دروست کردبوو، چەنێك ژیر بون، و بۆچی دوای دروستکردنی قوچەك و ناشتنی لاشەکان دەرگای قوچەکیەکانیان دادەخست، بۆئەوەی شوێنی چونە ژورەوەی نەزانرێت لەکوێوەیە، چونکە ئەوان پێشبینی ئەوەیان دەکرد کە ڕۆژێك دێت کە خەڵکی ڕادەپەڕن بۆئەوەی خوداکانی پێشوو لەناو ببەنو لەوڕۆژەدا پەیکەری خودایانی پێشوویان لەناو دەبردو جەستەی مۆمیاکراوە کانیان لەناو گۆڕدا دەردەهێنا و دەیانسوتاندن، بەڵام ناتوانن هێرش بکەنە سەرە قوچەکیەکان و لاشەی فیرعەون لەگۆڕەکاندا دەربهێنن و بیانسوتێنن، چونکە ئەو قوچەکە قەڵایەکە کە ڕێگای چونە ژور و هاتنە دەری نیە و هیچ کەسێك ناتوانێت بچێتە ناو ئەو قوچەکیەوە، بۆئەوەی لاشەی فیرعەنەکان تێدا لەناو ببات. لەوکاتەدا هیچ کەسێك لاشەی مومیاکراوی فیرعەونەکانی لەگۆڕەکاندا دەرنەهێنا بۆئەوەی بیسوتێنێت، لەبەرئەوەی لە"تبس"دا ڕێز لەفیرعەونەکان دەگیرا، ڕێزیان لەلاشەی مومیاکراوی کاهینەکانیش دەگرت، سەرەڕای ئەوەش خەڵکیان لەگۆڕەکاندا دەردەهێنا و دەیانسوتاندن، بۆیە لەوانەبوو ڕۆژێك بێت لاشەی فیرعەونەکانیش لەگۆڕ دەربهێنن و بیانسوتێنن، هەرلەبەرئەوەش بەبۆنەی ئەوەی فیرعەونە کۆنەکان قوچەکیان بۆ ئارامگای خۆیان دروست کردبوو بەپادشاگەلێکی دوربین لەقەڵەم دەدران و گۆڕی خۆیان بەشێوەیك بنیات نابوو کە لەهەموو دەست تێوەردانێك پارێزراو بێت.

*بەشی چل و سێیەم*

# کاری تازەم لە"تبس"دا

کاتێك ئێمە خۆمان کرد بە"تبس"دا خاچمان لەمل کردبوو و بینیمان کۆمەڵێك لەهەڵگرانی خاچ، شاخدارەکانیان فڕێ دەدایە ناو ڕوباری نیلەوە و ئەوەندە داریان دا بەنێوچاویاندا تا نوقمی ئاو بون و چیتر سەرئاو نەکەوتنەوە.

ئێمە تێگەشتین کە لە"تبس"دا هەڵگرانی خاچ داگیرکەرن و خودایانی کۆنیان لەناو بردووە، ئێستا"ئاتون" خودایەکە کە هاوتای نیە و فەرمانڕەوایی"تبس"دەکات.

من بە"توتمس"م وت: دەبێت هەرچی زووترە بڕۆین بۆ مەیخانەی"کلکی تیمساح"، چونکە لەوێ شوێنێکی هێمن و ئارامە، ئێمەش بەچەکوش و تەور بەدەستەوە ڕێگای مەیخانەمان گرتەبەرو کاتێك خۆمان کرد بەمەیخانەدا، بینم"کاپتا"جلە نایابەکانی لەبەر داکەندووە و جلێکی کۆن و دڕاوی پۆشیوە و ڕوپۆشی ئاڵتونی چاوەکەشی لابردووە و چاوە کوێرەکەی ئاشکراکردووە و وتاربێژی بۆ کۆمەڵێك نۆکەرانی ڕوت و ڕەجاڵی"تبس"دەکات و دەڵێت: براکانم بخۆنەوە و شادی بکەن، چونکە جیهانێکی نوێ دەستی پێکردووە و دوای ئەوە چیتر خاوەن و نۆکەرو وەجاخزادە و هەژار بونی نابێت و هەموو کەسێك لەبەرامبەر یەکتردا یەکسانن‌و هەموو کەسێك ئازادە کە بڕوات بۆ هەر شوێنێك کە خۆی بیەوێت و هەرکارێك کە خۆی حەزی لێدەکات بیکاتە پیشەی خۆی و من لەمڕۆدا ئاوجۆ بەخۆڕایی بەنێوتاندا دابەش دەکەم، بەمەرجێك دوای بەدەستهێنانی کانزاکان، منتان لەبیر نەچێت و کاتێك پەرستگای خودا درۆینەکانتان تاڵان کرد، ئەوەی بەدەستی دەهێنن، لەم مەیخانەدا خەرجی بکەن، و منیش وەك ئێوە نۆکەرم و بەنۆکەریش

لەدایك بوم و چاوێکم خاوەنەکەم کوێری کرد، چونکە ڕۆژێکیان تینو و برسیم بوو و گۆزەی ئاوجۆکەیم هەڵقوڕی و ئەویش بەشێوەیەك دارکاری کردم کە بووە هۆی ئەوەی چاوێکم کوێر ببێت. بەڵام ئەم ستەمکاریانە لەئاییندەدا دوبارە نابنەوە و چیتر لەمەودوا، بەناونیشانی ئەوەیکە کە نۆکەرە دارکاری ناکرێت و چاوی لەبەر تەنها گۆزەیەك خواردنەوەدا کوێر ناکرێت و هیچ کەسێك بەبۆنەی ئەوەیکە نۆکەرە بەدەستەکانی خۆی کار ناکات، بەڵکو تا ئەو ڕۆژەی زیندوین، کارمان خواردن و خواردنەوە و سەماکردن و خۆشگوزەرانی دەبێت.

لەوکاتەدا"کاپتا"چاوی بەمن و"توتمس" کەوت و زۆر سەری بەبینینی ئێمە سوڕما و بەپەلە ئێمەی لەسەکۆی مەیخانەکەوە بردە یەکێك لەژورە تایبەتەکانی مەیخانە و وتی: ئێوە زۆر کەمتەرخەم بون کە بەم جلانەوە بەناو شاردا تێپەڕیون و هاتون بۆ ئێرە، ئەگەر دەتانەوێت گیانتان پارێزراو بێت، جلەکانتان بگۆڕن و جلێکی کۆنە لەبەربکەن و سەروچاوتان قوڕاوی بکەن، بۆئەوەی وا بزانن کە لەچینی کرێکارەکانن. چونکە ئەمڕۆ لە"تبس"دا هەرکەسێك جلێکی گرانبەهای لەبەردا بێت، لەلایەن کرێکار و نۆکەرەکانەوە بەکوشت دەدرێت، بگرە ئەو کەسانەش کە قەڵەون دەکوژن، ئەگەر دەبینن کە منیان هێشتا نەکوشتووە، لەبەرئەوەیە کە دەزانن من لەڕابردوودا نۆکەر بوم، سەرەڕای ئەوەش بڕێك گەنمم بەنێو نۆکەرەکاندا دابەش کردووە و لەم مەیخانەشدا بەخۆڕایی ئاوجۆم پێداون، بەڵام ئێوە بۆچی لەم کاتەدا کە گیانی کاربەدەستانی دەوڵەت لەژێر هەڕەشەی مەرگدایە هاتون بۆ "تبس"؟

ئێمەش ئەو چەکوش و تەورەی لەگەڵ خۆماندا هێنابومان پیشانی"کاپتا"مان دا و وتمان: هاتوین بۆئەوەی خوداکانی میسر لەناو ببەین و پەیکەرەکانیان تێك بشکێنین.

"کاپتا"تەماشایەکی چەکوش و تەورەکەی کرد و وتی: ئەوکارەی کە دەتانەوێت ئەنجامی بدەن خراپ نیە، لەبەرئەوەی خەڵکی ئەمڕۆ، ئەنجامدانی ئەم کارە پەسەند دەکەن، بەڵام دەبێت ئاگاداری ئەوە بن کە نەتانناسنەوە، چونکە لەوانەیە گۆڕانکاری بەسەر بارودۆخدا بێت و شاخدارەکان وەك ڕابردوو فەرمانڕەوایی بگرنەوە دەست، کە لەم حاڵەتەدا ئێوە بەکوشت دەدەن.

من دڵنیام کە بارودۆخ بەم شێوەیە نامێنێتەوە، چونکە نۆکەر و کرێکارەکان تاوانگەلێکی وایان ئەنجام داوە کە کۆمەڵێك لەهەڵگرانی خاچ لەگەڵ شاخدارەکان

هاودەست بوون و دەیانەوێت هێمنی و ئارامی بگەڕێننەوە بۆ"تبس"، ئەگەر خەڵکیش بۆ پاراستنی سیستەمی ئاسایش و ئارامی شار هاودەستی یەکتر نەبن، ئەوا سەرەڕای ئەوەش ئەم حاڵە بەم شێوەیە بەردەوام نابێت، چونکە نۆکەران و کرێکاران والێکی دەدەنەوە کە چیتر دوای ئەوە پێویستیان بەکارکردن نیە و دەتوانن لەڕێی تالانی و فەرهود کردنەوە خۆیان تێر بکەن، لەکاتێکدا زێڕو و زیو ناخورێت و گەنم لەمیسردا دەست ناکەوێت.

من لەلایەکەوە خۆشحاڵم بەوەی فیرعەون کۆیلەکانی ئازاد کردووە،چونکە ئەم بڕیارە دەبێتە هۆی ئەوەی من لەکۆمەڵێك نۆکەری نەخۆش و پیر ڕزگارم ببێت، ئەگەر فیرعەون ئەمانەی ئازاد نەکردایە، سەرەڕای ئەوەی نوکەری من یان هی تۆ بون، ناچار بوم تا ئەو ڕۆژەی زیندون خواردنیان پێبدەم بێئەوەی سودی ئەوتۆیان لێ وەرگرم، بەڵام ئێستا هەموویان وا لێکی دەدەنەوە کە چیتر دوای ئەوە بێکارکردن خواردنیان دەست دەکەوێت، دڵنیام ئەو کرێکارانەی کە لەڕێی دزی و فەرهود کردنەوە بژێوی ژیانی خۆیان دابین دەکەن، بەزوویی بەهۆی نەبونی گەنم و لەناوچونی سامانی فەرهود کراوەوە برسیان دەبێتەوە، ئەوکات ناچار دەبن کار بکەن بۆئەوەی خواردنێکی نیوە تێر بخۆن، ئەوکات من دەتوانم بەموچەیەکی کەم کرێکارانی بەهێز هانی کارکردن بدەم و هەرکاتێکیش کارم پێیان نەما، دەستبەرداریان بم و دڵنیام کە چیتر لەمەو دوا کرێی یەك ڕۆژی کرێکارێك دەبێتە یەك نان.

وتم: "کاپتا"بەهۆی ئەوەی تۆ باسی نان و گەنمت کرد، ئەوەم هاتەوە یاد کە من بەڵێنم بە"هورم هب"داوە کە گەنمی بۆ بنێرم، بۆیە بڕیاری ئەوەم داوە نیوەی گەنمەکەی خۆمی پێبدەم، بۆئەوەی بتوانن لەبەرامبەر لەشکری سەربازی "هاتی"بەرگری لە میسر بکەن. بۆیە تۆ دەبێت نیوەی گەنمەکەی من باری کەشتی بکەیت و بینێریت بۆ"هورم هب" لە"تانیس" و نیوەکەی تری وردە وردە بهاڕە و بیکە بەئارد و نانی لێ دروست بکەن و بیدەن بەخەڵکی و ئەوکەسانەی لەلایەن تۆوە نان بەخەڵکی دەدەن، مافی ئەوەیان نیە هیچ کانزایەك لەبەرامبەر ئەم نانەدا لەخەڵکی وەرگرن، بەڵام دەبێت بڵێن((ئەم نانە لەلایەن"ئاتون"ەوە دەدرێت بەئێوە، بیخۆن و ستایشی"ئەخناتون" بکەن)).

"کاپتا"کاتێك گوێ لەم قسەیە بوو، جلەکانی بەری بەهۆی ئەوەی کۆنە بون و بەهایەکی ئەوتۆیان نەبوو دڕی و دەستی کرد بەگریان و بەدەم گریانەوە وتی: "سینۆهە"گەورەم، ئەم کارەی تۆ دەبێتە هۆی ئەوەی ئێمە شکست بخۆین و بۆ تیکە نانێك دەست بۆ خەڵکانی تر درێژ بکەین، بەڵام خەڵکانی تر وەکو تۆ شێت نین کە گەنمی خۆیان بکەن بەئارد و دواجار بیکەن بەنان و بیدەن بەئێمە. وای بەحاڵم کە زیندوو ماوم و دەبێت ئەم ڕۆژە ڕەشە بەچاوی خۆم ببینم، ئاخر تۆ بۆچی دەتەوەێت گەنمی خۆت کە لەمڕۆ بەدواوە بەهاکەی بەئەندازەی کێشانەی خۆی کانزایە بکەیت بەئارد و دواجار بیکەیت بەنان و بەنێو خەڵکیدا بەشی بکەیت بۆئەوەی بیخۆن...ئایا تۆ وا دەزانی کاتێك خەڵکی نانی تۆیان خوارد سوپاست دەکەن؟ بگرە ئەگەر بیشتوانن تۆ بەکوشت بدەن، ئایا چاوپۆشی لەکوشتنی دەکەن؟

هیچ کەسێك سوپاس گوزاری تۆ نابێت، هەر یەك لەو کەسانەی کە نانێکی تۆی دەست دەکەوێت، دەڵێت کە تۆ پیاوێکی دەوڵەمەندی و بەپێی فەرمانی خودای تازە دەبێت وەك ئێمە هەژار بکەویت و دەبێت گەنم و نانی تۆ خەڵکانی تر بیخوات و ئەم"هورم هب"ەش کە تۆ دەتەوێت نیوەی گەنمەکەتی پێبدەیت لەچەتەیەك خراپترە، چونکە کاتێك چەتەیەك شتێك لەکەسێك زەوت دەکات، ڕو و ڕاست پێی دەڵێت کە ئەوەی لێی وەرگرتووە بۆی ناگەڕێنێتەوە، بەڵام"هورم هب"زێڕی لێ وەرگرتین و وتی بەقازانجەوە بۆمانی دەگەڕێنێتەوە، بەڵام من نامەیەکم بۆ نوسی و پێم وت: کە قەرزی خۆی بداتەوە، لەوەڵامدا نوسیبوی: وەرە وەریگرەرەوە. وتم: "کاپتا"تۆ دەزانی هیچ کاتێك ئاڵتون و گەنم وەکو خەڵکی لەبەرچاوی مندا هیچ بەهایەکیان نەبووە و ئەمڕۆش"هورم هب"پێویستی بەگەنمی منە بۆئەوەی خواردن بدات بەلەشکرەکەی خۆی، لەهەمان کاتیشدا نەتەوەی میسریش برسیەتی و من خاوەنی گەنمێکی زۆرم، ناتوانم بەرگەی ئەوە بگرم کە لەبەرچاوی مندا هێزەکانی"هاتی"دەست بەسەر میسردا بگرن و خەڵکی لەبرساندا بمرن، بەڵام من گەنمی خۆم ئەشارمەوە بۆئەوەی لەدواڕۆژدا بەنرخێکی گرانتر بیفرۆشمەوە، بۆیە ئەوەی پێم وتی جێبەجێی بکە و دەست لەگریان و هاوارکردنت هەڵگرە، چونکە کاتێك چاوی گریانی هەزاران منداڵ برسی ببینم، ئەوکات بەزەییم بەفرمێسکەکانی تۆدا نایەتەوە.

"کاپتا"سەری دانەواند و وتی: گەورەم، من سەرەڕای ئەوەی دەزانم کە شکست دەهێنیت، ناچارم ملکەچی فەرمانەکانت ببم. ڕۆژی دوایی دوای ئەوەی جلەکانمان گۆڕی، لەکاتێکدا کە چەکوش و تەورمان بەدەستەوەبوو ڕومان لەشەقامەکانی "تبس"کرد بۆئەوەی بزانین بارودۆخی شار چۆنە. کەسە وەجاخزادەو دەوڵەمەندەکان ماڵەکانیان گۆڕیبوو بە قەڵایەکی بەرگریکاری جەنگی و چواردەوری خۆیان تەنیبو بۆئەوەی لەهەڕەشەی خەڵکی پارێزراو بن.

هەندێك لەپەرستگاکان لەحاڵی سوتاندا بون و هیچ کاهینێکی تێدا بەدی نەدەکرا و دیاربوو کە کاهنی پەرستگاکانیان کوشتبوو.

لەو پەرستگایانە جگە لە پەیکەری خودایانی میسر هیچ شتێکی تر بەدی نەدەکرا و تەواوی ئەو شتومەکانەی کە شایستەی فرۆشتن بون فەرهود کرابوو.

ئێمەش بەهۆی ئەو چەکوش و تەورەی بەدەستمانەوە بوو لەو پەرستگایانەدا هەرچی پەیکەری خودایان بوو دەمانشکاند و هەوڵی ئەوەشمان دەدا ناوەکانیان بسرینەوە.

هەندێك لەپەرستگاکانیش وەك ماڵە دەوڵەمەندەکان بوبو بەقەڵایەکی جەنگی و کاهینەکانیش بێئەوەی لەمەرگ بترسن، بەرگریان لەخودایانی خۆیان دەکرد و ئێمەش دەمانزانی کە ناتوانین بچینە ئەو جۆرە پەرستگایانەوە.

هەموو ڕۆژێك کاری من و"توتمس"ئەوە بوو کە بۆ شکاندنی پەیکەری خودایان و سڕینەوەی ناویان دەبێت لەماڵ دەربچین و شەویش بەشەکەت و ماندویی دەگەڕاینەوە بۆماڵ یان دەڕۆشتین بۆ مەیخانەی"کلکی تیمساح".

ماڵی من هەمان ماڵی مسگەری پێشوی شاری"تبس"بوو، لەوماڵەدا خزمەتکارەکەم خواردنی بۆ لێدەناین و "تهوت"یش بەدەستە بچوکەکانی باوەشی بەملمدا دەکرد و منی بەناوی"باوك"بانگ دەکرد، کاتێکیش"مریت" لەمەیخانە نەبوایە لەماڵدا بەمهرەبانیەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکردم، بەڵام ئێمە شەوانە بەهۆی ئاژاوە و ژاوەژاوی تەواوی خەڵکیەوە نەماندەتوانی بخەوین.

نۆکەر و کۆڵبەر و کرێکارەکان کۆمەڵێکیان دروست کردبوو بۆئەوەی بتوانن بەکۆمەڵ و پێکەوە هێرش بکەنە سەر ماڵی وەجاخزادە و دەوڵەمەند و پەرستگاکان و سەروەت و سامانیان تاڵان بکەن و ئەوەی بەدەستی دەهێنن لەنێو خۆیاندا بەشی

بکەن. هەندێك لەوانە بەڕۆژدا دەخەوتن و شەویش دەستیان بەدزی و تالانی دەکرد و هەندێکی تریان بەڕۆژدا سامانی خەڵکیان فەرهود دەکرد و شەوانەش دەحەوانەوە، بۆیە بەردەوام ژاوە ژاو و گاڵەی ئەمانە دەبیسترا.

کاربەدەستانی فیرعەون نەیانتوانی ڕێ لەم تالانی و دزییە بگرن، چونکە لەزۆری خەڵکی دز و تالانچی نەیاندەزانی چی بکەن، چونکە فیرعەون داوای لەتەواوی شوێنکەوتەکانی کردبوو کە دەست لەکارەکانیان هەڵگرن و بڕۆن خودایانی میسر لەناو ببەن، ئاساییە کە ئەم جۆرە کارانە بێ کوتەککاری و ڕووبەڕووبونەوە ئەنجام نادرێت.

لەڕاستیدا فیرعەون بەدەرکردنی ئەم فەرمانە، خەڵکی لەکوشتن و فەرهود و بزیکردن ئازاد کرد و کاربەدەستانی"تبس" کە ئاگاداری ئەم بابەتە بون بەهیچ شێوەیەك ڕێگایان لێ نەدەگرتن، سەرەڕای ئەوەی کە چیتر لەتوانایاندا نەبوو ڕێگریان لێ بکەن، سەدان یاسا و سیستەم شکێنرابوو و کاربەدەستانی فیرعەونیش دەیانزانی ئەگەر ڕێگایان لێ بگرن بەدڵنیاییەوە دەکوژرێن. لەڕۆژانێکی ئاوا کوشتن و دزی و فەرهودکردندا، تەنها لەشکرێکی جەنگی کە خاوەنی سەربازگەلێکی بەئەزمون و زۆر و چەکێکی زۆر و گالیسکەی جەنگیەکی زۆر بێت دەتوانێت ڕێی لەم فەرهودی و کوشتنە بگرێت و خەڵکی هانی ئەوە بدات گوێڕایەڵی فەرمان و یاسا و سیستەمەکان بن. بەڵام خودی فیرعەون فەرمانی ئەوەی دابوو کە ئەم بارودۆخە بێتەبون، هیچ کاتێك فەرمانی بە فەرماندەی لەشکرەکانی خۆی نەدەدا کە ئاسایش و ئارامی لە"تبس"دا بەرقەرار بکەن، لەبەرئەوەی هێشتا هەندێك پەرستگای پەیوەست بەخوداکانی پێشوو مابون و بەرگریان لەخۆیان دەکرد و ئامادە نەبون باوەڕ بەخودای"ئاتون"بهێنن.

"کاپتا"کۆمەڵێکی بۆ هاڕینی گەنم و دروست کردنی نان بەکرێ گرت و هەموو ڕۆژێك بڕێك نانی دروست دەکرد، بەڵام لەکاتی دابەشکردنی نان بەسەر هەژاراندا دوچاری کێشە و گرفت دەبوو، چونکە هەرئەوەی کرێکارەکانی لەشەقام و کۆڵانەکاندا دەردەکەوتن هەموو خەڵکیان بەسەردا دەڕژا و نانەکانیان بەزۆر لێ دەفڕاندن و دەیانوت ئەم نانە هی ئێمەیە، هەروەها دەیانوت دەوڵەمەندەکان دەستیان بەسەر نانی ئێمەدا گرتووە و ئێستاش دەبێت ماف بگەڕێتەوە بۆ خاوەن ماف و هیچ کەسێك سوپاسگوزاری من نەدەبوو.

چل شەو و چل ڕۆژ بارودۆخی"تبس"بەوشێوەیە بوو، من کەسانێکم بینی کە لەڕابردوودا ئاڵتونیان بەترازوو دەکێشا، ئێستا لەشەقامەکاندا سواڵیان بۆ بەدەست هێنانی نانێك دەکرد. من بەچاوی خۆم دەمبینی کە ژنانی هەمان ئەم پیاوانە بۆئەوەی منداڵەکانیان لەبرساندا نەمرن خۆیان دەدا بەدەست کۆیلەکانەوە. نە بەزەیی بونی هەبوو و نە یاسا و نە باوەڕ بە"ئاتون".

بەڕوکەش"ئاتون"لە"تبس"دا فەرمانڕەوایی دەکرد، بەڵام لایەنگرانی بەواتا نۆکەران و کرێکاران ئەگەر لەتوانایاندا بوایە ئەوا وەجاخزادە و ئەو دەوڵەمەندانەشیان دەکوشت کە لایەنگری"ئاتون"بون تەنها بۆئەوەی دەست بەسەر سەرەوەت و سامانەکەیاندا بگرن.

چلهەمین ڕۆژ، "کاپتا"پێی وتم: گەورەم، کاتی ئەوە هاتووە لە"تبس"هەڵبێیت، لەبەرئەوەی سەردەمی خودای"ئاتون"بەم زوانە کۆتایی پێدێت و هیچ کەسێکیش خەم بۆ سەرنگون بونی ناخوات، چونکە قۆناخی خودای"ئاتون"خراپترین قۆناخی "تبس"بووە و هەموو خەڵکی بۆ ئەم شارە خوازیاری یاسا و سیستەمێکن، بەڵام ئەم کارە بێ خوێنڕێژیگەلێکی تازە ئەنجام نادرێت، بۆیە تیمساحەکانی ڕوباری"نیل" دوبارە ڕۆژگەلێکی خۆش چاوەڕێیان دەکات.

وتم: تۆ بەچ شێوەیەك دەڵێت کە قۆناخی خودای"ئاتون"لەم شارەدا کۆتایی پێدێت.

"کاپتا"وتی: کاهینەکانی ئامون و کاهینەکانی خودایانی تر بۆ ڕیشەکێشکردنی زۆری لایەنگرانی"ئاتون"دەستیان ناوەتە دەستی یەکترەوە و بڕیاری ئەوەیان داوە کە"ئاتون"لەناو ببەن، ئەگەر بۆ لەناو بردنی ئەم خودایەش پێویست بکات تەواوی دانیشتوانی"تبس"بەکوشت بدەن.

پرسیم: تۆ بە چ شێوەیەك ئاگاداری ئەم بابەتە بویت؟

"کاپتا"وتی: من هیچ کاتێك پەیوەندی خۆم لەگەڵ"ئامون"دا نەپچڕاندووە و بەردەوام لەگەڵ کاهینەکانی"ئامون"دا پەیوەندیم هەیە، چونکە زێڕم بەقەرز دەدانێ و

لەبەرامبەردا زەویەکانی"ئامون"م وەك "گرەو"[29]"ێك لێیان وەردەگرت، من لەم کارەدا دوو سودم لەبەرچاو گرتبوو، یەکەم ئەوەیکە قازانج بکەم، چونکە دەمبینی کە کاهینەکانی"ئامون"هەم بەڵگەنامە و هەم قازانجیان پیێ دەدام. دووەم ئەگەر بارودۆخ گۆڕانکاری بەسەردا هات، بتوانم پارێزگاری لەگیان و دارایی خۆم بکەم و کاهینەکانی"ئامون"من بەیەکێك لەخۆیان لەقەڵەم بدەن و وەك ئەوانی تر بەکوشتم نەدەن.

ئێستا"ئامی"کە لەڕابردوودا کاهینی مەزنی خودای تازە بوو، بۆ پاراستنی گیان و دلرایی خۆی لەگەڵ کاهینەکانی"ئامون"هاودەست بووە و ئەو و کاهینەکانی"ئامون"و تەواوی وەجاخزادەو دەوڵەمەندەکان یەکێتیەکی مەزنیان پێکهێناوە و ئەوانەی ئامادە نین ئەنگوستیلەیەکی "مس"بدەن بۆ تێرکردنی کەسە برسیەکان، بیێ هیچ پێداگریەك زێڕ و زیویان خوستووەتە بەردەستی ئەم یەکێتیە مەزنەوە بۆئەوەی بتوانن بەو زێڕ و زیوە سەربازانی پیێ بگرن بەکریێ.

دوای ئەوە "کاپتا" وتی: کاهینەکانی"ئامون"و "ئامی"و وەجاخزادەکان، سەربازەکان لەنێوان ئەو ڕەشپێستانەی کە لەباشوری میسردا نیشتەجێن و دانیشتوانی"شوردن"دا بەکریێ بگرن و بەیەکجاری هێرش بکەنە سەر"ئاتون"و لایەنگرانی لەناو ببەن. بۆیە گەورەم لەبەرئەوەی تۆ یەکێکیت لەلایەنگرانی بەناوبانگی"ئاتون"و زۆرێك لەخەڵکی"خاچی ژیان"یان کەبەردەوام بەملتەوە هەڵتواسیبوو بینیوە، ئەوا بەدڵنیاییەوە بەدەستی کاهین و سەربازەکانیان بەکوشت دەدرێیت.

منیش وتم: فیرعەون ڕێیان پێنادات کە"ئاتون"لەناو ببەن.

---

[29] گرەو: وشەیەکی پاراوی کوردیە کە دەتوانرێت لەبەرامبەر"ڕەهن"ی عەرەبیدا بەکار بهێنرێت، چونکە ڕەهنیش هەمان واتای"گرەو"ی هەیە، چونکە کاتێك تۆ شتێك دەدەیت بە"ڕەهن"واتای ئەوە دەگەیەنێت تۆ گەرەوێکت لەگەڵ کەسێکدا کردووە کە ئەگەر لەکاتی خۆیدا ئەو شتەی لێت وەرگرتووە بۆی نەگەڕێنیتەوە، ئەوا ئەو کەسە ئەو شتەی بەرەهن پێت داوە دەستی بەسەردا دەگرێت، بۆیە ئەم مامەڵەیە دەقاودەق وەك گرەو وایە، کاتێك گرەو لەگەڵ کەسێکدا دەکەیت ئیتر لەسەر شتێك بێت یان شتێکی لیێ قەرز بکەیت و لەکاتی دیاری کراودا بۆی نەگەڕێنیتەوە ئەوەی وەك گرەوێك لەلای ئەو داتناوە دەیدۆڕێنی یان بەشێوەیەکی جوانتر دەتوانین بڵێین لەبەرامبەر ئەوشتەی کە لێت وەرگرتووە یان لێت قەرز کردووە دەستی بەسەردا دەگرێت.......وەرگێڕ.

"کاپتا"وتی: هیچ کەسێك داوای مۆڵەت لە فیرعەون ناکات، بۆئەوەی ڕێی پێبدات یان نەیدات و دوای ئەوەی کاهینەکان دەست بەکاربون و خودای"ئامون"و خوداکانی تر دەستیان پێکردەوە، ئەوا تەواوی ئەو ڕێگایانەی کە بەرەو"ئاسۆ"دەڕۆن دەبڕن، هەڵبەت بەشێوەیەك هیچ شتومەك و خواردنێکی بۆ نەڕوات و دانیشتوانەکەشی لەبرساندا دەمرن. ئەوکات"ئاتون"و کاهینەکانی فیرعەون ناچار دەکەن لە شاری"ئاسۆ" دەربچێت و بێنەوە بۆ"تبس" و لەبەرامبەر"ئامون"دا سوژدە ببەن. قسەکانی"کاپتا"زۆر کاری تێکردم، لەهەمان ئەوکاتەدا بەژن و باڵای فیرعەون و چاو و زەردەخەنەکانی هاتەوە بەرچاوم و زۆر دڵم بۆی سوتا.

فیرعەون هەموو تەمەنی خۆی بۆ ئەوە تەرخان کردبوو کە"ئاتون"باڵا دەست بێت و دەستەڵاتی خۆی بەرفراوان بکات و جەنگ و کینە و جیاوازیەکان لەنێوان دەوڵەمەند و هەژاردا لەناو ببات.

بەڵام ئەوەی"کاپتا"باسیکرد ئەوە نیشان دەدا کە تەواوی هەوڵەکانی فیرعەون "با"دەبیات و دوبارە قۆناخی فەرمانڕەوایی کاهینەکانی"ئامون"دەست پێدەکاتەوە و دوبارە بەنرخو بەهای بەدبەختیو برسیەتی نۆکەرانو کرێکارانو جوتیاران خەزێنەکانیان پڕ دەکەن لەزێڕو زیوو دەست بەسەر نیوەی زەویە بەپیتەکانی میسردا دەگرن.

وتم: "کاپتا"ئەم ڕسواییە نابێت بێتە بون، چونکە ئەگەر"ئامون"جارێکی تر ببێتەوە بەخودا و کاهینەکانی دەستەڵات بگرنەوە دەست، لەوباوەڕەدا نیم کە تا یەکساڵی تر جیهان لە ستەم و زۆرداری جیاوازیەکانی نێوان دەوڵەمەند و هەژار ڕزگار ببێت. ئەی"کاپتا"من لەمڕۆدا تاڕادەیەك هەژار کەوتوم، بەڵام تۆ دەوڵەمەندی و خۆت دان بەوەدا دەنێیت کە سامان و دارایی خۆت لەڕێی منەوە بەدەست هێناوە، بۆیە تۆ دەتوانیت بەو سامانەی کە ماوەمە لەگەڵ سامانەکەی خۆتدا هێزێکی سەربازی پێ بەکرێ بگریت و من پێت دەڵێم تا دەتوانی شمشێر و نێزە و گورز بکڕە و کۆمەڵێك کرێکار و نۆکەر دەستنیشان بکە و ئەم چەکانە بەنێویاندا دابەش بکە، بۆئەوەی لەو ڕۆژەی کە کاهینەکانی"ئامون"دەستیان بەڕاپەڕین کرد کرێکاران و نۆکەرەکان بەرگری لەخودای خۆیان بکەن و نەهێڵن"ئاتون"لەناو بچێت. چونکە ئەگەر لەمڕۆدا"ئاتون" لەناو بچێت، تاکە هەلی ڕزگاری جۆری مرۆڤ لەناو دەچێت. چونکە هێشتا زەویگەلی

دەوڵەمەندەکان﴿بێ لەزەویەکانی"ئامون"﴾ بەنێو جوتیارەکاندا دابەش نەکراوە و گەرچی دەڵێن هیچ جیاوازیەك لەنێوان هەژاران‌ودەوڵەمەنددا نیە، بەڵام ئەم جیاوازیە هێشتا بەکرداری ماوەتەوە و دەوڵەمەندەکان دەوڵەمەندترن‌وکرێکاران‌ونۆکەرانیش هێشتا هەژار، بەڵام ئەگەر"ئاتون"بۆماوەیەك بکەن بەخودای خۆیان، بێگومان گومانی جیاوازی نێوان دەوڵەمەند و هەژار لەناو دەچێت و زەوی کەسە دەوڵەمەندەکان بەسەر هەژاراندا دابەش دەکرێت و لەو ڕۆژەدا هەموو کەسێك کار دەکات و هیچ کەسێك ناتوانێت بێکار سود لەبەرهەمی کاری نۆکەران و جوتیاران وەرگرێت."کاپتا"تۆ لەڕابردوودا لەهەموو شوێنێکدا لەگەڵ مندا بویت و لەهیچ شوێنێکدا بەجێت نەهێشتوم، بۆیە ئێستاش داوات لێ دەکەم بەجێم مەهێڵە و لەگەڵ مندا وەرە، بۆئەوەی پێکەوە ئەم کارە تەواو بکەین و بیگەیەنینە جێی خۆی و نەهێڵین خودای تازە لەناو بچێت و فیرعەن بێهیوا ببێت، چونکە ئەگەر خودای تازە سەرنگون ببێت، سەرەڕای ئەوەی تەختی فەرمانڕەوایی ستەم بەرپا دەبێتەوە، فیرعەونیش لەنائومێدیاندا دەمرێت.

کاتێك"کاپتا"گوێی لەم قسانە بوو لەرزی لێهات، بەڵام ئەمجارەیان نەگریا. ئەگەر بگریایە تێدەگەشتم کە دەیەوێت فێڵم لێ بکات، بەڵام لەبەرئەوەی فرمێسك لەتاکە چاوەکەیەوە نەتکایە خوارەوە تێگەشتم کە ترساوە و دوای ئەوە وتی: گەورەم، ئەگەر خودای نوێ دەستەڵاتی خۆی بپارێزێت، من کە پیر بوم، ناچار دەبم چیتر دوای ئەوە دەست بەکار کردن بکەمەوە، لەکاتێکدا جەستەم توانای کاری نەماوە، ئەگەر خودای تازە بمێنێتەوە، من وەك هەندێك لەوەجاخزادەکانی ئەمڕۆ بەئاشەکانەوە دەبەستنەوەو ئەوەندە قامچیم لێ دەدەن تا گیان دەسپێرم.

گەورەم"سینۆهە" ئایا لەبیرتە جارێکیان لە"کریت"پێت وتم کە بچمە ماڵی ڕەشی خودای"کریت"کە ناوی"مینوتور"بوو، منیش بەگوێم کردی و لەگەڵ تۆدا خۆم کرد بەماڵی خودای"کریت"دا. ئەم جارەشیان تۆ دەتەوێت خۆت بکەیت بەماڵێکی ڕەشدا و نازانی ئەو ماڵە لەناوەوە چی لەخۆ دەگرێت و لەوانەیە جارێکی تر گیانەوەرێکی ترسناك ببینی کە مردبێت‌و لاشەی وەك ئەو گیانەوەرەکەی تر هەڵوەشابێت، چونکە بەو شێوەی ئێمە لێی تێدەگەین خودای"ئەخناتون" لە"مینوتور"ی خودای"کریت" ترسناکترە.

خودای"کریت"لەبەرامبەر"گا"یەکدا سەمای بە کچ و کوڕی جوان دەکرد و هەموو مانگێك کچێکی جوانی دەکردە ژەمی خواردنی خۆی، بەڵام خودای نوێی فیرعەون هەزاران ژن و پیاو دەکاتە قوربانی خۆی....نەخێر گەورەم....ئەمجارەیان من لەگەڵ تۆدا خۆم ناکەم بەلانەی خودای ڕەشدا.

"کاپتا"نەدەگریا و هەربەوشێوەیە بەبڕوا بەخۆبونێکی تەواوەوە قسەی دەکرد، هەر بۆیە تێگەشتم لەوەی کە ئەو بەهەموو بیروباوەڕێکیەوە ئەو قسانە دەکات.

دوای ئەوە نۆکەری ڕابردوم وتی: ئەگەر بەزەییت بەخۆتدا نایەتەوە و ئەگەر لەبیری مندا نیت، هیچ نەبێ بیر لە"مریت"و"تهوت"ی بچوك کە هەردوکیان تۆیان خۆش دەوێت بکەرەوە و ئەوان لەم شارە دور بخەرەوە، چونکە من دەزانم کە گیانی هەردوکیان لەهەڕەشەی مەرگدایە، چونکە ئەو ڕۆژەی کاهینەکانی"ئامون"و وەجاخزادەکان بەتوڕەییەوە بکەونە ڕێ نە بەزەییان بەپیاو و نە بەژن و نە بەگەورە و نە بەبچوکدا دێتەوە. کاهینەکانی"ئامون"کە بەیەکجاری فریوی بیروباوەڕە لاوازەکانی خەڵکیان خواردووە، بەهۆی بێلایەنی زۆربەی خەڵکی میسرەوە دەستەڵاتی خۆیان لەدەست دابوو، بۆیە بۆ نوێکردنەوەی دەستەڵاتی خۆیان ئەگەر پێویست بکات زۆربەی خەڵکی میسر لەناو دەبەن، چونکە ئەمەیان بەلاوە باشترە لەوەی بەئەندازەی ڕێز و خۆڵی بیابان ژن و پیاو هەبن و پەیڕەوی لەخودای نوێ بکەن.

وتم: "کاپتا"من دەزانم تۆ بۆچی دەترسیت، چونکە دەوڵەمەند بویت، من ئەوەم تاقی کردووەتەوە کە سامان و دارایی مرۆڤ ترسنوك و بێ کەسایەتی و سازشکار دەکات، چونکە ترسی ئەوەی هەیە سەروەت و سامانی خۆی بەهۆی بارودۆخە هەڕەشە ئامێزەکانەوە لەدەست بدات و هەژار بکەوێت، تۆ لەبەرئەوەی سامانت هەیە لەئاژاوەی کۆمەڵێك خەڵك و چەند کاهینێکی کەچەڵ و چەند وەجاخزادەیەك دەترسی و وا هەست دەکەیت ئەمانە دەتوانن بەسەر زۆربەی خەڵکی میسر کە هەژارن زاڵ بن، لەکاتێکدا مەحاڵە خەڵکی دوای ئەوەی تامی ئازادیان کردووە، ئامادە بن دوبارە بچنەوە ژێر باری جەور و ستەمی"ئامون" و کاهینەکانیەوە.

ئەو خودا ڕەشەی تۆ باست کرد"ئامون"ە کە نەتەوەی میسری کردووەتەی نۆکەرو خولامی خۆی و لەنەزانیدا هێڵاونیەتەوە، بۆئەوەی هەرگیز نەپرسن"بۆچی؟"ئەم خودا ڕەشە لەڕێی نەزانی و ئەفسانەو بێباوەڕیدا خودایی دەکات و ڕەوشی هەمیشەیی ئەو

نەوەیە: هەموو کەسێك دەبێت برسی بێت بۆئەوەی هەمیشە بۆ من و کاربەدەستانی من بەواتا کاهینە کەچەڵەکانی کار بکەن و ئەگەر ڕۆژێك یەکێك لەمانە سەری بەرز کردەوە و پرسی"بۆچی؟"یەکسەر سەری ئەوەی بەدڕەوشتی لەبەرامبەر خودادا کردووە بە سزای سوکایەتی کردن بە خودا و بەگوناهی بێباوەڕی بە تێڵا بکوتمەوە، بۆئەوەی ئەوانی تر بزانن تەنها ئەوەی من دەیڵێم ڕاستە و ئازادی واتای ئەوە نەگەیەنێت کە تەواوی خەڵکی میسر لەسەرتاپای تەمەنیاندا کۆیلەی من بن و بگرە لەقوتابخانەی"ماڵی ژیان"یشدا کە مەزنترین ناوەندی زانستی جیهانە، ڕێنادەم هیچ کەسێك بپرسێت"بۆچی؟".

"کاپتا"تۆ دەڵێیت کە"مریت"و"تهوت" لەم شارەدا لەژێر هەڕەشەی مەرگدان و نەبێت هەڵبێم و ئەوان لەگەڵ خۆمدا ببەم، بۆئەوەی خۆم لەهەموو هەڕەشەیەك دور بخەمەوە، بەڵام کاتێك چارەنوسی"ئاتون"تاکە ڕزگارکەری نەتەوەی میسر بگرە جۆری مرۆڤیشە لەهەڕەشەدا بێت گیانی ژن و منداڵێك چ گرنگیەکیان هەیە، بۆیە ئەوەمان لەسەرە کەخۆڕاگربین و نەهێڵین چەندکاهینێکی چاوچنۆك لەگەڵ چەند دەوڵەمەندێکی پارەپیس و بێبەزەییدا لەڕێی بەکرێ گرتنی چەند سەربازێکی ڕەشپێستەوە بەسەر خودای فیرعەوندا زاڵ بن و بەسەر خودایەك کە لەهەموو شوێنێك بگرە لەناو دڵی هەموومان‌دا جێگیرە و ئەگەر ئەم خۆ ڕاگریەی ئێمە بەئەنجامی خۆی نەگات و "ئاتون"سەرنگون ببێت، چیتر ژیان هیچ بەهایەکی نامێنێت، بۆیە باشتر وایە ژن و پیاو و منداڵەکانیش لەناو بچن.

"کاپتا"وتی: ئەوەی پێویست بوو پێتی بڵێم پێم وتی و چیتر لەمبارەیەوە قسەت لەگەڵدا ناکەم. من هەندێجار بیرم لەوە کردووەتەوە کە نهێنیەکی بچوکت بۆ باس بکەم، بەڵام دواجار دستبەرداری دەبم، چونکە دەزانم کە هیچ کارێك لەتۆ ناکات، تۆش وەکو فیرعەون شێت بویت، بۆیە ئەگەر ڕۆژێك لەنائومێدیاندا خۆڵەمێشت کرد بەسەری خۆتدا و سینە و ڕوخسارت بەنینۆك ڕوشاند، گلەیی لەمن نەکەیت و ئەگەر بەکوشتیش درایت، هیچ تاوانێکم مەدەرە پاڵ. من نۆکەرێکی پێشوم کە منداڵم نیە بۆئەوەی لەدوای مەرگم، بەسەرمدا بگریت، بۆیە بۆ هەرکوێ تۆ بڵێیت وەکو پێشوو لەگەڵتدا دێم، لەکاتێکدا دەزانم کە هاتنی من لەگەڵ تۆدا بێسودە، و جارێکی تر من و

تۆ خۆمان دەکەینەوە بەماڵێکی تاریکی وەك ماڵەکەی خودای"کریت" و من گۆزەیەك شەراب لەگەڵ خۆمدا دەهێنم.

لەو ڕۆژە بەدواوە"کاپتا"بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکەی من دەستی کرد بەچەك کڕین و بەسەر نۆکەرو باربەرەکانی ڕابردودا دابەشی کردو لەگەڵ هەندێك لەکاربەدەستانی فیرعەون لە"تبس"دا ڕێك کەوت بۆئەوەی لەکاتی بەرپابونی جەنگدا بەرگری لە"ئاتون" بکەن.

لە"تبس"دا هەر بەوشێوەیە بێ یاسایی و بێبەند و باری و برسیەتی فەرمانڕەوا بوو و هەندێکیان دەیانوت کە ژیانی ئێمە وەك خەوێکی ترسناکی لێهاتووە کە بێداربونەوەی نیە، بەڵام ئەگەر بمرین لەم خەوە ترسناکە ڕزگارمان دەبێت و مەرگیش خەوی تۆقێنەر و ترسێنەری ئێمەیە.

ئەم جۆرە کەسانە بۆئەوەی لەژیان ڕزگاریان ببێت یەکتریان دەکوشت و بۆئەوەی گریانی ژن و منداڵەکانیان بەچاوی خۆیان نەبینن ئەوانیشیان دەکوشت. هەندێکی تریان بۆئەوەی ژیان لەبیر بکەن شەو و ڕۆژ ئاوجۆ یان شەرابیان دەخواردەوە و شتێك کە لەو ڕۆژانەدا تەواو نەدەبوو ئاوجۆ و شەراب بوو.

ئەگەر کەسێکیان لە شەقامەکاندا ببینیایە نانێکی بەدەستەوەبێت پێیان دەوت ئەم نانە لەگەڵ ئێمەدا بەش بکە، چونکە ئێمە دوو براین و لەبەرامبەر یەکدا یەکسانین. ئەگەر کەسێکی تریان بەجلوبەرگی کەتانیەوە ببینیایە پێیان دەوت، ئەو جلانە لەبەرت داکەنە و بیدە بەئێمە، چونکە ماوەیەکە ڕۆت و بێجلین و لەمەودوا نۆرەی تۆیە بێ جل و بەرگ و ڕوت بیت.

هەرکەسێك هەڵگری"خاچ"بوایە ئەگەر بەتەنهایی دەستی شاخدارەکان بکەوتایە بەدڵنیاییەوە دەیانکوشت و لاشەکەیان فڕێ دەدایە ناو ڕوباری نیلەوە و تیمساحەکان بەشێوەیەك بۆ خواردنی لاشەی مردووەکان بێشەرم ببون کە هەندێکات دەهاتنە ناو شاری"تبس"یشەوە.

بەم شێوەیە، دوجار سێ شەو و ڕۆژی تریش تێپەڕی[30]، بەڵام دوای ئەو ماوەیە خودای "ئاتون" لە"تبس"دا لەناوچوو، چونکەسەربازە ڕەشپێستەکان و سەربازەکانی

---

[30] لێرەدا مەبەستی ئەوەیە کە دوو سێ ڕۆژی تێپەڕیوە بەواتا شەست ڕۆژ.....وەرگێڕ.

"شردن"کە لەلایەن کاهینی"ئامون"و وەجاخزادە و "ئامی"یەوە بەکرێگیرابون هاتن و "تبس"یان گەمارۆ دا بۆئەوەی هیچ کەسێك نەتوانێت هەڵبێت. لەناو"تبس"یشدا تەواوی شاخدارەکان ڕاپەڕین و لەڕێی کاهینەکانی"ئامون"ەوە چەکیان بەسەردا دابەش کرا.

هەندێك"کەنیزەك"و خەڵکی لەناخەوە نە لایەنگری"ئامون"بوون و نە لایەنگری "ئاتون" لەبەرئەوەی بەتەواوی لەم بێبەندوباریەی"تبس" بێزار و هەراسان ببون، بۆیە پەیوەندیان بەشاخدارەکانەوە کردو دەیانوت خودای تازە جگە لەبێبەندوباری و برسیەتی هیچی تری بۆ نەهێناوین، ئێمە لەم خودا بێشێوە و بێبەزەییە بێزارین.

کاتێك ئاژاوەی شاخدارەکان دەستی پێکرد، من لە مەیخانەی"کلکی تیمساح" بەنۆکەرو کرێکارەکانی پێشوم وت: من لایەنگری ئەوە دەکەم کە لەم ڕۆژانەدا کە "ئاتون"خودایی خۆی بەشێوەیەکی جدی دەست پێکرد، ستەم زاڵ بوو بەسەر دادپەروەریداو بێتاوانەکان بەکوشت دران وبەئاشەکانەوە بەستنیانەوەو بێ ڕەزامەندی مێرد و براکانیان دەستیان بۆ کچ و ژنەکان درێژ کرد، بەڵام من کە پزیشکم دەزانم کاتێك ورگێك بۆ چارەسەر کردنی ڕیخۆڵەیەکی گیراو هەڵدەدرێت، خوێن دەڕژێت و تا خوێن نەڕژێت، کەسی نەخۆشیش چارەسەر ناکرێت. ئەو ستەمانەی کە ئێوە بەچاوی خۆتان دەیبینن وەك ئەو خوێنە وایە کە دەبێت بڕێژرێت بۆئەوەی نەخۆش بەواتا حکومەتی"ئامون"وخوداکانی تری میسر لەناوبچێت. بەرگەگرتنی ستەمو خوێنڕێژی بۆ لەناو بردنی نەخۆشی ڕێپێدراوە، چونکە بەرگەگرتنی ئازارەکان کاتیەو دوای ئەوەی کەسی نەخۆش بۆماوەی چەند ڕۆژێك بەرگەی ئازارەکانی گرت، چیتر پاشماوەی تەمەنی بەئاسودەیی و تەندروستی دەژیت.

لەبەرئەوەیە ئەی نۆکەران و باربەرانی پێشوو، بۆ پاراستنی خودای ئاتون بجەنگن و لەمەرگ نەترسن، چونکە لەم جەنگەدا ئێوە شتێکتان نیە کە خەم بۆ لەدەست دانی بخۆن و گیانی ئێوەش کاتێك کە"ئاتون"لەناو چوو هیچ بەهایەکی نابێت. چونکە ئەگەر شاخدارەکان دوای ئەوەی دەستیان بەئاژاوەگێڕی خۆیان کرد"ئامون"و خودایانی پێشوو ئەگەر نەتانکوژن، ئەوا دەتانێرن بۆ کانە کانزانکان یان وەکو ڕابردوو دەتانکەنەوە نۆکەر و کارەکەری خۆیان. بەڵام نۆکەر و کرێکارەکانی ڕابردوو پێکەنین و وتیان"سینۆهە"تۆ پیاوێکی سادەیت و لەڕوی سادەییەوە وا

هەست دەکەیت کە یەك خودا لەگەڵ خودایەکی ترو ئەم فیرعەونە لەگەڵ ئەو فیرعەونەکەی تردا جیاوازە، لەکاتێکدا تەواوی خوداکان زۆر لەیەك دەچن و ئەوەی دەیڵێن درۆیەو تەنها بۆ گەرم کردنی بازاڕی خۆیانە، هەروەها تەواوی فیرعەونەکانیش لەیەك دەچن و ئەوەی دەیڵێن تەنها بۆئەوەیە دەستەڵاتی خۆیان بپارێزن، هەمان ئەم فیرعەونە دەڵێت تەواوی مرۆڤەکان لەبەرامبەر یەکتریدا یەکسانن و هیچ جیاوازیەك لەنێوان نۆکەر و خاوەنەکەیدا نیە، وەك فیرعەونەکانی تر درۆزنە و وەك ئەوان کەسی خاوەندار لە نۆکەرەکان بەوالاتر دەزانێت و خودی ئەویش لەئێستادا لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا سەدان نۆکەری هەیە و ئەگەر یەکێك لەئێمە ئەمڕۆ بڕوات بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی فیرعەون یان یەکێك لە کاربەدەستانی ئەو بڕۆین بۆ لای و بڵێین لەبەرئەوەی یەکسانی بەرقەرارە و هیچ جیاوازیەك لەنێوان نۆکەر و خاوەن و هەژار و دەوڵەمەنددا نیە من هاتوم کە ئەمڕۆ لەگەڵ تۆدا نان بخۆم، پاسەوانانی فیرعەون یان کاربەدەستەکانی من بەهۆی ئەم قسانەمەوە دەکوژێت.

فیرعەونیش لەبەرئەوە لایەنگری یەکسانی دەکات چونکە کەرەستەی پاراستنی دەستەڵات و بەردەوامی فەرمانڕەوایی ئەو فەراهەم دەکات. ئەو لەناخەوە خوازیاری یەکسانی نیە، ئەگەر خوازیاریشی بێت خۆی لەهەموو کەسێك بەپێشەنگتر دەزانێت و لەوباوەڕەدایە کە دەبێت پارێزگاری لەدەستەڵات و تایبەتمەندی و سامانی خۆی بکات و هیچ کەسێك بەئەندازەی ئەو ڕێزو کانزاو ژنی جوانی نەبێت. کاربەدەستەکانی ئەو کاتێك دەبینن فیرعەون بێئەوەی هیچی لەوان زیاتر بێت-چونکە ئەویش وەك ئەوان مرۆڤە-سود لەتایبەتمەندیگەلێك وەردەگرێت و خودی ئەویش دەڵێت نابێت ئەوان سود لەم جۆرە تایبەتمەندیانە وەرگرن، هەوڵی ئەوە دەدەن کە هەڵگری تایبەتمەندیەکانی فیرعەون بن بۆئەوەی ڕێز و کانزا و ژنی جوانیان هەبێت و کاربەدەستە پلە دوو و پلە سێ و هەموو ئەو کەسانەی کە بەشێکن لەکاربەدەستانی فیرعەون بەهەمان شێوە بیر دەکەنەوە و کرداری دەکەن. بەڵام تۆ"سینۆهە"لەبەرئەوەی پیاوێکی سادە و چاکیت و بەردەوام ئێمەت بێ بەرامبەر چارەسەر کردووە، لە"کاپتا"م بیستووە کە گەنمی خۆت بەخۆڕا بەنێو خەڵکیدا دابەش کردووە، بەڕاستی جێی خەمە بکوژرێیت.

لەبەرئەوە ئەو گورزەی کە بەدەستەوەیە فڕێ بدە، چونکە دەستەکانی تۆ بۆ وەشاندنی ئەم گورزە دروست نەکراوە و ئەگەر شاخدارەکان ببینن کە تۆ گورزێکت بەدەستەوەیە هەوڵی کوشتنت دەدەن.

بەڵام ئێمە هەروەك خۆت وتت هیچ شتێکمان نیە لەدەستی بدەین کە خەمی لەدەستدانی بخۆین، بۆیە لەمەرگ ناترسین و ئەگەر شاخدارەکانیش هەوڵی کوشتنی ئێمەیان دا بەرگری لەخۆمان دەکەین و ئەگەر بەکوشتیش بدرێین بۆ ئەو مەرگەی خۆمان زۆر بەداخ نابین.

چونکە لەماوەی ئەم شەست شەو و ڕۆژەدا کە ئێمە چیتر کۆڵبەر و نۆکەر نەبوین چێژمان لەژیان وەرگرت و تا توانیمان خواردمان و خواردمانەوە و لەگەڵ ژن و کچانی دەوڵەمەنددا ڕامانبوارد، ئەگەر بیشکوژرێین چیتر خەمی خواردن و خواردنەوە و ڕابواردن لەگەڵ ژنانی جواندا ناخۆین.

ئەم قسانە لەلایەکەوە کاریان تێکردم ئەویش لەڕوی بواری پیشە پزیشکیەکەی خۆمدا بوو.

من لایەنگری ئەوم کرد کە دەستەکانم بۆئەوە دروست نەکراوە کە"گورز"ی پێ بوەشێنرێت، بەڵکو بۆ بەکارهێنانی دەرمان دروست کراوە لە بواری چارەسەریەکان دا.

ئەوەبوو"گورز"ەکەم فڕێ دا و ڕۆشتمەوە بۆماڵ و جانتا و کەرەستەی پزیشکی و نەشتەرگەریەکانی خۆمم هێنا، بۆئەوەی کاتێك جەنگ دەستی پێکرد، چارەسەری بریندارەکان بکەم.

*بەشی چل و چوارەم*

## جەنگی تۆقێنەری"تبس"و کوشتنی خۆشەویستانم

ئەوکات جەنگ لە"تبس"دا بەرپا بوو و جەنگێك دەستی پێکرد کە تەواوی جەنگەکانی ڕابردوو لەچاو ئەم جەنگەدا زۆر بچوك بون.

سێ شەو و ڕۆژ بەردەوام خەڵکی لە"تبس"دا یەکتریان دەکوشت و ئاگریان لەماڵەکاندا بەر دەدا بۆئەوەی لەشەوی تاریکدا گۆڕەپانی جەنگ ببینن. سەربازە ڕەشپێستەکان و سەربازەکانی"شردن"یش ئاگریان لەماڵەکان بەر دەدا و هەرچیان بەرچاو بکەوتایە دەیاندزی و هەرکەسێك کە لەتوانایاندا بوایە بەکوشتیان دەدا. لەبەرچاوی ئەواندا شاخدار و خاچیەکان وەك یەك وابون و هەردوکیان دەکوشتن.

فەرماندەی ئەم سەربازانە"پیپت ئاتون"بوو کە وتم لەبەرامبەر پەرستگای"ئامون" لەشەقامی "قۆچ"ەکاندا کوشت و کوشتاری خستە ناو خەڵکیەوە و بەڕاستی خۆی وا دەنواند کە لایەنگری خودای تازەی"ئاتون"ە. بەڵام لەوکاتەدا ناوی خۆی گۆڕیبوو، و ناوی"پیپ ئامون"ی بۆخۆی هەڵبژاردبوو.

ئەم پیاوە"ئامی"بۆ فەرماندەیی سەربازانی ڕەشپێست و"شردن"دەستنیشانی کردبوو، لەبەرئەوەی وا لێکی دەدایەوە کە شایستەترین سوپاسالارەکانی فیرعەونە.

لەو ڕۆژەوەی جەنگ دەستی پێکرد من لە مەیخانەی"کلکی تیمساح"دا ژیانم بەسەر دەبرد و لەوێدا برینی نۆکەرانی ڕابردوو و باربەرەکانم تیمار دەکرد و ئەوانیش بەبوێری و ئازاییەکەوە دەجەنگان.

"مریت"لەو شەو و ڕۆژانەدا، بێدابڕان سەرقاڵی ئامادەکردنی پارچەی برین پێچی بوون، بگرە جلەکانی من و"کاپتا"شی بۆ ئامادەکردنی پارچەی برین پێچی پارچە پارچە کردبوو.

"تهوت"ی بچوکیش ئاوی بەو کەسانە دەدا کە تینویان بوو و نەیاندەتوانی هەستنە سەر پێ.

ڕۆژی سێیەم جەنگ نزیکی لەنگەرگای"تبس"و ناوچەی هەژار نیشینەکان بویەوەو سەربازە ڕەشپێستەکان و "شردن" کەتایبەت بۆ جەنگ پەروەردە کرابون بەکوشتنی خەڵکی لەکۆڵانی ناوچە هەژارەکاندا لافاوی خوێنیان هەڵساند.

هیچ یەك لەو دوو دەستە سەربازیە دیلیان پەسەند نەدەکرد، ئەگەر کەسێکیش خۆی بدایە بەدەستەوە یەکسەر بەکوشتیان دەدا و هەر لەبەرئەوەش نۆکەران و باربەرەکان کە دەیانزانی ئەگەر خۆیان بدەن بەدەستەوە دەکوژرێن، تا دوایین هەناسەیان جەنگیان لەگەڵدا دەکردن.

لەڕۆژی سێیەمدا، سەرۆکی نۆکەران و کۆڵبەران هاتن بۆ مەیخانە بۆئەوەی کەمێك ئاوجۆ و شەراب و کەمێك خواردن ببەن بۆسەربازەکان، و بەمنیان وت: "سینوهە" تۆ لێرەدا بۆ تیمارکردنی ئەم بریندارانە ئەرکێکی بێهودە دەکێشیت، چونکە تەواوی ئەم بریندارانەی کە تۆ تیمارت کردون، بەدەستی شاخدارەکان بەکوشت دەدرێن و تۆ ئەگەر حەز بکەیت دەتوانی لەناوچەی لەنگەرگا خۆت بشاریتەوە و لەوێدا پەناگایەك هەیە ئەگەر تۆ لەوێدا جێگیر ببیت، هیچ کەسێك هەست بەبونی تۆ ناکات.

وتم: من پزیشکی فیرعەونم و هیچ کەسێك ناوێرێت دەستدرێژی بکاتە پزیشکی فەرمانڕەوایان.

کاتێك نۆکەرانی پێشوو و کۆڵبەرەکان گوێیان لەم قسەیە بوو پێکەنین، ئەوکات ئاوجۆ و شەرابیان خواردەوە و بۆ جەنگ لەمەیخانە ڕۆشتنە دەرەوە.

لەهەمان ڕۆژدا"کاپتا"لێم نزیك بویەوە و وتی: "سینوهە"ماڵەکەی تۆ لەگەڕەکی هەژاراندا دەسوتێت و شاخدارەکان ورگی خزمەتکارەکەی تۆ"موتی" کە دەیویست بەرگری لەماڵەکە بکات ونجڕ ونجڕکردووە و کاتی ئەوە هاتووە کە جلەکانی خۆت بگۆڕیت و جلی پزیشکی فەرمانڕەوایی لەبەر بکەیت، بۆئەوەی کاهین و ئەفسەرەکان

تۆ بەجلو و هێماکانی پزیشکی فیرعەونیەوە ببینن و ڕێزت لێ بگرن و هەوڵی کوشتنت نەدەن.

"مریت"بەتکاوە دەستی گرتم و وتی: "سینۆهە"هەمان ئەو کارەی کە"کاپتا"وتی ئەنجام بدە، ئەگەر بۆ پاراستنی گیانی خۆت ناتەوێت ئەم کارە بکەیت هیچ نەبێ لەپێناو من و"تهوت"ی بچوکدا پارێزگاری لەژیانی خۆت بکە.

سێ ڕۆژ بوو کە من نەخەوتبوم، بەهۆی شەراب و دەرمانە بزوێنەرەکانەوە خۆم بەبێداری هێڵابویەوە، بۆئەوەی بتوانم تیماری بریندارەکان بکەم.

لەو سێ ڕۆژەدا بەهیوای ئەوە بوم کە بەرگری نۆکەرانی ڕابردوو و کۆڵبەرانی لەنگەرگای"تبس"و کرێکارەکانی تر خاچ بەسەر شاخدا سەر بخەن، بەڵام لەوکاتەدا ئاگاداری ئەوە بووم کە خاچ پەرستەکان شکستیان هێناوە و شاخدارەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە.

ئەوکات لەبێزاریان بە"مریت"م وت: من هیچ گرنگیەك بەماڵەکەی خۆم نادەم و هیچ گرنگیەکیش بە ژیانی تۆ و ژیانی"تهوت"و ژیانی خۆم نادەم، چونکە ئەو خوێنانەی کە دەیبینی دڕژێنە سەر زەوی خوێنی"ئاتون"ی خودای بێشێوە و نەبینراوە، لەبەرئەوەی"ئاتون"لەبونایەتی دانە دانەی ئێمەدایە و ئەو خوێنەی کە لەئێمە دەڕژێت هەمان خوێنی ئەوەو لەمڕۆوە کە خودای "ئاتون" لەناو دەچێت نامەوێت بەزیندوویی بژیم.

لەوکاتەدا ماوەی هەڵهاتنم نەمابوو، لەبەرئەوەی گروپێك سەربازی ڕەشپێست و"شردن" بەفەرماندەی کاهینێکی"ئامون"کە سەری پاك تاشیوە و ڕۆنی لەسەر و ڕوخساری ماڵیبوو، گشتنە بەردەم دەرگای مەیخانەکە و بە"قۆچ"ی سەر دەرگاکەیان شکاند.

ئەو کاهینەی کە فەرماندەی ڕەشپێست و"شردن"بوو وتی: ئێرە یەکێکە لە مەزنترین پەناگاکانی"ئاتون"و تەواوی بریندارو خاچپەرستەکانی ئێرە بکوژن، دەبێت ئێرە بەزەبری شمشێرو نێزە و ئاگر لە بونایەتی"ئاتون" پاك بکەینەوە و نەهێڵن هیچ کەسێك لەم شوێنەدا بەزیندویی بمێنێتەوە.

ئەوان لەبەرچاوی مندا بەخێرایی ئەو بریندارانەی کوشت کە لەژێر چاودێری چارەسەرکردنی مندا بوون، سەربازانی ڕەشپێست و"شردن"بەجوتەپێ دەڕۆشتنە

سەر ورگی برینداره‌کان و لەبرینەکانیان کە من تیمارمکردبوون و پێچابووم خوێن دەچۆڕا.

لەبەرچاوی مندا سەربازێکی ڕەشپێست بەیەکلێدانی گورز مێشکی"تهوت"ی بچوکی بەو ناوەدا پژاندو هەر لەبەرچاوی مندا ڕەشپێستەکان ویستیان سوکایەتی بە"مریت"بکەن و لەبەرئەوەی ئەو ژنە، بەتوندی بەرگری لەخۆی کرد، لەیەك کاتدا دە نێزە چەقیە ورگ و سینەیەوە، کاتێك من بەمەبەستی هاوکاری کردنی بەرەوڕوی ڕۆشتم، ئەو کاهینەی فەرماندەی سەربازەکان بوو بەشاخەکانی دای بەسەرمدا و لەپێ کەوتم و چیتر دوای ئەوە نەمزانی چی ڕویداوە. کاتێك هاتمەوە هۆش خۆم، وا هەستم کرد کە لە"جیهانی خۆرئاوا[31]"م.

دوای ئەوە ئەو کۆڵانەم ناسیەوە کە مەیخانەی کلکی تیمساح دەکەوێتە ئەوێ، بینیم مەیخانەکە دەسوتێت و مەشخەڵی ئاگری لێ بەرز دەبێتەوە، بەڵام لەبەرامبەر مەیخانەکەدا "کاپتا"ئاوجۆ و شەراب بە سەربازەکان دەدات.

ڕوداوەکانی ڕابردووم هێنایەوە یاد و دیمەنی پژانی مێشکی"تهوت"و چەقینی نێزەکان بەسینە و ورگی"مریت"دا هاتەوە بەرچاوم. ویستم هەستمەوە سەرپێ، بەڵام نەمتوانی، بۆیە سنگەخشێم بەسەر زەویدا دەکرد، تائەوەی خۆم گەیاندە بەردەم دەرگای مەیخانەکە و ویستم خۆم بکەم بەناو مەیخانەکەدا و پەیوەندی بە"تهوت" و "مریت"ەوە بکەم. لەو شوێنەدا جلەکانی بەرم ئاگریان گرت، بەڵام"کاپتا"لەناکاو چاوی پێم کەوت، بەدەم هاوارەوە هات و منی لەناو ئاگرەکە هێنایە دەرەوە و لەخۆڵی کۆڵاندا گەوزاندمی بۆئەوەی ئەو ئاگرەی بکوژێنێتەوە کە بەربوبووە جلەکانم، لەبەرئەوەی سەربازە ڕەشپێست و "شردن"ەکان پێدەکەنین لەوانەبوو بمکوژن، "کاپتا" وتی: ئەم پیاوە هەم پزیشك و هەم کاهینی پەرستگای"ئامون"ە، چونکە ئەگەر کاهین نەبوایە نەیاندەهێلا لە"ماڵی ژیان"دا بخوێنێت و ببێتە پزیشك، بەڵام بەهۆی ڕوداوەکانی ئەم چەند ڕۆژی ڕابردووەوە، شێت بووە نازانێت چی بکات. منیش لەسەر خۆڵی کۆڵان دانیشتوم و سەرم خستووەتە نێوان هەردوو دەستمەوە و فرمێسك لەچاوانم دەچکێت و دەموت"مریت"...مریت...تۆ لەکوێی؟ بۆچی میهرەبانی

---

[31] جیهانی خۆرئاوا: بەبۆچونی میسریە کۆنەکان جیهانی دوای مەرگە.

تۆ لەتەنیشت خۆمەوە هەست پێناکەم. بەڵام"کاپتا"پێی وتم بێدەنگ بە....چیتر لەوە زیاتر کاری شێتانە لەخۆت مەنوێنە، چونکە کارە شێتانەکانی تۆ زۆر زیاتر لەوەی چاوەڕێ دەکرا بەدبەختی لەگەڵ خۆیدا هێناوە.

بەڵام من ناتوانم بێدەنگ بم و هاوارم دەکرد و دەگریام و"کاپتا" بۆئەوەی بێدەنگم بکاتەوە وتی:

گەورەم، ئەوە بزانە کە خوداکان تۆیان زۆر بەدبەختر لەوەی کە چاوەڕێ دەکرا کردووە، چونکە ئەو نهێنیەی کە نە من دەمتوانی پێتی بڵێم و نە "مریت"، ئەوەبوو کە "تهوت" کوڕی تۆ بوو و لەبەرئەوەی تۆ لەگەڵ"مریت"دا دەژیایت ئەو سکی لێت پڕبوو و ئەو منداڵەی لێت بوو.

بەڵام لەبەرئەوەی تۆی لەکانگای دڵیەوە خۆش دەویست و نەیدەویست کە بونی ئەو ببێتە هۆی ئەوەی پلەپایە و کەسایەتی تۆ کە پزیشکی فەرمانڕەواییت بڕوشێت پێی نەوتیت کە ئەمە کوڕی تۆیە، چونکە لەو حاڵەتەدا تۆ ناچار دەبویت گۆزەی لەگەڵدا بشکێنی و بەڕاستی ببێتە هاوسەری تۆ.

"مریت"چەند جارێك لەمبارەیەوە قسەی لەگەڵ مندا کردووە و هەموو جارێك دەیوت حەز ناکات خەڵکی ژنێك بەهاوسەری ڕاستەقینەی"سینۆهە"لەقەڵەم بدات کە ئەو ژنە لەمەیخانەدا خزمەتی کڕیارەکانی کردووە و شایستەی ئەوە نیە لەگەڵیدا بژیت و ئەمڕۆ لە"تبس"و تەواوی شارەکانی میسردا پیاوگەلێك هەن کە دەڵێن ئێمە بەدەستی"مریت"ی خزمەتکاری مەیخانەی "کلکی تیمساح"بادەمان بۆ تێکراوە و خواردومانەتەوە.

و تۆش"سینۆهە"خاوەنی دێرینم، ئەگەر شێت نەبوایەیت، ئە وڕۆژەی کە پێم وتی لە"تبس" بڕۆ و "مریت و تهوت"یش لەگەڵ خۆتدا ببە، لێرە دەڕۆشتی، بەڵام تۆ ئامادە نەبویت ئەم شارە بەجێ بهێڵیت و لەئەنجامدا دوو کەس بەهۆی ئەم شێتیەی تۆوە بەکوشت دران.

من دوای بیستنی ئەم قسەیە بێدەنگ بوم و بۆماوەیەك تەماشام کرد و وتم: ئایا ئەو قسەیەی کە کردت ڕاستە؟ بەڵام پەییم بەوە برد کە ئەم پرسیارە لەجێی خۆیدا نیە، چونکە"کاپتا"چ ڕاست بڵێت و چ درۆ بکات، لەهەردوو حاڵەتەکەدا ئەو دوانە لەناو چون. سەرەڕای ئەوەش هەستم بەوە دەکرد کە گوتەی"کاپتا"ڕاستە، چونکە

"مریت"یش بەمنی وتبوو نهێنیەك هەیە كە ناتوانێت پێم بڵێت و دەبێت ئەو نهێنیەش هەر ئەوە بێت.

من دوای ئەوەی ئاگاداری ئەم حاڵەتە بوم نەگریام، چونكە ڕۆح و فرمێسكی چاوەكانم وەك بەردیان لێ هاتبو و نەمدەتوانی بگریم.

بەڵام نەمدەتوانی بیری لێ نەكەمەوەو دەمبینی كە مەیخانەی"كلكی تیمساح" دەسوتێت و بڵێسەی ئاگری شەپۆلان دەدات و بۆنی سوتانی لاشەكان دەبیستران و لاشەی"مریت"ی هاوسەری خۆشەویست و كوڕەكەم"تهوت"یش لەو مەیخانەدا بوون.

كاتێك ئەوەم هێنایەوە یاد كە لاشەی كوڕی من لەكەنار لاشەی نۆكەران و باربەرانی لەنگەرگادا دەسوتێت و دەبێت بەخۆڵەمێش، لەترساندا خەریك بوو بەڕاستی شێت ببم، چونكە "تهوت"ی كوڕم، لەنەوەی خودایان بوو، چونكە خودی من لەنەوەی فیرعەون بەواتا لەنەوەی خودایانم.

ئەگەر من بمزانیایە"تهوت"كوڕی منە، بەشێوەیەكی تر ڕەفتارم دەكرد، چونكە باوكێك، لەپێناو كوڕەكەیدا گارگەلێكی ئەنجام دەدا كە هیچ كاتێك ئامادە نیە ئەو كارانە لەپێناو خۆیدا ئەنجام بدات، بەڵام كار لەكار ترازابوو و لاشەی خوشك و كوڕە خۆشەویستەكەم لەناوەڕاستی ئاگردا دەسوتان و من نەمدەتوانی بگرە تەرمەكانیان لەنابوتی ڕزگار بكەم و بەدەستی خۆم هەردوكیان مۆمیا بكەم و لەناو گۆڕستانێكی مەزن و پایەداردا بیان نێژم.

لەبەرئەوەی كۆتایی بەجەنگ هاتبوو"كاپتا"پێی وتم: وەرە با بڕۆین بۆئەوەی بتبەمە لای"ئامی"و"پیپت ئامون"، ئێستا ئەوانە لەكەنار ڕوباری"نیل"دان و تۆش لەلای ئەوان زیاتر پارێزارو دەبیت.

كاتێك من ڕۆشتم بۆ لای ئەوان بینیم كە ئەو دوانە لەناوچەی هەژارانی كەنار ڕوباری"نیل"دا لەسەر تەختێك دانیشتون و سەرقاڵی سزادانی خاچپەرستەكانن.

سەربازە ڕەشپێستەكان و"شردن"سات لەدوای سات خاچ پەرستەكانیان دەبردە لای ئەو دوانە و ئەوانیش بەم شێوەیە دادوەری خاچ پەرستەكانیان دەكرد.

هەر خاچپەرستێك كە چەكدار بووە و بەدیلی بگیرێت سەرەو خوار لەسێدارە دەدراو بەدیوارێكەوە هەڵیان دەواسی.

هەریەك لە پەیڕەوانی خاچ پەرست، لەکاتی تالانکردنی مالاندا دەستگیر بکرایەن، دەبووە خۆراکی تیمساحەکانو دەست و پێیان دەبەستن و هەڵیان دەدانە ڕوباری نیلەوەو سەدان تیمساح کە چاوەڕێی نێچیرەکەی خۆیان بون هێرشیان بۆ دەبردن. خاچ پەرستە ئاساییەکان کە نە چەکداربونو نە ماڵی خاڵکیان تالان کردووە، بەقامچی لێیان دەدان و دوای ئەوە ڕەوانەی کانە کانزاکانیان دەکردن.

ژنانی پەیڕەوانی خاچپەرست بە ڕەشپێست و"شردن"ەکان دەسپێدران، بۆئەوەی بیانکەنە کەنیزەکی خۆیان و لەبەرئەوەی لەماڵی پەیڕەوانی خاچ پەرست هیچ شتێك نەمابوو بۆئەوەی سەربازەکانی"ئامون" و خوداکانی تر تالانی بکەن، ناچار بون کوڕەکانیان بەدیلی بگرن و لەبازاڕەکاندا بیانفرۆشن.

لەکەنار ڕوباری"نیل"دا بە لەسێدارەدان و هەڵدانە ناو ڕوبارەوە و کوتەك کاری پەیڕەوانی خاچ، کوشتارگا و ناوەندی ئەشکەنجە دانێك هاتبووە بون و "ئامی"ش بۆئەوەی سەرنج و سۆزی کاهینەکانی"ئامون"بەلای خۆیدا ڕاکێشێت دەیوت: من خوێنی پیس لەسەرتاسەری میسر دور دەکەمەوە.

"پپیت ئامون"یش بێ بەزەییانە پەیڕەوانی ئاتونی دەکوشت یان بەقامچی دەیبەستن بۆئەوەی ڕەوانەی کانە کانزاکانیان بکات، چونکە پەیڕەوانی"ئاتون"لە "تبس"دا ماڵەکەیان تالان کردبوو و پشیلەکانیشی بەبرسیەتی مابونەوە و "پپیت ئامون" نەیدەتوانی ئەم بابەتە لەهزریدا فەرامۆش بکات بۆیە لەو کاتەدا ئەو هەلەی بۆ ڕەخسابوو کە تۆڵەی خۆی و پشیلەکانی لەپەیڕەوانی خاچپەرست بکاتەوە.

بۆماوەی دوو ڕۆژ کەناری"نیل"کوشت و کوشتار بەردەوام بوو و ڕۆژی دووەم تەواوی دیواری ماڵی هەژارانیان بەلاشەی ئەوانەی کە سەرەوخوار هەڵواسیبوو داپۆشی.

کاهینەکانی"ئامون"لەڕۆژانی دواییدا بەخۆشحاڵیەوە پەیکەری خودای خۆیان بەرز کردەوە و قوربانیان پێشکەش کرد و بەخەڵکیان وت: چیتر لەمیسردا، وشکەساڵی بونی نابێت و هیچ کەسێکیش فرمێسك لەچاوانی ناتکێتە خوارەوە، لەبەرئەوەی"ئامون"گەڕاوەتەوە و خوداکەی ئەو نوێ بووەتەوە و"ئامون"بەرەکەت دەدا بەو کەسانەی کە باوەڕیان پێی بووە.

ئێستا دەست بەکار بن و لەکێڵگەکانی"ئامون"دا تۆو بوەشێنن و دڵنیابن کە ئامون لەبەرامبەر هەر تۆوێکدا کە لەزەویدا دەیچێنن، دە ئەوەندەتان پێ بدات و چیتر گەنم لەمیسردا بێبەها دەبێت، بەڵام نە وشکەساڵی دەستبەرداری میسر بووە و نە بێبەندوباری لە"تبس"دا کۆتایی پێهات.

سەربازانی ڕەشپێست و "شردن" خاوەنی ماڵ و گیان و ژن و خەڵکی شاری "تبس"بون و بەئارەزوی خۆیان هەر کەسێکیان بویستایە دەیانکوشت و لەگەڵ ژنەکەیدا ڕایاندەبوارد و مندالەکانیشیان دەفرۆشتن و کۆمەڵێك لەو کەسانەی کە ئەندامی کروپی شاخداران و پەیڕەوانی "ئامون"بون بەدەستی هەمان ئەم سەربازانە کوژران.

چونکە ئەو سەربازانە نە باوەڕیان بە"ئامون"بوو نە بە"ئاتون"و مەبەستیان تەنها بەدەست هێنانی کانزا و ڕابواردن بوو لەگەڵ ژناندا. نە"ئامی"دەیتوانی ڕێ لەم سەربازانە بگرێتو نە"پپیت ئامون"و کاربەدەستانی فیرعەونیش لە"تبس"دا بەتەواوی بێدەستەڵات بوبون، چونکە کاهینەکانی"ئامون"فیرعەونیان لەتەختی فەرمانڕەوایی هێنایە خوارەوە و وتیان کە ئەو درۆزن و نەفرەت لێکراوە و چیتر نابێت لەمیسردا فەرمانڕەوایی بکات و جێنشینەکەی دەبێت بێت بۆ"تبس"و لەبەرامبەر "ئامون"دا کڕنوش بەرێت، ئەوکات بەفیرعەونی میسری لەقەڵەم دەدەن.

دوای ئەوەی"ئامون"لە"تبس"دا دەستەڵاتی گرتەوە دەست، بۆ ماوەیەك لەوێ مامەوە، لەبەرئەوەی نەمدەتوانی ئەو شارە بەجێ بهێڵم و لەڕاستیدا وەك ئەوە وابوو کە هێزی هەر جۆرە بڕیاردانێك لەمن زەوت کرابێت. من ڕێم دەکرد و نانم دەخوارد، بەڵام خۆمم نەدەناسی، وەك بڵێی کەسایەتیەکی ترم لەخۆم گرتبێت کە لەبەرچاوم بێگانە بێت.

لەشاری"ئاسۆ"شەوە هیچ هەواڵێکی فیرعەونم پێ نەدەگەشت، بەڵام بەپێی ئەو دەنگۆیانەی دەگەشتنە"تبس" دەمزانی کە لە"ئاسۆ"شدا بارودۆخێکی نالەبار باڵی بەسەر ئەو شارەدا کێشاوە.

کاتێك"ئامی"دەیویست بڕوات بۆ شاری ئاسۆ"پپیت ئامون"ی کردە فەرمانڕەوای "تبس"و دوای ئەوە ڕۆشت و پێش ڕۆشتنی پێی وتم: "سینۆهە" هەر بەوشێوەی خۆت دەزانی کاهینەکانی"ئامون"فیرعەونیان لەتەختی فەرمانڕەوایی لابردووە و

نەفرەتیان کردووە و منیش دەمەوێت بڕۆم بۆ"ئاسۆ"بۆئەوەی پێی بڵێم کە دەست لەفەرمانڕەوایی هەڵگرێت و بەرگری لەخۆی نەکات.

چاکتر وایە تۆ لەم کۆچەمدا لەگەڵمدا بیت، لەبەرئەوەی بونی پزیشکێکی وەك تۆ لەکاتێکدا من دەمەوێت"ئەخناتون"لە فەرمانڕەوایی بێبەش بکەم زۆر بەسودە، ئایا دێیت بۆئەوەی پێکەوە بڕۆین بۆ ئاسۆ؟

وتم: بەڵێ دێم، لەبەرئەوەی واهەست دەکەم کاسەی بەدبەختیم لێی بڕژێت و خودایان لەمڕووەشەوە تایبەتمەندیەکی ترم پێ ببەخشن، ئەم تاقیکردنەوەیەش بەلای منەوە زۆر بەپێویست دەزانم، بەڵام"ئامی"تێنەگەشت کەمن باسی چی دەکەم، دوای ئەوە بەرەو شاری"ئاسۆ" کەوتینە ڕێ.

لەهەمان ئەو کاتەی ئێمە لە"تبس"ەوە بەرەو"ئاسۆ"دەڕۆشتین"هورم هب"یش لە"تانیس"ەوە بەرەو"ئاسۆ"بەڕێ کەوتبوو.

ئێمە بۆئەوەی بڕۆین بۆ"ئاسۆ"بەدرێژایی ڕوباری"نیل"دا ڕێمان دەکرد و ئەویش بەپێچەوانەی ئاڕاستەی ڕوبار ڕێی دەکرد.

بەشێوەیەك کەلەدواییدا ئاگاداری ئەوە بووم کە لەسەر ڕێی گەشتەکەی"هورم هب"دا دانیشتوانی شارەکان پەرستگا کۆنەکانی"ئامون"یان کردبووەوە و پەیکەری"ئامون"یان تێدا پەرپا کردبوو، بەڵام"هورم هب"هیچ ڕەخنەیەکی لێ نەگرتبون و دەیویست زووتر خۆی بگەیەنێتە شاری"ئاسۆ"، چونکە ئەو هەستی بەوە کردبوو کە"ئامی"دەیەوێت لەمیسردا دەستەڵاتی تەواو بەدەست بهێنێت و"هورم هب"یش حەزی نەدەکرد ئەو پیاوە لە وڵاتی ڕوباری"نیل"دا هیچ دەستەڵاتێکی هەبێت.

کاتێك ئێمە لە"ئاسۆ"نزیك بوینەوە پەیمان بەوە برد کە شاری"ئاسۆ"وەك شارێکی نەفرەت لێکراوی لێهاتووە، چونکە تەواوی ئەو ڕێگایانەی بەم شارە کۆتایی دێت، کاهینەکانی"ئامون"و شاخدارەکان بەستبویان و نەیاندەهێڵا هیچ کەسێك بڕواتە ناو شاری"ئاسۆ"وە.

ئەوکەسانەش کە لە"ئاسۆ"دەهاتنە دەرەوە بۆئەوەی بڕۆن بۆ شوێنێکی تر تەنها بەمەرجێك ئازادی تێپەڕبونیان هەبوو، ئەو مەرجەش ئەوەبوو کە قوربانی پێشکەشی "ئامون"بکەن و نیشانی بدەن کە باوەڕیان بە"ئامون"ە، بەپێچەوانەی ئەم حاڵەتەوە،

بەقامچی لێیان دەدان و دوای لێدانیشی دەیاننارد بۆ کانە کانزاکان. لەڕێی ڕوباری "نیل"یشەوە کە شاڕێی"ئاسۆ"یە، بێ بۆمەڵەتی کاهینەکانی "ئامون" نەیاندەتوانی تێبپەڕن، چونکە ئەو کاهینانە ڕێگای ڕوباری"نیل"یان بە بەزنجیری"مس"ین بەستبوو. بەڵام لەبەرئەوەی"ئامی"بۆئەوە دەڕۆشت کە فیرعەون لەفەرمانڕەوایی لاببات و کاهینەکان دەیانزانی کە ئەو لە هاوپەیمانەکانی ئەوانە، زنجیریان لەبەردەم کەشتیەکەدا کردەوە و ئێمەش پەڕینەوە.

***

کاتێك کەشتی خۆی کرد بەناو شاردا، من لەبینینی باخەکانی"ئاسۆ"سەرم سوڕما، چونکە گوڵ و سەوزایی ناو باخەکان وشك بوبون و درەختەکانیش ئەوەیان نیشان دەدا کە ئاودێری نەکراون.

کاتێك مرۆڤ لەڕابردوودا لەڕوباری"نیل"ەوە بەنێو شاری"ئاسۆ"دا تێدەپەڕی دەنگی باڵندەی هەردوو کەناری لای ڕاست و چەپی باخەکانی بەر گوێ دەکەوت. بەڵام ئەو ڕۆژە من گوێم لەدەنگی باڵندەکان نەبوو و وەك بڵێی باڵندەکانی ئەو شارە کۆچیان کردبێت.

باخی"هاتی"کە فیرعەون و وەجاخزادەکانی میسر بەهەوڵ و زەحمەتێکی زۆر هێنابویانە بون بەهۆی کۆچکردنی وەجاخزادەکان و خزمەتکارەکانەوە وێران دەهاتە بەرچاو، چونکە کەسێك نەبوو ئاودێری درەختەکان بکات.

هەندێك لەباخەکان بۆنی لاشەی گەنیوی لێدەهات و دوای ئەوە من پرسیاری هۆکاری ئەم بۆنەم پرسی و تێگەشتم کە چوارپێکان لەناو گەوڕ و سەگەکان لەناو کولانەکانیاندا، لەبرس و تینواندا تۆپیون و لاشەیان بۆگەنی کردووە. بەڵام فیرعەون و خێزانەکەی لەکۆشکی "ئاسۆ" نەهاتبونە دەرەوەو هەر لەوێ دەژیان‌و کۆمەڵێك لەخزمەتکارو کەسانی بەوەفاو کاربەدەستانی بەتەمەنیش لەوکۆشکەدا دەژیان. خزمەتکارەکان بەهۆی وەفاداریانەوە نەیاندەتوانی فیرعەون بەجێ بهێڵن‌و کاربەدەستە پیرەکانیش دەیانزانی هیچ کارێکیان لەدەست نایەت بۆئەوەی بڕۆن بۆ شوێنێکی تر.

من دوای ئەوەی خۆمکرد بەناو شاری"ئاسۆ"دا تێگەشتم کە فیرعەون‌و کاربەدەستانی بۆ ماوەی دووجار سوڕانەوەی مانگ، بەواتا بۆماوەی شەست شەو و

ڕۆژ ئاگاداری بارودۆخی دەرەوەی شارەکەیان نین، چونکە کاهینەکانی"ئامون" نەیاندەهێلا هیچ هەواڵێك بگاتە کاربەدەستانی میسر. لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا هەست بە کەمی خۆراك دەکرا و کاربەدەستانیش وەك فیرعەون پەنایان بۆ خواردنی سادە دەبرد.

"ئامی"پێی وتم: لەبەرئەوەی تۆ لە فیرعەونەوە نزیکی و ئەو متمانەیەکی تەواوی بەتۆ هەیە و دەزانێت کە درۆ ناکەیت، بڕۆ بۆ لای و ئەوەی ڕویداوە پێی ڕاگەیەنە. منیش بەڕۆحێکی خەمگینەوە ڕۆشتم بۆلای و فیرعەون کە سەری دانەواندبوو سەری بەرز کردەوە و بینیم کە ڕوناکی چاوەکانی کەم بووەتەوە و لەوکاتەدا فیرعەون وتی: "سینۆهە"ئایا لەنێو هاوڕێکانمدا تەنها تۆ هاتویت، یان ئەوانی تریش هاتون، من کەسانێکم لە"تبس"دا هەبوو کە هاوڕێم بون و منیش خۆشم دەویستن، پێم بڵێ ئەوان چی دەکەن.

وتم: ئەی فیرعەون"ئەخناتون"خوداکانی ڕابردوو بەتایبەت"ئامون"کە تۆ هەموویانت سەرنگون کردبوو، جارێکی تر لە"تبس"سەریان هەڵداوەتەوە و خودایی خۆیان دەکەن و کاهینەکانیشی پەیکەری"ئامون"یان بەرپا کردووەتەوە و وەك ڕابردوو قوربانی پێشکەش دەکەن و خەڵکیش زۆر خۆشحاڵن لەوەیکە خوداکانی خۆیانیان بەدەست هێناوەتەوە و نەفرەت لەتۆ دەکەن و تۆش بەکەسێکی نەفرەت لێکراو دەزانن و ناوی تۆیان لەهەموو پەرستگا و پەیکەر و نوسراوەکاندا سڕیوەتەوەو دەڵێن کە تۆ فیرعەونی درۆزنی و دەبێت لەفەرمانڕەوایی لابرێیت؟

کاتێك فیرعەون گوێی لەم قسەیە بوو وروژا و ڕوخساری سور وەرگەڕا و وتی: "سینۆهە"من پرسیاری بارودۆخی"تبس"م لێ نەکردی، بەڵکو پرسیم کە چی بەسەر هاوڕێکانمدا هاتووە و یاوەرەکانم چی دەکەن؟

وتم: "ئەخناتون"تۆ چ کارێکت بەهاوڕێکانتەوە هەیە؟ و بەلای تۆوە چ گرنگیەکیان هەیە کە زیندو یان مردوو بن؟ ئەوەی بەلای تۆوە گرنگە ژن و منداڵ و زاواکانتن.

بەڵام ژنەکەت شاژن"نفر تی تی"و کوڕەکانت لەتەنیشتەوەن و یەکێك لەزاواکانت "سمن خکر" لەڕوباری"نیل"دا سەرقاڵی ڕاوەماسیە و زاواکەی ترت"توت"یاری بە بوکەڵەکانی دەکات و هەموو ڕوژێك بوکەڵەکانی مۆمیا دەکات و لەگۆڕدا دەیانێژێت[٣٢].

فیرعەون وەك ئەوەی گوێی لەقسەکانی من نەبێت وتی: هاوڕێی من "توتمس"کە هاوڕێی تۆش بوو لەکوێیە و چی دەکات؟ ئەو هونەرمەندە مەزنە لەکوێیە کە بە هونەرەکەی خۆی بەردی مردووی زیندو دەکردەوە و تەمەنێکی جاویدانی بە بەردەکان دەبەخشی؟

وتم: "ئەخناتون"ئەو لەبەرئەوەی لەبەرامبەر تۆ و خوداکەی تۆدا بەوەفا بوو بەدەستی سەربازە ڕەشپێستەکان بەکوشت درا و بەنێزەکانیان کون کونیان کرد و جەستەیان فڕێدایە ناو ڕوباری"نیل"و تیمساحەکانیش پارچە پارچەیان کرد، ئێستاش لەشوێن کاری ئەو پیاوەی کە تۆ دەڵێیت گیان و تەمەنێکی جاویدانی بە بەردە مردووەکان دەبەخشێت، لەکاتی شەودا چەقەڵەکان تێیدا دەست بەلورە لور دەکەن.

"ئەخناتون"وەك ئەوەی پەردەیەك لەبەرەچاویدا لا ببات دەستی کرد بە دەست ڕاتەکاندن و دوای ئەوە ناوی کۆمەڵێك لەهاوڕێکانی کە لە "تبس"دا بون هێنا.

لەدوای هێنانە زمانی هەرناوێکدا من دەموت: ئەو لەپێناو تۆ و خوداکەی تۆدا بەکوشت درا یان دەموت زیندووە و ئێستا قوربانی پێشکەشی"ئامون"دەکات و نەفرەت لەتۆ دەکات.

کاتێك فیرعەون کۆتانی بەهێنانە زمانی ناوی هاوڕێکانی هێنا، وتم: فیرعەون ئەوەش بزانە کە قۆناخی خودای"ئاتون"کۆتایی پێهاتووە و بۆ جارێکی تر "ئامون" لەجیهاندا پلەی خودایی بەدەست هێناوەتەوە.

---

[32] بیری ئامادە کردنی کەرستەکانی مەرگ و ژیان بۆ جیهانێکی تر، بەشێوەیەك لەمیسری کۆندا بەهێز بوو کە بگرە منداڵەکانیش لەکاتی یاری کردن لەگەڵ بوکەڵەکانیاندا، بوکەڵەکانیان مۆمیا دەکرد و دەیانخستنە ناو گۆڕەوە و پێش ئەوەی"ئاتون"خودای نوێی میسر بێتە بون کە مێژوو نوسانی میسر بەپێی ئەو بەڵگانامانەی کە دەستیان کەوتووە دەڵێن وەك بڵێی خەڵکی ئەو وڵاتە تەنها بۆنەوە دەژیان کە کەرستەکانی مەرگی خۆیان فەراهەم بکەن و بمرن، مەبەست لەم پەراوێزە ئەوەیە کە خوێنەر سەری لەوە سوڕ نەمێنێ کە بۆچی منداڵەکان لەکاتی یاری کردن لەگەڵ بوکەڵەکانیاندا خۆیان بە یاری مەراسیمی بەخاك سپاردنەوە سەرقاڵ دەکرد.

**فیرعەون دەستە لاوازەکانی ڕاوەشاندو تەماشای شوێنێکی دورەدەستی بەرامبەری خۆی کردو وتی: "ئاتون" خودایەکی هەمیشەیی و هەتاهەتایی و بێسنورەو کەسێکی بێسنوریش ناتوانێت لەجیهانێکی سنورداردا جێگیر ببێت. لەبەرئەوەش سەیر نیە کە ئەویان سەرنگون کردبێت.**

**بەڵام ئێستا کە"ئاتون" لەناو چووە هەموو شتێك دەگەڕێتەوە باری جارانی خۆی و نەزانی و ترس و کینە و ستەم فەرمانڕەوایی ئەم جیهانە دەکات، هەربۆیە باشترایە من بمرم و قۆناخی تازەی خودای"ئامون"و خوداکانی ترس و ستەم نەبینم، خۆزگە من هەر لەدایك نەبومایە، بۆئەوەی بینەری ئەم ستەم و بەدبەختیانە نەبومایە.**

**وتم: ئەی فیرعەون تۆ کە دەتزانی خودایەکی بێسنور لەم جیهانە سنوردارەدا جێی نابێتەوە و بیر و هزری بچوکی خەڵکی ناتوانێت خودایەکی بێ شێوە و نەبینراو بپەرستێت، دەی کەواتە بۆچی ئەم خودایەت هێناو و بەخەڵکیت ناساند و بۆچی ئەم هەموو خوێنەت ڕشتە سەر زەوی...ئاخر تۆ کە لێرەدا دانیشتوی و کۆڕەکەی خۆت لەبەرچاوی خۆت بەکوشت نەداوە و ئەو ژنەی کە خۆشت دەوێت لەبەرچاوی خۆتدا کون کون و پارچە پارچەیان نەکردووە، ناتوانیت لەوە تێبگەیت کە خودای تۆ بەچ شێوەیەك ئەم خەڵکەی بەدبەخت کردووە و چەنێك خەڵکی بێ تاوان و بێدەرەتانی بەکوشت داوە و بەچ شێوەیەك بووە هۆی ئەوەی ژنانی دەوڵەمەند کە تا دوێنێ بەقاڵب ئاڵتونیان هەبوو، بۆئەوەی تیکە نانێك بدەن بەمنداڵەکانیان خۆیان دەدا بەدەست ڕەشپێستەکانەوە، سەرەڕای ئەوەش ئەمانە هێشتا خۆشبەخت بون، چونکە ڕەشپێستەکان دەستدرێژیان دەرکردە سەر ژنەکانی تر بێئەوەی تیکە نانێکیان پێبدەن، ئایا ئەو خۆشبەختیەی کە تۆ دەتویست پێشکەشی خەڵکی میسری بکەیت شایستەی ئەم هەموو بەدبەختی و کارەساتانە بوو.**

**"ئەخناتون" تۆ جەنگی"تبس"ت بەچاوی خۆت نەبینیوە و نازانی شاخدارەکان چ تاوانگەلێکیان ئەنجام داوە، بەڵام پێش ئەمان"خاچ پەرستەکان"یش هەمان ئەم تاوانانەیان دژی شاخدارەکان ئەنجام دا بۆئەوەی خودای ئەوان لەناو ببەن. من وام دەهێنایە بەرچاو کە لەکۆتایی ئەم تاوانانەدا، ئەو جیهانەی کە خودای تۆ باسی دەکرد دێتەبون و جیاوازی نێوان دەوڵەمەند و هەژار و خاوەن و کۆیلە لەناو دەچێت، بەڵام ئەوە کێیە دەبێت بەرپرسیاریەتی خوێنی ئەو هەموو بێتاوانانە لەئەستۆ بگرێت**

که کوژران و سوتێنران و کون کونکراون و جەستەی زیندویان فڕێدریە بەردەم تیمساحەکان.

تۆ ئەی فیرعەون کە دەتزانی خودای بێسنور و نەبینراوت لەم جیهانەدا جێی نابێتەوە، بۆچی فەرمانی ئەوەت دەرکرد خەڵکی خوداکەی تۆ بپەرستن بۆئەوەی ئەم کارەساتانە ڕوبدەن.

فیرعەون وتی: "سینوهە"تۆ کە ئەوەندە من بەکەسێکی ستەمکار و خەڵکئازار لەقەڵەم دەدەیت، لەلای من ڕامەوەستە و لێرە برۆ بۆئەوەی لەوە زیاتر ئازار نەکێشیت...لێرە برۆ بۆئەوەی چیتر چاوم پێت نەکەوێت، لەبەرئەوەی لەبینینی ڕوخساری مرۆڤ بێزار بوم.

بەڵام من لەباتی ئەوەی برۆم لەبەرامبەر"ئەخناتون"دا لەسەر زەوی دانیشتم و وتم: نەخێر ئەی فیرعەون من لێت دورناکەومەوە، لەبەرئەوەی وەك بڵێی کاسەی چارەنوسی من هێشتا لێوانلێو نەبووە و دەبێت لەوەیکە هەیە زیاتر پڕ ببێت، ئەوکات ڕۆشتن زۆر ئاسان دەبێت و هەموو کەسێك دەتوانێت بڕوات، بەڵام هەندێکات مانەوە پێویستی بە ویست و بوێری هەیە، سەرەڕای ئەوەی باسی هەندێك شتم بۆکردی کە لایەنی سکاڵا لەخۆ دەگرێت، هەموو ئەمانە لەدەردی دەرونمەوە سەرچاوە دەگرێت، چونکە من لە"تبس"دا کوڕەکەی خۆم و ژنێك کەخۆشم دەویست لەدەست داوە.

سەرەڕای ئەوەش"ئامی"و"هورم هب"دەیانەوێت بێن بۆ لات و قسەت لەگەڵدا بکەن و "هورم هب"لەسەر ڕوباری"نیل"بوقی لێدا و فەرمانی دا کە زنجیری مسی ببپچڕێنێت بۆئەوەی بتوانێت بەکەشتیەکانیەوە بڕواتە ناو شاری"ئاسۆ"وە و لەو باوەڕەدام دوای کاتژمێرێکی تر هەردوکیان بێن بۆ لات.

فیرعەون زەردەخەنەیەکی تاڵی کرد و وتی: "ئامی"پەیکەری تاوانە و"هورم هب"یش پەیکەری شمشێر و نێزە، ئایا"ئاتون"بەو ڕادەیە منی سەرنگونکردووە کە تەنها ئەم دوو کەسە وەفاداری من بن و بێن بۆ لام.

چیتر فیرعەون دوای ئەوە هیچ قسەیەکی نەکرد، تائەوکاتەی"ئامی"و"هورم هب"خۆیان کرد بەژوردا و من لەڕوخساری هەردووکیان کە سور وەرگەڕابوو تێگەشتم کە دەمەقرەیان لەگەڵ یەکتریدا کردووە و بەدەم دەمەقرەوە خۆیان کردووە بە کۆشکی فرمانڕەواییدا.

*بەشی چل و پێنجەم*

## بەدەستی خۆم فیرعەونم کوشت

"ئامی"دوای ئەوەی خۆیکرد بەژووردا بیّ هیچ پێشەکی و ڕێزێك وتی: "ئەخناتون" تۆ چیتر ناتوانیت فەرمانڕوایی بکەیت، بەڵام ئەگەر دەست لەکار بکێشیتەوە ئەوا گیانی خۆت لەمەرگ ڕزگار دەکەیت، ئەگینا لەناوت دەبەن، بۆیە باشتر وایە دەست لەکار بکێشیتەوە و"سمن خکر"ی زاوات بۆ فەرمانڕەوایی هەڵبژێرە، بۆئەوەی ئەم زاوایەی تۆ لێرەوە بڕوات بۆ"تبس"و قوربانی پێشکەشی "ئامون"بکات و دوای ئەو قوربانیەش، کاهینەکانی ئامون ڕۆن بەسەریدا دەماڵن و کڵاوی فەرمانڕەوایی دەنێنە سەری.

کاتێك قسەکانی"ئامی"تەواو بوو"هورم هب"وتی: شمشێر و نێزەکانی من پارێزگاری لە"ئەخناتون"دەکەن، بەمەرجێك فیرعەون لێرەوە بڕوات بۆ"تبس"و قوربانی پێشکەشی"ئامون"بکات، گەرچی کاتێك کاهینەکان چاویان بەفیرعەون دەکەوێت دەست بە دەمە بۆڵە دەکەن، بەڵام کاتێك نێزە و شمشێرەکانی من دەبینن بێدەنگ دەبن و دوای ئەوە ئەگەر فیرعەون بۆ گەڕانەوەی سوریا پەنا بۆ جەنگ و هێرش کردن ببات، ئەوا لەوکاتەدا کاهینەکان ناچار دەبن هاوکاری فیرعەون بکەن.

"ئەخناتون"بۆماوەیەك تەماشای"هورم هب"ی کرد و دوای ئەوە وتی: من وەك فیرعەون ژیاوم و وەك فیرعەونێکیش دەمرم، هەرگیز قوربانی پێشکەشی خودایەکی درۆینە ناکەم و هیچ کاتێکیش پەنا بۆ جەنگ نابەم، چونکە خودای من ڕقی لەجەنگ و ئاژاوەیە.

دوای ئەم قسەیە فیرعەون دامێنی کراسەکەی خۆی بەرز کردەوە و ڕوخساری پێ داپۆشی و لەو ژورە ڕۆشتە دەرەوە و"هورم هب"و"ئامی"و من لەو ژورەداماینەوە.

من لەسەر زەوی دانیشتمو لەکاریگەری ئەو قسانەو بێزارییاندا هێزی هەستانەوەم نەبوو، تەماشای ئەو دوانەم دەکرد و بینیم کە"ئامی" هەردوو دەستی خۆی کردەوەو بە"هورم هب"ی وت: شمشێر و نێزەکانی تۆ ئامادەیە و تۆ دەتوانی ئەم هەلە باشە بۆ فەرمانڕەوایی بقۆزیتەوە، بۆیە بڕیاری ئەوە بدە و کڵاوی فەرمانڕەوایی میسر بکەرە سەرت.

"هورم هب"پێکەنی و وتی: "ئامی"بەبۆچونی تۆ کڵاوی فەرمانڕەوایی کردنە سەر بەو ڕادەیەش ئاسانە، ئەی تۆ بۆچی نایکەیتە سەرت. لەبەرئەوەی تۆ دەزانیت هەرکەسێك لەدوای"ئەخناتون"ەوە ببێتە پادشا دەبێت درەوی ئەو شتە بکات کە ئەو چاندویەتی، پێشنیاری ئەوەم لێدەکەیت کە ببمە پادشای میسر، ئەگەر بتزانیایە دوای"ئەخناتون"فیرعەون بون بەوشێوەیە ئاسانە خودی خۆت کڵاوی فەرمانڕەواییت دەکردە سەر."ئەخناتون"ئەم وڵاتەی دوچاری وشکەساڵی کردووە، سەرەڕای ئەوەش بەڕادەیەك میسری لاواز کردووە کە بەدڵنیاییەوە میسر دەکەوێتە بەر پلاری هێرشی وڵاتە دراوسێکان. ئەو تۆوەی ئەخناتون وەشاندویەتی، بەواتا وشکەساڵی و جەنگ دەبێت جێنشینەکەی درەوی بکات و ئەگەر من لەدوای ئەخناتون کڵاوی فەرمانڕەوایی لەسەر بکەم، ئەوا خەڵکی وشکەساڵی و جەنگ لەچاوی منەوە دەبینن، چونکە من ناتوانم لەماوەیەکی کورتدا خۆم لەوشکەساڵی و جەنگ بپارێزم، ئەوکاتەش بەلای تۆوە زۆر ئاسان دەبێت کە من لەتەختی فەرمانڕەوایی بهێنیتە خوارەوە.

"ئامی"وتی: لەبەرئەوەی تۆ ناتەوێت ببیتە فیرعەون، هیچ ڕێگە چاریەکی تر لەبەر دەستدا نیە جگە لەوەی"سمن خکر"زاوای"ئەخناتون"ببێتە فیرعەون، ئەگەر ئەو ئامادە نەبوو فەرمانڕەوایی بگرێتە دەست، ئەوا زاواکەی تری"توت"ئەو فەرمانڕەواییە وەردەگرێتو بۆماوەیەك دەبێتە جێی ڕقی خەڵکی تا ئەوکاتەی وشکە ساڵی بەتەواوی لەناو دەچێت و بارودۆخ باشتر دەبێت.

"هورم هب" وتی: من دەزانم کە تۆ بۆچی حەز دەکەیت یەکێك لەزاواکانی "ئەخناتون"بکەیت بە فیرعەون، چونکە دەزانی ئەمانە هیچ دەستەڵاتێکیان لەبەرامبەر تۆدا نیە و تۆ دەتوانی بەناوی ئەمانەوە فەرمانڕەوایی خۆت بکەیت.

"ئامی"وتی: بەڵام تۆ لەبەرئەوەی خاوەنی لەشکرێکی سەربازیت، لەمن بەهێزتری، بەتایبەت ئەگەر بتوانی پاشەکشە بە"هاتی"یەکان بکەیت، ئەوا بەهێزتر دەبیت و چیتر هیچ کەسێك ناتوانێت پۆز بەسەر تۆدا لێبدات.

ئەو دوو کەسە بۆماوەیەك لەمبارەیەوە گفتوگۆیان لەگەڵ یەکتردا کرد و دوای ئەوە"ئامی"وتی: "هورم هب"من دان بەوەدا دەنێم کە دەمویست شکست بەتۆ بهێنم و دەستەڵاتت لە لەشکری میسردا کەم بکەمەوە، بەڵام ئەمڕۆ دەبینم من و تۆ پێویستمان بەیەکترە، ئەگەر من نەبم، تۆ ناتوانیت ڕێ لە"هاتی"یەکان بگریت و ئەگەر تۆش ڕێ بە"هاتی"ەکان نەگریت، ئەوا منیش ناتوانم فەرمانڕەوایی خۆم بکەم، چونکە هێزەکانی"هاتی"لەماوەیەکی کەمدا میسر داگیر دەکەن. کەواتە وەرە و دەست بنێینە ناو دەستی یەکترەوە و سوێند بەخوداکانی میسر بخۆین بۆئەوەی هاوکاری یەکتری بکەین.

"هورم هب"وتی: من خوازیاری فەرمانڕەوایی میسر نیم، بەڵام حەز دەکەم فەرماندەی لەشکر بم و لەشکرەکەم وڵاتان داگیر بکەن و بۆ ئەم کارەش پێویستم بە هاوکاری تۆیە، بەڵام دەترسم ئەگەر لەگەڵ تۆدا یەك بگرم، تۆ لەیەکەمین هەلدا خیانەتەم لێ بکەیت و شکستم پێ بهێنیت و تەختی زەویم بکەیت، بۆیە ناتوانیت ئەم قسانەم بەدرۆ بخەیتەوە لەبەرئەوە تۆ باش دەناسم، لەبەرئەوە باشتروایە بۆ ئەم یەك گرتنە پێویستم بەدڵنیاییەکە.

"ئامی"وتی: چ"گرەو"[33]"و دڵنیاییەك والاترە لەوەی کە تۆ خاوەنی لەشکرێکی سەربازیت کە بوجەی ئەو لەشکرە من دەیدەم و ئایا بۆ پارستنی هێز و دەستەڵاتێك هیچ"گرەو"و دڵنیاییەکی باشتر و پایەدار تر لە بونی لەشکرێك بەدی دەکەیت؟

"هورم هب"بێدەنگ بوو ومن بینیم کە ئەو لەکاتی قسەکردندا دوچاری دڵەڕاوکێ و دودڵی نابێت و دوای ئەوە وتی: ئەو"گرەو"و دڵنیاییەی من دەمەوێت ئەوەیە کە شازادە"باکتاتون"ببێتە خوشکم و من گۆزەیەکی لەگەڵدا بشکێنم.

"ئامی"پێکەنی و وتی: ئاها...."هورم هب"تۆ زۆر لەوە زیرەکتری کە من بیرم لێدەکردەوە و دەزانی ئەو کەسەی کە لەگەڵ شازادە خانم"باکتاتون"ی خوشکی

---

[33] برۆ بۆ پەراوێزی ژمارە"٣٤".

فیرعەون ژیانی هاوسەری پێك بهێنێت، مافی ئەوەی هەیە ببێتە پادشای میسر و بگرە مافی تۆ بۆ گرتنە دەستی فەرمانڕەوایی میسر زۆر لە زاواکانی"ئەخناتون"زیاترە.

چونکە"ئەخناتون"بەپێی بانگەشەی کاهینەکان، فیرعەونێکی درۆزن و نەفرەت لێکراوە، بۆیە لەخوێنبەری کچەکانیدا کە ژن و زاوای ئەون، خوێنی فیرعەونێکی درۆزنو نەفرەت لێکراوی پێدا تێدەپەڕێت، لەکاتێکدا "باکتاتون" خوشکی "ئەخناتون" بەواتا کچی فیرعەونی مەزنە و لەخوێنبەری ئەودا خوێنی فیرعەونی مەزنی پێدا تێدەپەڕێت، هەر لەبەرئەوەش ئەگەر ئەو ببێتە خوشکی تۆ، ئەوا بۆ گرتنە دەستی فەرمانڕەوایی میسر زۆر لە زاواکانی"ئەخناتون"شایستەی ئەو پۆستەیت. سەرەڕای ئەوەش بزانە کە ئەم شازادە خانمە ناوی خۆی کە"باکتاتون"بوو گۆڕیوە و ناوی "باکتامون"ی لەخۆی ناوە، هەرلەبەرئەوەش کاهینەکانی"ئامون"زۆر پێی گەشبینن. بەڵام من بەو پێشنیارەی تۆ ڕازی نیم، چونکە ئەگەر ئەم شازادە خانمە کە کچی فیرعەونی مەزنە ببێتە هاوسەری تۆ، تۆ بەتەواوی لەسنوری چاودێری من دەردەچیت و لەئایندەشدا هیچ دەستەڵاتێکم بەسەرتەوە نامێنێت.

"هورم هب"وتی: دەزانم تۆ لەوە دەترسی کاتێك ئەو بوبە هاوسەری من و منداڵمان بوو، فەرمانڕەوایی میسر دەبێتە مافی جێنشین و پاشماوەکانی من، بەڵام ترسی ئەوەت نەبێ کەمن پێش تۆ فەرمانڕەوایی بگرمە دەست، چونکە دەتوانم چاوەڕێی ئەوە بکەم، لەبەرئەوەی من زۆر لەتۆ لاوترم و ئامادەم بەشمشێر و نێزەکانم هاوکاریت بکەم، بۆئەوەی کڵاوی فەرمانڕەوایی بکەیتە سەرت. ئەوەی بووە هۆی ئەوەی داوات لێ بکەم ئەم شازادە خانمە ببێتە خوشکم ئەوەیە کە من ئەوم خۆش دەوێت و لەو ڕۆژەوەی چاوم بەو ژنە کەوتووە خوازیاری بوم و ئێستاش خوازیاری ئەوم و ئەگەر تۆ دەستەڵاتی خۆت بخەیتە گەڕ بۆئەوەی ئەم ژنە ببێتە هاوسەرم، ئەوا من هیچ ناکۆکیەکم لەگەڵ فەرمانڕەواییەکەی تۆدا نابێت.

"ئامی"ڕۆچووە ناو هزری خۆیەوە و منیش زانیم بیر لەچی دەکاتەوە، هۆکاری بیرکردنەوەی "ئامی"ئەوەبوو کە ئاگاداری ئەوەبووە کە کەرەستەیەکی باشی بەدەست هێناوە بۆئەوەی لەو ڕێیەوە"هورم هب"بخاتە ژێری چاودێری خۆیەوە، چونکە ئەو پیاوەی ژنێکی خۆش دەوێت، بۆئەوەی بتوانێت لەگەڵ ئەو ژنەدا ژیانی هاوسەری پێك بهێنێت، بەهەموو مەرجێك ڕازی دەبێت.

دوای ئەوە"ئامی"وتی: "هورم هب"ماوەیەکە تۆ ئارەزوی ئەوە دەکەیت کە ئەم ژنە ببێتە هاوسەری تۆ و دەتوانی بۆماوەیەکی تر چاوەڕێ بکەیت، چونکە تۆ، لەئێستادا دەبێت بەشداری لەجەنگێکی مەزندا بکەیت کە ئامانجی ئەو جەنگە ڕێگرتنە لەهێرش کردنە سەر میسر و لەمکاتەدا دەبێت بڕۆیتە گۆڕەپانی جەنگەکانەوە، بۆیە ناتوانی لەگەڵ ئەم شازادە خانمەدا گۆزە بشکێنی. سەرەڕای ئەوەش هیچ کەسێك تا ئەمڕۆ دەربارەی خوشك و برایەتی تۆ لەگەڵ ئەم شازادە خانمەدا باسی نەکردووە و بیری ئەو ئامادەی پەسەندکردنی ئەم بابەتەی نیە، بۆیە پێویستی بەهەندێك کاتە کە ئەم شازادە خانمە ئامادە بێت و تۆ بەبرای خۆی هەڵبژێرێت، لەبەرئەوەی دەزانێت کە تۆ لە نەژادێکی خەڵکی ئاساییت و کاتێك لەدایك بویت، لێواری پەنجەی پێکانت وەك لێواری سمی"گا"کان سەنێری پێوە بووە. تەنها یەك کەس لەمیسردا دەتوانێت ئەم شازادە خانمە ئامادە بکات بۆئەوەی ببێتە خوشکی تۆ و ئەوکەسەش منم، منیش سوێند بەهەموو خوداکانی میسر دەخۆم کە ئەو ڕۆژەی تاجی فەرمانڕەوایی میسرم کردە سەر، بەدەستی خۆم گۆزەی خوشك و برایەتی هەردووکتان بشکێنم.

"ئامی"ئەوەندە بەگوڕ و تینەوە ئەم قسانەی کرد کە بەتەواوی کاری کردبووە سەر"هورم هب"و وتی: زۆرباشە منیش هاوکاریت دەکەم کە زووتر فەرمانڕەوایی میسر بەدەست بهێنیت بۆئەوەی زووتر ئەم شازادە خانمە ببێتە خوشکم.

بەشێوەیەك ئەم دوو کەسە پێکەوە سەرقاڵی گفتوگۆ بون کە منیان نەدەبینی کە لەسەر زەوی دانیشتبوم، لەناوکاو"هورم هب"چاوی بەمن کەوت و پێکەنی و وتی: ئاه..."سینۆهە" تۆ هێشتا لێرەیت و گوێت لەتەواوی گفتوگۆکانی ئێمە بوو. ئایا دەزانی لەبەرئەوەی تۆ پەیت بەنهێنیەکانی ئێمە بردووە، من دەبێت تۆ بکوژم، بەڵام گرفت لەوەدایە کە تۆ هاوڕێی منی و کوشتنی هاوڕێیەك چێژ بەخش نیە.

من پێکەنیم بەو قسانەی هات، چونکە ئەوەم هێنایەوە یاد کە"هورم هب"و"ئامی" هەردوکیان لەخەڵکانی ئاسایین و لەڕوی نەژادیەوە توانای فەرمانڕەواییان نیە، لەکاتێکدا لەبەرئەوەی من لەنەژادی فیرعەونم شایستەی ئەوەم فەرمانڕوایی بگرمە دەست.

کاتێك"ئامی"چاوی بەپێکەنینەکەی من کەوت وتی: "سینۆهە"ئێستا کاتی پێکەنین نیە، لەبەرئەوەی ئێمە بەگوڕو تینێکەوە قسەکانمان دەکەین و هیچ گاڵتەیەکی

تێدا بەدی ناکرێتو ئەگەر تۆش دۆستی ئێمە نەبوایەیت، بەتایبەت ئەگەر بەهیوای ئەوە نەبوایایەین سود لەبونایەتی تۆ وەرگرین، هەر ئێستا تۆمان دەکوشت بۆئەوەی نهێنیەکانمان ئاشکرا نەکەیت.

ئێستاش ئەوە لەبەرژەوەندی تۆدایە کە ئەم بابەتە بۆ هیچ کەسێك نەگێڕیتەوە، بۆئەوەی هیچ کەسێك ئاگاداری ئەوە نەبێت من دەمەوێت فەرمانڕەوایی بگرمە دەستو تۆ ئەگەر ئامادە بیت هاوکاریمان بکەیت، ئەوا لەئایندەدا هەرچیت بوێت پێتی دەبەخشین. وتم: چ هاوکاریەکتان بکەم؟

"ئامی"وتی: ماوەیەکە فیرعەون نەخۆشە و هەموو کەسێك دەزانێت کە ئەو نەخۆشیەی ئەو بەهیچ شێوەیەك چارەسەر ناکرێت و ئێستاش ئەم نەخۆشیەی فیرعەون زیاتر بووە و هەموو دەزانێت کە لەم جۆرە هەلومەرجەدا نەخۆشی فیرعەون بەهیچ شێوەیەك چارەسەر ناکرێت، تەنها یەك ڕێگای چارەسەر کردنی ماوە و ئەویش کونکردنی سەریەتی، بۆئەوەی هەڵمی زیانبەخشی ناومێشکی بێتە دەرەوە.

تۆش پزیشکی تایبەتی"ئەخناتون"و زانا مەزنەکانی میسرو بگرە جیهانیت و هیچ کەسێك گومانی لەزیرەکی و تواناکانی تۆدا نیە، بۆیە هەر ئەمڕۆ کون بکەرە سەریەوەو بەشێوەیەك چەقۆی نەشتەرگەریەکەتی تێ بچەقێنە کە بەئەندازەی پەنجەیەك بچەقێتە ناو مێشکیەوە، بۆئەوەی فیرعەون بمرێت و میسر لەم بەدبەختیە ڕزگاری ببێت.

وتم: "ئامی"دوای ئەوەی فیرعەون مرد لاشەکەی بۆ مۆمیاکردن دەگوازنەوە بۆ مردوو خانە و لەوێ ئێسقانی سەری لا دەبەن، بۆئەوەی مێشکی دەربهێنن و دوای ئەوەی ئێسقانەکە دەخەنەوە شوێنی خۆی، کرێکارانی"مردوو خانە"هەرئەو کاتەی چاویان بەفیرعەون کەوت تێدەگەن کە من چەقۆکەم بەئەندازەی یەك پەنجە لەمێشکی چەقاندووە و من بومەتە هۆکاری کوشتنی فیرعەون.

ئەم قسەیەم کاری کردە سەر هەردوکیان، لەبەرئەوەی هیچ یەك لەو دوانە نەڕۆشتونەتە ناو مردووخانەوەو چاویان بەشێوازی کارکردنی ئەوێ نەکەوتووە و نەیاندەزانی کە هیچ کاتێك لەمردووخانە ئێسقانی سەری فیرعەون یان کەسانی تر کە دەوڵەمەند و وەجاخزادەن لا نابەن، بۆئەوەی مێشکی دەربهێنن.

بەڵێ، کاتێك دەیانەوێت لاشەی کەسە هەژارەکان مۆمیا بکەن، ئێسقانی سەریان بەئەندازەی کاسەیەك لەسەریان جیا دەکەنەوە، بۆئەوەی بەخێرایی و ئاسانی مێشکی سەری لاببەن‌و فرێی بدەن، دوای ئەوە ئێسقانەکە دەخەنەوە جێی خۆی. بەڵام مێشکی فیرعەون‌و کاربەدەستان و وەجاخزادەو دەوڵەمەندەکان لەکونی لوتیانەوە دەردەهێنن، من خۆم لە"مردوو خانە"دا فێربوم کاتێك کە سەرقاڵ بووم بەمۆمیاکردنی جەستەکانەوە.

بۆیە هەر کاتێك من بەئەندازەی پەنجەیەك چەقۆکەی خۆم بچەقێنمە سەری فیرعەون کرێکارانی"مردوو خانە" لەکاتی مۆمیاکردنی لاشەکەیدا نازانن کەمن کوشتومە، بەڵام ئەو بیانوەی کەمن بۆم هێنانەوە"ئامی"و"هورم هب" باوەڕیان پێکرد.

"هورم هب"وتی: من پزیشك نیم و نازانم بەچ شێوەیەك فیرعەون دەبێت بمرێت، بەڵام ئەوەی من دەیزانم ئەوەیە کە ئەم پیاوە دەبێت لەناو بچێت، چونکە تا ئەو زیندوو بێت میسر ڕزگاری بەخۆیەوە نابینێت.

وتم: لەبەرئەوەی من پزیشکم دەزانم کە هەلومەرجی فیرعەون بەو شێوەیە نیە کە بتوانرێت کون بکرێتە سەری، چونکە کاتێك کون دەکەنە سەرێك کە هەڕەشەی مەرگی نزیك بێت، لەکاتێکدا لەئێستادا فیرعەون لەژێر هەڕەشەی مەرگدا نیە، بەڵام لەبەرئەوەی هاوڕێی فیرعەونم حەزناکەم ئەم پیاوە بەهۆی سەرنگون بونی خوداکەیەوە ئازار بکێشێت و پاشماوەی تەمەنی خۆی لەبەدبەختیدا بەسەر ببات، شلەمەنیەکی دەرخوارد دەدەم کە بێ هیچ جۆرە ئازار و دەردێكماڵئاوایی لەم جیهانە بکات و ئەم شلەمەنیەش خواردنەوەیەکە کە لە شیرەی پێستی"خشخاش"[34]"دروست دەکرێت.

"ئامی"وتی: ئایا مەبەستت تلیاکە؟

وتم: بەڵێ مەبەستم تلیاکە و ئەم مادەیە تێکەڵی شەرابی دەکەم و دەرخواردی فیرعەونی دەدەم و ئەویش بێ ئەوەی هەست بەهیچ ئازارێك بکات دوچاری خەوێکی زۆر قورس دەبێت و دەمرێت.

"ئامی"وتی: ئایا دوای مەرگی فیرعەون، ئەوکەسانی کە لاشەکەی مۆمیا دەکەن، کاریگەری ئەم زەهرە لەورگی ئەودا پەیدا دەکەن؟

---

[34] خشخاش: گوڵی ئەو جۆرە گیایەیە کە"تلیاك"ی لێ دروست دەکەن.....وەرگێڕ.

وتم: لەبەرئەوەی من شلەمەنیەکەی دەرخوارد دەدەم، پاشماوەی ئەو ژەهرە لەورگیدا نامێنێتەوە.

"ئامی"وتی: "تلیاك"هەڵگری بۆنێکی تایبەتە و کاتێك فیرعەون بۆنی ئەو تلیاکە بکات، نایخواتەوە.

وتم: تلیاك دوای ئەوەی چەندجارێك کوڵێنرا و پاڵێورا بۆنی خۆی لەدەست دەدات، بەتایبەت ئەگەر لەناو شەرابێکدا بیتوێنرێتەوە، تلیاك و دەرمانگەلێکی ترم ئاوێتەی شەراب کردووە.

"ئامی"وتی: کەواتە چاوەڕێی چی دەکەیت و ئەو زەهرەی دەرخوارد بدە، بەلاّم ئایا باشترنیە کە زەهرێکی درخوارد بدەیت کە خێراتر کاری تێبکات.

وتم: "ئامی"من ئاگاداری ئەوەم کە ئەم پیاوە لەکارەکانیدا نیازی ئەوبووە کە چاکە لەگەڵ خەڵکیدا بکات و نەیدەویست بارودۆخی میسر بەوشێوەیەی لیّ بێت، بەلاّم پێداگری لیّ کرد و گوێی لە ئامۆژگاری کەسە زیرەکەکان نەگرت و هەرچی پێیان وت کە دەست لەم ئینکاریەی هەڵگرێت، پەسەندی نەکرد و بەردەوام دەیوت کە خوداکەی من وای ویستووە. بۆیە شایستەی ئەوە نیە کە زەهرێکی درخوارد بدەین کە ئازاری پیّ بگەیەنێت و جگە لەشیرەی پێستی"خشخاش" هیچ زەهرێکی تر بەدی ناکرێت کە هەڵگری ئازارێکی کەمتر بێت، تەنها شیرەی ئەم"خشخاش"ەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی کەسی ژەهراوی دوچاری خەوێکی قوڵ بکات و هەست بەهیچ جۆرە ئازارێك نەکات و تەنها هەندیّ کەس کە توانایەکی دەرونی لاوازیان هەیە، لەوانەیە کەمێك جەستەیان سارد بکاتەوە و بیانهێنێتە لەرزە.

"ئامی"و"هورم هب"پەلەیان بوو کە من هەرچی زوترە فیرعەون دەرمانخوارد بکەم، بۆئەوەی "ئامی"زوتر بەفەرمانڕەوایی خۆی بگات و"هورم هب" بتوانێت لەگەڵ شازادە خانم"باکتاتون" کە ناوە تازەکەی"باکتامون"ە ژیانی هاوسەری پێك بهێنێت. من لێوانێکم نیوە شەراب کرد، هەروەها دەرمانەکەی خۆمم بۆ زیاد کرد و تێکم دا، بۆئەوەی ئەو دەرمانە ئاوێتەی شەرابەکە ببێت، دوای ئەوە لەگەڵ"ئامی"و"هورم هب"دا بەرەو ژورەکەی فیرعەون ڕۆشتین.

فیرعەون کلاّوی فەرمانڕەوایی لەسەر داکەندبوو، گاڵۆك و قامچی فەرمانڕەواییشی خستبووە لایەکییەوە و لەسەر تەختە خەوەکەی ڕاکشابوو.

"ئامی"تاجی فەرمانڕوایی هەڵگرت و بۆماوەیەك بەدەستی کێشانەی کرد و وەك ئەوەی بیەوێت بزانێت سەری بەگەری هەڵگرتنی ئەو کێشە دەگرێت یان نە؟

دوای ئەوە وتی: فیرعەون"ئەخناتون"پزیشکەکەت"سینۆهە"دەرمانێکی بۆ ئامادە کردویت کە چارەسەری نەخۆشیەکەت دەکات و دوای ئەوەی چاك بویتەوە، لەبارەی ئەو بابەتەی کە ئەمڕۆ باسکرا، گفتوگۆ لەگەڵ یەکدا دەکەین.

فیرعەون چاوی کردەوەو هەستایە سەرپێ و لەسەر تەختەکە دانیشت و بۆماوەیەکی درێژ تەماشای هەرسێکمانی کرد و کاتێك تەماشای منی کرد، پشتم کەوتە لەزین.

ئەو لیوانی شەرابەکەی بەدەستمەوە بینی و وتی: "سینۆهە"کاتێك گیانەوەرێك بریندار دەبێت، بۆئەوەی ئاسودەی بکەن یەکسەر لەناوی دەبەن، ئایا ئەم دەرمانە کە تۆ بۆ منت هێناوە وەك هەمان حاڵەتی ئەو گیانەوەرەیە؟ ئەگەر وابێت من سوپاسگوزاری تۆم، لەبەرئەوەی نائومێدی من لەمەرگ خراپترە و ئەمڕۆ مەرگ بەلای منەوە لەهەموو شەرابێك چێژ بەخشترە.

وتم: فیرعەون"ئەخناتون"ئەم دەرمانە بخۆرەوە بۆئەوەی بتوانی ئاسودە بیت و بحەوێیتەوە، چونکە زۆر پێویستت بە حەوانەوەیە.

"هورم هب"وتی: فیرعەون"ئەخناتون"ئایا لەبیرتە کاتێك لاو بویت من لەبیاباندا بەجلەکانی بەرم تۆم داپۆشی بۆئەوەی سەرمات نەبێت؟ ئەم دەرمانە بخۆرەوە و بخەوە ئەگەر هەستت بەسەرماش کرد من بەجلەکانی خۆم دات دەپۆشم.

فیرعەون لیوانی شەرابەکەی لێ وەرگرتم و بۆ لێوی برد، بەڵام دەستەکانی بەشێوەیەك دەلەرزان کە بەهەردوو دەستی لیوانەکەی گرت.

بەوشێوەی من لێکم دابویەوە، سەرەڕای ئەوەی بەلایەنی کەم باش دەیزانی چی دەخواتەوە لیوانە شەرابەکەی یەکبین خواردەوە و دوای ئەوە لیوانەکەی لەسەر تەختەکەدا دانا و منیش هەڵمگرت.

فیرعەون بۆماوەیەك تەماشای کردین، بێئەوەی قسەیەك بکات و دوای ئەوە ڕاکشا، ئەوکات هەستی بەساردی جەستەی کردو دەستی کرد بەلەرزین و"هورم هب"جلەکانی بەری داکەندو دای بەسەری فیرعەوندا، بۆئەوەی ئەو لەرزەی لەناو بچێت، دوای ئەوە

خەوی لێکەوت، ئەوکاتەی فیرعەون خەوی لێکەوت"ئامی"تاجی فەرمانڕەوای ئەوی دەکردە سەر خۆی، بۆئەوەی بزانێت ئایا بۆسەری ئەو باشە یان نە؟

بەپێی ئەو هێمایەی من بۆم کردن"هورم هب"و"ئامی" لەو ژورە ڕۆشتنە دەرەوە و منیش لەگەڵیاندا چومە دەرەوەو بەخزمەتکارەکەم وت: لەبەرئەوەی فیرعەون پێویستی بەحەوانەوەیەو خەوی لێکەوتووە نابێت لەخەو هەڵی بستێنن و خزمەتکارەکەش تا بەیانی ڕۆژی دوایی ئەوی لەخەو هەڵنەستاند. بەم شێوەیەمرد، فیرعەون "ئەخناتون"و پێکی مەرگی لەدەستی من"سینۆهە" سەرکونتێکەری تایبەتی فەرمانڕەوایان وەرگرت و خواردیەوە. من ناتوانم بڵێم لەنێوا ئەو هۆکارە جۆراوجۆرانەی کە بووە هۆی ئەوەی من لێوانی تلیاکی پوختەکراو دەرخواردی ئەو بدەم، کام هۆکاریان لەوانی تر بەهێزتر بوو؟ ئایا مەرگی"مریت"و"تهوت"بوە هۆی ئەوەی ئەوڕۆژە بەدەستی خۆم لێوانی مەرگ دەرخواردی فیرعەون بدەم؟ ئایا لەبەرئەوەی دەمزانی بەردەوامی ژیانی ئەو پیاوە دەبووە هۆی ئەوەی نەتەوەی میسر لەوە بەدبەختتر دەبێت کە بووە، بۆیە کۆتاییم بە ژیانی هێنا؟ ئایا لەبەرئەوەی لەمیسردا، نەریتی دێرین ئەوەبوو کە فیرعەون بەدەستی پزیشکی خۆی بەکوشت بدرێت، من ئەو کارەم ئەنجام دا، بۆئەوەی بەپێی نەریت و دروشمەکان ڕەفتار بکەم؟ ئایا سەرەڕای ئەوەی دەمزانی مەرگی فیرعەون ئەو لەڕەنج و ئازاری هەمیشەیی ڕزگار دەکات، ئەوکارەم ئەنجام دا؟یان لەبەرئەوەی لەئاسمان و ئەستێرەکاندا تۆمار کرابوو کە دەبێت ئەم کارە بەدەستی من ئەنجام بدرێت، ئەنجامم دا.

لەوانەیە بێ لەم هۆکارانە، من دەمویست کاسەی چارەنوسی من لێوانلێو ببێت، بۆئەوەی بتوانم ڕۆژێك لەڕۆژان بەخۆم بڵێم"سینۆهە"تۆ چارەنوسێکت هەبووە کە هیچ کەسێك نەیبووە.

لەوانەیە دەمویست بەمشێوەیە توانای خۆم پیشانی خۆم بدەم، چونکە مرۆڤ هەرچەنێك بڵێت، بۆئەوەی ئەوە بخاتە ڕوو کە خۆی دەناسێت، سەرەڕای ئەوەش توانای ئەوەی نیە پێناسەیەکی تەواوی خۆی بکات، هەندێکات کارگەلێك ئەنجام دەدات کە دوای ئەنجامدانی ئەو کارە ناتوانێت بڵێت، چی بووە هۆی ئەوەی دوچاری ئەم کارە ببێت.

ڕۆژی دوایی لەکۆشکی فەرمانڕەوایی شاری"ئاسۆ"دەنگی شیوەن و هاوار بەرز بویەوە و ئێمەش خۆمان گەیاندە کۆشك. تەنها یەك کەس نەدەگریا و ئەو کەسەش شاژن"نفر تی تی"بوو کە لەتەنیشت تەرمی هاوسەرەکەیدا بیْ گریان ڕاوەستابوو و بەپەنجەکانی ڕوخساری نەوازش دەکرد.

دوای ئەوەی خۆم کرد بەژووردا و لەجەستەی فیرعەون نزیك بومەوە، بینیم کە چاوەکانی کراوەیە و تەماشام دەکات، بەلاّم من هێمای توڕەییم لەچاوانیدا نەدەبینی، بەلاّم تائەوکاتەی ئەوم ناردە"مردووخانە"وە و بەکرێکارانی مردوخانەم سپارد، بۆئەوەی جەستەی مۆمیا بکەن، شەرمم لەوە دەکرد تەماشای ڕوخساری فیرعەون بکەم.

لەوانەیە ئەگەر کەسێك بیْ لەمن، نوسەری ئەم کتێبە بوایە ئەم بەشەی یاداشت نەدەکرد و خۆی بە بکوژی فیرعەون نە دەناساند، بەلاّم من لەم کتێبەدا جگە لە ڕاستی هیچ شتێکی ترم نەنوسیوە و ناشی نوسم، ئەگەر بەزیانی منیش بشکێتەوە.

من دەزانم ئەگەر ڕۆژێك کەسێك ئەم کەم و کورتی و گرفتە بخوێنێتەوە، زۆر بەسەختی لێم توڕە دەبێت و نەفرەتم لێدەکات کە بۆچی من پزیشکی فەرمانڕەوایی و جێی متمانەی فیرعەون بوم، ئەوم کوشتوە.

من جگە لەوەی کە باسم کرد هیچ شتێکی تر نالێم بۆئەوەی پاساو بۆ بێتاوانی خۆم بهێنمەوە، بەلاّم ئێستا کە سەرقاڵی تۆمارکردنی ئەم گرفت و کەموکورتیەم، دەڵێم یەکێك لەو هۆکارانەی کە منی هانی ئەوەدا جامی ئاوێتەی تلیاك بدەم بەفیرعەون ئەوەبوو کە دەمویست کۆتایی بەڕەنج و ماندویەتیەکانی بهێنم و دەمزانی ئەگەر لەجیاتی من کەسێکی تر هەوڵی کوشتنی فیرعەونی بدایە، ئەوی بەئازارگەلێکی گیانکێش دەکوشت، لەکاتێکدا من ئەوم بەشێوەیەك ناردە جیهانی خۆرئاواوە کە خودی خۆشی ئاگای لێی نەبوو کە ئایا خەوی لێکەوتووە یان لەحاڵی گیانەلاّندایە.

پێش ئەوەی تەرمی"ئەخناتون"هەڵگرن بۆئەوەی بۆ مۆمیاکردنی بیبەن بۆ مردووخانە"سمن خگر"زاوای فیرعەونیان لەجێگەکەی ئەودا دانیشاند و ئەویان بەفیرعەون بانگ کرد و تاجی فەرمانڕەواییان کردە سەری و قامچی و گۆچانی فەرمانڕەواییان دا بەدەستیەوە. بەلاّم فیرعەونی لاو و تازەکار و ترسا و تۆقاو، تەماشای چەپ و ڕاستی خۆی دەکرد، چونکە بەوە ڕاهاتبوو کە بەردەوام ملکەچی

فەرمانەکانی"ئەخناتون"بێت و بەپێی ویست و خواستەکانی ئەو بیر بکاتەوە و نەیدەتوانی ببێتە خاوەنی بیروباوەڕێکی سەربەخۆ.

"ئامی"و"هورم هب"پێیان وت، ئەگەر حەز دەکات تاجی فەرمانڕەوایی بەسەریەوە بێت، دەبێت یەکسەر شاری"ئاسۆ"بەجێ بهێڵێت و بڕوات بۆ"تبس"و لەوێ قوربانی پێشکەشی خودای"ئامون"ی مەزن و هەمیشەیی میسر بکات. بەڵام"سمن خگر" گوتەکانی"ئەخناتون"ی دوبارە کردەوە و وتی: هەوڵ دەدەم کە ڕوناکی "ئاتون"ی خودای بێ شێوە و نەبینراو بەهەموو جیهاندا پەخش بکەم و لەمشارەدا پەرستگایەك بۆ باوکی ژنەکەم"ئەخناتون"دروست بکەم و ئەو وەك"ئاتون"ی خودا دەپەرستم، لەبەرئەوە"ئەخناتون" هاوشێوەی نیە و نابێت.

کاتێك"ئامی"و"هورم هب"بینیان کە"سمن خگر"سورە لەسەرئەوەی خودای "ئاتون" بپەرستێت، هیچ شتێکیان نەوت.

لەڕۆژی دواییدا فیرعەونی لاو، وەکوو جاران ڕۆشت بۆ ڕوباری"نیل"بۆئەوەی ڕاوەماسی بکات، بەڵام کەوتە ناو ئاوەوە و تیمساحەکان قوتیان دا.

هەندێکەس دەڵێن کە"سمن خگر"لەکاتی ڕاوە ماسیدا کەوتووەتە ناو ئاوەوە و بووەتە خۆراکی تیمساحەکان، بەڵام من باوەڕ بەم قسانە ناکەم و وا هەست دەکەم کە ئەویان هەڵدابێتە ناو ئاوەوە.

"هورم هب"پیاوێك نەبوو کە دوچاری ئەو جۆرە کارانە ببێت و بەئەگەرێکی زۆر ئامی"سمن خگر"ی کردبێتە خۆراکی تیمساحەکان، بۆئەوەی زووتر بەمەبەستی خۆی کە فەرمانڕەوایی میسر بوو بگات.

ئەوکات"ئامی"و"هورم هب"ڕۆشتن بۆ لای"توت"و بینیان کە ئەو لەگەڵ بوکەڵەکانیدا سەرقاڵی یاری ناشتنی مردووەکانە و ژنەکەشی"ئانکس تاتون"کچی فیرعەونی پێشووش یاری لەگەڵدا دەکات."هورم هب" پێی وت: "توت"هەستە سەرپێ لەبەرئەوەی تۆ بویتەتە فیرعەون و دەبێت تاجی فەرمانڕەوایی بکەیتە سەر و لەسەر تەختی باوکی ژنەکەت دانیشی.

"توت"لەجێی هەستایە سەرپێ و"هورم هب"و"ئامی"ئەویان بەرەو ڕوی تەختی باوکی ژنەکەی برد و لەسەری دایان نیشاند و"توت"وتی: من سەرم سوڕ نامێنێ لەوەیکە بومەتە فیرعەون، لەبەرئەوەی خۆم بەپێشەنگی هەموو کەسێك دەزانی و لەمەو

دوا قامچیەکەم سزای بەدکاران دەدات و گۆچانی فەرمانڕەواییشم چاکەکاران بەڕێوە دەبات.

"ئامی"وتی: "توت"قسەی پڕ و پوچ بخەرە لاوە و گویم لێ بگرە و بزانە چی دەڵێم؟تۆ لەمەودوا دەبێت گوێڕایەڵی من بیت و ئەوەی من دەیڵێم بێ هیچ ڕەخنە و سەرپێچیەك ئەنجامی دەدەیت، یەکەم کاری ئێمە ئەوە دەبێت کە بڕۆین بۆ"تبس"و تۆ لەوێ لەبەردەم خودای کۆنی میسر "ئامون"کڕنوش ببەیت و قوربانی پێشکەش بکەیت و کاهینەکانیش سەرت بەڕۆن بماڵن و تاجی سور و سپی فەرمانڕەوایی بکەنە سەرت.

"توت"بۆماوەیەك بیری لێکردەوە و وتی: ئەگەر من بڕۆم بۆ"تبس"ئایا گۆڕێکی وەك گۆڕەکەی فیرعەونم بۆ دروست دەکەن؟ ئایا لەگۆڕەکەی مندا یاری منداڵانی جوانو چەقۆی شین باو لەجۆری ئەو چەقۆیەی کە من لە"هاتی"بەدەستم هێناوە دادەنێن؟ چونکە من لەگۆڕەکانی ئەم شارە کە زۆر بچکون و وێنەیان لەسەر دیوارەکانیان کێشاوە بێزارم، بۆیە گۆڕێکی مەزنم دەوێت بۆئەوەی بتوانم شتگەلێکی زۆری تێدا دابنێم.

"ئامی"وتی: سڵاوت لێ بێت، سەرەڕای ئەوەی منداڵیت بەڵام لەئێستاوە بیر لەگۆڕەکەت دەکەیتەوە و دڵنیاش بە کە بەپێی خواست و ئارەزوی تۆ، کاهینەکان گۆڕێکی مەزن و جوان و گرانبەهات بۆ دروست دەکەن. هەرکاتێك لەئایندەدا هەمان ئەم ژیری و زیرەکیەی خۆت نیشانی بدەیت، ئەوا بۆ میسر دەبیتە فیرعەونێکی زۆر باش، بەڵام ناوت خۆش نیە و ناوی تەواوی تۆ"توت ئانخ ئاتون"ە، ئەم ناوەش بۆ کاهینەکانی"تبس"ناسازگارە، چونکە ئەوان نەفرەت لە هەر شتێك دەکەن کە بە"ئاتون"ناو نرابێت، لەمڕۆ بەدواوە ناوت"تۆ ئانخ ئامون"ە.

"توت"ی بچوك هیچ ڕەخنەیەکی لەم بابەتەش نەگرت و تەنها وتی: من تەنها ناوی پێشوی خۆم بەباشی دەنوسی، بەڵام ناتوانم ناوە تازەکەم بنوسم و نازانم ئەو جۆرە نوسینەی کە"ئامون"لەخۆی دەگرێت بەچ شێوەیەکە، ئەوکات فێری نوسینی"توت ئانخ ئامون"یان کرد و بۆیەکەمین جار ناوی خۆی لە شاری"ئاسۆ"دا نوسی.

شاژن"نفر تی تی"هاوسەری فیرعەونی پێشوو، دەوای ئەوەی بینی کە بەهۆی فەرمانڕەوایی"توت ئانخ ئامون"ە هیچ کەسێك گرنگی بەو نادات، خۆی ڕازاندەوە و بۆ

بینینی"هورم هب"ڕۆشت بۆ لای کەشتیەکە کە لەکەنار ڕوباری"نیل"دا ڕاوەستابوو و چووە ناو ژورەکەی"هورم هب"و پێی وت: ئایا دەبینی"ئامی"باوکم لەم وڵاتەدا دەستی بەچ یاریەکی منداڵانە کردووە و منداڵێکی کردووە بە فیرعەونی میسر بۆئەوەی بتوانێت بیٚ هیچ دژێك لەمیسردا بەناوی"تۆت ئانخ ئامون"ەوە فەرمانڕەوایی بکات، لەکاتێکدا من لەم وڵاتەدام و هەموویان دەزانن کە هاوسەری فیرعەونی پێشو و دایکی منداڵەکانی ئەوم و دەستەڵاتی من بۆ فەرمانڕەوایی لەمنداڵێك زیاترە، بەکورتیەکەی لەبەرئەوەی من ژنم، ناتوانم بەتەنهایی بانگەشەی خۆم لەسەر کورسی دانیشێنم، بەڵام ئەگەر پیاوێك هاوکاریم بکات، سەرەڕای ئەوەی شاژنم و بەگوتەی هەموو کەسێك من جوانترین ژنی میسرم، دەتوانم فەرمانڕەوایی خۆم لەگەڵ ئەو پیاوەدا بەش بکەم، بۆیە"هۆرم هب"ئێستا تەماشای جوانیم بکە و ئەم هەلە لەدەستی خۆت مەدە....تۆ نێزە و شمشێرت هەیە و منیش جوانی و ناو و نانیشان و من و تۆ ئەگەر یەکبگرین دەتوانین فەرمانڕەوایی میسر بکەین و بەم فەرمانڕەواییەی ئێمەش میسر سودێکی زۆرمان لیٚ وەردەگرێت، لەکاتێکدا کە"ئامی"باوکم پیاوێکی گەمژە و تەماعە، ئەگەر ببێتە پادشای میسر، بەڵایەکی لەمە خراپتر دەهێنێت بەسەر میسردا.

"هورم هب"تەماشایەکی کرد و"نفر تی تی"بەردەوامی بەقسەکانی خۆی دا بۆئەوەی سەرنجی ئەو بەلای پێشنیارەکانیدا ڕابکێشێت.

چونکە گەرچی"نفر تی تی"بیستبوی کە"هورم هب"خوشکی فیرعەونی پێشووی خۆشدەوێت و ئارەزوی ئەوە دەکات ژیانی هاوسەری لەگەڵدا پێك بهێنێت، بەڵام بیری لەوە دەکردەوە کە ئەم ژن و مێردایەتیە بەهۆی لەخۆبایی شازادە خانم"باکتاتون"ەوە ئەنجام نادرێت.

سەرەڕای ئەوەش ئاگاداری ئەوە نەبوو کە پەیمانێك لەنێوا ئەو و"ئامی"باوکیدا بەستراوە کە"هورم هب"لەکاروباری فەرمانڕەواییدا هاوکاری"ئامی"بکات و ئەو پیاوەش لەبەرامبەردا کەرەستەی پێکهێنانی ژن و مێردایەتی"هورم هب"و خانم"باکتاتون"فەراهەم بکات.

سەرەڕای ئەم دوانەش"نفر تی تی"بەوە ڕاهاتبوو کە بەسود وەرگرتن لەجوانی خۆی زۆر زوو پیاوەکان هانی ئەوە بدات کە لەگەڵیدا ڕابوێرن و وای لێك دەدایەوە شارەزای هونەری دڵڕفێنی پیاوانە، لەکاتێکدا کە"باکتاتون"ی لاو بیٚ ئەزمونە و

نازانێت بەچ شێوەیەك دەبێت پیاوان فریو بدات. بەڵام جوانی ئەو بەهۆی منداڵبونێکی زۆرەوە پەژموردە بوو بوو و هیچ کارێکی لە"هورم هب"نەکرد و وتی: ئەی"نفر تی تی"جوان، من لەم شارەدا بەڕادەی پێویست خۆم پیس کردووە و حەزناکەم بەهۆی ئەوەی لەگەڵ تۆدا ڕادەبوێرم خۆم پیستر بکەم، ئێستاش دەبێت لەڕێی نامەنوسەکەمەوە نامەیەك بۆ ئەفسرەکانم بنوسم کەلە سنوری"سینا" نیشتەجێن، بۆیە ناتوانم لەگەڵ تۆدا ڕابوێرم.

کاتێك"نفر تی تی"گوێ لەم وەڵامە بوو پۆشاکە کەتانیەکەی کۆکردەوە و بەتوڕەییەوە لەو ژورە ڕۆشتە دەرەوە.

خودی"هورم هب"باسی ئەم ڕوداوەی بۆکردم، بەڵام من لەوباوەڕەدام کە"هورم هب"بەو زبریە وەڵامی نەداوەتەوە، بەڵام بێ دودڵی داواکەی ڕەت کردووەتەوە، چونکە لەو ڕۆژە بەدواوە"نفر تی تی"دەستی کرد بەدژایەتی کردنی"هورم هب"و دوای ئەوە لەشاری"تبس"دا لەگەڵ شازادە خانم"باکتاتون"دا دژی"هورم هب" یەکیان گرت.

"هورم هب"ئەگەر بەپێی خواستی"نفر تی تی"مامەڵەی لەگەڵدا بکردایە و ئەو ژنەی ڕازی بکردایە، پشت و دۆستێکی بەهێزی بەدەست دەهێنا، بەڵام ئەو پیاوە نەیدەویست"ئەخناتون"ی فیرعەونی پێشوو لەخۆی بڕەنجێنێ و لەگەڵ ژنەکەیدا ڕابوێرێت.

من ئاگاداری ئەوەبووم کە"هورم هب"سەرەڕای ئەوەی ڕەزامەندی خۆی لەسەر مەرگی "ئەخناتون" دەربڕی، بەڵام دوای مەرگیشی فیرعەونی هەر خۆشدەویست، گەرچی ناوی ئەخناتون لەسەر تەواوی نوسراو و پەرستگاکاندا سڕیەوە و پەرستگای"ئاتون"ی خودای بێ شێوە و بینراوی ئەو فیرعەونەی لەشاری"ئاسۆ"دا وێران کرد، بەڵام هەر ڕۆژێك من"هورم هب"م ببینیایە تێدەگەشتم کە ئەو فیرعەونی پێشوی خۆشدەویست.

من ئاگاداری ئەوە بووم، کاهینەکانی"ئامون"دوای ئەوەی دەستەڵاتیان کەوتە دەست ویستیان تەرمی مۆمیاکراوی"ئەخناتون"کە لەشاری"ئاسۆ"نێژار بوو لەگۆڕ بهێننە دەرەوە و بیسوتێنن و خۆڵەمێشەکەی بڕێژنە ڕوباری"نیل"ەوە بۆئەوەی بەتەواوی لەناو بچێت.

بەلاّم"هورم هب"لەڕێی چەند پیاوێك كە جێی متمانەی ئەوبون، پێش ئەوەی كاهینەكان گۆڕی"ئەخناتون" بدۆزنەوە، لاشەكەیان لەگۆڕستانی شاری "ئاسۆ" دەرهێناو خستیە ناو كەشتیەكەوەو ناردی بۆ"تبس"بۆئەوەی لەگۆڕستانی دایكی "ئەخناتون"دا بنێژرێت، كاتێك كاهینەكانی شاری"ئاسۆ"گۆڕی فیرعەونیان هەڵكەند بینیان هیچ تەرمێكی تێدا نیە، دوای ئەوە بانگەشەی ئەوەیان كرد كە"ئامون"لاشەی مۆمیاكراوی فیرعەونی درۆزن و نەفرەت لێكراوی نابوت كردووە، كەهیچ ناونیشانێكی ئەو لە"جیهانی خۆرئاوا" –جیهانی دوای مەرگ–نەماوە.

"ئامی"دوای ئەوەی ڕەزامەندی"توت ئانخ ئامون"ی وەرگرت بۆئەوەی كۆچ بكەن بۆ"تبس"فەرمانی دا كەشتیەكانی ئامادە بكەن بۆئەوەی پادشا بەڕێ بكەوێت. "ئامی"بەڕادەیەك بۆ گواستنەوەی پادشای میسر لە"ئاسۆ"وە بۆ"تبس"پەلە پەلی بوو كە ئەو خواردنانەی كە لەكۆشكی زێڕین"كۆشكی فەرمانڕەوایی"لێنرابوو نەخورێت و كاربەدەستانیش بێئەوەی هەلی ئەوەیان بۆ بڕەخسێت كە ئەو خواردنە ئامادە كراوە بخۆن بەڕێ كەوتن. لەبەرئەوەی لەشاری"ئاسۆ"دا باسی ئەوە كرابوو كە ئەم شارە نەفرەتی لێكراوە و مانەوە لەوێدا باش نیە، بگرە بۆ ماوەی ساتێكیش بێت، بۆیە دەبێت بەپەلە ئەو شارە بەجێ بهێڵن.

خەڵكیماڵەكانی خۆیان بەجێ هێشت و هەڵهاتن و یاری مندالاّنەكانی"توت ئانخ ئامون" لەكۆشكی زێڕیندا بۆ هەمیشە لەسەرزەوی مانەوە و مەراسیمی ناشتنی تەرمەكانی بۆ هەمیشە پیشان دەدا.

ئەو ڕەشەبایانەی كە لەبیابانەوە هەڵیان دەكرد، لمێكی نەرم و وردی بەسەر شاری"ئاسۆ"دا دەپژاندو ماڵ و باخەكانی بەلم دادەپۆشی. تیشكی خۆرو بارن ماڵەكانی وێران و لافاوی ڕوباری"نیل"یش لەوەرزی پاییزدا هاوكاری زیاتر وێرانكردنی شاری دا. گۆم و سەرچاوە ئاویەكانیش وشك بون و ئەو درەختانەش كە"ئەخناتون" بەزەحمەت و ئیشقێكەوە ناشتبونی، لەناو چون و بنمیچی ماڵەكانیش تەپینەوە و لەماڵ و باخەكاندا، لەباتی مرۆڤ چەقەڵەكان تێیدا نیشتەجێ بون.

بەم شێوەیە شاری"ئاسۆ"ی "ئاتون" بەهەمان ئەو خێراییەی كە بنیات نرا لەناو چوو و دوای ئەوەی بیابان بەخاك و لمی خۆی بەسەر شاردا زاڵ بوو و هەموو شتێكی لەژێر خۆڵدا داپۆشی، هیچ كەسێك هەوڵی ئەوەی نەدا بۆ دەرهێنانی كەرەستە

گرانبەهاکان کە کەتبونە ژێر خۆڵەوە سەردانی ئەو شارە بکات، چونکە ئەو شوێنەی کە شاری"ئاسۆ"تێدا هاتبووە بون شوێنێکی نەفرەت لێکراو بوو و"ئامون" بەشێوەیەك نەفرەتی لەو زەویە کردبوو کە هیچ کەسێك نەیدەوێرا پێ بنێتە ئەو شوێنەوە و شتە گرانبەهاکان لەژێر خاکدا دەربهێنێت.

وەك بڵێی"ئاسۆ ئاتون"خەونێك یان سەرابێك بوبێت کە لەناکاو لەناو چوو و هیچ جێ پێیەکی لەدوای خۆیەوە بەجێ نەهێشتبێت.

"هورم هب"لەپێش کەشتی فەرمانڕوایانەوە دەڕۆشت، بۆئەوەی لێواری ئەمبەرە و بەری ڕوباری نیل هێمن بکاتەوە و کاتێك چووە ناو"تبس"ەوە دوای دوو ڕۆژ لەو شارەدا هیچ دزی و پیاوکوژی و بێبەندوباریەك نەما.

"هورم هب"دز و پیاوکوژانی نەکوشت، هەروەها سەرەو ژێریش بەدیوارەکانەوە هەڵی نەواسین، بەڵکو هەموویانی دەستگیر کرد، بۆئەوەی لەگۆڕەپانی جەنگدا سودیان لێ وەرگرێت، چونکە"هورم هب"بۆ ڕێگرتن لە لەشکری"هاتی"پێویستی بەسەرباز بوو.

کاتێك فیرعەونی بچوك چووە ناو"تبس"ەوە، ئێمە بینیمان شەقامی"قۆچ"یان بەئالآی فیرعەون ڕازاندبوەوە و پەرستگای"ئامون"لەبەرامبەر خۆردا دەدرەوشایەوە.

فیرعەون لەڕۆژی تاج لەسەرناندا بۆ ڕۆشتن بۆ پەرستگای"ئامون"سواری کەژاوەیەکی زێڕین بوو و لەدوای ئەوەوە شاژن"نفر تی تی" ژنی فیرعەونی پێشوو و لەدوای ئەویشەوە کچەکانی دوای کەوتبون.

لەو ڕۆژەدا فیرعەون ڕۆشت بۆئەوەی لەپەرستگای"ئامون"دا مەراسیمی تاج لەسەرنان ئەنجام بدات و قوربانی پێشکەشی"ئامون" بکات و خودای کۆنی میسر بەتەواوی پیرۆز کرا.

"کاهینەکانی"ئامون" بەسەرۆکایەتی"هری بوری" کاهینی مەزن، لەکاتێکدا کە هەموویان سەرێکی تاشراویان هەبوو و ڕۆنیان بەسەر و ڕوخساریاندا ماڵی بوو، لەبەرامبەر پەیکەری"ئامون"دا ڕۆنیان بەنێوچاوانی فیرعەوندا ماڵی و تاجی سپی و سوری میسریان بە هێمای"زەنبەق"و "پاپی روس" نا بەنێوچاوانیەوە و ئەم مەراسیمە لەبەرچاوی خەڵکیدا ئەمجام درا، بۆئەوەی هەموویان ببینن کە فیرعەون تاجی خۆی لەکاهینەکانی ئامونەوە پێ بەخشراوە.

کاتێك کۆتایی بە مەراسیمی تاج لەسەرنان هات، فیرعەونی بچوك و نوێ، قوربانی پێشکەشی"ئامون" کرد، ئەوکات ئەوەی لەتوانای"ئامی"دابوو وە ئەوەی لەوڵاتی هەژار و وێرانی میسردا بەدەست دەهات، پێشکەشی"ئامون"کرا.

بەڵام"هورم هب"پێش ئەوەی فیرعەون دیاریە مەزنەکانی پێشکەشی"ئامون"بکات لەگەڵ"هری بور"یدا ڕێکەوتبوو کە ئەو دیاریانە بدات بەو بۆئەوەی خەرجی جەنگیان بکات و ڕێی لەهێرشی"هاتی"ەکان بگرێت.

دانیشتوانی شاری"تبس"خۆشحاڵی خۆیان لەبارەی هاتنەوە سەرکاری خودای کۆن و هاتنی فیرعەونی نوێ کە سەرەڕای ئەوەی منداڵبوو دەربڕی، لەبەرئەوەی مرۆڤ هەر لەڕەچەڵەکەوە خەیاڵپلاّ و هەمیشە بەئایندە گەشبینە و واهەست دەکات کە ئایندە لەڕابردوو باشتر دەبێت، بۆیە یەکێك لە بەدبەختیەکانی مرۆڤ ئەوەیە کە پەند لەتاقیکردنەوە تاڵەکانی ڕابردوو وەرناگرێت و بیر لەوە دەکاتەوە لەبەرئەوەی ئایندە هێشتا نەهاتووە لەڕابردوو باشتر دەبێت و هەر لەبەرئەوەش خەڵکی"تبس"وایان لێك دەدایەوە کە لەڕابردوو باشتر دەبن، لەشەقامی"قۆچ"دا قەرەباڵخیان بەچواردەوری فیرعەوندا دروست کردبوو و گوڵیان دەرشتە بەرپێی.

بەڵام هێشتا دوکەڵ لەناوچە هەژار نشینەکان کە دەکەوێتە لەنگەرگای ڕوباری"نیل"ەوە هەڵدەستێت و ئاسمانی"تبس"ی لەلایەکەوە تاریك کردبوو، بۆنی لاشەی مردوو لەماڵە وێرانەکانەوە دەهات و قەلە ڕەشە و داڵەکەرخۆرەکانیش بەسەر سەربانی پەرستگای"ئامون"ەوە نیشتبونەوە، لەچاخیاندا نەیاندەتوانی بفڕن، چونکە هەموو ڕۆژێك لەبەیانیەوە تا ئێوارە لاشەی کوژراوەکانیان دەخوارد و ژنانی هەژار و منداڵانی بێ باوك و برسیش، لەکەلاوەی ماڵەکانیاندا دەگەڕان بەئومێدی ئەوەی بڕێك کەلوپەلی ماڵەکەیان لەژێر خۆڵ و خاشاکدا دەربهێنن و منداڵەکان بەشێوەیەك لەبرساندا لاواز دەهاتنە بەرچاو کە من هیچ لاشەیەکی وشکراوم، ئەوکاتەی کە لەمردووخانەدا کارم دەکرد بەو لاوازیە نەبینیوە و ژنان و منداڵەکان دەیانزانی کە بەزەیی ڕوی لە"تبس"وەرگێڕاوە و ماوەیەکە چیتر هیچ کەسێك شتێك نادات بەوی ترو سکی برسی تێر ناکات، هەر لەبەرئەوەش داوای نان یان کانزایان لەکەسانی تر نەدەکرد.

٥

له لەنگەرگای"نیل"دور کەوتمەوە و بەرەو مەیخانەی"کلکی تیمساح"ڕۆشتم و لەو مەیخانەیە جگە لەوێرانەیەك کە بەهۆی ئاگرەوە ڕەش بووبوویەوە، هیچ شتێکی تر نەدەبینرا.

ئاهێك لەناخمەوە بەرز بویەوە، چونکە ئەو ڕۆژەم هاتەوە یاد کە لەو مەیخانەیەدا لەبەرچاوی خۆمدا بەگورز، نێوچەوانی کوڕە بچوك و شیرینەکەی خۆم"تهوت" کە لەنەژادی من بەواتا لەنەژادی"فیرعەون"و نەوەی خودایان بوو پارچە پارچە کرا و لەبەرچاوی مندا پەلاماری "مریت"یان دا بۆئەوەی ئەو ژنە بەدیلی ببەن، بەڵام ئەو بەرگری لەخۆی کرد و بەنێزە لەماوەی چاوتروکانێکدا جەستەیان کون کون کرد.

ئەوکات لەکاتێکدا کە لەوانەیە"مریت"هێشتا گیانی دەدا ئاگریان بەردایە مەیخانەکەوە و"مریت"ی نازداری من، بەزیندویی لەناو ئاگردا سوتێنرا.

ئەی خودایانی میسر، ئایا ئەکرێت پێم بڵێن"مریت"ی من، لەوکاتەی ئاگریان بەردایە مەیخانەکەوە، بێ بەرگەگرتنی ئازاری سوتان مرد؟

خۆزگە من هەروەك چۆن فیرعەون"ئەخناتون"م بە تلیاك و بێ هیچ ئازارێك ناردە جیهانێکی ترەوە، "مریت"و"تهوت"ی بچوکی خۆشم بەتلیاك بکوشتایە، بەڵام من بەهۆی ئەوەی کەوتبومە ژێر کاریگەری گوتەکانی فیرعەونەوە، لەوکاتەدا بەهیچ شێوەیەك بیرم لەپاراستنی ژیانی "مریت"ی خۆشەویست و کوڕە بچوکەکەم نەدەکردەوە و سەیر لەوەدایە بەشێوەیەك مێشکم لەدەست دابور کە نەمدەتوانی لەوە تێبگەم کە نەتەوەی میسر، یان هەر نەتەوەیەکی تر دەتوانێت خودایەك بپەرستێت کە نە ببینرێت و نە شێوەیەك لەخۆ بگرێت، جۆری مرۆڤ تەنها دەتوانێت یەك جۆر مرۆڤ بپەرستێت، ئەویش خودایەکە کە شێوەیەکی هەیە و مرۆڤ دەتوانێت چاوی پێی بکەوێت، بێ لەم حاڵەتە خەڵکی وا لێکی دەدەنەوە کە خودایەکی بێ شێوە و نەبینراو دەپەرستن، بەڵکو لەڕاستیدا خودایانی پلە دوو و سێیەم دەپەرستن کە فیرعەونەکان یان کاهینە مەزنەکانن[٣٥].

[35] لێرەدا سینۆهە، لەوانەیە بەهۆی ئەو خەمەی کە هیبوی، گوتەیەك بهێنێتە زمان کە گوتەی یەکەمی پێچەوانەی گوتەی دوای ئەو بێت، چونکە سینۆهە هەر بەوشێوەی لەلاپەڕەکانی پێشودا خوێندمان باوەڕی بەخودای نەبینرا و بێشیوە هێنابوو، دووەم لەوە تێناگات کە تاکە ئاینی ئاینێك کە بۆ جۆری مرۆڤ بەدی هێنەری خۆشبەختی ئەم دنیا و ئەو دنیایە، ئەوئاینەش پەرستنی خودای تاك و تەنها و نەبینراوە و مرۆڤ بێ بەپەرستنی خودای تاك و تەنهای نەبینراو لەم دنیا و ئەودنیادا ئارامی ڕۆحی و خۆشبەختی بەدەست دەهێنێت.

لەبەرئەوەی جۆری مرۆڤ ناتوانێت خودای بێ شێوە و نەبینرا بپەرستێت، چونکە هیچ مێشك و هزرێك توانای تێگەشتنی خودای بێ شێوە و نەبینراوی نیە، هەرلەبەرئەوە هەمان ئەو خودایە فەراموش دەکەن و لەباتی ئەو، ئەو کەسانەی کە دەڵێن ئێمە کوڕی خودای نەبینراوین یان لە لایەن ئەوەوە هاتوین یان گوێمان لەدەنگی بووە و گفتوگۆی لەگەڵدا دەکەین، دەپەرستن، چونکە ئەم جۆرە کەسانە مرۆڤن و شێوەیەکی تایبەتیان هەیە و خەڵکی دەتوانن بیانبینن و لەئاییندەشدا بەوشێوەیە دەبن و هەرجارێك خودایەکی بێ شێوە و نەبینراو بێتە بون، هەرکاتێك بیەوێت سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، ناچارە مرۆڤێك بەخەڵکی بناسێنێت و لەزمانی ئەوەوە لەگەڵ خەڵکیدا بدوێت، بۆئەوەی ئەم خەڵکە ئەو مرۆڤە بپەرستن و دوای مەرگی ئەو مرۆڤەش ئەو کاهینانەی دەبنە جێنشینی ئەو خەڵکی دەیانپەرستن، چونکە جۆری مرۆڤ توانای ئەوەی تێدا نیە جگە لەمرۆڤ و گیانەوەر و بێگیان،بەواتا ئەو شتانەی کە شێوەیەکیان هەیە بپەرستن.

ئەگەر فیرعەون"ئەخناتون"شێوەیەکی بۆ خودای خۆی دروست بکردایە، ئەوەی بەسەردا نەدەهات و ئەو دوڕویی و دوزمانی و فیتنەیە دروست نەدەبوو و"مریت و تهوت"ی من بەوشێوە دڵتەزێنە بەکوشت نەدەدران و خۆڵەمێشی بەدبەختی و داماوی نەدەنیشت بەسەر خەڵکیەوە و بۆ جارێکی تریش من تەنها نەدەبوم.

بەبۆچونی من یەکێك لەشتە هەڕەشەئامێزەکانی جیهان بیری چاکسازی فیرعەونێکە، چونکە ئەو جۆرە بیرۆکە چاکسازیانە سەرەڕای ئەوەی چاکەی خەڵکی دەوێت، کۆمەڵێکی زۆر بەدبەخت دەکات. لەدورەوە دەنگی هەلهەلەی خەڵکی کە بۆ فیرعەونی تازە لێیان دەدا و خۆشحاڵی خۆیان بۆ دەردەبڕی، دەبیست. خەڵکی وایان دەزانی لەبەرئەوەی فیرعەونی نوێ و بچوك لەمنداڵیەوە لەبیری گۆڕەکەی خۆیدایەتی و دەیەوێت ئارامگایەك بۆ خۆی دروست بکات، بە فیرعەونێکی دادپەروەر دەهاتە بەرچاویان و دەتوانێت ستەم لەناو ببات و دادپەروەری و خۆشبەختی بەرقەرار بکات.

بەڵام بێئاگا لەوەی کە خودای فیرعەونی پێشوو، سەرەڕای ئەوەی خوازیاری ئاشتی و یەکسانی و لەناوبردنی جیاوازی نێوان دەوڵەمەند و هەژار بوو، ئەو بەدبەختیانەی بەسەر خەڵکیدا هێنا و لەم حاڵەتەدا قور بەسەری ئەو کەسانەی لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئەم فیرعەونە تازەیەدا دەژین، چونکە خودای تازە هەمان خودای"ئامون"ی ستەم و توڕەیی و تەماعیە و تازە فەرمانڕەوایی گرتووەتە دەست و

تینو و برسیەتی، ماوەیەکە هیچی نەخواردووە و نەخواردووەتەوە و بۆ تێکردنیشی دەرئەنجامی دەستڕەنجی تەواوی خەڵکی میسر و بۆ تینو شکاندنیشی خوێنی هەموو منداڵەکانی ئەم وڵاتە بەشی ناکات.

فیرعەونی پێشوو مەرگی لەدەستی من وەرگرت و خواردیەوە و مرد و ئاسودە بوو، چونکە دوای مەرگ هەموو شتێك فەرامۆش دەکرێت، بەڵام من بەزیندویی ماوم و ناتوانم ئەوەی بینیومە و بیستومە و بەسەر مندا هاتووە فەرامۆشی بکەم، بۆیە بەناچاری ژیانم دوای ئەوە هاوکات دەبێت لەگەڵ تاڵی و نەهامەتیەکاندا.

وێرانەی مەیخانەی"کلکی تیمساح"م بەجێ هێشتو گەڕامەوە بۆ لەنگەرگای "تبس"و لەنگەرگای"تبس" کە چۆڵ و تەپۆڵکەیەك لە سەبەتەی خاڵی دڕاوو تەنافی بەکار نەهاتوو دەهاتە بەرچاو کە ڕۆژێك لەڕۆژان لێرەدا ناوەندی چالاکی باربردن و گواستنەوەی دەریایی و ڕوباری بووە. لەناکاو پیاوێکی لاواز لەژێر سەبەتەکاندا هاتە دەرەوە و بەرەو ڕوم هات و بەچاوە قوڵ و تاریکەکانی تەماشایەکی منی کرد و وتی: ئایا ناوی تۆ"سینۆهە"نیە؟ ئایا تۆ هەمان پزیشکی فەرمانڕەوایی نیت کە بەناوی"ئاتون"برینی نەخۆشەکانت تیمار دەکرد؟من کە نەمدەزانی مەبەستی چیە، بێدەنگ بوم و چاوەڕێی پاشماوەی قسەکانی بوم و لەبەردەوامی قسەکانیدا ئەو پیاوە وتی: ئایا تۆ هەمان ئەو"سینۆهە"یە نیت کە لەڕێی خزمەتکارەکانتەوە نانت بەنێو خەڵکیدا دابەش دەکرد و ئەوانیش لەزمانی تۆوە دەیانوت ئەمە نانی"ئاتون"ە... بیخۆن و سوپاسگوزاری "ئەخناتون"بن و تۆش کەنانت بەنێو خەڵکیدا دابەش دەکرد، ئەمڕۆ نانێکم پێبدە، چونکە چەند ڕۆژێکە من لەژێر ئەم سەبەتانەدا ژیان بەسەر دەبەم و لەبرساندا توانای ڕێکردنم نیە.وتم: تۆ دەبینی کەمن نانم پێ نیە، بۆئەوەی پێتی بدەم، بەڵام تۆ بۆچی لەژێر ئەم سەبەتانەدا ژیان بەسەر دەبەیت؟

پیاو وتی: من خانویەکی بچوکم هەبوو و بۆنی ماسی گەنیوی لێدەهات، بەڵام سەرای ئەوەش نەمدەتوانی لەکاتی خۆر و باران و لەکاتی شەودا لەوێ بخەوم، من ژنێکی ناشیرینم هەبوو و منداڵگەلێکیشم هەبوو کە ماوەیەکە بەبرسیەتی ژیانیان بەسەر دەبرن، بەڵام سەرەڕای ئەوەش هەر منداڵی من بون. بەڵام ئەمڕۆ ئەوماڵەشم نەماوەو وێرانیان کردووە...ئەمڕۆ ژنم نیە، چونکە ژنەکەمیان کوشتوم، ئێستاش منداڵم نیە، چونکە هەموویان لەناو چون و بەرپرسیاریەتی تەواوی ئەم تاوانانە لەئەستۆی خوداکەی تۆدایە. "سینۆهە"خودای تۆ"ئاتون" ماڵ و ژن و منداڵەکانی لێ

سەندم و منی گەیاندە ئەم ڕۆژە ڕەشە و لەئێستاشدا بۆ ئەوەی لەگەرما هەڵبێم، دەبێت پەنا بۆ ئەم سەبەتە کۆنانە ببەم، لەو ڕۆژەوەی جیهان هاتووەتە بون، خودایەك لە خوداکەی تۆ ترسنۆکتر و شومتر نەهاتووەتە بون و من دەزانم کە دەمرم، بەڵام خۆشحاڵم کە خوداکەی تۆ لەناو چووە، بۆئەوەی خەڵکی میسر لەوە زیاتر بەدبەختتر نەبن.

دوای ئەم قسانە پیاو کەوتە سەر زەوی و دەستی کرد بەگریان و لەبەرئەوەی من نەمدەتوانی هاوکاری بکەم لێی دور کەوتمەوە و خۆم کرد بەناوچەی هەژار نشینەکاندا و گەشتمە شوێنێك کە ماڵی مسگەر بەواتا خانوی پێشوی من بوو.

بینیم ئەو ماڵە وەك ماڵەکانی تری"تبس"وێران بووە و ڕەشی ئاگری تێدا بەدی دەکرێت و ئەو درەختانەی لەنزیك ماڵەکەوە بون وشك بون. بەڵام لەکەنار دیواری ئەو کەلاوە و لەژێر ئەو وێرانەیەدا چاوم بە کولانەیەك کەوت کە گۆزەیەکی لەبەردەمدا بوو، وەك بڵێی کەسێك لەوێدا نیشتەجێ بوبێت، چونکە شێداری گۆزە ئەوەی پیشان دەدا کە ئاوی تێدایە.

من هەنگاوێك بەرەو ڕوی کولانەکە ڕۆشتم و لەناکاو"موتی"خزمەتکارم بەقژێکی پەرێشان و ئاڵۆزکاوەوە بینی کە بەشەلەشەل لەکولانەکەی هاتە دەرەوە و وتی، ئەمڕۆ پیرۆز بێت کە خاوەنەکەم گەڕاوەتەوە.

بەبینینی"موتی"بەڕادەیەك سەرم سوڕما کە لەو کاتەدا واهەستم کرد ئەوە ئەو نیە، بەڵکو ڕۆحی ئەوە، چونکە پێیان وتبوم کە ئەویان کوشتووە.

لێم پرسی: "موتی" ئایا تۆ زیندویت؟

"موتی"هیچی وەڵامێکی نەدایەوە و لەسەر زەوی دانیشت و ڕوخساری بەهەردوو دەستی داپۆشی و بینیم کە لاواز بووە و برینی جێگای شاخی پێوە دیار بوو.

دیاربوو تاقەتی ئەوەی نەبوو باسی ئەو داستانەم بۆ بکات کە چی بەسەردا هاتووە و منیش نەمدەویست بەداواکردنی ڕونکردنەوەکانم برینەکانی تازە بکەمەوە.

هەواڵی"کاپتا"م لێ پرسی و"موتی"وتی: "کاپتا"بەدەستی نۆکەر و کرێکارەکان کوژراوە، چونکە کاتێك بینیان ئەو شەراب و ئاوجۆ بەسەربازەکانی"ئامون"دەدات زۆر لێی توڕە بون و کوشتیان. بەڵام من باوەڕم بەم قسەیە نەکرد، چونکە لەبیرمە دوای ئەوەی"ئاتون"سەرنگون بوو و"ئامون" دەست بەکار بوو"کاپتا"زیندوو بوو و هەر

ئەویش نەیهێلا بچمە ناو ئاگری مەیخانەی"کلکی تیمساح"ەوە و لاشەی"مریت" و "تهوت" بهێنمە دەرەوە.

لەوکاتانەدا کرێکاران‌و نۆکەران‌و بەشێوەیەکی گشتی تەواوی لایەنگرانی"خاچ" لەناو چوبون و هیچ کەسێکی وایان لیّ نەمابویەوە کە هەوڵی کوشتنی"کاپتا"بدەن.

دوای ئەوەی من لە"تبس"ڕۆشتم، سەرەڕای ئەوەی بێبەند و باری باڵی بەسەر شاردا کێشابوو، بەلاّم من"کاپتا"م زۆر لەوە ئازاتر دەزانی کە لەبێبەند و باریەکی ئاوادا سەرەڕای ئەوەی دەیتوانی سود لەپارێزگاریەکانی"ئامون"وەرگرێت بەکوشت بدرێت.

کاتێک"موتی"بینی من بێدەنگ بوم و هیچ قسەیەك ناکەم، لەناکاو توڕە بوو و وتی: ئایا ئاگاداری ئەوەیت کە ئینکاری و سوربونەکانی تۆ چ دەرئەنجامێکی لەدوای خۆیەوە بەجیّ هێشت؟

تۆ لەدواییین ڕۆژەکانیشدا دەتوت: "ئاتون"باڵ بەسەر هەموو شوێنێکدا دەکێشێت، بەلاّم هەم ئەو شکستی خوارد و هەم تۆ، ئێستا تۆش پیاوێکی هەژارت لێدەرچووە و دڵنیام کە برسیتە و لەبەرئەوەش هاتویت بۆ ئێرە بۆئەوەی داوای تیکە نانێك لەمن بکەیت، هەروەها لەبەرئەوەی شوێنێکت بۆ خەوتن نیە لەناو ئەم کولانەیەدا کە من لەژێر ئەم وێرانەیەدا دروستم کردووە دەتەوێت بخەویت و سەر لەبەیانیەکەشی کاتێك لەخەو هەڵدەستی، داوای ئاوجۆ و ماسی سوێرم لیّ دەکەیت و ئەگەر یەکسەر ئاوجۆکەت بۆ نەهێنم دارکاریم دەکەیت. تەماشای ژیانی خۆت و ژیانی من بکە.....بەهۆی سوربون و پێداگریەکانتەوە بیّ لەم وێرانەیە هیچ شتێکی تر لەدوای خۆیەوە بەجیّ نەهێشتووە و منیش هەر لێرەدا دەمرم، بێئەوەی گۆڕێکم هەبێت، چونکە پارەی کرینی گۆڕێکم نیە و دوای مەرگیش لەبەرئەوەی هەژارم، کەسێك من ناباتە بۆ مردووخانە و جەستەم مۆمیا ناکات و لەگۆڕدا نامنێژێت و بۆئەوەی لاشەم بۆگەن نەکات فڕێی دەدەنە ناو ڕوباری"نیل"ەوە و منیش وەك هەزاران کەسی تر کە لەم شارەدا بونەتە خۆراکی"تیمساح"ەکان دەبمە ژەمێکی گیانەوەرانی ڕوباری"نیل".

کاتێك"موتی"ئەم قسانەی کرد من دەستم کرد بەگریان، چونکە ئەو کاتانەم هاتەوە یاد کە لاو بوم و بەهۆی هەڵەوێریەکانمەوە، ژن و مێردێك کە من ئەوانم بەدایك و باوکی خۆم دەزانی بیّ گۆڕ هێشتەوە، چونکە بگرە من گۆڕەکەی ئەوانیشم فرۆشتبوو بۆئەوەی بتوانم سەرنجی ژنێك کە زۆر بێشەرم و شایستەی ئەوە نەبوو کە من لەگەڵیدا

هاوخەو بم بەلای خۆمدا ڕابکێشم، کاتێکیش چاوی بەمن کەوت خۆی بەناونیشانی ژنێکی بەڕێز پیشانی من دا.

ئێستاش"موتی"خزمەتکارم گۆڕی نیەو ئەگەر من ئەمڕۆ بیرم لەوە نەکردایەتەوە کەبێم بۆ ئێرە و چاوم بەو بکەوێت، لەوانەبوو بمرێت و لاشەکەشیان فڕێبدایەتە ناو ڕوباری نیلەوە، چونکە کەسێك کە نەسامانی هەبێت بۆئەوەی لاشەی خۆی مۆمیا بکات و نە دارایییەکی ئەوتۆی هەبێت کە گۆڕێکی پێ بکرێت، دوای مەرگ تاکە گۆڕ و شوێنی ڕوباری"نیل" دەبێت.

کاتێك"موتی"چاوی بەگریانی من کەوت توڕەییەکەی هێور بویەوە و وتی: "سینۆهە"خەم مەخۆ من هێشتا لەژێر وێرانەی ئەمماڵەدا بڕێك گەنم و چەن گۆزەیەکی پڕ لە ڕۆنی ڕوەکم هەیە و ئێستا بڕێك لەو گەنمە دەکەم بەئارد و نانت بۆ دروست دەکەم، دوای ئەوەش نانێك لەگەڵ خۆمدا دەبەم بۆئەوەی گۆزەیەك ئاوجۆی پێ بکڕم و بیهێنم بۆت بۆئەوەی تێری لێ بخۆیتەوە.

دوای ئەوە من و تۆ پێکەوە لەهەمان ئەم شێوەنەدا خانویەکی بچوك بۆخۆمان دروست دەکەین، بۆئەوەی تۆ بتوانی لەناویدا دانیشی و کاری پزیشی خۆتی تێدا بەڕێوە ببەیت، سەرەڕای ئەوەی خەڵکی بەتەواوی هەژار کەوتون و ناتوانن لەبەرامبەر چارەسەریەکانتدا شتێکت پێبدەن، بەڵام تۆ لەڕوی پزیشکیەوە لەنێو خەڵکیدا ناوبانگیەکی باشت هەیە و نەخۆشگەلێکی زۆر سەردانت دەکەن.

ئەگەر کەسە نەخۆشەکانیش سەردانت نەکەن، ئەوا خۆم ناهێڵم برسی و تینوت ببێت و ڕۆژانە دڕۆمە ئەو ماڵانەی هێشتا بەدەوڵەمەندی ماونەتەوە و جلەکانیان بۆ دەشۆرم و داوای ئەوەیان لێدەکەم کە لەبەرامبەردا ئاوجۆم پێبدەن، بۆئەوەی بۆتۆی بهێنم، بەڵام تەنها یەك تکام لەتۆ هەیە ئەو تکایەشم ئەوەیە کە لەمەودوا خودایەکی تر مەهێنەرە میسر و ئەم شارەوە، چونکە ئێمە چ خێرێکمان لەهەموو ئەو خودایەی کە لەمیسردا هەیە بینیوە، بۆئەوەی تۆ خودایەکی تر بهێنیتە ئەم میسرەوە.

ئەگەر خوداکان توانای ئەوەیان ببوایە کە چاکسازی لەکاروبار مرۆڤەکاندا بکەن، هەزارەها خودا کە تا ئەمڕۆ هاتونەتە بون چاکسازیان لەم کارانەدا دەکرد، هەروەها هەمان ئەم خودایەی تۆ دەتوت هیچ خودایەك لەو بەهێزتر نیە، تەماشاکە چ بەدبەختیەکی هێنایە بون و بەچ شێوەیەك کۆمەڵێك شاخدار ئەویان لەناو برد، ئایا شێتی نەبوو کەڕێدرا ئەو هەموو خوێنە بڕێژرێت و ئەو هەموو بەدبەختیە بێتە بون و

تۆش هەرچی سامانی خۆتە لەدەستی بدەیت و شکست بخۆیت، سەرەڕای ئەو هەموو بەدبەختیەش هەمان خودا فەرمانڕەواییمان بکات.

ئەوەندە دڵم بۆ"مریت"و"تهوت"دەسوتا، ئەوەندە بەزەییم بەتۆدا نەدەهاتەوە، چونکە تۆ پیاوێکی وەك هەر پیاوێکی تر یان مێشکێکی منداڵانەت هەیە یان شێتی، چونکە پیاوێك، لەبەرئەوەی پیاوە هەرگیز ژیر نابێت و بەردەوام بەمنداڵی یان بەشێتی دەمێنێتەوە، بەڵام"مریت"ژنێکی ژیر و دانبەخۆدارگر بوو و من ئەوم وەك کچی خۆم خۆشدەویست و"تهوت"یش هەموو شەوێك لەباوەشی مندا دەخەوت.

لەبەرئەوەی بەبەردەوامی فرمێسکم دەڕشت و دەگریام"موتی"بابەتی گفتوگۆکانی گۆڕی و وتی: "سینۆهە"تێپەڕبونی کات چاکسازی لەهەموو شتێکدا دەکات و تۆش ئەم بەدبەختیانە فەرامۆش دەکەیت و بەوشێوەیە گۆنا و جەستەت بەلاوازی نامێننەوە، چونکە من وەکوو ڕابردوو خواردنی چاك و خۆشت دەرخوارد دەدەم و دوبارە وەکو جاران قەڵەو دەبیتەوە.

من کە بەهۆی ئەم دڵنەواییانەی ئەوەوە هێور بومەوە و وتم: "موتی"من نەهاتوم بۆئەوەی ببمە مایەی دەردیسەریت، بەڵکو لێرە دەڕۆم و لەوانەیە بۆماوەیەکی درێژخایەن نەگەڕێمەوە، لەبەرئەوەش هاتم بۆئێرە بۆئەوەی چاوم بەو ماڵە بکەوێت کە بەئاسودەیی تێیدا دەژیام و درختە سێبەردارەکانی بەرامبەر ئەم ماڵە ببینم، بەڵام ئێستا وشك بون. هەروەها دەمویست هەیوانی ئەو ماڵەی کە"تهوت"ی کوڕم تێیدا یاری دەکرد بۆجارێکی تر ببینم، بەڵام دەبینم هەیوانی ماڵەکە پڕبووە لەخۆڵ و خاشاك.

تۆ وتت من شکستم هێناوە، ئەم قسەیەت زۆر ڕاستە، چونکە سامانی خۆم لەدەست دا، بەڵام هێشتا ئەوەندەم هەیە کە بتوانم بڕێك کانزات بۆ بنێرم بۆئەوەی بتوانی شتێك بۆ خۆت بکڕیت و ئەگەر حەز دەکەیت ئێرە نۆژەن بکرەوە و تێیدا بژی.

من لەگوتەکانی تۆ کە دەزانم لەدڵسۆزیەوە سەرچاوە دەگرێت، بێزار نەبوم، ئەوکاتانەی کە زمانت وەك چزی هەنگ وایە، ڕۆحت لێوانلێوی سۆز و خۆشەویستیەو ئێستاش ماڵئاواییت لێدەکەم و هەر ئەمڕۆ یان سبەی، بڕێك کانزات بۆ دەنێرم. بەڵام"موتی"دەستی کرد بەگریان و خۆڵی کرد بەسەر خۆیدا و وتی: من ناهێڵم بڕۆیت، چونکە بەچاوەکانتدا دیارە کە برسیتە و دەبێت خواردنێکت بۆ لێ بنێم بۆئەوەی بیخۆیت و کەمێك هێز بەبەرتدا بێتەوە.

من بۆئەوەی"موتی"دڵگران نەکەم، مامەوە تا ئەوەی خواردنێکی بۆ لێنام و خستیە بەردەمم و منیش دەستم کرد بەخواردنی ئەو چێشتە، بەڵام تامەزرۆی خواردن نەبووم، چونکە بەردەوام بیرم لای"مریت"و"تهوت"بوو و نەیاندەهێڵا بەتامەزرۆوە چێشتەکەم بخۆم.

"موتی"بەردەوام دەیوت: "سینۆهە" بخۆ و کەمێك هێز بەبەر خۆتدا بهێنەرەوە... بۆئەوەی هەمیشە تامی خواردنی منت لەبیر بێت، چونکە پێشبینی ئەوە دەکەم سەرەڕای ئەوەی ئەو بەدبەختییانەی کە بەسەر تۆدا هاتووە، دوبارە خۆت گرفتاری بەدبەختیگەلێکی تر دەکەیت، بەڵام هەوڵی ئەوە بدە کە زووتر بگەڕێیتەوە و من چاوەڕێی گەڕانەوەی تۆم، ئەگەر بابەتی کڕینی گۆڕەکەم بەئەنجام بگات، چیتر خەمی ئایندە ناخۆم، لەبەرئەوەی هێزی جەستەم بەتەواوی لەناو نەچووە و دەتوانم لەڕێی جل شۆرین و لێنانی چێشت لەماڵی دەوڵەمەندەکاندا–ئەو ڕۆژەی نانخواردن ئاسایی بویەوە و بەئاسانی گەنم بەدەست بێت–منیش دەتوانم بژێوی ژیانم دابین بکەم.

ئەو ڕۆژە من تا کاتی خۆرئاوابون لەو کولانەیەدا لەلای"موتی"بووم، زۆر خەمگین بوم و لەدڵی خۆمدا دەموت: هەر ئەوکاتەی بڕە کانزاکەم دا بە"موتی"چیتر پێ نانێمە ئەم وێرانەیەوە، چونکە بەشێوەیەك بەبینینی ئەم وێرانەیەوە ڕۆحم پەرێشان دەبێت کە خۆم تەنهاتر و بەدبەختر لەهەر کاتێکی تر دەزانم. ماوەیەك پێش خۆر ئاوابون ڕۆشتم بۆ کۆشکی زێڕینی فەرمانڕەوایی و بڕێك کانزام لەوێ هێنا و دام بە"موتی".

ئەوکات ماڵئاواییم لە"موتی"کرد و وتم: ژیانی خۆت بەشێوەیەك ڕێك بهێنە کە وەك بڵێی لەم ساتە بەدەواوە هەرگیز من نابینی، بەڵام ئەگەر هەر هەلێکم بۆ بڕەخسێت دەگەڕێمەوە بۆ لات.

کاتێك لەو وێرانەیە گەڕامەوە بینیم بەشێك لەئاسمانی"تبس" بەهۆی بڵێسەی ئاگرەوە ڕۆناك بووە و دەنگی موزیك لەهەندێك کۆڵاندا دەبیسترێت، دوای ئەوە ئاگاداری ئەوە بوم لەبەرئەوەی ئەو ڕۆژە ڕۆژی تاج لەسەر نانی"توت ئانخ ئامون"ە، خەڵکی شادی خۆیان بەو بۆنەیەوە دەردەبڕن.

*بەشی چل و شەشەم*

## کردنەوەی پەرستگای"سخ مت"ی خودای جەنگ

لەهەمان ئەو شەوەی کە"تبس"بەبۆنەی تاج لەسەرنانی فیرعەونی تازە ئاگری داگیرساندبوو و موزیکی دەژەند، کاهینەکانیش لەژێر ڕۆشنایی مەشخەڵەکاندا لەناو پەرستگای"سخ مت"ی خودای جەنگ کە چل ساڵ لەمەو پێش داخراوبوو کاریان دەکردو گیای هەرزەی ناو پەرستگاکەیان دەکەندو جلێکی کەتانی سورباویان دەکردەبەری پەیکەری خودای جەنگو هێماکانی جەنگو وێرانکاریان بەپەیکەرەکەوە هەڵدەواسی. چونکە"ئامی"بە"هورم هب"ی وتبوو: ئەی کوڕی شەهێن-هورم هب لەسەردەمی منداڵی و لاویەتیدا بەبەردەوامی لەگەڵ شەهێنێکدا ڕێی دەکرد و ئەوی لەپێش خۆیەوە دەهێنایە فڕین و دەیوت کە کوڕی شەهێنە-فوویان کرد بە بوقەکاندا و جەنگ دەستی پێکرد، بۆئەوەی نەتەوەی میسر بەهۆی توشبونیان بەجەنگەکانەوە، تەواوی بەدبەختیەکانی خۆیان بۆ نمونە فیرعەونی درۆزن بە فەرامۆشی بسپێرن.

دەست بەجەنگ بکە بۆئەوەی خەڵکی ماوەی ئەوەیان نەبێت، بیر لەشتگەلێکی تر بکەنەوە و لەبرسیەتیدا بناڵن و لەجەنگەکاندا بەشانازیەوە خۆت پیشان بدە، بۆئەوەی شازادە خانم "باکتاتون"بەخۆشی و ئارەزویەکەوە بێت بەپیریتەوە و ڕازی بێت بەوەی شوت پێ بکات.

ئەوەبوو"هورم هب" بەڕەزامەندی"ئامی"و کاهینەکانی"ئامون" فەرمانی دا پەرستگای خودای جەنگ بکاتەوە، بۆئەوەی لەڕۆژی دواییدا بتوانێت سەردانی ئەم پەرستگایە بکات و داوای هاوکاری لە"سخ مت"ی خودای جەنگ بکات کە سەری وەك شێر و جەستەی وەك ژن بوو.

لەکاتێکدا فیرعەونی تازە، لەگەڵ هاوسەر و بوکەڵەکانیدا سەرقاڵی یاری ناشتنی مردووەکان بوو، لەناو پەرستگاکانی"تبس"دا ناوی"ئەخناتون"یان سڕیەوە و ناوی"توت ئانخ ئامون"یان دەنوسی و "ئامی"بەناوی فیرعەون وڵاتی بەڕێوە دەبرد و سەرانەی دەسەند و زەوی دەوڵەتی بەهەر کەسێك کە خۆی بیویستایە دەبەخشی و کاهینەکانی ئامونیش بەهۆی لەخۆبایی لەڕادەبەدەریان کە لەسەرکەوتنەکانیانەوە سەرچاوەی دەگرت لەپێستی خۆیاندا جێیان نەدەبویەوە، چونکە لەناکاو تەواوی سامان و دارایی ڕابردویان کە لەدەستیان دابوو، بەدەست هێنایەوە."هورم هب"یش دەیویست لەبەدەستهێنانی سەرکەوتنەکانیدا لەوانی تر بەجێ نەمێنێت و ئەویش وەك ئەوانی تر ناوبانگی دەربکات و خەڵکی بزانن کوڕی"شەهێن" لەمەو دوا یەکێکە لەکاربەدەستە سەرەکیەکانی میسر و دەبێت وەك ئەوانی تر ڕێز لەمیش بگرن.

ئەوەبوو لەڕۆژی دواییدا، بوقی سەربازەکان"هروم هب" لەشەقام و گۆڕەپانەکانی میسردا دەنگی دایەوە و چوارپێکان ئەو هەواڵەیان بەخەڵکی ڕاگەیاند کە ئەمڕۆ دەروازەی مسینی پەرستگا"سخ مت"دەکرێتەوەو "هورم هب"لەگەڵ هەندێك لەسەربازەکانی دەڕوات بۆ ئەو پەرستگایە و قوربانی پێشکەشی"سخ مت"دەکات.

لەو ڕۆژەدا"هورم هب"پێی وتم: کە بۆ تەماشاکردن سەردانی ئەو پەرستگایە بکەمو دوای ئەوەش ئاگاداری ئەوە بووم کە دەیەوێت دەستەڵات و هێزی خۆیم پێ نیشان بدات.

دەبێت ئەوەش بڵێم ئەو ڕۆژە"هورم هب"دەیزانی کە لەناو خەڵکی میسردا دەردەکەوێت،بۆیە بۆئەوەی بەشێوەیەکی ڕوکەش پەرستانە خۆی پیشانی خەڵکی نەدات ئەسپی گالیسکە جەنگیەکانی خۆی بەپەڕی شەپۆلداری نەعامە نەڕازاندەوە و بزیسکەی چەرخی گالیسکەکانی بە ڕوپۆشی ئاڵتونین دانەپۆشی و تەنها دوو داسی مەزن و تیژی وەك ئەو داسانەی کە لەگۆڕەپانەکانی جەنگدا، لەپێش گالیسکەکانەوە دادەکوترێن، بەگالیسکەکانەوە بەستەوە، لەدوای گالیسکەکەی ئەویشەوە سەربازە نێزەدارەکان بەشێوەیەکی سەربازی ڕێیان دەکرد و هەنگاوە سەربازیەکانیان لەسەر سەنگ فەرشی شەقامی بەردەم پەرستگا دەنگدانەوەیەکی مەزنی دروست دەکرد.

لەدوای نیزەدارەکانیشەوە، سەربازەڕەشپێستەکان ڕێیان دەکرد، بۆئەوەی هەنگاوە سەربازەکانیان پێکەوە بگوازنەوە، لەکاتی ڕێکردنیان تەپڵێکیان بۆ لێدەدان کە لەپێستی مرۆڤ دروست کرابوو.

خەڵکی بەترس و حەسرەتەوە تەماشای سەربازەکانی"هورم هب"کە لەتێریاندا ڕوخساریان دەدرەوشایەوە دەکرد و دەیانزانی کە خواردنی ئەوانیان بۆ سەربازەکان بەکاردەهێنا. کاتێك گالیسکەی"هورم هب"لەبەرامبەر پەرستگادا ڕاوەستا و پێی نایە سەر زەوی و خەڵکی چاویان بە باڵای بەرز و شانی پانی کەوت، بەشێوەیەکی نادیار هەستیان بەوە کرد کە هێشتا کۆتایی بە بەدبەختیەکانیان نەهاتووە، بەڵکو تازە دەبێت بەرگەی بەدبەختیە تازەکانیان بگرن.

"هورم هب"لەگەڵ سەرکردەی هێزە سەربازیەکانی خۆیدا پێی نایە ناو پەرستگاکەوە و کاهینەکانیش بەدەستە خوێناویەکانیانەوە پێشوازیان لێکرد.

من وەك میسریەکانی تر ((جگە لەوانەی کە زۆر پیربون)) هێشتا بەچاوی خۆم ئەوەم نەبینیبوو کە بەچ شێوەیەك مەراسیمی کردنەوەی خودای جەنگ بەڕێوە دەبرێت، بۆیە لەدەستی خوێناوی کاهینەکان سەرم سوڕما.

دوای ئەوە بینیم، کاهینەکان"هورم هب"یان بردە لای پەیکەری"سخ مت".... "سخ مت" خودایەك بوو کە سەری وەك شێر و سینە و مەمکێکی وەك مرۆڤی هەبوو و لەو ڕۆژەدا جلە ئەرخەوانەکەیان خەڵتانی خوێن کرد.

ئەو شوێنەی کە پەیکەرەکەی"سخ مت"ی تێدا بوو، تۆزێك نیوە تاریك بوو و وەك بڵێی"سخ مت"بەچاوێکی زەق و کراوەوە تەماشای"هورم هب"دەکات.

کاهینەکان لەبەردەم پەیکەرەکەدا، سێ دڵیان دا بەدەست"هورم هب"ەوە و پێیان وت کە لەسەر میحرابدا بیانگوشێت، من لەهەمان ئەوکاتدا وا لێکم دایەوە کە ئەوانە دڵی مەڕ یان گوێرەکە بن، بەڵام کاتێك لێی وردبومەوە بینیم کە دڵی مرۆڤە.

کاتێك"هورم هب"دڵی خوێناوی مرۆڤی بەهەردوو دەستی گرت، لەسەر میحرابەکەدا دەیگوشین و لەناو دڵەکانیشەوە خوێن دەهاتە دەرەوە، کاهینەکانی چواردەوری پەیکەرو "هورم هب"سەمایان دەکردو هەریەکێکیان چەقۆیەکیان بەدەستەوە بوو دەیاندا بەنێوچاوانی خۆیانداو خوێن بەسەر جلە سپی و ڕۆحانیە

کانیاندا دەڕژا و دیمەنێکی ترسناکی وەك دیمەنی ڕۆژانی جەنگی ناوخۆی و کوشت و کوشتاری"تبس"دەهێنایە بون.

کاهینەکان لەکاتی سەماکردندا پێکەوە ئەمەیان دەهێنایە زمان:

((ئەی هورم هب، کوڕی شەهێن، لەجەنگی داگیرکاری بگەڕێرەوە بۆئەوەی"سخ مت" لەپایگای خۆی بێتە خوارەوە و بەڕوتی تۆ لەباوەش بگرێت.))

کاتێك"هورم هب"خوێنی لەدڵی گەرمی مرۆڤەکان هەڵڕشت، لەسەر میحرابەکەدا هەڵی گوشی دوای ئەوە لەپەیکەر و محرابەکە دور کەوتەوە و کاهینەکانیش بەدەم سەماکردنەوە، لەکاتێکدا کە ڕوخسار و جلە سپیەکانیان لەخوێنی سور وەرگەڕابوو لەگەڵ ئەودا تابەردەرگای پەرستگا ڕۆشتن، دوای ئەوە"هورم هب" لەپەرستگا ڕۆشتە دەرەوە و گەشتە لای گالیسکەکەی خۆی و سواری بوو و ئەوکات ڕوی لەخەڵکی میسر کرد و دەستەکانی خۆی پیشانی خەڵکی دا و بەدەنگێکی بەرز وتی:

ئەی خەڵکی میسر، گویێ لەگوتەکانم بگرن، من"هورم هب"ی کوڕی شەهێنم کە سەرکەوتنی میسرم لەدەستدایە و هەموو ئەوانەی لەگەڵ مندا لەجەنگی پیرۆزدا بەشدار دەکەن، بەڵێنیان پێ دەدەم کە شانازی هەتاهەتایی دەبێتە بەشیان.

لەمکاتەدا گالیسکە جەنگیەکانی"هاتی"لە بیابانی"سینا"دا لەحاڵی جولاٌندایە و پێشەنگەکانی ئەمانەش لەمیسری خواروودا سەرقاڵی کوشت و کوشتار و تالاٌنین و هیچ کاتێك میسر دوچاری ئەم جۆرە هەڕەشانە نەبووەتەوە و لەبەرامبەر ئەم هەڕەشەیەدا کە لەمڕۆدا هەڕەشە لەمیسر دەکات، هێرشی خێڵەکانی"هیك سوس" لەکۆندا بۆ میسر، زۆر بێنرخ دێتە بەرچاو.

لەشکری سەربازی"هاتی"یەکان گەشتووەتە میسر و ئێوەش نازانن کە ئەمانە چەنێك بێبەزەیین و بەچ شێوەیەك ڕیشەی نەتەوەی میسر وشك دەکەن، لەشکری سەربازی"هاتی"بگاتە هەر شارێك وێرانی دەکات و سەربازی دژمن تەواوی ژن و منداڵەکان وەك دەستکەوتی جەنگ بەدیلی دەگرن بە کەنیزەیی دەیانبەن بۆ خۆیان، تەواوی پیاوە بەجێماوەکانیش کوێر دەکەن، بۆئەوەی بتوانن بیانبەستنەوە بەبەرداشەکانی خۆیانەوە و تەواوی کوڕە لاوەکانیش بەدیلی دەگرن، بۆئەوەی لەبازاڕی کۆیلە فرۆشەکاندا بیانفرۆشن.

ئەو شوێنەی گالیسکە جەنگیەکانی"هاتی"لێوە تێپەڕێت، بۆماوەی یەك ساڵی تر"بەواتا ٢٧هەزار ساڵ" گیا لەو زەویەدا ناڕوێت و هەر لەبەرئەوەش من بانگەشەی ئەوە دەکەم کە دەبێت جەنگی پیرۆز لەبەرامبەر دژمنی بێبەزەییدا دەست پێبکەین.

ئەم تێکۆشانە پیرۆزە جەنگێکە کە ئێمە بۆ پاراستنی ژن و کوڕ و کچ و پیاوانی ژیر و پاراستنی خوداکانمان دەست پێدەکەین و من ئەو دڵنیاییەتان پێ دەبەخشم ئەگەر خۆبەخشانە بەشداری لەم جەنگەدا بکەن، نەك تەنها پاشەکشە بە سەربازەکانی "هاتی"دەکەین، بەڵکو وەك ڕابردوو سوریاش دەگەڕێنینەوە بۆ خۆمان، هەموو میسریەك سود لەپەیوەندی سوریا بەمیسرەوە وەردەگرێت و خەزێنەی ماڵی هەر میسریەك وەکو ڕابردوو پڕ لەگەنم، کاسەکانیشی پڕ ئاوجۆ دەبێت.

ئەی خەڵکی میسر، قۆناخێکی درێژخایەنی ترسنۆکی و لاوازی کاریگەریەکی نالەباری پێ بەخشیوین و دژمنانی میسر بێشەرم بون، نەك تەنها سوریایان لەئێمە سەندووەتەوە، بەڵکو ئێستا دەیانەوێت نیشمانی ڕەشی خودای میسریمان لێ زەوت بکەن و وڵاتی ئامون و خودایانی تر وێران بکەن و لەباتی ئاو لەڕوباری"نیل" خوێن بڕوات.

کاتژمێر دەڵێت کاتی هەستان و بەڕێکەوتن و خوێن ڕشتنە، هەرکەسێك لەم جەنگەدا بەشداری بکات و لەگەڵ مندا بکەوێتە ڕێ، خەزێنەیەکی پڕ لەگەنم بەدەست دەهێنێت و لەئایندەشدا، لەدەستکەوتە جەنگیەکاندا بەشدار دەبن.

ئەگەر هەندێك پیاو نەیانەوێت لەم جەنگەدا بەشداری بکەن، من بەزۆر دەیانبەم بۆ کۆڵبەری و بەم شێوەیەش بیانەوێت و نەیانەوێت لەم جەنگەدا بەشداری دەکەن، بێئەوەی خەزێنەیەکی پڕ لەگەنم وەرگرن و لەئایندەدا لەدەستکەوتە جەنگیەکاندا بەشداردەبن بەدرێژایی تەواوی ئەو جەنگە، سەرەڕای ئەوەی کۆڵبەریان پێدەکرێت، دەبێت ببنە مایەی گاڵتە و توانجی سەربازەکانمان.

بۆیە بەهیوای ئەوەم کە هەر پیاوێکی میسری کە دەتوانێت نێزە یان شمشێر بوەشێنێت، بکەوێتە ڕێ و لەگەڵ مندا بێت بۆ گۆڕەپانی جەنگ، ئێستا ئێمە بەهۆی لاوازی و کەمتەرخەمیو سوربون و پێداگری ئەو کەسانەی تا ئەمڕۆ لەمیسردا دەستەڵاتیان لەدەستدابوو بونە هۆی ئەوەی لەئێستادا هیچمان لەدەستدا نەبێت و

وشکەساڵی وەك تیمساحی برسی ئێمە خستووەتە ژێر چاودێری خۆیەوە، بەڵام سەرکەوتن دەبێتە هۆی ئەوەی گەنم و ئاوجۆ و کانزایەکی فراوانمان دەست بکەوێت.

هەرکەسێك لەم جەنگەدا بکوژرێت ڕاستەوخۆی دەچێتە جیهانی خۆرئاواوەوە و خودای میسر بۆ هەتا هەتا پارێزگاریان لێدەکات و هەرکەسێك زیندوو بمێنێت، لەدەستکەوتی سەرکەوتنەکاندا بەشدار دەبێت، بەڵام بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن، دەبێت قوربانیەکی زۆر بدەین.

"هورم هب"ی کوڕی شەهێن دەڵێت ئەی ژنانی میسر تاڵ بۆ کەوانەکان بچنن، ئەگەر ڕیشکی گیایی و ڕیخۆڵەی ئاژەڵتان دەست نەکەوێت، بەپرچتان ئەو تاڵە دروست بکەن و هاوسەر و کوڕەکانیشتان بنێرنە گۆڕەپانی جەنگەوە، هەروەها ئەی پیاوانی میسر لەهەموو کانزایەك نوکی سەرنێزەیەك دروست بکەن و لەگەڵ مندا بێن بۆئەوەی بەشداری لەو جەنگەدا بکەن، کە جیهان هێشتا هاوشێوەی ئەو جۆرە جەنگەی نەبینیوە.

"هورم هب"دەڵێت لەم جەنگەدا فیرعەونە مەزنەکان و تەواوی خودایان، بەتایبەت "ئامون" پشتوانی لەئێمە دەکات و ئێمەش بەشێوەیەك لەسەربازەکانی"هاتی"دەدەین کەلەکاتی هەڵهاتنندا نەوێرن تەماشای دوای خۆیان بکەن. ئێمەش دوایان دەکەوین و زەویەکانی"سینا"و سوریا بەخوێنی ئەوان سور دەکەین، بۆئەوەی لەڕێی ئەو خوێنەوە، نەنگی میسر بشۆرینەوە و لەناوی ببەین....ئەی خەڵکی میسر گوێم لێ بگرن....گوتەکانی"هورم هب" کوڕی شەهێن و داگیرکەری ئایندە کۆتایی پێهات.

کاتێك کۆتایی بە وتارەکەی"هورم هب"هات دەستە خوێناویەکانی هێنایە خوارەوەو ئەوکات دەنگ لە بوقەکان بەرز بویەوە و سەربازەکان بەنێزە پێکەوە دەیاندا لەپشتی قەڵخانەکانیاو پێکانیان بەتوندی بەزەویدا دەکێشاو خەڵکیش لەوروژاندا دەستیان کرد بەهاتو هاوار و"هورم هب"بەدەم زەردەخەنەوە بەلێخوری گالیسکەکەی وت: بڕۆ..و سەربازەکانی لەنێو خەڵکیدا ڕێیان بۆ گالیسکەکەی دەکردەوە بۆئەوەی بەنێویاندا تێپەڕێت، بەڵام خەڵکی بەردەوام هاواریان دەکرد. لەو ڕۆژەدا تێگەشتم کە مەزنترین شادی بەکۆمەڵی نەتەوەیەك لەوەدایە کە وەك ئەم کۆمەڵگایە هاوار بکەن بێئەوەی بزانن بۆچی هاوار دەکەن و لەکاتی هاوار کردندا چی دەڵێن، چونکە کاتێك

خەڵکی پێکەوە لەگەڵ یەکتردا هاوار دەکەن خۆیان بەکەسێکی بەهێز لەقەڵەم دەدەن و واخۆیان نیشان دەدەن کە بۆ مەبەستێکی ڕەوا و پیرۆز سەرقاڵی هاوارکردنن.

دوای ئەوە"هورم هب"بەرەو ڕوباری"نیل"ڕۆشت بۆئەوەی سواری کەشتیەکەی خۆی ببێت و بەرەو میسری خوارو بەڕێ بکەوێت، لەبەرئەوەی دەیزانی پێویستە لەوێ ئامادە بێت، چونکە هێزی سەربازی"هاتی"گەشتبونە ئەوێ.

من کە دەمزانی"هورم هب"دوای ئەوەی سواری کەشتیەکەی دەبێت دەڕوات، بۆیە ڕۆشتم بۆ لای و وتم: فیرعەون"ئەخناتون"کە من پزیشکی تایبەتی ئەو بوم مردووە، بۆیە چیتر پێویستی بە کون تێکردنی سەر نیە و من ئازاد بوم و دەتوانم بۆ هەر کوێ خۆم بمەوێت بڕۆم.

لەلایەکی ترەوە حەزناکەم لە"تبس"دا بمێنمەوە، چونکە دوای ئەو کارەساتە هیچ شتێك لە"تبس"دا من خۆشحاڵ ناکات، بۆیە دەمەوێت لەگەڵ تۆدا بێم و بەشداری شەڕ بکەم و بزانم دوای جەنگ کە ساڵهایە لایەنگری بویت، نەتەوەی میسر چ سودێك لەسەرکەوتنەکانی تۆ وەردەگرێت.

"هورم هب"وتی: من خۆبەخشینی تۆ بۆ ئەم جەنگە بە بەختێکی باش لەقەڵەم دەدەم، چونکە چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد کە تۆ چاپۆشی لەحەوانەوە و ئاسودەی خۆی بکەیت، گەرچی لەگۆڕەپانی جەنگدا بۆ پاشەکشە پێکردنی سەربازەکانی دوژمن هیچ کارێك لەتۆ ناوەشێتەوە، چونکە ناتوانیت شمشێر و نێزە بوەشێنیت، بەڵام پزیشکێکی تەردەستی و من دەتوانم سود لە پزیشکی تۆ وەرگرم و لەو باوەڕەدام کە سود لەزانیارە پزیشکیەکانت وەربگیرێت، بەڵام ئەوەش بزانە کە"هاتی"یەکان سەربازگەلێکی بێبەزەیین و لەوانەیە لەگۆڕەپانی جەنگدا بتکوژن.

وتم: "هورم هب"من وڵاتەکەی ئەوانم بینیوە و بێبەزەیی ئەوانم لەوڵاتەکەی خۆیاندا بەرچاو کەوتووە، بەڵام لە سەربازەکانی"هاتی"ناترسم، چونکە کاتێك مرۆڤ ئومێدی ئەوەی نەبێت کە لەجەنگدا خۆشبەختی بەدەست بهێنێت ئەوا ناشترسێت.

"هورم هب"وتی: سەربازەکانم ناحەقیان نەبوو کە لەجەنگی"خبیری"دا تۆ بەکوڕی کەر بانگ بکەن، چونکە وەك گوێدرێژ هەست بەهیچ ترسێك ناکەیت. ئەوکات سەوڵ لێدەرەکان سەوڵە درێژەکانیان هێنایە جوڵە و کەشتی کەوتە ڕێ و ئەو کەسانەی کە لەکەنار ڕوباردا کۆبوبونەوە دەستیان کرد بەهەلهەلە لێدان.

"هورم هب"تەماشایەکی کردن و هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی و وتی: ئەوەی من لەوتارەکەمدا بەخەڵکیم ڕاگەیاند زۆر کاری تێکردن...دوای ئەوە بەرەو ژورەکەی خۆی ڕۆشت و وتی: دەمەوێت دەستە خوێناویەکانم پاك بکەمەوە و بیانشۆرم.

دوای ئەوەی دەستەکانی لەژورەکدا شۆرد وتی: بۆنی خوێن لەدەستەکانم دێت و من پێش ئەوەی بڕۆم بۆ پەرستگای"سخ مت"نەمدەزانی کە کاهینەکانی پەرستگا چەند مرۆڤێك دەکەن بەقوربانی و ناحەقیشیان نەبوو، چونکە دەروازەی پەرستگاکەی ئەوان چل ساڵ لەوەوپێش نەکرابویەوە و ئارەزوی ئەوەیان دەکرد کە دوای کردنەوەی ئەم پەرستگایە، قوربانیەکی سەرنجڕاکێش پێشکەشی ئەم خودایە بکەن، هەر لەبەرئەوەش پێش کردنەوەی ئەم پەرستگایە داوایان لێکردم چەند کەسێك لە دیلەکانی"هاتی"و سوریایان پێبدەم.

کاتێك بیستم کە کاهینەکان لەو ڕۆژەدا چەند مرۆڤێکیان کردووە بەقوربانی بۆ"سخ مت"ئەژنۆم کەوتە لەرزین. گەرچی من لەپەرستگادا بەچاوی خۆم بینیم کە دڵی مرۆڤەکانیاندا بەدەست"هورم هب"ەوە، بۆئەوەی بەسەر میحرابەوە بیانگوشێت‌و خوێنی ناو دڵەکان بڕژێتە دەرەوە، بەڵام بەوە دڵنەوایی خۆم دەدایەوە کە دڵی مرۆڤەکان بەشێوەیەك کە بەلای منەوە ڕون نیە، بەدەست کاهینەکان گەشتووە، بەڵام گوتەی"هورم هب"ئەو گومانەی لەمندا نەهێڵا و زانیم کە کاهینەکانی"سخ مت" دیلەکانی"هاتی"و سوریایان لەپەرستگادا بەدەستی خۆیان کوشتووە و دڵیان دەرهێناون‌وداویانە بە"هورم هب"بۆئەوەی خوێنیان پێشکەشی خودای جەنگ بکات.

"هورم هب"وتی: کاتێك کاهینەکان داوایان لێکردم کە چەند دیلێکیان پێ بدەم، نەمدەزانی مەبەستیان چیە و چیان پێدەکەن، بەڵام کاتێك لەبەرامبەر میحرابدا دڵیانم بینی، سەرم سوڕما.

سەرەڕای ئەوەش ئەگەر"سخ مت" بەو قوربانیە ڕازی بێت و هاوکاریمان بکات، من ئەم ڕوداوە بە بێنرخ دەزانم، چونکە هەنوکە ساتێکە کە ئێمە پێویستمان بەهاوکاری هەموو خودایەکە چ نێر بێت یان مێ. ئەوەش بزانە کە لەبەرچاوی مندا نێزە و شمشێرێك کە لەرێی دەستی سەربازێکی ئازاوە دەوەشێنرێت، زۆر لەبەرەکەتی خوداکان بەبەهادارتر دەزانم، بەڵام بەلایەنی کەم سودی قوربانی ئەوەیە کە کاهینەکان بەو قوربانیە ڕازی بون و ئێمە لێیان ئاسودە خەیاڵ دەبین و کاتێکیش من دەچمە ناو

گۆڕەپانی جەنگەوە بیرم لەهێزی دواوە ئاسودە دەبێت و دەزانم کە کاهینەکانی پەرستگا دەست بەهاندان و فیتنە نانەوە ناکەن.

دوای ئەوە من بە"هورم هب"م وت: وتارەکەی"ئۆرشەلیمت زۆر باشتربوو لە وتارەکەی ئەمڕۆت.

"هورم هب"وتی: ئەو وتارەی کە لەگۆڕەپانی جەنگدا بۆ سەربازەکان ئەنجامم دا، دەبێت جیاوازی بێت لەو وتارەی کە بۆ خەڵکی دەدرێت، چونکە سەربازەکان ناتوانن لەڕێی وشە چینی و بەکارهێنانی دەربڕینگەلێکی بەرجەستە و پڕ و پوچەوە فریو بدەیت. لەکاتێکدا نەتەوەیەکی گەمژە (تایبەتمەندی سروشتی هەر نەتەوەیەکیش گەمژەییە) باوەڕ بەڕستە و وشەگەلێکی بەرجەستە کە هەزار جۆری ڕستە و وشەی ئەوا بەئەندازەی"کا"یەك نرخی نیە دەکات و وا دەزانێت کە بەم وشانە دەتوانێت جیهان بگۆڕێت. بۆئەوەی گەمژەیی نەتەوەیەکت بۆ دەربکەوێت، نمونەیەکت بۆ دەهێنمەوە و بەڵگەی منیش هەمان ئەم وتارەیە کە ئەمڕۆ بۆ خەڵکیم ئەنجامدا. ئەم وتارە وەك ئەو وتارە وایە کە لەسەرەتای دروست بونی جیهانەوە تائێستا تەواوی سوپاسالارانی جەنگ و وتاربێژان لەسەرەتای هەر جەنگێکدا دەیهێننە زمان و هیچ شتێکی نوێی تێدا بەدی ناکرێت، بەڵام دڵنیات دەکەمەوە کە ئەم وتارەی من لەسەر بەرد هەڵدەکۆڵن و بۆ نەوەکانی داهاتو بەجێی دەهێڵن، چونکە ئەم نەتەوەیە لەوباوەڕەدان کە من شتگەلێکم وتووە کە لەوەوپێش هەرگیز نەوتراوە. من لەوتارەکانمدا وتم: ئەم جەنگە وەك تێکۆشانێك وایە، بۆ پاشەکشە پێکردنی هێرشبەران و لەسەرەتای دروست بونی جیهانەوە تا ئەمڕۆ هەرکەسێك ویستویەتی جەنگێك بەرپا بکات هەمان ئەم قسانەی کردووە و هیچ جەنگێك لەجیهاندا دەستی پێنەکردووە کە هەڵگری لایەنێکی پیرۆز نەبێت.

منیش وتم: ئامانجی ئێمە دەبێت ئەوە بێت کە هێرشبەران ڕاوبنێین و نەهێڵین زەویە ڕشەکانیان بکەوێتە دەست و بۆئەوەی ئەم نەتەوەیە بترسێنم، هەڕەشەی "هاتی"لەوەیکە هەیە مەزنتر پیشان بدەم.

من ناڵێم مەبەستی پاشەکشە پێکردنی"هاتی"م نیە و ئەوەی وتم ڕاست بوو، بەڵام ئامانجی کۆتایی من شکست پێهێنانیان نیە، بەڵکو ڕێگایەکە بۆ گەشتن بەمەبەستی خۆم.

مەبەستی منیش ئەوەیە کە سەرکەوتن و پیرۆزی بەدەست بهێنم، بۆئەوەی بتوانم فەرمانڕەوایی خۆم لەسەر کورسی دانیشێنم و شازادە خانم"باکتاتون" لەئامێز بگرم.

ئامانجی سەرەکی من ئەوەیە کە لەڕێ کوشتنی هەزاران سەربازی"هاتی"و میسریەوە ببمە خاوەنی شانازی و مەزنی و نەتەوەکەشم وەك یەکێك لەخودایان تەماشام بکەن و هیچ شازادە خانمێك لەپێك هێنانی ژیانی هاوسەری لەگەڵ مندا ڕەت نەکاتەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە شانازی بەوەوە بکات کە دەبمە برای ئەو.

من وتم ئەم جەنگە جەنگێکی پیرۆز و بەرگیرکاریە بۆ ڕاونانی دوژمن لەمیسر، بەڵام دوای ئەوەی"هاتی"م شکست پێهێنا دەست بەسەر سوریادا دەگرم و دوای داگیرکردنی سوریا هەرکاتێك بمەوێت، تەواوی وڵاتانی جیهان داگیر دەکەم، بگرە لەوکاتەدا ناوی ئەو جەنگانە دەنێم"جەنگی پیرۆز"و خەڵکیش بەهۆی گەمژەیی سورشتیانەوە باوەڕ بەم وشەیە دەکەن.

باوەڕم بەخودایان نیە کە لەجەنگەکاندا هاوکاریمان بکەن، چونکە خوداکان ناتوانن پارێزگاری لەخۆیان بکەن، چ بگات بەوەی لەجەنگەکاندا هاوکاریمان بکەن، بەڵام ئەمڕۆ بەم وتارەم لەبەرامبەر ئەم نەتەوەیەدا بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن لەجەنگدا، داوای پشتیوانی و هاوکاریم لەخوداکان کرد، لەبەرئەوەی دەزانم ئەم نەتەوەیە گەمژەیە، بەبیستنی ئەم قسەیە خۆشحاڵ دەبن و وا هەست دەکەن کە خوداکان بەهانامانەوە دێن و هاوکاریمان دەکەن و هاوکاری ئەمانە لەجەنگەکاندا کاریگەری خۆی دەبێت، بەتایبەت لەمن ڕازی و خۆشحاڵ دەبن، چونکە واهەست دەکەن منیش بەئەندازەی ئەوان گەمژە و بێمێشکم کە پشت بەهاوکاری خوداکان ببەستم.

من ئەمڕۆ لەم وتارەی خۆمدا هیچ شتێکم دەربارەی گرفتەکانی ئایندە کە لەم جەنگەدا چاوەڕێی سەربازەکان دەکات نەکرد، چونکە گرفتەکانی جەنگ وەك هەڵهاتن و ئاوابونی خۆرە، کە بەدڵنیاییەوە لەکاتی خۆیدا هەڵدێت و پێویست بەوە ناکات پێش ئەوەی خەڵکی ئامادەبونی خۆیان بۆ ئەم جەنگ نیشان بدەن بیانترسێنم.

ئەمڕۆ من کۆمەڵێك ئاشنایانم لەناو ئەو کۆمەڵەدا دانا بۆئەوەی کاتێك من کۆتاییم بەوتارەکانی خۆم هێنا هاواری شادی بەرزبکەنەوەو هەلهەلەم بۆ لێدەن. ئەمەش کارێکە کە تەواوی ئەو کەسانەی کە لەڕابردوودا وتاربێژیان بۆ خەڵکی کردووە، ئەم

کارەیان ئەنجام داوە، چونکە سادەیی و گەمژەیی نەتەوە بەرادەیەکە کە هەستی ئەوەیان نیە تێبگەن لەوەی ئایا ئەوەی بیستیان شایەنی ستایش کردنە یان نە؟ بۆیە دەبێت کەسانێك هەبن کە هاواری شادی بەرز بکەنەوە، بۆئەوەی خەڵکانی تر بێئەوەی پەی بەچاکی و خراپی ئەو وتارە ببەن لاسایی ئەو کەسە بکەنەوە و ئەوکات "سینۆهە" تۆ کە یەکێك بویت لەگوێگرانی ئەو وتارە، لەوباوەڕەدایت تەواوی ئەوانەی کە گوێیان لەم وتارەی من بوو، دەبنە لایەنگر و فیداکاری من.

وتم: "هورم هب"باوەڕت بەتوانای خودایان نیە...تۆ کە دەڵێیت ناونیشانی "جەنگی پیرۆز" ناونیشانێکە کە بەردەوام بەکارهێنراوە و شتێکی نوێ نیە... تۆ دەڵێیت نەتەوەکان گەمژە و بێهەستن....ئایا لەجیهاندا شتێك هەیە کە باوەڕت پێی بێت؟

"هورم هب"پێکەنی و وتی: تۆ پیاوێکی سادەیت، ئەگینا ئەم پرسیارەت لێ نەدەکردم، چونکە خوت دەزانی کە باوەڕم بەچ شتێکە.

"سینۆهە"ئەو ڕاستیەی کە لەسەرتای دروست بونی ئەم جیهانەوە بونی هەبووە و تا کۆتایی ئەم جیهانەش بونی دەبێت، ئەوەش بزانە کە فیرعەونێك... لەگەڵ"هروم هب"... یان"ئامی" ناوێکدا... یان"هری بوری"ەك و بەشێوەیەکی گشتیش هەرکەسێك کە توانای دەستەڵات و شانازی و سامان و دارایی بێت، تەنها باوەڕی بەیەك شت دەبێت، ئەو شتەش باوەڕهێنانە بە هێز و شانازی و سامانەکان.

فیرعەونێك یان"ئامی"کە هەڵگری پلەوپایە و سامان و داراییە، ئەگەر پێت بڵێت باوەڕی بەخودایەکە، دڵنیابە لەوەی کە درۆ دەکات، ئەگەر بڵێت باوەڕی بەنەتەوەکەی خۆیەتی بزانە کە دەیەوێت تۆ فریو بدات، ئەگەر بیشڵێت باوەڕی بەوڵات و خاکی ڕەشە دڵنیابە کە دەیەوێت بەمەبەستی زیاترکردنی دەستەڵات و سامانی خۆی سود لەسادەیی و گەمژەیی تۆ وەرگرێت.

فیرعەونێك یان"هورم هب"ێك، ناتوانێت جگە لەهێز و شانازی و سامانی خۆی باوەڕ بەهیچ شتێکی تر بکات،"ئامی"و"هری بور"یش بەهەمان شێوەن، هەرچی بڵێن و ئەنجامی بدەن، تەنها بۆئەوەیە هێز و شانازی و سامانی خۆیانی پێ بپارێزن یان زیاتری بکەن.

بەلام فیرعەونێك یان"ئامی"ەك كە بۆ پاراستنی هێز و سامانیان وا خۆیان پیشان بدەن كە باوەڕیان بەخوداو نەتەوەی میسرو خاكی ڕەشە، لەبەرچاوی ئەواندا پیرۆزترین ولاتە، ئەمانە ناچارن بەوشێوەیە خۆیان پیشانی خەڵكی بدەن كە لەسەرتاپای ساڵدا بۆ نەتەوەو نیشتمان خۆیان تێدەكۆشن و شەونخونی دەكێشن و دەست بەسەر خواردن‌و شەربەت‌و ئاجودا دەگرن و دەستگیرۆیی پێوە دەكەن بۆئەوەی نەوەك یەكێك لە تاكەكانی نەتەوەكەیان برسی بێت.

لەوانەیە لەسەرەتا لاویەتیاندا كە هێشتا چێژی هێز و سامان بەوشێوەی كە دەبێت لەبەرچاوی خاوەن هێزو سامان ئاشكرا نەبوبێت و كەسانێك لەنێو ئەمانەدا بەدی بكرێت كە بێ لەخۆیان باوەڕیان بەهەندێك شتی تر بێت، بەلام هەرئەوەی كەمێك چون بەساڵاداو زانیان هێزو سامان چ چێژگەلێك دەهێنێتە بون و بەچ شێوەیەك لەخۆبایی‌و شەهوەتی مرۆڤ هێور دەكاتەوە بێ لەخۆیان چیتر باوەڕیان بەهیچ شتێكی تر نامێنێت.

ئەوكاتانەی لاو بوم بێ لەخۆم باوەڕم بەدوو شتی تر هەبوو، یەكێكیان "شەهێن"ەكەی خۆم و ئەویتریان بەهاوڕێیەك، بەلام ئەمڕۆ كە هەندێك لەتەمەنم تێپەڕیوە، بێ لەخۆم باوەڕم بەهیچ شتێك نەماوە و دەزانم كە هەرچی ئەنجام دەدەم دەبێت بەمەبەستی زیادكردنی شانازی یان سامانەكەم جێبەجێ بكەم.

هەموو جۆرە هاوڕێیەك لەبەرچاوی مندا، كەرەستەیەكە بۆ بەهێزكردنی هێز و زیادكردنی سامان و بگرە ناشتوانم ژنیشم خۆش بوێت و "باكتاتون"یشم تەنها بۆ ڕابواردن و زیادكردنی شانازیەكانی خۆم دەوێت.

"سینۆهە"ئەم قسانەی كە بۆتۆی دەگێڕمەوە، گوتەگەلێكە كە هەموو فیرعەونێك بگرە هەركەسێك كە هێز و سامانی هەیە، ئەگەر نەیەوێت درۆ بكات، پێت دەڵێت: ناوەڕۆكی گوتەكانی من ئەوەیە كە خۆم بەچەقی هەموو شتێك دەزانم و لەو باوەڕەدام كە ولات و نەتەوەی میسر خۆدی منە و لەبەرئەوە خوازیاری مەزنی میسرم بۆئەوەی لەمڕێیەوە خۆم مەزنتر بكەم، چونكە ڕێگایەكی تر بۆ مەزنكردنی خۆم شك نابەم، چونكە دەبێت نەتەوەیەك هەبێت كە هێز و دەستەلاتی من لەڕێی ئەوانەوە بۆ كەس و نەتەوەكانی تر بگوازرێتەوە و منیش بتوانم گەنم و ڕۆنی ڕوەك و كانزاكان بەدەست بهێنم و ئەوەی لەنەتەوەكەی وەردەگرم، كۆمەڵێك خەڵكی پێ بەكرێ دەگرم كە

بەردەوام بەدەنگێکی بەرز ستایشی تایبەتمەندیەکانی من بکەن، بۆئەوەی خەڵکی بزانن کە تەنها من هەڵگری ئەو جۆرە تایبەتمەندیانەم.

ئەم قسانە هیچ کاریگەریەکیان لەمن نەکرد و لەوانەیە لەبەرئەوەش کاری تێنەکردبم کە من لەسەردەمی لاویەتیدا"هورم هب"م بینیبێت، دوای ئەوەش چاوم بەدایك و باوکی کەوتووە و ئاگاداری ئەوە بوبێتم سەرەڕای ئەوەی"هورم هب"ئەمانەی کردوە بە بەشێك لەوەجاخزادەکأن، بەڵام دایك و باوکی بونی سەنێریان لێدێت.

ئەم جۆرە قسانەی کە لەدەمی پیاوێکی وەك"هورم هب"ەوە بیست بەلاسەنگ دەزانم و بیریشم لەوە کردەوە ئەگەر فیرعەونێك یان وەجاخزادەیەکی ڕاستەقینە لێی دێت ئەم قسانە بکات، بەڵام لەدەمی ئەو پیاوەوە ببیسترێت وەك ئەوە وایە گوتەگەلێکی پڕوپوچ و بێ بنەما و بێهودە بهێنێتە زمان.

*بەشی چل و حەوتەم*

## جەنگی پیرۆز یان جەنگی میسر و هاتی

کاتێك گەشتینە"ممفیس"هورم هب، داوای لەوەجاخزادە و دەوڵەمەندەکان کرد کە بەشداری لەکۆبونەوەیەکدا بکەن.

کاتێك هاتن"هورم هب"پێی وتن: ئێوە هەمووتان دەوڵەمەندن و منیش پیاوێکی هەژار، ئەو ڕۆژەی لەدایك بوم وەك چوارپێکان سەنێر لەنێوان پەنجەکانما بوو، بەڵام ئامون بەرەکەتی پێدام و منی مەزنترکرد، ئێستاش فیرعەون فەرمانی پێداوم ڕێ لەدوژمنی بێبەزەیی و خوێنڕێژ بگرم کە بەرەو ڕوی میسر دێت.

کاتێك خۆم کرد بەو شوێنەدا، بەخۆشحاڵیەوە بیستم کە ئێوە بە جوتیار و نۆکەرەکانی خۆتان وتووە، لەبەرئەوەی جەنگ دەستی پێکردووە، دەبێت قوربانی بدەین و دەست بەسامان و خۆراکەکانمانەوە بگرین و بەشە خۆراکی جوتیار و نۆکەرەکانتان کەم کردووەتەوە، بەهای بەرهەمە خۆراکیەکانیشتان بەرزکردووەتەوە و ئەوەی وتتوتانە و کردوتانە ئەوەم بۆ دەسەلمێنێت کە خودی ئێوەش ئامادەن قوربانی بدەن و منیش بەم قوربانیدانەی ئێوە زۆر خۆشحاڵ دەبم. ئێوە دەزانن کە جەنگ، پێویستی بەبوجەیەکی تایبەتە کە لەهەموو شتێك گرنگتر چەك و بەشە خۆراکی سەربازەکانە. کاتێك من هاتم بۆ ئێرە پرسیاری ڕادەی سەروەت و سامانی ئێوەم لەکاربەدەستەکان کرد، سەرەڕای ئەوەش لەبارەی سامان و دارایی ئێوە چەند زانیاریەکی ترم بەدەست هێناوە و دەزانم کە ئێوە لەسەردەمی فیرعەونی درۆزندا بڕێك لەسامان و دارایی خۆتان شاردبویەوە بۆئەوەی باج و سەرانە نەیگرێتەوە. بەڵام ئێستا سەردەمی فەرمانڕەوایی فیرعەونی ڕاستگۆ هاتووەتە پێشوە و ئەو خودایەش

بەناوی"ئامون"فەرمانڕەوایی دەکات و ئێوەش نابێت سامانی خۆتان بشارنەوە، بەڵکو دەبێت بەخۆشحاڵیەوە لەپێناو جەنگی بەرگری لەمیسر پێشکەشی هێزی سەربازی بکەن، ئەویش ئەوەیە کە هەریەك لەئێوە بیّ ئەملاولا نیوەی سامان خۆی بدات بەمن، ئیتر ئەوەی پێمی دەدەن زێڕ بێت یان زیو یان گەنم یان مانگا و مەڕ یان ئەسپ بێت بۆ ڕاکێشانی گالیسکەکان جیاوازی یەکی کییە.

کاتێك کۆتایی بەقسەکانی"هورم هب"هات، بەیەکجار دەنگی شیوەن لەوەجاخزادە و دەوڵەمەندەکان بەرز بویەوە و جلەکانی بەریشیان هەڵدڕی و ئەوانەی قژێکی زۆریان پێوە بوو دەستیان بەقژ ڕنینەوە کرد و بەدەم گریانەوە دەیانوت ئێمە هیچ شتێکمان نیە و فیرعەونی درۆزن و خوداکەی هیچی پیّ نەهێڵاوین و هەژار کەوتوین و ئەوەی هەمانبوو لێمان زەوتکراوە و ئەو کەسانەی کە بەتۆیان وتووە کە ئێمە سامان و دارایی خۆمان شاردووەتەوە درۆی کردووە.

"هورم هب"چاوەڕێی کرد تا ئەوکاتەی کۆتاییان بەگریان و شیوەنی خۆیان هێنا و وتی: لەسەردەمی فەرمانڕەوایی فیرعەونی درۆزندا، بەوشێوەی کە بەچاوی خۆم بینیومە، هیچ کەسێك تۆوێك گەنم و ئەنگوستیلەیەکی مس و گۆزەیەك ئاوجۆی لەئێوە وەرنەگرتووە.

کاربەدەستانی درۆزن تەنها دەستیان بەسەر زەویەکانی"ئامون"کە لەلایەن کاهینەکانەوە بەڕێوە دەبرا گرتووە و بەسەر جوتیارەکاندا دابەشیان کرد و هەندێك لەئێوە سەرەڕای ئەوەی خاوەنی زەویگەلێکی فراوان بون، لەڕێی جوتیارەکانتانەوە، بەشێك لەو زەویانەتان بەخۆڕایی وەرگرت، بەڵام نەتاندا بە جوتیارەکانتان، بەڵکو دەستتان بەسەردا گرت. بۆیە سامانی هیچ یەك لەئێوە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی فیرعەونی درۆزندا کەمی نەکردووە و هەندێکتان دەتانتوانی فراوانی زەویەکانتان زیاتر بکەن، دوای ئەوەش وشکەساڵی هاتە پێشەوە و لەبەرئەوەی ئێوە پێشبینی وشکەساڵیتان دەکرد، دانەوێڵەکانتان شاردەوە و توانیتان لەبەرامبەر هەر کاسەیەك دانەوێڵەدا بەهایەکی زۆر لەخەڵکی وەرگرن. سەرەڕای ئەوەش من نامەوێت نیوەی سامانەکانتان بەخۆڕایی لیّ وەرگرم، بەڵکو مەبەستی من ئەوەیە کە ئێوە نیوە دارایی ڕوکەشی خۆتان کە بەدڵنیاییەوە زۆر لەدارایی و سامانی ڕاستەقینەتان زیاترە بەقەرز

بدەن بەمن، بۆئەوەی خەرجی ئەم جەنگەی بکەم و دوای ئەوەی کۆتایی بەم جەنگە هات قەرزەکانتان پێدەدەمەوە.

دەوڵەمەندەکان بۆماوەیەك تەماشای یەکتریان کرد دوای ئەوە وتیان: ئەگەر ئێمە قەرز بەتۆ بدەین، تۆ چ بەڵگەنامەیەکمان لەبەرامبەر ئەم قەرزەماندا پێ دەدەیت؟

"هورم هب"وتی: بەڵگەنامەی من بۆ وەرگرتنی ئەو قەرزانەتان سەرکەوتنەکانمە و لەوباوەڕەدام کە ئەم بەڵگەنامەیە لەبەرچاوی ئێوەدا باوەڕپێکراو بێت، چونکە ئەگەر من جەنگاوەر نەبم، ئەوا سەربازەکانی"هاتی" دێن بۆ ئێرە، نەك تەنها نیوەی دارایی ئێوە، بەڵکو دەست بەسەر تەواوی سامانەکانی ئێوەدا دەگرن.

من دەزانم لەبەرئەوە کەسانێکی هۆشیارن و لەبواری ژمێریاریدا کەسانێکی شارەزان، بەدڵنیاییەوە لەبەرامبەر ئەم قەرزانەتاندا داوای قازانجیشم لێدەکەن، منیش ئامادەم قازانجتان پێبدەم، بەڵام لەگەڵ هەریەك لەئێوە لەبارەی قازانجەوە گفتوگۆتان لەگەڵدا دەکەم. دەوڵەمەندەکان جارێکی تر هاوار و شیوەنیان لێ بەرز بویەوە و وتیان: ئێمە دەزانین لەبەرئەوە دەڵێیت لەگەڵ دانە دانەی ئێوەدا لەبارەی قازانجەوە گفتوگۆتان لەگەڵدا دەکەم، چونکە نیازی ئەوەت نیە قازانجمان پێبدەیت، بگرە ئێمە بەهیوای ئەوەش نین کە خودی قەرزەکەشت لێ وەرگرینەوە، چ بگات بەقازانج.

لەکاتێکدا کە نێوچاوانیان بەزەویەوە چەسپاند وتیان: ئێستا کە دەبێت ئێمە هەژار بکەوین و هەموو شتێکی خۆمان لەدەست بدەین، بەلای ئێمەوە باشتر وایە خۆمان بدەین بەدەست سەربازەکانی"هاتی"یەوە.

"هورم هب"وتی: زۆرباشە...من ئامادەم بەپێی خواست و ئارەزوی خۆتان ڕەفتارتان لەگەڵدا بکەم. لەبەرئەوەی دەتانەوێت خۆتان بدەن بەدەست سەربازەکانی "هاتی"ەوە، منیش هەر ئێستا بەسەربازەکانی خۆم دەڵێم بێنو دەستو پێتان ببەستنەوەو هەڵتاندەنەناوکەشتیەوەو بتانبەنوهەمووتان بدەن بەدەست سەربازەکانی "هاتی"ەوە. بەڵام بەدەستەوەدانی ئێوە بۆسەربازەکانی"هاتی" هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ مەرگتاندا نیە، چونکە سەربازەکانی"هاتی"دەم و دەست کوێرتان دەکەن، بۆئەوەی بتانبەستنەوە بە بەردئاشەکانیانەوە و دوای ئەوەی ئێوە ڕۆشتن من دەست بەسەر تەواوی سامانەکانتاندا دەگرم.

کاتێك دەوڵەمەندەکان گوێیان لەم قسەیە بوو، دەنگە دەنگێکیان نایەوە و خۆیاندا بەزەویدا و لەوکاتدا ئامادەبون هەر یەکێکیان بڕێك زێڕ و زیو بدەن بە"هورم هب". بەڵام"هورم هب"دڵنەوایی دانەوە و وتی: من لەبەرئەوە ئێوەم بۆ ئێرە بانگ کردووە، چونکە دەزانم لەئێوە دەوڵەمەندتر نیە و ئاگاداری ئەوەشم ئێوە کەسانێکی هۆشیارن و دەتوانن لەڕێی سەرمایە و داراییەکانتانەوە بەزیانی خەڵکی خۆتان دەوڵەمەند بکەن و لەئایندەشدا دەوڵەمەند دەبن، چونکە خەڵکی ئەم جیهانە دەکرێن بەدوو بەشەوە.

دەستەی یەکەمیان تا دوایین ڕۆژی تەمەنیان بەهەژاری دەمێننەوە، چونکە نەیانتوانی و ناشتوانن ڕێگای دەوڵەمەندبون کە ڕێگای بەدەست هێنانی سامانە بەزیانی خەڵکی و لەڕێی مژینی خوێنیانەوە ئاشکرا بکەن و دەستەکەی تریان ئەوانەن کە فێری ڕێگای بەدەستهێنانی سامان بەزیانی خەڵکی و لەڕێی مژینی خوێنیانەوە ببن، ئەوا ئەم دەستەیە ئەگەر لەماوەی ژیانیاندا بیست جار دارایی خۆیان لەدەست بدەن، دەتوانن دوبارە خۆیان دەوڵەمەند بکەنەوە، چونکە دەزانن بەچ شێوەیەك دەبێت بەزیانی خەڵکی خۆیان دەوڵەمەند بکەن، ئێوە لەو جۆرە گروپەن و ئەگەر من بەشێوەیەك ئێوە بگوشم کە هەموو شلەمەنیەکی جەستەتان بچۆڕێنمە دەرەوە دوبارە دەتوانن خۆتان دەوڵەمەند بکەنەوە، چونکە دەزانن چ ڕێگایەك بۆ بەدەست هێنانی سامان لەڕێی تاڵان کردنی دەستڕەنجی خەڵکیەوە بگرنە بەر، بەڵام دڵنیابن کە من بەو ڕادەیەش ناتانگوشم کە هەموو شتێکتان لێ بچۆڕێنمە دەرەوە، چونکە ئێوەی دەوڵەمەند وەك درەختی میوەداری من وان و باخەوانێکی ژیریش هەرگیز درەختی بەردار لەڕیشەوە هەڵناکێشێت، بەڵکو تەنها بەچەند میوەیەکی ئەو درەختە ڕازی دەبێت. سەرەڕای ئەوەش کاتێك جەنگ دەستی پێکرد دەوڵەمەندەکان، بەتایبەت خاوەن زەویە کشتوکاڵیەکان و بازرگان و خاوەن کەشتی و ئاژەڵدارەکان سامان و دارایی خۆیان زیاتر دەکەن، بگرە ئەگەر بەئەندازەی خۆڵ و ڕێزی بیابان کاربەدەستانی چاودێری دارایی بۆ وەرگرتنی باج و سەرانەی ئەمانە دابنرێت سەرەڕای ئەوەش سامان و داراییان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر دەبێت، بگرە ئەمانە باج و سەرانەش لەخودی کاربەدەستانی دارایی وەردەگرن، لەبەرئەوەی گەنم و ئاوجۆ و گۆشت و شتەکانی تری خۆیان بەنرخێکی گرانتر پێ دەفرۆشن، کەواتە خەمی ئەوە مەخۆن کە بڕێك لەداراییەکانتان بەقەرز دەدەن بەمن، چونکە دەئەوەندەی ئەوەی

بەمنتان داوە لەماوەیەکی کورتدا وەردەگرن. ئێستا بڕۆن و لەسەردەمی جەنگدا خۆتان سەرقاڵی خۆئامادەکردنی قازانجێکی زۆر بکەن، و خۆتان چاختر بکەن، چونکە هەرکاتێك جەنگێك دەستپێبکات، گەرچی هەزاران سەرباز بەکوشت دەدرێت و هەزارەها ماڵ وێران دەبێت و دانیشتوانی ئەو ماڵانەش بەکۆیلە یان کەنیزەکی دەیانبەن، بەڵام سەرمایەدار و بازرگان و ئاژەڵداران و خاوەن کەشتی و سەوداگەرەکان کە شتێك دەکڕن و دەیفرۆشنەوە چاختر دەبن.

سەرەڕای ئەوەی من دوای شکست پێهێنانی لەشکری"هاتی"دەمەوێت سوریاش داگیر بکەم و وەك پێشوو بیخەمەوە ژێر دەستەڵاتی میسر لەمکاتەدا ئێوە سودێکی زۆر لەسوریا وەردەگرن، لەوەش باشتر ئەوەیە کە سەرەڕای ئەو قەرزەی کە دەیدەن بەمن بۆئەوەی لەسەربازەکاندا خەرجی بکەم، جار جارێکیش دیاریم بۆ بنێرن بۆئەوەی ئەویش لەسەربازەکاندا خەرج بکەم.

ئێستا بڕۆن ئەگەر دەتانەوێت دەست بە شیوەن و گریان بکەنەوە بڕۆن و دەست پێبکەن چونکە منیش چێژ لەم شیوەن و گریانەتان وەردەگرم، لەگوێی مندا وەك دەنگی ئەنگوستیلەی ئاڵتون وایە، چونکە دەزانم ئێوە سەرەڕای ئەوەی دەگرین، بەڵام ئەو زێڕ و زیوەی لێم داوا کردن پێم دەدەن.

دەوڵەمەندەکان هەستانە سەرپێ و ڕۆشتن، بەڵام نەگریان، بەڵکو دەستیان کرد بەژمێریاری، بۆئەوەی بزان بەچ شێوەیەك دەئەوەندەی ئەو زێڕ و زیوەی کە دەیدەن بە"هورم هب" لەشوێنێکی تر بەدەستی دەهێنن. کاتێك دەوڵەمەندەکان ڕۆشتن"هورم هب"پێی وتم: لەوانەیە ئەمڕۆ وا لێکی بدەیتەوە کە سەندنی باج و سەرانە لەدەوڵەمەندەکان بۆ داهاتی جەنگ ستەمێکە لەدەوڵەمەندەکان دەکرێت و باشتر وابوو من خەرجی جەنگ لەڕێی داراییەکی دادپەروەرانەوە لەتەواوی خەڵکی میسر چ دەوڵەمەند و چ هەژار وەرگرتایە، بۆئەوەی دانە دانەی تاکی هەموو چینەکان خەرجی ئەم جەنگەیان لەئەستۆ بگرتایە، بەڵام من دەزانم کە وەرگرتنی سەرانە، لە هەموو چینێك بۆ بوجەی جەنگ، بەناونیشانی ئەوەی فشار بکەوێتە سەر تەواوی تاکەکانی کۆمەڵگا بیرۆکەیەکی بێ بنەما و پوچە، چونکە کاتێك لەهەر وڵاتێکدا سەرانە لە خەڵکی وەرگرن، هەرچەنێکیش ئەو سەرانەیەش دادوەرانە بێت سەرەڕای ئەوەش فشارێکی زۆر دەخاتە سەر چینی هەژاران، چونکە بازرگان و دۆڵەمند و سەوداگەران

گەر ئەنگوستیلەیەك وەك سەرانە بدەن ئەوا بەدڵنیاییەوە دە ئەنگوستیلە لە خەڵکی هەژار وەردەگرن. هەروەك چۆن قۆچەکیەکانی میسر فشاری و قورسی تەواوی ئەو بەردانەی کە لەچینەکانی سەرەوەیە دەیخاتە سەر چینی خوارەوە، بەهەمان ئەو شێوەیە فشاری سەرانە و بەلایەنی کەم هەموو جۆرە فشارێکی تر، لەقۆناخی دواییدا دەکەوێتە سەر بڕبڕەی پشتی هەژاران‌و دواجار پشتیان دەشکێنێت. هەر لەبەرئەوەش چاپۆشیم لەباج وەرگرتن لەهەژاران کرد، بۆئەوەی بڵێن"هورم هب" کەسێکە کە بۆ جەنگەکان تەنها پارە لە دەوڵەمەندەکان وەردەگرێت و کار بەهەژارانەوە نیە، بەڵام دەزانم کە هەژارگەلێك هەن کە باجی ئەم جەنگە و جەنگەکانی تریش دەدەن، سەرەڕای ئەوەش ئەم بابەتە ناوبانگیەکی باشم بۆ دروست دەکات و دەبێتە هۆی ئەوەی لەلای خەڵکی میسری خۆشەویست بم. مانەوەی"هورم هب" لە"ممفیس" بەهۆی وەرگرتنی سەرانەی ئاڵتون‌و زیو لە دەوڵەمەندەکان‌و بەکرێ گرتنی سەربازە تازەکان‌و دروستکردنی گالیسکەی جەنگی، زۆر لەوەی کە من پێشبینیم دەکرد درێژەی کێشاو لەو ماوەیەی کە لە"ممفیس"دا بوو، سەربازەکانی"هاتی"لەناوچەی سێڕیانی "دلتا[36]" ڕوباری "نیل"دا لادێ و کڵگەکانیان وێران دەکردو ئەسپەکانی خۆیان لەکێڵگە گەنمەکاندا کە هێشتا گوڵی نەکردبوو دەلەوەڕاند.

هەڵهاتووانی ناوچەی سێڕیانی ڕوباری"نیل"دەهاتن بۆ"ممفیس"و باسی بێبەزەیی سەربازەکانی "هاتی"و بەسەرهاتی ڕاوەشێنیان بۆ دەکردین.

"هورم هب"زۆر ڕازی بوو لەو بەسەرهاتانەی کە هەڵهاتووەکان بۆ خەڵکی باسیان دەکرد و دەیوت: ئەم بەسەرهاتانە دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی لەجاران زیاتر لە هێزی سەربازی "هاتی"بترسن و خۆیان ئامادەی هاوکاری کردنی لەشکری سەربازی میسر بکەن.

"سینۆهە"تۆ سەرت لەوە سوڕ دەمێنی کە من بۆچی لێرەدا ڕاوەستاوم و بۆچی ناڕۆم بۆئەوەی ڕێ لە هێزی سەربازی"هاتی"بگرم، بەڵام من ناتوانم بێ سەربازی

---

[36] دەلتا: پیتێکی یۆنانیە کە لەشێوەی سێگۆشەدایە و لەبەرئەوەی ڕوباری نیل لەو شوێنەی دەڕژێتە دەریاوە، دەبێت بەچەند لقێکەوە و کۆی ئەو بەشە ڕوبارانە شێوە سێگۆشەیەك دروست دەکەن، هەر لەبەرئەوەش مێژوو نوسە یۆنانیەکان بە"دەلتا"بانگیان دەکرد و لەڕابردوودا ڕوباری نیل لەناوچەی دەلتادا حەوت لقی لێدەبویەوە، بەڵام ئێستا لە دوو لق زیاتر نیە.

پێویست و فێرکراو و لەگەڵ گالیسکە جەنگیەکاندا بڕۆم بۆئەوەی لەگەڵ"هاتی"دا بجەنگێم. سەرەڕای ئەوەش لەبەرئەوەی "غەزە" لەژێر دەستی ئێمەدایە و هێزەکانیشمان لەوێدا بەرگری دەکەن، تاڕادەیەك خەیاڵم ئاسودەیە. چونکە "غەزە"وەك تیرێك وایە کە چەقیبێتە کۆمی"هاتی" و هاودەستەکانی "ئازیرو"ە و ناهێڵێت بگرە مانۆڕی سەربازیش ئەنجام بدەن. ئایا لەبیرتە کە تۆ بۆ بەرقەرار کردنی ئاشتی لەگەڵ "ئازیرۆ"دا ڕۆشتی بۆ سوریا، من ئەوەم پێ ڕاسپاردی کە بەهیچ شێوەیەك"غەزە" لەدەست نەدەیت. لەو ڕۆژەوە پێشبینی ئەمڕۆم دەکرد کە پەناگای"غەزە" لەسوریادا بۆئێمە چ بۆ بەرگری کردن و چ بۆ گەڕانەوەی سوریا بۆ ژێر دەستی میسر گرنگیەکی لەڕادەبەری هەیە. تا ئەوڕۆژەی"غەزە"لەژێر دەستی ئێمەدا بێت"هاتی"ناوێرێت هێزی پیادەی خۆی کە ژمارەی سەربازەکانی وەك مێروله و کوله وایە لەبیابانی سوریا و"سینا"وە تێپەڕێنێت و لەوێوە خۆی بگەیەنێتە میسر، لەبەرئەوەی دەزانێت ئێمە خاوەنی هێزی دەریایین و دەتوانین لەڕێی دەریاوە، هێزی گرنگی سەربازی لەلەنگەرگای"غەزە"دا پیادە بکەین و لەپشت هێزی سەربازی پیادەی "هاتی"ەوە سەر دەربێنین‌و تا ئەو ڕۆژەی پیادە هێزی سەربازی "هاتی" لەبیابانی سوریا و "سینا"وە تێنەپەڕێت و نەگاتە میسر، هیچ ترسێك هەرشەی میسر ناکا. ئەمڕۆ هێزی سەربازی "هاتی" تەنها پشت بەمانۆڕی گالیسکە جەنگیەکانیان دەبەستن و فەرماندەی لەشکری سەربازی "هاتی" لەورباوەڕەدایە کە لەماوەیەکی کەمدا بەگالیسکە جەنگیەکانی دەتوانێت میسر داگیر بکات. بەڵام ئاگاداری ئەوە نیە کە میسر جیاوازە لەوڵاتانی وەك سوریا، چونکە سوریا جۆگەلەی ئاودێری نیە، لەمیسردا لەهەموو شوێنێکدا لەو شوێنەی کە ڕوباری نیل دەڕژێتە دەریاوە تا یەکەمین تاڤگە[37]جۆگەی ئاودێری هەیە، بۆیە ئەم کەناڵانە دەبنە ڕێگری پەڕینەوەی گالیسکە جەنگیەکانی "هاتی". بەڵام ,من تەنها پشت بەجۆگە ئاوێریەکانی میسر نابەستم، چونکە دەزانم تا ڕێی لە لەشکری سەربازی هێرشبەر نەگیرێت، بگرە ئەگەر ڕوباری ئاگریش لەبەردەمیدا بێت، ئەو لەشکرە بەهەر شێوەیەك بێت ڕێگای پەڕینەوە

---

[37] تاڤگەی یەکەم: بریتیە لە یەکەمین تاڤگەی ڕوباری نیل"لەباکورەوە بەرەو باشور"کە دەکەوێتە میسر، بگرە لەکاتی دروست کردنی تەلاری ڤوچەکیەکاندا ئاگاداری ئەم تاڤگانە بوون.

دەدۆزێتەوە، بەکورتیەکەی حەز دەکەم بەهێزێکی تۆکمە و تەواوەوە بڕۆم بۆ جەنگی "هاتی"، ئێستاش دەستەپاچە نیم، چونکە پارتیزانەکانم بەبەردەوامی لەبیابانی "سینا"دا سەرقاڵی ئازاردانی هێزی سەربازەکانی"هاتی"ن، ڕۆژ نیە کۆمەڵێك سەربازیان لیٚ نەکوژن.

هەرچەند هێزی سەربازی"هاتی"لەمیسری خواروودا ئاوایییەکان وێران بکەن و کێڵگەکان لەناوببەن و خەڵکی چاوترسێن بکەن، ئەوا ژمارەی ئەو کەسانەی پەیوەندی بەهێزی سەربازی منەوە دەکەن ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر دەبێت.

لەڕاستیدا کۆمەڵێك جوتیار کە لەمیسری خواروودا بەهۆی دەستدرێژیەکانی هێزی سەربازی"هاتی"ەوە بە برسیەتی ماونەتەوە و پەیوەندیان بەهێزی سەربازی"هورم هب"ەوە کردوە.

کۆمەڵێکی تریش کە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی"ئاتون"دا هەژار کەوتون، پەیوەندییان بەهێزی سەربازیەوە کردووە، بەڵام لەبەرئەوەی ژمارەی هێزی سەربازی "هورم هب"بەپێی پێویست نیە، بێئەوەی گویٚ بداتە ئەوەی کاهینەکانی "ئامون"چی دەڵێن، فەرمانی دەرکرد و هەموو ئەو تاوانبارانەی کە بەسزای ئەوەی باوەڕیان بە"ئاتون"بوو و ناردبویان بۆ کانە کانزاکان ئازادی کردن و ئەمانەش بەهەمان شێوە پەیوەندیان بەهێزی سەربازی"هاتی"ەوە کرد.

*بەشی چل و هەشتەم*

## بەچ شێوەیەك هێرشمان کردە سەر سەربازەکانی"هاتی"

شاری"ممفیس"بەهۆی جێگیر بونی سەربازەکانەوە گۆڕا بەشارێکی سەربازی وروژێنەر و هەموو شەوێك سەربازەکان لەسۆزانیخانە و شەقامەکاندا بەدڕەوشتی و شەڕ و کێشمەکێشیان دەنایەوە و دانیشتوانی سەرەکی ئەو شارەش، لەترسی ئەمانە دەرگایماڵەکانیان دەبەست و لەماڵەکانیان نەدەهاتنە دەرەوە. بەڵام کورەکانی توانەوە و دروست کردنی مس شەو و ڕۆژ کاریان دەکرد. خەڵکی ئەو شارە بەڕادەیەك لە لەشکری"هاتی"ترسابون کە ژنەکانیشیان خشڵی مس و زیوەکانی خۆیان دەدا بەسەربازەکان بۆئەوەی نوکی نێزە یان تیرێکی لیّ دروست بکەن.

"هورم هب"یش بەهەمان شێوە لە"ممفیس"دا ئاڵتون و زیوی لەدەوڵەمەندەکان وەردەگرت و کەشتی پێدەکڕین. هەر کەشتیەك لە دوانزە دروگەکانەوە بهاتایە یان لە"کریت"ەوە بهاتایەتە لەنگەرگایەکی میسرەوە، لەلایەن"هورم هب"ەوە دەکڕا.

ئەگەر کەشتیەوانی کەشتی ئامادە بوایە بەئارەزوی خۆی کەشتیەکەی بفرۆشێت ئەوە هیچ، ئەگەر ئارەزوشی لیّ نەبوایە ئەوا"هورم هب" بەزۆر لێی دەکڕی.

لەوکاتەدا کەشتیەکانی"کریت" سەرگەردان ببون و لەلەنگەرگایەکەوە دەڕۆشتن بۆ لەنگەرگایەکی تر و نەیاندەوێرا بگەڕێنەوە بۆکریت، لەبەرئەوەی هەواڵگەلێکی ناخۆشیان لەبارەی "کریت"ەوە بیستبوو.

دەیانوت کە لە"کریت"دا کۆیلەکان ڕاپەڕینیان کردووە و ئاگریان بەرداوەتە لەنگەرگاکانی "کریت"و هەندێکی تر دەیانوت کە هێزی"هاتی"هێرشی کردووەتە سەر"کریت"و ئەم هەواڵە زۆر سەیر بوو بەلای ئەوانەی گوێیان لێی دەبوو، چونکە

دەیانزانی خێڵەکانی"هاتی"ئەزمونێکی ئەوتۆیان نیە کە بتوانن لەڕێی دەریاوە هێرش بکەنە سەر"کریت".

هەندێکی تر لەوباوەڕدابوو کە خێڵە سپی پێستەکان کە لەباکورەوە هاتون هێرشیان کردووەتە سەر"کریت. بەلآم تەواوی سەوڵ لێدەرەکانی کەشتی و کەشتیەوانەکانی"کریت"کە بەسەرگەردانی لە لەنگەرگایەکەوە دەڕۆشتن بۆ لەنگەرگایەکی تر، لەوباوەڕەدا بون ئەم بەدبەختیەی "کریت" لەمەرگی خوداکەیانەوە سەرچاوە گرتووە و دەیانوت لەبەرئەوەی خوداکەیان مردووە، ناتوانن بگرێنەوە بۆ"کریت".

ئەوەبوو کاتێك"هورم هب"پێی وتن: پەیوەندی بەهێزی سەربازی میسرەوە بکەن، لەبەرژەوەندی ئەواندا بوو ئەگەر ئەم پێشنیارەیان پەسەند بکردایە، هەندێك لەکەشتیەکانی"کریت"یش بەهۆی ئەو سەرگەردانیانەوە خۆیان کرد بەلەنگەرگاکانی سوریادا و کەوتنەدەستی"ئازیرو"و هێزەکانی "هاتی"ەوە. بەلآم"هورم هب"توانی بەسود وەرگرتن لە کەشتیەکانی"کریت"و کەشتی دورگەکان، هێزێکی دەریایی پێك بهێنێت و هەموو کەشتیەوانەکان و سەربازانی ئەم هێزە دەریاییەش کەسانی لێهاتو و چاوکراوە بوون.

کاتێك ڕوباری"نیل"هەڵچوو"هورم هب"لەگەڵ سەربازەکانیدا بەڕێ کەوت، بەلآم پێش ئەوەی لە"ممفیس"ەوە بکەوێتە ڕێ، بەهۆی ئەو نامەبەرانەی کە لەڕێی وشکانی یان دەریاوە دەیناردن بۆ"غەزە"ئەو هەواڵەی نارد بۆ هێزی سەربازی"غەزە"کە بەرگری لەخۆیان بکەن.

لەهەمان کاتدا کەشتیەکی میسری بەئازوقەو خۆراکەوە خۆی کرد بە لەنگەرگاکانی "غەزە"داو پەیامی"هورم هب"یان بە بەفەرماندەی هێزی سەربازی "غەزە" گەیاند. ئەوە هەمان ئەو فەرماندە بوو کە کاتێك ویستم بچمە ناو"غەزە"وە دەروازەی شاری بۆ نەکردمەوە، بەڵکو لەناو سەبەتەیەکدا منی هەڵکێشایە سەر دیواری حەساری"غەزە".

من نازانم ئەو بەچ شێوەیەك لەناو ئەو شارەدا بەرگری بۆ دەکرا، لەبەرئەوەی سەربازەکانی "ئازیرو"و "هاتی" بەبەردەوامی هێرشیا بۆ دەکردن و بەردەوام قۆچی سەریان دەکوتا بەدەروازەی شاردا و گۆزە پڕ لەمارە ژەهراویەکانیان هەڵدەدایە ناو شارەوە. بەلآم ڕۆژ نەبوو لەلایەن سیخوڕەکانی"هورم هب"پەیامێك بە تێرێکەوە

نەبەستریتەوەو هەڵنەدریتە ناو شارەوە و "هورم هب"یش بەهۆی ئەو پەیامانەوە بەردەوام پێی دەوتن"بەرگری بکەن ..... بەرگری بکەن.

کاتێك ئێمە لە"تانیس"نزیك بوینەوە"هورم هب"ئەو زانیاریەی پێگەشت کە تیپێك گالیسکەی جەنگی"هاتی" لەکەنار ڕوباری"نیل" لەپێچی ڕوباردا بۆسەیان بۆ داناوین.

"هورم هب"فەرمانی دا جۆگەلەی ئاوێدێریەکان کە بەسترابون و بەهۆی لیتە و چڵکاوەوە بێکەڵك بوبون پاك بکەنەوەو ئاوی تێبەر بدەن، ئەوانیش وایان کرد، لەناکاو تیپی گالیسکە جەنگیەکانی"هاتی"ئاگاداری ئەوە بون لەهەموو لایەکەوە ئاو چواردەوری گرتون. سەربازەکانی "میسر"لەناو کەشتیدا بون بۆیە لەئاو نەدەترسان، بۆیە بەکەشتیەکانیان لەکەناڵە ئاویەکانیانەوە تێپەڕین و سێ سەد ئەسپی"هاتی"یان کوشت و سەد گالیسکەشیان سوتاند.

"هورم هب"لەم ڕوداوە زۆر توڕە بوو، چونکە ئەو دەیویست دەست بەسەر گالیسکە و ئەسپەکانیاندا بگرێت و لەڕیزی هێزی سەربازی"میسر"دا سودیان لێ وەربگیرێت. دوای ئەم ڕوداوە، بەردەوامیمان بەڕێکردنی خۆماندا تائەوکاتەی گەشتینە "تانیس".

لەوێدا"هورم هب" ڕوبەڕوی دەستەیەك لە سەربازەکانی"هاتی"بویەوە کە لەگالیسکەکانیان زۆر دور بون و سەربازە میسریەکانیش هێرشیان بۆ کردن، لەبەرئەوەی سەربازەکانی"هاتی"پیادە بوون، توانیان هەموویان بکوژن و دەست بەسەر گالیسکە سەربازیەکانیاندا بگرن.

ئەم سەرکەوتنە لەڕوی هێزی سەربازیەوە بەوشێوەیەش گرنگ نەبوو، بەڵام لەڕوی ڕۆحیەوە زۆر کاریگەربوو، چونکە سەربازەکانی میسر بیستبویان کە ناتوانرێت شکست بە بەسەربازەکانی "هاتی"بهێنرێت، ئەم ڕوداوەش ئەوەی سەلماند کە سەربازەکانی"هاتی"وەك هەر هێزێکی سەربازی تر شایەنی شکست پێهێنانە.

"هورم هب"هێمانی هێزی سەربازی میسری بە ئەسپەکانەوە نوساند و گالیسکە بەدەستهاتووەکانیشی بەهەمان شێوەی گالیسکە جەنگەیەکانی میسر ڕەنگ کرد.

خودی"هورم هب"یش بەهۆی ئەم سەرکەوتنەوە وروژابوو و سەربازەکانی پیادە و چەکی قورسی خۆی کێشایە دواوە و بەدەستەیەك گالیسکەی جەنگی هێرشی کردە

سەر"تانیس"و کاتێك بەرەو"تانیس"دەڕۆشتین، پێی وتم: "سینۆهە"ئەگەر تۆ دەتەوێت دەستی خۆت بوەشێنی ئەو لێدانە بەخێرایی و بەتوندی بوەشێنە بۆئەوەی دژەکەت وا سەری لێ بشێوێت کە نەتوانێت بەپەلە پەرێشانی و پەرتوبلاوی خۆی کۆبکاتەوە.

من لەوباوەڕەدابوم کە"هورم هب"لە"تانیس"دا ڕادەوەستێت، بەلام سەرەڕای ئەوەی دەیزانی لەباشوری"تانیس"دەستەیەك لە لەشکری"هاتی"لەبیاباندا سەرقالی وێرانکردنی لادێ‌و کێڵگەکانن، لە"تانیس"تێپەڕی‌و کەوتینە پشتی بیابانەوە"بیابانی سینا"ەوە و منیش بەسەر سوڕمانەوە بینیم"هورم هب"وەك ئەو تیرەی لەکەوانەی بەردەبێت ڕوی کردە ڕۆژهەلاتەوە.

دوای ئەوەی چوینەی ناو بیابانەوە"هورم هب"دەستی بەسەر چەند پایەگایەکی جەنگی "هاتی" کە سەربازەکانی پاراستنی گۆزە پڕ لەئاوەکانیان لەئەستۆدابوو گرت،ئەوکات زانیم کەبۆچی"ئازیرو"وهێزی سەربازی"هاتی"گۆزە بەکارهاتووەکانیان لەمیسر دەکڕی، چونکە گۆزە تازەکان ئاو دەدەنەوە و ئەو ئاوەی کە لەناو گۆزەکەدایە لەبەینی دیواری گۆزە تازەکانەوە دزە دەکاتە دەرەوە و هەموو ئاوی ناو گۆزەکە لەناو دەچێت، بەلام گۆزە بەکار هاتووەکان ئاوی ناو گۆزەکە دەپارێزن.

هێزی سەربازی"هاتی"سەدان هەزار گۆزەی پڕ لەئاوی لەسوریاوە تا سنوری میسر، لەچەند شوێنێکی تایبەتی بیاباندا دانابوو، بۆئەوەی کاتێك هێرش دەکەنە سەر میسر، هێزە سەربازیەکان بێئاو نەبن. چونکە هێزی سەربازی"هاتی"هێزی دەریایی نەبوو، بۆیە بۆ هێرش کردنە سەر میسر ناچاربوو لەڕێی وشکانیەوە هێرش بکاتە سەر نیشتمانی ڕەش، لەڕێی دەریاوە هێرشکردنیش پێویستی بەئاو بوو.

گۆزەکان بۆ ئەوەی ئاوەکەی کەم نەکات تا دەمەکەی دەخرایە ناو زەویەوە بۆئەوەی گەرمی خۆر ئاوی ناو گۆزەکان نەکات بەهەلم . "هورم هب"بێئەوەی لەبیری ماندویەتی ئەسپەکاندا بێت، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە بەرەو ڕۆژهەلات ڕۆشت.

سەرەڕای ئەوەی هەندێك لەئەسپەکان تۆپین"هورم هب"لەخێرایی ڕۆشتنەکەی کەم نەکردەوە، بەلام ڕۆشتنی سەدانی گالیسکەی ئەو لەبیاباندا دیمەنێکی تۆقێنەری هەبوو و خۆڵ و خاشاکی دەکرد بەئاسماندا و ئەوانەی چاویان بەڕەوتی گالیسکە

سەربازەکانی ئەو دەکەوت دەیانوت"هورم هب"وەك لافاو و زریانێکی لەناکاو لەوانەیە لەهەرکاتێکدا بگات.

لەهەمان ئەو کاتەدا گالیسکەکانی"هورم هب"خۆیان کرد بەبیاباندا، گروپە پارتیزانەکانی لایەنگری میسریش دەستیان بەچالاکیەکانی خۆیان دژی پایگاکانی "هاتی"کرد و شەوانە بەسەر تەپۆڵکەکانی"سینا"ەوە ئاگریان دادەگیرساند و لەرێی ئاگرەوە پەیوەندیان بە"هورم هب"ەوە دەکرد.

ئەو خۆڵ و خاشاکەی بەهۆی ڕەوتی گالیسکەکانەوە هەڵدەستا و ئەو ئاگرانەی کە شەوانە دادەگیرسان، ئەو ئەفسانەیەی دروست کرد کە"هورم هب"لەرۆژدا بەخێرایی ڕەشەبای بیابان و لەشەودا بەخێرایی ستونێك لەمەشخەڵی ئاگر، هێرشی کردووەتە سەر سوریا.

"هورم هب"بەسود وەرگرتن لەبێئاگایی سەربازەکانی"هاتی"دەستی بەسەر تەواوی ئەو شوێنانەدا گرت کە ئاوی تێدا بوو. هێزەکانی هاتی لەوباوەڕەدا نەبون "هورم هب"هێرشیان بۆ بکات، بۆیە هەموویان یان بەدیلی گیران یان بەکوشت دران. دوو شت بوە هۆی ئەوەی هێزی سەربازی"هاتی"چاوەڕێی هێرشی"هورم هب"نەکەن، یەکێکیان ئەوەیکە لەشکری"هاتی"بە بەردەوامی خۆی هێرش بەر بوو، تا ئەو کاتە هیچ کەسێك ئەوەی بەچاوی خۆی نەیبینیبوو یان نەیبیستبوو کە کەسێك هێرش بکاتە سەر"هاتی". دووەم ئەوەیکە لەشکری"هاتی"دەیزانی بەشێك لەهێزەکانی لەمیسری خواروودا سەرقاڵی وێرانکردنی لادێ و کێڵگەکانن و لەوباوەڕەدا نەبوو کە"هورم هب"بهێڵێت ئەمانە بەردەوامی بەوێرانکاری خۆیان بدەن و خۆیان بێن بۆ "سینا"و هێرش بکەنە سەر"هاتی"ەکان، لەکاتێکدا دەیانزانی کەمیسر لاوازە و ئەگەر"هورم هب"لەمیسر دەربچێت ئەو وڵاتە توانای بەرگری کردنیان نیە لەبەرامبەر ئەو دەستە زۆرانەی"هاتی" کە لەمیسری خواروودا جێگیرن.

یەکێك لەو هۆکارانەی کە لەبیابانی"هاتی"دا هێزی سەربازی لەبەرامبەر"هورم هب"دا لاواز کرد خۆڕاگری و بەرگریکاری"غەزە"بوو.

لەشکری"هاتی"بۆئەوەی شاری"غەزە"لەناو ببات، کۆمەڵێك لە یەکە سەربازیەکانی خۆی لە"غەزە"دا کۆکردەوە، بەڵام لەبەرئەوەی لەچواردەوری"غەزە"دا کەرەستەی خۆراکی تێدا بەدی نەدەکرا بۆئەوەی خواردنی ئەو یەکە سەربازیانەی تێدا بدەن، بۆیە

ئەو یەکانەی لەشارەکانی سوریادا بڵاوکردەوە بۆئەوەی خۆراك بەشی ئەمانی تر بکات.

هەرلەبەرئەوەش کاتێك"هورم هب"خۆی کرد بەناو بیابانی"سینا"دا"هاتی"ەکان نەیانتوانی هێزەکانی خۆیان لەبەرامبەر ئەودا ڕاگرن.

"هورم هب"تا نزیك شاری"غەزە"ڕۆشت و بەشێك لەهزەکانی"هاتی"کە لەچواردەوری شاردا بون لەناوی بردن، بەڵام نەیتوانی بچێتە ناو"غەزە"وە، چونکە لەوێدا، ئەفسەرانی"هاتی"ئاگاداری ئەوەبون کە گالیسکە جەنگیەکانی"هورم هب"زۆر نین، بۆیە بڕیاری ئەوەیان دا کە ڕێی لێبگرن.

ئەوکاتەی"هورم هب"بەرەو"غەزە"دەڕۆشت من لەگەڵیدا نەبوم، بەڵکو لەیەکێك لەنێوەندە ئاویەکاندا مامەوە، چونکە"هورم هب"پێی وتبوم: لەوشوێنەدا پێویستی بەکاری پزیشکی ئەو نیە، چونکە هەل ئەوەی بۆ نارەخسێت بریندارەکان تیمار بکات‌و هەرکەسێکیش بریندار بکرێت لەبیاباندا بەجێی دەهێڵن، ئەگەر بەزیندوییش بمێنێتەوە ئەوە باشتر، ئەگەر بیشمرێت ئەوە دەبێتە خۆراکی داڵە کەرخۆرە و باڵندە لاشە خۆرەکان.

ئەوەی لەبارەی ڕوداوەکانی ئەم جەنگەوە بەمن گەیشت، بابەتگەلێك بوو کە"هورم هب" یان ئەفسەرەکانی دوای کۆتایی هێنانی ئەو جەنگە بۆیان گێڕامەوە.

پێش ئەوەی بگەنە"غەزە"هورم هب، بەسەربازەکانی خۆی وتبوو ئەگەر لەگالیسکەکانیان پیادە ببن ئەوا زۆر لێیان دورنەکەونەوە، لەبەرئەوەی ئەم جەنگیان جەنگێکی هونەری و تەکنیکی‌و ناجێگیرە، نەك جەنگێکی گۆڕەپانی و لەوانەیە لەو جەنگەدا ناچاربن سات لەدوای سات گۆڕانکاری بەسەر مانۆڕ و شێوازی شەرکردنیان بهێنن، بەڵام هەندێك لەسەربازەکانی بەتەماعی فەرهودکردنی سامانی ئۆردوگاکانی"هاتی" لەگالیسکەکانیان دابەزین و لێی دور کەوتنەوە.

کاتێك"هورم هب"ئاگاداری ئەوەبوو کەهێزەکانی"هاتی"لەبەرامبەرئەو هێرشەیاندا ئەوانیش دەستیان کردووە بەهێرش بردن، ناچاربوو بەخێرایی گالیسکەکانی بگەڕێنێتەوە، لەئەنجامدا هەندێك لەسەربازەکانی لەپشت حەساری "غەزە"وە کەوتنە دەستی سەربازەکانی"هاتی"ەوەو سەریان بڕین و پێستیان لێکردنەوە بۆئەوەی دوای

دەباغکردنی پێستیان کیسەیان لێ دروست بکەن، چونکە"هاتی"ەکان لەدروست کردنی جۆری کیسەکاندا زۆر لێهاتو بون.

سەربازەکانی"هورم هب"دەستکەوتێکی ئەوتۆیان لەو شەڕەدا بەدەست نەهێنا، چونکە تاکە شتێك کە بەڕێژەیەکی زۆر لەبیاباندا هەبوو گۆزەی پڕ لەئاوبوو، گەرچی گۆزەکانی بیابان پڕبون لەئاوی گەرم، بەڵام بەکێشانەی خۆیان نرخی کانزا بەنرخەکانیان هەبوو، بەڵام هەمان ئەو گۆزانە لەکەنارەکانی ڕوباری"نیل"دا زۆر بێنرخ بون.

دوای ئەو جەنگە"هورم هب"هێزی سەربازی خۆی دوای ئەوەی لەغەزە گەڕاندیەوە، لەبیاباندا ڕاوەستا، لەکاتێکدا کە بەدڵنیاییەوە لەوانە بوو هێزەکانی "هاتی"لەهەر ساتێکدا هێرشیان بۆ بکردایە، بەڵام ئەسپەکانی بەڕادەیەك ماندوو بون کە نەیدەتوانی خۆی بگەیەنێتە سنورەکانی میسرەوە. بەڵام لەبەرئەوەی"هورم هب"نێوەندی کۆگا ئاوەکانی لەدوای خۆیەوە لەناو نەبردبوو، دەیزانی کە هەڵی ئەوەی دەبێت بەشێك لە هێزەکانی میسر کە لەدوای خۆیەوە بەجێی هێشتوون ڕەوانەی بیابانیان بکات و بیانهێنێتە ڕیزی خۆیەوە.

سەربازەکانی"هورم هب"سەرەڕای ئەوەی لەو جەنگە دەستەویەخەدا خۆیان هێرش بەر و داگیرکەر بون بەڵام گلەییان لەکەمی دەستەکەوتەکان دەکرد، ئەگەر کەسێك بەوانی بوتایە ئێوە شانازی خۆتان بەدەست هێناوە، ئەوا لەوەڵامدا پیان دەوتن ئێمەش ئامادەین ئەم شانازیانەی خۆمان بفرۆشین بەچەند ئەنگوستیلەیەك.

من لەگەڵ ئەو لەشکرەی کە لەمیسرەوە هاتبون بۆئەوەی پەیوەندی بە"هورم هب"ەوە بکەن، کەوتمە ڕێ و کاتێك بەخێرایی بەبیاباندا تێدەپەڕین، ئەوەی چاوم پێی کەوت کارەساتەکانی جەنگ بوو نەك شانازیەکانی. چونکە ئەفسەر و سەربازەکان لەکاتی سەرکەوتنەکانیاندا شانازیەکان بەدەست دەهێنن و ئەوانەی لەدوایانەوە ڕێ دەکەن، بێ لە کارەساتەکان جەنگ هیچ شتێکی تر نابینن.

هەندێکات لاشەی سەربازێکی میسریم دەبینی کە کەمتیارەکان نیوەی لاشەیان خواردبوو، هەندێکاتیش سەربازێکی"هاتی"مان لەسەر ڕێگاکەمان دەبینی کەبەسیخێکەوە هەڵواسراو.

لەنێوەندی کۆگا ئاوەکاندا دەمانتوانی سود لەو ئاوانەی کە سەربازەکانی "هاتی" کۆیان کردبوویەوە وەرگرین، چونکە "هورم هب" دەیزانی خۆی یان ئەو لەشکرەی لەدوایانەوەیە سود لەم کۆگا ئاوانە وەردەگرێت، هەر لەبەرئەوەش ئەو ئاوانەی دەکەونە سەر ڕێگای گواستنەوەی پێویستی یان سەربازەکانی میسر لەناو نەبرد.

ڕۆژێکیان دوای خۆر ئاوابوون من ئاگری ئۆردوگای "هورم هب" م لەدورەوە بینی،بەڵام دەمزانی لەو شەوەدا ناتوانم خۆم بگەیەنمە ئەو ئۆردوگایە، لەبەرئەوەی ئەو ئاگرەی لەبیابانێکی تەخت و ڕێکدا دەبینرێت زۆر لەوە دورترە کە لەسەرتادا دێتە بەرچاوی.

ئەو شەوە هەوای بیابان دوای گەرمی ڕۆژ زۆر سارد بوو و من نەمتوانی خەوم لێ بکەوێت، بەڵام ئەو سەربازانەی بەپێی پەتی گەرمی بیابانیان بەپێ بڕیبوو، لەشەکەت و ماندویەتیاندا خەویان لێ کەوتبوو، لەکاتی خەودا وڕێنە و هاوار هاواریان بوو، من لەو باوەڕەدام ئەم حاڵەتە لەو ئەفسانەیەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەکاتی شەودا بیابان دەبێتە شوێنی هات و چۆ و گەڕانی ڕۆحە ئازار بەخشەکان، هەر بۆیە خەوتووەکان لەکاتی شەودا هاوار دەکەن و ئەم هات و هاوارە بووەتە هۆی ئەوەی ئەو باوەڕە لەلای خۆیان دروست بکەن کە ڕۆحە ئازار بەخشەکانی بیابان، ئازار بەمرۆڤەکان دەگەیەنن.

ڕۆژێکی تر پێش ئەوەی سپێدەی بەرەبەیان هەڵبێت، بوقیان لێدا و سەربازەکانیان لەخەو هەڵساند و ئێمەش بەرەو ئۆردوگاکەی "هورم هب" کەوتینە ڕێ، بەڵام پێش ئەوەی بگەیەنە ئۆردوگاکەوە، کۆمەڵێك لە گالیسکە پشکێنەر و گەڕۆکەکانی "هاتی" کە لەبیاباندا سەرقاڵی ڕێپێوان بون، لەدوامانەوە سەریان دەرهێنا.

سەربازە پیادەکانمان هێشتا فێری ئەوە نەکرابون کە بەچ شێوەیەك شەڕ لەگەڵ گالیسکە جەنگیەکانی "هاتی" دا بکەن، زۆر لەبینینی گالیسکەکانی دوژمن ترسان و هەندێکیشیان هەڵهاتن، بەڵام بەتیری تیرهاوێژەکان کە لە گالیسکەکانەوە تیریان دەهاوێشت بەکوشت دران. بەڵام ئێمە لەبەرئەوەی لەئۆردوگای "هورم هب" نزیکبوبوینەوە، ئەودەستەیەك گالیسکەی جەنگی خۆی بۆهاوکاری ئێمە ناردو گالیسکەکانی "هاتی" ش هەر ئەوەی چاویان کەوت بە گالیسکەکانی "هورم هب"، پێداگیری وسوربونیان بەهەڕەشەی لەناوچونی خۆیان زانی، بۆیە هەڵهاتن.

هەڵهاتنی ئەوان بووە مایە خۆشحاڵ سەربازەکانی ئێمە و دەستیان بەڕاوەشاندنی نێزەکانیان و هەندێکیشیان تیریان تێ دەهاویشتن، لەکاتێکدا دەیانزانی کە تیرەکانیان ناگاتە خودی گالیسکەکانیش.

کاتێك سەربازانی پیادەی ئێمە بینیان گالیسکەکانی "هاتی" هەڵهاتن هاواریان کرد ئێمە لە "هاتی" ناترسین، چونکە "شەهێنی هورم هب" خۆی بەسەریاندا شۆڕ دەکاتەوە و چاویان کوێر دەکات.

سەربازانی پێیادەی ئێمە بەهیوای ئەوەوە بون دوای ئەوەی گەشتنە ناو ئۆردوگای "هورم هب" ڕێزیان لێبگرن، چونکە بەپێی پەتی بیابانی گەرمیان بەڕێ بڕیبوو، هەروەها چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد کە ماوەیەکی درێژ لەوێ بحەوێنەوە. بەڵام "هورم هب" لەکاتێکدا ڕوخساری بەخۆری بیابان ڕەش داگەڕابوو و چاوەکانی وەك دوو پیاڵە خوێن دەهاتە بەرچاو، قامچیەکەی خۆی تەکانداو وتی: ئەی تەمەڵینە، هەی بۆقەکانی چڵکای ڕوباری "نیل" لەکوێ بون بۆچی ئەوەندە درەنگتان پێبوو؟ مەگەر پێم نەوتن کە زوتر بێن؟ئێشتاش کە هاتون بەشێوەیەك بۆنی چڵك و پیسی لەشتان دێت، ئەوکاتانەی من دەبێت لەنێوتاندا بم دەبێت لوتم بگرم بۆئەوەی بۆنی بۆگەنی ئێوە ئازارم نەدات. بەڵام ئێستا هاتون، لەباتی ئەوەی پەنجەی پیستان بکەن بەلوتتاندا یان کۆمتانی پێ بخورێنن چاڵ و خەندەق بۆ خۆتان هەڵکەنن، لەبەرئەوەی ژیانی ئێوە بەو خەندەقەوە پەیوەست دەکرێت، ئەگەر ئەو چاڵانەشتان هەڵکەند و ئەگەر بەردتان خستە بەر چەرخی گالیسکەکان بۆئەوەی نەڕۆن، ئەوکات بەزیندوویی دەمێننەوە، ئەگینا هەر لێرەدا ئێسقانەکانتان سپی دەبێت.

سەربازە میسریەکان سەرەڕای ئەوەی ماندوو بون و پێیان برینداربوو، لەو قسانەی "هورم هب" تورە نەبون، چونکە دەیانزانی "هورم هب" هەمیشە بەو شێوەیە قسە لەگەڵ سەربازەکانیدا دەکات، بەڵام قامچی خوێنینی ئەو ئەوەی ئاشکرا دەکرد کە ئەو قسەیە وەك ئەوانەی ڕابردوو گاڵتە لەخۆ ناگرێت.

بۆیە سەربازەکان بێئەوەی بیر لەپێی برینداروو جەستەی ماندویان بکەنەوە دەستیانکرد بەچاڵ هەڵکەندن و خەندەقێکیان بۆ خۆیان دروست کردو لەبەردەم خەندەقەکانیشدا تاوێرەبەردیان داناو لەنێوان تاوێرە بەردەکاندا، تیرەی درێژیان داکوتی بۆئەوەی ڕێ لەتێپەڕینی گالیسکەکان بگرێت.

لەپێش ئەم خەندەق و تیرانەوە بەپێی فەرمانەکانی"هورم هب" مێخکەلێکی کورتیان لەسەر زەوی داکوتی و تەنها بەستنیان بەیەکەوە و من تێگەشتم کە مەبەستی"هورم هب" ئەوەیە دەستو پێی ئەسپ و چەرخی گالیسکەکانی بەتەنافی ئەو مێخانەوە گیربکات و گالیسکە جەنگیەکانی"هاتی" لەجوڵە بوەستێنێت. جگە لەو خەندەقانەی کە دیاربوو لە چ شوێنێکدا هەڵکنراون، دوبارە بەپێی فەرمانی"هورم هب"ڕیزێك خەندەقی درێژ و کەوانی هەڵکەند، بەڵام بەشێوەیەك بەخۆڵ دایپۆشین کە لەدورەوە هیچ کەسێك نەتوانێت لەوە تێبگات کە لەو شوێنەدا چاڵێکی درێژ و پان هەیە.

هەموو ڕۆژێك کۆمەڵێك لە سەربازی نوێ و کەم ئەزمون پەیوندیان پێوە دەکردین، هەروەها دەستە پارتیزانەکانیش لەم لاو لاوە پەیوەندیان پێمانەوە دەکرد، سەرەڕای ئەوەی بیابانێکی بەرفراوان بوو و ترسی ئەوە هەبوو کە گالیسکەکانی"هاتی"تەڵە و بەربەستەکان بەجێ بهێڵن و لەدواوە بێن بۆمان، بۆیە هەرچەنێك قەندەق و چاڵیان لەڕاست و چەپی ئۆردوگاکەوە هەڵکەندایەو چەند بەربەستێکی نوێیان دروست بکردایە، سەرەڕای هەموو کارەش هورم هب دەیوت کەمە. بەڵام وردە وردە ئەم کارانە سەربازە میسریەکانی بەهێزتر کرد و کاتێك باڵای بەرز و شانە پانەکانی"هورم هب"و قامچی خوێناوی دەستیان دەبینی، ئاگاداری ئەوە دەبون کە ئەو لەبەرەبەیانەوە تا نیوە شەو، چاودێری کارەکان و ئامادەکردنی شوێنی بەرگرییەکان بووە و لەدڵی خۆیاندا دەیانوت کە ئەم پیاوە ئێمە لەهەڕەشەی هاتی ڕزگار دەکات، ڕۆژێکیان"هورم هب"پەیامێکی بۆ سەربازەکانی میسر و ئەو پارتیزانانەی کە بەرێوەبون بۆئەوەی خۆیان بگەیەننە ئۆردوگا نارد کە پەلە بکەن بۆئەوەی شەویان بەسەردا نەیەت، ئەگەر شەویان بەسەردا بێت لەوانەیە بکەونە بۆسەی گەشتی بیابانی"هاتی"ەکانەوە.

هەمان ئەو ڕۆژەی کە"هورم هب"ئەو پەیامەی بۆ سەربازەکانی میسرو پارتیزانەکان نارد، نزیکی خۆرئاوا بون ئەو کاتانەی کە سەربازەکان خەریکی چاڵ هەڵکەندن بون، ئاسمانی بیابان پڕبوو لەخۆڵ و خاشاك و دوای ئەوە گالیسکە جەنگیەکانی"هاتی"دەرکەوتن.

کاتێك سەربازەکان بینیان داسکەڵێکی مەزن کە لەکانزایەکی سەیر بەناوی ئاسن دروست کرابوو لەپێش گالیسکەکانیانەوە ڕاست داکوتیوە، بەشێوەیەك ترسیان لێ نیشت، کە لوتیان سارد بووبوو[٣٨].

لەبەرئەوەی شەو داهات سەربازەکانی"هاتی"نەیانوێرا لەوناوچەیەی کە ئاگاداری هەلومەرجی سروشتی نەبون، هێرش بکەنە سەر لەشکرێك کە هێشتا ئاگاداری چەن و چۆنیان نین.

ئەمانە ئۆردوگایەکیان لە بیاباندا دروست کرد و ئاگریان هەڵگیرساند و ئالکیان بە ئەسپەکانی خۆیان دا و تا چاو کار بکات لەبیاباندا، مەشخەڵگەلێکی بچوك بەدی دەکرا.

گالیسکە پشکێنەروگەشتیارەکانی"هاتی"یش تا بەیانی سەرقاڵی تاقیکردنەوەو هەلومەرجی بەرەی جەنگی ئێمەبون و هەندێك لە پاسەوانانی میسریان کوشت، بەڵام ئەو پارتیزان و چەتانەی کە لەخزمەتی میسردا کاریان دەکرد، لەدوو لای ئۆردوگای"هاتی"ەوە هێرشیان کردە سەر دوژمنەکاکانیان و چەند کەسێکیان لێ کوشتن و چەند گالیسکەیەکیان لێ سەندن.

سەرەڕای ئەوەی"هورم هب"بەسەربازەکانی وتبوو بخەون، من لەوباوەڕەدام لەو شەوەدا هیچ کەسێك نەخەوت، جگە لەسەربازە کۆنەکان نەبێت چونکە بەلایانەوە زۆر ئاسایی بوو و دەیانزانی کە سبەی ئەوشەوە جەنگ دەست پێدەکات، تا بەیانی دەنگی چەرخی گالیسکە جەنگیەکان و تەقەتەقی چەك و قیژەی تێپەڕبونی تیرەکان و ناڵەی برینداراەکان دەبیسترا.

"هورم هب"کۆمەڵێك لەسەربازانی کۆنەکار و بەئەزمونی خۆی لەهێڵی پێشەوەی ئۆردوگا بۆ پاسەوانی هەڵبژاردبوو و چەند کەسێکیان لێ بریندار‌بوو و من کە تابەیانی بێداربوم، تیماری ئەم بریندارانەم دەکرد و"هورم هب"منی کێشایە کەنارەوە و وتی: هەر یەك لەم سەربازە کۆنەکار و بەئەزمونانە لەبەرچاوی مندا بەهای هەزاران سەربازی تازەکار گرانبەهاترن، بۆیە هەوڵی چارەسەرکردنیان بدە و نەهێڵیت بمرن و

---

[38] لەسەردەمی سینوهەدا کاتێك بیانویستایە بڵێن کەسێك زۆر ترساوە، دەیانوت لوتی سارد بووە.

بۆ چارەسەرکردنی هەریەك لەم سەربازانە ئەنگوستیلەیەکی ئاڵتونت پێدەدەم کە کێشی یەك"دین[39]" بێت.

وتم: "هورم هب"من دەمزانی کە تۆ لێرەدا، بەواتا لەبیابانی تەختی کەنار دامێنی کێوەکانی "سینا"دا ئۆردوگایەکت دروست کردووە و دەتەوێت لێرەدا ڕێ لە "هاتی"ەکان بگریت.

ئەگەر من ئاگاداری ئەم بڕیارەی تۆ بومایە، پێم دەوتی کە ئەم کارە مەکە، چونکە لەبیابانێکی تەختدا ڕێگری لەگالیسکە جەنگیەکانی"هاتی" کە گالیسکەکانی دەتوانێت پێیدا تێپەڕێت زۆر هەڕەشەئامێزە، بەڵام ئێستا تۆ ئەم بڕیارەت داوە و هیچ کارێك بۆ گۆڕینی ئەم بارودۆخە لەمن ناوەشێتەوە، من سەربازە کۆن و تازەکانت ئەگەر بریندار بن تیمار دەکەم، وەك بڵێی دەزانی هیچ کارێك لە سەربازە تازە کارەکانت ناوەشێتەوە، چونکە ئەمانە دوای ئەوەی گالیسکە جەنگیەکانی "هاتی" هێرشیان برد هەڵدێن.

من لەپێناو زێڕدا سەربازەکانت تیمار ناکەم و ئەوەی دەتەوێت لەبەرامبەر ئەم چارەسەر کردنەمدا بیدەیت بەمن، بیدە بەسەربازەکانی خۆت، چونکە ئەوانە لەمن زیاتر پێویستیان بە زێڕ و زیوە، لەوانەیە بەیانی هەموومان بکوژرێین و سبەی شەو من بونم نەبێت بۆئەوەی برینی سەربازەکانت تیمار بکەم.

"هورم هب"وتی: "سینۆهە"تۆ پیاوێکی ژیریت، بەڵام پیاوێکی جەنگاوەر نیت و لەهەر جەنگێکدا دەبێت هەڕەشەکانیش لەبەرچاو بگریت و ئەگەر هیچ هەڕەشەیەك لەجەنگدا نەبوایە"تۆت ئانخ ئامون"ی فیرعەونی میسر کە لەئێستادا هێشتا منداڵە ئەویش دەیتوانی ببێتە فەرماندەی تیپێکی سەربازی و بەشداری جەنگەکان بکات و منیش ئێستا دەڕۆم بۆئەوەی کەمێك شەراب بخۆمەوە بۆئەوەی بتوانم بخەوم و دوای ئەوەی هەستام بتوانم باشتر بجەنگێم، چونکە ئەگەر کەمێك گەرمی شەراب لەسەری مندا بێت دەتوانم باشتر بجەنگم.

دوای چەند ساتێك گوێم لە قومە قومی گۆزەکەی بوو کە لەدەمیدا خاڵی دەکرد. دوای ئەوە چەند کەسێك لەسەربازەکانی کە لەبەردەم چادرەکەیەوە تێپەڕین بانگ

[39] بڕۆ بۆ پەراوێزی ژمارە"٣٤"ی بەرگی یەکەمی سینۆهە.

کردو قومێکی دا بەهەریەك لەوانە و وتی: ئەو کەسانەی ئێشکگریان نیە بڕۆن بخەون بۆئەوەی بتوانن باشتر خۆیان ئامادەی جەنگ بکەن.

کاتێك سپێدەی بەیان هەڵهات، ئەڵبەتە ئەو شەوە نەمتوانی بخەوم ، لاشەی چەند ئەسپێکی کەوتوو چەند گالیسکەیەکی"هاتی"م بینی کە لەوێدا وەرگەڕابون و قەلەڕەشەکانیش سەرقاڵی خواردنی چاوی مردووەکان بون.

لەکاتێکدا کە سەربازەکانی"هاتی"ئاگرەکانی خۆیان بەخۆڵ دەکوژاندەوە و ئەسپەکانیان بەگالیسەکانەوە دەبەستەوە و بۆجارێکی تر چەکەکانیان پاك دەکردەوە، "هورم هب"سەربازەکانی خۆی لەدامێنی کوێکەدا کۆکردەوە و پاڵی بەتاوێرە بەردێکەوە دا، لەکاتێکدا کە پارچە نانێکی بە پیازێکەوە دەخوارد وتی:

"ئامون"خودای میسر کارێکی بێوێنەی ئەنجام داوە، چونکە سەربازەکانی "هاتی"لەبەرامبەر ئێوەدا داناوە بۆئەوەی ئێوە لەناویان ببەن و بەوشێوەی کە دەبینن پیادەی هێزی سەربازی"هاتی"هێشتا نەهاتووە، چونکە سەربازانی پیادەی دوژمن، لەلێوارەکانی بیاباندا لەبەرئەوەی لەوێ ئاوێکی زۆر هەیە ڕاوەستاون، بۆئەوەی گالیسکەکان ڕێگایان بۆ پاك بکەنەوە و دەست بەسەر ئەو ناوچانەدا بگرن کە ئاوی تێدایەو دوای ئەوە هێزی پیادە"هاتی"بکەوێتە ڕێ و پەیوەندی بە گالیسکە جەنگیەکانەوە بکەن. دوێنێ شەو بەبۆنەی ئەوەی لەئۆردوگای هاتی ئاو نەبوو، تەواوی ئەسپەکان تینویان بووە و بەشێك لە ئەسپەکان ئالکیان نەبوو و سەربازەکانی "هاتی"ش ناچار بون گیا دڕکدارەکان بخەنە بەردەمی ئەسپەکانیان، چونکە من تەواوی ئاوو ئالیکی"هاتی"ەکانم لەبیاباندا لەناو بردووە، هەر لەبەرئەوەش گالیسکەکانی "هاتی"بەسەختی دەجەنگێن، چونکە دەزانن ناچارن ڕێگا بۆ خۆیان پاك بکەنەوەو دەبێت تێبپەڕن و لەوێوە خۆیان بگەیەننە میسر، بەپێچەوانەی ئەمەشەو ڕێگەچارەیەکی تریان نیە جگە لەوەی بگەڕێنەوە بۆ سوریا، ئەمانە ئەگەر پەیڕەوی هزری خۆیان بکردایە، هەر ئەمڕۆ پاشەکشەیان دەکرد، بەڵام ئەمانە خەڵکانێکی تەماعنو بەهیوای ئەوەن هەرئەوکاتەی گەشتنە میسر دەست بەتالانیەکانی خۆیان بکەن و زێڕ و زیوی فراوان بەدەست بهێنن.

یەکێکیتر لەو شتانە بابەتی بەهای ئەو گۆزانەیە کە لەمیسر کڕیویانە بڕێك کانزایان خەرج کردووە، بۆیە ناتوانن چاوپۆشی لەو بڕە سامانە بکەن کەلەپێناو ئەم

گۆزانەدا خەرجیان کردووە و بگەڕێنەوە. هەرلەبەرئەوەش دەڵێم"ئامون"کارێکی بێهاوتای کردووە و هێزی سەربازی "هاتی" لەبەرامبەر ئێوەدا داناوە، چونکە کاتێك گالیسکەکانیان بکەونە جوڵە، دەکەونە ژێردەستی ئێمە یان دەکەونە ناو چاڵەکانەوەو لەجوڵە دەکەون.

"هورم هب"لەم کاتەدا بێدەنگ بوو و نانە وشکەکەی برد بۆ دەمی و بەدەمی کەمێك لەو نانەی قرتاندو دەستی کرد بەجوینی و سەربازەکانیش وەك ئەو منداڵانەی چاوەڕێی پاشکۆی چیرۆکێك بن هاواریان کرد تەواوی بکە....تەواوی بکە...

"هورم هب"ئەوپارچە نانەی کە لەدەمیدا دەیجوی لەناکاو تفیکردەوە و چەند جنێوێکی دا و وتی: وەك بڵێی چێشت لێنەرانی لەشکر پاشەڕۆی پشیلەیان کردبێتە ناو هەویری ئەم نانەوە و برژاندبێتیان، بۆیە لەناو دەمدا تامی ئەوەندە بۆگەن بوو، ئەگەر ئەوکارەیان کردبێت، من لەسێدارەیان دەدەم. کاتێك سەربازەکان گوێیان لەم قسەیە بوو پێکەنین و"هورم هب"یش هاواری کرد: هەی مشك و بۆقی چڵکاوەکانی ڕوباری"نیل"...بۆچی پێدەکەنن؟ئایا وادەزانن لەبەرئەوەی سەنێرو پاشەڕۆی ئەسپ و ولاخیان تێکەڵی نانەکەی ئێوە کردووە و دەرخواردتان دەدەن من تەمێیان دەکەم؟

نەخێر... نەخێر ئەگەر لەسەرتا تا کۆتایی ئەم جەنگە لەباتی نان سەنێرتان بدەنێ، من هیچکامیان تەمێ ناکەم، بەڵکو بێتاقەتی ئەوە دەبم کە بۆچی ئێوە پاشەڕۆی ئەسپەکانی منتان خواردووە، چونکە ئێوە سەرباز نین، بەڵکو وەك مشك ترسنۆکن. ئەگەر سەرباز بونایە تێدەگەشتن ئەو دارە درێژەی کە بەدەستانەوەیە داری هەڵسەنگاندنی قوڵایی ڕوباری"نێل"نیە، بەڵکو نێزەیە، ئەویش ئەو جۆرە نێزانەی کە سەرێکیان سەرێکی نوك تیژی کانزایی پێوەیە و ئەو نێزانەشیان لەبەرئەوە داوە بەئێوە بۆئەوەی سکی سەربازەکانی"هاتی"پێ کون کون بکەن. ئێوەش هەی تیرهاوێژەکان، من دەبینم کە وەك منداڵەکان تاڵی کەوانی تیرەکانتان ڕادەکێشن و تیرەکانتان بەرەو ئاسمان دەهاوێژن، بۆئەوەی بزانن تیر کامیەکتان بەرزتر دەبێتەوە، ئەو کەوانانەیان لەبەرئەوە داوە بەئێوە کە بەتیر چاوی سەربازەکانی"هاتی"کوێر و ورگیان کون کون بکەن، ئەگەر توانای ئەوەتان نیە سەربازەکانی"هاتی"بپێکن، چاوەڕێکەن کەمێك نزیکتر ببنەوە، چونکە ئەسپەکانیان نیشانەیەکی گەورەترن و تیر هاوێژیان بکەن.

کاتێك گالیسکەکانی"هاتی"لێتان نزیك بونەوە، پاشی نێزەکان بخەنە سەر زەوی و بەهەردوو دەستتان توند بیگرن، بۆئەوەی سەری نێزەکان بچەقن بەسنگی ئەسپەکانداو ئەگەر نەتانتوانی بەمشێوەیە ئەسپی گالیسکەکان بکوژن و ئەوان ئێوە تەختی زەوی بکەن، دوای ئەوەی ئێوەیان تەختی زەوی کرد، بەچەقۆ ماسولکە و شاڕەگی ئەسپەکانیان ببڕن، ئەگینا گالیسکەکان بەسەرتاندا تێدەپەڕن و ئێسقانی لەشتان ورد و خاش دەکەن.

ئەوکات"هورم هب"بەنەفرەتەوە بۆنی ئەو نانەی کرد کە بەدەستیەوە بوو و دوای ئەوە فڕێی داو قومێك ئاوجۆی لەگۆزەکەی خۆی خواردەوە و وتی:

من لەوباوەڕەدام کە ئەم قسانە بۆ ئێوە بێسود بێت، چونکە هەرئەوکاتەی ئێوە گوێتان لەدەنگی گالیسکەکانی"هاتی"و نەعرەی سەربازەکان بوو، بەشێوەیەك دەتۆقێن کە ناچار دەبن سەرتان لەژێر کراسەکەی دایکتاندا بشارنەوە و لەبەرئەوەی دایکتان لێرە نیە بۆئەوەی سەرتان لەباوەشیدا بشارنەوە، ناچارن سەرتان بچەقێنن بەنێو خۆڵی بشارنەوە. بەڵام دەبێت ئەوەشتان پێ بڵێم، هەرکاتێك"هاتی"ەکان لێرەوە تێپەڕن و خۆیان بگەیەننە کۆگای ئاو و ئالیکەکانیان کە لەدوای ئێمەوەیە و خۆیانی لێ تێر بکەن، بەدڵنیاییەوە دوای ئەوە ئێوە لەناو دەچن و کیسە و بوخچە لەپێستتان دروست دەکەن و ژنانی "هاتی"ش کاتێك بیانەوێت منداڵە شیر خۆرەکانیان لەسەر شتێك بخەوێنن کە شێ نەداتەوە، ئەوا ناچارن لەسەر پێستی ئێوە بیانخەوێنن، یان ئەوەی چاوتان دەردەهێنن بۆئەوەی تا ئەوکاتەی لەژیاندان بەرداشەکانی هاتیو "ئازیرو"بخولێننەوە. بەڵام من پێنج سەد لەسەربازە کۆنەکانی خۆم لەدوای ئێوە داناوە و ئەم پێنج سەد کەسە لەجەنگدا تاڕادەیەك لەئێوە دور دەگرن، بۆئەوەی ئەگەر ئێوە ترستان لێ نیشت بتانکەنە گاڵتەجاڕی خۆیان و پێتان پێبکەنن، کاتێکیش هەوڵی هەڵهاتن بدەن، دەتانکوژن، چونکە ئەگەر لەپێشتانەوە مەرگ هەبێت، ئەوا بێ هیچ دودڵیەك مەرگ لەدواشتانەوە چاوەڕێتان دەکات. بەڵام ئەگەر هەڕەشەی مەرگ چاوەڕێتان بکات، ئەوا لەهەمان ئەوکاتەدا سەرکەوتن و دەستکەوتێکی زۆریش لەهەمان ئەوکاتەدا چاوەڕێتان دەکات و دڵنیام ئەگەر هەرکەسێك ئەرکی خۆی ئەنجام بدات و هەوڵی ئەوە بدات سەرباز و ئەسپەکانی"هاتی"بکوژێت، ئێمە سەردەکەوین. منیش لەسەرەتاوە تا کۆتا لەو جەنگەدا لەگەڵتاندا دەبم و شەڕتان لەگەڵدا دەکەم،

سەرەڕای ئەوەش نێزە و شمشێر و قامچیەکەی خۆشم بەکاردەهێنم و هەرکەسێك ببینم کەمتەرخەمی لەئەرکەکانیدا بکات بەقامچیەکەم لەناوی دەبەم.

من لەوباوەڕەدام"هورم هب"لەم قسانەیدا تەنها مەبەستی ئەوە نیە کە هانی سەربازەکانی بدات، بەڵکو دەیەوێت پێش هێرشی"هاتی"سەربازەکانی سەرقاڵی بیستنی بیروبۆچونەکانی بن، بۆئەوەی بەهۆی چاوەڕێی هێرشی سەربازەکانی هاتیەوە دوچاری ترس و تۆقان نەبن.

کاتێك سەربازەکانی هاتی ئوردوگای خۆیان کۆکردەوە و بەڕێ کەوتن، "هورم هب" وتی: سەربازانی دوژمن بەڕێ کەوتن و سوپاسی"ئامون"و تەواوی سەربازەکانی تر دەکەم کە ئەوانیان بۆ لای ئێمە نارد. ئێستاش ئەی بۆقەکانی چڵکاوی ڕوباری "نیل"بڕۆن و پەیوەندی بەپایگاکانی خۆتانەوە بکەن و هیچ کەسێکیش نابێت بێ فەرمانی من خاڵی پاسەوانیٔ جەنگی خۆی بەجێ بهێڵێت. ئێوەش ئەی پێنج سەد سەربازی بەئەزمون و کۆنەکارەکانم، لەدوای ئەم بۆقانەوە ڕاوەستن و هەرکەسێکیان ویستی هەڵبێت بێ دودڵی بیکوژن. لەمکاتەدا"هورم هب"بەدەنگی بەرز بەسەربازەکانی وت:

من دەتوانم ئەوەتان پێڕاگەیەنم کە لەپێناو خودایانی میسر و نیشتمانی ڕەش و ژن و منداڵەکانی خۆتان بجەنگن، بەڵام ئەم ڕاسپاردەیە بە بێهودە دەزانم، چونکە ئاگاداری ئەوەم کە هەر هەلێکتان بۆ هەڵهاتن دەست بکەوێت و بتوانن خۆتان ڕزگار بکەن، تف لەژن و نیشتمانی ڕەشی خۆتان دەکەن. بۆیە پێتان دەڵێم لەپێناو پاراستنی گیانی خۆتان بجەنگن و پاشەکشە نەکەن، لەبەرئەوەی ئەگەر بەرنگاری بکەن سەردەکەون، بەڵام ئەگەر پاشەکشە بکەن بەدڵنیاییەوە بەکوشت دەدرێن، ئێستاش بڕۆن بۆئەوەی پێش گەشتنی گالیسکە جەنگیەکانی "هاتی" لەپایگاکانی خۆتاندا ئامادەبن.

لەکاتێکدا سەربازەکان هاواریان دەکرد بەرەو ڕوی پایگا جەنگیەکانیان ڕایان کرد، من توانیم لەوە تێبگەم کە ئایا هاواری ئەمانە لەخۆشیەوە سەرچاوە دەگرێت یان لەترسەوە، منیش لەدوای سەربازەکانەوە ڕاوەستام، چونکە پایگای جەنگی پزیشکێك لەگۆڕەپانی جەنگدا لەدوای سەربازەکانەوەیە، بۆئەوەی بتوانێت بریندارەکان تیمار بکات.

لەشكرى"هاتى" گاليسكەكانيان بەشێوازێكى سەربازى جوان ڕاوەستاندبوو. بەسەر سينەى پياوو گاليسكە سەربازيەكانيانەوە وێنەى خۆرێكى باڵدار دەدرەوشايەوەو ئاڵاكانيش بەلاسەرى سەربازەكانەوە دەشەكايەوە، دياربوو كە گاليسكە جەنگيەكانى"هاتى" هەوڵى ئەوە دەدەن لەوشوێنە تەختەى كە"هورم هب"لەبەردەمياندا بووەتە بەربەست تێپەڕن، چونكە لەشكرى "هاتى" نەياندەتوانى گاليسكەكانى خۆيان لەناوچە كێويەكانەوە تێپەڕێنن.

نەبونى ئاليك و ئاويش گاليسكە سوارەكانى"هاتى" ناچار دەكرد كە لەهەمان ئەو شوێنەوە تێپەڕن و هەوڵى ئەوە نەدەن سوڕێك بەدەورى بياباندا بخۆن، چونكە دەيانزانى ئەگەر پێ بنێنە ناو بيابانەوە، ئەگەر خۆشيان بەرنگارى بكەن، ئەوا ئەسپەكانيان لەبرسيەتى و تينويەتيدا دەمرن.

هەر دەستيەك لەگاليسكەكانى"هاتى"لەشەش گاليسكە پێك دەهات و هەر دە دەستە تيپێكى پێك دەهێنا، لەوباوەڕەدام خاوەنى شەشت تيپبون و لەناوەڕاستى ئەو سەربازانەى كە سيستەمێكى سەربازى جوان ڕاوەستابون گاليسكە قورسەكانيان دەبينرا. گاليسكە قورسەكان نەياندەتوانى بەخێرايى گاليسكە سوكەكان بكەونە رێ و وەك كەشتيەكانى بيابان وابون، بەڵام دەمزانى كە هەموو شتێك لەژێر خۆياندا دەفليقێنن، بۆيە سەرم لەوە سوڕ دەما كە"هورم هب"و سەربازەكانى بەچ شێوەيەك دەتوانن ڕێ لەم گاليسكانە بگرن.

دەنگى بوقى لەشكرى"هاتى"لێدرا و ئەفسەرە پلە بەرزەكان ئاڵاكانى خۆيان ڕاوەشاند و لەناكاو گاليسكەكان بەرێكەوتن.

كەوتنە ڕێى شەست تيپ گاليسكەى جەنگى كە سەربازگەلێكى لێهاتو و بەتواناى بەسەرەوە بوو، ديمەنێكى ترسناكى هەبوو و بينيم لەناوەڕاستى ئەم گاليسكانەشدا ئەسپگەلێك ڕێ دەكەن كە وەك بڵێى كەسێك بەپشتيانەوە بێت. دواى ئەوە تێگەشتم كە بەسەر پشتى هەريەك لەم ئەسپانە كەسێك سوار بووە، بەڵام بەشێوەيەك بەسەر ياڵى ئەسپەكانەوە خەوتبوون كە لەيەكەم تەماشاكردندا نەدەبينران و من زۆر سەرم لە بينينى ئەو سوارنەى كە بەسەر ملى ئەسپەكانەوە خەوتبون سوڕما، تائەوكاتەى بينيم ئەمانە بێئەوەى ئەسپەكان ڕاوەستن، ئەوەندە خۆيان شۆڕدەكردەوە بۆئەوەى دەستيان

بگاتە زەوی و بەچەقۆ ئەو پەتانە ببڕن کە ئێمە لەنزیك زەویەوە بەستونمانەتەوە بە تیرەگەلێکی بچوك و کورتەوە.

لەوکاتەی ئەو سوارانە خەریکی بڕینی ئەم پەتانە بون، سوارگەلێکی تر لەپشتیانەوە دەهاتن و ئەو نێزانەیان بەزەویدا دەچەقاند کەئالأیەکیان بەسەرەوە هەڵواسرابوو.

سودی دواین کاریان بەلامەوە ڕون و ئاشکرا نەبوو و سوارەکان ئەوەندە خێرا کاریان دەکرد کە من فریای ئەوە نەدەکەوتم کە بیرلەمانۆڕی دووەمی سوارچاکەکانی "هاتی"و چەقینی ئەو نێزە ئالأدارانەیان بکەمەوە و تێبگەم مەبەستیان لەو کارە چی بوو؟

لەناکاو"هورم هب"هاواری کرد نێزەکان لەناو ببەن و خۆدی خۆشی ڕایکرد و خۆی گەیاندە یەکێك لەو نێزانە و هەڵی کەند و فڕێی دا.سەربازەکانیشی بەهەمان شێوەی ئەو ڕایانکرد و ئەو نێزانەی کە چەقێنرابون هەڵکەند و لەپشت گۆڕەپانی جەنگەوە هەڵیان چنینە سەر یەکتر.

ئەوکات تێگەشتم کە سەربازەکانی"هاتی"بۆچی ئەو نێزانەیان بەزەویدا چەقاندوەو تێگەشتم کە مەبەستیان ئەوبوو خاڵی لاوازی بەرەی جەنگی ئێمە نیشان بدەن بۆئەوەی گالیسکەکان بەتایبەت گالیسکە قورسەکان لەوێوە تێپەڕن.

من لەوباوەڕەدابوم لەو ڕۆژەدا ئەگەر"هورم هب"زوو هەلوێستی وەرنەگرتایە و فەرمانی نەدایە کە ئەو نێزانەی چەقاندونیان هەڵکێشن و گالیسکەکان سەرکەوتنیان لەوەدا بەدەست بهێنایە کە لەو ناوچە لاوزانەوە تێپەڕن، ئەوا شکستیان بەسەربازەکانی میسر دەهێنا، چونکە دوای ئەوەی گالیسکەکان گەشتنە ناوچەی بەربەستەکانی ئێمە، بەهەموو ئەو دژواریانەی کە"هورم هب"لەسەر ڕێی ئەواندا دەینابوو، سەرەڕای ئەوەش هەندێك لەوانە سەرکەوتنیان لەوەدا بەدەست هێنا کە لەو بەربەستانەوە تێپەڕن.

خەندەقێکی بەو شێوەیە تەسك بۆ پەڕینەوەی گالیسکەکانی"هاتی"دژوار نەبوو، چونکە لەهەر تیپێکدا، هەندێکیان تەختەیەکی شێوە پردیان لەگەڵ خۆیاندا

هەڵگرتبوو و هەر ئەوکاتەی دەگەشتنە لای ئەو خەندەقەوە، تەختەکانیان دەنا بەسەر ئەو خەندەقەوە و گالیسکەکان بەسەریاندا تێدەپەڕین[40].

گەرچی هەندێك لەگالیسکەکانی "هاتی" لەو خەندەقانە پەڕینەوە، بەڵام لەبەرئەوەی زیانێکی زۆریان لێکەوت، گالیسکەکانی تر پاشەکشەیان کردو خۆیان لەم بەربەستانە پاراست و ماوەیەك ڕاوەستان، بەڵام ئەو گالیسکانەی کە تێپەڕیبون لەبەردەم تاوێرە بەردەکانـدا ڕاوەسـتان و لێخـوڕو سـەربازەکانی ئـەو گالیـسکەیە دابـەزین و هـەوڵی ئـەوەیان دا تـاوێرە بـەردەکانی سـەر ڕێیـان لا ببـەن و ڕێگایـەك بـۆ خۆیـان بکەنـەوە. خێرایی مانۆڕی سەربازەکانی "هـاتی" زۆر سەرسوڕهێنەربوو و ئاشکرابوو کە مـاوەی چـەند سـاڵێکە مەشـقیان کـردووە یـان ئـەزمونیان لەگۆڕەپانـەکانی جـەنگ وەرگرتـووە، بۆیـە ئەوکاتـەی گالیـسکەکان ڕوبـەڕوی بەربەسـتێك دەبنـەوە لەگالیـسکەکانیان دادەبەزن و بۆئەوەی ئەو بەربەستانە لەسەر ڕێیان پاك بکەنەوە.

کاتێك "هورم هب" بینی سەربازەکانی "هاتی" سەرقاڵی پاککردنەوەی بەربەستەکانی سـەر ڕێیـانن، تێگەشـت، ئەگـەر ڕێیـان پێبـدات ئـەوا لەماوەیـەکی کـەمتر لـەوەی من لـەم دێڕەدا باسی ئەو حاڵەتەتان بۆ دەکـەم ئـەو بەربەستانە لەسـەر ڕێیـان پـاك دەکەنـەوە و ڕێگـا بـۆ خۆیـان و ئـەو گالیـسکە قورسـانەی لەدوایانـەوە دێـت دەکەنـەوە، ئـەوەبوو فـــەرمانی بەســـەربازەکانی خۆیـــدا کـــە تیرهاوێـــژی ئـــەو ســـەربازانە بکـــەن کـــە لەگالیسکەکانیان پیادە بون، یان بەلایەنی کەم ئەسپەکانیان بکوژن.

سەربازەکانی "هاتی" دوای ئەوەی ئەم تاوێرە بەردانەیان لەسەر ڕێی خۆیان لابرد، لەکاتێکدا کە هەندێکیان کوژراوو برینداروو ئەسپگەلێکی کوژراویان لەدوای خۆیانەوە بەجێهێشت گەڕانەوە. سەربازەکانی ئێمەش بەگەڕانەوەی سەربازەکانی "هاتی" زۆر خۆشحاڵ بونو هاواری خۆشیان لێ بەرز بویەوە، چونکە لەوباوەڕەدا بون کۆتایی بەجەنگ هاتووە و سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە. بەڵام "هورم هب" دەیزانی کە هێشتا کۆتایی بەجەنگ نەهاتووە، بەڵکو تازە دەستی پێکردووە، بۆیە فەرمانی دا بوق

---

[40] ئێمـە لـەوباوەڕەداین کـە هـەلگرتنی پـرد لەلایـەن یەکـە سـەربازیەکانی ئـەو سـەردەمەوە، یەکێکـە لەداهێنانـە جەنگیەکانی ئەو سەردەمە، لەکاتێکدا بەپێی ئەم کتێبەی بەردەستمان، ئـەم مـانۆڕە، لەسـەردەمی سینۆهەدا کـارێکی ئاسایی بـووە و گالیـسکەکان، پـردە تەختـەیان لەگـەڵ خۆیانـدا هەڵدەگرت، بۆئـەوەی بتـوانن زۆر بەئاسـانی بەسـەر خەندەقەکاندا تێپەڕن. سودیان لەم جۆرە پردانە وەردەگرت.

لێبدەن و بەسەربازەکانی خۆی وت: بەپەلە تاوێرە بەردەکان بگەڕێننەوە جێی خۆیان، بەڵام پێش ئەوەی سەربازەکانی ئێمە بتوانن بەردەکان بخەنەوە شوێن خۆیان، گالیسکە قورسەکانی هاتی لەگەڵ گالیسکە سوکەکاندا دوبارە بەڕێکەوتن.

من لەوڕۆژەدا تێگەشتم کە جیاوازی نێوان سەبازانی لێهاتو و بەتوانا و بەئەزمون و ئەو سەربازەی کە بەپەێی پێویست مەشقیان نەکردووە چیە.

سەربازەکانی"هاتی"سەرەڕای ئەوەی هەلێکی کەمیان لەبەردەستدا بوو، لەژێر ڕێژنەی تیربارانا، دوبارە بەردەکانیان لەسەر ڕێی گالیسکەکانیان دورخستەوە، بەڵام سەربازەکان ئێمە سەرەڕای ئەوەی دوو یان سێ ئەوەندەی ئەو ماوەیەی کە"هاتی"ە کان توانیان بەردی سەر ڕێیان لاببەن هەبوو و نەیانتوانی بەردەکان بگەڕێننەوە جێی خۆیان و پێش ئەوەی بەردەکان بخەنەوە جێی خۆیان گالیسکە قورسەکانی "هاتی" گەشتن.

کاتێک"هورم هب"بینی سەربازەکانی نەیانتوانی بەردەکان بخەنەوە بەر ڕێی گالیسکەکان، لەڕێی ئەفسەرەکانیەوە فەرمانی بەسەربازەکانی خۆی دا کە بە نێزە ڕێ لەئەسپەکان بگرن و بنی نێزەکان بچەقێننە زەوی و نوکەکەشی ئاڕاستەی سینەی ئەسپەکان بکەن، بۆئەوەی بچەقێت بەسینەی ئەسپەکاندا و ڕایان وەستێن، بەڵام ئەم کارەش بەتەواوی ئەنجام نەدرا، چونکە سینە و سەر و گەردنی ئەسپی گالیسکە قورسەکان بەوەرەقی ئاسنین زرێپۆش کرابوو، بۆیە نێزەی سەربازەکانی ئێمەش نەدەچەقیەی سینەی ئەسپەکانیانەوە.

من بینیم ئەو ئەسپانەی گالیسکە قورسەکانی"هاتی"ڕادەکێشێت لەئەسپە میسریەکان بەرزتر و بەهێزرتن و لەنەژادێکی جیاوازن.

لەبەرامبەر هەریەك لەو ئەسپانە دوو داسی گەورەی پێوە هەڵواسرابوو کە جەنگاوەران دەیانتوانی لەناو گالیسکەکانیاندا دەسکی داسەکان تەکان بدەن، ئەم دوو داسەش وەك دوو داسی جوتیاری وابوو، کە خەرمانی بونایەتی سەربازەکانی ئێمەی دەرەو دەکرد و وەك گیا دەیڕشتنە سەر زەوی و دوای ئەوەش چەرخی پان و قورسی گالیسکەکانیش ئێسقانی سەربازە میسریەکانی ورد و خاش دەکرد.

کاتێك من ئەسپە مەزن و گالیسکەی قورس و زرێپۆشەکانم بینی کە لەدەمامکی ئاسنین ڕوخساری ئەسپەکانەوە شتێکی وەك شاخ هاتبووە دەر، بەهۆی بینینی ئەو جۆرە گیانەوەرانەوە لەترساندا دەلەرزیم.

داسەکانی تەکانیان دەخوارد و سەربازەکانی ئێمەیان پارچە پارچە دەکرد و گالیسکە جەنگیەکانیش بەسەر لاشەکانیاندا تێدەپەڕین، لەناکاو بینیم هیچ شتێك ناتوانێت ڕێ لە گالیسکە قورسەکانی"هاتی"بگرێت، چونکە هەموو شتێکیان لەناو دەبرد و تێك و پێکیان دەدان.

سەرەڕای ئەوەی"هورم هب"بەبەردەوامی هاواری دەکرد و بەقامچی سەربازەکانی خۆی هانی جەنگ دەدا، من بینیم کە هەوڵەکانی ئەو بێ دەرئەنجامە و گالیسکە قورسەکانی"هاتی"سات لەدوای سات سنوری بەرەکانی ئێمە دەبەزێنن و سەربازەکانمان لەناو دەبەن.

ئەوکات گەشتەمە ئەو باوەڕەی کە هیچ شتێك ناتوانێت ڕێ لەم گالیسکانە بگرێت، بەدڵنیاییەوە ئەمانە میسر داگیر دەکەن و شارەکانمان وێران دەکەن و کوشت و کوشتار دەخەنە ناو خەڵکی میسرەوە و زەوی ڕەشیش دەکەوێت ژێر دەستی ئەمانە.

ئەوکات سەرم خستە سەر زەوی و بۆ میسر و نەوەکانی دەستم کرد بەگریان.

لەدورەوە دەنگی جوڵەی گالیسکەکان و هاواری جەنگاوەران و ناڵە و قیژەی بریندااران و هاوارەکانی"هورم هب"م دەبیست، بەڵام ئەو بێ سود هاواری دەکرد، گالیسکە قورسەکان سنوری بەرەکانی ئێمەیان دەبەزاند و"هورم هب"لەوکاتەدا فەرمانی دا کە گالیسکە سوکەکانی میسر کە خێراییەکی زیاتریان هەبوو دوای گالیسکە قورسەکان بکەون و هەوڵی ئەوە بدەن کە ئەو سەربازە هاتیانەی سواری گالیسکەکانن بەتیر بکوژن.

من ئەم مانۆڕەم بەبێسودلەقەڵەم دەدا،چونکە ئەوگەردوخاکەی بەهۆی جوڵەی گالیسکەکانەوە بەرز دەبویە، دەبووە ڕێگر لەبەردەم ئەو سەربازانەی کە دەیانویست بەوردی ئامانجی خۆیان بپێکن، بگرە ئەگەر گەردوخۆڵیش نەبوایە، ئەواخودی سەربازەکان لەتیرهاوێشتندا بەوشێوەیە لێهاتوو نەبون کە بتوانن لەکاتی چوارناڵی ئەسپەکانیان، ئەو سەربازانەی کە بەسەر گالیسکەکانیانەوە غاریان دەکرد بەتیر بکوژن.

لەنکاو هاوارگەلێکی تۆقێنەر لەو سەربازانەی کە سواری گالیسکەکان بون بەرز بویەوە و من بینیم کە زەوی دەمی کردەوە و تەواوی گالیسکەکانی"هاتی"قوت دا.

ئەوکات تێگەشتم کە"هورم هب"کاتێك بەگالیسکە خێرا و سوکەکانی خۆی وت دوای گالیسکە قورسەکانی "هاتی" بکەون، مەبەستی ئەوە نەبوو سەربازەکانی ئێمە دوژمنەکانیان بەتیر بکوژن، بەڵکو مەبەستی ئەوەبوو کە گالیسکە سوك و خێراکانی ئێمە دوایان بکەون بۆئەوەی ئەسپی بەهێزی گالیسکە قورسەکانی"هاتی"بوروژێنن و خێراتر غارغارێن بکەن و لێخوڕەکانیان نەتوانن بیانگرنەوە یان خودی لێخورەکان لەترسی تیرهاوێژەکانی ئێمە خێراتر لێخوڕن و ئاگاداری ئەوە نەبن کە بەرەو نابوتی و لەناوچون دەڕۆن.

ئەم مانۆڕەی"هورم هب"زۆر بەسود و کاریگەر بوو، چونکە گالیسکە قورسەکانی "هاتی" گەشتنە لێواری ئەو خەندەقانەی کە"هورم هب" لەدواوە هەڵی کەندبوو و سەری داپۆشیبوو، بێئەوەی ئاگایان لەوە بێت کە ژێری گالیسکەکانیان خاڵیە، لەناکاو وەك ئەوەی زەوی دەمی کردبێتەوە و دژمن قوت بدات، تەواوی گالیسکە قورسەکان کەوتنە ناو خەندەقەکەوە.

سەرەتا من بەهۆی ئەو گەرد و خۆڵەی کە بەهۆی غاری ئەسپ و گالیسکەکانەوە بەرز بوبویەوە نەمتوانی لەوە تێبگەم چ باسە و هورم هب دەیەوێت چی بکات، بەڵام کاتێك گەرد و خۆڵی ناو گۆڕەپانی جەنگ نیشتەوە، سەربازەکانی خۆمانم بینی بەفەرمانی"هورم هب"لەکەنار لێواری خەندەقەکاندا ڕاوەستاون، بەڕێژنە بەرد و تیر بەسەر سەربازەکانی"هاتی"دا دەبارێنن و "هورم هب" پێی وتبون بگرە نەهێڵنن یەك کەسیش لەوانە بەزیندویی بێتە دەرەوە.

بەڵام دەستەی گالیسکە سوك و خێراکانی ئێمە دوای گالیسکەکانی"هاتی"کەوتن، چونکە دەیانزانی بۆچی دوایان دەکەون، دوای ئەوەی ئەو گالیسکانە کەوتنە ناو خەندەقەکانەوە گەڕانەوە بۆئەوەی بڕۆن بەهانای تیمی هێزی پیادەکانیانەوە و ڕێ لەو گالیسکە سوکانەی"هاتی"کە لەدوای گالیسکە قورسەکانەوە دەهاتن بگرن.

من دڵنیام کاتێك میسریەکان بینیان گالیسکە قورسەکانی"هاتی"لەناکاو لەناوچون، بەشێوەیەك خۆشحاڵ و هیواداربون کە بوێریەکی زیاتری بە بەپیاوانی ئازا بەخشی و ئەوانەش کە ترسنۆك بون ئازاتر کرد.

"هورم هب"ئاگاداری ئەوە بوو کەلایەنی ڕۆحی و دەرونی سەربازەکانی زۆر بەهێتر بووە، بۆیە بەتەواوی لایەنی ئامادەکاری سەربازەکانی خۆی قۆستەوە و پەیامی بۆ پارتیزان و چەتەکانی کە لەبەری جەنگی ئێمەدا بون نارد کە بێن بەهانامانەوە.

ئەوکات تەواوی هێزی میسر، بەواتا گالیسکە و پیادە و پارتیزانەکان بەهەموو توانایەکیانەوە دوای گالیسکە سوکەکانی"هاتی"کەوتن، ئەمەش بووە مایەی سەرسوڕمانی دوژمن، بۆیە بۆ یەکەمین جار لەگۆڕەپانێکی تەختدا، گالیسکەکانی "هاتی"بەزیانێکی زۆر قورسەوە پاشەکشەی کرد.

بەلایەنی کەم هیچ یەك لەگالیسکە قورس و سەرنشینەکانی بەزیندویی نەمان، چونکە دوای ئەوەی ئەسپەکان کەوتنە ناو خەندەقەکانەوە بەهۆی قورسی گالیسکەکان هەموویان کوژران، یان دەست و پێیان بەشێوەیەك شکابوو کە هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ مەرگدا نەبوو، هەروەها سەربازەکانی میسریش نەیانهێڵا سەربازەکانی "هاتی" زیندوو یان بەبێ زیان لەو خەندەقانە بێنە دەرەوە، بۆیە هەمویانیان یان کوشت یان بریندایان کردن.

کاتێك ئەفسەرانی"هاتی"زانیان تەواوی گالیسکە قورس‌و بەشێکی زۆر لە گالیسکە سوکەکانیان لەناو چون، دوای ئەوەی پاشەکشەیان کرد، کوبونەیەکی تایبەتیان ڕێکخست، بیروبۆچونێکی جیاواز لەلایەن ئەندامانی ئەو کۆڕە خرایە ڕوو. ئەوان بۆیەکەمین جار گرفتاری بارودۆخێك بون کە پێشتر هەرگیز توشی نەبون و نەیاندەزانی بەچ شێوەیەك دەبێت چاکسازی تێدا بکەن.

"هورم هب"پاشەکشەو کۆبونەوەکەی ئەوانی قۆستەوە و لەترسی ئەوەی بەدەوری بەرەی جەنگی ئێمەدا بسوڕێنەوە و لەپشتەوە بۆمان بێن، بۆیە پارتیزان و چەتەکانی ناردە ئەملاوولای بەرەکەوەو سەربازەکانی خۆشمانی لەوە ئاگادار کردەوە کە بەربەست لەسەر ڕێی گالیسکەکانی"هاتی"دا دروست بکەن، بۆئەوەی ئەگەر جارێکی تر هەوڵی هێرش کردن ببەن نەتوانن لەو بەربەستانەوە تێپەڕن.

ئەفسەرو سەربازەکانی"هاتی"بەڕادەیەك هەڵەشەبوون کە سەرەڕای ئەوەی بەچاوی خۆیان بینیان بەچ شێوەیەك گالیسکە قورسەکانیان لەناوچون دوبارە هێرشیان کردەوە، بەڵام چیتر سەربازەکانی ئێمە لەسەربازەکانی"هاتی"نەدەترسان، کاتێکیش

گالیسکە سوکەکانی ئەوان گەشتنە بەربەستەکانی ئێمە هەندێکیانمان بەزیندویی دەستگیر کردن.

من لەو هێرشەدا بەهۆی تەپ و تۆزی گالیسکەکانەوە، گۆڕەپانی جەنگم نەدەبینی، بەڵام دوای ئەوەی کۆتایی بەو جەنگەش هات و"با"ی بیابان ئەو تەپ و تۆزە لەناو برد، تێگەشتم کە ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکانی میسر لەو هێرشەدا کوژراون. لەکاتێکدا کە لەم هێرشەیاندا گالیسکەی قورسی تێدا نەبوو.

کاتێك کۆتایی بەو جەنگەش هات، ئەوەم لەسەربازە میسریەکان بیست کە دەیانوت ئەمڕۆ تەپ و تۆز بووە هۆی ئەوەی ئێمە بەباشی گۆڕەپانی جەنگ نەبینین، ئەگینا بەهۆی بینینی لاشەی لەڕادەبەری کوژراوی سەربازە میسریەکان بەشێوەیەك دەتۆقاین کە نەماندەتوانی بەردەوامی بەجەنگ بدەین.

لەکۆتایی ئەو ڕۆژەدا سەرباز و گالیسکەکانی"هاتی"کاتێك زانیان بەرگری کردنیان بێسودە خۆیان دا بەدەستەوە و"هورم هب" فەرمانی دا کە دیلەکانی"هاتی" لەسێدارە بدەن و سەربازەکانی ئێمەش وەك بڵێی تەماشای گیانەوەرێکی سەیر دەکەن بەسەر سوڕمانەوە لێیان نزیك دەبونەوە و دەستیان لەجەستەیان دەدا بۆئەوەی بزانن ئایا وەك خۆیان پێست و گۆشتیان هەیە یان جەستەیان بەکەرەستەیەکی جیاواز دروست کراوە.

هەندێك لەسەربازەکانی ئێمە وێنەی خۆری باڵداری لەسینەی سەربازەکان هەڵدەکەند و وەك یادگاریەك لەلای خۆیان هەڵیاندەگرت، بۆئەوەی کاتێك گەڕانەوە بۆ میسر پیشانی ئاشنا و هاوڕێکانیان بدەن و سەریان بەو وێنەیە سور بهێنن، بەڵام لەخۆری باڵدار سەیرتر ئەو کڵاوە ئاسنینانەبوو کە ئەفسەرانی"هاتی"لەسەریان دەکرد و بەسەر کڵاوەکەیانەوە دوو تەوری یەکتربڕی پێوە هەڵواسرابوو. سەربازەکانی ئێمەش تا ئەو ڕۆژە نەیاندەزانی کە ئاسن چ جۆر کانزایەکە، بۆیە زۆر سەیریان لەو کڵاوە ئاسنینەکان دەهات.

"هورم هب"سەرەڕای ماندویەتیەکی زۆر بەڵام زۆر خۆشحاڵ بوو و بەنێو سەربازە میسریەکاندا پیاسەی دەکرد و لەدەستەیەکەوە دەڕۆشت بۆ ئەو دەستەکەی تر و بەشێوەیەکی دۆستانە دەستی بەپشتی سەربازەکاندا دەکێشا و دەیوت: ئافەرین ئەی بۆقەکانی چڵکاوی ڕوباری"نیل"، ئەمڕۆ زۆر باش شەڕتان کرد، ئایا لەبیرتانە کە

ئەمرۆ بەرەبەیان پێم وتن ئەگەر ئەرکی خۆمان ئەنجام بدەین سەردەکەوین، ئێستاش دەبێت لایەنگری ئەوە بکەن کە من لێکدانەوەیەکی باشم بۆ ئەو بارودۆخە کردبوو.

"هورم هب"فەرمانی دا کە نان و ئاوجۆ بدەن بەسەربازەکان و دوای ئەوەی نان و ئاوجۆیان خوارد و خواردەوە، ئازادیان بکەن بۆئەوەی برۆن ئەوەی سودی بۆ ئەوان هەبێت لەسەربازە کوژراوەکانی"هاتی"وبگرە گوژراوە میسرەکان بۆخۆیان کۆبکەنەوە.

"هورم هب"دەیزانی کە کوژراوەکانی"هاتی"و میسریەکان شتێکی شایستە و بەنرخیان پیْ نیە، بەلاّم دەیویست سەربازەکانی والێکی بدەنەوە کە سەرکەوتنیان لەبەدەست هێنانی دەستەکەوتە جەنگیەکاندا هێناوە. بەلاّم باشترین دەسکەوتی جەنگ کە دەستی سەربازەکان ناکەوێت، بەلْکو دەکەوێتە دەستی لەشکری میسرەوە، گالیسکە و ئەسپەکانی"هاتی"بوو و "هورم هب" دەیزانی کە ئەسپەکان برسی و تینویانە، بۆیە بەو میسریانەی شارەزاییەکی تەواویان لەبەخێوکردنی ئەسپدا هەیە پێی وتن: ئالیك و ئاوێکی باش بدەن بەم ئەسپانە. ئەسپەکان کە لەزمانی"میسر"ی تێنەدەگەشتن، هەروەها کاتێك چاویان بە پەرستیارە تازەکان کەوت، یەکسەر توڕەیی خۆیان دەربڕی، بەلاّم میسریەکان ئالیك و ئاویان پێدان و ئەوکات بەزمانێکی نەرم و نیان قسەیان لەگەلْ ئەسپەکاندا کرد.

ئەسپ گیانەوەرێکی هۆشیارە، بگرە ئەوکاتانەش لەزمانێکی بیانیش تێناگات، لەرێی ئاوازی دەنگەکانەوە دەتوانێت تێبگات کە ئایا دەیانەوێت هەستی خۆشەویستیان بۆ دەربڕن یان نە؟ کاتێکیش ئاگاداری ئەوەبون کە دەیانەوێت سۆز و خۆشەویستی خۆیان پێشکەش بکەن، یەکسەر مالْیان دەبن.

"هورم هب"دوای ئەوەی سەرکەوتنی لەبەدەست هێنانی برێك ئەسپ و گالیسکەدا هێنا، داوای لەچەتەکان کرد پەیوەندی بە لەشکرەکەی ئەوەوە بکەن و لەبەشی گالیسکە جەنگیەکانیاندا کاربکەن، لەبەرئەوەش چەتەکانی بانگێشتی ئەوە کرد لەریزی کالیسکە جەنگیەکانیدا کاربکەن، چونکە دەیزانی ئەوان لەپەروەردە کردنی ئەسپدا لەمیسریەکان شایستەترن، چونکە میسریەکان لەئەسپ دەترسن، لەکاتێکدا چەتەکان لەم جۆرە گیانەوەرانە ناترسن.

دوای کۆتایی هاتنی ئەو جەنگە، هەموو سەربازە تەندروستەکان حەوانەوە، بەلاّم من نەمدەتوانی بحەوێمەوە، چونکە ناچاربوم تیماری بریندارەکان بکەم و برینەکانیان

بپێچم و نەشتەرگەری کاسەی سەری ئەوسەربازەکانەش بکەم کە گورزی دوژمنیان بەرکەوتبوو، بۆیە شەو و ڕۆژ لەکاتێکدا کۆمەڵێك کە لەبرین پێچی و نەشتەرگەریدا هاوکاریان دەکردم، من سەرقاڵی برینداران بوم، لەم شەو و ڕۆژانەدا کۆمەڵێك لەو بریندارانەی کە چارەسەرکردنیان مەحاڵبوو مردن، دوای ئەوەش"هورم هب"دەستی کرد بە نۆژەنکردنەوە و بەهێزکردنی گالیسکە جەنگیەکانی و هەموو ڕۆژێك سەربازە میسریەکانی هانی ئەوەدا مەشق لەسەر گالیسکە جەنگیەکان بکەن.

"هورم هب"دەیوت: گەرچی ئێمە لەم جەنگەدا بەهۆی بەربەستە زەمینیەکانەوە سەرکەوتنمان بەدەست هێنا، بەڵام بۆئەوەی بتوانین سوریا لە"ئازیرو"و"هاتی" وەرگرینەوە، پێویستمان بەگالیسکەی جەنگی دەبێت. چونکە تەنها لەڕێی گالیسکە جەنگیەکانەوە دەتوانێت سەرکەوتن بەسەر گالیسکە جەنگیەکانی دوژمندا بهێنین و "ئازیرو"و "هاتی"یش لەسوریادا خاوەنی گالیسکەگەلێکی جەنگی زۆرن، سەرەڕای ئەوەش سەربازەکانی هێزی پیادەی"هاتی"بەشداریان لەم جەنگەدا نەکرد، بۆیە هیوادارم ئێستا ئاگاداری شکستی گالیسکەکانی خۆیان بن و هێزی پیادەی سەربازی خۆیان بنێرن بۆ بیابان، لەم حاڵەتەدا من لەڕێی گالیسکە و هێزی سەربازی پیادەکانی خۆمەوە لەناویان ببەم. بەڵام هێزی سەربازی"هاتی"نەهات بۆ بیابان و لەمەرزی سوریاوە تەکانی نەخوارد، وەك بڵێی سەربازی دوژمن بەهیوای ئەوەیە"هورم هب"هێرشیان بۆ ببات، لەوکاتەدا دڵنیابوو لەوەی شکست بەسەربازە ماندووەکانی "هورم هب" دەهێنێت، بەڵام"هورم هب"دەیزانی تا ئەوکاتەی هێزی سەربازی خۆی لەڕوی گالیسکە جەنگیەکانەوە بەهێز نەکات، نابێت بڕوات بۆ جەنگی سوریا دژی "ئازیرو" و" هاتی".

هەواڵی سەرکەوتنی"هورم هب" لەبیابانی سوریادا دەنگدانەوەیەکی مەزنی هەبوو، هەندێك لەشارەکانی سوریا ڕاپەڕین، چونکە خەڵکی سوریا لە پلەوپایەخوازی و لەخۆبایی"ئازیرو"و تەماعی و بێبەزەیی"هاتی"ەکان بێزار ببون، سەرەڕای ئەوەش ناکۆکی و ڕکابەریەکی بەردەوام کەوتە نێوان شارەکانی سوریاوە و ئەوان هەموو هەلێکیان دەقۆستەوە، بۆئەوەی ڕق و کینەی خۆیان بەسەر شارەکانی تردا خاڵی بکەنەوە.

سەرەڕای ئەوەش"سیخوڕەکان"ی"هورم هب"یش بەردەوام داری وشکیان هەڵدەدایە ناو ئاگری ناکۆکی نێوان شارەکانی سوریاوە و لەبارەی شکست پێهێنانی گالیسکە جەنگیەکانی "هاتی"لەبیاباندا هەواڵێکی ڕاوەشێنیان بەنێو خەڵکیدا بڵاو دەکردەوە بۆئەوەی خەڵکی بەهێز و توانای میسر چاوترسێن بکەن و دەیانوت کە چیتر کۆتایی بەقۆناخی سستی و لاوازی میسر هاتووە، چونکە چیتر"ئاتون"خودای میسر نیە و خودای هەمیشەیی ئەو وڵاتە بەناوی"ئامون" فەرمانڕەوایی ئەویٚ دەکات و"ئامون"خودایەکی بەهێز و بێبەزەیی و دەغەزنە، کە وەك ڕوبار خوێنی ئەو کەسانە دەڕژێنێت کەدژمنی میسرن.

لەکاتێکدا"هورم هب"سەربازەکانی خۆی هانی مەشقکردن دەدا و ئەو کێوەی کە لەتەنیشتیەوە بەسەر هێزی سەربازی"هاتی"دا سەرکەوت ناوی"کێوی سەرکەوتنی" لێنا، چەند پەیامنێرێکی نارد بۆ"غەزە"و لەهەموو ئەو پەیامانەی بۆی ناردبون پێی دەوتن بەرگری بکەن.....بەرگری بکەن، چونکە دەیانزانی هەرکاتێك"غەزە"خۆڕاگری نەکات و بکەوێتە ژێردەستی هێزە سەربازیەکانی"هاتی"و"ئازیرۆ"وە، ئەوا چیتر ئەو پایگایەکی بەهێز و دڵنیای نابێت بۆ هێرش بردنە سەر وڵاتی سوریا.

"هورم هب"چەند کاربەدەستێکی دەستنیشان کرد کە لەنێو سەربازەکانی خۆیدا باسی سوریایان بۆ بکەن و پێیان بڵێن ئەوەندە زێڕ و زیو لەسوریادا هەیە کە ئەگەر هەر لەشکرێکی بیانی بچێتە ناو سوریاوە، ئەوا هەر سەربازێك بەکێشانەی خۆی دەتوانێت زێڕو زیو بەدەست بهێنێت، بەتایبەت یەکێك لەوشتانەی کە کاربەدەستەکانی "هورم هب"باسیان دەکرد ژنەکانی پەرستگای"عەشتار"ی سوریا بوو.

لەوبارەیەوە دەیانوت کە پەرستگای"عەشتار"ی شارەکانی سوریا پڕە لە ژنی لاوو جوان کە هاوشێوەیان لەمیسر و هیچ شوێنێکی تردا بەدی ناکرێت و ئەم ژنانە پێشکەشی ئەوە کراون کە تەنها خزمەتی"عەشتار"بکەن و خۆیان بخەنە بەردەست پیاوانەوە، بەتایبەت پیاوەکانی میسر. بۆئەوەی لەگەڵیاندا ڕابوێرن، چونکە ژنەکانی پەرستگای"عەشتار"هەر جارێك لەگەڵ پیاوێکی میسریدا ڕابوێرن، وا هەست دەکەن کە "عەشتار"خۆشبەتی جاویدانی پیٚ بەخشیون.

ڕۆژێکیان پیاوێك لەبیابانەوە هات و لەبرسی و تینواندا هێزی لەبەر بڕابوو خۆی کرد بەئۆردوگاکەی ئێمەدا و سەربازە میسریەکانیش دەستگیریان کرد، بەڵام ئەو وتی: دەبێت هەر ئێستا چاوی بە"هورم هب" بکەوێت.

سەربازەکانیش دەمودەست کردیانە گاڵتەجاڕی خۆیان، بەڵام لەدواییدا ناچاربون بە"هورم هب" بڵێن کە ئەو پیاوە دەیەوێت چاوی پێت بکەوێت.

"هورم هب"سەر لەئێوارەکەی پێشوازی لەو پیاوە کردو ئەو پیاوەش کە جلێکی "سریانی" لەبەردابوو لەبەردەم"هورم هب"دا کڕنوشی بردو دەوای ئەوە دەستی خستە سەرچاوی وەك ئەوەی چاوی ئێشی هەبێت.

"هورم هب" لێی پرسی: ئایا هیچ مێرولەیەك تۆی گەستووە.

پیاویش وتی: بەڵێ ئەی"هورم هب"، "ئاودزەك[41]"ێك منی گەستووە... منیش سەرم لەم قسەیە سوڕما، چونکە"ئاودزەك"هیچ کەسێك ناگەزێت، بەڵام ئەو پیاوە وتی: لەسوریادا دە جۆر"ئاودزەك"هەیە و هەموشیان ژەهراوین.

"هورم هب"وتی: سلاوت لێ بێت ئەی پیاوی خۆڕاگر و ئازا و دلێر، ڕونتر قسە بکە، چونکە ئەو پیاوەی کە دەیبینی، پزیشکە و وەك گیانەوەرەکان ناتوانێت لەوە تێبگات ئێمە چی دەڵێین.

پیاویش لەوەلامی"هورم هب"دا وتی: گەورەم هورم هب"یونجە"خۆی پیادا کرد.

کاتێك من گوێم لەم قسانە بوو، تێگەشتم کە ئەو یەکێکە لەسیخوڕەکانی"هورم هب"و بەهێما قسەی لەگەڵدا دەکات.

"هورم هب"کاتێك گوێ لەم قسەیە بوو لەچادرەکەی ڕۆشتە دەرەوە و فەرمانی دا کە لەسەر کێوی سەرکەوتن ئاگرێك هەڵگیرسێنن.

زۆری نەخایاند کە ئاگرگەلێکی تر لەسەر کێو و تەپۆڵکەکان تا سنوری میسر دەرکەوتن و من تێگەشتم کە فەرماندەی لەشکری"میسر"لەڕێی ئەو ئاگرەوە، پەیامێکی نارد بۆ"تانیس"و ئەو پەیامەش ئەوەبوو کە کەشتیە جەنگیەکانی میسر

---

[41] ئاودزەك: مێرولەیەکە لەجۆری"کوللە"و ڕەنگێکی قاوەیی هەیە و پێکانی ددانێکی تیژی هەیە و کە لەژێر زەویدا چاڵ بەو ددانانە دەکەنێت و زیان بەڕیشکی گیاکان دەگەیەنێت......سەرچاوە"فەرهەنگی عەمید"..وەرگێڕ.

لە"تانیس"ەوە بکەونە ڕێ و بەرەو"غەزە"بڕۆن بۆئەوەی لەگەڵ هێزی دەریایی سوریادا بجەنگێن.

بەیانی ڕۆژی دەوایی"هورم هب"فەرمانی دا فو بە بوقەکاندا بکەن و ئۆردوگاکەیان کۆکردەوە و لەشکری میسر لەکاتێکدا کە گالیسکەکان لەپێشیانەوە دەڕۆشتن، ڕێگای سنوری سوریایان گرتە بەر، من نەمدەزانی کە"هورم هب"بەچ هیوایەك دەیەوێت لەدەشتێکی تەخت و بێ بەربەستدا لەگەڵ لەشکری سەربازی"هاتی"دا کە خاوەنی گالیسکەی بەهێزی جەنگە بەشەر بێت.

سەربازەکان بەخۆشحاڵیەوە بەرەو سوریا بەڕێ کەوتن، چونکە دەیانزانی لەوێدا دەستکەوتی زۆر بەدەست دەهێنن و لەگەڵ ژنە جوانەکانی پەرستگای"عەشتار"دا ڕادەبوێرن. منیش سواری کەژاوەکەی خۆم بوم و لەدوای لەشکری میسرەوە کەوتمە ڕێ و کێوی سەرکەوتنو ئێسقانی کوژراوەکانی"هاتی"و میسر کە برایانە تێکەڵی یەکتری بوبون لەدوای خۆمانەوە بەجێ هێشت.

*بەشی چل و نۆیەم*

## باسی خۆڕاگری ڕاوەشێنی"غەزە"

ئێستاش باسی جەنگی سوریا دەکەین، بەڵام من بەکورتی باسی ئەم جەنگە دەکەم، چونکە من پیاوێکی جەنگاوەر نیم کە بتوانم لەوە تێبگەم لەڕوی هونەری جەنگەوە جیاوازی جەنگێك لەگەڵ جەنگەکانی تردا چیە؟

بەبۆچونی من هەموو جەنگەکانی لەیەك دەچن، چونکە لەتەواوی ئەم جەنگانەدا وڵاتەکان وێران دەکرێن وماڵەکان دەسوتێن و خەڵکی بەکوشت دەدرێت و شیوەنی ژن و منداڵەکان ڕۆحەکان خەمگین دەکەن.

لەبەرئەوەی ئەم ڕوداو و دیمەنانە لەهەموو جەنگەکاندا دوبارە دەبێتەوە، ئەگەر بمانەوێت باسی جەنگێکی درێژخایەنی سوریا کە سێ ساڵ درێژەی کێشا بکەین، ئەوا سەرگوزەشتی ژیانی من یەك شێوە ژیان لەخۆ دەگرێت.

تەنها ئەوە دەڵێم کە زۆرێك لە دێهاتەکانی سوریا وێران بون و درەختە میوەدارەکانیشیان لەباخەکاندا بڕی، بۆئەوەی بەشێوەیەکی ئاسانتر بتوانن میوەکانیان بخۆن، دانیشتوانی شارە مەزنەکانیش کەم بونەوە.

کاتێك"هورم هب"خۆی کرد بەسوریادا، پەنای بۆ فێڵێك برد کە زۆر پێویست بەوە ناکات لێرەدا باسی بکەین، بۆیە دوای ئەوەی خۆی کرد بەسوریادا، سەربازەکانی ئازاد کرد لە لادێکاندا سامانی خەڵکی تاڵان بکەن و ژنەکانیان بەدیلی بگرن، بۆئەوەی سەربازەکان بزانن کە لەجەنگی سوریادا، سودێکی شایستەیان بەدەست هێناوە و ڕابواردنێکی زۆریش لەگەڵ ژنانی ئەوێدا دەکەن، بەڵام دوای ئەوەی سەربازەکان بۆماوەیەك ڕایانبوارد"هورم هب"ڕێی لێگرتن و ڕاستەوخۆ ڕۆشت بەرەو"غەزە".

نزیك بونەوەی هێزەکانی هورم هب"لەغەزە"هاوکات بوو لەگەڵ گەشتنی وەرزی "سەرما". کاتێك لەشکری"هاتی"بینی"هورم هب"دەیەوێت بچێتە ناو"غەزە"وە بەخێرایی بەرەیەکی لەنزیك"غەزە"وە دروست کرد، بۆ ئەوەی ڕێ لە"هورم هب" بگرێت و لەشکری"هاتی"یش دەیزانی لەبەرئەوەی لەبەردەم"غەزە"دا دەشتێکی فراوان هەیە، بەگالیسکەکانی لەماوەیەکی کورتدا هیزی سەربازی میسر لەناو دەبات.

بەهۆی گەشتنی وەرزی"زستان"لەشکری"هاتی"ناچاربوو بۆ دابین کردنی ئالیك بۆ ئەسپەکانیان"ئالف"لە سەوداگەرەکانی سوریا بکڕن و دوای ئەوەی ئالیکیان دا بە ئەسپەکانیان، ئەسپەکانیان نەخۆش کەوتن و پاشەڕۆکانیان ڕەنگێکی سەوز و شل بوبویەوە و زۆرێکیش لەئەسپەکان تۆپین، بۆیە گالیسکەکانی"هاتی"و لەشکری سوریا"لەشکری ئازیرو پادشای سوریا"بێ ئەسپ مانەوە.

لەشکری"هاتی"و سوریا نەیانتوانی سود لەگالیسکەکانی خۆیان وەرگرن بۆئەوەی ڕێ لە"هورم هب" بگرن و"هورم هب"یش کە لەڕوی گالیسکەوە لە دوژمن باشتر بوو، زۆر بەزویی گالیسکەکانی ئەوانی لەناو برد و دوای ئەوەش سەرقاڵی لەناوبردنی هێزی پیادەی"هاتی"و سوریا بوو، بۆیە لەبەردەم"غەزە"شدا شکستی پێ هێنان.

زۆرێك لەسەربازەکانی"هاتی"و سوری و میسری لەو جەنگەدا بەکوشت دران و لاشەکانیان لەسەر زەوی مانەوە، بۆیە دوای ئەو جەنگە ئەو دەشتەیان بەناوی "دەشتی ئێسقان"ەکان بانگ دەکرد.

کاتێك هێزی سەربازی"هاتی"و سوریا لەبەردەم شاری"غەزە"دا شکستی هێنا و"هورم هب"ئۆردوگاکەیانی تالاّن کرد، فەرمانی دا کە هەرچی ئالیکی ئەو ئۆردوگایە هەیە بیسوتێنن، بۆئەوەی ئەم ئالیکە نەدەن بەئەسپەکانی خۆیان، ئەوکات تێگەشتم ئەو ئالیکەی کە لەشکری سوریا و"هاتی"لە سەوداگەرەکانیان کڕیبو، ژەهراوی کرابوو، ژەهریان تێکەڵی ئالفەکە کردبوو.

هێشتا من نەمدەزانی کە"هورم هب"بەچ فێڵێك توانی ئالف فرۆشەکانی سوریا هانی ئەوە بدات کە ئالفی وشك و ژەهراوی بفرۆشن بەسەربازەکانی سوریا و"هاتی"، بۆئەوەی ئەسپەکانیان لەناو بچن و گالیسکەکانیان بێ ئەسپ بمێننەوە.

دوای ئەوەی سەربازەکانی دوژمن لەبەردەم"غەزە"دا شکستیان هێنا"هورم هب"ویستی بڕواتە ناو"غەزە" کە لەکەنار دەریا و لەنگەرگادایە.

لەهەمان ئەوکاتەدا هێزی دەریایی میسر کە لە"تانیس"ەوە کەوتبونە ڕێ، بەبارودۆخێکی خراپەوە خۆیان کرد بە"غەزە"دا. چونکە کەشتیە جەنگیەکانی "میسر"دوای ئەوەی نزیکی"غەزە" بونەوە ناچاربون لەگەڵ کەشتیە جەنگیەکانی هاتی و سوریادا بجەنگێن، بۆئەوەی ڕێگا بۆخۆیان بکەنەوە. دوای ئەم شەڕە کۆمەڵێك لەکەشتیە میسریەکان نوقم بون و کەشتیەکانی تریش ویستیان زوتر خۆیان بگەیەننە لەنگەرگای"غەزە"بۆئەوەی خۆیان لەهێرشی کەشتیەکانی دوژمن بپارێزن، بەڵام فەرماندەی سەربازی لەنگەرگای"غەزە"لەنگەرگاکەی بەڕویاندا نەکردەوە و وتی: من نازانم ئایا ئێوە میسرین یان بۆئەوەی فریومان بدەن لاسایی هێما جەنگەیکانی میسرتان کردووەتەوە.

فەرماندەی شاری"غەزە"کە فەرمانڕەوایی سنوری لەنگەرگاشی دەکرد، بەڕادەیەك گوماناوی بوو کە بگرە دەروازەی شاریشی بەڕوی"هورم هب"دا نەکردەوە، بۆیە"هورم هب"ناچاربوو بۆماوەیی ڕۆژێك لەپشت حەساری شارەوە ڕاوەستێت، بۆئەوەی فەرماندەی پایگا سەربازیەکانی"غەزە"ڕێی پێبدەن بچێتە ناوەوە و دوای ئەوەی ئەو فەرماندەیە ڕازی بوو لەسەر ئەوەی"هورم هب" بێتە ناوەوە، وتی: ئەو دەبێت لەشکرەکەی خۆی لەدەرەوەی شاردا ڕابگرێت و تەنها خۆی بێتە ناو شارەوە، و دوای لێکۆڵینەوەیەکی درێژ بۆی دەرکەوت کە ئەو"هورم هب"ە، ئەوکات ڕازی بوو لەسەر ئەوەی سەربازەکانیشی بێنە ناو شارەوە.

ئەوڕۆژەی دەروازەکانی شاری خۆڕاگری"غەزە"بەڕوی"هورم هب"دا کرایەوە و خۆی کرد بەناو ئەو شارەدا، لەئێستای میسردا بەبۆنەی ئەو ڕۆژەوە، ڕۆژێك دەکرێت بەجەژن کە تایبەتە بە"سخ مت"ی خودای جەنگ و لەم ڕۆژەدا منداڵە میسریەکان بەگورزی دارین و نێزەی قامیشی، لەگەڵ یەکتردا بەشەڕ دێن و خۆیان بەیاری جەنگی "غەزە"وە سەرقاڵ دەکەن.

بێگومان، هەرگیز شارێکی وەك شاری"غەزە"لەبەردەم دژمنەکەیدا بەوشێوەیە خۆی ڕانەگرتووەو هیچ سوپاسالارێکی جەنگیش لەشارێك گەمارۆ بدرێت، وەك سوپاسالاری"غەزە" ناتوانێت لەبەرامبەر دوژمندا خۆی ڕاگرێت.

بۆیە بەپێویستی دەزانم کە من ناوی ئەم فەرماندەیە لەم سەرگوزەشتەیەدا بنوسم، چونکە کاتێك من باڵوێزی میسر بوم و لەگەڵ"ئازیرو"پەیمانی ئاشتیم مۆر کرد، ئەو

ڕێی پێنەدام لەڕێی دەروازەوە بڕۆمە ناو ئەو شارەوە، بەڵکو منی بەسەبەتەیەکەوە بەست و بەپەت ڕایکێشامە سەر دیواری حەساری شار و لەوێوە چومە ناو ئەو شارەوە.

ئەم پیاوە ناوی"ڕوژو"بوو و سەربازەکانی بەناوی"سەرەگا"بانگیان دەکرد، چونکە لەڕوی جەستەییشەوە لە"گا"یەکی نێردەچوو، لەڕوی ڕۆحیەت و ڕەوشتیشەوە من هیچ پیاوێکم وەك"ڕوژو" نەبینیوە کە بەدگومان و ئینکار بێت.

لەوڕۆژەدا ڕازی بوو"هورم هب"بێتەناوشارەوە، سەرەڕای ئەوەی ئەوەئاشکرابووکە "هورم هب" سوپاسالاری میسرەو لەبیابانی"سینا"دا شکستی بەسوپای"هاتی" هێناوەو لەشکری "هاتی"و سوریای لەبەرامبەرشاری"غەزە"دا تێكوپێك دا، سەرەڕای ئەوەش نەیدەویست ڕێ بەسەربازەکانی "هورم هب" بدات بێنە ناو شارەوە و دەیوت لەوانەیە ئەمانە سەربازەکانی سوریاو"هاتی"بن کە جلی سەربازەکانی میسریان لەبەرکرووە.

دوای ئەوەی سەربازەکانی میسر چونە ناو شاری"غەزە"وە، هەموویان خۆشحاڵ بون بێ لە"ڕوژو"، چونکە ئەو پیاوە بۆماوەی چەند ساڵێکە لەناو ئەو شارەدا گەمارۆ درابوو، گەرچی لەژێر فەرمانی"هورم هب"دابوو، بەڵام بەوە ڕاهاتبوو کە لەبارەگای فەرماندەیی خۆیدا سەرکردەی ڕەها بێت و هیچ کەسێك فەرمانی بەسەردا نەدات، بەڵام هاتنی"هورم هب"دەبووە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی کە ئەو بتوانێت لەئایندەدا بێئەوەی کەسێك فەرماندەی بێت فەرمانڕەوایی بکات.

من لەوباوەڕەدام کە"ڕوژو"ی ناسراو بە"سەرەگا"تاڕادەیەك شێت بوو و زۆریش ئینکاربوو، بەڵام بێ ئەو شێتی و ئینکاریەی نەیدەتوانی بۆماوەی چەند ساڵێك لەبەرامبەر هێرشە سەربازیەکانی"هاتی"و سوریادا خۆی ڕابگرێت و شاری غەزە لەدەست نەدات.

"ڕوژو"ی سەرەگا پێشینەی جەنگی ئەوتۆی نەبوو کە شایەنی ستایش بێت و لەبەرئەوەش کردیان بەفەرماندەی پایگا سەربازیەکانی"غەزە"بۆئەوەی لە"میسر" دوری بخەنەوە، بۆئەوەی خۆیان لەئینکاری و شێتیەکانی ڕزگار بکەن، چونکە"غەزە" یەکێك بوو لەو خاڵانە کە کاتێك کەسێك دەردیسەری بۆ دروست بکردنایە و بیانویستایە لەمیسر دوری بخەنەوە دەیاننارد بۆ"غەزە". بەڵام دوای ئەوەی"ئازیرو"

لەسوریادا شۆڕشی بەرپاکرد"غەزە"بەرنگاری لەخۆی کرد، ئاشکرابوو کە"رۆژو" جەنگاوەرێکی شایشتەیە و گومانی تێدا نیە ئەگەر"غەزە"خاوەنی حەسارێکی بەرز نەبوایە"رۆژو"نەیدەتوانی بەرگری تێدا بکات.

حەساری"غەزە"بە بەردەگەلێکی گەورە دروست کرابوو دەیانوت ئەم حەسارە لەسەردەمانێکی زۆر کۆندا دێوەکان دروستیان کردووە، بگرە سەربازەکانی"هاتی"کە هەموو قەڵایەکیان وێران دەکرد و دەستیان بەسەردا دەگرت، نەیانتوانی زاڵبن بەسەر ئەو حەسارەدا، بەڵام لەبەرئەوەی لەشکری"هاتی"هەڵگری هونەرە جەنگیەکان بوو، توانی کونێك بکاتە ژێری یەکێك لە منارەکانی حەسارەوە و بیڕوخێنێت.

"غەزە"پێش ئەوەی گەمارۆ دانەکەی دەست پێبکات، لەدوو شار پێك هاتبوو، یەکێکیان شاری کۆن، کە لەناو حەساردا بوو، ئەویتریان شاری نوێ کە لەدەرەوەی حەسار بوو.

کاتێك شۆڕشی"ئازیرو"دەستی پێکرد"رۆژو"فەرمانی دا شاری تازە کە دەکەوێتە دەرەوەی حەسارەوە وێران بکەن، ئەو بۆ پاراستنی بەرژەوەندی سەربازی خۆی ئەو فەرمانەی دەکرد، چونکە لەو کاتەدا، هێشتا"ئازیرو"بیری لەداگیرکردنی "غەزە" نەکردبویەوە، بەڵکو بۆئەوەی ناکۆکی بخاتە نێوان خۆی و ڕاوێژکارەکانیەوە ئەو فەرمانەی دەرکرد.

ڕاوێژکارەکانی وتبویان: شاری نوێ کە دەکەوێتە دەرەوەی حەسارەوە، لەوانەیە یەکەمین ناوچەی بەرگریکاری ئێمە بێت، بەڵام"رۆژو"بۆئەوەی ناکۆکی بخاتە نێوان خۆی و ئەوانەوە، فەرمانی وێرانکردنی ئەوشارەی دەرکرد.

دانیشتوانی شار کاتێك بیستیان"رۆژو"فەرمانی دەرکردووە ماڵەکانیان وێران بکات و شاری نوێ لەناو ببات ڕاپەڕین و داوای هاوکاریان لە"ئازیرو"کرد، بەڵام پێش ئەوەی"ئازیرو"بەهانایانەوە بێت"رۆژو"قڕی خستە هەموو دانیشتوانی شاری نوێوەو ئەم ڕێگریەش لەشۆڕشی خەڵکی، ئەوەندە بێبەزەییانەبوو کەتاکۆتایی جەنگی"غەزە" هیچ کەسێك نەیدەوێرا سەرپێچی لەفەرمانی "رۆژو"ی سەرەگا بکات.

هیچ کەس نەیدەزانی بەچ شێوەیەك ڕەفتار لەگەڵ"رۆژو"دا بکات، ئەگەر یەکێك لەسەربازەکانی دوژمن، چەکی خۆی بدایە بەدەستەوە و بیوتایە بە"رۆژو"لێم ببورە و لەسێدارەم مەدە،لەمکاتەدا"رۆژو"هاواری دەکرد ئەم پیاوە بکوژن، چونکە لەباتی

ئەوەی پەنا بۆ دادپەروەریەکانم ببات پەنای بۆ بەزەییم بردووە و ئەم بابەتەش ئەوە دەسەلمێنێت کە من بەکەسێکی دادپەروەر نازانێت.

بەڵام ئەگەر سەربازێك خۆی بدایە بەدەستەوە، بەڵام داوای بەزەیی لێ نەکردایە "رۆژو"دەیوت ئەم پیاوەش لەسێدارە بدەن چونکە بێشەرمی لەبەرامبەر مندا کردوەو بەهیچم دەزانێت.

کاتێك ژن ومنداڵەکان دەهاتن بۆ لای و بەدەم گریانەوە داوای ئەوەیان لێدەکرد کە لەهاوسەر و باوکانیان کە سەربازانی سوریا بون ببورێت، "رۆژو"دەیوت ئەمانە لەسێدارە بدەن، چونکە ئەمانە نازانن هەروەك چۆن هیچ گۆڕانکاریەك لەفەرمانی ئاسمان بەسەر زەویدا ناکرێت، فەرمانی منیش لەبەرامبەر ئەو سریانیانەی دژی میسر ڕاپەڕیون ناگۆڕێت.

هیچ کەسێك نەیدەزانی بەچ شێوەیەك ڕەفتار لەگەڵ ئەو پیاوەدا بکات و بەچ شێوەیەك قسەی لەگەڵدا بکات کە لێی نارازی نەبێت، ئەویش هەموو قسەیەکی بەشێوەیەك لێك دەدایەوە کە وەك بڵێی ویستبێتیان جنێو و سوکایەتی پێ بکەن، یان بیانەوێت فریوی بدەن و بەپێچەوانەی فەرمانەکانی ئەو ڕەفتار بکەن.

خەڵکی تەنها لەشتێکی ئەو دڵنیا بون، ئەو شتەش ئەوەیە کاتێك فەرمانێکی دەرکردایە دەبێت بێ ئەملاولا جێبەجێ بکرێت و هیچ بیانویەك بۆ جێبەجێ نەکردنی پەسەند نەدەکرد.

شاری"غەزە"لەسەرتادا لەلایەن"ئازیرو"پادشای"ئامورو"کە دوای ئەوەی شۆڕشی دژی میسر بەرپاکرد، بوبە پادشای سەرتاسەر سوریا و سوریای لەچنگی میسر دەرکێشا و دوای ئەوە هێرشی کردە سەر"غەزە". بەڵام هێرشی"ئازیرو"بۆ"غەزە"بە بەراورد بەهێرشی لەشکری"هاتی"وەك یاری منداڵانە دەهاتە بەرچاو، چونکە لەشکری"هاتی"شەو و ڕۆژ مادده ئاگرینەکان و گۆزەی پڕ لەماری ژەهراوی و لاشەی کوژراو و دیلە میسریەکانیان هەڵدەدایە ناو شارەکەیانەوە و دیلەکانیش کاتێك بەر زەوی دەکەوتن یەکسەر دەمردن، ئەمەش لەحاڵەتێکدا کەبەر دیواری حەسار نەکەوتایەن و بەئێسقانی تێکشاوەوە نەکەوتنایەتە بن دیوارەکانەوە.

کاتێك ئێمە چوینە ناو شاری"غەزە"وە ماڵێکت نەدەبینی کە بنمیچی پێوە بێت، چونکە بەردباران و مادە ئاگریەکان بنمیچی تەواوی ماڵەکانی وێرانکردبو و

سوتاندبونی و هەندێك لەدانیشتوانی ئەو شارە لەژێر زەویدا دەژیان و ئەو جۆرە کەسانەش لە ژن و پیرەمێردە لاوازەکان پێکدەهاتن کە ساڵهایە تێری سکی خۆیان نانیان نەخواردووە.

"روژو" نۆژەنکردنەوەی حەساری شاری لەسەرتای گەماڕۆکەوە سپارد بەتەواوی پیاو و منداڵە نێرەکانی ئەو شارە، لەهەر دە پیاو و منداڵ نۆ کەسیان مردن. دانیشتوانی ئەو بەشە شارەی کە بەزیندویی مابونەوە، کاتێك چاویان پێمان کەوت لەباتی ئەوەی خۆشحاڵی خۆیان دەرببڕن جنێویان پێدەداین و خۆڵیان دەکرد بەسەر خۆیاندا.

"هورم هب"وتی: گەنم و گۆشتیان پێبدەن، بەڵام ئەم خواردنە بوبەهۆی ئەوەی هەندێکیان بەهۆی ئەوەی تێر نانیان خوارد، مردن، چونکە گەدەیان ساڵهایە بەخواردنی کەم ڕاهاتبوو و نەیدەتوانی بەرگەی خواردنێکی زۆر بگرێت.

من حەز دەکەم بڵێم، ئەو ڕۆژەی چوینە ناو شاری"غەزە"وە، ئەو شارەمان بەچ شێوەیەك بینی، من بینیم پێستی مرۆڤ بەدیوارەکانەوە هەڵواسراوە و بەشێوەیەك بۆنی لاشەکانی ئەو شارە دەهات، کاتێك ئێمە بەنێو شاردا ڕێمان دەکرد، لوتی خۆمان گرتبوو.

ئەو لاشانەش سەربازەکانی"هاتی"لەدەرەوە هەڵیان دەدایە ناو شارەوە، بۆئەوەی سەربازە بەرگری کارەکانی ئەو شارە بەبۆگەنی لاشەی مردووەکان بێزار بکەن، یان ئەوەی ببێتە هۆی ئەوەی سەربازە بەرگریکارەکان توشی نەخۆشی بکەن و بمرن.

من حەزدەکەم بڵێم لەو ڕۆژەدا، یەکێك لەڕۆژە سەرکەوتنە مەزنەکانی"میسر"ە، بەڵام خۆشحاڵ نەبوم، چونکە بینیم ئەو سەرکەوتنە بە ئازارو ڕەنج و بەدبەختیگەلێکی مەزن بەدی هاتووە، کە هاوشێوەی ئەو بەدبەختیە بونی نیە.

سەربازەکانی"روژو"ی سەرەکا، کە بەرگریکارو خۆڕاگری شاربون، لاوازی لاشەیان مرۆڤی دەتۆقاند، بگرە مردووە وشکبووەکانی مردووخانەکانیش دوای نەشتەرگەری و مۆمیاکردن لەوان قەڵەوتر و جوانتربون.

دەست و پێیان بەهۆی چەرمەسەری بەردەوام و برسیەتی و لێدانیان بەقامچی "ژورو" درێژ بوبو، هەروەها پەراسوی سەربازەکان دەرپەڕیبوو و لەسەر ئەژنۆیان

دومەڵێکی مەزنی درەکردبوو کە من دەمزانی بەهۆی نان نەخواردنەوەوە ئەو دومەڵە لەسەر ئەژنۆیان دروست بووە.

هیچ سەربازێکم نەبینی کەبتوانێت بەڕێکو ڕاستی ڕێ بکات، لەبەرئەوەی هەموویان کۆمو چاویان قوڵ ببوو، کاتێك تەماشایان دەکردین، ئێمە لێیان دەترساین، چونکە وەك بڵێی ئاژەڵگەلێکی دڕندە تەماشامان دەکەن.

کاتێك"هورم هب"یان بینی بەدەستێکی لاواز و بازوی بێهێزەوە، نێزەکانی خۆیان بەرز کردەوە و دەنگێکی وەك ناڵە لەدەمیانەوە دەهاتە دەر و دەیانوت"بەرنگاری بکەن".

سەربازە بەدبەختەکانیش ئەوەندە ئەم ڕاسپاردەی"هورم هب" لەفەرماندەکانی خۆیانەوە بیستبوو"بەرگری بکەن"نەیاندەتوانی قسەیەکی تر بکەنو قسەیەکی تر لەڕۆحیاندا نەدەهاتە بون کە لەڕێی زمانیانەوە دەری بڕن.

کاتێك"هورم هب"بینی سەربازەکانی"غەزە" بەهۆی جەنگو بەرنگاری درێژخایەنیان بەوشێوەیان لێهاتووە، پێی وتن: چیتر لەمەودوا کاتی حەوانەوەو ئاسودەیی ئێوەیە و بخۆن و بخۆنەوە و بخەون تائەوکاتەی ماندویەتی لە لەشتاندا نامێنێت و هێزی لەدەستچوتان بۆ بگەڕێتەوە، دوای ئەوە یەکسەر گۆشتی تازە و ئاوجۆ بەنێو سەربازەکاندا دابەش کرا.

"هورم هب"بەدەستی خۆی ملوانکەیەکی زێڕی کردە ملی هەریەك لەو سەربازانە و دیلەکانی سوریای بەسەریاندا دابەش کرد. بەڵام سەربازەکان بەهۆی لاوازی لەڕادەبەدەر و ماندویەتیەوە نەیانتوانی دیلەکان نمایشی فرۆشتن بکەن، لەباتی ئەوە بەلاسایی کردنەوەی سەربازەکانی"هاتی" دەستیان کرد بەئەشکەنجەدانیان، چونکە لەسەردەمی گەمارۆی درێژخایەنیاندا، سەربازە میسریەکان لە"غەزە"دا لەسەربازەکانی"هاتی"ەوە هەندێك شت فێربوبون کە یەکێك لەو شتانە، بەزیندویی پێست کەندنی ژن و پیاوەکان و هەڵواسینیان بەدیواردا بوو.

کاتێك لێیان پرسین، بۆچی ژنەکانی سوریا ئەشکەنجە دەدەن و لەباتی ئەم کارانە بۆچی نایانفرۆشن؟

لەوەڵامدا وتیان: هیچ جیاوازیەك لەنێوان ژن و پیاوی سریانیدا نیە، هەرکامێکمان دەست بکەوێت دەبێت بەئەشکەنجەوە بیانکوژین، بۆئەوەی تۆڵەی خۆمانیان لێ بکەینەوە.

"هورم هب"ملوانکەیەکی ئاڵتون بەخشڵ ڕزاوە و قامچیەکی ئاڵتونی دا بە دەستی سەرگاوەو بەو سەربازانەی کە لەگەڵ ئەودا هاتنە ناو"غەزە"وە وت: کە بەشانازی "ڕوژو"ی سەرگاوە پێکەوە هاوار بکەن و هەموویان بەخۆشی و شانازیی ئەوەوە هاواریان کرد، چونکە کاتێك خۆیان کرد بەشاردا تێگەشتن کە ئەو پیاوە لەپێناو پاراستنی"غەزە"دا چ هەوڵ و قوربانیەکی داوە. بەڵام دوای ئەوەی هاواری سەربازەکان خامۆش بوو"ڕوژو"بە"هورم هب"ی وت: مەگەر تۆ وادەزانی من ئەسپم کە هەوسارت کردووەتە سەرم و ئەو قامچیەت پێداوم؟ ئایا ئاڵتونی پاکە؟ یان زێڕی سریانیە؟ ئەگەر زێڕی سریانی بێت، لە دە بەشی نۆ بەشی مسە.

"هورم هب"سەری لەو قسەیە سوڕ نەما، لەبەرئەوەی دەیزانی کە لایەنی ڕۆحی و ڕەوشتی ئەو پیاوە بەچ شێوەیەکە، بۆیە ئەو دڵنیاییەی پێ بەخشی کە ئەو قامچیە بەتاڵی زێڕی خام میسری چنراوە.

سەرەگاش بەتوڕەییەوە وتی: "هورم هب"سەربازەکانی خۆت لەم شارە ببەرە دەرەوە، چونکە ئەمانە دەنگە دەنگ دەنێنەوە و ناهێڵن من بخەوم، لەکاتێکدا لەکاتی گەرمارۆکەدا، سەرەڕای ئەوەی بەبەردەوامی دەنگی لێدانی"قوچ"و دەنگی بەردە باران و ئاگر بەرگوێم دەکەوت، بەڵام بەئاسودەیی دەخەوتم...ئەگەر سەربازەکانی خۆت لەمشارە نەبەیتە دەرەوە و ببنە مایەی خەو ڕەواندنم، ناچارم فەرمان بەسەربازەکانی خۆم بدەم کە تەواوی سەربازەکانت بکوژن.

سەرەگا ڕاستی دەکرد، چونکە ئەوپیاوەی بۆماوەی چەند ساڵێکە شەو و ڕۆژ لەجەنگدا بەئاسودەی دەخەوت، نەیدەتوانی بخەوێت و بەبەردەوامی بیری لای خەزێنەی کەرەستەی چەکە سەربازیەکانی بوو و ڕۆژێکیان هات بۆلای"هورم هب"و بەلێبوردەییەوە وتی:

"هورم هب"تۆ فەرماندەی میسر و سەرکردەی منی، بۆیە داوات لێدەکەم تەمێم بکەیت، چونکە من شایستەی سزادانم.

"هورم هب"وتی: بۆچی تۆ شایستەی سزادانیت؟

سەرەگا وتی: لەبەرئەوەی بەشێك لەو كەرەستە چەكانەی بەمن سپێدرابوو، دەبێت بەبێ كەموزیاد بیدەمەوە دەستی فیرعەون، نازانم چیم كردووە، ئەگەر پاپیرۆسەكانم بمایا، دەمتوانی تێبگەم لەوەی چیم لێكردون، بەڵام پاپیرۆسەكانم بەهۆی ئاگرەوە لەناو چون و لەوكاتەوەی ناتوانم بخەوم یادەوەری خۆم لەدەست داوە و تەنها ئەوە دەزانم كە ژمێریاری هەموو ئەوشتانەی بەمن سپێدراوە تەواوە و تەنها نازانم چیم كردووە لەچوارسەد"پالۆ"ی ولاخ كە لەگەنجینەكەدا بووە و ئاگاداری ئەوەشم كە ئەم پالۆانە بەكار نەهێنراون، لەبەرئەوەی لەبرساندا هەموو ولاخەكانمان خواردوە و هیچ گوێدرێژێك لەشاردا نەبوو بۆئەوەی بەهۆیانە سود لەم پالۆانە وەرگرین.

ئێستا تۆ ئەی"هورم هب" بەهۆی ئەم كەمتەرخەمی و بێئاگاییمەوە، لەبەرامبەر سەربازەكاندا بەقامچی لێم بدە، بۆئەوەی تەمێ بكرێم و بزانم كە هەرگیز ناتوانم بكەمە خزمەتی فیرعەون، لەبەرئەوەی سامانی سەربازی فیرعەون كە بەمن سپێدرابوو بەفیڕۆ چووە.

"هورم هب"وتی: تۆ لەو ڕووەوە هیچ نیگەران مەبە، چونكە من چوارسەد پالۆ لەگەنجینەی لەشكرەكەی خۆمت پێدەدەم بۆئەوەی بیانخەیتە ناو گەنجینەكەتەوە و هیچ كەم و كورتیەك لەژمێریاری گەنجینەكەتدا نەبێت. بەڵام سەرەگا پەسەندی نەكردو وتی: تۆ دەتەوێت فریوم بدەیتو پالۆی ولاخی لەشكرەكەی خۆت بەمن بسپێری، بۆئەوەی لەبەردەم فیرعەوندا باشتر بتوانی بەوە تاوانبارم بكەیت كە كەرەستەی جەنگی لەشكرەكەم بەفیڕۆداوە. من ئەم كارە ناكەم و فریوی تۆ ناخۆم، دزانم كە تۆ ئیرەیی بەمن دەبەیت و دەتەوێت ببیتە فەرمانڕەوای"غەزە"و جێگەكەی من بگریتەوە. ئێستاش من گومانی ئەوە دەكەم كە تۆ فەرمانت بە سەربازەكانی خۆت داوە پالۆی ولاخەكانی من لەگەنجینەكەدا بدزن، بۆئەوەی تۆ بتوانی لەلای فیرعەون بەكەمتەرخەم و دز تاوانبارم بكەیت، من ئەو پالۆانەی تۆ دەتەوێت بەمنی بدەیت وەرناگرم و تا ئەوكاتەی پالۆەكانی خۆم نەدۆزمەوە لەم شارەدا دەست لەگەڕان و پشكنین هەڵناگرم.

ئەم قسانەی"رۆژو"هورم هبی لەبەرامبەر بارودۆخی دەرونی سەرەگادا ترساندا و واهەستی كرد كە ئەو شێت بووە، بۆیە وتی: "رۆژو" باشە تۆ بۆ حەوانەوە بگەڕێرەوە

بۆ لای ژن و منداڵەکەت لەمیسر، چونکە من واهەست دەکەم کە گەمارۆی درێژخایەنی ئەم شارە و ئەو ئەرك و کارانەی تۆ ئەنجامت داون، تۆی زۆر ماندوو کردبێت.

"هورم هب"ئاگاداری ئەوە نەبوو کە بەم قسانەی، بەچ شێوەیەك سەرەگا لەوە دڵنیادەکاتەوە کە ئەو چاوی بڕیوەتە فەرمانڕەوایی"غەزە" بۆیە وتی: ژنی من حەساری شارە و منداڵەکانیشم منارەکانی ئەم شارەیە، بۆیە من لێرە ناڕۆم، ئەگەر نەتوانم ئەم پاڵوانە بدۆزمەوە، بەدەستی خۆم سەری ژن و منداڵەکانی خۆم دەبڕم.

دوای ئەوە"روژو"بێ ئەوەی"هورم هب"ئاگادار بکاتەوە فەرمانی بەسەربازەکانی خۆیدا بەرپرسی گەنجینەی سەربازی کە یەکێك بوو لە کەسە ئازا و دلێرەکانی "غەزە"و وەك ئەوانی تر چەند ساڵێك لەوەوپێش لەبەرامبەر دژمندا خۆڕاگری کردووە، لەسێدار بدەن.

کاتێك"هورم هب"ئاگاداری ئەم ڕووداوە بوو هات و وتی: بێ دودڵی ئەم پیاوە شێت بووە، بۆیە فەرمانی دا کە لەژورێکدا بخەنە ژێر چاودێریەوە و نەهێڵن لەو ژورە بێتە دەرەوە و دوای ئەوە بەمنی وت: بڕۆ پشکنینێکی بۆ بکە و بزانە بەچ شێوەیەك دەتوانی چارەسەری بکەیت.

منیش ڕۆشتم و پشکنینم بۆ "روژو"کرد و گەڕامەوە و بە"هورم هب"م وت: بەهۆی ئەو هەڵمەی لەسەری ئەم پیاوەدا کۆبووەتەوە توشی شێتی بووە، بۆ چارەسەرکردنی من دوو ڕێگام لەبەردەستدایە، یەکەم ئەوەیکە تۆ لەگەڵ سەربازەکان لەشار بڕۆنە دەرەوەو"غەزە" بەو بسپێری، بۆئەوەی ئەو بتوانێت وەك ڕابردوو بەتەنها فەرمانڕەوایی ئەم شارە بکات.

"هورم هب"وتی: من ناتوانم پێش گەشتنی هێزی یاریدەدەری میسر بۆ هێرشکردنە سەر سوریا ئەم شارە بەجێ بهێڵم، چونکە هەر ئەوکاتەی لێرە چومە دەرەوە پێش ئەوەی هێزی یاریدەدەر بگات، من شکست دەخۆم و تاکە ڕێگای ئارامی و هێمنی و پاراستنی لەشکری من، حەساری"غەزە"یە.

وتم: لەبەرئەوەی ناتوانی لەم شارە بڕۆیتە دەرەوە، بۆ چارەسەرکردنی سەرەگا، جگە لەکونکردنی سەری هیچ ڕێگەچارەیەکی ترم بەدەستەوە نەماوە.

"هورم هب"وتی: من ناتوانم پیاوێك کە نمونەی قارەمانیەتی نەتەوەی میسرە، دوچاری هەڕەشەی کونکردنی سەری بکەم، چونکە سەرەڕای ئەوەی لەوانەیە بمرێت،

خودی منیش بەوە تاوانبار دەکرێم کە ئێرەییم بەئازایەتی ئەو بردووە، هەر لەبەرئەوەش کەرەستەی لەناوبردنی ئەوم فەراهەم کردووە.

ئەوەبوو من بۆ هێورکردنەوەی شێتی سەرەگا، بەچەند دەرمانێکی هێورکەر و چەند پیاوێکی بەهێزەوە ڕۆشتم بۆلای و بەپیاوە بەهێزەکانم وت: بەتختەخەوێکەوە بیبەستنەوە، بۆئەوەی بتوانم ئەم دەرمانەی دەرخوارد بدەم.

پیاوەکانیش سەرەگایان بەتەختەخەوێکەوە بەستەوە و من بەلولەیەك دەرمانەکەم کرد بەقوڕگیدا و دوای ئەوەی دەرمانە هێورکەرەکەم چووە ناو گەدەی سەرەگاوە و کاری تێکرد، ئاگاداری ئەوە بوم کە کەمێك هێور بویەوە و پێی وتم:

ئەو"هورم هب"ە چەقەڵە کە لەبیابانەوە خۆی کرد بەناو لەنگەرگای"غەزە"دا، بیری منی بەشێوەیەك پەرت و بڵاو کردووە کە من ئەوەم لەبیرچووە کە بڵێم ڕۆژێکیان پێش ئەوەی"هورم هب"خۆی بکات بەم شارەدا سیخوڕێکی هەڕەشەئامێزی سوریام گرت و من ئەوم لەزیندانێك کە دەکەوێتە منارەی قەڵاوە، زیندانی کردووە و دەمویست لەسێدارەی بدەم، بەڵام بەهۆی هاتنی"هورم هب" و سەربازەکانی و پەرت و بڵاو بونی بیر و هۆشی من، نەیانهێڵا ئەو سەربازە لەسێدارە بدەم، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو پیاوە زۆر فێڵبازە، ئێستا هاتەوە بیرم کە لەوانەیە ئەو چوارسەد پاڵوی وڵاخەکانی منی دزیبێ...بڕۆ و بیهێنە بۆ لام، بۆئەوەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکەم و بزانم کە چی لەو پاڵوانە کردووە و لەکوێ شاردونیەتەوە، دوای ئەوەی ئاگاداری شوێنی نهێنی ئەو پاڵوانە بوم ئاسودە دەبم، ئەوکات خەوم لێدەکەوێت.

من سەرەتا وامدەزانی کە سەرەگا وڕێنە دەکات، بەڵام ئەو بەڕادەیەك لەسەر ئەو قسانەی سوربوو کە من ناچاربوم بڕۆمە ناو زیندانی ئەو منارەوە و چاوم بەو سیخوڕە بکەوێت، دوای ئەوەی بەرەو ڕوی ئەو منارەیە ڕۆشتم، ئاشکرابوو کە کابرای زیندانی لەچینی خوارەوەی ئەو منارەیەدا زیندانی کراوە و ئەوێش زۆر تاریکە و بۆ چونە ناو ئەو زیندانەوە، دەبێت مەشخەڵێك لەگەڵ خۆتدا ببەیت.

بۆیە مەشخەڵێکم داگیرساند و خۆم کرد بەو زیندانەدا و ئاگاداری ئەوەبووم پاسەوانی زیندا کەسێکی کوێرە، و پێم وت: من هاتوم ئەو سیخوڕە سوریاییەی کە ڕۆژێك پێش هاتنی"هورم هب"بۆئەم شارە دەستی ئێوە کەوتووە لەم زیندانە بهێنمە دەرەوە و بیبەم بۆ لای سەرەگا، بەڵام کابرای کوێر لەهەمان کاتدا کەسێکی پیربوو،

ناوی بیست خودای میسری هێنایە زمان و سوێندی بەهەمویان خوارد کە هیچ زیندانیێك لێرەدا نیە، چونکە کاتێك سیخوڕێك دەگیرێت یەکسەر بۆبەدەست هێنانی زانیاری‌و ئەوەیکە بۆچی هاتووەو دەیەوێت چ هەواڵێك بەدەست بهێنێت، ئەشکەنجەی دەدەن‌و دوای ئەوەش لەزینداندا بەزنجیر دەیبەستنەوە و وازی لێدەهێنن تا ئەوکاتەی لەبرساندا دەمرێت و لاشەی دەبێتە خۆراکی مشکی ترسناکی ئەو زیندانە، چونکە هیچ خواردنێکیان شك نەدەبرد بۆئەوەی بیدەن بەزیندانیەکان.

سەرەڕای ئەوەی پیاوی نابینا سوێندی بەبیست خودای میسر خوارد کە لەزینداندا هیچ زیندانیەك نیە، من لەقسەکانیدا هەستم بەوە کرد کە درۆم لەگەڵدا دەکات، چونکە پیاوێکی ڕاستگۆ پێویستی بەوە نیە سوێند بەبیست خودا بخوات.

بۆیە پێم وت: تۆ دەزانی کە سەرەگا لەوجۆرە پیاوانەیە ئەگەر بزانێت تۆ درۆ دەکەیت، سەرەڕای ئەوەی پیرەمێرد و کوێری، پێستت دەماڵێت، بۆیە باشتروایە ڕاستیەکەم پێ بڵێیت.

پیرەمێرد کاتێك زانی من فریوی قسەکانی ناخۆم، ئەوکات کڕنوشی برد و وتی: ئەی پیاوی مەزن کە ناتوانم بتبینم، بەڵام بەدەنگتدا دەزانم کە خەڵکی میسریت و دەستەڵاتداری، بەزەیت بەمندا بێتەوەو من بەدادوەر مەسپێرە، چونکە بەدڵنیاییەوە دەمکوژێت، من یەکێك لەخزمەتکارە بەوەفاکانی میسربومو ئێستاش هەر خۆم بەخزمەتکاری دەزانم و لەکاتی گەمارۆدا ئەوکاتەی هێشتا خواردنیان بەزیندانیەکان دەداو گەنجینەی خواردنمان بەوشێوەیە کەم نەبوو، من هەموو ڕۆژێك بۆ خزمەتکردنی میسر و فیرعەون بڕێك لەخواردنی زیندانیەکانم دەدزی، چونکە دەمزانی ئەوان تا برسیتر بن، ئەوا خزمەتێکی زیاترم بەمیسر و فیرعەون کردووە.

بەڵام ئەم سیخوڕە سریانیە کە ڕۆژێك پێش هاتنی"هورم هب"دادوەری "غەزە" دەستگیری کرد، زیندانیەکی ئاسایی نیە و زۆر زماندرێژە، کاتێك قسە دەکات، قسە شیرینەکانی لەگوێی مندا وەك دەنگی بولبوڵ وابوو، ئەو ڕۆژەی ئەویان زیندانی کردو زیندانیەکانی بینی کەگۆشتی لاشەیان بووەتە خۆراکی مشکەکان، لێی پرسیم ئەوانە بۆچی مردون؟

وتم: لەبەرئەوەی لەمشارەدا خواردن نیە، ئێمە ناتوانین خواردن بەزیندانیەکان بدەین، بۆیە ئەوانیش لەبرساندا دەمرن.

دەبێت تۆ ئەوە بزانی لەبەرئەوەی من کوێرم، ناتوانم زیندانیەك بەزنجیر ببەستمەوەو بەردەوام ئەوکاتانەی کە کەسێك دەخرێتە زیندانەوە، پیاوانی تر دێن و ئەو بەزنجیری مسین دەبەستنەوە و دەڕۆن. بەڵام دوای ئەوەی کابرای زیندانی بەسترا، من دەتوانم زیندانەوانی خۆم بکەم. کاتێك ئەو سیخوڕە هات، بەوشێوەیە بوو کە پێم وتی، چەند پیاوێك هاتن ئەویان بەزنجیر بەستەوەو دوای ڕۆشتنی ئەمانە، کابرای زیندانی لەبارەی مەرگی زیندانیەکانی تر پرسیاری لێکردم. ئەو دوای ئەوەی بیستی ئەمانە لەبرساندا مردون، پێی وتم: ئەگەرتۆ خواردنم پێ بدەیت، هەڵبەت بەشێوەیەك کە من لەبرساندا نەمرم و هێزم تێدا بمێنێت، من لەڕۆژی هاتنی"هورم هب"دا ئەوەندە زێرت پێدەدەم کە هیچ پیاوێکی دەوڵەمەند لەسوریادا بەئەندازەی تۆ ئاڵتونی نەبێت، منیش کاتێك گوێم لەم بەڵێنەی ئەوبوو، زانیم کە ڕاست دەکات و بەڵێنەکەی خۆی بەجێ دەهێنێت، ئەو دەیوت سەرەڕای ئەوەش ئەوەندە زێڕ و زیوەت پێدەدەم کە نەتوانی هەڵیانگری، بگرە چاوەکانیشت چاك دەکەمەوە، چونکە من پزیشکێك دەناسم کە لەچارەسەکردنی نەخۆشیەکاندا بۆ نمونە لەتیمارکردنی چاودا لەجیهاندا وێنەی نیە و ئەو چاوەی من کە دەیبینی ئەو چاکی کردەوە و دوای ئەوەی"هورم هب"خۆی کرد بەم شارەدا، تۆش هەم دەوڵەمەند و هەم بینا دەبیت و دەتوانیماڵێك بۆخۆت دروست بکەیتو دە خزمەتکار، لەماڵەکەی خۆتدا نیشتەجێ بکەیت و لەشەو و ڕۆژێکدا دەجار گۆشتی قاز بخۆیت.

من دڵنیام ئەو لەبەرامبەر هەر ژەمێکدا، بڕێکی زیاتر زێڕم دەداتێ و هەموو ڕۆژێك نانو ئاوم پێدەداو بۆ هەر ژەمە خواردنێك دە کەڕەتی دە کەڕەتی کەڕەتی دە"دین"[42] ئاڵتونی پێدەدام.

بەڵام ئەو زوو زوو برسی دەبوو هەموو شەو و ڕۆژێك، چەندجارێك خواردنی لێ داوا دەکردم و منیش بەو کەرەستانەی کە هەمبوو خواردنم بۆ ئامادە دەکرد و پێم دەدا، بۆیە ئەو پیاوە تائێستا لەبەرامبەر نرخی ئەو خواردنەی من پێم داوە، تا چەند

[42] بڕۆ بۆ پەراوێزی ژمارە"٢٤"ی بەرگی یەکەمی سینۆهە.

ڕۆژێك لەوەوپێشیش، دووجار،کەڕەتی دە...کەڕەتی دە...کەڕەتی دە...کەڕەتی دە...کەڕەتی دە....کەڕەتی دە...کەڕەتی دە..."دین"دەبێت بەمن بدات[43].

بەڵام من لەبەرەئەوەی لەو کێشانەیە زیاتر قەرزم بەلایەوەتی، دەمەوێت چاوەڕێ بکەم تا ئەوکاتەی قەرزەکەم دەگاتە سێ ملیون"دین"و دوای ئەوە پێی ڕاگەیەنم کە"هورم هب"هاتووە.

وتم: کەواتە هێشتا پێت نەوتووە کە"هۆرم هب"هاتووە بۆ ئەم شارە؟

کابرای زیندانەوانیش وتی: نەخێر، چونکە ئەگەر پێم بوتایە، لەزیندان دەرۆشت و من لەقازانجێکی بێئەندازە بێبەش دەبوم، بەڵام کاتێك قەرزەکەم بگاتە سێ ملیون"دین"پێی دەڵێم کە"هورم هب"هاتووە.

وتم: ئەی پیاوی سادەو کوێر ئایا دەزانی سێ ملیون"دین"چەنێك زێر دەکات؟ ئەگەر سێ ملیون"دین"لەشوێنێکدا کۆ ببێتەوە، بگرە بیست ئەسپیش ناتوانێت هەڵیانگرێتو بیانگوازێتەوە بۆ شوێنێکی ترو لەسەرتاپای شاری"غەزە"دا ئەو کاتانەی کە ئەم شارە چەقی بازرگانی بوو، سێ ملیون"دین" زێڕی تێدا نەبووە، چ بگات بەمڕۆ کە ئەم شارە وێران بووە.

[43] مەبەستی کابرای زیندانەوان دەهەزار دین زێڕە.

*بەشی پەنجایەم*

## کاپتا لە"غەزە"دا

بەڵام لەکاتێکدا ئەم قسانەم لەگەڵ کابرای نابینادا دەکرد،ئەژنۆکانم لەخۆشیاندا دەلەرزین و دڵم بەتوندی لێیدەدا، چونکە هەستم بەوە کردبوو کە ئەو زیندانەی کە بەزمانە نەرم و شیرینەکەی کابرای زیندانەوانی فریو داوە کێیە؟

بەدەم پێکەنینەوە بەزینداوانم وت: دەبێت ئەو زیندانە فێڵبازە سزا بدرێت، بۆیە من ببەرە لای ئەو پیاوە بۆئەوەی بزانم کێیە، بەڵام قوڕ بەوسەرەت گەر ئازادت کردبێت یان لەبرساندا کوشتبێتت.

زیندانەوانیش کاتێك خۆی بە"ئامون"دەسپاردو هاواری دەکرد مەشخەڵەکەی بەدەستیەوە گرت بۆئەوەی ئەم چاوانەم کابرای زیندان ببینێت، چونکە چاوەکانی خۆی کوێر بون.

دوای چونە ناو زیندانەوە، من لەبۆگەنی ئەو شوێنە و بینینی ئێسقانی مردووەکان کە هەندێکیان هێشتا بەزنجیرەوە بەسترابونەوە سەرم سوڕما.

زیندانەوان منی گەیاندە شوێنێك و بەردێکی جوڵاندەوە و کونێك دەرکەوت. ئەوکات بەردێکی تری لابردو دوبارە کونەکە گەورەتر بوو، دوای لابردنی چەند بەردێکی تر ئاگاداری ئەوە بوم کە ئەو شوێنە زیندانیەکی تاکە کەسیە، لەبەرئەوە ئەوی بردووەتە ئەو شوێنەو بەردەمی زیندانەکەی بەبەرد هەڵچنیوە بۆئەوەی سەربازەکانی"ڕوژو" چاویان پێی نەکەوێت، بەڵام خودی ئەو زیندانە تاکە کەسیە هەوای هەبوو، چونکە بینیم کە ڕوناکی دەرەوەی بەردەکەوێت.

پیرەمێردێکی شڕپۆشی بەزنجیر بەستراو، لەو زیندانەدا دانیشتبوو و تەماشای دەکردم، هەر ئەوەی منی ناسیەوە هاواری کرد: ئەی"سینۆهە"، گەورەم، ئایا ئەوە تۆی یان چاوەکانم بەهەڵە دەبینن؟ئەمڕۆژە پیرۆز بکرێت کەتۆی هێناوەتە ئێرە، بەڵام هەرئێستا گۆزەیەك شەرابم بۆ بهێنە، چونکە لەو ڕۆژەوەی لەم زیندانەدا زیندانی کراوم، مەیم نەخواردووەتەوە و بەنۆکەرەکانت بڵێ بمشۆرن، ڕۆنی بۆن خۆش بەلەشمدا بماڵن، چونکە من خووم بەژیانێکی خۆشەوە گرتووە و بەردەکانی ئەم زیندانە پێست و کۆممی بریندار کردووە و دوای ئەوەی منیشیان شۆرد و ڕۆنی بۆنداریان لێدام و جلی گرانبەهایان لەبەرکردم، ئەگەر تۆ بڵێیت کە چەند کەسێك لەکچانی پەرستگای "عەشتار"بێن بۆ ژورەکەم، ئەوا لەو حاڵەتەدا من هیچ گلەییەکت لێناکەم.

منیش دەستم خستە سەرپشتی و وتم: کاپتا....کاپتا....من زۆر خۆشحاڵ بوم بە بینینت...کاتێك لە"تبس"دا بوم پێیان وتم کە تۆ کوژاروی، بەڵام من دەمزانی کە ئەو قسەیە ڕاست نیە، چونکە تۆ کەسێکیت کە هەرگیز نامریت، بەڵگەش بۆ ئەوە، تۆ لەم کولانەیەدا کە هەموو ئەوانەی لێرەدا زیندانی کراون تەنها یەك کەس بەزیندویی ماوەتەوە ئەویش تۆیت.

لەکاتێکدا کە لەوانەیە لەنێو ئەو کەسانەی کە لێرەدا بون لەو جۆرە کەسانە بن کە لەلای خودا پلەوپایەیەکی مەزنیان هەیە، بەڵام خوداکان نەیانتوانی لەمەرگ ڕزگاریان بکەن، لەکاتێکدا بەهێزی زمان و دوڕویی و زمانچەوریت، بەردەوامیت بەژیانی خۆت دا و تەنها شتێك کە بەسەرتدا هاتبێت ئەوەیە کە لاواز بویت و ورگە زلەکەت دابەزیوە، سەرەڕای ئەوەی پێستی ورگت دەبینم کە بەسەر پێتدا شۆڕبووەتەوە، بەڵام زۆر خۆشحاڵم بەوەی تۆم بەزیندوییم بینیەوە.

"کاپتا"وتی: "سینۆهە"گەورەم، تۆ لەلای من هەمان ئەو پیاوەیت کە لەو سەردەمانەی کۆیلەی تۆ بوم ناسیومە، بەڵام باسی خوداکانم بۆ مەکە، چونکە ئەوکاتە گرفتار و بەدبەخت بوم کە پەنام بۆ خودایانی"بابل" و "هاتی" برد و هیچ یەك لەمانە بەهاناماوە نەهاتن و منیان ڕزگار نەکرد، بۆیە بۆئەوەی بەزیندوویی بمێنمەوە ناچاربوم شکست بەخۆم بهێنم، چونکە ئەم زیندانەوانە بۆ هەر ژەمە خواردنێك کە بەمنی دەدا، بەئەندازەی بوجەی یەك ساڵی شارێك داوای زێڕم لێدەکات.

فەرمانڕەوای ئەم شارەش پیاوێکی شێتە کە هیچ قسەیەك ناچێت بەمێشکیدا و بەشێوەیەك ئازارم پێدەدات کە من وەك ئەو"گا"یەی کە بەزیندویی پێستی دەماڵن هاوارم بەسەریدا دەکرد، بەڵام هیچ کارێکی لەو نەدەکرد.

بەڵام گەورەم، پێی بڵێی ئەم زنجیرەم لێ بکەنەوە و لەم زیندانە ڕزگارم بکە، ئێستاش کە تۆ هاتویت بۆ ئێرە، من چیتر توانای بەرگەگرتنی ئەوەم نیە کە بۆ یەك ساتیش بێت لەم زیندانەدا بمێنمەوە.

منیش یەکسەر وتم: زنجیرەکەی لێ بکەنەوە، ئەوکات"کاپتا"کە زۆر لاواز بوو و نەیدەتوانی بەپێی خۆی ڕێ بکات بەهاوکاری نۆکەرەکان، بردمە ژوەرەکەی خۆمەوە و بەنۆکەرەکانی خۆمم وت کە بیشۆرن و قژوو ریشیم بۆ کورت کردەوەو جلێکی کەتانیشم لەبەرکردو ملوانکەیەکی ئاڵتونیشم کردە ملی و بازنگێکم کردە دەستی، بۆئەوەی خەڵکی بزانن کە ئەو یەکێکە لە پیاوە بەڕێزەکانی من.

لەکاتێکدا کە نۆکەرەکان خەریکی شۆردنو جل لەبەرکردنی بون"کاپتا" بەبەردەوامی دەمی دەجوڵاندەوەو نانی دەخوارد تا ئەوەی کەمێك هێزی بەبەردا هاتەوە، بەڵام لەپشت دەرگای ژورەکەوە هاوار و گریانی زیندانەوان دەبیسترا و داوای دوملیونو سێسەدوشەست هەزار"دین"زێڕی خۆیی دەکرد. بگرە کابرای زیندانەوان ئامادە نەبوو لەیەك"دین"ی خۆی خۆش بێت و دەیوت: من بۆ ئامادەکردنی خواردنی ئەو بۆئەوەی بەزیندویی بمێنێتەوە، هەموو ڕۆژێك گیانی خۆمم دەخستە هەڕەشەوە، بۆیە ناتوانم یەك"دین"یش لە زێڕی خۆم خۆش بم.

من بە"کاپتام"وت: دوو هەفتەیە کە"هورم هب"لەم شارەدا ژیان بەسەر دەبات و لەو ماوەیەدا پیاوێکی تەماع و پارەپیس بەتۆی نەوتووە کە ئەو لەم شارەدایە، چونکە ئەو مامەڵەیەی تۆ لەگەڵ ئەودا بەو ڕۆژەوە پەیوەست دەکرێت کە"هورم هب"بێتە ناو ئەم شارەوە، ڕۆژێك دوای زیندانی کردنت"هورم هب"خۆی کرد بەم شارەدا، بۆیە تۆ تەنها یەك ڕۆژ قەرزاری دەبیت، ئەویش بەپێی نرخی خۆراکی ئەو سەردەمەی کە گیرابویت، لەبەرئەوە ئەم پیاوە بەتەماعە زۆر فێڵبازە، من فەرمان دەدەم کە قامچیکاری بکەن و بە"هورم هب"دەڵێم فەرمانی ئەوەی بۆ دەربکات کە سەری لەلاشەی بکەنەوە، چونکە ئەم پیاوە لەوکاتەوەی کە ئەم شارە گەمارۆ دراوە، خواردنی زیندانیەکانی دزیوەو خواردنی پێنەداون، بۆیە بەرپرسی مردنی تەواوی ئەو زیندانیانەیە کە

لەبرساندا مردون. بەڵام"کاپتا"ناڕەزایی خۆی دەربڕی و وتی: ئەمکارە مەکە، لەبەرئەوەی من پیاوێکم کە حەز بەمامەڵەی ڕێك و پێك دەکەم و لەبەڵێنی خۆم پەشیمان نابمەوە. ڕاستە کە دەبوو من خواردنم بەهەرزانتر لێ بکڕیایە، بەڵام کاتێك بونی نانم دەکرد، ئەوەندە تامەزرۆی دەبوم کەلەوکاتەدا هەرچی لێ بویستایەم پەسەندم دەکرد.

من زۆر سەرم لەم قسەیەی سوڕما، بۆیە وتم: "کاپتا"سەرم لەم قسانەت سوڕ دەمێنێ. ئایا تۆ بەڕاستی"کاپتا"یت، ئایا من ئەم قسانە لەدەمی تۆوە دەبیستم؟ تۆ لەڕابردوودا پیاوێك بویت کەچاوپۆشیت لەئەنگوستیلەیەکی خۆت نەدەکرد و نەتدەهێڵا خەڵکانی تر بەئەندازەی ئەنگوستیلەیەکی مسین فریوت بدەن یان درۆت لەگەڵدا بکرێت، کاتێك"هورم هب"هات بۆ ئەم شارە، پێی نەوتویت کە ئەو هاتووە، لەمکاتەدا جێی سەرسوڕمانە کە تۆ سەرەڕای ئەوەی دەزانی فریو دراویت، دەتەوێت قەرزەکەی خۆتی پێ بدەیتەوە.

من لەوباوەڕەدام کە تایبەتمەندی ئەم شارە ئەوەیە کە هەر کەسێك لەناو حەساری ئەم شارەدا نیشتەجێ بوو، وەك سەرەگا شێت دەبێت، بگرە پیاوێکی وەك"کاپتا"ش توشی ئەم شێتیە بووە و بیر لەوە ناکاتەوە کە بەچ شێوەیەك دوو ملیون و سێسەد و شەست هەزار"دین"زێری قەرزی خۆی بداتەوە بەو پیاوە، لەکاتێکدا"کاپتا"دوای ئەوەی خودای"ئاتون"لەناو چوو، تۆش وەك من شکستت هێناوە.

بەڵام"کاپتا"کە بەهۆی خواردنەوەی شەرابەوە مەست بوبو وتی: من پیاوێکی دروستکارم و بەڵێنی خۆم بەجێ دەهێنم و قەرزی ئەم پیاوەش دەدەمەوە، بەڵام داوای ئەوەی لێدەکەم ئەو ماوەیەم پێبدات کە وردە وردە بیدەمەوە. چیتر من پەیم بەوە برد کە ئەم پیاوە گەمژەیە، بگرە ئەگەر دە"دین" بگرە دوو"دین" زێڕی لەترازوودا بۆ بکێشم و پێی بدەم و بڵێم ئەمە دوو ملیون و سێسەد و شەست هەزار"دین"زێڕە، یەکسەرپەسەندی دەکات و واهەست دەکات کەقەرزی خۆی بەتەواوی وەرگرتووەتەوەو ڕازی دەبێت، چونکە ئەم پیاوە لەهەموو تەمەنیدا بگرە یەك"دین" زێڕی بەچاوی خۆی نەبینیوە. بەڵام"سینۆهە"، گەورەم، بەوشێوەی تۆ وتت، من پیاوێکی شکست خواردوم و شۆڕشی "تبس"منی کردووەتە پیاوێکی هەژار و کاتێکیش جەنگ دەستی پێکرد نازانم ئەو نۆکەرو کرێکارانەی کە لایەنگری"ئاتون"بون لەکوێوە زانیان

که پەیوەندیم بە"ئامون"ەوە هەیە. چونکە پێیان وتبون کە من نۆکەر و کرێکارەکانم بە"ئامون"فرۆشتووە و ئەوانیش دوای بیستنی ئەم قسەیە ڕژانە ناو مەیخانەکەوە و هەوڵی کوشتنی منیان دەدا و منیش بۆ ئەوەی گیانی خۆم بپارێزم لە"تبس"ەوە ڕۆشتم بۆ"ممفیس"و دوای ئەوەی زانیم"هورم هب"ڕۆشتووە بۆ سوریا، لەم وڵاتەدا پەیوەندیم پێوەکرد.

لێرەدا من توانیم خزمەتێکی مەزن بە"هورم هب"بکەم، بۆنمونە سەرکەوتنم لەوەدا بەدەست هێنا کە ئالیك بەم لەشکرە بفرۆشم و ئەوەی من بەم لەشکرەم فرۆشت بوو بەهۆی مەرگی ئەسپەکانیان و بەهۆی ئەو خزمەتانەی من بە"هورم هب"م کردووە نزیکەی نیو ملیون"دین"قەرزای من دەبێت و من گیانی خۆمم خستووەتە هەڕەشەوەو لەڕێی دەریاوە، خۆم گەیاندە لەنگەرگای"غەزە"، بەڵام فەرمانڕەوای شێتی ئەم شارە دوای ئەوەی من خۆم کرد بەم شارەدا، دەستگیری کردم و بەسزای ئەوەی کە من سیخوڕی سوریام، منی خستە ژێر ئازار و ئەشکەنجەوەو دوای ئەوەش زیندانی کردمو ئەگەر ئەم زیندانەوانە بەهانامەوە نەهاتایە، من لەم زیندانەدا لەبرساندا دەمردم.

ئەوکات من ئاگاداری ئەوەبوم کە"کاپتا" لەسوریادا سیخوڕی"هورم هب"بووە، بەواتا سەرۆکی سیخورەکانی ئەو بووە، هەروەها ئاگاداری ئەوەبوم کە بۆچی ئەو سیخوڕەی کە من لەبیابانی"سینا"دا بینیم، کاتێك هات بۆلای"هورم هب"چاوێکی داخستبوو، دەیویست ئەوەی بۆبسەلمێنێ کە لەلایەن پیاوی یەکچاو بەواتا "کاپتا"وە هاتووە بۆ لای.

هەروەها ئاگاداری ئەوبووم کە"کاپتا"بەفرۆشتنی ئالیکی ئاڵودە بەزەهری فرۆشتووەبەلەشکری"هاتی"وتوانیگالیسکەی،لەشکری"هاتی" لەکاربخاتو ڕێگای "غزە" بەڕوی"هروم هب"دا بکاتەوە. "هورم هب" لە "کاپتا" باشتری دەستناکەوێت بۆئەوەی لەسوریادا سیخوڕی بۆ بکات، چونکە هیچ کەسێك وەك ئەو ئاشنای بارودۆخی سوریا نیە و بەئەندازەی ئەویش دوڕ و فێڵباز نابێت.

سەرەڕا ئەوەش دەمزانی کە"هورم هب"پیاوێك نیە کە قەرزی کەسێك بداتەوە، بۆیە وتم: گریمان تۆ دە ئەوەندەی ئەم کێشانەیەش کە باست کرد"هورم هب"ئاڵتون قەرزاری تۆیە، ئەگەر بەردێك بگوشیت لەوانەیە ئاڵتونی لێ بەدەست بهێنی،

بەڵام"هورم هب"بگرە بەئەندازەی تۆوێکیش زێڕ بەتۆ نادات، چونکە ئەم پیاوە هیچکاتێك قەرزی هیچ کەسێکی نەداوەتەوە.

"کاپتا"وتی: من دەزانم کە"هورم هب"لە سەرەگای فەرمانڕەوای"غەزە"کە من ئەوم لە برسیەتی و مەرگ ڕزگار کرد نمەك نەشناسترە.

منیش بەسەرسوڕمانەوە لێم پرسی: ئایا تۆ ئەوت لەبرسیەتی ڕزگار کرد؟

"کاپتا"وتی: بەڵێ، کاتێك لەشکری"هاتی"گەمارۆی"غەزە"ی دابوو، من گۆزەی پڕ لەمارم فرۆشت بە لەشکری"هاتی".

ئەوان یەکسەر باوەڕیان بەوە نەکرد کە مار لەناو گۆزانەدا هەبێت، بۆیە من یەکێك لە گۆزەکانم کردەوە و چەند مارێك لە گۆزەکان هاتنە دەرەوە و سێ سەربازی هاتیان گەست.

ئەوکات چیتر نەیانوێرا گۆزەکانی تر بکەنەوە و بەگومانی ئەوەی ئەم گۆزانە پڕن لەماری ژەهراوی، هەڵیاندەدایە ناو حەساری"غەزە"وە، لەکاتێکدا من هەموو ئەو گۆزانەم پڕکردبوو لە گەنم و لەدوایین ڕۆژەکانی ئەو گەمارۆیەدا هەمان ئەم گەنمە فەرمانڕەوای"غەزە"و سەربازەکانی لەمەرگ ڕزگار کرد. بەڵام هەر بەوشێوەیی لەبارەی "هورم هب"ەوە وتم: دەزانم کە ئەو لەفەرمانڕەوای ئەم شارە ناسوپاسترە و یەك "دین" قەرزیشم ناداتەوە، بەڵام من ئەوەم لەو دەوێت کە مافی فرۆشتنی خوێی سەرتاسەری سوریا بەمن بسپێرێت، هەروەها مافی هەریەك لەو لەنگەرگایانەی کە دەیانکاتەوە بدات بەمن.

وتم: "کاپتا"ئایا تۆ بریاری ئەوەت داوە کە لەسەرتاسەری تەمەنتدا کار بکەیت و قەرزی ئەم زیندانەوەانە بدەیتەوە؟

"کاپتا"پێکەنی و وتی: من بۆ دانەوەی قەرزی ئەم پیاوە دوو ڕێگام گرتووەتە بەر، یەکێکیان ئەوەیکە بڕێك زێڕی بدەمێ و پێی بڵێم ئەمە هەموو ئەو قەرزەیە کە تۆ بەلای منەوە هەتە و ئەویش لەبەرئەوەی هەرگیز زێڕی بەچاوی خۆی نەبینیوە، لەوانەیە ڕازی بێت. ئەو بەڵێنەکەی تر کە دابوم بەو ئەوەیە لەڕێی تۆوە کە پزیشکێکی مەزنیت بینایی بۆ بگەڕێنمەوە و دوای ئەوەی بینایی بۆ گەڕایەوە یاری زاری لەگەڵدا دەکەم و لەسەر ئەو زێڕەی بەقەرز بەلای منەوەیە قوماری لەگەڵدا دەکەم و لەبەرئەوەی

شارەزاییەکی تەواوم لەیاری زار زوردا هەیە، دەتوانم بەوشێوەی خۆم بمەوێت زار هەڵبدەم و لەڕێی ئەم یاریەوە ئەوەی من قەرزاری ئەوم لێی ببمەوە.

لەوکاتەی کە کابرای زیندانەوان لەپشتی دەرگاوە دەگریا کردمانە ژورەوە و "کاپتا" قسەی لەگەڵدا کرد و زیندانەوانیش ڕازی بوو بەوەی کەمێکی تر ماوەی پێبدات بۆئەوەی قەرزەکەی بداتەوە.

دوای ئەوە پشکنینم کرد بۆ چاوی کابرای زیندانەوان و پەیم بەوە برد کە نابینایی ئەو لەنەخۆشیەکی چاوەوە سەرچاوەی گرتووە کەهیچ پشکنین و چارەسەرێکیان بۆ نەکردووە، بەڵام لەڕێی سوژنەوە بەوشێوەیەی کە لەوڵاتی"میتانی"بینیبوم دەمتوانی بۆ ماوەیەکی کورت بینایی بۆ بگەڕێنمەوە.

هەرکاتێك لەڕێی سوژن و دەرزیەوە نەشتەرگەری بۆ چاوێك بکەن، گەرچی بینایی بۆ ئەو چاوە دەگەڕێتەوە، بەڵام لەدواییدا ئەو چاوەی لەڕێی سوژن و دەرزیەوە نەشتەرگەری بۆ کراوە، وای لێدێت کە چیتر ناتوانرێت نەشتەرگەری بۆ بکرێتەوە.

ڕۆژی دوایی من"کاپتا"م -کە بۆ ماوەیەك حەسایەوە و هێزی بەبەردا هاتەوە- بردە لای"هورم هب".

"هورم هب"بەبینینی"کاپتا" زۆر خۆشحاڵ بوو، بۆیە کاتێك ئەوی بینی باوەشی پێدا کرد و ماچی کرد و وتی: "کاپتا"تۆ لەمڕۆدا یەکێکیت لەقارەمانە مەزنەکانی میسر و نەتەوەی میسر خزمەت و شانازیەکانی تۆ لەبیر ناکات. بەڵام"کاپتا"دەستی کرد بەگریان و وتی: ئەی"هورم هب" تەواوی ئەو شانازیانەی کە نەتەوەی میسر دەیەوێت پێشکەشی منی بکات، بەلای منەوە نە دەبێتە دەنکە گەنمێك و نە دەبێتە تۆزێك زێڕ. ئەی"هورم هب"ڕێزلێنان و شانازی و شتگەلێکی وەك هاوکاری و یارمەتی خودایان بەهای ئەنگوستیلەیەکی مسینی نیە، بۆیە منیش نە خوازیاری ڕێزلێنانی تۆم و نە حەزم لەو شانازیەیە کە نەتەوەی میسر بەمنی دەبەخشن. من تەنها زێڕم دەوێت...چونکە بەهۆی تۆوە داراییەکی زۆری خۆمم خەرج کردووە و بەڕادەیەکیش قەرزار بوم کە ناوێرم خۆم پیشانی خەڵکی بدەم، لەبەرئەوە تۆ دەبێت زێڕم پێبدەیت کە بتوانم قەرزەکانی خۆمی پێبدەمەوە.

"هورم هب"دەموچاوی مۆنکرد و بەتوڕەییەوە قامچیەکەی خۆی دا بەزەویدا و وتی: "کاپتا" ئەوەی تۆ باسی دەکەیت لەگوێی مندا وەك ویزە ویزی مێش وایە و

دەمت بەهۆی ئەم قسانەوە پیس بووە، تۆ دەزانی کە من هێشتا دەستکەوتەکانی جەنگم بەدەست نەهێناوە، بۆئەوەی زێڕ بەتۆ بدەم، ئەگەر ڕۆژێك لەجەنگدا دەستکەوتیش بەدەست بێت دەبێت لەجەنگی دژی"هاتی"دا خەرج بکرێتو لەو دەستکەوتەش هیچی بەر تۆ ناکەوێت.

بەڵام لەبەرئەوەی تۆ ناتوانی لەترسی قەرزارەکانت خۆت پیشانی خەڵکی بدەیت، تەنها تۆ قەرزدارەکانتم پێ نیشان بدە بۆئەوەی هەموویان بەتاوانی سیخوڕی و خیانەت لەسێدارەیان بدەم و تۆش چیتر قەرزاری هیچ کەسێك نەبیت.

"کاپتا"وتی: من حەز ناکەم قەرزدارەکانم لەسێدارە بدەیت، چونکە ئەگەر ئەوانە بکوژرێن، متمانەی من لەسوریا و میسردا لەناو دەچێت و چیتر هیچ سەوداگەر و بازرگانێك مامەڵەم لەگەڵدا ناکات و نە هیچم پێ دەفرۆشێت و نە هیچم لێ دەکڕێت.

"هورم هب"کە مەبەستی ئەوەی هەبوو سەر بنێتە سەری نۆکەرە پێشووەکەم وتی: "کاپتا"من دەمەوێت بزانم بەچ شێوەیەك سەرەگا تۆی بەتاوانی ئەوەی کە سیخوڕی سوریایت زیندانی کردووە و ئازاری داویت، چونکە فەرمانڕەوای"غەزە"سەرەڕای ئەوەی پیاوێکی شێتە، بەڵام سەربازێکی باشو هۆشیارە و هیچ کاتێك لەبواری سەربازیدا هەڵە ناکات و دەبێت هۆکارێك هەبێت کە بەو شێوەیە لەتۆ بەدگومان بووە.

کاتێك"کاپتا"گوێ لەم قسانە بوو، وەك ئەوەی دوبارە ئازاری بدەنەوە، دەستی کرد بەهاوار کردن و یەخەی خۆی هەڵدڕی، چونکە دەیزانی هیچ زیانێك بەخۆی ناگەیەنێت و ئەو جلەش کەلەبەریدایەتی هی منە و وتی: "هورم هب"تۆ ئێستا پێت وتم کە میسر شانازی بەمنەوە دەکات و من بومەتە خاوەنی شانازیەکی جاویدانە، بۆیە بەچ شێوەیەك ئەو پیاوەی ماوەیەك لەوەوپێش ئەوەندە بەمەزنت دەزانی، ئێستا تاوانی سیخوڕی دەخەیتە پاڵ؟ ئایا خزمەتەکانی من لەبەرامبەر میسر و لەشکرەکەی خۆتدا فەرامۆش کردووە؟ ئایا ئەوە من نەبوم ئالفی ژەهراویم دەردخواردی ئەسپەکانی"هاتی"دا و بومە هۆی مەرگی ئەسپەکانیان و گالیسکەکانیشیانم لەکار خست؟

ئایا من نەبوم کەگیانی خۆم خستە هەڕەشەوە تەنها بۆئەوەی گۆزەی پڕ لەگەنم هەڵدەمە ئەودیو حەساری"غەزە"وە، ئەگەر ئەو گەنمە نەگەشتایەتە دەستی خەڵکی"غەزە"بەرگریکارانی ئەم شارە لەبرساندا دەمردن و تۆش نەتدەتوانی بێیتە

ناو ئەم شارەوە، ئایا من نەبوم کە بەخەرجکردنی زێڕ و زیوی خۆم کەسانێکی شایستەم بەکرێ گرت بۆئەوەی تۆ لە لەشکری"هاتی"ئاگادار بکاتەوە و مەشکەی ئاوی لەشکری"هاتی"هەڵدڕن بۆئەوەی ئەسپ و سەرنشینی گاڵیسکەکانی تینویان ببێت و لەپێ بکەون؟

تەواوی ئەم کارانە من بۆ خزمەتکردنی تۆ و میسر ئەنجامم دا، لەکاتێکدا دەمزانی کە تۆ دەمودەست قەرزەکەی خۆمم پێ نادەیتەوە، لەکاتێکدا خەڵکانی تر داوای کرێیان لێ دەکردم و ئامادە نەبون بەخۆڕایی خزمەت بکەن.

تۆ دەزانی بەهۆی ڕوداوەکانی"تبس"ەوە دارایی خۆمم لەدەست دا و شکستم هێناو شتێکم نەبوو بۆئەوەی بیدەم بەوانەی کار و خزمەتێکیان بۆئەنجام دەدام، بۆیە ناچار بوم چەند کارێك بۆ"هاتی"و"ئازیرو"ئەنجام بدەم، بۆئەوەی زێڕیان لێ وەرگرم یان بەهەر شێوەیەك بووە بەهۆی هاوکاری ئەوانەوە وا لەو خەڵکە بکەم تۆ لەم جەنگەدا سەرکەوتن بەدەست بهێنی.

من بەشێوەیەك خزمەتی"هاتی"و پادشای"ئازیر"م کرد کە هیچ زیانێك بەتۆ نەگەیەنێت، بەڵام کارەکانی منی ئاسانتر دەکرد، من لەوباوەڕەدا بوم کە پیاوێکی شایستە دەبێت چەندین تیر لەتوڕەکەکەی پشتیدا بێت، بۆئەوەی ئەگەر هەندێك لەمانە ئامانجی خۆیان نەپێکا بتوانێت سود لەتیرەکانی تر وەرگرێت، هەر لەبەرئەوەش نوسراوێکی تەختەقوڕ"قوڕی خۆشەکراو"م لە"ئازیرو"پادشای سوریا وەرگرت، بۆئەوەی ئەگەر لەشکری سوریا ڕێم لێ بگرن و ببنە مایەی دەردیسەریم بتوانم بەو تەختە قوڕە خۆم ڕزگار بکەم.

دوای ئەوەی ئەسپەکانی لەشکری"هاتی"بەهۆی خواردنی ئەو ئالیکە ژەهراویەوە کەمن پێم فرشتبون تۆپین، ئەفسەرەکانی"هاتی"لەمن بەدگومان بون و منیش کە گیانی خۆم لەژێر هەڕەشەی مەرگدا بینی، لەڕێی دەریاوە خۆم گەیاندە"غەزە"، چونکە وا لێکم دایەوە فەرمانڕەوای "غەزە"ئەگەر بەڕێزیشەوە پێشوازی لەپیاوێك کە خزمەتێکی مەزنی بەمیسری کردووە نەکات ئەوا هیچ نەبێ بەدەرەفتاریشم لەگەڵدا ناکات، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو پیاوێکی شێتە، کاتێك منی لەجلوبەرگێکی سریانیدا بینی لێم بەدگومان بوو و دوای ئەوە پشکنیمی و تەختەقوڕەکەی "ئازیرو"ی دۆزیەوە، دوای ئەوە هەرچەنێك ویستم بۆی ڕونبکەمەوە و هێماکانی نێوان من و تۆم

پێنیشان دا، بەڵام ئەو ئامادە نەبوو ئەوە پەسەند بکات کە من خزمەتکاری لەشکری تۆ و میسر بم و بەشێوەیەك ئەشکەنجەی دام کە وەك مانگا دەمبۆڕاند و کاتێکیش ئاگاداری ئەوەبوم کە دەیەوێت من بکات بەدوو بەشەوە، ناچار بووم دان بەوەدا بنێم من سیخوڕی"ئازیرو"م.

"هورم هب"پێکەنی و وتی: "کاپتا"تۆ لەبەرئەوەی لەپێناو خزمەتکردن بەمیسر و لەشکری ئەو وڵاتەدا بەرگەی ئەو هەموو دەردیسەریەت گرتووە، بۆیە کرێی مەعنەویت زیاترە لەمادی، بەڵام لای من باسی زێڕو زیو مەکە، لەبەرئەوەی باشدەزانی ئەگەر داوای زێڕ و زیو لەمن بکەیت، من لەخۆت توڕە دەکەیت. بەڵام"کاپتا"دوای ئەو ڕتکردنەوە ڕوڕاستەی"هورم هب"شکستی نەخوارد و ئەوندە گریا و هاوار و پێداگری کرد تا ئەوکاتەی مافی کڕینو فرۆشتنی تەواوی دەستکەوتی جەنگەکانی ئەوو سەربازەکانی لێ وەرنەگرت وازی لێ نەهێنا.

بەهۆی ئەم مافی کڕینەوە"کاپتا"ئەو مافەی پێ بەخشرا کە تاکە کەسێك بێت کە بتوانێت دەستکەوتەکانی جەنگ لە"هورم هب"و سەربازەکانی بکڕێت و لەبەرامبەر ئەو دەستکەوتانەشدا کەرەستەی خۆراکیان پێ بفرۆشێت. هەروەها مافی ئەوەشی پێ بەخشرا کە ئەو دەستکەوتانەی لێیان دەکڕێت بەئارەزوی خۆی بەهەرشێوە و بەهەرکەسێك کە خۆی بیەوێت بیانفرۆشێت.

بەهۆی ئەم مافی کڕینەوە،مافی کڕینی ئەودەستکەوتانەی"هورم هب"لە"دەشتی ئێسقان"ەکاندا بەدەستی هێنا، بە"کاپتا"وە پەیوەست کرا و من تێگەشتم کە ئەم مافە بۆ دەوڵەمەند کردنەوەی "کاپتا"بەس دەبێت.

لەهەمان ئەو کاتەی کە"کاپتا"ئەم مافەی لە"هورم هب"وەردەگرتبوو، کۆمەڵێك لە بازرگانانی سوریا و میسر هاتن بۆ"غەزە" بۆئەوەی دەستکەوتی سەربازەکان بکڕن، بەڵام لەبەرئەوەی مافی کڕین و فرۆشتنی دەستکەوتەکان بە"کاپتا"وە پەیوەست دەکرا، نەیاندەتوانی بێ ڕەزامەندی ئەو بگرە ئەو دەستەکەوتانەی کە کڕیبویان لە"غەزە"ببنە درەوە، لەبەرئەوە بۆ بردنە دەرەوەی ئەو دەستکەوتانەش لەسوریا دەبوو باجیان بە"کاپتا"بدایە.

***

"هورم هب"دوای ئەوەی هێزی یاریدەدەر کە لەمیسرەوە هاتبوو پەیوەندی بە هێزەکەیەوە کرد و هەرچی ئەسپ کە لەباشوری سوریادا بوو بەدەستی هێنا و هانی سەربازەکانی دا مەشق لەسەر گالیسکە جەنگیەکان بکەن، چونکە دەیویست هێرش بکاتە سەر"ژوپە" کەیەکێکە لە لەنگەرگاکانی میسر، بەڵام پێش ئەوەی هێرش بکاتە سەر ئەم لەنگەرگایە، بانگەشەیەکی بڵاو کردەوە کە لەڕێی سیخوڕەکانیەوە بەهەموو شارەکانی سوریادا بڵاو بویەوە.

"هورم هب"لەم بانگەشەیەدا بەدانیشتوانی شارەکانی سوریای ڕاگەیاندبوو: من ناهاتوم بۆئەوەی ئەم وڵاتە داگیر بکەم، بەڵکو بۆ ئەوە هاتوم کە شارەکانی سوریا ڕزگار بکەم و دانیشتوانی شارەکانیش دەبێت من بەڕزگارکەری خۆیان بزانن، دەبێت بڵێم لەڕابردوودا پێش ئەوەی سوریا لەژێر دەستی میسر دەرچێت و بکەوێتە ژێر دەستەڵاتی"ئازیرو"و"هاتی"ەوە، هەریەك لەشارەکانی سوریا سەربەخۆییەکی تایبەت بەخۆیان هەبوو و لەهەموو شارێکدا پادشایەك فەرمانڕەوایی دەکرد. دانیشتوانی ئەم شارانە لەبەرئەوەی بەئازادی دەژیان و بازرگانی خۆیان دەکرد دەوڵەمەند بون، بەڵام دوای ئەوەی"ئازیرو"دەستی بەسەر سوریادا گرت، نەریتی کۆنی پشتگوێخست و سەربەخۆیی شارەکانی لەناو بردو پادشای شارەکانیان تەفروتوناکرد و باج و سەرانەیەکی زۆری لەشارەکان وەردەگرت."ئازیرو"لەبەرئەوەی کەسێکی تەماع بوو ئەم شارانەی بە"هاتی"فرۆشت و"هاتی"یش بە بێبەزەیی و تەماعییەکی تایبەت بەخۆی بەشێوەیەك دانیشتوانی ئەو شارانەی خستە ژێر فشارەوە کە هەرگیز سەردەمی فەرمانڕەوایی"هاتی"فەرامۆش نەکەن.

"هورم هب" دەیزانی کە خەڵکی سوریا لەستەمەکانی"هاتی"وەڕەس بوون، بۆیە لەبانگەشەکەی خۆیدا وتبوی: من کە"هورم هب"و کوڕی "شەهێن"م هەموو شار و قەزا و ناحیەو لادێیەك لەبەندی کۆیلایەتی ڕزگار دەکەم و دوپاتی دەکەمەوە کە تەواوی شارەکانی سوریا دوای ئەوەی وەکوو ڕابردوو ئازاد و سەربەخۆیی خۆیان وەردەگرنەوە و ئەو فەرمانڕەوایانەی کە پێش فەرمانڕەوایی "ئازیرو"و"هاتی"لەم شارانەدا فەرمانڕەواییان دەکرد، دوبارە دەیانگەڕێنمەوە سەر تەختی فەرمانڕەوایی خۆیان و قۆناخی گەشە و درەوشانەوە و خۆشی شار و ناحیە و لادێکانی سوریا سەرلەنوێ دوبارە دەبێتەوە.

"هورم هب"لەبانگەشەیدا داوای لەتەواوی شارەکانی سوریا کردبوو کە دژی"هاتی"یەکان ڕاپەڕن و شاربەدەریان بکەن، هەروەها وتبوی: هەرشارێك لەدژی"هاتی"شۆڕش بەرپا بکات، ئەو پشتوان و پارێزگاری دەبێت. بەڵام ئەو شارانەی کە لەبەرامبەر لەشکری میسردا بەرگری لەخۆیان بکەن، دوای زاڵبونی میسریەکان، دەکەونە بەر تالآنی سەربازەکانیانەوە و دانیشتوانەکەشی بەنرخی کۆیلە و کەنیزەك دەفرۆشین و حەساری شاریان بەشێوەیەك وێران دەکەین کەچیتر دوای ئەوە ئاوەدان نەکرێتەوە.

ئەم بانگەشەیەی"هروم هب"ناکۆکیەکی زۆری خستە نێوان دانیشتوانی سوریا و"هاتی"و مەبەستی"هورم هب"یش هەر ئەوەبوو.

کاتێك لەشکری"هورم هب"بەرەو لەنگەرگای"ژوپە"بەڕێکەوتن،"کاپتا"لە"غەزە"دا تەکانی نەخوارد، چونکە هێشتا دڵنیانەبوو لەوەی"هورم هب"بتوانێت لە"ژوپە"دا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، چونکە دەیزانی"ئازیرو"و"هاتی"ەکان لەناو سوریادا خەریکی کۆکردنەوەی لەشکری خۆیانن. دواجار"روژو"ی سەرەگا لەگەڵ"کاپتا"دا ئاشت بویەوە، چونکە تێگەشت کە ئەو سیخوڕی"ئازیرو"ی پادشای سوریا نەبووە، بەڵکو خزمەتی میسری دەکرد، هەروەها"کاپتا"ئەوی لەترسی ئەو چوارسەد"پاڵو"ەی کە ون بوبون ڕزگار کرد و پێیوت کە هیچ کەسێك"پاڵو"ی وڵاخەکانی نەدزیوە، بەڵکو سەربازەکانی لەبەرئەوەی برسیان بووە، پاڵوەکانیان کە لەچەرمی مەڕ دروست کرابون خواردووە.

سەرەگا، دوای ئەوەی زانی هیچ کەسێك "پاڵو"ەکانی نەدزیوە، بەڵکو سەربازەکانی خۆی خواردویانە، شێتیەکەی چارەسەر بوو و ئێمەش دەست و پێمان کردەوە و ئازادمان کرد، دەبێت ئەوەش بڵێم: دوای ڕۆشتنی"هورم هب"و لەشکرەکەی، من لە"غەزە"دا مامەوە و بینیم کە بە چ شێوەیەك چاوی کابرای زیندانەوانی پیر بەشێوەیەکی کاتی چارەسەر کرا و بینایی بۆ گەڕایەوە.

سەرەگا، دوای ڕۆشتنی"هورم هب"دەروازەی شاری بەست و وتی: چیتر لەمەودوا ڕێ بە هیچ لەشکرێکی سەربازی نادات بێتە ناو ئەم شارەوە و دەردیسەری بۆ دروست بکات. لەبەرئەوەی فەرمانڕەوای"غەزە"هیچ کارێکی بەدەستەوە نەبوو

بۆئەوەی خۆی پێوە سەرقاڵ بکات، بوبووە هاوڕێی"کاپتا"و لەگەڵیدا دەیخواردەوە و تەماشای یاری"زار زوری"کاپتا و کابرای زیندانەوانی دەکرد.

"کاپتا"و کابرای زیندانەوان، لەبەیانیەوە تا ئێوارە دەیانخواردەوە و یاری زاریان دەکرد و لەگەڵ یەکدا دەبووە دەمە بۆڵەیان، چونکە کابرای زیندانەوان لەبەرئەوەی دەدۆڕا تورە دەبوو و هەوڵی دەدا لەهەر یاریەکدا لەسەر بڕێکی کەمتر گرەوی لەگەڵدا بکات، بەڵام"کاپتا"ئەوی هانی ئەوە دەدا گرەو لەسەر بڕێکی زیاتر بکات.

کاتێك لەشکری"هورم هب" گەشتە"ژوپە"[44] یاری"کاپتا"و زیندانەوانی پیریش تا دەهات زۆرتر دەبوو، من بیستم کە ئەمانە هەرجارەو لەسەر سەدوپەنجا هەزار "دین" زێڕ گرەویان دەکرد.

کاتێك"هورم هب"سەرکەوتنی لەوەدا بەدەست هێنا کە درزێك بخاتە ناو حەساری "ژوپە"دا، زیندانەوانی پیر نەك تەنها ئەو زێڕەی کە"کاپتا"قەرزاری بوو دۆڕاند بەڵکو دوسەد هەزار "دین"یش قەرزاری بوو. بەڵام"کاپتا"جوامێری لەگەڵدا کردو لەو بڕە زێڕەی خۆی خۆش بوو، بگرە چەند ئەنگوستیلەیەکیشی پێدا، کاتێکیش من و "کاپتا"ویستمان لە"غەزە"وە بەرەو"ژوپە" بڕۆین، کابرای پیرەمێرد بەهۆی دەستپاکی کاپتاوە بەدواماندا دەستی کرد بەگریان.

من نازانم کە ئایا"کاپتا"بە"زار"ێکی پاك و دروستەوە یاری لەگەڵ پیرەمێرددا کردووە یان زارێکی ساختەی بەکار هێناوە، بەڵام ئاگاداری ئەوەم کە لەیاری زارزوردا زۆر لێهاتوو بووە. دوای ئەوەی ئێمە لە"غەزە"ڕۆشتین ناوبانگی ئەم یاری زارزورە بۆماوەی چەند هەفتەیەك لەناو شاردا ناوبانگی دەرکرد کە دوو کەس لەسەر چەند ملیۆنێك"دین"زێڕ گرەویان لەگەڵ یەکدا کردووە.

زیندانەوانی پیریش دوای ڕۆشتنی ئێمە، دوبارە کوێربویەوە و بەو زیوانەی کە لە"کاپتا"ی وەرگرتبوو خانویەکی لەبن حەساری شاردا بۆخۆی دروست کرد و دواین ڕۆژەکانی لەو خانووەدا بەسەر برد، لەبەرئەوەی"غەزە"لەچنگی"هاتی"ڕزگاری بوو، دوبارە گرنگی بازرگانی ڕابردووی بۆ گەڕایەوە و گەشتیارانێکی زۆر سەردانی ئەو شارەیان دەکرد و هەر کەسێك لەدەرەوە یان لەناوەوەی سوریاوە سەردانی"غەزە"ی

[44] ژوپە: شار و لەنگەرگایەکە کە لەمرۆدا بە ناوی"یافە" یان"یافا" ناو دەبرێت..

بکردایە و بیویستایە زیندانەوانی پیر و کوێر ببینێت، بۆئەوەی باسی ئەو قومارە مەزنەی کە تا ئەوکاتە لەمیسر و سوریادا هاوشێوەی نەبوو لەدەمی خودی ئەوەوە ببیستن، پیرەمێردیش بەخۆشی و شانازیەکەوە باسی وردەکاری ئەو قومارەی بۆ دەکردن کەتا ئەوکاتەش فەراموشی نەکردبوو، کاتێك دەگەشتە ئەو خاڵەی کە تەنها بەهەڵدانی یەك زار سەدوپەنجاهەزار"دێن"زێڕی دراوندووە، خەڵکی لەسەرسوڕماویاندا دەستیان دەکرد بەهاوارکردن، چونکە تا ئەوکاتە نەیانبیستبوو کە فیرعەونێکیش بتوانێت بەهەڵدانی یەك زار سەد و پەنجا هەزار"دێن" بدۆڕێنێت. هەرکەسێکیش سەردانی ئەو پیرەمێردەی بکردایە، بڕێك مس یان زیوی پێ دەبەخشی، بەشێوەیەك لەشێوەکان ناوبانگی ئەو پیاوە کوێرە بوو بە کەرەستەیەکی زۆرباشی دابینکردنی بژێوی ژیانی و هەر بەوشێوەی ئاگادارم، تا ئەو ڕۆژەی زیندوو بوو، زۆر بەئاسودەیی دەژیا ولەوانەیە ئەگەر"کاپتا"سەرمایەیەکی بەو بدایە بۆئەوەی کەمێك بەهۆی دەستەکوتەکانیەوە بژیت، بەوشێوەیە ئەو ژیانە خۆشەی بەو پیرەمێردە نەبەخشیایە.

کاتێك"هورم هب"دەستی گرت بەسەر"ژوپە"دا من و"کاپتا"ش گەشتبوینە ئەوێ، ئەوکات من بۆ یەکەمین جار بینیم کاتێك داگیرکەران دڕۆنە ناو شارێکی دەوڵەمەندەوە چی لێ دەکەن.

کاتێك"هورم هب"گەمارۆی شاری"ژوپە"ی دا، لەدواین ڕۆژەکانی شکست پێهێنانی ئەو شارە، هەندێك لە دانیشتوانی هەڵەشەی ئەو شارە ڕاپەڕینیان دژی هێزە سەربازیەکانی"هاتی"کرد و بۆ ڕزگارکردنی خۆیان قوربانیان دا، بەڵام"هورم هب"بەناونیشانی ئەوەیکە لەکاتێکدا شۆڕش بەرپابووە کە هیچ سودێکی بۆ لەشکری میسر نەبووە، ڕازی نەبوو لەسەرئەوەی ئەو شارە تاڵان نەکات.

ئەوکات سەربازەکانی"هورم هب"بۆماوەی دوو هەفتە ئەو شارەیان تاڵانکرد و کاپتا توانی لەهەمان ئەو دوو هەفتەیەدا دەوڵەمەند ببێت.

لەبەرئەوەی سەربازەکانی"هورم هب"هیچ چارەیەکی تریان بەدەستەوە نەبوو جگە لەوەی سامانی تاڵانکراویان بە"کاپتا"و کارمەندەکانی بفرۆشن و لەبەرامبەردا ئاوجۆ و شەرابی لێ بکڕن و"کاپتا"ش فەرش و قەنەفە و مێز و پەیکەری خوداپانی بەنرخێکی زۆر هەرزان لێ دەکڕین.

ئەو سەربازانەش کە هەریەکێکیان کۆمەڵێك دیلیان هەبوو، هەر دیلێکیان بەنرخی دوو ئەنگوستیلە دەفرۆشت، چونکە جگە لەو هیچ کڕیارێکی تر لەوێدا نەبوو، بەپێی ئەو مافەی کە"هورم هب"دابوی بە"کاپتا"هیچ کەسێك نەیدەتوانی ئەو سامان و کەلوپەل و کۆیلە و کەنیزانەی کە لەو جەنگەدا بەدەستیان هێنابوو لێیان بکڕێت.

من لەوشارەدا هیچ دڕندەیەکم لەبەرامبەر مرۆڤدا، لەخودی مرۆڤ ترسناکتر و دڕەندەتر نەبینیوە. کاتێك دەستەیەك مرۆڤ، بەسەر دەستەیەکی تری مرۆڤدا زاڵ دەبێت، بەشێوەیەك ڕەفتار لەگەڵ شکستخواردووەکاندا دەکەن کە دڕەندەکانی ناوچەی باشوری میسریش بەو شێوەیە ڕەفتار لەگەڵ گیانەوەرانی دارستاندا ناکەن.

چونکە کاتێك دڕەندە تێری خوارد، چیتر دوای ئەوە کاری بەگیانەوەرانی دارستانەوە نامێنێت، مەگەر ئەوەی برسی بێت، بەڵام ئەو گیانەوەرەی ناوی"مرۆڤ"ە، هەرگیز تێر ناخوات و ئەگەر تەواو سامانی میسر و سوریا و"بابل"ی پێ بدەیت، دوبارە سەرلەنوێ دەکوژێت و ماڵ وێران دەکات، بۆئەوەی بتوانێت سامانێکی زیاتری بەدەست بهێنێت و کاتێکیش پەیی بەوە برد کە ناتوانێت هیچ شتێك لەخەڵکی بەدەست بهێنێت بۆئەوەی سامانەکەی خۆی پێ زیاتر بکات، کەسانی تر لەڕوی توڕەییەوە دەکوژێت، بەبیانوی ئەوەی بۆچی هیچ سودێکی بەو نەگەیاندووە و نەبووەتە هۆی زیادکردی سامانەکەی.

من بەچاوی خۆم بینیم کە سەربازەکانی میسر لە"ژوپە"دا ئاگریان بەردەدایە ماڵەکان، بۆئەوەی لەبەر ڕوناکی ئاگرەکاندا، بتوانن لەکاتی شەودا مەی بخۆنەوە و خۆیان سەرگەرم بکەن. من بەچاوی خۆم بینیم کاتێك سەربازە میسریەکان دەیانویست دارایی بازرگانێك زەوت بکەن بەچ شێوەیەك ئەشکەنجەیان دەدا، بۆئەوەی پێیان بڵێت زێڕ و زیوەکەی لەکوێدا شاردووەتەوە؟ ئەوەشم بەچاوی خۆم بینی کە سەربازەکانی میسر لەچوارڕیانێکدا ڕادەوەستان و هەرکەسێك لەوێوە تێبەپەڕیایە، چ ژن یان منداڵ یان پیر بوایە دەیانکوشت، و کەرەستەی قەرەوڵی تیرهاوێژە میسریەکان ژن و پیاو و منداڵی شاری"ژوپە"بوو.

من وام دەزانی ئەو دیمەنانەی کە لەکاتی جەنگی خودایانی شاری"تبس"دا بینیم، ترسناکترین دیمەنبوبێت کە لەسەرتاپای تەمەنمدا بینیبێتم، بەڵام کاتێك کارەساتی

سـەربازەکانی "هـورم هـب"م لەشـاری "ژوپـە"دا بینـی، ئاگـاداری ئـەوە بـووم کـە کارەساتەکانی شاری "تبس" لەچاو ئەم کارەستانەدا وەك یاری منالان وایە.

لەبەرئـەوەی لـە "تـبس"دا لایـەنگرانی "ئـامون"و "ئـاتون"دوو میـسری بـون کـە هەنـدێکات بـەزەییان بەمنـدالو ژنانـدا دەهاتـەوەو وەك ژنو منداڵەکـەی مـن نەیاندەکوشتن، بەڵام سەربازەکانی "هورم هێ"لە "ژوپە"دا منداڵە شیرخۆرەکانیشیان دەکوشت و "هورم هب"یش بەتەواوی لەئەنجامدانی هەرکارێکدا ئازادی کردبون.

من لەوباوەڕەدام کە کوشت و کوشتاری سەربازانی "هورم هب" لەشاری "ژوپە"دا بەهیچ شێوەیەك فەرامۆش ناکرێت و لەم کوشت و کوشتار و تالانیە بێوێنەیەدا، سەربازە میسریەکان تامی بەدەست هێنانی سامانیان کرد.

من دەتوانم بڵێم کە "هورم هب" لەشاری "ژوپە"دا بەئەنقەست سەربازەکانی خۆی لەم کوشت و کوشتارەدا ئازاد کردبوو، بۆئەوەی بزانن تالانی سامان و دارایی خەڵکی و بەدیلکردنی ژن و منداڵە بێتاوانەکانیان چ چێژێکیان پێ دەبەخشێت و لەئایندەشدا بۆ بەدەست هێنانی چێژی هاوشێوەی ئەمانە، خۆیان ڕوبەڕوی هەموو هەڕەشەیەك بکەنەوە. هەرواش بوو، دوای کۆتایی هاتنی جەنگی "ژوپە" کاتێك "هورم هب" ویستی دەست بەسەر تەواوی شارەکانی تری سوریادا بگرێت، سەربازەکانی بۆ بەدەست هێنانی شەراب و ژن و زێر، باکیان لەهیچ هەڕەشەیەك نەبوو و پێشوازیان لەمەرگ دەکرد.

یەکێك لەوشتانەی کە سەربازەکانی میسری هان دەدا بۆئەوەی هەموو هەوڵێکی خۆیان بخەنە گەڕ بۆئەوەی سەرکەوتن بەدەست بهێنن، یان بکوژرێن، ئەوەبوو کە دەیانزانی سەربازەکانی "ئازیرو"ی پادشای سوریا هیچ کەسێك بەدیلی وەرناگرن و هەر سەربازێکی میسریش خۆی بدات بەدەستەوە بەزیندویی پێستی دەکەنن و بەڵگەشیان بۆ ئەم کارە ئەوەبوو بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ئەمانیش وەك تەواوی سەربازە میسریەکانی تر بەشداریان لە کوشت و کوشتار و تالانی سوریادا کردووە.

کاتێك هەواڵی کوشت و کوشتاری شاری "ژوپە" بەهەموو شارەکانی سوریادا بڵاو بویەوە، چەند شارێك لەترسی گیانیان شۆڕشیان بەرپا کرد و لەشکری سەربازی "هاتی"یان شاربەدەرکردو هەر ئەوەی "هورم هب" گەشتە ئەو شارە، دەروازەی شاریان بەڕویدا کردەوە.

من لەوە زیاتر باسی کارەساتی سەربازە میسریەکانتان لەشاری"ژوپە"دا بۆ ناکەم، چونکە هەرکاتێك ئەم کارەساتە بەبیر دەهێنمەوە لەخەمدا دڵم وەك بەردێك لەسینەمدا قورس دەبێت و دەستەکانم وشك دەبن و لەسەر پاپیرۆس وێنەی ئەم کارەساتانەم بۆ ناکێشرێت.

تەنها ئەوە دەڵێم پێش ئەوەی"هورم هب"بێتە ناو شاری"ژوپە"وە، لەو شارەدا، بیست هەزار کەس بێ لەمندالآن کە لەژماردن نەدەهاتن، دەژیان، بەلاّم کاتێك"هورم هب"ئەو شارەی بەجێ هێشت تەنها سێ سەد کەسی تێدا مابوو.

ئەو جەنگانەی تر کە"هورم هب"لەسوریادا کردی، هەموویان وەك شەڕی"ژوپە" وابون. من کە وەك پزیشکێك لەگەڵ لەشکری"هورم هب"دابووم و بریندارانم تیمار دەکرد، توانیم ئەوە ببینم کە بەچ شێوەیەك جۆری مرۆڤ خۆی سەرچاوەی نەهامەتی و بەدبەختی هاوڕەگەزەکانی خۆیەتی.

جەنگی سوریا ماوەی سێساڵی خایاند و"هورم هب"چەند جارێك شکستی بە لەشکری "هاتی"و "ئازیرو"هێنا.

سەرەڕای ئەوەی گالیسکەکانی"هاتی"توانیان زۆر بۆ"هۆرم هب"بهێنن، بەلاّم ئەو سەرکەوتنی لەوەدا بەدەست هێنا کە خۆی بگەیەنێتە پەنای حەسارەکانی شارو لەشکری خۆی لەناوچون ڕزگار بکات، هەروەها لەبەرئەوەی"هورم هب"توانی پەیوەندی دەریایی خۆی لەگەڵ میسردا بپارێزێت، هەموو جارێك دەیتوانی داوای هێزی سەربازی لەمیسر بکات و لەحەسار بێتە دەرەوە و بەردەوامی بەجەنگەکانی بدات.

بەهۆی ئەم جەنگەوە لەماوەی سێ ساڵدا شارەکانی سوریا وێران بون و خەڵکی کە هیچ شوێنێکی هێمن و ئاسایشیان نەبوو، شار و لادێکانیان بەجێ هێشت و پەنایان بۆ کێوەکان برد، هەڵبەت جگە لەو شوێنانەی کە کەوتبوە دەستی هێزەکانی میسرەوە هیچ شوێنێکی تریان نەبوو، چونکە لەم ناوچانەدا کە بە بەشێك لەڕێڕەوی میسر لەقەڵەم دەدرا، خەڵکی هێمنی و ئاسایشیان هەبوو و دەیانتوانی کشتوکاڵ و بازرگانی بکەن، بەلاّم هەروەك چۆن شارەکانی سوریا بەهۆی جەنگی سێ ساڵەوە وێران بوو، شار و ناحیەکانی میسریش لەم جەنگەدا دانیشتوانی تێدا کەمبوبویەوە و بەدرێژایی هەردوو کەناری ڕوباری"نیل"شار و ناحیەیەك بەدی نەدەکرا کە خێزانەکان پیاوێك

یان چەند پیاوێکی خۆی لەجەنگی سوریادا لەدەست نەدابێت، بەڵام"هورم هب"دەیویت: ئەم قوربانیدانە لەپێناو مەزنی میسر، وڵات دەبێتە خاوەنی خاکێکی ڕەشی زۆر.

لەماوەی ئەم سێ ساڵەدا"هورم هب"لەسوریادا بەبەردەوامی دەجەنگا و منیش بەبەردەوامی لەگەڵ سەربازەکانیدا بوم و بریندارەکانم تیمار دەکرد، گەرچی لەڕوی زانستی پزیشکی نەشتەرگەریەوە فێری ئەزمونگەلێکی نوێ بوم، بەڵام پشتم کوڕ بوبوو چرچ و لۆچی کەوتبووە ڕوخسارمەوە.

بەچاوی خۆم ئەوەندە کارەسات و تاوانی ترسناکم بینی کە بووە هۆی ئەوەی نەرمو نیانی و نەریتی هزری خۆم لەدەست بدەم و منیش وەك پزیشکە پیرەکان بەتوڕەییەوە قسەم دەکرد و بەپێچەوانەی سەردەمی لاویەتی، بەنەرمونیانیەوە مامەڵەم لەگەڵ بریندارەکاندا نەدەکرد.

لەسێیەمین ساڵی ئەو جەنگەدا، نەخۆشی"تاعون"لەسوریادا باڵاو بویەوە و هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە نەخۆشی تاعون هەمیشە دوای جەنگە درێژخایەنەکان دێنە بون، چونکە لاشەیەکی زۆری مرۆڤگەلی کوژراو لەیەك شوێندا کۆدەبێتەوە و لەبەرئەوەی ناتوانرێت لاشەکان مۆمیابکرێن و بنێژرێن، یان بێئەوەی مۆمیا بکرێن بنێژرێن، جەستەی مرۆڤەکان، لەهەمان ئەو شوێنەدا هەڵدەوەشێت و بۆگەن دەکات و تاعون کە نەخۆشیەکی گەڕۆك"ساری"ە لەنێو خەڵکدا دەردەکەوێت و بڵاو دەبێتەوە.

*بەشی پەنجا و یەکەم*

## شەوێك لەگەڵ پیاوێكی شكست خواردودا

بەهۆی بەردەوامی جەنگەوە سەرتاسەری سوریا گۆڕا بەكوشتارگایەكی پڕ لە لاشەی نەنێژراو، بۆیە پێویستی بەوە نەدەكرد سەرت لەبڵاو بونەوەی نەخۆشی تاعون سوڕ بمێنێت.

ئەو تاعونە بەڕادەیەك كوشت و كوشتاری خستە ناو نەتەوەی سوریاوە كە هەندێك لەنەتەوەكانی سوریا بەتەواوی لەناو چون، هەڵبەت بەشێوەیەك لەناوچون كە بگرە زمانیشیان فەرامۆش كرا و لەئێستادا هیچ كەسێك نازانێت كە ئەو نەتەوەیە بەچ زمانێك گفتوگۆیان كردووە.

ئەم نەخۆشیە بەشێوەیەك سەربازەكانی لەبەرەی جەنگی میسر و پادشای سوریا و "هاتی"دا بەكوشت دا كە چیتر كاری جەنگی سەربازی ڕاوەستا و سەربازەكان لەدەشتەكانەوە بەرەو شوێنە شاخاویەكان هەڵهاتن بۆئەوەی خۆیان لەنەخۆشی تاعون بپارێزن.

نەخۆشی تاعون وەك"ئاتون"ی خودای پێشوی میسر، خوازیاری یەكسانی بوو، چونكە هیچ جیاوازیەكی لەنێوان هەژار و دەوڵەمەند و ژن و پیاوو لاوو پیرو جوان و ناشیریندا نەدەكردو هەموویانی لەخشتە دەبردو وەجاخزادەیەكی وەك سواڵكەرێك لەناو دەبرد.

هیچ یەك لە دەرمانە ئاساییەكان نەیدەتوانی ڕێ لەم نەخۆشیە گەڕۆكە بگرێت و ئەم نەخۆشیەش بەڕادەیەك توند و بەهێز بوو كە ئەوانەی توشی ئەم نەخۆشیە بوبون،

دامێنی کراسەکەی خۆیان دەدا بەسەریاندا و لەسەر زەوی پێیان درێژ ڕادەکێشا و دوای سێ ڕۆژ دەمردن.

هەندێکیشیان چارەسەر دەبون و دومەڵێکی مەزن لەبن باڵ یان لەبنی ڕانیاندا دەردەچوو و برینی چڵکی"ئیلتهاب" دومەڵی ئەو تاعونەش لەوێوە دەردەچوو، بەڵام تا ئەوکاتەی زیندوو بون برینی شوێنی ئەو دومەڵە لەو شوێنەدا لەناو نەدەچوو، هەر ئەو برینەش ئەوەی پێنیشان دەداین کە ئەمانە دوچاری چ هەڕەشەیەکی ترسناك بونەتەوە.

من لەنێو ئەو بەڵا مەزنەدا ئاگاداری ئەوەبووم کە نەخۆشی تاعون، وەك ئەو پیاوە وایە کە بیروبۆچونێکی جێگیری نیە و لەبەرئەوەی کاری هەمیشەیی کوشتنی مرۆڤە، بەڵام هەندێك مرۆڤی لەکوشتن بێبەش دەکرد.

بۆنمونە ئەوانەی بەهێزو تەندروست بون، زیاد لەو کەسانەی لاواز بون، بەهۆی ئەم نەخۆشیەوە دەمردن و کاتێك پیاوێکی لاوازو کەم خوێن توشی ئەم نەخۆشیە دەبوو، زۆر ئەگەری ئەوەی هەبوو لەم نەخۆشیە ڕزگاری ببێت و بەزیندوویی بمێنێتەوە.

بەهەمان شێوە ئەوکاتانەی من چارسەری توشبوانی تاعونم دەکرد، چەندجارێك توشبوانم هانی ئەوە دەدا کە خوێنی لەشیان کەم بکەنەوە بۆئەوەی لاواز بن، هەروەها پێم دەوتن بۆماوەی چەند ڕۆژێك خواردن نەخۆن. بەڵام سەرەڕای ئەوەی کۆمەڵێك لەو توشبوانە، بەبرینداركردنی بەردەوامی شاڕەگی خوێنیان و خۆپاراستن لەنانخواردن، چارەسەرکران، من ناتوانم بڵێم کەئەم ڕێگە چارەسەرەی من بووە هۆی ئەوەی ئەمانە چاك ببنەوە یان نە؟ چونکە هەندێکی تریان بەهەمان شێوەی ئەوانی تر کە لەژێر چاودێری و چارەسەری مندا بون مردن.

سەرەڕای ئەوەی من هیوادار نەبوم کە ئەم ڕێگەچارەیەم کار لەنەخۆشەکان بکات، بەڵام هەر هەوڵی چارەسەرکردنیانم دەدا، چونکە کەسی پزیشك ئەگەر بیشزانێت بەدڵنیاییەوە کەسی نەخۆش دەمرێت، نابێت خۆی لەچارەسەرکردنی بپارێزێت، چونکە لەم حاڵەتەدا ئەگەر چاکیش ببێتەوە لەنائومێدیاندا دەمرێت، بۆیە لەهەموو حاڵەتەکاندا پزیشك دەبێت بەشێوەیەك خۆی پیشان بدات کە دەتوانێت چارەسەری ئەو نەخۆشیە بکات.

من نالێم شێوازی چارەسەرکردنەکانی من کاریگەر بون، بەڵام ئەو سودەی هەبوو کە کەسە هەژارەکانیش دەیانتوانی ئەو شێوازە چارەسەریە بەکار بهێنن، چونکە گران بەسەریاندا تەواو نەدەبوو و بڕینی خوێنبەر و خۆپاراستن لەنان خواردن بۆ هەژاران بەهەرزانترین دەرمان لەقەڵەم دەدرا.

ئەو کەشتیانەی لەنێوان میسر و سوریادا هاتوچۆیان دەکرد، نەخۆشی تاعونیان گواستەوە بۆ میسر، بەڵام ئەم نەخۆشیە زیانێکی زۆر بەخەڵکی میسر نەگەیاند و ژمارەی ئەو توشبوانەی کە چارەسەر دەکران، زۆر زیاتر بوو لەوکەسە توشبوانەی کە دەمردن و کاتێك وەرزی پاییز دەهات و ڕوباری"نیل"هەڵدەستا نەخۆشی تاعون لەمیسردا لەناو دەچوو.

بەگەشتنی وەرزی زستان، لەسوریاشدا نەخۆشی تاعون نەماو ئەوکات"هورم هب" توانی سەربازەکانی خۆی کە لەناوچە کێوییەکاندا پەرژوبڵاوبوبون کۆبکاتەوە. لەوەرزی بەهاردا"هورم هب" لەگەڵ سەربازەکانیدا خۆی گەیاندە بەشتەکانی "مجیدو"و لەجەنگێکی مەزنی ئەو دەشتەدا، بەشێوەیەك شکستی بەهێزی سەربازی"هاتی"هێنا کە بووە هۆی ئەوەی داوای ئاشتیان لێ بکەن، چونکە ئاگاداری ئەوەبون ئەگەر لەگەڵ"هورم هب"ئاشتی نەکەن، ئەوا دەکەونە بەر پلاری هێرشی "بابل"یەکان.

"بورابوریاش"کە لەسەردەمی"ئەخناتون"دا لەگەڵ حکومەتی میسردا یەکیگرت، کاتێك بیستی"هورم هب" لەدەشتی"مجیدو"دا شکستی بەلەشکری"هاتی"هێناوە، بڕیاری ئەوەی دا هێرش بکاتە سەر وڵاتی"میتانی" و ئەو وڵاتە لەهاتی وەرگرێتەوە و هەمان ئەو کارەشی کردو دەستی بەسەر وڵاتی"میتانی"دا گرتو هێزەکانی "هاتی"لەم وڵاتە هەڵهاتن و کێڵگە و ئەو لەوەرگایانەی کە دەکەوێتە سەرچاوەی نێوان دوو ڕوباری مەزنی ئەو وڵاتەوە کە لە"بابل"ەوە هەڵدەقوڵێت کەوتە ژێر دەستی پادشای"بابل"ەوە.

ئەفسەرانی"هاتی"کاتێك لەسوریادا شکستیان هێنا ئاگاداری ئەوەبون سوریا بەشێوەیەك وێران بووە کە چیتر بەهیچ شێوەیەك ناتوانن سودی لێ وەرگرن، بۆیە نەیانویست پاشماوەی ئەو گالیسکە جەنگیانەی بۆیان ماوەتەوە و دەبوو لەدژی پادشای"بابل"دا بەکاری بهێنن لەسوریادا لەدەستی بدەن.

"هورم هب"زۆر خۆشحاڵبوو بەپێشنیاری ئاشتی"هاتی"ەکان، چونکە جەنگی سێ ساڵەی سوریا زیانێکی زۆری بەمیسر گەیاندبوو و"هورم هب"یش دەیویست کۆتایی بەم جەنگە بهێنێت، بۆئەوەی بتوانێت سوریا ئاوەدان بکاتەوە، بەڵام یەکێك لەمەرجەکانی ئاشتی ئەم بەڵێننامەیە ئەوەبوو کە هێزەکانی"هاتی" شاری "مەجیدو"ی پایتەختی سوریا و پادشای ئەو شارە لەگەڵ ژن و منداڵەکەیدا بداتەوە دەستی"هورم هب".

چونکە"ئازیرو"پادشای وڵاتی"ئامورو"دوای ئەوەی بەسەر سوریادا زاڵ بوو، پایتەختی خۆی گۆڕی و"مجیدو"ی کردە پایتەختی خۆی. هێزەکانی"هاتی"ش لەشاری"مجیدو"دا پەلاماری کۆشکی"ئازیرو"یان دا و ئەو و ژن و منداڵەکەیان دەستگیر کرد، لەکاتێکدا کە بەزنجیر بەستبونیانەوە هەموویانیان دایە دەستی"هورم هب"ەوە.

دوای ئەوەی لەشکری"هاتی"پادشای سوریاو ژنو منداڵەکەیان دا بەدەستی"هورم هب"ەوە، لەبەرئەوەی دەیانزانی دەبێت"مجیدو"ی پایتەختی سوریان بەجێ بهێڵن، ئەو مەڕو مانگایانەی کە بەدەستیان هێنا، لەسوریا بردیانە دەرەوە و ڕوانەی وڵاتی"هاتی"ان کردن.

"هورم هب"دوای ئەوەی"ئازیرو"پادشای سوریا و ژن و منداڵەکەی زیندانی کرد، فەرمانی دا، فوو بەبوقەکاندا بکەن، بۆئەوەی هەمووان بزانن کە کۆتایی بەجەنگ هاتووە و لەنێوان و میسر و"هاتی"دا ئاشتی بەرقەرار بووە.

دوای ئەوە بەخۆشی ئەم ئاشتیەوە بانگێشتی ئەفسەر و فەرمانڕواکانی"هاتی"کرد کە لەشەوی دوای بەرقەرارکردنی ئاشتی، لەو میوانداریەی کە بەرپا دەبێت پێکەوە کۆببنەوە بڕیاری ئەوەی دا لەڕۆژی دوایی ئەو میوانداریەدا،"ئازیرو"ی پادشای سوریا و ژن و منداڵەکەی بەئازار و ئەشکەنجەیەکی ترسناکەوە بەبەرچاوی هەموو سەربازەکانەوە لەسێدارە بدات.

من بەهۆی پێشینەی ئاشنایەتی و دۆستایەتیم لەگەڵ"ئازیرو"دا کە لەسەرەتای ئەم بەسەرهاتانەمدا بۆم باسکردن، هەر بەوشێوەیەی پێم ڕاگەیاندن پێش ئەوەی ببێتە پادشای سەرتاسەری سوریا، لەوڵاتی خۆی"ئامورو" کەیەکێکە لە وڵاتانی سوریا، میوانداریێ کردم، ئەوشەوە نەڕۆشتم بۆ میوانی"هروم هب" بەڵکو لەباتی

ئەوەی لەمیوانداریەکەی"هروم هب"دا ئامادە بم، ڕۆشتم بۆ ئەو چادرەی کە"ئازیرو" تێیدا بەزنجیر بەسترابویەوە و زیندانی کرابوو.

من دەمزانی ئەو پیاوەی کە پادشای سەرتاسەری سوریا بوو، لەوشەوەدا سەرەڕای ئەوەی لەفەرمانڕەوایی خۆی کەتبوو و بڕیاری مەرگی بۆ دەرکرابوو و دەبوو لەڕۆژێکی تردا بەئازار و ئەشکەنجەیەکی ترسناکەوە لەسێدارە بدرێت، هاوڕێیەك شك نابات، هەروەها دەشمزانی کە"ئازیرو" پیاوێکە کە زۆر پەیوەستە بەژیانەوە و ناتوانێت بەو ئاسانیە پشت لەژیان بکات.

من دەمویست پێی بڵێم کە ژیان بەوشێوەی خۆی لێکی دەدایەوە خۆشەویست نیەو ئەگەر ئەوەی من لەسەرتاپای ژیانمدا بینیم ئەو بیبینیایە، زۆر بەئاسانی دەستی لەژیان دەشۆرد، لەبەرئەوەی پزیشکم دەمویست پێی بڵێم کە مەرگ بۆ ئازار جەستەیی و خەمە مەزنەکان و نائومێدیەکانی ژیانی ڕوداوێکی زۆر دڵخۆشکەرە، لەبەرئەوەی بەردەوام لەژیاندا ئازار دەچێژێت، نەك لەکاتی مەرگدا.

دەمویست تەواوی ئەم قسانەی بۆ بکەم کە لەوانەیە لەو شەوەدا، بتوانێت خەوی لێبکەوێت، چونکە دەمزانی پیاوێکی وەك ئەو کە زۆر ژیانی خۆشدەویست و بەژیانەوە پەیوەست بوو، ناتوانێت لەشەوێکدا بخەوێت کە دەزانێت لەبەیانی ڕۆژی داهاتوو دەمرێت.

ئەگەر ئەم قسانەم کاری کردە سەر باری دەرونی ئەو چی لەوە باشترە، ئەگەر کاریشی تێنەکان، ئەوا من لەتەنیشتیەوە دادەنیشم بۆئەوەی تا بەیانی تەنها نەبێت، چونکە مرۆڤ دەتوانێت بێ هاوڕێیەك ساڵهای ساڵ بژی، بەڵام لەکاتی مەرگدا بەلایەنی کەم پێویستی بەیەك هاوڕێیە، بەتایبەت ئەگەر یەکێك بێت لە سەرکردە یان پادشا مەزنەکان.

کاتێك"ئازیرو"دوای دەستگیرکردنی هێنایان بۆ ئۆردوگای"هورم هب"سەربازە میسریەکان جنێویان پێدەداو تەرسەقوڵی ئەسپیان تێدەگرت، منیش لەوکاتەدا لەتەنیشت"هورم هب"ەوە دانیشتبوم، ڕوخساری خۆم بەدامێنی کراسەکەم داپۆشیبوو بۆئەوەی ئەو چاوی پێم نەکەوێت و بەبینینم شەرمەزار نەبێت.

من دەمزانی کە"ئازیرو"پیاوێکی خۆ بەزلزانەو دەزانێت کە من لەڕابردوودا ئەوکاتانەی ئەوم بینیبوو لەترۆپکی فەرمانڕەوایی و دەستەڵاتیدا دەژیاو خۆی ئامادەی

ئەوە کردبوو کە سەرتاسەری سوریا لەژێر دەستی میسر وەرگرێتەوە و بەدڵنیاییەوە نەیدەویست من بەوشێوەیە زەبون و لاواز ببینم. لەو شەوەدا کاتێك ویستم بڕۆمە ناو چادرەکەی"ئازیرو"وە پارێزەرانی ئەو چادەر ڕێیان لێ نەگەرتم، لەبەرئەوەی دەیانزانی کە من پزیشکم و وایان دەزانی بۆئەوە دەڕۆمە لای بۆئەوەی برینەکانی بۆ تیمار بکەم، ئەگەر"ئازیرو"برینداریش نەبوایە ئەوا پاسەوانەکان ڕێیان لەچونە ژورەوەم نەدەگرت.

کاتێك چومە ناو چادرەکەوە سەربازە پاسەوانەکانی ئەو چادرە وتیان: بهێڵن با ئەو پیاوە بڕواتە ناو ئەو چادرەوە، چونکە ئەو"سینۆهە"ی کوڕی کەرەو هاوڕێی "هورم هب"ە، ئەگەر ئێمە ڕێ لەچونە ژورەوەی بگرین ئەوا ئەو بەزمانی خۆی کە وەك چزی دوپشك وایە دەمانگەزێت یان سود لەزانستی پزیشکی خۆی وەردەگرێت و ئێمە لەپیاوەتی دەخات.

من بێ هیچ دەردیسەریەك چومە ژورەوەو وتم: "ئازیرو"پادشای وڵاتی"ئامورو" ئایا لەشەوێکدا کە لەبەیانی ڕۆژی دوایی هەمان ئەو شەوەدا دەمریت، حەز دەکەیت هاوڕێیەکت هەبێت؟

دەنگی زنجیری"ئازیرو"لەتاریکی ئەو چادرەدا بیستراو دوای ئەوە ئاهێکی هەڵکێشاو وتی: چیتر پادشا نیم و حەزیش ناکەم، چونکە کەسێك کە دەستەڵاتی خۆی لەدەست بدات، ئەوا هاوڕێکانیشی لەدەست دەدات، بەڵام دەنگت بەلامەوە ئاشنا دیارە...ئایا تۆ"سینۆهە"نیت؟

وتم: بەڵێ من"سینۆهە"م.

"ئازیرو"وتی: بەخودای"مردوك"سوێندت دەدەم، ئەگەر"سینۆهە"یت پیان بڵێ چرایەکمان بۆ بهێنن، بۆئەوەی ئێرە کەمێك ڕوناك ببێتەوە، چونکە من ناتوانم لەتاریکیدا ئاسودە بم. ئەو"هاتی"ە نەفرەتیانە جلەکانمیان پارچە پارچە کردووە و جەستەیان بەشێوەیەك بریندار کردوە کە من ئێستا پیاوێکی جوان نیم، بەڵام دەزانم تۆ کە پزیشکی کەسانێکی لەمن خراپترت بینیوە و چیتر لەبەرئەوەی دەمرم لەبەدبەختیەکانی خۆم شەرمەزار نیم، چونکە لەکاتی مەرگدا بەدبەختی نابێتە مایەی شەرمەزاری.

"سینۆهە"....پێیان بڵێ چرایەك بهێنن، بۆئەوەی من چاوم پێت بکەوێت و دەستت بگرم، چونکە ڕۆحم خەمبارە و کاتێك بیر لەژن و منداڵەکانم دەکەمەوە، فرمێسك لەچاوانم دەڕژێنە خوارەوە، ئەگەر تۆ بتوانی کەمێك ئاوجۆی بەهێزم بۆ بهێنی، بۆئەوەی قورگ و لێومی پێ تەڕ بکەم، ئەوا دوای مەرگم، لەلای دێوەکانی ئەو جیهانەکەی تر ستایشی تۆ دەکەم، چونکە دوای مەرگم بەناچاری دێوەکان دەبنە هاوڕێم، چونکە من ئێستا بەشێوەیەك هەژار کەوتوم کە بگرە توانای کڕینی گۆزەیەك ئاوجۆشم نیە، سەربازەکانی"هاتی"هەموو شتێك تا دواین ئەنگوستیلەی مسی منیان بەتالان بردووە.

منیش بەسەربازەکانم وت: چرایەك بهێنن و ئەوانیش مەشخەڵێکیان هێناو لەبەرئەوەی ئەو چادرە پڕوبوو لەدوکەڵی ئەو مەشخەڵە و بووە مایەی ئازاردانمان وتم: ئەو مەشخەڵە ببنە دەرەوە و چرایەکمان بۆ بهێنن، دوای ئەوە سەربازەکان چرایەکیان بۆ هێناین، پێم وتن: گۆزەیەك ئاوجۆشمان بۆ بهێنن.

دوای ئەوەی ئاوجۆی بەهێزی سوریایان بۆ هێناین "ئازیرو"بەدەم هاوارو گریانەوە هەستایە سەرپێ و منیش یارمەتیم دا بۆئەوەی بتوانێت ئاوجۆکە بخواتەوەو ئەو کات بینیم کە ماشوبرنجی کەوتووەتە قژەکانیەوە و سەربازەکانیش بەشێوەیەك ڕیشیان کەندووە کە لەهەندێك شوێندا گۆشتیشیان لەگەڵ ڕیشیدا پچڕاندبوو. هەروەها ئەوەشم بەچاوی خۆم بینی کە پەنجەکانی دەستی بەخەستی برینداربوبون و هەندێکیشیان بەتەواوی فلیقابون و ناخونەکانیشی بەهۆی ئەو خوێنەی لی هاتووەتە دەرەوە ڕەش داگەڕاوە. هەروەها چەند پەراسویەکی "ئازیرو" شیان شکاندبوو، ئەویش بەشێوەیەك کە زۆر بەسەختی دەیتوانی هەناسە بدات، هەندێجاریش خوێنی قوڕگی کە لەگەڵ لیکی دەمیدا تێکەڵ ببو تف دەکردەوە.

کاتێك کەمێك ئاوجۆی خواردەوە تەماشایەکی چراکەی کرد و وتی: ئەمشەو ئەم چرایە بۆ چاوە ماندووەکانی من گونجاو و چێژ بەخشە، بەڵام بڵێسەی چراکە وەك بڵێسەی ژیان چەند تەکانێك دەخوات و سەما دەکات و دوای ئەوەش وەك ژیان خامۆش دەبێت و منیش ئەی"سینۆهە"بە بۆنەی ئەم چرا و ئاوجۆیەوە سوپاست دەکەم و بەداخی ئەوەم کە هیچ شتێکم نیە پێتی ببەخشم، چونکە سەربازەکانی "هاتی" بگرە ئەو ددانە زێرانەی کە تۆ بۆت دروست کردبوم، لەدەمیان دەرهێنام.

لەبەرئەوەی سەرزەنشکردنی پیاوێك- كە بەهۆی کرداری نەکردنی ئامۆژگاریەکانی ئێمە بەدبەخت بووە- لەخۆپەسەندی و خۆویستیەوە سەرچاوە دەگرێت، من پێم وتن: لەڕابردوودا ئەوم لە"هاتی" ئاگادار کردووەتەوە کە"هاتی"نەتەوەیەکی بێبەزەیی و دڕندەیە و پیاوێك بەهۆی ئەوەی گوێ لەئامۆژگاریەکانی ئێمە نەگرتووە، بەدبەخت بووە، سزای ئەو بێگوێییەشی ئەو بەدبەختیەی بوو كە بەچاوی خۆی بینی و چیتر ئێمە نابێت سەرزەنشتی بکەین کە بۆچی گوێی لەئامۆژگاریەکانی ئێمە نەگرتووە. ئەوەبوو لەسەرخۆ سەری"ئازیرو"م خستە ناو دەستمەوە و ئەویش دەستی کرد بەگریان و فرمێسکەکانی ئەویش لەنێوان پەنجەکانمەوە دەچۆڕان.

"ئازیرو"وتی: "سینۆهە"کاتێك من پادشایەکی بەهێزبوم، لەبەردەم تۆدا بێ هیچ شەرم و ئازارێك پێدەکەنیم و خۆشی خۆمم دەردەبڕی، ئێستاش چارەڕەش بوم، چیتر بۆچی شەرم لەوە بکەم کە لەبەردەمی تۆدا بگریم؟ بەڵام"سینۆهە"ئەوەش بزانە کە من بۆ پادشایی و سامانی تاڵانکراوم ناگریم، بەڵکو بۆ ژنەکەم"کفتیو"کە تۆ پێت بەخشیم، هەروەها بۆ کوڕە گەورەکەم کە زۆر ئازایە و کوڕە بچوکەکەم کە هێشتا منداڵە و سبەی هەردووکیان دەکوژن، دەگریم.

وتم: ئەی"ئازیرو"پادشای"ئامورو"من نەمدەویست ئەمشەو شتێك بڵێم کە خەمەکانت زیاتر بکات، بەڵام لەبەرئەوەی تۆ بۆ ژن و منداڵەکانی خۆت دەگریت، منت هانی ئەوە دا پێت بڵێم کە کەسانی تریش سێ ساڵ لەوەوپێش لەم شارەدا دوچاری بەدبەختی بون و ژن و منداڵەکانیان لەبەرچاوی خۆیاندا بەکوشت دراون، ئەوانیش بەهەمان شێوەی تۆ ڕۆحیان هەیە و خەم بۆ مەرگی ژن و منداڵەکانیان دەخۆن.

سێ ساڵە سوریا بەهۆی پلەوپایەخوازی تۆ گۆڕا بە کوشتارگایەکی مەزن و ئەوندەی تێدا کوژرا کە هیچ کەسێك خۆی بۆ ئەوە نەڕەنجاند کە ڕێ لەزیاد بونی ڕێژەی کوژراوەکان بگرێت.

سەرەڕای ئەوەش من ناڵێم لەبەرئەوەی تۆ بویتە مایەی ئەم بەدبەختیانە، شایستەی مەرگیت، بەڵکو دەڵێم لەبەرئەوەی تۆ دۆڕایت و شکستت هێناوە دەبێت بمریت، چونکە بەدڵنیاییەوە تاوانبارێکی بەهێز لەهەموو سزایەك پارێزراو دەبێت، بەڵام هەرئەوەیکە لاواز بوو، بەسزای خۆی دەگات، سەرەڕای ئەوەی من مەرگی تۆ بەهاوتای دادپەروەری دەزانم، بەڵام بەهیچ شێوەیەك بەمەرگی ژن و منداڵەکانت ڕازی

نیم، من لەبارەی ژن و منداڵەکانت لەگەڵ"هورم هب"دا قسەمکرد و پێم وت ئەگەر ئەوان ئازاد بکات دیاریەکی مەزن وەردەگرێت، بەڵام ئەو ئەم بۆچونەی منی پەسەند نەکرد و وتی: دەبێت نەوە و تۆوی"ئازیرو"بگرە ناویشی دەبێت لەسوریادا لەناو ببرێت.

هەرلەبەرئەوەش دوای ئەوەی کوژرایت لاشەکەشت لەگۆڕدا نانێژرێت، بەڵکو فڕێی دەدەنە ناو بیابانەوە بۆئەوەی ببیتە خۆراکی گیانەوەرەکان، چونکە"هورم هب"حەز ناکات بگرە گۆڕێکیش لەدوای خۆتەوە بەجێ بهێڵیت، و لەئایندەدا سریانیەکان بەسەر گۆڕەکەتەوە کۆ ببنەوە و بەناوی تۆ سوێند بخۆن یان تۆ وەك خوداکان بپەرستن.

"ئازیرو" زۆر ترسا لەوەیکە لەگۆڕدا نانێژرێت و وتی: "سینۆهە"لەبەرئەوەی نام نێژن، تۆ کە ئەمشەو لەلای منی دۆستایەتی خۆت بگەیەنەرە جێی خۆی، دوای مەرگم لەبەردەم خودای"بەعل"لەوڵاتی"ئامورو"دا بەناوی من قوربانی پێشکەش بکە، بۆئەوەی من لەجیهانێکی تردا، بەبەردەوامی بەبرسیەتی و تینویەتیەوە سەرگەردان نەبم و هەمان ئەم دۆستایەتیە لەبەرامبەر"کفتیو"کە لەڕابردوودا خۆشت دەویست و لەدواییدا پێشکەشی منت کرد ئەنجام بدە و بەناوی ئەویشەوە قوربانی پێشکەشی خودای"بەعل"بکە، بۆئەوەی لەجیهانەکەی تردا تینو و برسی و بێ جێ نەبێت، دوو کوڕەکەشم کە سبەی بەکوشت دەدرێن وەك من و"کفتیو"پێویستیان بەقوربانیە بۆئەوەی لەجیهانی دوای مەرگ برسی و تینوو بێماڵ نەبن. من هیچ گلەییەکم لە"هورم هب"نیە، چونکە ئەگەر من سەرکەوتنم بەسەر ئەودا بهێنایە، بەهەمان شێوەی ئەو ڕەفتارم دەکرد و ئەوم بەکوشت دەدا، بەڵام کاتێك بیر لەوە دەکەمەوە کە ژن و منداڵەکانم بەکوشت دەدرێن گەرچی خەمگین دەبم، بەڵام شتێك دڵنەواییم دەداتەوە ئەویش ئەوەیە کە هیچ کەسێك لەگەڵ"کفتیو"دا ڕانابوێرێت، چونکە ژنەکەم خاوەنی خۆشەویستێکی زۆرە و زۆرێك لەپیاوەکان زۆر حەزیان لەسپێتی پێست و جەستە قەڵەوەکەیەتی و ئەگەر لەدوای مەرگی من ئەو زیندو بوایە، دەبووە بەشی کەسانی تر و من لەجیهانێکی تردا بەهۆی ئەم بابەتەوە بەدبەخت دەبووم.

گەرچی باشتر وابوو کە بەزیندویی بمێننەوە، بەڵام دەزانم سەرەڕای ئەوەی شازادەن بەنرخی کۆیلایەتی دەیانبردن بۆ میسر، نابێت ئەوان بکرێن بەکۆیلە و لەکانە

کانزاکانی میسردا بێگاریان پێ بکەن، بەڵام لەبەرئەوەی بەکوشت دەدرێن ئەوا هیچ کەسێك ناتوانێت ئەوان بکاتە کۆیلەی خۆی.

"سینۆهە" من تەنها لەگوتەیەکی تۆ زۆر خۆشحاڵ بوم، ئەویش ئەوەیە کە وتت *"من لەبەرئەوە دەمرم کە دۆڕاوم"*. ئەگەر من لەم جەنگەدا سەرکەوتنم بەدەست بهێنایە سەرەڕای ئەوەی تۆ دەڵێیت کە سوریا بووەتە کوشتارگایەکی مەزن، ئەوا لەم حاڵەتەدا خەڵکی میسر ناوی منیان بەمەزنیەکەوە دەهێنایە زمان‌و هەموو تاوانەکانیان دەخستە ئەستۆی میسرو دەیانوت فیرعەونی میسر پادشایەکی خوێنڕێژ و ستەمکارەو ئەگەر هێرشی نەکردایەتە سەر میسر، ئەم جەنگەش دروست نەدەبوو کوشت و کوشتار نەدەکەوتە نێو خەڵکی سوریاوە.

من هەڵەیەکم کرد ئەویش ئەوەبوو کە متمانەم بە"هاتی"کرد و نەمدەزانی کە"هاتی"ەکان ئەوەندە ترسنۆکن کە تەنها بۆئەوەی لەگەڵ میسردا ئاشت ببنەوە، هاوردەستەکەیان بدەن بەدەست"هورم هب"ەوە و سەروەت و سامانەکەشی تالآن بکەن.

"ئازیرو"کەمێکی تر ئاوجۆی خواردەوە و وەك بڵێی وتار بێژی بۆ خەڵکی دەکات بەوروژانێکەوە هاواری کرد: بەداخەوە سوریا، بەداخەوە ئەی ئەو وڵاتەی خۆشەویستی منی و وەك خۆشەویستێکی جوان بەبەردەوامی ئازارت داوم...ئەی سوریا من لەپێناو مەزنی تۆدا ئەرکم کێشاوە....لەبەرئەوە شۆڕشم بەرپاکرد کە تۆ ئازاد بیت و میسر نەتکاتە کۆیلەی خۆی، بەڵام ئەمڕۆ کاتی مەرگی من هاتووە، تۆ من جێ دەهێڵیت و نەفرەتم لێدەکەیت.

ئەی شاری مەزنی"بیبلوس"...و ئەهای ئەی شاری دەوڵەمەندی"ئزمیر"...و ئەی شاری مەزن و جوانی"سیدون"و ئەی شاری بەتوانای"ژوپە"و ئێوە ئەی شارەکانی تری سوریا کە هەمووتان وەك گەوهەر بەسەر تاجی پادشایەتی منەوە دەدرەوشێنەوە، بۆچی بەجێم دەهێڵن؟ و بۆچی دەستبەردارم بون؟

ئەی وڵاتی مەزن و دەوڵەمەندو زیرەك و بەهێزی سوریا من بەڕادەیەك ئێوەم خۆشدەوێت کە بگرە ئەمڕۆش، کە منتان بەجێ هێشتووە، و نەفرەتم لێ دەکەن دەستبەردارتان نابم، چونکە دەزانم ئێوە خۆشەویستانی منن و خۆشەویستێکی جوانیش گوێنەداتە خۆشەویستەکەی خۆی بەڵکو نازی بەسەردا دەکات.

ئەی سوریا، نەژادەکان لەناو دەچن، نەتەوەکان دێنە بون و لەناو دەچنەوە و شانازیەکانیش وەك سێبەرێك کە لەدوای ئاوابونی خۆر لەناو دەچێت، بەڵام تۆ بمێنەرەوە و جاویدان بە.

ئەی سوریا، جیهان ماوە تۆش لەکەنار دەریا، لەکەنار کێو و تەپۆڵکە سورەکان شارەکان دروست بکەرەوە و بەچواردەوریاندا حەسارێکی مەزن دروست بکە و هەرجارێکیش ڕەشەبا بێت خۆڵی ئێسقانەکانی من لەبیابانەوە بەرەو ڕووت دێت بۆئەوەی ماچی وڵاتەکەی تۆ بکات.

بەڕاستی ئەم قسانە زۆر کاریان تێکردم، بۆیە قسەم پێ نەبڕی، چونکە ئەم جۆرە بیرۆکانە لەڕوی دەرونیەوە هێوری دەکاتەوە، بۆیە لەسەرخۆ دەستەکانی"ئازیرو"م کە برینیان پێوەبوو گرتو ئەو وتی:

"سینۆهە"پێم وتی کە من داخ بۆ مەرگی خۆم ناخۆم و پەشیمانیش نیم کە بۆچی شۆڕشم دژی میسر بەرپا کردوە، چونکە تا ئەوکاتەی مرۆڤ دەست لەکاری مەزنەوە نەدات، سودێکی مەزنیش بەدەست ناهێنێت و ئەگەری ئەوەش هەیە کە لەکاری مەزندا زیانێکی مەزنیشت لێ بکەوێت، کارێك کە من ئەنجامم دا بوو بەهۆی ئەوەی فەرمانڕەوایی و شانازیەکانی سوریا ببێتە بەشی من و من تا ئەو ڕۆژەی زیندوو بوم بەباشی ژیام و هەڵگری ئیشق بوم و توانیم ڕق و کینەکانی خۆم هێور بکەمەوە. لەم کاتەدا هیچ یەك لەوکارانەی کە ئەنجامم داوە، لەکارەکانم پەشیمانم ناکاتەوە، وەك بڵێی کۆی ئەم کارانەم لەیەك پێچراون و وەك گوریسێکیان لێهاتووە و ئێستا لەگەردنم ئاڵاوە و ئاڕاستەی مەرگم دەکات. ئێستاش لەبەرئەوە ئەم قسانە دەکەم بۆئەوەی تۆ بزانی من لەمەرگ ناترسم، بەڵام لەبەرئەوەی لەسەرتاپای تەمەنمدا پیاوێکی وورد بومو وەك هەر سریانیەك سروشتی من لە بازرگانیەوە سەرچاوەی گرتووە، بۆیە بازرگانیو مامەڵەکردنم خۆشدەوێتو لەبەرئەوەی تۆ پزیشکی دەمەوێت ئەو پرسیارەت لێ بکەم کەئایا ئەکرێت لەڕێی مامەڵەیەکی بازرگانیەوە فریوی مەرگ بدەیت یان بەمامەڵەیەکی سەوداگەرانەوە فریوی خودا بدەیت؟

ئێمەی سریانی کە لەبواری بازرگانیدا کەسانێکی زبردەستین، لەهەموو مامەڵەیەکماندا کەسانی تر فریو دەدەین، ئایا ئەکرێت مامەڵەیەك پێشنیاری مەرگ بکەم بۆئەوەی فریو بخوات و دەستبەرداری من بێت؟

وتم: نەخێر"ئازیرو"مرۆڤ دەتوانێت هەموو کەسێك فریو بدات، بەڵام توانای ئەوەی نیە فریوی مەرگ بدات، بەڵام لەبەرئەوەی سبەی چرای ژیانی تۆ خامۆش دەبێت، دەمەوێت ڕاستیەکت پێ بڵێم و ئەو ڕاستیەش کە تا ئێستا هیچ کەسێك نەیوێراوە باسی بکات ئەوەیە کە مەرگ هیچ ئازارێك لەخۆ ناگرێت"ئازیرو"، ئایا دەزانی بۆچی تا ئێستا هیچ کەسێك نەیوێراوە ئەم ڕاستیە زانستی و پزیشکیە بۆ خەڵکی ئاشکرا بکات. هۆکارەکەی ئەوەیە تاکە شتێك کە دەبێتە هۆی ئەوەی پیاوانی ئازا و کەسانی هەڵەشە و خاوەن ویست ماڵی بکڕێن و گوێڕایەڵ بن ئەوەیە کە لەمەرگ دەترسن، لەبەرئەوەی وا دەزانن کە ئازاری مەرگ هەزارجار لەئازارە جەستەییەکان ترسناکتر و خراپترە، لەکاتێکدا لەژیانی مرۆڤدا شتێك لە مەرگ خۆشتر و نەرمونیانتر نیە، بۆیە"ئازیرو"ئەوە پەسەند بکە کە ئازاری کێشانی ددانێك دە کەڕەتی دە کەڕەتی دە کەڕەتی دە لەئازاری مەرگ زیاترە و لەکاتی مەرگدا، حاڵی مرۆڤ وەك حاڵی کەسێکی ماندو و نەخۆش وایە کە لەسەر زەوی ڕاکشاوە و دەیەوێت بخەوێت و خەویش چاوەکانی داگیرکردووە، لەکاتی مەرگدا هەست بەهیچ شێوە ئازارێك ناکرێت و هەموو دەرد و ئازار و ئەشکەنجەیەك لە ژیانەوە سەرچاوە دەگرێت نەك لەمەرگەوە و ئەو کەسەی کە بریندار دەبێتو بگرە بۆ ساتێکیش ناتوانێت دان بەخۆیدا بگرێت، نیگەرانی ئەوە نیە کەدەبێت بمرێت، بەڵکو لەبەرئەوە ئازار دەکێشێت و لەئازاردا لول دەخوات کە لەژیاندایە. مەرگ کۆتایی تەواوی ئازارو خەم و بەشمەینەتی و نائومێدی هەروەها کۆتایی تەواوی ئازارە جەستەییەکانە، ئایا هیچ کات ئاگاداری ئەوە بویت کە دوای ڕۆژێکی گەرم و خنکێنەر فێنکی شنەی شەو، بەچ شێوەیەك خۆشی بەمرۆڤ دەبەخشێت، بەهەمان شێوە مەرگیش لەچاو ژیاندا وەك ئەو شنەی شەوە وایە لەچاو گەرمی خنکێنەری ڕۆژدا. بەڵام کەسانی زانا و ژیر و پزیشکەکان ئەم ڕاستیەیان بۆ خەڵکی ئاشکرا نەکردووە، بۆئەوەی ترسی خەڵکی لەمەرگ لەناو نەچێت، چونکە ئەگەر خەڵکی لەمەرگ نەترسن، هیچ هێزێك ناتوانێت کەسانی سەرکێش و ئازا ماڵی بکات. چونکە ئەمانە لەوە ناترسن کە دوای مەرگ چیتر زیندوو نابنەوە، بەڵکو لەوە دەترسن کە لەدوای مەرگ دوچاری ئەشکەنجەو ئازارگەلێکی مەزن دەبن."ئازیرو" ناتوانیت مەرگ فریو بدەیت، چونکە حەز لەمامەڵە و سەوداگەری ناکات و زێڕ و زیوو ژنی جوانو شەرابی لا پەسەند نیە، بەڵام لەهەموو خواردنەوەیەك خۆشترە و

هاوخەوی لەگەڵ ئەودا چێژ بەخشە. "ئازیرو"لەبەرئەوەی من پزیشکم، لەوباوەڕەدا نیم کە جەستەی ئێمە دوای مەرگیشمان ئەگەر مۆمیاشمان بکەن بمێنێتەوە.

هەڵبەت مۆمیا ڕێ لەهەڵوەشان و بۆگەنکردنی جەستە دەگرێت، بەڵام ئەوەی لەدوای مۆمیاکردن دەمێنێتەوە وەك دارێکی وشك وایە نە وەك جەستەی مرۆڤێك.

• من سەرەڕای ئەوەی میسریم باوەڕم بەژیانێکی تر کە ئێمەی میسری ناوی "جیهانی خۆرئاوای" لێ دەنێین نیە، بەڵام پێداگریش لەسەر ئەوە ناکەم کە ئەم بیروباوەڕەی من ڕاستە، لەوانەیە لەجیهانێکی تردا جۆرێك ژیان بونی هەبێت و هەر لەبەرئەوەش دوای مەرگی تۆ و ژن و منداڵەکانت، لەپێناو تۆ و ژن و منداڵەکانت قوربانی پێشکەشی خودای"بەعل"دەکەم، بۆئەوەی ئەگەر جیهانێکی تر بۆ ئێمە هەبێت تۆ و ژن و منداڵەکانت برسی و تینو و بێ شوێن نەبن.

"ئازیرو"زۆر دڵی بەو قسانەم خۆش بوو و بەهیوایەکەوە وتی: "سینۆهە"کەواتە کاتێك ویستت قوربانیمان بۆ بکەیت، مەڕی وڵاتەکەی خۆم"ئامورو"هەڵبژێرە بۆ ئەو قوربانیە، چونکە مەڕەکانی"ئامورو"چاخن و گۆشتێکی خۆشیان هەیە هەروەها ئەوەت لەبیر نەچێت کە دڵی برژاوو جگەر و گورچیلەی مەڕ پێشکەشی خودای "بەعل"بکەیت، چونکە بەبەردەوامی حەزم لە دڵ و جگەر و گورچیلەی برژاو بووە و هەمووجارێك لەکاتی قوربانی مەڕەکاندا شەرابی"سیدون"لەگەڵ گوڵی یاسەمین دەرخواردی خودای"بەعل"بدەیت، و ئەم کارەش زۆر خۆشحاڵم دەکات، چونکە دوای مەرگ دەتوانم لەگەڵ"کفتیو"دا مەی بخۆمەوە و بەئارەزوی خۆم قسەی لەگەڵدا بکەم.

تا ئەوکاتەی"ئازیرو"ئەم قسانەی دەکرد خۆشحاڵ بوو، بەڵام دوای ئەوە دوبارە خەمگین بویەوە و وتی: "سینۆهە"نازانم، سەرەڕای ئەوەی تۆ میسریت و منیش خراپیەکی زۆرم لەبەرامبەر میسریەکاندا کردووە، بۆچی چاکەم لەگەڵدا دەکەیت و ئەوەی لەبارەی مەرگەوە بۆت باسکردم زۆر کاری تێکردم، لەوانەیە هەر بەوشێوەی تۆ باست کرد، مەرگ بێ لەخەوێکی شیرین هیچی تر نەبێت. سەرەڕای ئەوەش کاتێك من ئەوە دەهێنمەوە یاد خۆم کە لەوەرزی بەهاردا لەوڵاتی "ئامورو"درەختی"بادەم و هەڵوژە و ئاڵوباڵو پڕ دەبێت لەشکۆفەی جوان جوان و مەڕەکان بەسەر تەپۆڵکە سەوزەکانەوە باعە باع دەکەن و بەرخۆلەکانیش لەخۆشیاندا هەڵبەز و دابەز دەکەن، ناتوانم خەم بۆ لەدەست دانی ژیان نەخۆم. هەرکاتێکیش ئەوە بەبیرخۆم دەهێنمەوە

کە لەوەرزی بەهاردا، لەولاتی"ئامورو"گوڵەکانی زەنبەق دەڕوێتەوە و بۆنی زێڕین لە درختی سنۆبەرەکانەوە دێت، دڵم دادەگیرێت و من پەیوەست بونێکی تایبەتم بە گوڵی زەنبەقەوە هەیە، لەبەرئەوەی گوڵی فەرمانڕەواییە و من تەنها خەمی ئەوە دایگرتوم کە چیتر بەهاری"ئامورو"نابینمەوە و لەهاوینی ئەو وڵاتەدا، لەکەنار کانیە سارد و فێنکەکاندا دانانیشم و لەوەرزی بەهاردا کێوی داپۆشراو لەبەفر نابینم.

من و"ئازیرو"بەو شێوەیە ئەو شەوە تا بەیانی قسەمان کرد.

هەندێکات باسی مەرگمان دەکرد و هەندێکاتیش باسی وڵاتی"ئامورو"مان دەکردو هەندێکاتیش یادگاری سەردەمی لاویەتیمان نوێ دەکردەوە.

کاتێك سپێدەی بەرەبەیان هەڵهات و جیهان ڕوناك بویەوە، نۆکەرەکانم، خواردنێکی زۆر و بەتامیان بۆ هێناین و پاسەوانەکانیش ڕێگیریان لێ نەکردن، چونکە یەکەم ئەوان بەشی خۆیان لەو خواردنە هەڵگرت.

من برسیم نەبوو، لەبەرئەوەی لەوکاتەدا تامەزرۆی خواردنم نەدەکرد، بەڵکو دەمویست "ئازیرو"نان بخوات. ئەو خواردنەی ئێمە بریتی بوو لەمەڕی برژاو و گەرمو مریشکی برژاو و گەرم و نانی گەنم کە لەناو ڕۆندا سورکراوەتەوە.

نۆکەرەکانم شەرابی"سیدون"کە ئاوێتەی عەتریان کردبوو بۆ هێناین و"ئازیرو" بۆماوەیەك نانی خواردو شەرابی خواردەوە، دوای ئەوەی من بەنۆکەرەکانم وت کە"ئازیرو"پاك بشۆرن و قژی بۆ شانە بکەن و ڕیشیشی بکەنە ناو تۆڕێکی زێڕینەوەو باشترین پۆشاکی لەبەر بکەن.

نۆکەرەکانم"کفتیو"و کوڕەکانی"ئازیرو"یشان بەهەمان شێوە پاك شۆردو جوانترین پۆشاکیان لەبەرکردن، بەڵام"هورم هب"ڕازی نەبوو لەسەر ئەوەی"ئازیرو" پێش مەرگی چاوی بە ژن و منداڵەکانی بکەوێت.

کاتێك ڕۆژ بەتەواوی ڕوناك بویەوە"هورم هب"لەگەڵ فەرماندە و ئەفسەرانی "هاتی" لەچادرە مەزنەکەی خۆی هاتە دەرەوە وبینیم هەموویان پێدەکەنن، دەمزانی کە هەموویان بەهۆی کاریگەری خواردنەوەوە مەست بون.

من لە"هورم هب"نزیك بومەوە و پێم وت: تۆ دەزانی کە من چەندجارێك خزمەتم بەتۆ کردووە کە دواییینیان چارەسەرکردنی پێ بریندارەکەت بوو لەجەنگی شاری

"سور"[45]دا، لەو جەنگەدا تیرێکی ژەهراوی چەقیبووە پێتەوە و من نەمهێلا ژەهری ئەو تیرە بتکوژێت، ئێستاش هاتوم داوای شتێکت لێ بکەم، ئەو داوایەشم ئەوەیە کە"ئازیرو"بەئازارەوە نەکوژیت، چونکە ئەم پیاوە پادشای سوریا بوو، لەجەنگدا مەردانە جەنگیوە.

"ئازیرو"پێش ئەوەی بەدەستی تۆ دیل بکرێت، بەڕادەی پێویست ئەشکەنجە و ئازار دراوە، چونکە ئەفسەرەکانی"هاتی"ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆریان داوە بۆئەوەی بەزۆر ئەوەی لەزمان دەربکێشن کە زێڕو زیوەکەی لەکوێدا شاردووەتەوە، بۆیە شایستەی ئەوە نیە ئەمڕۆش بەهەمان شێوە ئازارو ئەشکەنجە بدرێت، ئەگەر تۆ چاوپۆشی لەئازاردانی ئەو بکەیت، ناوچاکی تۆ بەمەزنی دەمێنێتەوە.

کاتێك"هورم هب"گوێی لەم قسەیەی من بوو دەمووچاوی دا بەیەکدا و ڕەنگی پێستی ڕەش داگەڕا، چونکە ئەو لەو ڕۆژەدا پێش بنینی چەند شتێکی کردبوو بۆ مەرگی"ئازیرو"و دەیویست ئەو بەئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆرەوە بکوژێت، بۆئەوەی ئەفسەرانی"هاتی"و ئەفسەران و سەربازانی میسری بەتەماشاکردنی ئەم دیمەنە کاتی خۆش بەسەر بەرن و منیش بەچاوی خۆم ئەوەم دەبینی کە میسریەکان بۆئەوەی لەڕیزی پێشەوە دانیشن شەڕیان لەگەڵ یەکتردا دەکرد.

دەبێت ئەوە بڵێم کە خودی"هورم هب"چێژی لەئازاردانی کەسانی تر وەرنەدەگرت و کەسێکی بێ بەزەیی نەبوو، بەڵام ئەو بەسەربازێك لەقەڵەم دەدرا و مەرگی بەیەکێك لەچەکەکانی خۆی لەقەڵەم دەدا، بۆیە لەو ڕۆژەدا دەیویست بەشێوەیەك"ئازیرو" بکوژێت کە ببێتە پەندێکی بۆ ئەوانی تر و چیتر لەسوریادا هیچ کەسێك نەوێرێت دژی میسر شۆڕش و ڕاپەڕین بەرپابکات.

"هورم هب"دەیزانی کە نەتەوەکان توڕەیی بە توانا و لێهاتویی لێك دەدەنەوە و وا لێکی دەدەنەوە کە سوپاسالاری بێ بەزەیی، سوپاسالارێکی شایستەیە و بەپێچەوانەشەوە بەزەیی و نەرمونیانی بەهێمای لاوازی لەقەڵەم دەدرێت.

ئەوەبوو دەستی خۆی لەسەر شانی شازادە"شوباتو"شازادەی"هاتی"یەکان هەڵگرت و چەندجارێك قامچییەکەی دەستی کێشا بەڕانی خۆیدا و وتی: "سینۆهە"تۆ

[45] دەکەوێتە سوریای کۆنەوە.

وەك دڕكێك وایت كە چەقیبیتە پێی منەوە و منیش خەریكە لەتۆ وەڕەس دەبم، لەبەرئەوەی تۆ كەسێكی نائاساییت و بڕیاری تۆ دەربارەی بابەتە ئاساییەكان، وەك بڕیاری شێتەكان وایە.

كاتێك كەسێك بەپلەوپایە و سامانی خۆی دەگات، تۆ لەباتی ئەوەی ستایشی بكەیت و ڕێزی لێ بگریت، ڕەخنەی لێدەگریت و كاتێكیش كەسانێك كە پلەوپایە و سامان و دارایی خۆیان لەدەست دەدەن، تۆ لەباتی ئەوەی پشتگوێیان بخەیت، دەڕۆیت بۆ لایان و دڵنەواییان دەدەیتەوە، بیستومە كە دوێنێ شەو تا بەیانی لەلای "ئازیرو"بویت وئاوجۆت پێداوە و بەیانیش بەنۆكەرەكانی خۆتت وتووە كە خواردن و خواردنەوەی بۆ بهێنن. ئەوە كاری شێتەكانە كە دەستی هاوكاری بۆ هەژار و شكست خواردووەكان درێژ دەكەن، چونكە دۆستایەتی كەسانی بەدبەخت و هەژار، هیچ سودێك بەمرۆڤ ناگەیەنێت بەپێچەوانەوە دەبێتە مایەی زیانیان، چونكە مرۆڤ ناچار دەبێت لەزێڕ و زیوی خۆی بدات بەوان.

تا ئەوكاتەی مرۆڤ زیندووە، دەبێت خۆی لەهاوڕێیەتی ئەو كەسانە بەدور بگرێت كە خاوەنی پلەوپایە و سامان و دارایی نین، بەبەردەوامی هاوڕێیەتی كەسانێك بكات بەهیوای ئەوەی ڕۆژێك بێت سود لەپلەوپایە و سامانەكەیان وەرگرێت و تۆش تا ئەو ڕۆژەی"ئازیرو"خاوەنی دەستەڵات و سامان بوو هاوڕێیەتیت نەكرد و ئەمڕۆ كە نە پادشایە و نە دەوڵەمەند هاوڕێیەتی و پشتگیری دەكەیت. بەڵام"سینۆهە"تۆ دەزانی كە من بۆ ئەمڕۆ، كۆمەڵێك جەلادی زبردەستم لەملاولاوە هێناوە بۆئەوەی لەبەرچاوی ئەفسەران و سەربازەكانی مندا نمایشی چەند هونەرێك بكەن و ئامادەكردن و دامەزراندنی كەرەستەی ئازاردانەكان زۆر گران بەسەر مندا شكاوەتەوە و من ناتوانم لەدواین كاتژمێرەكاندا بۆقەكانی ڕوباری"نیل"لەم دیمەنە بێبەش بكەم، چونكە ئەمانە ماوەی سێ ساڵە لەسوریادا بۆ لەناوبردنی هەمان ئەم"ئازیرو"یە گیانی خۆیان كردووەتە قوربانی و ئەمڕۆ مافی خۆیانە تەماشای ئەشكەنجە و ئازارەكانی بكەن.

"شوباتو"شازادەی"هاتی"كاتێك گوێ لەم قسانە بوو، بەتوندی دەستی كێشا بەپشتی"هورم هب"دا و وتی: ئافەرین، بەڕاستی قسەیەكی جوانت كرد، تۆ نابێت ئەمڕۆ ئێمە لەم دیمەنە بێبەش بكەیت، چونكە ئێمە بۆئەوەی تۆ لەتەماشاكردنی ئەشكەنجەكانی ئەو بێبەش نەكەین كاتێك"ئازیرو"مان دەستگیركرد گۆشتی جەستەی

ئەومان پارچە پارچە نەکرد، تەنها هەندێك ناخونی پەنجەکانیمان هەڵکێشا و پەنجەکانیشیمان شکاند، بۆیە تۆ لەبەرئێمەش بێت دەبێت ئەشکەنجەی بدەیت، ئەگینا ئێمە لێت دڵگران دەبین.

"هورم هب"یش دەموچاوی دا بەیەکدا و من تێگەشتم کە بۆچی وا گۆڕا، چونکە فەرماندەی لەشکری میسر خۆی بە لەشکرێکی سەرکەوتوو دەزانێت و چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد کە شازادە"شوباتو"کە فەرماندەیەکی شکست خواردووە بەدەستی بدات لەپشتی و فەرمانی بەسەردا بدات، بۆیە وتی:

"شوباتو"دیارە کە تۆ سەرخۆشی و ناتوانی سنوری خۆت بپارێزی. من لەبەرئەوە بڕیاری ئەوەمدا"ئازیرو"بەهەموو شێوەکانی ئازارو ئەشکەنجەوە بکوژم کە هەموو کەسێك بزانێت، هەرکەسێك پشت بەهاوڕێیەتی"هاتی"ببەستێت چارەنوسی وەك چارەنوسی"ئازیرو"کۆتایی دێت، بەڵام لەبەرئەوەی شەوی ڕابردوو من و تۆ هاوڕێ بوین و چەند پێکێکمان پێکەوە هەڵقوڕاند، من لەبەرتۆ چاپۆشی لەئازاردانی پیاوێك دەکەم کە سەردەمانێك هاوڕێی تۆ بووەو فەرمان دەدەم بێ ئازار و ئەشکەنجە و بەمەرگێکی ئاسان لەسێدارەی بدەن.

"شوباتو"بەو قسانە زۆر دڵگران بوو و ڕەنگ لەڕویدا نەما، چونکە دانیشتوانی وڵاتی"هاتی" سەرەڕای ئەوەی خیانەت لە دۆست و هاوپەیمانەکانیان دەکەن و هەر ئەوەی هیچ بەرژەوەندیەکیان لەگەڵیاندا نەما دڵسۆزترین هاوڕێیانی خۆیان دەفرۆشن، ڕازی نەبوو هیچ کەسێك ئەوان بەکەسانێکی خیانەتکار و بێوەفا و بێ متمانە لەقەڵەم بدات.

لەوانەیە ئەوانیش ڕاست بکەن، چونکە هەموو نەتەوە و فەرمانڕەوایەکی شایستە بەوشێوەیە ڕەفتار دەکاتو هەرئەوەی بەرژەوەندیەکانی خۆی لەخیانەتێکدا بەرجەستە کرد، خیانەت دەکات، بەڵام"هاتی"یەکان لەخیانەتکردندا زۆر هەڵەشەبون و بێ هیچ بیانو و ڕونکردنەوەیەك، پەنایان بۆ خیانەت دەبرد.

"شوباتو" توڕە بوو، بەڵام هاوڕێکانی ئاگاداری ئەوەبون کە توڕەیی"شوباتو" لەوانەیە بۆ خۆی و ئەوانی تر زۆر گران تەواو ببێت، دەمیانگرت و لەوێ دوریان خستەوە و دوای چەند خولەکێکی تر سەرکردەی شکست خواردوی"هاتی"ڕشایەوەو ئەوەی لەڕابردوودا خواردبویەوە، هێڵنجایەوە و بەدەمەستیەکەشی لەناو چوو.

"هورم هب"فەرمانی دا کە"ئازیرو" بهێنن و سەرەڕای ئەوەی دەیزانی کە من خواردنم پێداوە، کاتێك بینی ئەو پیاوە بەسەر بەرزیەوە هەنگاو دەنێت و جلێکی گرانبەهای لەبەرکردووە و قژی ڕێك و پێك شانە کراوە سەری سوڕما.

"ئازیرو"بەدەم پێکەنینەوە دەهاتو گاڵتەی بەو ئەفسەرو سەربازە میسریانە دەکرد کە پاسەوانی ئەو بون، کاتێکیش گەشتە لای"هورم هب"و بەلاسەری پاسەوانەکانیەوە بە"هورم هب"ی وت:

ئەی"هورم هب"ی پیس، لەمن مەترسە و خۆت لەپشت نێزەی سەربازەکانتەوە حەشار مەدە، چونکە منیان بەزنجیر بەستووەتەوە، لێم نزیك ببەرەوە بۆئەوەی بتوانم پێم بەجلەکانتدا بماڵم و ئەو ترسەقولەی بەپێمەوە لکاوە پیّ پاك بکەمەوە، چونکە لەئێستادا کاتێك بەنێو ئوردوگاکەی تۆدا تێدەپەڕیم بۆئەوەی خۆم بگەیەنمە شوێنی لەسێدارەدان، پێکانم پیس بون، من لەسەرتاپای تەمەنمدا ئوردوگایەکی ئەوەندە پیسم بەچاوی خۆم نەبینیوە و هەموو کەسێك دەزانێت کاتێك ئوردوگایەك پیس بێت، ئەوە دەسەلمێنێت کە فەرماندەیٚ ئەو ئوردوگایە کەسێکی خاوەن سەلیقە و شایستە نیە.

"هورم هب"لەکانگای دڵیەوە پێکەنی و وتی: "ئازیرو"من لێت نزیك نابمەوە، لەبەرئەوەی بۆنی بۆگەنیت لێوە دێت و سەرەڕای ئەوەی توانیوتە جلێکی نویٚ لەبەر بکەیت بۆئەوەی برینەکانتی پیٚ بشاریتەوە، بەڵام هەر بۆنی بۆگەنیت لێوە دێت، بەڵام هیچ نکوڵیەك لەوەدا ناکرێت کە پیاوێکی ئازایت و لەمەرگ ناترسیت و بەدەم پێکەنینەوە بەرەو ڕوی شوێنی لەسێدارەدان هەنگاو دەنێیت، هەر لەبەرئەوەش فەرمانم دا تۆ بیٚ ئەشکەنجە و ئازار لەسێدارە بدەن، بۆئەوەی لەئایندەدا بەکەسێکی چاك باسم بکەن، چونکە هێز و توانا لەوەدا نیە کە مرۆڤ دژمنی شکست خواردوی خۆی ئەشکەنجە بدات، بەڵکو هێز و توانا لەوەدایە کە سوپاسالاری سەرکەوتوو، سەرەڕای ئەوەی دەتوانێت ئەشکەنجەی سوپاسالاری شکست خواردو بدات، بەڵام چاوپۆشی لەئەشکەنجەدانی بکات.

دوای ئەوە"هورم هب"فەرمانی بەپاسەوانەکانی ئەو دا چواردەوری"ئازیرو"بگرن بۆئەوەی سەربازە میسریەکان تەرسەقول و بەردی تێنەگرتن و جنێوی پێنەدەن.

دوای"ئازیرو"ژنکەی"کفتیو"یان هێنا و من بینیم کە ئەو ژنە ئارایشی کردووە و خۆی جوانتر کردووە و دوو کوڕەکەی"ئازیرو"ش لەگەڵیدا هاتن و دەستی یەکتریان گرتبوو، بەهەنگاوەکانیان دەیانسەلماند کە لەتیرەی شازادەکانن.

لەشوێن لەسێدارەدانی ژن و منداڵەکاندا پەیوەندییان بە"ئازیرو"ە کرد، کاتێك "ئازیرو"چاوی بەژنەکەی خۆی کەوت خەمگین بوو هاواری کرد "کفتیو" ... "کفتیو" هەی ژنی سپی پێست، هەی پێڵوی چاوم، من زۆر بەداخم کە بومە هۆی کوشتنی تۆ، چونکە دەزانم تۆ دەتوانی سەر لەنوێ چێژ لەژیان وەربگریت.

"کفتیو"ش پێی وت: "ئازیرو"هیچ خەمم بۆ مەخۆ، چونکە من بەخواست و ئارەزوی خۆم لەدوای تۆوە دێم بۆ وڵاتی مردووەکان، لەبەرئەوە دەزانم کە لەدوای تۆ هاوسەرێکی تری وا بەدەست ناهێنم کە بتوانێت وەکو تۆ کە بەئەندازە نێرەگایەك بەهێزی، خۆشبەخت و ڕازیم بکات.

کاتێك تۆ زیندو بویت، من تۆم لەنێو هەموو ژنەکانی تر جیاکردەوە و نەمهێڵا بێ لەخۆم لەگەڵ هیچ ژنێکی تردا ڕابوێری و ئێستا کە ڕێگای وڵاتی مردووەکانت گرتووە بەر، منیش لەگەڵت دێم بۆئەوەی نەهێڵم لەوێش لەگەڵ ژنانی تردا ڕابوێری، چونکە دڵنیام کە تەواوی ئەو ژنانەی کە پێش من لەگەڵیاندا ڕاتبواردووە و ئێستا لەجیهانی مردووەکانت، چاوەڕێت دەکەن بۆئەوەی تۆ لەمن زەوت بکەن. ئەگەر میسریەکانیش نەمکوژن، بەپرچە درێژەکانم خۆم دەخنکێنم، بۆئەوەی لەدوای تۆ خۆم بکەم بەجیهانی مردووەکاندا ولێت جیا نەبمەوە، چونکە سەرەڕای ئەوەی تۆ هاوسەری منی، من بەکەنیزەکێك لەقەڵەم دەدرام، پزیشکێکی میسری منی بەتۆ بەخشی و پلەی شاژنیت پێ بەخشیم و منیش دوو منداڵی جوانم بۆ هێنایتە ئەم جیهانەوە.

"ئازیرو"لەم وڵامەی"کفتیو"زۆر خۆشحاڵ بوو و دوای ئەوە بەکوڕەکانی خۆی وت: کوڕە خۆشەویستەکانم، ئێوە منداڵی پادشایەکن و لەمکاتەدا دەبێت وەك شازادەکان بەواتا بێ هیچ ترسێك بمرن. من لەم دواییانەدا لەگەڵ پیاوێك کە لەبواری مەرگدا کەزیاد لەسەد کەسی ئاسایی ئەزمونی لەمەرگدا هەیە گفتوگۆمکردووە و ئەو پێی وتم کە مەرگ، دە ئەوەندەی کێشانی ددانێك ئاسانترە و هیچ ئازارێك لەخۆ ناگرێت، بۆیە ئێوەش دەبێت ئاگادار ئەوە بن کە مەرگ هیچ ئازارێك لەخۆ ناگرێت، بەڵکو ئەوە ژیانە کە مرۆڤ دوچاری ئازار و ئەشکەنجەکان دەکات.

دوای ئەم قسەیە"ئازیرو"لەبەردەم جەلادەکاندا کەوتە سەر ئەژنۆ و بە"کفتیو"ی وت: من زۆر لە بینینی ئەم میسریە بۆگەنانەی بەچواردەورماندا ڕاوەستاون بێزارم و نامەوێت چاوم بەنێزە خوێناویەکانیان بکەوێت، بۆیە حەز دەکەم لەمکاتەدا تەنها تەماشای تۆ بکەم."کفتیو"ی هاوسەرم لەبەرامبەرمدا ڕاوەستە، بۆئەوەی من بتوانم لەمکاتەدا بەدەم تەماشاکردنی ڕوخساری جوانی تۆوە بمرم.

"کفتیو"قژەکانی بۆ پشتەوە هەڵدایەوە و ڕوخساری خۆیی پێ نیشان دا، لەکاتێکدا کە"ئازیرو"چاوی بڕیبووە ئەو، کابرای جەلاد شمشێری قورس و درێژی خۆی دا لە ملی"ئازیرو"و بەیەك لێدان سەری لەلاشەی کردەوە و بەڕادەیەك لێدانی کابرای جەلاد بەهێز بوو کە سەری تابەرپێی"کفتیو"تلی خوارد و ئەو خوێنەی لەملی"ئازیرو"وە فوارەی دەرکرد، ژن و دوو کوڕەکەی لەخوێن گەوزاند و کوڕە بچوکەکەی لەرز گرتی.

بەڵام"کفتیو"سەری"ئازیرو"ی لەسەر زەوی هەڵگرت و نای بەسینەیەوە و ماچی لێو و چاوەکانی کرد و نەوازشی ڕیشی کرد و بێئەوەی سەری لەسینەی جیابکاتەوە، بەکوڕەکانی وت: منداڵەکانم بۆچی دەرنگ بەخۆتان دەکەن، ئێستا باوکتان ڕۆشت ئێوەش بڕۆن، چونکە من پەلەمە بۆئەوەی پەیوەندی بەئێوە و ئەوەوە بکەم.

کوڕە گەورەکەی بێئەوەی دەستی برا بچوکەکەی بەربدات لەسەر ئەژنۆ کەوت و جەلادیش وەکو باوکی، بەیەك لێدان سەری لێکردەوە و دوای ئەوەیش سەری برا بچوکەکەی لەلاشەی جیا کردەوە.

"کفتیـو"کـە هـەروەکو جـاران سـەری"ئـازیرو"ی بەباوەشـەوە بـوو، بـێ هـیچ کاریگەریەك تەماشای مەرگی منداڵەکانی خۆی کرد.

دوای مەرگی ئەوانیش کابرای جەلاد بەلەقە سەری هەردوو کوڕەکەی لەخۆی دروخستەوە و بەئاماژە"کفتیو"ی تێگەیاندا کە لەسەر ئەژنۆ بکەێت.

ژن بێئەوەی سەری"ئازیرو"لەخۆی درو بکاتەوە لەبەردەم کابرای جەلاددا لەسەر ئەژنۆ کەوت و بەدەستێکی قژی هەڵدایەوە دواوە بۆئەوەی ملی بەجوانی دەربکەوێت و کابرای جەلادیش لەکاتی جیاکردنەوەی سەری دوچاری هیچ گرفتێك نەبێت.

کابرای جەلادیش سەری ئەوی لەلاشەی جیاکردەوەو خوێنی شاڕەگی خوێنبەری "کفتیو"ڕژا بەسەر سەری"ئازیرو"و کوڕەکانی و بەم شێوەیە هەرچواریان بێ هیچ

ئەشکەنجەدانێك مردن، بەڵام"هورم هب"ڕێی بەناشتنی لاشەیانی نەدا، وتی: لاشەیان فڕێ بدەنە ناو بیابانەوە، بۆئەوەی ببنە خۆراکی گیانەوەرەکان.

پیاوێکی ئاوا کە پادشای وڵاتی"ئامورو"و لەم دواییانەشدا بوو بەپادشای سەرتاسەری وڵاتی سوریا و لەدوای مەرگی ئەو"هروم هب"پەیمانی ئاشتی لەگەڵ "هاتی"دا بەست، لەکاتێکدا دەیزانی کە ئەم ئاشتیە زۆربەردەوام نابێت، چونکە"هاتی"بەپێی ئەوپەیمانەی لەگەڵ"هورمهب"دا بەستبیوی شارەکانی"سیدون و ئزمیرو کادش"ی سوریای لەژێر دەستدابوو، "هاتی"شاری"کادش"ی کردبووە پایەگایەکی جەنگی مەزن.

سەرەڕای ئەوەی"هورم هب"دەیزانی ئەو ئاشتیەی لەگەڵ"هاتی"دا بەردەوام نابێت، چونکە هەردوولا بەهۆی ئەو جەنگەوە شەکەت و ماندوو بوبون، هەر لەبەرئەوەش ڕازی بوو لەسەر ئەوەی ئاشتی لەگەڵ"هاتی"ەکاندا بەرقەرار بکات.

سەرەڕای ماندوبویان لەجەنگ، دوو هۆکاری تر هەبوو کەبووە هۆی ئەوەی"هورم هب"ئاشتی لەگەڵ"هاتی"ەکاندا بەرقەرار بکات، یەکێك لەو هۆکارانە ئەوەبوو کە دەیویست بەشێك لەکاتەکانی بۆ بەرژەوەندیە تایبەتەکانی خۆی لە"تبھس"ی پایتەختی میسردا تەرخان بکات و هۆکارەکەی تریشیان ئەوەبوو کە دەیزانی لەباشوری میسردا، خێڵە ڕەش پێستەکان سەریان بەرز کردووەتەوە و ئامادە نین باج و سەرانە بدەن بەمیسر.

لەو ساڵانەی کە"هورم هب"لەجەنگدا بوو فیرعەون"توت ئانخ ئامون"فەرمانڕەوایی ئەو وڵاتەی دەکرد و سەرەڕای ئەوەی بێ لەدروست کردنی گۆڕێکی مەزن بۆخۆی بیری لەهیچ شتێکی تر نەدەکردەوە و دەستی لەکاروبارەکانی ترەوە نەدەدا، نەتەوەی میسریش تەواوی بەدبەختیەکانی خۆیان دەدایە پاڵ ئەو و دەیانوت بەچ شێوەیەك ئێمە دەتوانین فیرعەونێك کە ژنەکەی کە لەنەوەی فیرعەونێکی درۆزنە، چاوەڕێی کاری چاکی لێ بکەین.

"ئامی"هەوڵی چاکسازی کردنی ئەم شێوازی بیرکردنەوەیەی نەدا، بەڵکو هەندێك بوختانیشی بەنێو خەڵکیدا بڵاو دەکردەوە، بۆئەوە خەڵکی بەتەواوی لەم فیرعەونە بەدبین و بێزاربن، چونکە دەیزانی لەبەرژەوەندی ئەودایە کەخەڵکی لەم فیرعەونە بەدبین و بێزارتر بن.

بۆنمونە هاوڕێکانی خۆی بەوە ڕادەسپارد کە بەهەر کەسێك گەشتن بڵێن فیرعەون تەواوی سامان و دارایی میسری خەرجی ڕازاندنەوەی گۆڕەکەی خۆی دەکات و بەدبەختی خەڵکی میسر لەدروست کردنی گۆڕەکەی ئەوەوە سەرچاوە دەگرێت.

بەهۆی بزواندنی"ئامی"یەوە، لەلایەن فیرعەونەوە لەمیسردا باجێك تەرخان کرا بۆئەو کەسانەی کە دەیانویست خاوەنی گۆڕێك بن بۆخۆیان و لاشەیان دوای مەرگیان مۆمیا بکەن، بۆئەوەی لەگۆڕەکەی فیرعەوندا خەرج بکرێت. خودی ئەم سەرانەیەش خەڵکی میسری نیگەران کرد، چونکە بێ لەکۆیلە و نۆکەرەکان، هەموو کەسێك نیگەرانی پێدانی ئەم سەرانەیە بوو. هەر میسریەك بیویستایە دوای مەرگی لاشەی مۆمیا بکەن و لەگۆڕێکی تایبەتدا بینێژن، هەندێك لەنۆکەرانیش لەسەرتاپای تەمەنیاندا دزیان لەخاوەنەکەی خۆیان دەکرد و پارەیان پاشەکەوت دەکرد، بۆئەوەی دوای مەرگیان لاشەیان مومیا بکرێت و لەگۆڕێکدا بنێژرێت.

لەو سالانەی کە فیرعەون"توت ئانخ ئامون" لەمیسردا فەرمانڕەوایی دەکرد، من لەسوریا بەبەردەوامی لەگەڵ لەشکری"هورم هب"دا بوم و چارەسەری بریندار و نەخۆشەکانم دەکرد و هیچ شتێکم لەبارەی بارودۆخی"تبس"ی پایتەخی میسرم نەدەزانی، بێ لەوەی گەشتیارەکان بۆیان باس دەکردم.

ئەو کۆچەرو گەشتیارانەی کە لەمیسرەوە دەهات، دەیانوت کە فیرعەون زۆر باریكو لاوازەو نەخۆشیەکی نادیاری ئازاری دەداتو ئەم نەخۆشیەش بە جەنگی سوریاوە پەیوەست دەکرێت، چونکە هەرکاتێك هەواڵی یەکێك لەسەرکەوتنەکانی "هورم هب"ی پێ بگات بەشێوەیەك نەخۆش دەکەوێت کە یەکسەر دەیخاتە جێگەوە، بەلام کاتێك دەبیستێت"هورم هب"لەجەنگێکدا شکستی هێناوە چاك دەبێتەوە و لەجێگەکەی هەڵدەستێتە سەرپێ.

گۆچەر و گەشتیارەکان دەیانوت کە ئەم بابەتە بەڕادەیەك بەلایانەوە سەیرە کە وەك کارێکی جادوگەری دێتەبەرچاویان و تەندروستی و نەخۆشی فیرعەون بە هاواڵە جەنگیەکانی سوریاوە پەیوەست دەکرێت.

کاتێك جەنگی سوریا درێژەی کێشا"ئامی"بەنهێنی چەند کەسێکی ناردە لای"هورم هب"ەوە و پێی وتبوو کە تا کەی دەتەوێت بەردەوامی بەجەنگی سوریا بدەیت، پەلە بکە و ئاشتی بەرقەرار بکە، بۆئەوەی من بتوانم بەمەبەستی خۆم بگەم،

چونکە من پیرم و توانای دان بەخۆداگرتنم نەماوە و هەرئەوکاتەی من بەمەبەستی خۆم گەشتم، بەپێی ئەو بەڵێنەی پێمداویت، تۆش بەمەبەستی خۆت دەگەیەنم.

من لەوباوەڕەدا نەبووم کە نەخۆشی فیرعەون لەجادوگەریەوە سەرچاوە بگرێت و من وام لێك دەدایەوە کە فیرعەون لەبەرئەوە بەهۆی هەواڵەکانی جەنگی میسر، هەندێجار نەخۆش‌و هەندێجاریش لەو نەخۆشیەی چاك دەبویەوە کە"ئامی" مەبەستێکی تایبەتی لەم کارەدا هەبوو هەبوو.

هەرلەبەرئەوەش کاتێك جەنگی سوریا تەواو بوو و"هورم هب"ئاشتی لەگەڵ "هاتی"یەکاندا بەرەقەرارکرد سواری کەشتیە جەنگیەکان بوین و لەڕوباری"نیل" بەرەو سەرەوە ڕۆشتین، کاتێك بیستمان فیرعەون سواری کەشتی زێڕینی"ئامون"بووە بۆئەوەی بڕوات بۆ"وڵاتی خۆرئاوا"من بەبیستنی ئەم هەواڵە، بەواتا هەواڵی مەرگی فیرعەون سەرم سوڕنەما و ئەوکات تێگەشتم کە نەخۆش کەوتن و چاکبونەوەی فیرعەون بۆ ئەوەبوو کە کاتێك لەئێستادا هەواڵی مەرگی فیرعەون بەنێو خەڵکیدا بڵاو بویەوە سەریان لەو هەواڵە سوڕ نەمێنێت، کە بۆچی"توت ئانخ ئامون" لەناوکاو مرد.

کاتێك ئێمە هەواڵی مەرگی فیرعەونمان بیست، ئاڵای کەشتیە جەنگیەکانمان داگرت و ڕوخسارمان بەدوکەڵ ڕەش کرد.

دەیانوت کاتێك فیرعەون هەواڵی سەرکەوتنی لەشکری میسر لە"مجیدو"و ئاشتی لەگەڵ "هاتی"دا بیست، بەشێوەیەك گرفتاری نەخۆشیەکەی خۆی بویەوە کە یەکسەر کۆچی دوایی کردووە. بەڵام پزیشکانی ماڵی ژیان لەگەڵ ئەم نەخۆشیەی فیرعەوندا هەڵگری بیروبۆچونێکی جیاواز بون و دیار نەبوو کە ئەو بەچ شێوەیەك مردووە، بەڵام بەگوتەی کرێکارانی مردوو خانە کە دەیانوت کاتێك ویستیان ورگی فیرعون بۆ مۆمیاکردن هەڵدڕن، بینیان کە ڕیخۆڵەکانی ڕەش داگەڕاوە و هەستیان بەوەکرد کە لەوانەیە ژەهراوی کرابێت. بەڵام خەڵکی میسر دەیانوت: مەرگی فیرعەون دەگەڕێتەوە بۆ سەرکەوتنی میسر لەسوریادا، چونکە بەبۆچونی خەڵکی میسر فیرعەون تێگەشت کە چیتر دوای ئەم سەرکەوتنە خەڵکی میسر لەبەدبەختیەکانی ڕزگاریان دەبێت و خۆشبەخت دەبن، لەبەرئەوەی ئەو خوازیاری بەدبەختی نەتەوەی میسر بووە، هەر لەبەرئەوەش لەخەماندا گرفتاری نەخۆشیەکەی خۆی بوو و کۆچی دوایی کرد.

من دەمزانی کە لەهەمان ئەو ڕۆژەی"هورم هب"پەیمانی ئاشتی لەگەڵ"هاتی"دا لەسەر تەختە قوڕێکی خۆشەکراو مرۆکرد، وەك ئەوە وابوو کە چەقۆی لەدڵی فیرعەون چەقاندبێت.

هەواڵی مەرگی فیرعەون"هورم هب"و سەربازەکانی زۆر دڵگران کرد، لەبەرئەوەی "هورم هب" کاتێك گەشتە میسر ئالآی سەرکەوتنی هەڵکرد و سەرکردە سورياييەكانى بەكوڵەكەی کەشتیە جەنگیەکانەوە هەڵواسیبوو، بۆئەوەی وەك فیرعەونە کۆن و مەزنەکانی میسر کە دوای گەڕانەوەیان لەجەنگێکی دوژمنکارانەوە سەرەوخوار هەڵیان دەواسین ڕەفتار بکات و خەڵکیش بەبینینی کەسە هەڵواسراوەکان شانازی بەخۆیانەوە بکەن و بزانن کە میسر وەکو ڕابردوو بەهێزە و دەتوانێت تۆڵە لەدوژمنانی بیانی و یاخیبووەکانی بکاتەوە. بەڵام بەگەشتنی هەواڵی مەرگی فیرعەون بو بەهۆی ئەوەی"هورم هب"ئالآی سەرکەوتن داگرێتە خوارەوە و لاشەی ئەوانەی کە بەدارەوە هەڵواسرابون فڕێ بداتە ڕوباری نیلەوە.

سەربازە میسریەکانیش لەگەڵ"هورم هب"دا گەڕانەوە بۆ میسر، بەهیوا ئەوە بون قەرەبوی ئەو سێ ساڵ جەنگەی کە لەسوریادا بەسەریان برد و بەرگە گرتنی ئەو هەڕەشانەی کە ڕوبەڕویان بونەوە و ئێستا گەڕاونەتەوە بۆ"تبس" تا بتوانن لەو زێڕ و زیوەی کە لەسوریادا بەهۆی تاڵانیەکانی سوریاوە بەدەستیان هێناوە، لەعەیش و نۆشەکانیاندا سودیان لێ وەرگرن، بەڵام هەواڵی مەرگی فیرعەون بەرنامە خۆشگوزەرانیەکانی ئەوانی لەپایتەختی میسردا هەڵوەشاند، چونکە زانیان دەچنە ناو شارێکەوە کە نێوەندی شیوەن و ماتەمینیە و دەبێت ڕوخساریان بەدوکەڵ ڕەش بکەن و خۆیان بەکەسێکی خاوەن ماتەمینی نیشان بدەن و هەمویان دەیانوت ئەم فیرعەونەی کە ئێمە نارد بۆ جەنگی سوریا ئێستاش دەستبەردارمان نابێت و مەرگی ئەویش وەك سەردەمانی زیندوبونی، بووەتە مایەی بەدبەختی ئێمە.

کاتێك سەربازەکان ئاگاداری ئەوە بون کە دوای چونیان بۆ ناو"تبس"ناتوانن بەئارەزوی خۆیان ڕابوێرن، کەشتیەکان لەهەر شوێنێکی لەنگەرگادا لەنگەریان بگرتایە دادەبەزینە کەنارەکانی ڕوباری"نیل"ەوە و ئەو ژنانەی کە لەسوریاوە لەگەڵ خۆیاندا هێنابویان دەیانبردنە قەراخ ڕوبارەکانەوە و لەوێدا لەسەر دەستکەوتە جەنگیەکانی سوریا یان ئەو ژنانەی کە لەگەڵ خۆیاندا لەسوریاوە هێنابویان قوماری

زارزوریان لەسەر دەکردن. چونکە گەرچی هەر پیاوێك لە ژنەکەی خۆی تێری خواردبوو و نەیدەویست چیتر لەگەڵیدا ڕابوێرێت، بەڵام واهەستی دەکرد کە ژنەکانی تر لەژنەکەی خۆی چێژ بەخشتر بن و هەر بۆیە حەزی دەکرد لەڕێی یاری قومارەوە ژنەکانی تر بەدەست بهێنێت.

هەندێکات سەربازە میسریەکان لەکاتی قوماركردندا لەیەکتری تورە دەبون و کێشمەکێش لەنێوانیاندا دروست دەبوو و یەکتریان بریندار دەکرد و جنێوی زۆر مەزنیان بەخوداکان دەدا، ئەم جنێودانەشیان بوبەهۆی ئەوەی دانیشتوانی کەنارەکانی ڕوباری"نیل"لەبێباوەڕی ئەمانە سەریان سوڕ بمێنێ و بەسەرسوڕمان و ترسەوە لەسەرخۆ لەیەکتریان دەپرسی، هەندێك لەمانە خودای میسریان فەرامۆش کردووە و"بەعل"ی خودای سوریا دەپەرستن.

خـودی منـیش لـەولاتی"ئـامورو"کـە دەکەوێتـە سـوریا چـوار قوربـانی مـەزنم پێـشکەشی "بــەعل" کــرد بۆئــەوەی"ئــازیرو"و ژن و منداڵــەکانی دوای مــەرگیان سـەرگەردان و برسـی و تینـو و بێ شـوێن نـەبن. مەبەسـتی مـن لەبەبیرهێنانـەوەی ئـەم خاڵانـە ئەوەیـە کـە نەتـەوەی میـسر سـەرەڕای ئـەوەی دەیزانـی سـەربازەکانی"هـورم هـب"لەجەنگـدا سـەرکەوتنیان بەدەسـت هێنـاوە، لێیـان دەترسـان، چـونکە دەیـانبینی زۆرێکیـان نـە جلـەکانیان لـەجلی میـسری دەچـوو و نـە باوەڕیـشیان بـەخودای میـسر هەبوو. من و سەربازەکانی میـسریش دوای ئـەو دوریـەمان لـەوێ بەبینینی بارودۆخی میسر سەرمان زۆر سوڕما، چونکە کاتێك لەهەر کەنارێکی ڕوباری"نیل"دا دادەبـەزین، دەمانبینی خەڵکی یان ماتەم بوو یان هەژار و دەستەپاچە بوو.

خەڵکی میسر ئەوەندە جلەکانی بەریان شۆڕدبوو کە ڕەنگە سەرەکیەکەی خۆی بەتەواوی لەناو چوبوو و نەدەبینرا و ڕوخساری هەموشیان لاواز و وشك دەهاتە بەرچاو،چونکە میسریەکان توانای بەدەست هێنانی ڕونی ڕوەکیان نەبوو. هەموو کەسێك بەترسێکەوە تەماشای دەکردین و پشتی کەسە هەژارەکان بەکوتەك و قامچی کۆکەرەوانی باج بریندار ببو.

تەلارە گشتی و دەوڵەتیەکان ڕویان لەوێرانی کردبوو و خشت لەبنمیچی ماڵەکان دەکەوتە خوارەوەو شەقامەکانی میسریش لەوکاتەوەی ئێمە لەمیسر دەرچوین، نۆژەن نەکراونەتەوەودیوارگەلێکی زۆری کەناڵەئاودێریەکان ڕوخابون. تەنها پەرستگاکانمان

بەئاوەدان کراوی بینی و دیوارەکانی بە بەوێنەی زێڕین و ئەرخەوانی ڕازابویەوە و کاهینەکانی ورگێکی قەڵەو و سەرێکی تاشراو و بەڕۆن چەورکراویان هەبوو. لەوکاتەدا ئاگاداری ئەوەبوم کە کاهینەکانی پەرستگا ژیانێکی خراپیان نەبووە و بەردەوام باشترین گۆشت و نان و شەرابیان خواردووە، لەکاتێکدا ئەمانە دەیانخوارد و دەیانخواردەوە خەڵکی ئەگەر پارچە نانێکی وشکیان بەدەست بهێنایە لەئاوی ڕوباری"نیل"دا دەیانخوساند بۆئەوەی بتوانن قوتی بدەن. هەندێك لەمیسریەکان کە لەڕابردوودا، شەرابیان لە پێکە زێڕینەکاندا دەخواردەوە، ئەگەر سەرکەوتنیان لەوەدا بەدەست بهێنایە مانگی جارێك یەك گۆزە ئاوجۆ بەدەست بهێنن، خۆیان بەکەسێکی خۆشبەخت دەزانی هەروەها چیتر لەکەنارەکانی ڕوباری"نیل"دەنگی پێکەنینی ژنان و هاواری شادی منداڵان نەدەبیستراو ژنەکانیش پەژموردەو لاواز، بەدەستە باریکەکانیان تێڵایەکی تایبەت بەجل شتنیان بەرز دەکردەوە و دەیانهێنایە خوارەوەو منداڵە لاوازەکانیش بەسکێکی برسیەوە تاقەتی یاریکردنیان نەبوو، بۆیە بەسەر زەویدا دەگەڕان بۆئەوەی بتوانن ڕیشکی گیا یان درەختێك دەربهێنن و سکیان بەو ڕیشکی گیایە تێر بکەن..

جەنگی درێژخایەن، میسری بەو ڕۆژە گەیاندبوو و ئەوەی لەدوای جەنگ"ئاتون"و "ئامون" لەمیسردا مایەوە بەهۆی جەنگی درێژخایەنی میسر و سوریا لەناوچوو، هەرلەبەرئەوەش خەڵکی تاقەتی ئەوەیان نەبوو بەهۆی کۆتایی جەنگ و گەڕانەوەی ئاشتی خۆشحاڵی خۆیان دەربڕن هەروەها بەترسیشەوە تەماشای جوڵەی کەشتیە جەنگیەکانی"هورم هب"کە بەرەو"تبس"دەڕۆشت دەکرد. سەرەڕای ئەوەش پەڕەسێلکەکان، بەخێرایی تیرێك کە لە کەوانێکەوە دەهاوێژرا، بەسەر ڕوباری "نیل"دا دەفڕین و لەناو چڕە نەیجەلانی کەناری ڕوباری"نیل"دا ئەسپی دەریایی"غول" دەیاننەڕاندو تیمساحەکانیش دەمیان دەکردەوە، بۆئەوەی باڵندەکان بەدەنوکەکانیان نێوان ددانەکانیان بۆ پاك بکەنەوە و ئاوی ڕوباری"نیل" کە بەخۆشترین ئاوی جیهانی دەزانین دەخواردەوەو بۆنی هەوای ئاوێتە بەبۆنی چڵکاوی ڕوباری"نیل"مان دەکرد و

گوێمان لەشنەی گیای"پاپیروس" کە بەهۆی باوە دەشەکایەوە دەکرت و تەماشای فڕینی مراویەکان و جوڵەی"ئامون[٤٦]"مان لەئاسماندا دەکرد.

ئەم هێماو و بۆنانە ئەوەمان پێنیشان دەدات کە گەڕاوینەتەوە نیشتمان خۆمان.

ڕۆژێکیان چاومان بەکێوی سیانەی"تبس"کەوت کە پاسەوانی پایتەختی میسرن و سەربانی تەلاری پەرستگای"ئامون"یشمان بینی، هەروەها چاومان بە درەوشاوەیی ترۆپکی پایە بەردینەکان[٤٧] کە لەئاڵتون بوو کەوت.

کاتێك لە"تبس"نزیك بوینەوە چاومان بەشاری مەزنی مردووەکان"گۆڕستانی تبس"کە وەك بڵێی ناکۆتایە کەوت و خۆمان کرد بەناو شارداو چاومان بەلەنگەرگاکان کەوت و ناوچەی هەژار نیشنەکانمان بینی کەماڵەکانیان لەگڵ دروست کرابون، هەروەها چاویشمان بە تەلاری گەڕەکە دەوڵەمەندەکان کەوت.

ئەوکات بەهێزێکی زیاترەوە هەوای"تبس"مان هەڵمژی و سەوڵ لێدەرەکانیش سەوڵەکانیان بەهێزێکی زیاترەوە نوقمی ئاو دەکردو سەربازەکانی"هورم هب"یان فەرامۆش کردبوو کە ماتەمینی فێرعەونن، بۆیە بەخۆشیەوە دەستیان کرد بەگۆرانی وتن.

بەم شێوەیە گەڕامەوە بۆ"تبس"کە لەمنداڵیەوە لەوێ گەورە بوبوم و بڕیارم دا چیتر ئەو شارە بەجێ نەهێڵم، چونکە چاوەکانم ئەوەندە چاوی بەشەڕەنگێزی و ڕسوایی جۆری مرۆڤی لەبوار و هەلومەرجە جیاوازەکاندا بینیبوو کە چیتر نەمدەویست دوبارە ببمە بینەری ئەم جۆرە ڕسوایی و بێبەزەییانە.

بۆیە بڕیارمدا پاشماوەی ژیانم لەشوێن لەدایك بونمدا کە دەکەوێتە گەڕەکی هەژاران و لەماڵێکی بچوك کەلەوێدا نیشتەجێ بوم بژیم و لەڕێی پیشەی پزیشکیمەوە بژێوی ژیانم دابین بکەم. من ناتوانم ماڵێکی باشتر بکرم، چونکە ئەو زێڕ و زیوەی لەسوریادا بەدەستم هێنا خەرجی قوربانیەکەی"ئازیرو"و ژن و منداڵەکەی کردو نەمدەویست ئەو کانزا ئاڵودانە بۆخۆم هەڵگرم و لەگەڵ خۆمدا بیانهێنمەوە بۆ میسر،

---

[46] ئامون: لێرەدا واتای خۆر دەگەیەنێت و هەروەها لەسەرتای سەرگوزەشتی سینوهەدا بینیمان بەهەمان ئەو واتایە بەکار هێنراوە.

[47] ئەم پایە بەردینانە کە یەکێك لەوانە لەئێستادا لە"پاریس"دایە، بەواتا لەمیسرەوە گواستراوەتەوە بۆ پاریس، پارچە بەردێکە و لەڕێی سێبەری ئەم پایەوە کاتیان پێ دیاری کردووە.

چونکە دەمزانی ئەو زێڕ و زیوەی کە لەسوریادا بو بەشی من ئالودەی خوێنە و بەبەردەوامی بۆنی خوێنیان لیٚ دەهات. هەرلەبەرئەوەش ئەوەی لەسوریادا بەدەستم هێنا، بۆ ڕازیکردنی"ئازیرو"و ژن و دو کوڕەکەی لەقوربانیەکەیاندا خەرجم کرد و بەدەستی خاڵی گەڕامەوە بۆ"تبس". بەڵام بێئاگابوم لەوەی کە کاسەی چارەنوسم هێشتا پڕ نەبووە و هەندێکاری تر چاوەڕێم دەکات کە لەئەنجامدانیان دەترسام و زۆریش ڕقم لێیان بوو، بەڵام ناچاربوم ئەنجامیان بدەم و هەمان ئەو کارانەش بوو بەهۆی ئەوەی دوای چەند ڕۆژێك کە من دەمیوست پاشماوەی ژیانم لە"تبس"دا بەسەر ببەم، دوبارە لەویٚ کۆچ بکەم و بڕۆم، لەدواییدا باسی ئەم ڕوداوەشتان بۆ دەکەم.

"ئامی"و"هورم هب"دوای مۆرکردنی پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ"هاتی"و مەرگی فیرعەون، هەستیان بەوە کرد کە بەئارەزووەکانی خۆیان گەشتون و وایان لێکدەدایەوە کە هیچ شتێك ناتوانێت ببێتە ڕێگر لەبەردەم فەرمانڕەواییاندا. بەڵام ئەوەندەی نەمابوو بەهۆی کینەو ڕقی ژنێکەوە، هەردوکیان لەم فەرمانڕەواییەیان بێبەش بن، هەر لەبەرئەوەش پێویست بەوە دەکات جارێکی تر ناوی شاژنی"نفر تی تی"و شازادە خانم"باکتامون"بهێنم، چونکە ئەو ژنەی ڕقەبەرایەتی دەکرد، شاژنی پێشوو"نفر تی تی"بوو. بەڵام بۆئەوەی لەبارەی ئەم دوو کەسەو پلانگێڕی و ئەو هەڕەشانەی بۆ هەردوو فەرمانڕەوا"ئامی"و"هورم هب"دایانڕێژابوو بدوێم، بۆیە دەبێت لەمبەروارەوە بەشێکی نویٚ بکەمەوەو ئەو بەشەش دواین بەشی مێژوی ژیانی من دەبێت و لەم بەشەدا باسی ئەوەتان بۆ دەکەم کەبەچ شێوەیەك هاتمە بون بۆئەوەی چارەسەری خەڵکی بکەم و لەمەرگ ڕزگاریان بکەم و هەوڵی خۆکوژیم دا.

***

"ئامی" لەگەڵ"هورم هب"دا لەسەر ئەوە ڕێکەوتبون کە دەوای مەرگی"توت ئانخ ئامون"تاجی فەرمانڕەوایی بکاتە سەر.

هەر لەبەرئەوەش بۆئەوەی زوتر ئەم تاجە بکاتە سەری لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دانیشێت و زووکۆتایی بەمەراسیمی ماتەمینی"توت ئانخ ئامون"بهێنێت و کاربەدەستان و مۆمیاکارەکانی "تبس"لەوە ئاگادار کردەوە کە بەخێرایی لاشەی مردوی"فیرعەون مۆمیا بکەن و گۆڕی فیرعەون کە بەپێی ئەو

نەخشەیە تەلارێکی مەزن بوو بەناتەواوی هێڵایەوە و لەئەنجامدا گۆڕی"توت ئانخ ئامون"بەپێچەوانەی ئارامگای فیرعەونە مەزنەکانی میسر بچوك بوو و ئەو زێڕ و زیو و شتە بەنرخانەی کە فیرعەون تایبەتی ئارامگاکەی خۆی کردبوو، بۆئەوەی لەجیهانەکەی تردا پێی بێت، کەوتە ژێردەستی ئەو. بەڵام مەرجی سەرەکی ڕێکەوتنی"هورم هب"و"ئامی"ئەوەبوو کە"ئامی" کارێك بکات کە شازادە خانم"باکتامون"ببێتە هاوسەری"هورم هب"، بۆئەوەی"هورم هب"کە لەکاتی لەدایك بونیدا لەگەوڕدا پێی ناوەتە ئەم جیهانەوە و نێوان پەنجەی پێکانی سەنێرین بووە، بتوانێت دوای مەرگی"ئامی"ببێتە پادشای میسر و جێگەی فیرعەونە مەزنەکانی نیشتمانی ڕەش بگرێتەوە.

"ئامی"بۆئەوەی شازادە خانم"باکتاتون"بکاتە هاوسەری"هورم هب"لە"تبس"دا گفتوگۆی لەگەڵ کاهینەکانی پەرستگای"ئامون"کردووە و پلانێکی لەگەڵ ئەواندا کێشا کە بڕیاربوو بەم شێوەیە ئەنجام بدرێت.

لەو ڕۆژەی"هورم هب"دوای ئەوەی لەسوریا بەناونیشانی سەرکەوتنێکی مەزن دەڕوات بۆ پەرستگای ئامون شازادە خانم"باکتامون"بەئاڕایشێکی هاوشێوەی ئاڕایشی"سخ مت"خودای جەنگ لەو پەرستگایەدا ئامادە دەبێت و دوای کۆتایی هێنانی ئەو مەراسیمە ئاینیانە، کاهینەکانی پەرستگا دەڕۆنە دەرەوە و یەکێکیان پێش ئەوەی بڕواتە دەرەوە گۆزەیەك لەنێوان"هورم هب"و شازادە خانم کە لەو ڕۆژەدا بووەتە خودای جەنگ دەشکێنرێت، ئەوکات پەرستگا بەتەواوی خاڵی دەبێت و هورم هب لەوێدا لەگەڵ شازادە خانمدا ڕادەبوێرێت و بەوەی کە"هورم هب"لەناو پەرستگادا لەگەڵ خودای جەنگدا ڕادەبوێرێت، ئەویش بەهەمان شێوە پلەی خودایی پێ دەبەخشرێت و دەبێتە خودای جەنگ. کاهینەکانیش بەو شێوەی کە"ئامی"فێری کردبوون دەیانوت هیچ گرنگیەکی ئەوتۆ لەشکاندنی گۆزەیەك لەنێوان ئەو دوو کەسەدا نیە، چونکە خودایان بۆئەوەی پەیوەندی بەیەکەوە ببەستن و ببنە ژن و مێردی یەکتری پێویستیان بەشکاندنی گۆزە نیە و شکاندنی گۆزە شایستەی مرۆڤە نە خوداکان، لەبەرئەوەی پلەوپایەی ئەوان لە شکاندنی گۆزەیەك مەزنترە، سەرەڕای ئەوەش لەبەرئەوەی ئەو دوانە لەپەرستگادا لەگەڵ یەکتردا ڕادەبوێرن و یەکێك لەوانە خودای جەنگە، خود بەخود دەبنە هاوسەری یەکتری.

*بەشی پەنجا و دووەم*

## پەیوەندیەکی سەرسوڕهێنەر

"ئامی"وای دەزانی بەم پلانەی شازادە خانم"باکتامون"دەکاتە هاوسەری"هورم هب"، چونکە کاتێك شازادە خانم لەپەرستگایەکی خاڵی لەکەسانی بێگانە لەگەڵ "هورم هب" کە پیاوێکی باڵا بەرز و چوارشانە و بەهێزە، تەنها ببینێت، ناتوانێت خۆی ڕاگرێت و یەکسەر خۆی هەڵدەداتە باوەشی. بەڵام شاژن"نفر تی تی"بەهۆی ئەو ڕقەی لەبەرامبەر"هورم هب"دا هەیبوو-کە پێشتر پێم ڕاگەیاندن کە هۆکاری دروست بونی ئەم ڕقە چی بوو-نەیدەویست شازادە خانم"باکتامون" ببێتە هاوسەری"هورم هب"و بەبەردەوامی باسی خراپەی"هورم هب"ی لەلای شازادە خانمدا دەکرد، بەتایبەت ڕسوایی نەژادی"هورم هب"ی دەهێنایە بەرچاو شازادە خانم و دەیوت کە تۆ لەنەژادی خودایانیت، لەکاتێکدا ئەم پیاوە کاتێك لەدایك بوو نێوان پەنجەی پێکانی پڕبوو لەسەنێر و ئەگەر ئەم پیاوە لەگەڵتدا ڕابوێرێت، خوێنت پیس دەبێت و چیتر هیچ کەسێك تۆ بە نەوەی خودایان لەقەڵەم نادات.

ئەوکات ئەم دوو ژنە دەستیان کرد بەداڕشتنی پلانێك کە تەنها ڕق و کینە و فێڵی ژن دەتوانێت ئەو جۆرە پلانانە ئەنجام بدات، چونکە کاتێك ڕۆحی ژن لێوانلێوی ڕق بوو، تێبینی هیچ شتێك بگرە خۆشی ناکات و تەواوی کەرەستەی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی خۆی دەکاتە قوربانی ئەم جۆرە پلانانە.

پێش ئەوەی باسی پلانی ئەم دوو ژنەتان بۆ بکەم، دەبێت ئەوەتان بەبیر بهێنمەوە کە کاتێك لەشکری"هاتی" لەسوریادا داوای ئاشتیان کرد، من سەرم سوڕما.

من بەپێی ئەو زانیاریانەی کە لەبواری ڕۆحی و سەرسەختی"هاتی"ەکانەوە هەمبوو، چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد کە ئەمانە لەسوریادا داوای ئاشتی بکەن، چونکە گریمان لەدە جەنگی تردا شکستیان بهێنایە، بەهۆی ئەم شکستەیانەوە هیچ زیانێك بەوڵاتەکەی خۆیان نەدەگەیاند، چونکە سوریا نیشتمانی ئەوان نەبوو.

ئەگەر"هورم هب"بەهۆی سەرکەوتنەکانیەوە لەخۆی بایی نەبوایە ئەوا بەهۆی پێشنیاری ئاشتی"هاتی"ەکان وەکو من سەری سوڕ دەما، بەڵام ئەو سەرەڕای لەخۆباییەکەی لەبەرئەوە دەیوست ئاشت ببێتەوە بۆئەوەی بتوانێت بگەڕێتەوە بۆ "تبس"و کارەتایبەتەکانی خۆی ئەنجام بداتو شازادە خانم"باکتامون" بکاتە هاوسەری خۆی.

"نفر تی تی"لەسەردەمی ژیانی هاوسەرەکەیدا، دەستەڵاتێکی زۆری هەبرو بەڵام بەهۆی مەرگی هاوسەرەکەیەوە ئەو دەستەڵاتەی خۆی لەدەست دا، بەڵام جوانیەکەی وەك جاران مابویەوە.

ئەو بریاری دا کە سود لەجوانی خۆی وەرگرێت و"هورم هب"کە بە بەهێزترین پیاوی میسر دەهاتە بەرچاوی، سەرنجی بەلای خۆیدا ڕاکێشێت، بۆئەوەی هەم چێژ لەڕابواردنەکانی وەرگرێت و هەم دەستەڵات و توانای ڕابردووی ئەم جارەیان لەڕێی"هورم هب"ەوە بەدەست بهێنێتەوە. بەڵام"هورم هب"کە حەزی دەکرد لەگەڵ شازادە خانم"باکتامون"دا ڕابوێرێت، کاتێك بینی"نفر تی تی"خۆی پێشکەشی ئەو دەکات، لەخۆی دورکردەوە، بۆیە هیچ سوکایەتیەك بۆ ژنێکی جوان لەوە خراپتر نیە کە خۆی بدات بەدەست پیاوێکەوە کەواهەست دەکات خۆشی دەوێت و پیاوەیش ئەو کەسە لەخۆی دور بکاتەوە.

"نفر تی تی"لەو ڕۆژەوە ڕقی کەوت لە"هورم هب"و لەبەرئەوەی ژنێکی جوان بوو کۆمەڵێك لەدادوەرانی میسر کەبەردەوام لەو بارەگایەدا دەیانخوارد و دەیانخواردەوە و هیچ کارێکیان نەبوو ئەنجامی بدەن، بۆیە بەدوای سەرگەرمیەکدا دەگەڕان بۆئەوەی خۆیانی پێوە سەرقاڵ بکەن، چواردەوری"نفر تی تی"یان گرت و ئەویش توانی لەدادوەر و ڕاوێژکارەکانی"توت ئانخ ئامون" کۆمەڵێك ڕاوێژکار بۆخۆی دروست بکات.

هەروەها لەخۆبایی سروشتی شازادە خانم"باکتامون"یشی قۆستەوە و بەشێوەیەك ئەوی هێنایە ئەو باوەڕەی کە ئەو لەنەژادی خودایانە، بگرە شازادە خانم لەکاتی خۆ شۆردنیشدا نەیدەهێڵا هیچ کەسێك دەست لەجەستەیەوە بدات و دەیوت کە نابێت دەستی کەنیزەکەکان بەر جستەم بکەوێت و هیچ کەسێکیش نابێت پێ بەسەر سێبەری مندا بنێت، چونکە من خودام و سێبەری منیش سێبەری خودایەکە.

شازادە خانم"باکتامون"تا ئەوکاتەی پەردەی کچێنی خۆی پاراستبوو و دەیوت: لەمیسردا کەسێك بەدی ناکەم کە شایستەی هاوسەری من بێت.

من لەوباوەڕەدام کە بەردەوامی کچێنی ئەو بووەتە هۆی ئەوەی شازادە خانم کەمێك تێکچون لەهەستەکانیدا دروست ببێت، چونکە کچێکی لاو ئەگەر شوو نەکاتو تەمەنی لەو قوناخەی کە کچەکان شوو دەکەن تێپەڕێت، بەهۆی فشاری سەڵتیەوە دوچاری ئەندێشەگەلێك دەبێت کە دەبێتە هۆی پەرش و بڵاو بونی هەستەکانی، بەڵام ئەگەر شوو بکات ئەوا لەم گرفتە ڕزگاری دەبێت.

"نفر تی تی"شازادە خانم"باکتامون"ی وا تێگەیاندبوو ئەو بۆ ئەوە هاتووەتە بون، کە میسر لەو کەسانەی کە لەخەڵکی ئاسایین و بانگەشەی فەرمانڕەوایی دەکەن ڕزگار بکات، هەروەها پێی وتبوو: لەڕابردوودا شازادەیەك بەناوی"هاچپ سوت" کە ڕیشی دەستکردی بەڕوخساریەوە دەچەسپاند و کلکی شێری لەدوای خۆیەوە هەڵدەواسی فەرمانڕەوایی وڵاتی دەکرد و هەموو خەڵکیش ملکەچی فەرمانەکانی بون، بۆیە ئەویش دەبێت لەئایندەدا ببێتە شاژنێکی بەتوانای میسر.

من لەوباوەڕەدام سەرەڕای ئەوەی"نفر تی تی"باسی خراپەی"هورم هب"ی بۆشازادە خانم "باکتامون" دەکرد، بەڵام ئەو کچە لاوە لەناخەوە"هورم هب"ی لا پەسەند بوو، بەڵام نەیدەتوانی بەرگەی سەرزەنشتی"نفر تی تی"و کەسانی تر بگرێتو خۆی بدات بەدەست پیاوێکەوە کە هەموو کەسێك دەزانێت کە خاوەنی نەژادێکی مەزن نیە.

من لەوباوەڕەدام لەبەرئەوەی"نفرت تی تی"کچی"ئامی"ە، ئەو پیاوە پلانی خۆی و "هورم هب"ی بۆ کچەکەی گێڕابێتەوە و پێی وتووە کە: ئێمە هەردوکمان دەمانەوێت فەرمانڕەوایی میسر بکەین و"نفر تی تی"پەیی بەوە برد کە یەکێك لەخاڵە سەرەکیەکانی ئەم پلانە ئەوەیە کە"هورم هب"ببێتە هاوسەری شازادە خانم

"باکتامون"، ئەوکات"نفر تی تی"هۆش و جوانی خۆی خستە گەڕ بۆئەوەی پلانی ئەو دوانە پوچەڵ بکاتەوە.

کاتێك ژنێکی هۆشیاری وەك شاژن"نفر تی تی"بڕیاری ئەوە بدات کە پلانێك لەکاتی خۆیدا ئەنجام بدات، ئەوا لەداسی گالیسکە جەنگیەکان تیژتر و هەڕەشە ئامێزتر دەبێت.

چۆنایەتی ئاشکراکردنی پلانی ئەم دوو ژنە بەم شێوەیە بوو، کاتێك"هورم هب" خۆی کرد بەناو شاری"تبس"دا پەیامێکی بۆ شازادە خانم"باکتامون"نارد بۆئەوەی چاوی پێی بکەوێت، بەڵام شازادە خانم ڕەتی کردەوە.

شەوێکیان"هورم هب"کە ساڵهایە ئارەزوی ئەوەی دەکرد چاوپێکەوت لەگەڵ شازادە خانم"باکتامون"دا بکات ویستی بڕوات بۆماڵی ئەو و کاتێك نزیکی ماڵەکەی بویەوە بەسەر سوڕمانەوە بینی کەسێکی پایەبەرزی"هاتی"خۆی کرد بەماڵەکەی ئەودا و هەرچی چاوەڕێی کرد کە ئەو لەماڵی ئەو ژنە بێتە دەرەوە بەڵام هەر نەهات.

"هورم هب"هەرچی بیری لێکردەوە کە پایەدارێکی"هاتی" چ کارێکی بەشازادە خانم"باکتامون"ەوە هەیە، بەڵام نەگەشتە هیچ ئەنجامێك، بۆیە"ئامی" لێ ئاگادار کردەوە و لەگەڵ "ئامی"دا لەهەمان شەودا خۆیان کرد بەماڵی"باکتامون"دا، ئەو نۆکەرەی کوشت کە ویستی ڕێی چونە ژورەوەی لێ بگرێت، ویستی کابرای پایەداری"هاتی" لەو ماڵەدا دەستگیر بکات، بەڵام ئەو پیاوە وەك ئەو کەسانەی باوەڕیان بەتوانای خۆیان هەیە، بەتوڕەییەوە قسەی لەگەڵ"هورم هب"دا دەکرد و باسی پەیمانی ئاشتی بۆ دەکرد، "هورم هب"یش ناچاربوو ئازادی بکات، چونکە هیچ فەرمانێکی دەستگیرکردنی ئەوی پێ نەبوو، ڕۆشتنی پایەدارێکی"هاتی" یان کەسێکی ئاسایی ئەو وڵاتە بۆ ماڵی خانمێك ئەویش بەڕەزامەندی شازادە خانم، تاوان نیە. بەڵام دوای ئەوەی کابرای پایەداری"هاتی"یان ئازاد کرد ئەوماڵەیان پشکنی و لەناو خۆڵەمێشی چێشخانەکەدا چەند تەختەقوڕێکیان دۆزییەوە کە لەلایەن "هاتی"ەکانەوە نێردرابوو، ئەو تەختە قوڕانەش وەڵامی ئەو نامانەی بوو کە "باکتامون" بۆ هاتیەکانی ناردبوو. کاتێك"ئامی"و"هورم هب"لەناوەڕۆکی ئەو نامەیە ئاگادار بون، بەشێوەیەك سەریان سوڕماوو ترسان کە بووە هۆی ئەوەی پاسەوان لەچواردەوری ماڵی"باکتامون"و شاژنی پێشو"نفر تی تی"دا دابنێن، ئەوکات

لەهەمان ئەو شەوەدا، هاتن بۆماڵەکەی من کە دەکەوێتە گەڕەکی هەژار نشینەکانەوە کە پێشتر بۆم باسکردن و وتم پێش ئەوەی من ئەو خانووە بکڕم، ماڵی مسگەرێك بووە.

"موتی"خزمەتکاری من هەمان ئەوماڵەی کە لەجەنگی ناوخۆی"تبس"دا وێران بوبو بەو کانزایەی کە "کاپتا"لەسوریاوە بۆی ناردبو نۆژەنی کردبویەوە.

کاتێك"هورم هب" و"ئامی"هاتن بۆ ماڵی من، خۆیان نەناساند و ڕوخساریشیان بە دەمامکێك داپۆشیبوو.

من دوای ئەوەی لەسوریاوە گەڕامەوە بۆ"تبس"شەو خەوم لێ نەدەکەوت، ئەو شەوەش بێداربوم. کاتێك دەنگی لێدانی دەرگا هات و"موتی"لەکاتێکدا لەبەرخۆیەوە بۆڵەی دەکرد-چونکە تازە لەخەو ڕاچڵەکابوو- ڕۆشت دەرگاکە بکاتەوە.

من لەوباوەڕەدا نەبوم کە لەو کاتی شەوەدا"هورم هب"و"ئامی"بێن بۆماڵی من، وام دەزانی هاتون بۆئەوەی من ببەن بۆ لای کەسێك کە نەخۆشیەکەی زۆر هەڕەشە ئامێزە. بەڵام دوای ئەوەی ئەو دوو کەسەم بینی، بەموتیم وت: چرا گەورەکە داگیرسێنێت بۆئەوەی ژورەکە ڕوناکتر ببێتەوە و شەرابمان بۆ بهێنێت.

"هورم هب"پێی وتم: دەبێت"موتی"بکوژێت. چونکە خزمەتکارەکەی من چاوی بەڕوخساری کەوتووە.

منیش سەرم لەم قسەیە سوڕما، چونکە هەرگیز کەسێکی بەسزای بینینی ڕوخساری نەکوشتووە، بۆیە پێم وت: من ئەو دڵنیاییەت پێ دەبەخشم کە ئەم ژنە چاوی بەڕوخساری تۆ نەکەوتووە، چونکە چاوی ئەم ژنە لەڕۆژی ڕوناکدا بەڕادەیەك کزە کە ناشتوانێت ئەسپێکی ناوی"غول"لەنیزکەوە ببینێت، چ بگات بەشەو کە چاوەکانی بەهیچ شێوەیەك توانای بینینی ڕوخساری کەسەکان و ناسینەوەیان نیە، لەبەرئەوە بخۆرەوە و هیچ ترسێکت لەم ژنە نەبێت، دوای ئەوەش بۆم بگێڕەرەوە چی بووە کە بەم شەوە هاتوون بۆ ماڵی من؟ ئایا نەخۆشیەکی ترسناك هەڕەشە لەژیانتان دەکات کە بووەتە هۆی ئەوەی لەم کاتەی شەوەدا ڕێگای ماڵی من بگرنە بەر؟

"هورم هب"وتی: من نەخۆش نیم و هیچ شتێکیش هەڕەشە لەژیانی من ناکات، بەڵام میسر لەژێر باری هەڕەشەیەکی زۆر مەزندایە و تۆ"سینۆهە"دەبێت هەوڵی ڕزگار کردنی بدەیت.

"ئامی"ش پشتگیری قسەکانی"هروم هب"ی کرد و وتی: "سینۆهە"نەك تەنها میسر لەژێر باری هەڕەشەیەکی مەزندا نیە، بەڵکو خودی منیش گرفتاری ئەم هەڕەشەی لەناوچونە بوم، بۆیە تەنها تۆ دەتوانیت میسر و من لەم هەڕەشەیە ڕزگار بکەیت، هەر لەبەرئەوەش من و"هورم هب"لەمکاتە درەنگەدا هاتوین بۆ لات بۆئەوەی داوات لیّ بکەیت هاوکاریمان بکەیت.

منیش پێکەنیم و دەستەکانی خۆمم بۆ ڕاوەشاندن و وتم: هەر بەوشێوەی خۆتان دەیبینن دەستەکانم لەزێر و زیو خاڵیە و هەموو ئەو سامان و داراییەی کە لەمیسردا هەمبوو یان لەکاتی جەنگی ناوخۆی"تبس"دا لەپێناو تێرکردنی خەڵکی ڕەش و ڕوتدا خەرجم کرد یان ئەوەیکە دام بەهورم هب"کە خەرجی جەنگی سوریای بکات، بۆیە ئەمڕۆ هیچ شتێکم بۆ نەماوەتەوە کە بتوانم هاوکاری ئێوەی پیّ بکەم.

ئەوکات"هورم هب"ئەو تەختە قوڕانەی کە لەماڵی شازادە خانم"باکتامون"دا دۆزیبویەوە پیّ نیشاندام، بەڵام سەرەڕای ئەوەی ئەم تەختە قوڕە نوسراوانە وەڵامی پادشای"هاتی"بوو بەناوی "شوبیلولیوما" لەبەرامبەر ئەو نامانەی کە شازادەخانم بۆی ناردبوو، بەڵام لەڕێی وەڵامەکەوە دەتوانی پەی بەوە ببەیت کە شازادە خانم "باکتامون"چی بۆ پادشای"هاتی"نوسیوە، چونکە لەپێشەکی هەر وەڵامێکدا باسی ناوەڕۆکی نامەکەی شازادە خانمی تێدا دوبارە بووەتەوە.

دیارە شازادە خانم"باکتامون"لەنامەکانی خۆیدا بۆ پادشای"هاتی"نوسیوە کە من کچی فیرعەونی مەزنم و زۆریش جوانم و لەمیسردا کەسێك شك نابەم کە شایستەی ئەوە بێت بیکەم بەهاوسەری خۆم و بیستومە کە تۆ خاوەنی چەند کوڕێکی لاویت بۆیە داوات لێدەکەم یەکێك لەکوڕەکانت بنێریت بۆ لام بۆ میسر، بۆئەوەی گۆزەی هاوسەری لەگەڵدا بشکێنم و ببێتە هاوسەرمو دوای ئەوەی گۆزەی لەگەڵدا شکاندم و بوبەهاوسەرم، لەفەرمانڕەوایی میسردا دەبێتە هاوسەرمو دوای مەرگیشمان منداڵەکانمان لەمیسردا فەرمانڕەوایی دەکەن.

تەختە قوڕە نوسراوەکانی"هاتی"گوزارشتی لەوە دەکرد کە کاتێك"شوبیلولوما" یەکەمین نامەی شازادەخانمی میسری دەگاتە دەست، بەشێوەیەك لەخوێندنەوەی ئەو نامەیە سەری سوڕما کە لەسەرەتادا ئەوەی بەبیردا هات کە لەوانەیە بیەوێت فریوی

بدات‌و بیکاتە گاڵتەجاڕی خۆی، بۆیە بەنهێنی نوێنەرێکی خۆی نارد بۆ میسر بۆئەوەی بزانێت ئەو نامەیە تا چ ڕادەیەك ڕاستی لەخۆ دەگرێت.

دوای ئەوەی نێردراوەکەی بەنهێنی لەمیسردا چاوپێکەوتنی لەگەڵ شازادە خانم"باکتامون"دا دەکات‌و تێدەگات کە ڕاست دەکات‌و شازادە خانم لەڕێی ئەو نێردراوەوە نامەیەکی تر بۆ پادشای "هاتی"دەنێرێت‌و دەڵێت کە وەجاخزادەکانی میسرو کاهینەکانی"ئامون"لایەنگری ئەون‌و پێکهێنانی هاوسەری لەگەڵ شازادەی "هاتی"دا بەکارێکی دروست دەزانن.

ئەوکات پادشای"هاتی"تێگەشت کە دەتوانێت لەڕێی پێکهێنانی هاوسەری کوڕەکەی لەگەڵ شازادە خانم"باکتامون"دا دەست بەسەر میسردا بگرێت، بە فەرماندەی لەشکرەکەی خۆی شازادە"شوباتو" کە کوڕی خۆی بوو وت: کە لەگەڵ "هورم هب"دا پەیماننامەی ئاشتی مۆر بکات و بڕیار وابوو کە"شوباتو"دوای بەرقەرارکردنی ئاشتی نێوان"هاتی"و میسر، بچێتە ناو وڵاتی فیرعەونەکانەوە و ژیانی هاوسەری لەگەڵ شازادە خانم"باکتامون"دا پێك بهێنێت.

کاتێك من سەرقاڵی خوێندنەوەی ئەم نامەیە بوم"هورم هب"دەمەقڕەی لەگەڵ "ئامی"دا دەکرد و دەیوت:

"ئامی"ئایا دوای ئەو ئەرك و ماندوبونەی کە من لەپێناو تۆ و میسردا ئەنجامم داوە، پاداشتەکەم ئەوەیە؟ئەگەر من بمزانیایە کە تۆ ئەوەندە کەسێکی ناشایستی و ناتوانی پارێزگاری لەبەرژەوەندیەکانی من لە"تبس"دا بکەیت، ئەوا ناچارم خۆم هەوڵی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆم بدەم، یان پیاوێکی شایستە بۆ ئەم کارە دەستنیشان بکەم.

من ئەگەر سەگێکی کوێرم بکردایەتە پارێزەری بەرژەوەندیەکانم، لەتۆ زۆر باشتر دەیتوانی پارێزگاری لەبەرژەوەندیەکانم بکات و نەیدەهێڵا، پلانێکی ئاوا مەزن بەزیانی من لە"تبس"دا ئەنجام بدەن.

بەڕاستی"ئامی"تۆ نەفرەتئامێزترین پیاویت کە من تائێستا لەسەرتاپای تەمەنمدا بینیبێتم و دوای ئەم ڕوداوە، هیچ ڕێگەچارەیەکی ترم لەبەردەستدا نیە جگە لەوەی لەڕێی سەربازەکانمەوە دەست بەسەر"تبس"دا بگرم و نەهێڵم ئەم هاوسەریەتیە سەربگرێت.

"ئامی"وتی: تەواوی ئەو بابەتانەی کە لەم تەختە قوڕانەدا نوسراوە، ڕاست نیە و تۆ خۆت دەزانی نە وەجاخزادەکان لەم وڵاتەدا بەفەرمانڕەوایی شازادەیەکی "هاتی" ڕازی دەبن و نە کاهینەکانیش.

ناشبێت لەخەڵکی میسریش بترسیت کە ناکۆکیان لەگەڵ فەرمانڕەوایی مندا هەبێت، لەبەرئەوەی هەرگیز دەست وەرنادەنە کاری فەرمانڕەواییەوە و هەرکەسێك دەستەڵات و توانای هەبێت دەتوانێت "هێرەق"[48]یان لێ ببەستێت و هەرکاتێك خۆی بیەوێت زەویان پێ بکێڵێت، هەر لەبەرئەوەش من نە لەوەجاخزادەکان دەترسم و نە لە کاهینەکانیش، بەڵام لە"شوباتو"ی کوڕی پادشای"هاتی"زۆر دەترسم، چونکە ئەم پیاوە بێت بۆ"تبس"و گۆزەیەك لەگەڵ"باکتامون"دا بشکێنێت و ئەم ژنە بکاتە هاوسەری خۆی، بەدڵنیاییەوە دەبێتە پادشای میسرو ئێمە ناتوانین ڕێ لەفەرمانڕەواییەکەی بگرین، مەگەر ئەوەی جەنگ لەگەڵ"هاتی"دا بەرپا بکەیت، میسریش بەهۆی سێ ساڵ جەنگەوە، بەڕادەیەك لاوازی بووە کە مەحاڵە بتوانێت لەگەڵ "هاتی"دا بجەنگێت، چونکە بەدڵنیاییەوە لەو جەنگدا لەناو دەچێت، لەبەرئەوە تەنها کەسێك دەتوانێت ئێمە لەم نەهامەتیە ڕزگار بکات و ئەو کەسەش"سینۆهە"یە.

منیش بەسەرسوڕمانەوە وتم: توو خودایانی میسر پێم بڵێن، پزیشکێکی وەك من، کە نە زێڕی هەیە و نە زۆر و توانا، بەچ شێوەیەك دەتوانێت ئێوە ڕزگار بکات، ئایا ئێوە ئەوەندە هیواتان بەمنە کە بتوانم ئەم شازادە خانمە شێتە بهێنمە ئەو باوەڕەی کە"هورم هب"ی خۆش بوێت.

"هورم هب"وتی: "سینۆهە"تۆ لەڕابردوودا، جارێکیان هاوکاریت کردم و ئێستاش دەبێت جارێکی تر هاوکاریم بکەیت، چونکە مرۆڤ کاتێك دەستی بخاتە ناو هەویری نانەوە، چیتر ناتوانێت دەستی لێ هەڵگرێت و دەبێت ئەوەندە بیشێلێت تا ئەوکاتەی بەکەڵکی ئەوە دێت نانی لێ دروست بکەیت.

تۆ دەبێت لێرەوە بڕۆیت بۆئەوەی پێشوازی لە"شازادە"خانم بکەیت و کارێك بکەیت کە بەزیندویی نەمێنێت، بۆئەوەی پێ نەنێتە خاکی میسرەوە.

---

[48] هێرەق: وشەیەکی پاراوی کوردیە کە بەواتای ئەو گاسنە کوردەواریە دێت کە دەکرێتە میلی"گا"کانەوە بۆئەوەی زەویان پێ بکێڵن.......وەرگێڕ.

من نازانم تۆ بۆئەوەی ئەو بەزیندوویی نەمێنێتەوە، دەبێت چی بکەیت و خودی تۆ دەبێت شێوازێك بۆ کوشتنی بدۆزیتەوە، بەڵام من ناتوانم بەئاشکرا بیکوژم، گەر بەشێوەیەکی ئاشکرا بیکوژم،"هاتی"ەکان بۆ جارێکی تر هەوڵی ئەوە دەدەن هێرش بکەنەوە سەر میسر، لەمڕۆشدا میسر بەڕادەیەك لاواز بووە کە توانای ئەوەی نیە ڕێ لەهێرشەکانی"هاتی"بگرێت.

من بەبیستنی ئەم قسانە ترسم لێ نیشت و ئەژنۆکانم کەوتنە لەرزین و دڵیشم بەخێرایی کەوتە لێدان و زمانیشم کاتێك ویستم قسە بکەم لەناو دەممدا لوولی دەخواردو دەپێچرا، بۆیە بەترەترەوە وتم:

ئەگەر بینیبێتت من بۆ جارێك لەڕابردوودا هاوکاریم کردیت، لەبەرئەوەبوو کە دەمویست فیرعەونێکی شێت لەدەستی خودی خۆی ڕزگار بکەم، چونکە"ئەخناتون" زۆر ئازار و ڕەنجی دەکێشا و ئەگەر لەژیاندا بەردەوام ببوایە، میسری بەرەو لەناوبردن دەبرد.

بەڵام شازادە"شوباتو" کە کوڕی پادشای"هاتی"یە هیچ خراپەیەکی بۆ من نەبووەو من تەنها جارێك، لەو ڕۆژەی کە دەیانویست"ئازیرو"بکوژن چاوم پێی کەوتووە و ئامادە نیم بیکوژم، چونکە نامەوێت دەستم لەخوێنی پیاوێکی بێتاوانەوە بئاڵێنم. بەڵام"هورم هب"ئەبرۆی گرژکردو ڕوخساری مون کرد و بەقامچیەکەی دەیدا لەڕانی خۆی و وتی: "سینۆهە"تۆ پیاوێکی ژیریت و دەزانی کە ئێمە ناتوانین وڵاتێکی مەزنی وەك میسر کە لەمڕۆدا لەسەرتاسەری جیهاندا خاوەنی شانازیەکی تایبەت بەخۆیەتی و دوای ئەوەی لەسوریادا سەرکەوتنی بەدەست هێنا و ئابڕوی بۆ گەڕاوەتەوە، ببێتە قوربانی ئارەزووەکانی ژنێك.

کەمێك بیری لێ بکەرەوە و تێبگە، ئایا دەتوانرێت وڵاتێك بکەیت بەقوربانی، تەنها لەبەرئەوەی ژنێك دەڵێت من نامەوێت لەگەڵ ئەو پیاوەدا ژیانی هاوسەری پێك بهێنم، بۆیە پیاوێکی ترم دەوێت؟

"سینۆهە" ئەوە پەسەند بکە کە ڕێگەچارەیەکی تر بۆ ڕزگارکردنی میسر لەبەردەستدا نیە، جگە لەوەی دەبێت ئەم پیاوە لەناو ببرێت و تۆش دەبێت پێش ئەوەی بگاتە میسر لەناوی ببەیت.

باشترین ڕێگا بۆئەوەی تۆ ئاشنایەتی لەگەڵ ئەم پیاوەدا پەیدا بکەیت ئەوەیە کە هەر ئێستا بەڕێ بکەویت، بۆئەوەی لەبیابانی"سینا"دا خۆت بگەیەنیتە ئەم شازادەی"هاتی"ە.

بەپێی ئەو زانیاریانەی پێم گەشتووە، ئەگەر تۆ هەرئێستا بەڕێ بکەویت و خۆت بگەیەنیتە بیابانی"سینا" لەسەر سنوری میسردا دەگەیت بەم پیاوە و دوای ئەوەی چاوت پێی کەوت پێی بڵێ کە تۆ نوێنەری شازادە خانم"باکتامون"یت و ئەو تۆی ناردووە بۆئەوەی پشکنینێکی تەواو بۆ هاوسەری ئایندەی بکەیت و تێبگەیت کە ئایا ئەو ئامادەیی ئەوەی تێدایە کە بۆ شازادە خانمی میسری هاوسەرێکی بەهێز بێت یان نە؟

من دڵنیام ئەگەر تۆ بەوشێوەیە خۆتی پێ بناسێنی،شازادەی"هاتی"ش باوەڕ بەقسەکانت دەکاتو لەبەرئەوەی شازادەکانیش وەك خەڵکانی تر هەست و کونجکاویان هەیە، لەبارەی هاوسەری ئایندەیانەوە لێکۆڵینەوەیەکی تەواوت لەگەڵدا دەکەن بۆئەوەی بزانن ئایا ئەو جوانە یان نە؟

ئەوکات تۆ"سینۆهە" دەتوانی بەزمانێکی شیرین و گەرم بەشێوەیەك باسی شازادە خانم"باکتامون"یان بۆ بکەیت کە ئەو چیتر هیچ کونجکاویەکی لەبەرامبەر تۆدا نەمێنێت و لێکۆڵینەوەی ئەوەت لەگەڵدا نەکات کە ئایا تۆ بەڕاستی لەلایەن شازادە خانمەوە نێردراوی یان نە؟

گریمان بیەوێت لێکۆڵینەوەشت لەگەڵدا بکات کە ئایا تۆ لەلایەن شازادە خانم"باکتامون"ەوە نێردراوی بۆ لای ئەو یان نە، بەدڵنیاییەوە هەلی ئەنجامدانی ئەم کارەی نابێت کە کەسێك بنێرێت بۆ"تبس"و خودی ئەو کەسە لێکۆڵینەوە لەگەڵ"باکتامون"دا بکاتو دوبارە بگەڕێتەوە، چونکە لەوکاتەدا تۆ کاری خۆت ئەنجام دەدەیت. بەڵام من ئامادەی پەسەند کردنی کارێك کە"ئامی"و"هورم هب" داوایان لێدەکردم ئەنجامی بدەم نەبوم و کاتێك"هورم هب"ئاگاداری ئەوەبوو کە من نامەوێت ئەو کارە ئەنجام بدەم،وتی: "سینۆهە"بڕیاری خۆت بۆ مەرگ یان بەردەوامی ژیان بدە، چونکە ئێستا تۆ ئاگاداری نهێنیەکانی ئێمە بویت، ئەگەر نەتەوێت هاوکاریمان بکەیت، سەرەڕای ئەوەی هاوڕێیەکی نزیکی منیت، ناهێڵم بەزیندویی بمێنیتەوە.

"سینۆهە"ئەو ناوەی دایکت لێی ناویت، ناوێکی شومە، چونکە خاوەنی ئەم ناوە ئاگاداری نهێنی فیرعەونەکانە و کەسێك کە ئاگاداری ئەم نهێنیانە بێت، تا ئەو ڕۆژە زیندووە دەبێت هەوڵی ئەوە بدات ئەم نهێنیانە نەبێتە هۆی مەرگ و لەناوچونی ئەو.

ئێستا پێم بڵێ ئایا ئامادەیت لەمیسر بڕۆیت و پێشوازی لە شازادە "شوباتو" بکەیت و پێش ئەوەی پێ بنێتە خاکی میسرەوە، بیکوژیت یان نە؟

ئەگەر وەڵامی نەخێرم بدەیتەوە من بەهەمان ئەو چەقۆیەی کە بەکەمەرمەوە هەڵمواسیوە، لەهەمان ئەم شوێنەدا شاڕەگە خوێنبەرەکانی مل و لولەی هەناسەت دەبڕم، بەڵام باوەڕ بکە لەناچاریا ئەم کارە دەکەم و بەدڵنیاییەوە سەرەڕای ئەوەی تۆ هاوڕێیەکی دێرینی من بویت، بەڵام من ناچارم هەر تۆ بکوژم. ئێمە و تۆ لەڕابردوودا تاوانێکمان ئەنجام دا، ئەو تاوانەش کوشتنی فیرعەون"ئەخناتون" بوو، بەڵام ئەو تاوانەمان لەپێناو میسردا ئەنجام دا، ئێستاش دەبێت دوبارە لەپێناو ڕزگاری ئەم وڵاتە دوچاری ئەنجامدانی تاوانێکی تر بین، چونکە ئەگەر ئەم تاوانەش ئەنجام نەدرێت، میسر گرفتاری فەرمانڕەوایانی"هاتی"دەبێت.

وتم: "هورم هب"من بەمەرگ چاوترسێن مەکە...ئەگەر نازانی ئەوا ئێستا بزانە کە هیچ پزیشکێك هیچکاتێك لەمەرگ ناترسێت.

"هورم هب"دەستت لەسەر دەسکی چەقۆکەت هەڵگرە، چونکە چەقۆکەت، لەچەقۆی نەشتەرگەریەکەی من کول ترە و منیش زۆر ڕقم لە چەقۆی کولە، ئەوەش بزانە کە من لەترسی مەرگ ئەم داوایەی تۆ پەسەند ناکەم، بەڵکو لەبەرئەوە ئامادەم ئەم داوایەی تۆ پەسەند بکەم کە لەوە تێدەگەم تۆ ڕاست دەکەیت و میسر دەبێت لەفەرمانڕەوایانی"هاتی"ڕزگار بکرێت.

"هورم هب"وتی: ئافەرین، تۆ دوای ئەوەی ڕۆشتی بۆ لای شازادەی"هاتی"و بیستی کە تۆ لەلایەن هاوسەری ئایندەیەوە نێردراویت، یەکسەر دیاریگەلێکی گرانبەهات پێشکەش دەکات، ئەویش بەڕادەیەك کە دوبارە دوڵەمەند ببیتەوە.

وتم: من چاوەڕێی دیاریەکانی ئەو ناکەم، ئەگەر پیاوێکی سامان خۆشەویست و تەماع بوایەم، ئەو هەموو زێڕ و زیو و گەنم و نۆکەر و کێڵگانەی کە هەمبوو بۆ خۆم هەڵدەگرت، تۆ باش دەزانی کە من هەموو ئەوانەم لەدەست داوە.

ئەوکات من دڵنیام لەوەی کە دەکوژرێم، چونکە ئەوانەی لەدەوروبەری شازادە "شوباتو"دان کاتێك ئاگاداری ئەوە دەبن کە من کوڕی پادشا ئەوانم کوشتووە دەمکوژن.

من هێشتا نازانم بەچ شێوەیەك دەتوانم ئەم پیاوە لەناو ببەم، بەڵام ئەمکارە بۆ ڕزگارکردنی میسر ئەنجام دەدەم و تێدەگەم لەوەی ئەمەش وەك تەواوی ئەو ڕوداوانەی کە بەسەرمدا هاتووە بەشێکە لەچارەنوسم و هەر لەیەکەمین ڕۆژەوە ئەستێرەکانی ئاسمان، ئەم چارەنوسەیان بۆ دەستنیشان کردووم.

لەبەرئەوە تۆ ئەی"هورم هب"و تۆ ئەی"ئامی"کە زۆر حەز دەکەیت ببیتە پادشای میسرو تاجی فەرمانڕەوایی میسر لەدەستی من وەرگریت و بینێیت بەسەرتەوە و لەئایندەدا بەچاکی باسم بکەیت و بڵێیت کە پزیشکێکی هەژار و بێتوانا فەرمانڕەوایی گەڕاندەوە بۆ میسر.

کاتێك من ئەم قسانەم دەکرد لەناخەوە هەستم بەلەخۆبایی دەکرد، چونکە ئەوەم هێنایەوە یاد خۆم کە من لەنەوەی ڕاستەقینە و مەزنی فیرعەونەکانی میسرم، بەواتا لەنەژادی خودایانم‌و لەڕوی یاساییەوە من میراتگری ڕاستەقینەی تاج و تەختی فەرمانڕەوایی میسرم‌و مافی من بۆ فیرعونی میسر لە"ئامی"زۆر زیاترە کە لەسەرەتادا تەنها کاهینێکی بچوك بووە، هەروەها لە"هورم هب" کە هێشتا بۆنی سەنێر لەدایك و باوکیەوە دێت شایستەی ئەم فەرمانڕەواییەم.

لەوشەوەدا بە"هورم هب"م وت: کە من لەمەرگ ناترسم و ئەو گوتەیەشم دروست بوو، چونکە من بەهیچ شێوەیەك لەئازارەکانی مەرگ ناترسم، چونکە دەمزانی مەرگ هیچ ئازارێك لەخۆ ناگرێت، بەڵام سەرەڕای ئەوەی لەبەردەمی"هورم هب"و"ئامی"دا بەکەسێکی بەهێز و توانا کەوتمە بەرچاو، زۆر خەمم بۆ لەدەستدانی ژیان دەخوارد.

ئەوەم هێنایەوە یاد، ئەگەر بمرم چیتر چاوم ناکەوێت بەفڕینی ئەو پەڕەسێلکانەی بەسەر ڕوباری"نیل"دا سەما دەکەن‌و چیتر لەبینینی دیمەنی ڕەزە دەیمی قوچەکیەکان بێبەش دەبم و چێژ لەو قازانەی کە"موتی"بەشێوازی میسری بۆی سور دەکردمەوە وەرناگرم. بەڵام سەرەڕای ئەوەی ئەم چێژانەم هێنایەوە یاد، ڕزگاری میسریش بەئەرکی سەرشانی خۆم دەزانی‌و من کە بۆ ڕزگارکردنی وڵاتی میسر. فیرعەونی میسر"ئەخناتون"م ناردە جیهانەکەی تر، نابێت لەکوشتنی پیاوێکی

"هاتی"بەواتا کەسێك کە دوژمنی نیشتمان و نەتەوەکەی من و خودایانی میسرە سڵ بکەم. چونکە ئەگەر خۆم لەکوشتنی شازادەیەکی بیانی کە من بچوکتری پەیوەندی هاوڕێیەتیم لەگەڵیدا نیە بپارێزم، وەك ئەوە وایە کە فیرعەون"ئەخناتون"بەبێ هودە بەدەستی من کوژرابێت و ئەو قوربانیە مەزنەی کە من لەپێناو میسردا ئەنجام داوە بێ ئەنجام بووە.

تەواوی ئەم بیرۆکانە لەو شەوەدا کە"هورم هب"و"ئامی"لەماڵی مندا بون، بەنێو ڕۆحی مندا گوزەرا، ئەوکاتانەش کە تەماشای ئەو دوانەم دەکرد کە دوکەسی داگیرکەرن و دەیانەوێت وڵاتی میسر تاڵان بکەن، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئەم دوانە بەکەسانێکی میسری لەقەڵەم دەدران، لەکاتێك شازادە"شوباتو"کەسێکی بیانییە.

لەبەرئەوەش بە"هورم هب"م وت: ئەی پیاو دەتەوێت تاجی میسر بکەیتە سەرت، ئەوەش بزانە کە تاجی فەرمانڕەوایی قورسە و تۆ لەشەوێکی گەرمی هاویندا کاتێك ئارەق لەسەر و ڕوخسارت دەچۆڕێت، هەست بەقورسی ئەم تاجە دەکەیت.

"هورمهب"وتی: "سینوهە"لەباتی ئەوەی گفتوگۆلەسەرقورسی تاجی فەرمانڕەوایی بکەیت هەستە و بەڕێکەوە، چونکە کەشتیەك بۆ ئەم ڕۆشتنەی تۆ ئامادەیە و تۆ دەبێت بەخێرایی خۆت بگەیەنیتە بیابانی"سینا" بۆئەوەی پێش ئەوەی شازادەی "هاتی" بگاتە سنوری میسر، خۆتی پێ بگەیەنیت.

بەوشێوەیە من لەو شەوەدا کەلوپەلی کۆچم، بۆنمونە جانتای پزیشکیەکەم، گواستەوە بۆ ئەو کەشتیە خێرایەی کە "هورم هب"بۆی تەرخان کردبوم.

لەو شەوەدا"موتی" قازێکی بەنەریتی"تبس"لەتەنوردا بۆ برژاندم کە تەنها کەمێکم لەو شەوەدا لێخوارد، پاشماوەیەکەیم لەگەڵ خۆمدا برد بۆ ناو کەشتیەکە بۆئەوەی لەڕێدا بیخۆم بەڵام شەرابیشم لەبیر نەچوو.

کاتێك کەشتی لەڕوباری"نیل"ەوە بەرەو خوار دەڕۆشت، هەلی ئەوەم بۆ ڕەخسا کە بیر لەو نەهامەتیە بکەمەوە کە هەڕەشە لەوڵاتی میسر دەکات.

من ئاگاداری ئەوەبووم کە ئەو هەڕەشەیە وەك زریانێکی ڕەش وایە کە لەکەنارەکانی ئاسۆوە پەیدابووە و ئەگەر پێشی لێ نەگرن، میسر لەناو دەبات.

نامەوێت بەم قسانەم خۆم وەك ڕزگارکەێکی میسر بناسێنم، چونکە ئەگەر ئەم قسەیە بکەم، ئەوا درۆتان لەگەڵدا دەکەم.

ئەو کارانەی مرۆڤ ئەنجامیان دەدات، لەچەند هۆکارێکی جۆراوجۆرەوە سەرچاوە دەگرێت و لەوانەیە هەموو کارێك هەڵگری دوو هۆکاری سەرەکی بێت، یەکێك لەو هۆکارانە تایبەتە و ئەویتریان بەرژەوەندی گشتیە. بەڵام لەزۆر کاتدا، خەڵکی چاویان بە هۆکاری تایبەت ناکەوێت، هەر لەبەرئەوەش وادەزانن ئەو کەسەی کە ئەو کارەی ئەنجام داوە، جگە لەبەرژەوەندی گشتی هیچ شتێکی تری لەبەرچاو نەگرتووە.

بۆنمونە من دەرۆشتم بۆ ئەوەی میسر لەهەرەشەی فەرمانڕەوایی"هاتی"ڕزگار بکەم، بەڵام هۆکارێکی تایبەتیش هانی دەدام بۆئەوەی ئەم کارە ئەنجام بدەم، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر نەڕۆشتمایە"هورم هب"دەیکوشتم.

سەرەڕای ئەوەش هەستم بەشەرم نەدەکرد کە بۆچی دەڕۆم بۆئەوەی کەسێك بکوژم، چونکە دەمزانی بەکوشتنی ئەو کەسە میسر ڕزگاری دەبێت.

جارێکی تر خۆمم بەتەنهایی بینی و ئاگاداری ئەوەبوم کە دۆست و خەمخۆرێکم نیە، ئەو نهێنیەی کە من لەڕۆحمدا هەڵمگرتبوو، بەڕادەیەك هەڕەشە ئامێز بوو کە ئەگەر ئاشکرام بکردایە، هەزاران کەسی بەکوشت دەدا و من نەمدەتوانی بۆ هیچ کەسێك باسی بکەم.

من دەزانم بۆ لەناوبردنی شازادەی"هاتی"ناتوانم داوای هاوکاری لەهیچ کەسێك بکەم، چونکە ئەگەر کەسێکی تر ئاگاداری ئەم نهێنیە ببێت و بزانێت بۆچی هاوکاری من دەکات، نهێنیەکە کە دەگاتە گوێ هەموو کەسێکی ناو بازاڕ.

من بۆکوشتنی شازادەی"هاتی"دەبێت فێڵگەلێکی زۆر بەکاربهێنم، چونکە دەمزانی ئەگەر ئەوانەی لەچواردەوری شازادەدان ئاگاداری ئەم پیلانەی من بن کە کوڕی پادشای ئەوانم کوشتوە، بەجۆرەها ئەشکەنجە بۆنمونە یەکێك لەو ئەشکەنجانە بەزیندویی کەوڵکردنی پێستم دەمکوژن وخەڵکی"هاتی"لەئەشکەنجەداندا شارەزاترین جەلادانی جیهانن.

هەندێکات بیرم لەوە دەکردەوە کە دەست لەم کارە هەڵگرم و هەڵبێم و بڕۆم لەوڵاتێکی دورەدەستدا بژیم و میسر پشتگوێ بخەم و هەرچی بەسەردا بێت بەلامەوە گرنگ نەبێت، ئەگەر ئەم کارەم بکردایە و هەڵبهاتایام بارودۆخی جیهان، بەوشێوەیە نەدەبوو کە ئەمڕۆ هەیە، چونکە مێژویەکی جیاواز دەهاتە بون.

بۆیە لەدڵی خۆمدا وتم: "سینۆهە"تۆ کە ئەمڕۆ پیر بویت، ئەوەندە ئەزمونت هەیە کە بزانی نابێت فریوی وشە و دەربڕینەکان بخۆیت، چونکە ئەم جیهانە بنەما و بڕیارگەلێك لەخۆ دەگرێت کە هیچ گوتەیەکی هیوابەخش و هیچ بەڵێنێکی مەزن ناتوانێت لەناویان ببات.

یەکێك لەو بنەمایانە ئەوەیە کە لەهەموو وڵاتێکدا چینێکی هەژار و کەمدەست بەبەردەوامی دەبێت لەژێرباری ستەمی کەسە وەجاخزادە و دەستەی فەرمانڕەوا و دادوەراندا بن، ئیتر سەرۆکی دەستەی دادوەری"ئامی"بێت یان"هورم هب" یان شازادەی"هاتی".

لەبەرئەوە ئەگەر تۆ شازادە"هاتی"بکوژیت، هیچ جیاوازیەك لەنێو چینی هەژاراندا دروست ناکەیت، چونکە ئەگەر شازادەیەکی بیانی دوای ئەوەی بوو بە فیرعەونی میسرو ستەم لە خەڵکی هەژارو بێدەرەتان نەکات، ئەوا"ئامی" و"هورم هب"دەیانخەنە ژێر فشاری ستەمەکانی خۆیانەوە.

کەواتە هەڵبێ و لەوڵاتێکی دوردا بەردەوامی بەژیانی خۆت بدە، بۆئەوەی دەستت ئالودەی خوێنی ئەم پیاوە نەبێت. بەڵام سەرەڕای ئەوەی قسەم لەگەڵ خۆمدا دەکرد، هەڵنەهاتم، چونکە پیاوێکی لاواز بوم، بەواتا خووم بەژیانێکی ئاسانەوە گرتبوو و خواردن و خواردنەوەگەلێکی خۆش لەڕوی ڕۆحی و دەرونیەوە لاواز و بێدەرەتانی کردبوم و کاتێك پیاوێك بەهۆی ئەوەی هۆگری ژیانێکی خۆش و ئاسانەوە توانا و ویستی خۆی لەدەست بدات، بەشێوەیەك لاواز دەبێت کە بەو هۆیەوە دەبێتە ئامێری دەستی کەسانی تر و دەست لەتاوانگەلێکەوە دەدات و چیتر دوای ئەوە ناتوانێت نەبێتە ئامێری دەستی کەسانی تر.

من لەوباوەڕەدام کە ژیانێکی ئاسودە و خواردن و پۆشاکی باش و بونی نۆکەران کە شەو و ڕۆژ خزمەتی مرۆڤ دەکەن، بەشێوەیەك مرۆڤ هۆگری ئاسودەی و تەمەڵی دەکات کە هەندێك لەو کەسانە ئامادەن بمرن، بەڵام ئامادە نین گۆڕانێك لەژیاندا دروست بکەن، چونکە لەنهێنی و نادیاری ژیانی ئایندە دەترسن هەروەها لەوەش دەترسن کە خەو و خۆراك و پۆشاك و ژنە جوانەکانیان لەدەست بدەن.

لەبەرئەوەی من پیاوێکی لاواز بوم و نەمدەتوانی خۆم لەو چارەنوسەی کە ئەستێرەکان یان"هورم هب" بۆیان دەستنیشان کردبوم ڕزگار بکەم، بۆیە بیری

هەڵهاتنم لەهزری خۆم پاك كردەوە و بڕیارمدا"شوباتو"بكوژم و بیرم لەوەش دەكردەوە كە بەچ شێوەیەك لەناوی ببەم، بۆئەوەی ئەوانەی چواردەوری من و خەڵكی میسر بە بەكوشتنی شازادەكەیان تاوانبار نەكەن.

من دەمزانی كە ئەركێكی قورسم لەئەستۆدایە، چونكە شازادە"شوباتو"هەرگیز تەنها نابێتو"هاتی"یەكانیش خەڵكانێكن كە گومانیان لەهەموو كەسێك هەیە، بۆیە مەحاڵە بهێڵن من و كوڕی پادشاكەیان بەتەنهایی بمێننەوە.

من دەمزانی كە ناتوانم"شوباتو"لەگەڵ خۆمدا ببەم بۆ بیابان و لەدۆڵێكدا فڕێی بدەم، یان لەڕێی مارێكی ژەهراویەوە ژەهراوی بكەم. چونكە ئەوانەی چواردەوری ناهێڵن بۆساتێكیش لەگەڵ مندا بەتەنها بێت.

من دەمزانی كە دەتوانیت هەندێك لەدرەختە میوەدارەكان بەشێوەیەك پەروەردە بكەیت كە میوەكانیان ژەهراوی دەرچن و ببێتە هۆی مردنی كەسانی تر. هەروەها ئاگاداری ئەوەبووم كە دەتوانرێت هەندێك لە"كتێبەكان كە لەسەر ئەو لاپەرە "پاپیرۆس"انەی شتیان لەسەر نوسراوە بەشێوەیەك ژەهراوی بكەیت كە هەركەسێك لاپەڕەكانی هەڵداتەوە و بخوێنێتەوە بەهۆی ئەو ژەهرەوە بمرێت. بەڵام نەمدەتوانی لەبیابانی"سینا"دا سود لەو جۆرە كەسەرتانە وەرگرم، چونكە پەروەردەكردنی درەختی میوەی ژەهراوی و ئاڵودەكردنی لاپەڕەكان بەژەهری كوشندە كات و شوێنی پێویست هەیە و شازادە"شوباتو"ش كتێب خوێن نەبوو، بۆئەوەی بتوانم كتێبێك بەژەهر ئاڵودە بكەم و پێی بدەم.

ئەگەر"كاپتا"لەو دەوروبەرەدا بژیایە دەمتوانی پشت بەهاوكاریەكانی ببەستم، چونكە دەمزانی كە پیاوێكی فێڵبازەو لەدارِشتنی ڕێگەچارەكاندا كەسێكی نائاساییە، بەڵام "كاپتا" لەسوریادا دەژیت بۆئەوەی قەرزەكانی خۆی بداتەوە، لەبەرئەوەی هیچ ڕێگەچارەیەكی ترم لەبەردەستدا نەبوو جگە لەوەی پشت بە هۆش و زانستی خۆم ببەستم بۆ لەناوبردنی "شوباتو" ی كوڕی پادشای"هاتی".

ئەگەر"شوباتو"نەخۆش بوایە، ئەوا كوشتنی بەلای منەوە زۆر ئاسانتر دەبوو، لەبەرئەوەی لەمحاڵەتەدا دەمتوانی بەشێوازە زانستیەكان بەشێوەیەك كە هیچ كەسێك لێم بەدگومان نەبێت بینێرمە جیهانەكەی ترەوەو تەنها پزیشكەكان دەیانتوانی تێبگەن لەوەی من ئەوم كوشتووە، بەڵام پزیشكەكان ملكەچی ئەو یاسایەن كە لەهیچ

شوێنێکدا نەنوسراوەتەوە و بەبەردەوامی تاوانی کوشتنی هاوکارەکانیان پەردەپۆش دەکەن و هیچکاتێك نابینیت پزیشکێك بڵێت کە پزیشکێکی تر بەئەنقەست یان بەهۆی نەزانیەوە کەسێکی نەخۆشی کوشتووە. بەڵام"شوباتو"نەخۆش نەبوو، ئەگەر نەخۆشیش بکەوتایە ئەوا پزیشکانی وڵاتی"هاتی"چارەسەریان دەکرد و پێویستیان بەوە نەبوو کە داوای هاوکاری لەمن بکەن.

لەبەرئەوە باسی ئەم خاڵانە دەکەم بۆئەوەی بزانرێت کە ئەو ئەرکەی"هورم هب"و "ئامی"بەتایبەت"هورم هب" پێی سپاردبوم چەنێك دژوارە. ئێستا دژواری ئەم کارەم خستە ڕوو، بۆیە لەمەودوا باسی ڕوداوەکان دەکەم و دەڵێم دوای ئەوەی کەشتیەکەم گەشتە"ممفیس"یەکسەر ڕۆشتم بۆ ماڵی ژیانی ئەوشارە و وتم: کە هەندێك ژەهری جۆراوجۆرم بدەنێ.

هیچ کەسێك سەری لەو دواکاریانەی من سوڕنەما، چونکە هەموویان دەیانزانی کە هەرەشەئامێزترین ژەهر لەهەندێك نەخۆشیدا –ئەگەر بڕێکی کەمی لەلایەن پزیشکەوە بۆ نەخۆش دەستنیشان بکرێت– لەوانەیە ببێتە هۆی ئەوەی کەسی نەخۆش چاك بکاتەوە.

دوای ئەوەی ئەو ژەهرانەم لەماڵی ژیانی ئەو شارەدا بەدەست هێنا ڕۆشتم بۆ"تانیس"و لەوێوە بەسواری کەژاوەیەك ڕێگای بیابانی"سینا"م گرتەبەر و هەر بەوشێوەی"هورم هب"فەرمانی دابوو چەند گالیسکەیەکی جەنگی لەگەڵم بێن بۆ هەموو شوێنێك، بۆئەوەی نەوەکوو چەتەیەك سەری ڕێم لێ بگرێت.

زانیاریەکەی"هورم هب" بەڕادەیەك لەبارەی گەشتەکەی"شوباتو"ڕاست بوو کە لەسێ ماڵی شاری"تانیس" لەبیابانی"سینا"و کەنار ڕوبارێکی بچوکدا گەشتم بە "شوباتو"و بینیم کە لەوێدا مەنزڵی خستووەو هەندێك لەسەربازو خزمەتکارە "هاتی"ەکان لەگەڵیدان. کوڕی پادشای "هاتی" لەئۆردوگاکەی خۆیدا وڵاخێکی زۆری هەبوو، من تێگەشتم کە باری گوێدرێژەکان دیاریگەلێکە کە"شوباتو"دەیەوێت لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ میسر، بۆئەوەی پێشکەشی شازادە خانم"باکتامون"ی بکات.

کۆمەڵێك گالیسکەی جەنگی قورسیش لەو ئۆردوگایەدا بەدی دەکرا و بیستم کە کۆمەڵێك گالیسکەی سوکیش بۆ پشکنین و گەشتکردن بەرەو پێشەوە ڕۆشتون، چونکە پادشای"هاتی"کە کوڕی خۆی دەنارد بۆ میسر دەیزانی کە"هورم هب"

لەناخەوە"نارازیە بەهاتنی کوڕە لاوەکەی بۆ میسر و بۆیە هێزێکی جەنگی بچوك، بەڵام زبردەست و هەڵبژاردەی لەگەڵ کوڕەکەی خۆیدا نارد کە هەرکاتێك"هورم هب" مەبەستێکی خراپی لەبەرامبەر"شوباتو"دا هەبێت، ئەوان بەرگری لێ بکەن.

کاتێك خۆم کرد بەناو ئوردوگای کوڕی پادشای"هاتی"دا، ئەو کەسانەی کە لەوێ بون بەرێزەوە پێشوازیان لەمن و ئەو سەربازانەی کە لەگەڵمدا بون کرد، چونکە نەریتی"هاتی"ئەوەیە کاتێك دەبینن دەتوانن بێ پەنابردن بۆ جەنگ و بەخۆڕایی هەندێك شتیان بەخۆڕایی و بێ ئەرك کێشان دەست بکەوێت، بەرێزەوە پێشوازیان لێ دەکەن، تا ئەو ڕۆژەی دەیانخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە و ئەوکات پێستیان کەوڵ دەکەن، یان هەردوو چاویان کوێر دەکەن و دەیاننێرن بۆ ئاشەکانیان.

خەڵکی"هاتی"هاوکاریان کردین بۆئەوەی بتوانین ئوردوگای بچوکی خۆمان لەکەنار ئۆردوگای"شوباتو"دا بەرپا بکەین، بەڵام بەناونیشانی ئەوەی کە ئێمە لەدز و شێرەکانی بیابان بپارێزن کۆمەڵێکیان چواردەوری ئوردوگاکەی ئێمەیان گرت.

ئەو ڕۆژەی من لەنزیك شاری"مجیدو"لەسوریا لەدورەوە چاوم پێی کەوت، ئەو لەکەنار"هورم هب"ەوە ڕاوەستابوو و زۆر مەست بوو، هەر لەبەرئەوەش چاوەکانی ڕەشی دەنواند. بەڵام لەو ڕۆژەدا بینیم کە چاوێکی جوان و درەوشاوەی هەیە و لەبەرئەوەی وای دەزانی کە من لەلایەن "باکتامون"ەوە هاتوم بۆلای خۆشحاڵی و کونجکاوی ئەو لوتە گەورەکەی هێنایە لەرزین و دوای ئەوە پێکەنی و ددانە سپیەکانی دەرکەوتن و من بینیم کە جلی میسری لەبەرکردووە، بەڵام لەو جلانەدا زۆر هەستی بەنائارامی دەکرد.

هەردوو دەستم خستە سەر ئەژنۆم و کڕنوشم بۆ برد، ئەوکات هەستامەوە سەرپێی و نامە ساختەکەی خانم"باکتامون" کە"ئامی"ئامادەی کردبوو دا بەو. لەو نامە ساختەیەدا "باکتامون" منی وەك نێردراوی خۆی لەلای شازادەی"هاتی"ناساندبوو و دەیوت کە من"سینۆهە" پزیشکی فەرمانڕەوایی و نهێنی پارێزی تایبەتی ئەوم و لەبەرئەوەی ئاگاداری هەموو نهێنیەکی شازادە خانمم، ئەوا نابێت هیچ نهێنیەکی خۆیم لێ بشارێتەوە و دەبێت وەڵامی تەواوی پرسیارەکانی من بداتەوە و متمانەیەکی تەواوی بەمن هەبێت.

"شوباتو"وتی: "سینۆهە" لەبەرئەوەی تۆ پزیشکی فەرمانڕەوایی و نهێنی پارێزی هاوسەری ئایندەی منیت، منیش هیچ شتێکت لێ ناشارمەوە و پێت دەڵێم کەدوای ئەوەی من ژیانی هاوسەریەتیم لەگەڵ شازادە خانم"باکتامون"دا پێك هێنا وڵاتی ئەو وەك وڵاتی خۆم تەماشا دەکەمو بڕیاری ئەوەم داوە کە ملکەچی یاسا و نەرتی میسر بم و هەروەك چۆن دەبینی جلی میسریم لەبەرکردووە، ئێستا خۆم فێری نەریتە میسریەکان دەکەم بۆئەوەی کاتێك گەشتمە میسر خەڵکی وەك بێگانەیەك تەماشام نەکەن، من زۆر حەز دەکەم چاوم بەشوێنە سەرنج ڕاکێشەکانی میسر بکەوێت و زانیاریەکی تەواو لەسەر خوداکانی میسر بەدەست بهێنم کە لەمەودوا دەبنە خودای منیش، بەڵام لەهەموویان زیاتر تامەزرۆی بینینی ژنی ئایندەی خۆم"باکتامون"م، چونکە دەزانم دەبێت لەگەڵ ئەودا خێزانی فەرمانڕەوای نوێ پێك بهێنم. لەبەرئەوە باسی ئەوم بۆ بکە و پێم بڵێ ئایا هەر بەوشێوەی بۆیان باسکردوم جوانە یان نە؟ پێم بڵێ بالای بەرزە یان کورتە؟ سینە و مەمکی بەچ شێوەیەکە، ئایا سمت و کەمەری پانە یان نە؟"سینۆهە"هیچ شتێکم لێ مەشارەوە و ئەگەر دەزانی هەر کەموکورتیەك لەئەندامی شازادە خانمدا هەیە پێم بڵێ، چونکە هەروەك چۆن من متمانەیەکی تەواوم پێتە، تۆش دەبێت متمانەیەکی تەواوت بەمن هەبێت.

متمانەی"شوباتو"لەو ئەفسەرە"هاتی"انەی کە بەچەکەوە چواردەوریان گرتبوین بەدی دەکرا و من دەمزانی کە لەدواشمەوە چەند پاسەوانێکی نێزەدار ڕاوەستاوە، بۆئەوەی ئەگەر هەر گومانێکیان لەمندا بینی، نێزەکانیان لەجەستەمدا بچەقێنن. بەڵام من وا خۆم نیشان دا کە چاوم بەوان ناکەوێت و وتم: شازادە خانم"باکتامون"یەکێکە لەژنە جوانەکانی میسر و لەبەرئەوەی هەڵگری خوێنی پیرۆزی خودایانە، تا ئەمرۆش پەردەی کچێنی خۆی پاراستووە، چونکە نەیویستووە ببێتە هاوسەری پیاوێك کە شایستەی ئەو نەبێت، هەر لەبەرئەوەش لەتەمندا کەمێك لەتۆ گەورەترە، بەڵام تەمەنی ژنێکی جوان لەبەرچاو ناگیرێت، لەبەرئەوەی جوانیەکەی هەمیشە ئەو لەهەرەتی لاویەتیدا پیشان دەدات، شازادە"باکتامون"خاوەنی ڕوخسارێکی مانگ ئاسایە و چاوەکانیشی هێلکەییە، ئەگەر چاوەکانی ببینی هێزت لەبەر دەبڕێت. بالای شازادە خانم نە زۆر بەرزە و نەزۆریش کورت و بەشی دواوەی جەستەی پان و جوانە و ئەم بابەتەش لەڕوی پزیشکیەوە ئەوەمان پێنیشان دەدات کە ئەو دەتوانێت منداڵگەلێکی

زۆری ببێت، بەڵام کەمەری شازادە خانم، وەك کەمەری تەواوی ژنانی میسر باریکە و لەبەرئەوەش منی بۆ لای تۆ ناردووە کە من چاوم پێت بکەوێت و لێت بپرسم ئایا تۆ دەتوانی بۆ ئەو ببیتە هاوسەرێکی باش و بەهێز؟چونکە شازادە خانم کە تۆی بەشایستەی هاوسەری خۆی زانیوە چاوەڕێی ئەوەت لێدەکات تۆ بتوانی ئەرکی هاوسەریەتیت لەبەرامبەر ئەودا ئەنجام بدەیت.

کاتێك شازادە"شوباتو"گوێ لەم قسانە بوو، دەستەکانی چەماندەوە بۆئەوەی بتوانم ماسولکە دەرپەڕیوەکانی بازوی ببینم و وتی: بازوی من ئەوەندە بەهێزە کە من دەتوانم مەزنترین و بەهێزترین کەوان بەئاسانی بکێشم و بەسەر سواری وڵاخیشەوە دەتوانم بەزۆری سوڕانەوەی دەستم ئێسقانی ئەو وڵاخە بشکێنم. ڕوخساریشم ئەوەیە کە دەیبینی و چاوت پێی دەکەوێت کە هیچ کەموکورتیەکی تێدا بەدی ناکرێت و تائێستاش نەخۆش نەکەوتوم. وتم: "شوباتو"دیارە کە تۆ لاوێکی بێ ئەزمونیت و زانیاریەکی تەواوت لەبارەی نەریتەکانی میسرەوە نیە، چونکە وا دەزانی کە شازادە خانمێکی میسری کە خوێنی خودایان لەخوێنبەرەکانیدا دەخرۆشێت، کەوانێکە کە بتوانی تاڵی کەوانەکەی بەبازووە بەهێزەکانت بکێشی یان وڵاخێکە کە بتوانیت ئێسقانەکانی بەسوڕانەوەیەك بشکێنی، نەخێر"شوباتو"ژنێکی جوان و لاو لەبەر شتێکی تر شو دەکات، هەر لەبەرئەوەش شازادە خانم منی ناردووەتە لات، ئەگەر تۆ هێشتا شارەزای ئەوە نیت کە لەگەڵ ژنێکدا ئیشقبازی بکەین، من ئەو زانستەت فێر دەکەم.

"شوباتو"بەو قسانەی کە نکوڵی لەپیاوەتی ئەو دەکرد زۆر توڕە بوو و ڕوخساری سور داگەڕاو مشتی دەستی بەتوندی نوقاند، لەوکاتەدا ئەو ئەفسەرانەی کە لەچواردەوری چادرەکەدا بون دەستیان کرد بەپێکەنین، بەڵام لەبەرئەوەی "شوباتو" ئەوەی بەباشدەزانی کە هیچ توندوتیژیەك لەبەرامبەر مندا نیشان نەدات و دوای ئەوە زاڵ بوو بەسەر توڕەییەکانی خۆیدا و وتی: "سینوهە" تۆ واهەست دەکەیت منداڵم و تائێستا لەگەڵ هیچ ژنێکدا ڕامنەبواردووە. من تا ئەمڕۆ زیاتر لە دو کەرەتی شەست ژندا ڕامبواردووە و هەموشیان زۆر لێم ڕازی بون، ئەگەر شازادە خانمی تۆ تەنها بۆ جارێك لەگەڵ مندا ڕابوێرێت تێدەگات کە پیاوانی وڵاتی"هاتی"باشترین پیاوانی جیهانن.

وتم: من ئامادەم ئەو بابەتەی باست کرد پەسەند بکەم، بەلام تۆ چەند ساتێك پێش ئێستا وتت کە تائێستا نەخۆش نەوتووی، لەکاتێکدا من لەچاوەکانی تۆوە، دەتوانم لەوە تێبگەم کە ورگت نەخۆشە و ئازارت دەدات.

یەکێك لەفێڵەکانی پزیشك بۆئەوەی بتوانێت زێڕ و زیو لەدەوڵەمەندەکان دەرکێشێت هەمان ئەو شتەیە کە بەپیاوێکی دەوڵەمەند بڵێت تۆ نەخۆشیت. مرۆڤ هەرچەنێکیش تەندروست بێت کاتێك لەدەمی پزیشکێك ببیستێت کە ئەو بەنەخۆش بزانێت، یەکسەر واهەست دەکات کە نەخۆشە. چونکە مرۆڤ سەرەڕای ئەوەی تەندروست بێت، گەر ئەم جۆرە قسانە لەدەمی پزیشك ببیستێت یەکسەر ئەوە دەهێنێتەوە یاد خۆی کە دوێنێ شەو نەیتوانیوە زوو بخەوێت یان دوێنێ کاتێك لەخەو هەستا کەمێك هەستی بەبێتاقەتی کردووە یان پێرێ شەو، بەو شێوەی کە خۆی حەزی لێی بوو نەیتوانی نان بخوات.

بەبیرهێنانەوەی هەریەك لەم ڕوداوە بچوکانە کە تەندروست ترین کەس دوچاری ئەم حاڵەتە ئاساییانە دەبێت، بەسە بۆئەوەی مرۆڤ بهێنێتە ئەو باوەڕەی کە پزیشك ڕاست دەکات و ئەو بەڕاستی نەخۆشە و دەبێت چارەسەری خۆی بکات، ئەوکات پزیشك ئەگەر بزانێت ئەوا دەتوانێت زێڕ و زیوێکی زۆر لەبەرامبەر ئەم چارەسەر کردنەدا لەو پیاوە دەوڵەمەندە وەرگرێت. بەلام من لەوکاتەدا تایبەتمەندی پزیشکێکی تەماعم لەخۆم گرتبوو کە بەمەبەستی سود وەرگرتن پیاوێکی دەوڵەمەند بەکەسێکی نەخۆشی لەقەڵەم بدەم،ئەویش ئەوەبوو کە دەمزانی "شوباتو" کەمێك لەورگیدا هەست بەئازار دەکات، چونکە زانیاری ئەوەم هەیە کە لەڕوبارەکانی بیابانی "سینا"دا تاڕادەیەکی زۆر مادەی"کلس"ی تێدایە و ئەم مادەیەش دوای ئەوەی لەڕێی ئاوەوە دەچێتە ناو ورگی مرۆڤەوە، دوچاری ڕەوانی دەکات، بەتایبەت ئەو کەسانەی کە بەبەردەوامی ئاوی پاراوی سوریا دەخۆنەوە و بەئاوی"سینا"ڕانەهاتون.

من ئەم بابەتە پزیشکیەم بەهۆی گەشت کردنم بەبیابانی"سینا"دا فێری بوم و دەزانم هەرکەسێك بچێتە ناو بیابانی سیناوە و ئاوی ئاڵودە بە"کلس"بخواتەوە یەکسەر توشی ڕەوانی دەبێت."شوباتو"زۆر سەری لەم گوتەیەی من سوڕما و وتی: "سینۆهە"تۆ بەچ شێوەیەك پەیت بەم بابەتە برد؟

وتم: من لەچاوەکانتەوە هەستم بەوەکرد کە کەمێك ئازار لەورگتدا هەیە؟

لەکاتێکدا وانەبوو و چاوەکانی"شوباتو"ئەوی بەکەسێکی نەخۆش پیشان نەدەدا و شازادەی"هاتی"ش وتی: بەڵام هیچ یەك لەپزیشکەکانم نەیانتوانی پەی بەم بابەتە ببەن و هەر بەوشێوەی تۆ باستکرد من لەورگمدا هەست بەهەندێك ئازار دەکەم و هەر ئەمڕۆ چەند جارێك بۆئەوەی خۆم لەپاشەڕۆکانم خاڵی بکەمەوە لەبیاباندا دانیشتم.

دوای ئەم قسەیە شازادەی"هاتی"دەستی خستە سەر نێوچەوانی خۆی و وتی: هەست دەکەم کە نێوچەوانم گەرمە و چاوەکانیشم قورس بون و هەست بەناڕەحتی دەکەم.

وتم: "شوباتو"بەپزیشکەکەی خۆت بڵێ کە دەرمانێکت بۆ ئامادە بکات، بۆئەوەی لەڕێی ئەو دەرمانەوە ئەم سکئێشەیەت لەناو ببات و ئەمشەو بتوانی بەئاسودەیی بخەویت، چونکە نەخۆشی ڕەوانی بیابانی"سینا"زۆر هەڕەشەئامێزە و من خۆم پزیشکم و بەچاوی خۆم بینیومە کە کۆمەڵێك لەسەربازە میسریەکان بەهۆی هەمان ئەو نەخۆشیەوە لەهەمان ئەم بیابانەدا مردون و هێشتا هیچ کەسێك ئاگاداری هۆکاری ئەم نەخۆشیە نیە، بۆیە هەندێکیان دەڵێت کە ئەم نەخۆشیە لە "با"سوتێنەرەکانی بیبانەوە سەرچاوە دەگرێت، چونکە هەندێك لەم"با"یانە ژەهراوین و هەندێکی تر لەوباوەڕەدان ئەو"کوللانەی" کە لەبیاباندا دەفڕن، ئەم جۆرە نەخۆشیە دروست دەکەن و هەندێکی تریش سەرچاوەی ئەم نەخۆشیە بۆ ئاوی ئەم بیابانە دەگەڕێننەوە، بەڵام لەبەرئەوەی خاوەنی پزیشکگەلێکی باشیت، دەتوانیت پێیان بڵێیت هەوڵی چارەسەکردنت بدەن، من دڵنیام کە ئەمشەو بەئاسودەیی دەخەویت و سبەینێش ڕێگای میسر دەگریتە بەر.

کاتێك شازادەی"هاتی"گوێی لەم قسەیەی من بوو ڕۆچووە بیر و هزری خۆیەوە و تەماشایەکی ئەفسەرەکانی خۆی کرد، بەڵام هیچی نەوت، تێگەشتم کە ئەو بەزمانی دەرونی پێم دەڵێت"سینۆهە"لەبەرئەوەی تۆ بەباشی ئەم نەخۆشیە دەناسیت، بۆیە خۆشت دەرمانەکەی ئامادە بکە و دەرخواردم بدە.

من سەرەڕای ئەوەی دەمزانی کە ئەو دەیەوێت چیم پێ بڵێت، بەڵام بێدەنگ بوم و خۆم بەبێئاگا لەقەڵەم دا، تائەوکاتەی "شوباتو"وتی: "سنیۆهە"بۆچی خۆت ئەم دەرمانەم پێنادەیت کە دەبێتە هۆی چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشیە؟

منیش دەستەکانم بەفیزێکەوە بەواتای نەخێر ڕاتەکاندو بەدەنگێکی بەرز بۆئەوەی هەموویان گوێیان لیٚ بێت وتم: من هەرگیز ئەم کارە ناکەم، چونکە ئەگەر من دەرمانێکت پێبدەم و باری تەندروستی تۆ خراپتر ببێت، پزیشك و ئەفسەرەکانت تاوانبارم دەکەن و دەڵێن: کە من بەئەنقەسەت ئەو دەرمانەم دەرخواردی تۆ داوە بۆئەوەی باری تەندروستیت خراپتر ببێت، هەر لەبەرئەوەش باشتر وایە پزیشکەکانی خۆت هەولی چارەسەرکردنت بدەن و ئەو دەرمانەی بۆت ئامادە دەکەن دەرخواردت بدەن.

شازادەش زەردەخەنەیەکی کردو وتی: "سینۆهە"ئەو ئامۆژگاریەی تۆ زۆر بەسودەو لەگوێت دەکەم و هەرلەبەرئەوەش من پزیشکی تایبەتی خۆم بانگ دەکەم، بۆئەوەی پێی بڵێم کە دەرمانێکم پێبدات کە ئەم سك ئێشەیەم نەهێڵێت، لەبەرئەوەی دەمەوێت نان لەگەڵ تۆدا بخۆم‌و باسی سەرگوزەشتی شازادە خانم"باکتامون"لەدەمی تۆوە ببیستم و ناچارنەبم سات لەدوای سات لەچادرەکەم بڕۆمە دەرەوە و لەناو بیاباندا دانیشم.

ئەوکات شازادە"شوباتو"پزیشکی تایبەتی خۆی بانگکرد و من بینیم پیاوێکی کوڕ و بەدگومانە بەڵام دوای ئەوەی زانی کە نامەوێت ڕکابەری بکەم، ڕوخساری مۆنی کرایەوە و زەردەخەنەیەکی کرد و بەپێی فەرمانی شازادە دەرمانێکی"قەبزی"بۆ ئامادە کرد و دوای ئەوەی تامی دەرمانەکەی کرد دای بەشازادە بۆئەوەی بیخواتەوە.

من زۆر ڕازی بووم لەو پزیشکەی کە دەرمانی"قەبزی"دەرخواردی شازادە دا، چونکە دەمزانی ئەگەر شازادە دوچاری"قەبزی" ببێت، ئەوا ئەو زەهرەی کە من دەمەوێت دەرخواردی بدەم زۆر باشتر کاری تێدەکات.

لەکاتێکدا ئەگەر ڕەوانیەکەی بەردەوام بێت لەوانەیە زۆر زوو ئەو زەهرە لەجەستەی بێتە دەرەوەو هیچ کارێکی تێنەکات و نەبێتە هۆی مردنی.

پێش ئەوەی دەست بەو خواردنەی کە شازادە بەخۆشی منەوە ئامادەی کردبوو بکەین، من گەڕامەوە بۆ چادرەکەی خۆم و گۆزەیەك ڕۆنی زەیتونم خوارد، چونکە دەمزانی کەسێك کە بڕێك ڕۆنی زەیوتن بخواتەوە، لەدواییدا دەتوانێت ژەهریش بخوات بێئەوەی ئەو ژەهرە کاری تێبکات و بیکوژێت. ئەوکات کەمێك ژەهرم ئاوێتەی شەرابەکە کردو ئەو شەرابەشم ڕشتە گۆزەیەکی بچوکەوە و زۆر جوانیش لێی

وردبومەوە کە لەدوو پێك زیاتر نەبێت، دوای ئەوە سەری گۆزەکەم بەست و خستمە گیرفانمەوە و بۆ نان خواردن گەڕامەوە بۆ چادرەکەی شازادە"شوباتو".

لەکاتی نانخواردندا دەستم بەباسکردنی شازادە خانم"باکتامون"کردو کەمێکیش باسی نەریتی ئیشقبازی میسریەکانم بۆ کرد و شازادەش قا قا بەقسەکانم پێدەکەنی و هەندێ کاتیش چەپۆکێکی بەپشتمدا دەکێشا.

تائەوکاتەی وتی: "سینۆهە"سەرەڕای ئەوەی کەسێکی میسریت، بەڵام هاونشینێکی سەیر و خۆش و باشیت، دوای ئەوەی بومە هاوسەری"باکتامون"و پادشای میسر تۆ دەکەم بەپزیشکی تایبەتی خۆم.

پێش ئەوەی تۆ قسە بکەیت، ئازاری سك ئێشە زۆر نیگەرانی کردبوم، بەڵام ئێستا ئەو سك ئێشەیەم بەتەواوەتی فەرامۆش کردووە و تۆ باسی نەریتی ئیشقبازی میسریەکانت بۆ کردم بەڵام ئاگاداری نەریتی ئیشقازی"هاتی"ەکان نیت و کاتێك دەڕۆمە ناو وڵاتەکەی ئێوەوە بەئەفسەرو سەربازەکانم دەڵێم کە نەریتی وڵاتی"هاتی" فێری میسریەکان بکەن، بۆئەوەی بزانن کە بەپێی نەریتەکانی ئێمە باشتر دەتوانن چێژ لەژیان وەرگرن.

ئەفسەرانی شازادە کە وەك ئێمە نانیان دەخوارد و وەك شازادەکەیان شەرابیان دەخواردەوە، ئەو گوتەیەی شازادەکەیان زۆر خۆشحاڵی کردن و هەمان گوتەی شازادەیان بەدەم قاقای پێکەنینەوە دوبارە کردەوە.

شازادە"شوباتو"شەرابی خواردەوە و دەرخواردی ئەوانی تریشی دا و وتی: "سینۆهە" کاتێك شازادە خانم"باکتامون" دەبێتە هاوسەری من، وڵاتی"هاتی"و وڵاتی میسر دەبێت بەیەك وڵات، ئەوکات هیچ پادشایەك ناتوانێت لەبەرامبەر ئێمەدا خۆیَ ڕاگرێت،چونکە ئێمە دەبینە بەهێزترین وڵاتی جیهان. بەڵام پێش ئەوەی ئێمە ببینە بەهێزترین وڵاتی جیهان، من دەبێت دڵی میسریەکانیش بگۆڕم بەئاگر و ئاسن، بۆئەوەی ئەوانیش وەك ئێمە دلێر و بێبەزەیی بن و بزانن کە نابێت لەمەرگ بترسن.

"شوباتو"دوای ئەم قسانەی پێکێك شەرابی پێشکەشی ئاسمان و پێکێك شەرابی پێشکەشی زەوی کرد و ڕوی لەمن کرد و لێی پرسیم: "سینۆهە"تۆ بۆچی شەراب ناخۆیتەوە؟

وتم: ئەی کوڕی پادشای"هاتی"نامەوێت سوکایەتیت پێ بکەم و بتڕەنجێنم، بەڵام دەزانم کە تۆ هێشتا شەرابی ڕەزی"قوچەکیەکانی"میسرت نەخواردووەتەوە، ئەگەر ئەو شەرابە بخۆیتەوە، ئەوا شەرابەکانی تر لەدەمتدا تامی ئاو دەدەن و هەر لەبەرئەوەش من ناتوانم شەرابی تۆ بخۆمەوە، چونکە تەنها شەرابی میسریم خواردووەتەوەو خووم بەو شەرابەوە گرتووەو هەمیشە بڕێك لەو شەرابە لەگەڵ خۆمدا هەڵدەگرم بۆئەوە بیخۆمەوە، بەڵام وام لێکدایەوە کە ئەگەر ئەو شەرابە میسریە لەگیرفانم دەربهێنم و بیخۆمەوە تۆ لێم توڕە دەبیت.

"شوباتو"وتی: من لێت ناڕەنجێم، دوای ئەوەی تۆ ئەو قسەیەت کرد، حەزدەکەم بزانم تامی شەرابی ڕەزە دەیمی"قوچەکیەکان"چۆنە؟

منیش گۆزە بچوکەکەم لەگیرفانمدا دەرهێنا و ڕاموەشاند بۆئەوەی خڵتەی شەراب کە دەنیشێت دوبارە ئاوێتە تەواوی شەرابەکە ببێتەوە، هەر بەوشێوەیەی کە"شوباتو"و دەوروبەرەکەی لێکیان دایەوە کە من دەمویست خڵتەی شەرابەکە دوبارە ئاوێتەی شەرابەکە بکەمەوە، بۆیە ئەوانیش هەمان کاریان ئەنجام دا.

دوای ئەوەی گۆزە شەرابەکەم ڕاوەشاند وتم: ئەمە شەرابی ڕاستەقینەی ڕەزی "قوچەکیەکانی" میسرە و لەخودی میسردا بەبەهای زێر دەیفرۆشن چ بگات بەوەی بەوڵاتە بیانیەکانی بفرۆشن، لەهیچ وڵاتێکی ئەم جیهانەدا لەم شەرابە باشتر دەست ناکەوێتو لەبەرئەوەی عەترم کردبووە ناو ئەو شەرابەوە بۆنی خۆشی بەناو چادرەکەدا بڵاو بویەوەو هەموو ئەو گوتانەی لەبارەی باشی ئەم شەرابە کردم هەمووی ڕاست بوون، بەڕاستیش شەرابێکی باش بوو، دوای ئەوە کەمێکم ڕشتە ناو پێکەکەی خۆمەوە و هەمویم هەڵقوڕی.

دوای ئەوە خۆم وەك کەسێك پیشان دا کە یەکسەر سەرخۆش بوم و"شوباتو"ش کاتێك بینی من بەیەك پێك سەرخۆش بوم، پێکەکەی خۆی بەرەوڕوم درێژکرد و وتی: کەمێك لەوشەرابەم بۆ تێکە، بزانم تامی چۆنە و گەرمیەکەی بەچ شێوەیەکە.

بەڕوکەش واخۆم نیشان دا کە نامەوێت بەشی بدەم و وتم: "شوباتو"من شەرابی خۆم نادەم بەهیچ کەسێك، بەڵام نەك لەبەرئەوەی کەسێکی ڕەزیلم، بەڵکو ناتوانم شەرابێکی تر بخۆمەوە، جگەلەوەش هیچ شەرابێکی میسری تر شك نابەم، لەبەرئەوە نامەوێت بەشت بدەم و دەمەوێت ئەمشەو خۆم بەم شەرابە مەست بکەم، چونکە

ئەمشەو یەکێکە لەشەوە مەزنەکان، لەمشەوەدا میسر و"هاتی"بۆهەمیشە یەکدەگرن و یەك ولات پێك دەهێنن.

ئەوکات کەمێکی تر شەرابم بۆخۆم تێکرد و کاتێك پێکەکەم بۆ لێوم برد دەستم لەترساندا دەلەرزی، بەلام ئەوانەی لەو دانیشتنەدا ئامادە بون، لەرزینی دەستمیان دەگەڕاندەوە بۆ سەرخۆشیەکەم و پێم پێدەکەنین، بۆئەوەی زیاتر بەهەڵەدا بیانبەم، خۆم بەکەسێکی سەرخۆش پیشانداو وەك ولاخ دەنگم بەرز دەکردەوە و ئامادەبوانیش بەشێوەیەك پێدەکەنین کە لەزەویدا لول دەبون.

سەرەڕای ئەوەی"شوباتو"دەیبینی کە من مەست بوم و نابێت داوای شەراب لەکەسێك بکەیت کە نایەوێت لەشەرابی خۆی بەشی هیچ کەسێك بدات، بۆیە پێداگری کرد، چونکە ئەو لەوجۆرە کەسانە نەبوو کە کاتێك خوازیاری شتێك بێت کەسانی تر بتوانن بەشی نەدەن و داواکەی ڕت بکەنەوە. من لەبەرامبەر پێداگریەکەی ئەودا وەك کەسێك کە جگە لەملکەچ بون هیچ ڕێگەچارەیەکی تری لەبەردەستدا نیە، ئەگینا لەوانەیە گیانی لەژێر هەڕەشەی مەرگدا بێت، بۆیە خۆم دا بەدەستەوە و لێوانە شەرابەکەیم پڕکرد.

"شوباتو"کەمێك بۆنی شەرابەکەی کرد و تەماشایەکی چواردەوری کرد، وەك بڵێی پرسیاری لەوانی تر دەکرد کە ئایا من ئەم شەرابە بخۆمەوە یان نە؟ منیش تێدەگەشتم کە"شوباتو"لەدواین ساتەکاندا ترسێکی لیّ نیشتووە، بەلام ناوێرێت پێشمەرگە[49] کەی خۆی بانگ بکات بۆئەوەی کەمێك لەو شەرابە بخواتەوە، بۆئەوەی لەڕێی پێشمەرگەکەیەوە بزانێت ئایا ئەو شەرابە ئالودەی مادەکانی ترە یان نە؟

ئەو لەوە دەترسا پێشمەرگەکەی خۆی بانگ بکات و من لێی دلگران ببم، هەروەها بیری لەوەش دەکردەوە کە هێشتا پێویستی بەمنە، چونکە لەوانەیە لەبارەی منەوە هەواڵێکی خراپی بگەیەنم بە شازادە خانم"باکتامون" و ئەو لەم پێکهێنانی ژیانی هاوسەریەتیە بێبەش بکەم.

---

[49] لێرەدا مەبەست لە"پێشمەرگ" ئەوکەسەیە کە پێش پادشا یان فەرماندەکەی لەو خواردنانە دەخوات کە بۆ ئەو دانراوە بۆئەوەی بزانێت ئایا ئالودەی مادە ژەهراویەکانە یان نە؟ و دوای ئەو دەست بەخواردنی بکات.......وەرگێڕ

ئەوەبوو پێکە پڕەکەی خۆیی بۆ ڕادام و وتی: "سینۆهە"لەبەرئەوەی تۆ هاوڕێی منی و حەزدەکەم لەوە زیاتریش هاوڕێیەتیەکەمان قوڵ ببێتەوە، ڕێت پێدەدەم کە لەپێکەکەم بخۆیتەوە.

منیش بەخۆشیەکی ساختەوە پێکەکەیم لێ وەرگرت و قومێکم لێ خواردەوە، دوای ئەوە لێی وەرگرتمەوە و بۆ لێوی برد و لەبەرئەوەی ئەو شەرابە بۆنێکی خۆشی هەبوو هەمووی هەڵقوڕی و دوای ئەوەی پێکە خاڵیەکەی خستە سەرزەوی وتی: "سینۆهە"ئەم شەرابەی تۆ زۆر خۆش و بەهێزە و نەشئەکەشی کار لەسەر دەکات، بەڵام دوای خواردنەوەی تامی دەم تاڵ دەکات، بۆیە هەر ئێستا تاڵی دەمم بە خواردنەوەی شەرابی خۆمانە لەناو دەبەم.

ئەوکات پێکەکەی لەشەرابی خۆیان پڕکرد و خواردیەوە و دەمزانی کە ئەو ژەهرەی دەرخواردم داوە تابەیانی نابێتە هۆی مەرگی، چونکە سەرەڕای ئەوەی "شوباتو" نانێکی زۆری خواردووە، پزیشکی شازادە دەرمانی"قەبزی" دەرخواردی کوڕی پادشای"هاتی" داوە و کاتێك دوچاری قەبزی دەبێت ژەهرەکە کەمێك درەنگتر کاری تێدەکات.

منیش کەمێك لەشەرابی سوریام ڕشتە ناو پێکەکەمەوە و خواردمەوە، بەڵام نەك بۆئەوەی شەراب بخۆمەوە و خۆم مەست بکەم، بەڵکو بۆئەوەی پێکەکەم پاك ببێتەوە و پاشماوەی ژەهری تێدا نەمێنێت و دوای ئەوەی لەویَ ڕۆشتم ئەگەر پزیشکێك پشکنینی لەسەر بکات ناتوانێت پاشماوەی ژەهری تێدا بدۆزێتەوە.

دوای ئەوەی بۆماوەیەکی تر خۆم سەرخۆش نیشان دا، وا خۆم نیشان دا کە توانای دانیشتنم نیەو دەبێت بڕۆم بخەوم، ئەفسەرانی"هاتی"لەکاتی ڕۆشتنم بۆ چادرەکەی خۆم دەستیان گرتم و گەیاندمیانە چادرەکەی خۆمەوە، بەڵام ئەوگۆزە بچوکەی کەشەرابە میسریەکەی تێدا بوو لەگەڵ خۆمدا بردمەوە بۆئەوەی لەچادرەکەی "شوباتو"دا نەمێنێتەوە.

ئەفسەرانی"هاتی"بەگاڵتەپێکردنێکی نەشیاوەوە لەجێگەکەمدا خەواندمیان و ڕۆشتن بۆئەوەی خۆشیان بخەون. کاتێك هەستم کرد کە هەمویان خەوتون هەستام و پەنجەم لەقوڕگمدا ڕادا و ئەوەی خواردبوم هەموویم ڕشاندەوە و دوای ئەوەش گۆزەی شەرابە میسریەکەم شکاند و پارچەکانیم لەژێر خۆڵی بیاباندا شاردەوە.

سەرەڕای ئەوەش ئارەقێکی ساردم کرد، لەبەرئەوەی لەوە دەترسام کە ژەهراوی بوبێتم، تەنها بۆ خۆپارێزیەکی زیاتر دەرمانی ڕشاندنەوەم خواردەوە و دوبارە ڕشامەوە، بۆئەوەی ئەوەی لەناو گەدەمدایە هەڵیهێنجێنمەوە، چونکە سەرەڕای ئەوەی ڕۆنی زەیتونی زۆرم خواردبوو زۆر لەوە دەترسام ژەهراوی بوبێتم.

ئەوکات خۆم بۆ خەوتن ئامادە کرد، بەڵام لەترساندا خەوم لێ نەدەکەوت و بێ لەو ترسەی کە هەمبوو، وێنەی بەژن و باڵای"شوباتو"کە لاوێکی زۆر جوان بوو و چاوێکی درەوشاوە و ددانێکی سپی هەبوو لەبەرچاوم ون نەدەبوو.

کاتێك سپێدەی بەرەبەیان هەڵهات، من دەمزانی کە حاڵی شازادە"شوباتو"باش نیە، بەڵام ئەو وەك تەواوی دانیشتوانی"هاتی"لەخۆبایی بوو و وا خۆی نیشان دەدا کە دەتوانێت بەردەوامی بەم گەشتەی بدات، بۆیە سواری کەژاوەکەی بوو، بەڵام ئاگاداری ئەوەبووم کە پزیشکەکەی دووجار دەرمانی قەبزی دەرخوارد دا و ئەم دەرمانە حاڵی"شوباتو"ی خراپ تر کرد، ئەگەر پزیشکە تایبەتەکەی دەرمانێکی ڕەوانی بەهێزی بەو کوڕە لاوە بدایە لەوانەبوو"شوباتو"لەمەرگ ڕزگاری ببوایە، بەڵام لەبەرئەوەی زیاتر دوچاری قەبزی بوو بوو تەواوی ئەو ژەهرە لەجەستەیدا مایەوە و شەو کاتێك گەشتینە مەنزڵگەیەك بۆئەوەی کەمێك بحەوێینەوە"شوباتو"تادەهات حاڵی خراپتر دەبوو و چاوەکانی بەتەواوی کز بون وێنەی مەرگ لەجەستەیدا بەدی دەکرا.

پزیشکە تایبەتەکەی بانگی کردم و منیش کاتێك چاوم بەو لاوە کەوت کە خۆم ڕەوانەی مەرگم کردبوو لەرز گرتمی، پزیشکەکەشی ئەم لەرزەی وەك کاریگەری و خەمێك لێکدایەوە و لێی پرسیم: "سینۆهە"بۆچونی تۆ لەبارەی ئەم نەخۆشیە چیە؟

وتم: ئەوە هەمان ئەو نەخۆشی بیابانەیەیە کە دوێنێ شەو لەم شازادەیەدا دەستنیشانم کرد و ئەویش بەتۆی وت کە چارەسەری بکەیت.

کابرای پزیشکیش لێی پرسیم: دەرمانی ئەم نەخۆشیە چیە؟

وتم: بەبۆچونی من لەم قۆناخە نەخۆشیەیدا بریتیە لەدەرمانی هێورکەرەوە کە ئازار، بەتایبەت سکئێشە و ئازاری ڕیخۆڵەکانی لەناو دەبات و بۆ هێورکردنەوەی ئازاری ڕیخۆڵەکانی دەبێت بەردی گەرم بخەیتە سەر ورگی، بەڵام من هیچ جۆرە دەرمانێکم بەشازادە"شوباتو"نەداوە، بەڵکو هێڵام پزیشکە تایبەتەکەی دەرمانێکی بۆ

ئامادە بکات و خودی ئەویش دەرمانەکان بکات بەدەمیەوە و هەمان ئەو پزیشکەش بەچەقۆیەك دەمی لاوی دەکردەوە و دەرمانەکەی ڕژاندە دەمیەوە.

من دەمزانی کە دەرمانی هێورکەرەوە و دانانی بەردی گەرم بەسەر ورگیەوە، ناتوانێت ڕێ لەمەرگی بگرێت، بەڵام کەمێك لەئازارەکانی کەم دەکاتەوە و لەدواین کاتژمێرەکاندا کەمێك بەئاسودەییەوە دەژیت و بەئاسودەییش دەمرێت.

شازادە"شوباتو"بەهۆی کاریگەری ئەو ژەهرەوە دوچاری ڕوانیەکی توند بوو و پزیشکە تایبەتەکەشی سەری سوڕمابوو کە بۆچی دوای ئەو هەموو درمانی قەبزیەی کە پێی دابوو دوچاری ڕەوانی بووە.

ئەم حاڵەتی ڕەوانیە پزیشکی هێنایە ئەو باوەڕەی کە"شوباتو"دوچاری هەمان نەخۆشی بیابان بووە کە نیشانەکانی ئەم ڕوانیەیە هەروەها ئاگاداری ئەوە بووم کە هیچ کەسێکیان گومانیان لەمن نەبوو و دەمتوانی شانازی بەو ئازاییەی خۆمەوە بکەم، بەڵام لەناخەوە شەرمەزار بوم، چونکە پزیشك بۆئەوە هاتووەتە بون کە کەسی نەخۆش چارەسەر بکات و بیگەڕێنێتەوە بۆ ژیان، نەك لاوێکی جوان و تەندروست و بەهێز ڕوانەی جیهانێکی تر بکات، ئەم جۆرە کارانە دڕەندەترین سەربازانی "هاتی" دەتوانن بەنێزە و چەقۆ و شمشێرەکانیان ئەنجامی بدەن.

تابەیانی ڕۆژی دوایی شازادە"شوباتو"زیندو بوو و من بێئەوەی بەشەداری لەچارەسەر کردنیدا بکەم هەوڵم دەدا لەڕێی کابرای پزیشکی"هاتی"ەوە کە بێجگە لەنەخۆشی وڵاتەکەی خۆی شارەزای نەخۆشی وڵاتانی تر نیە و هەندێکات ئەرکەکانی گەدەو ڕۆیخۆڵە و گورچیلە و جگەری تێکەڵی یەکتر دەکرد، هەوڵم دەدا کەمێك لەئازارەکانی کەم بکەمەوە.

نابێت سەرم لەنەشارەزایی پزیشکانی"هاتی"و وڵاتانی تر سوڕ بمێنێت، چونکە خوێندنی بواری پزیشکی ئەوان زیاتر تیۆریە، نەك کرداری، لەنێو وڵاتانی جیهاندا تەنها میسرە کە هەزاران ساڵ لەوەوپێش زانستی پزیشکی بەشێوەیەکی کرداری بەخوێندکاران وتووەتەوە و کرێکارێکی مۆمیاکردنی"ماڵی مردووەکان" لەمیسردا، دە ئەوەندەی پزیشکەکانی"هاتی"شارەزای ئەرکە ئەندامیەکانی جەستەی مرۆڤە، لەبەرئەوەی هەموو ڕۆژێك ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ دەبینێت و پەی بەکەم و کورتی ئەندامەکانیش دەبات و لێهاتوویی مۆمیاگەرانی میسر بەڕادەیەك زۆرە کە هەرئەوەی

ورگی مردوویەکیان هەڵدڕی یەکسەر دەزانن ئەو مردووە بەچ نەخۆشیەك کۆچی دوایی کردووە.

پزیشکە سەرەتاییەکانی میسر کە لەقوتابخانەی"ماڵی ژیان"خوێندویانە لەمۆمیاگەرەکەکان زیاتر شارەزای ئەرکە هەناویەکان و هێمای نەخۆشی مرۆڤ بون و من لەوباوەڕەدام کە هێچ وڵاتێك ناتوانێت لەبواری پزیشکیدا ڕکابەری پزیشکە میسریەکان بکات و لەئایندەشدا ئەگەر نەتەوە بێگانەکان بیانەوێت پەیی بەهێماکانی ئەم زانستە ببەن، ئەوا سەرەتا دەبێت لەمیسریەکانەوە فێر بن.

کاتێك خۆر هەڵهات شازادە"شوباتو"بەهۆی نزیك بونەوەی مەرگیەوە هەست و هۆشی خۆی بۆ گەڕایەوە، چونکە کاتێك مەرگ نزیك دەبێتەوە و کەسەکە دەیەوێت ماڵئاوایی لەژیان بکات چیتر هەست بەهیچ ئازارێك ناکات، لەبەرئەوەی ئازار و ڕەنجەکانی ژیان لەناو دەچێت بۆیە هەست و هۆشی بۆ دەگەڕێتەوە."شوباتو"ش کاتێك هۆشی هاتەوە بەخۆیدا ئەفسەرەکانی بانگ کرد و پێی وتن: هیچ کەسێك لەمەرگی من بەرپرسیار نیە، بەڵکو من بەهۆی نەخۆشی بیابانەوە دەمرم، سەرەڕای ئەوەی مەزنترین پزیشکی"هاتی"هەوڵی چارەسەرکردنم دەکات و"سینۆهە"ی پزیشکی فەرمانڕوایانی میسر هاوکاری دەکات، بەڵام چاك نەبومەتەوە، چونکە ئاسمان و زەمین بڕیاری مەرگی منیان داوە و دەبێت بمرم، یان بیابانی میسر کە بەشێکە لەناوچەی خودایانی میسر بڕیاری مەرگی منیان داوە.

لەزمانی منەوە بەباوکم بڵێن وئێوەش بزانن کە چیتر لەمەودوا سەربازەکانی هاتی نابێت پێ بنێنە ئەم بیابانەوە، چونکە ئەم بیابانە دەبێتە هۆی لەناوبردنی ئێمە و مەرگی من بەڵگەی حاشاهەڵنەگری ئەم بابەتەیە و هەموشتان دەزانن کە ئێمە لەهەمان ئەم بیابانەدا بۆیەکەمین جار دوچاری شکست هاتین و گالیسکەکانی"هاتی" کە بەبەردەوامی لەهەموو شەڕێکدا سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، لەهەمان ئەم بیابانەدا لەناو چوون.

دوای مەرگی من دیاریەکی باش بدەن بەم دوو پزیشکە و تۆش سینۆهە دوای گەڕانەوەت بۆ میسر، سڵاوی من بەشازادە خانم"باکتامون"بگەیەنە و پێی بڵێ کە ئەو لەو بەڵێنەی کە بەمنی دابوو لێی دەبورم و بەداخی ئەوەم کە تەمەنم بۆ ڕێگای پێنەدام کە بتوانم ئەو بەوشێوەیەی کە خۆی حەزی لێ بوو و منیش حەزم لێی بوو بیکەم

بەشازادە خانمێکی"هاتی". هەروەها پێشی بڵێ لەئێستاشدا کە دەمرم بیر لەو دەکەمەوە و بەخیاڵی ئەوەوە دەڕۆم بۆ جیهانەکەی تر.

لەهەمان ئەوکاتەی کە شازادەی"هاتی"زەردەخەنەیەك بەلێوە بوو، ماڵئاوایی لەژیان کردو منیش سەرم لەو زەردەخەنەیەی سوڕ نەما، چونکە هەندێك کەس لەکاتی لەمەرگدا، ئەوکاتەی لەئازارە جەستەییەکان ڕزگاریان دەبێت، لەبەرئەوەی هەست بەئاسودەییەکی زۆر دەکەن و دیمەنگەلێکی جوان دەهێننەوە بەرچاوی خۆیان، زەردەخەنەیەك دەکەن.

ئەفسەرانی"هاتی"جەستەی شازادە"شوباتو"یان خستە ناو تەشتێکی گڵینی گەورەوە و تەشتەکەشیان پڕکرد لەهەنگوین و شەراب دوای ئەوە سەری تەشتەکەیان بەست، بۆئەوەی لاشەکەی ببەنەوە بۆ وڵاتی خۆی و لەسەر ترۆپکی کێوێك لەتەنیشت لاشەی ئەو فەرمانڕەوا و شازادانەی کە پێش ئەو مردون بنێژن.

ئەفسەرانی"هاتی"لەوەیکە دەیانبینی من دەگریم و بۆ مەرگی شازادە زۆر بەداخم، سۆزیان بەلای مندا بزوا و لەتەختەقوڕێکی خۆشەکراودا نوسیبویان: بەهیچ شێوەیەك من بەرپرسیاری مەرگی شازادە"شوباتو"نیم، بەڵکو ئەو بەهۆی نەخۆشی ڕوانی بیابانی"سینا"وە کۆچی دوایی کردووە، هەروەها ئەوەشیان نوسیبوو کە من لەگەڵ پزیشکی"هاتی"دا هەموو توانایەکی خۆمم خستە گەڕ بۆئەوەی بتوانم چارەسەری نەخۆشی شازادە بکەم، بەڵام نەمتوانی.

ئەوان ئەو تەختەقوڕە نوسراوەی کە مۆری شازادەی کۆچکردووی پێوەبوو، مۆری خۆشیان لێدا، چونکە وایان دەزانی کە میسریش وەك وڵاتی"هاتی"وایە، ئەگەر من هەواڵی مەرگی شازادە ببەمەوە بۆ شازادە خانم"باکتامون"دەمکوژێت و واهەست دەکات کە من دەستگیرانەکەیم کوشتبێت.

کاتێك ویستم بگەڕێمەوە بۆ میسر، بەپێی ڕاسپاردەکەی"شوباتو"دیاریەکیان پێدام، دوای ئەوەی ڕێگای میسرم گرتە بەر.

من هیچ گومانێکم لەوەدا نەبوو کە بەکوشتنی ئەو شازادەیە خزمەتێکی زۆر مەزنم بەمیسر گەیاندووەو نیشتمانی ڕەشم لەهەڕەشەی لەناوچون بەدەستی فەرمانڕەوایانی "هاتی"ڕزگار کرد، بەڵام خۆم شانازیم بەم کارەی خۆمەوە نەدەکرد.

کاتێك گەڕامەوە بۆ میسر، ئەوەم هێنایەوە یاد خۆم کە من سەرەڕای ئەوەی پزیشکم، لەو ڕۆژەوەی خۆمم ناسیوە، بونی من بووەتە هۆی مایەی بەدبەختی ئەو کەسانەی کە خۆشم ویستون. من زڕدایك و زڕباوکی خۆمم خۆشدەویست، بەڵام ئەوان بەهۆی کارە هەڵەشەییەکانی منەوە مردن، دوای ئەوە بە"مینا"ەوە پەیوەست بوم و ئەو کچە جوانەش بەهۆی لاوازی دەرونی منەوە لەماڵی خودای"کریت"دا بەکوشت درا. ئەوکات بە"مریت" و "تهوت"، ئەمانیشم بەهۆی لاوازیو دودڵی منەوە بەکوشت دران.

"ئەخناتون"ی فیرعەونی میسریش سەرەڕای ئەوەی چاکەیەکی زۆری لەگەڵ مندا کردبوو بەدەستی خۆم ژەهرەم دەرخوارد دا و مرد، چونکە من وام دەزانی بەکوشتنی ئەو خزمەتێکی مەزن بەمیسر دەکەم، دواین کەسێك کە من پێش مەرگی پێیەوە پەیوست بوم"شوباتو"بوو، ئەویش بەدەستی من ڕێگای جیهانێکی تری گرتەبەر. وەك بڵێی بونی من هەر لەسەرەتاوە نەفرەت ئامێز بووە و بەهۆی ئەم نەفرەتەوە، هەرکەسێکم خۆش بویستایە دەبوو لەناو بچێت.

دوای ئەوە گەشتمە شاری"تانیس" و بەکەشتی ڕێگای"تبس"م گرتە بەر.

کەشتیەکەم لەبەرامبەر کۆشکی زێڕین"کۆشکی فەرمانڕەوایی"ڕاوەستا و منیش دوای ئەوە خۆم کرد بەناو کۆشکداو بە"ئامی"و"هورم هب"کە لەوێ بون پێم ڕاگەیاندن کە ئاواتەکەتان هاتەدیو شازادە"شوباتو"لەبیابانی"سینا"دا مرد و لاشەکەیان کردە ناو تەشتێکی پڕ لەهەنگوین و شەرابەوە و گەڕاندیانەوە بۆ وڵاتی "هاتی"و چیتر ئەو نایەت بۆ میسر و نابێتە مایەی سەرئێشەی ئەم وڵاتە.

هەردوکیان بەبیستنی ئەم هەواڵە دڵیان خۆش بوو و"ئامی"یش ملوانکەیەکی زێڕینی لەگەنجینەی کۆشکی فەرمانڕەواییدا دەرهێنا و کردیە ملم و"هورم هب"وتی: بڕۆو ئەم هەواڵە بەشازادەخانم"باکتامون" بگەیەنە، بۆئەوەی بزانێت کە دەستگیرانەکەی مردووە، چونکە ئەگەر ئێمە ئەو هەواڵەی پێ ڕاگەیەنین باوەڕمان پێناکات.

منیش ڕۆشتم بۆ لای شازادە خانم"باکتامون"و پێم وت: ئەی شازادە خانم، دەستگیرانەکەت، شازادە"شوباتو"کە دەیویست بێت بۆ میسر و ژیانی هاوسەری لەگەڵ تۆدا پێك بهێنێ، لەبیابانی"سینا"دا بەهۆی نەخۆشی ئەو بیابانەوە مرد، بەڵام

من و پزیشکەکەی تا ئەو شوێنەی لەتوانامان‌دا بوو هەوڵی خۆماندا بۆ ئەوەی ڕزگاری بکەین بەڵام بەداخەوە.

کاتێك شازادە خانم"باکتامون"کە لێوەکانی سور کردبوو گوێی لەم قسانە بوو، بازنەیەکی زێڕی لەمەچەکی دەرهێنا و پێیدام و بەگاڵتەجاڕیەوە وتی:

"سینۆهە"ئەم بازنە بەناونیشانی ئەو مژدەیەی بۆت هێنام پێتی دەدەم، بەڵام پێش ئەوەی تۆ بێیت و ئەم هەواڵەم پێبدەیت، من دەمزانی کە چ بەرنامەیەکیان بۆ داڕشتووم، چونکە بڕیاری ئەوەیان دابوو من بکەن بەخودای"سخ مت"خودای جەنگ و جلە سورەکەشیان ئامادە کردبوو، بەڵام لەبارەی نەخۆشیەکەی"شوباتو"وە...من سەرم لە نەخۆشی و مەرگی سوڕنامێنێت، چونکە ئاگاداری ئەوەم تۆ بۆ هەرکوێیەك بڕۆیت مەرگیش لەگەڵت دەڕوات بۆ ئەو شوێنە و"ئەخناتون"ی برای منیش بەهۆی ئەوەی تۆ چارەسەرت دەکرد ڕوانەی جیهانی خۆرئاوات کرد، لەبەرئەوەش پێت دەڵێم ئەی"سینۆهە"نەفرەتت لێ بێت و داوا لەخودایان دەکەم تاهەتایە تۆ بەنەفرەتکراوی بهێڵنەوە، داوای ئەوە داوا لەخودایانیش دەکەم کە نەفرەت لەگۆڕەکەشت بکەن و جەستە مۆمیاییەکەت لەناو بچێت و گومناو بیت، چونکە تۆ تەخت و تاجی فیرعەنەکانی میسرت کردە گاڵتەجاڕی کەسانێکی بێ سەروپێ و بویتە هۆی ئەوەی خوێنی پاکی فیرعەونە مەزنەکانی میسر کە لەخوێنبەرەکانی مندا دەخرۆشێت لەئاییندەدا ئاڵودەی پیسی ببێت....سینۆهە....ئەی پزیشکی خوێنخوار.... نەفرەتکراویت بەجاویدانی بمێنێتەوە.

منیش دەستەکانم خستە سەر ئەژنۆم و کڕنوشێکم بۆ برد و وتم: شازادە خانم، ئەوەی وتت، هەر وادەبێت.

کاتێك من لەکۆشکی زێڕین چومە دەرەوە، شازادە خانم فەرمانی دا لەدوای منەوە تا بەردەرگای کۆشك گسك بدەن لەو ڕێگایەی کە من پێیدا ڕۆشتوم، بۆئەوەی زەوی لەئاڵودەیی تێپەڕبونی من پاك ببێتەوە.

***

جەستەی فیرعەون"توت ئانخ ئامون"ئامادە کرابوو بۆئەوەی ببیەنە ئارامگاکەیەوەو "ئامی"ش فەرمانی دابوو بەکاهینەکان کەتەرمی فیرعەون بگوازنەوە بۆ ئارامگاکەی کە دەکەوێتە دۆڵی"فەرمانڕەوایان"ەوە.

بڕێکی زۆری ئەو شتانەی کە فیرعەون دەیوست لەگەڵ خۆیدا بی باتە ناو گۆڕەکەیەوە، لەلایەن"ئامی"ەوە زۆرێکی دزرا و هەرئەوەی دەرگای ئارامگاکەیان بەست"ئامی"کە بەرتیلێکی زۆری دابوو بەکاهینەکان، بڕیاری ئەوەی دا کە ببێتە فیرعەونی میسر.

"هورم هب"لەڕێی سەربازەکانیەوە چوار ڕیان و شەقامەکانی"تبس"ی گرت بۆئەوەی خەڵکی لەکاتێکدا کە"ئامی"بۆ لەسەرنانی تاج و پیرۆزکردنی بڕوات بۆ پەرستگا، ڕانەپەڕن و شۆڕش بەرپا نەکەن، بەڵام هیچ کەسێك دەنگی ناڕەزایی بەرز نەکردەوە، لەبەرئەوەی خەڵکی بەجەنگ و برسێیەتی وەڕەس بوبون و لەو وڵاخە دەچون کە باریان کردبێت و لەڕێگایەکی ناکۆتادا بەنەقیزە و لێدان ڕێی پێبکەن و ئەو گیانەوەرەش لەشەکەتیا توانای ئەوەی نیە بەرگری لەخۆی بکات و ناتوانێت جوتە لەخاوەنەکەی خۆی بدات.

ئەو ڕۆژەی"ئامی"دەڕۆشت بۆ پەرستگا، نانیان بەنێو خەڵکیدا دابەش دەکرد و لەبەرئەوەی خەڵکی هەژاریش برسیان بوو، ئەم نانە بەشێوەیەك کاری تێکردن کە کاتێك"ئامی"یان بینی بەرەو پەرستگا دەڕوات هەلهەلەیان بۆ لێدا، بەڵام خەڵکانی ڕۆشنبیرو هۆشیار دەیانزانی کە لەمیسردا"ئامی"فیرعەونێکی ڕوکەش‌و کاتی‌و بێدەستەڵاتەو دەستەڵاتی ڕاستەقینە لەدەستی "هورم هب"دایە و سەریان لەوە سوڕ دەما کە ئەو پیاوە بۆچی خۆی تاجی فەرمانڕەوایی میسر لەسەر ناکات. بەڵام"هورم هب" دەیزانی چیی دەکات، چونکە هێشتا کۆتایی بەقۆناخی بەدبەختی میسر نەهاتووە و میسریەکان دەبێت جارێکی تر بجەنگن‌و لەباشوردا لەگەڵ دانیشتوانی وڵاتی"کوش" نیشتمانی ڕەشپێستەکاندا بجەنگێن. سەرەڕای ئەوەش جەنگی سوریاش تەنها لەشێوەی ئاشتیەکی کاتیدا کۆتایی پێهاتووە، چونکە هێزی"هاتی" بەپێی ئەو پەیمانە ئاشتیەی کە بەستبویان، لەسوریادا چەند پەناگایەکی مەزن و بچوکیان هەبوو، کەسە زیرەك‌و داناکان دەیانزانی کە دوبارە لەوێ جەنگ بەرپا دەبێتەوە.

"هورم هب"پێشبینی ئەم بەدبەختیانەی بۆ خەڵکی میسر دەکرد و دەیویست ئەم ڕوداوە نەخواستراوانە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی"ئامی"دا ڕوبدەن، بۆئەوەی خەڵکی واهەست بکەن کە بەهۆی فەرمانڕەواییەکەی ئەوەوە دوچاری ئەم بەدبەختیانە بون. دوای ئەوەی جەنگ کۆتایی پێهات"هورم هب" بەناونیشانی سەرکردەیەکی

سەرکەوتوو ڕزگارکەر، وەك خودایەکی ئاشتی دەگەڕێتەوە بۆ میسر و ئەوە بەخەڵکی بگەیەنێت کە چیتر لەمەودوا کات کاتی خۆشی و خۆشگوزەرانیەکانی ئەوە و خودی ئەویش ببێتە فیرعەونی میسر.

"ئامی"ئاگاداری پلانەکانی"هورم هب"نەبوو، یان دەیزانی بەلام وای هەستی دەکرد"هورم هب"هەلی جێبەجێکردنی ئەم کارانەی نابێت.

دەستەلاتو دەوڵەمەندی"ئامی"مەست کردو هەوڵی دەدا سود لەتەمەن و فەرمانڕەواییەکەی وەرگرێت، بەلام ئەو بەڵێنەی کە لەکاتی مەرگی"ئەخناتون"دا دابوی بە"هورم هب" بەجێ هێنا و شازادە خانم"باکتامون"ی دا بەو.

بەپێی ئەو پلانەی کە"ئامی"کێشابوی و لەڕێی کاهینەکانەوە لەکاتی خۆیدا ئەنجامی دا، لەڕۆژی دیاریکراودا بڕیاربوو خودای"سخ مت"ڕوخساری شازادە خانم"باکتامون"لەپەرستگای هەمان ئەو خودایەدا "هورم هب"ی فەرماندەی هێزی جەنگی سوریا پیرۆز بکات. لەو ڕۆژەدا شازادە خانمیان بەجلێکی سور و بەگەوهەر ڕازاوەوە برد بۆ پەرستگا و"هورم هب"دوای ئەوەی لەبەردەم هەمان ئەو پەرستگایەدا خۆی لەبەردەم هەلهەلەی سەربازەکاندا بینی و زێڕ و زیوی پێبەخشین، خۆی کرد بەنێو پەرستگاکەدا.

ئەوکات هەموو کاهینەکان لەپەرستگا هاتنە دەرەوە و"هورم هب"و شازادە خانم لەناو پەرستگاکەدا بەتەنهایی بەجێی هێلا و دەرگای پەرستگایان داخست و"هورم هب" کە سەربازێك بوو و ساڵها چاوەڕێی ئەم جوت بونەی دەکرد، لەو شەوەدا سودی لەو هەلە وەرگرت.

لەکاتێك کە ئەو لەناو پەرستگادا سودی لەو هەلە وەردەگرت سەربازەکانی، لەشاری"تبس"دا هێرشیان برد بۆ مەیخانە و سۆزانیخانەکان و تابەیانی سەرقاڵی خواردنەوە بون و هەندێکیان بەهۆی دەمەقرە و کێشمەکێشەوە بریندارکرد و چەند ئاگرێکیان کردەوە و بۆ بەیانیەکەشی لەبەردەم پەرستگا"سخ مت"دا کۆبونەوە بۆئەوەی تەماشای هاتنە دەرەوەی"هورم هب"بکەن، کاتێکیش دەرگای پەرستگا لەو بەیانیەدا کرایەوە و"هورم هب"هاتە دەرەوە، سەربازەکانی بەخۆشی ئەوەوە دەستیان کرد بەهەلهەلە لێدان و بەبینینی ڕوخسار و سینە و دەست و پێی"هورم هب"سەریان سوڕما، چونکە سەرتاپای ئەو پیاوە خوێناوی بوو، دیار بوو کە خودای جەنگ شەوی ڕابردوو بەئارەزوی خۆی ڕەفتاری کردووە و بەدان و ناخون، سەروچاوی"هورم

هب"ی بریندار کردووە، بەڵام هیچ کەس لەو ڕۆژەدا لەپەرستگادا چاوی بەشازادە خانم نەکەوت، چونکە کاهینەکان بەنهێنی ئەویان لەپەرستگای"سخ مت"بردبووە دەرەوە و گەڕاندویانەتەوە بۆ کۆشکی زێڕین.

شەوی بوك و زاوایی هاوڕێ کۆنم"هورم هب"فەرماندەی لەشکری میسر بەوشێوەیە بوو کە بۆم باسکردن و من سەرم لەوە سوڕدەما کە ئەوپیاوە لەوشەوەدا بەچ شێوەیەکی توانیویەتی لەگەڵ ژنێکدا ڕابوێرێت کە بەوشێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا کردووە.

من ئەو هەلەم بۆ نەڕەخسا کە ئەو پرسیارەی لێ بکەم کە لەو شەوەدا بەچ شێوەیەك توانیویەتی بەرگەی لێدانی شازادە خانم بگرێت، چونکە زۆری نەخایاند کە"هورم هب"بۆئەوەی جەنگ لەگەڵ ڕەشپێستەکاندا بکات و دەستیان بەسەردا بگرێت و بیانخاتە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیەوە، لەگەڵ لەشکرەکەیدا ڕێگای باشوری میسری گرتەبەر، هەر لەبەرئەوەش نەمتوانی پرسیاری شەوی بوك و زاوایی لێ بکەم.

"ئامی"زۆر چێژی لەفەرمانڕەوایی خۆی وەردەگرت و دەیوت"سینۆهە"لەوڵاتی میسردا هیچ کەسێك بەئەندازەی من بەتوانا نیە و من چیتر لەمەرگ ناترسم، لەبەرئەوەی دەزانم فیرعەون نامرێت، بەڵکو دوای مەرگیشی بەزیندوّیی دەمێنێتەوە و پاشماوەی ژیانی کە ژیانێکی جاودانەیە لەسەر کەشتی"ئامون"[50]دا بەسەر دەبات.

دوای ئەوەی بۆماوەیەك"ئامی"بەوشێوەیە قسەی دەکرد، من هەستم بەوەکرد کە بەهۆی پیری و لەخۆبایی و ئەوەیکە شەو و ڕۆژ لەگەڵ ژنەکاندا ڕایدەبوارد، گرفتێکی لەهەستەکانیدا دروست کردبوو، چونکە دوای ئەوە بەمنی وت: "سینۆهە"من هەرگیز نامرم، لەبەرئەوەی فیرعەونم، فیرعەونیش نامرێت.

منیش پێم وت: "ئامی"تۆ واهەست دەکەیت لەبەرئەوەی چەند کاهینێك، لەپەرستگادا ڕوخساریان بەڕۆن چەورکردوویت و پیرۆزیان کردویت، گۆڕاویت

---

[50] کەشتی ئامون: لەمیسری کۆندا، دوو واتا لەخۆ دەگرێت، یەکێکیان ئەو خۆرەی بەچواردەوری جیهاندا دەسوڕایەوە و ئەویتریان ئەو کەشتیەی کە میسریە دەوڵەمەندەکان، دەیخەنە گۆڕەکانیانەوە. هەروەها لەم ساڵانەی دواییدا تائەوشوێنەی ئێمە لەڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا خوندومانەتەوە، دوو جار کەشتی"ئامون"یان لەڕێی چاڵهەڵکەنە شوێنەوارناسەکانەوە لەگۆڕی میسریەکاندا دۆزیوەتەوە و کاتێکیش میسریەك دەڵێت کە من لەجیهانەکەی تردا لەکەشتیەکەی"ئامون"دا پاشماوەی ژیانم بەسەر دەبەم، بەواتای ئەوە دێت کە من هەم لەناو ئەو کەشتیەدا دەمێنمەوە هەم لەلای خودای ئامون و خۆردا دەبم.

بەکەسێکی تر؟مەگەر تۆ نەتبینی کە فیرعەونە ڕەسەن و ڕاستەقینەکانیش، بەواتا ئەوانەی باوکیان فیرعەون بووە و خوێنی خودایان بەخوێنبەرەکانیاندا تێدەپەڕی کۆچی دواییان کرد؟ لەم حاڵەتەدا بەچ شێوەیەك پیاوێکی وەك تۆ کە سەرەتا لەخەڵکێکی ئاسایی بویت و لەدواییدا بوویت بەفیرعەون، بەهیوای ئەوەیت کە نەمریت؟

"ئامی"دەیوت کاهینەکان، ناهێڵن من بمرم...منیش پێم وت: ئەگەر کاهینەکان ئەو توانایەیان هەبوایە کە ڕێ لەمەرگ بگرن، کارێکیان دەکرد کە خۆشیان نەمرن.

ئەوکات"ئامی"خەمگین بوو و نائومێدی بەسەریدا زاڵ بوو و وتی: "سینۆهە"ئایا تۆ دەتەوێت بڵێیت کە ئەو هەموو پلانگێڕیەی"توطئة"من بۆ فیرعەون بێ سود بووە و ئەو هەموو خەڵکەی بەکوشتم دان، بۆئەوەی لەسەر تەختی پادشایەتی دانیشم هیچ دەرئەنجامێك لەخۆ ناگرێت؟ ئایا منیش دەبێت وەك ئەوانی تر بمرم و چاوپۆشی لەچێژی فیرعەون بون بکەم کە لەهەموو شەراب و شەو لەگەڵ ژناندا ڕابواردن چێژ بەخشترە."سینۆهە"کارێك بکە کەمن ڕۆژی سەد جار بتوانم لەگەڵ ژناندا ڕابوێرم. کارێك بکە کە هیچ کاتێك لەبونایەتی مندا لەبەرامبەر ڕابواردندا هەست بەبێزاری و ماندویەتی نەکەم، تۆ پزیشکێکی مەزنی و شارەزای هەموو شتێکیت، بۆیە دەتوانی من بەشێوەیەك بەهێز بکەیت کە من بەتەنها زیاد لەدەئەوەندەی پیاوی لاو لەگەڵ ژناندا ڕابوێرم.

ئەم قسانەی ئەوەی بۆ سەلماندم کە مێشکی"ئامی"بەهۆی پیری و لەخۆبایی و پلەوپایەخوازیەوە تێکچووە، دوای ئەوەش هەندێك ناکۆکی دەرونی تریشم بۆ دەرکەوت، چونکە جۆرێك ترس لەخواردن لەلای ئەودا دروست بوو بوو و پیاوێك دەیوت کەیەکێك لەتایبەتمەندیەکانی مەزنی فیرعەون بون شەراب خواردنەوەیە، لەترسی لەدەستدانی تەندروستی خۆی، نە دەیخواردەوە و نەخواردنی بەتامی دەخوارد، بەڵکو بەتەنها نانێکی وشك خۆی تێر دەکرد، ئەویش بەخۆپارێزیەکی زۆرەوە، چونکە لەوە دەترسا ژەهراوی بکەن.

لەکاتێکدا ئەو پیاوەی دەیویست لەڕۆژێکدا سەدجار لەگەڵ ژناندا ڕابوێرێت، بەیەکجاری لێیان بێزار بوو حەزگەلێکی ناسروشتی وەك ئەو ئارەزوانەی پیاوانی وڵاتی"هاتی"هەیانبوو لەودا هاتە بون.

*بەشی پەنجا و سێیەم*

## تۆڵەی"باكتامون"

بەڵام دوای ئەوەی شازادە خانم"باكتامون"ناچاربوو شەوێك لەپەرەستگای خودای جەنگدا لەگەڵ"هورم هب"دا بەسەر بەرێت سكی پڕ بوو.

شازادە خانم بەهۆی ئەو ڕقەی لەباوكی منداڵەكەی هەیبوو، دەیویست كۆرپەكەی سكی بكوژێت، بەڵام سەركەوتنی بەدەست نەهێنا، دوای ئەوەش ئەو منداڵەی بوو، بەڵام دوای ئەوەی ئەو منداڵە لەدایك بوو، منداڵەكەیان لێ جیاكردەوە، بۆئەوەی نەوەك هەوڵی كوشتنی بدات، یان بیخانە ناو سەبەتەیەكەوە و بیدات بەدەم ئاوی ڕووباری"نیل"ەوە.

لەبارەی لەدایك بونی ئەو منداڵەوە، چەند ئەفسانەیەكیان دەگێڕایەوە، بۆنمونە باسی ئەوەیان دەكرد كە كاتێك لەدایك بووە سەری وەك سەری خودای جەنگ وابووە و خودەیەكی جەنگیشی بەسەرەوە بووە، بەڵام من كە پزیشكی شازادە خانم بوم و چاوم بەو منداڵە كەوتبوو، هیچ جیاوازیەكی لەگەڵ منداڵەكانی تردا نەبوو و"هورم هب"ئەو كوڕەی بەناوی"ڕامسیس"بانگكرد.

كاتێك ئەو كوڕە لەدایك بوو"هورم هب"لەباشوری میسر لەگەڵ ڕەشپێستەكاندا جەنگی بەرپاكرد و گالیسكەكانی كوشت و كوشتاریان خستە ناو ئەوانەوە، چونكە ڕەشپێستەكان كە هیچ كاتێك لەجەنگەكاندا چاویان بەگالیسكەی جەنگی نەكەوتبوو، نەیاندەزانی بەچ شێوەیەك لەبەرامبەر ئەمانەدا بەرگری لەخۆیان بكەن.

"هورم هب"لادێکانی ئەوانی کە بەدار و قامیش دروست کرابوو سوتاند و ژن و منداڵەکانیانی بەکۆیلەیی نارد بۆ میسر، بەڵام پیاوە ڕەشپێستەکانی خستە ڕیزی هێزی لەشکرەکەی خۆیەوە و ئەوانیش سەربازگەلێکی دلێر و بێباك بون.

ڕەشپێستەکانیش دوای ئەوەی چونە ڕزی لەشکری سەربازی"هورم هب"ەوە، ئازادبون لەوەی بەپێی نەریت و بیروباوەڕی خۆیان، تا ئەوکاتەی حەز بکەن تەپڵ لێبدەن و سەما بکەن.

سەمای ڕەشپێستەکان کاریگەریەکی مەزنی لەڕۆحیان دەکردو دوای ئەوەی بۆماوەی نیو"ترازو"سەمایان دەکرد بەشێوەیەك هەڵدەچوون کە دەیانتوانی بەنێزەیەکەوە شەڕ لەگەڵ شێرێکدا بکەن،"هورم هب"دەیزانی کە لەجەنگی ئایندەدا دژی"هاتی"دەتوانێت سودیان لێ وەرگێت و سەربازگەلێك بنێرێتە ئەو جەنگەوە کە زۆر لەسەربازە هاتیەکان ئازا و بێباکترین.

"هورم هب"هەموو ئاژەڵی ڕەشپێستەکانی گواستەوە بۆ میسر، بەشێوەیەك کە شیر لەمیسردا زۆر بوو و هەژارترین کەس دەیتوانی گۆشت بخوات.

لەمیسر دوای ساڵها برسیەتی، گەنمێکی زۆر لەکێڵگەکاندا درەو دەکرا و خەڵکی تێریان لەنان وگۆشت و ئاوجۆ دەخواردو دایکانیش هەرجارێك شیریان بەمنداڵەکانیان دەدا لەخودایانی میسر داوای هێزو سەرکەوتنیان بۆ"هورم هب"دەکرد، چونکە دەیانزانی کە شیرو پێکهاتەکانی شیر و گۆشت بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ گەنم و ئاوجۆی لەمیسردا فراوان و زۆرتر کرد. بەڵام گواستنەوەی ئاژەڵی ڕەشپێستەکان، لەباشورەوە بۆ میسر بۆ نیشتمانی ڕەش و بەفەرمانی"هورم هب"لادێکانی سوتاندن و چەند کارەساتێکی تر کە لەشکری میسر لەو ناوچەیەدا ئەنجامیان دا، بەشێوەیەك ڕەشپێستەکانی ترساند کە وڵاتی خۆیانیان بەجێ هێشت و بەرەو وڵاتی فیل و زەڕافەو شێرەکان کۆچیان کرد، دوای ئەوەش بۆماوەی چەندساڵێك نیشتمانی ڕەشپێستەکان کە دەکەوێتە باشوری میسر و ناوی"کوش"ە بەبێ کشتوکاڵ و وشکی مایەوە و کەسێك لەوێ نەبوو کە باج و سەرانە بدات بەمیسر.

بەڵام میسر دڵگرانی ئەوە نەبوو کە هیچ باج و خەراجێك لە وڵاتی"کوش" وەرناگرێت، چونکە ڕەشپێستەکانی ئەو ناوچەیە ماوەیەکە باج و سەرانەیان نەدەدا بەمیسر، بۆیەوە وەرنەگرتنی سەرانە لەوڵاتی"کوش"بەلای میسریەکانەوە زۆر

ئاسایی بوو، لەکاتێکدا لەسەردەمی فیرعەونە مەزنەکاندا دەرامەتی وڵاتی"کوش" یەکێك بوو لەسەرچاوە دەرامەتیە مەزنەکانی میسر و میسرش لەسوریا زیاتر سودی لە"کوش" وەردەگرت.

"هورم هب" دوای دوو ساڵ جەنگ لەباشوری میسردا بەدەستکەوتێکی زۆرەوە گەڕایەوە بۆ میسر و زێڕ و زوی دا بە سەربازەکانی کە زۆربەیان رشپێست بوو.

بەبۆنەی گەڕانەوەی"هورم هب"بۆ "تبس" لەبەرئەوەی ئەو دەیویست بەسەرکردەیەکی سەرکەوتوی مەزن ناوبانگ دەربکات، دە شەو و ڕۆژ، لەو شارەدا ئاهەنگ گێڕدرا و سەربازە مەستەکانیش لەبەیانیەوە تا ئێوارە و لەشەوەوە تا بەیانی لەشەقامەکاندا بوون، دوای ئەو جەشنەش هەندێك لەژنەکانی"تبس"شویان بەرەشپێستەکان کرد.

"هورم هب"دوای گەڕانەوەی لەباشوری میسر کوڕەکەی خۆی"ڕامسیس"ی دەگرت بەباوەشەوەو بەلەخۆباییەکەوە پیشانی منی دەدا و دەیوت: تەماشا کە ئەم کوڕە لەخوێن و جەرگی من هاتووەتە دەرەوە، بەڵام خوێنی فیرعەون و خودایان لەخوێنبەرەکانیدایەتی، سەرەڕای ئەوەی کاتێك من لەدایك بوم نێوان پەنجەکانم پڕبوو لەسەنێر، بەڵام ئەم کوڕە دەتوانێت ببێتە فیرعەونێکی ڕاستەقینە.

کاتێك"هورم هب"گەڕایەوە بۆ"تبس"ڕۆشت بۆئەوەی چاوی بە"ئامی"بکەوێت، بەڵام"ئامی" هەروەك چۆن پێشتر بۆم گێڕانەوە، وەکو شێتی لێهاتبوو، بۆیە ترسا و دەرگای لەخۆی داخست و لەپشتی دەرگاکەوە وتی من لەتۆ دەترسم، چونکە تۆ هاتویت بۆئەوەی بمکوژیت.

"هورم هب"بەم قسەیەی پێکەنی و بەلەقەیەك دەرگاکەی شکاند و تی: "ئامی"من بیستبوم کە تۆ شێت بویت، بەڵام باوەڕم بەم قسەیە نەدەکرد، بەڵام ئێستا گەشتمە ئەو باوەڕەی ئەوەی لەبارەی تۆوە بۆیان باسکردم ڕاستە. چونکە ئەگەر تۆ شێت نەبوایەیت، تێدەگەشتی کە زیندوومانەوەی تۆ سودێکی زۆر بەمن دەگەیەنێت، ئەگەر بزانم بەم زووییە دەمریت، ئامادەم نیوەی ئەو سامانەی کە لە"کوش"وە لەگەڵ خۆمدا هێناومە، لەپەرستگاکاندا خەرجی قوربانی و دیاریەکانیان دەکەم، بۆئەوەی تۆ بەزیندویی بمێنێتەوە، چونکە جەنگێکی ترم لەپێشە کە لەماوەی ئەم جەنگەدا

نەتەوەی میسر دوچاری بەدبەختی دەبێت و تۆش دەبێت زیندوبیت بۆئەوەی میسریەکان تەواوی ئەو بەدبەختیانەی کە دوچاری دەبن بەهی تۆی بزانن.

"هورم هب"دیاریگەلێکی گرانبەهای بۆ ژنەکەی"باکتامون"هێنابوو و دیاریەکانیشی بریتی بون لە بەردگەلێکی ئاڵتونی کە لەناو ئەو سەبەتانەدا بوو کە ژنە رەشپێستەکان چنیبویان هەروەها پێستی شێر کە"هورم هب"لە"کوش"دا ڕاوی کردبوو و پەڕی نەعامە و مەیمونی زیندوو بوو، بەڵام شازادە خانم"باکتامون"هیچ یەك لەو دیاریانەی وەرنەگرت و وتی: "هورم هب"خەڵکی والێکی دەدەنەوە کە من ژنی تۆم و من منداڵێکم بۆ هێناویتە ئەم جیهانەوە و هەرئەوەش بەسە بۆ تۆ. تۆ لەمەودوا نابێت لەگەڵ مندا ڕابوێری و هەرکاتێك وەك ئەو شەوەی لەپەرستگادا بەزۆر لەگەڵمدا ڕابوێری، من بەشێوەیەك تۆڵەی خۆمت لێدەکەمەوە کە لەسەردەمی دروستکردنی قوچەکیەکانەوە تا ئەمڕۆ هیچ ژنێك بەوشێوەیەی من تۆڵەی لەهاوسەرەکەی خۆی نەکردبێتەوە، بۆئەوەی شەرمەزاربیت و ئابڕوت ببەم، لەگەڵ نۆکەرو کۆڵبەرو چوارپێکاندا ئەویش لەناوەڕاستی شاری"تبس"و کەنار ڕوباری "نیل"دا ڕادەبوێرم، چونکە من زۆر ڕقم لەتۆیە و بینینی تۆ بەسە بۆئەوەی توشی هێڵجدانم بکات.

ئەم بەرگریکاریە ورووژانی"هورم هب"ی بۆئەوەی لەگەڵ شازادە خانمدا ڕابوێرێت زیاتر کرد و کاتێك چاوی پێم کەوت سکاڵای شازادە خانم"باکتامون"ی لاکردم و وتی: من حەز دەکەم لەگەڵ ئەم ژنەدا ڕابوێرم، بەڵام ئەو ناڕازییە.

وتم: باشتروایە لەگەڵ ژنانی تردا ڕابوێری...بەڵام هورم هب بەڕادەیەك "باکتامون"ی خۆشدەویست بەهیچ شێوەیەك ژنەکانی تر وەك ئەو سەرنجیان ڕانەدەکێشا.

ئەوکات داوای لێکردم دەرمانێکی پێبدەم کە دەرخواردی"باکتامون"ی بدات، بۆئەوەی خۆشی بوێت.

منیش وتم: دەرمانێکی وا لەهیچ شوێنێکدا بونی نیە.

ئەویش وتی: دەرمانێکم پێبدە کە خەوی لێ بخات و من بتوانم لەکاتی خەودا لەگەڵیدا ڕابوێرم.

منیش پێم وت: دەرمانی خەو زیان بەژن دەگەیەنێت....کاتێك"هورم هب"نەیتوانی دەرمانی خەوم لیّ وەرگرێت، ئەو دەرمانەی لەپزیشکەکانی تر وەرگرت و بێئەوەی"باکتامون"ئاگای لیّ بێت دەرخواردی دا و دوای ئەوەی خەوی لێکەوت "هورم هب"لەگەڵیدا ڕاییوارد، بەڵام شازادە خانم کاتێك لەخەو هەستا نەفرەت و ڕقی لەبەرامبەر"هورم هب"دا ئەوەندەی تر زیادی کرد.

"هورم هب"کە دەیویست لەگەڵ لەشکرەکەیدا بڕوات بۆ سوریا، بۆئەوەی بەتەواوی "هاتی"ەکان لەسوریادا دەربکات، پێش ئەوەی ڕێی ئەو وڵاتە بگرێتەبەر، ڕۆشت بۆ لای شازادە خانم بۆئەوەی ماڵئاوایی لیّ بکات.

شازادە خانمیش پێی وتبوو: "هورم هب"ئەوە بەبیر خۆت بهێنەرەوە کە چێم پیّ وتیت، دوای ئەوەی گەڕایتەوە و بینیت من تۆم لەبەرچاو هەموو خەڵکیدا ڕسواکردووە، مافی ئەوەت نیە نارەزایی خۆت دەربڕی.

"هورم هب"پێکەنی و ڕۆشت، دوای ڕۆشتنی ئەو بۆ سوریا شازادە خانم بۆ جارێکی تر هەستی بەوە کرد کە سکی پڕە و لەو ڕۆژەوەی ئاگاداری ئەوە بوو کە سکی پڕە، لەژورەکەی خۆی نەهاتە دەرەوە.

شازادە خانم، لەو کلاو ڕۆژنەیەی کە لەو ژورەدا هەیبوو خواردنی پێدەدرا و کاتێکیش کاتی لەدایك بونی منداڵەکەی نزیك بویەوە، خستیانە ژێر چاودێریەوە، بۆئەوەی هەوڵی کوشتنی منداڵەکەی خۆی نەدات، بەڵام "باکتامون"منداڵەکەی نەکوشت و ناوی"ست هوس"ی لێنا، بەواتای لە"ست"[51]بوو دەگەیەنێت.

دوای ئەوەی"باکتامون"لەزەیسانی منداڵە تازەکەی چاك بوویەوە، خۆی ڕازاندەوەو جلی کەتانی لەبەرکرد و لەکۆشکی زێڕین ڕۆشتە دەرەوە و بەرەو بازاڕی ماسی فرۆشانی"تبس"ڕۆشت و لەویّ بەماسی فرۆش و ئەو وڵاخدارانەی کە بەباری گوێدرێژ ماسیان هێنابوو بۆ بازاڕ وت: من شازادە خانم"باکتامون"ی هاوسەری"هورم هب"سەرکردەی مەزنی لەشکری میسرم و تائێستا دوو منداڵم لەو بووە، بەڵام ئەم پیاوە منی خۆش ناوێت و لەگەڵمدا ڕانابوێرێت، هەرلەبەرئەوەش من ئەمڕۆ هاتوم

---

[51] لەمیسری کۆندا"ست"بونەوەرێکی وەك ئەهریمەن"شەیتان"ی ئێستای ئێمە وابووە و هەروەك چۆن ئەهریمەن لەگەڵ یەزداندا ناکۆك بووە،"ست"یش بەهەمان شێوە ناکۆکی لەگەڵ خودایانی میسردا هەبوو.

بۆبازاڕی ماسی فرۆشەکان بۆئەوەی داواتان لێبکەم لەگەڵ مندا بێن بۆ ژێر درەختە چڕەکانی کەنار ڕوباری"نیل"و لەگەڵمدا ڕابوێرن، چونکە من چێژ لەتوندوتیژی و بەدڕەوشتی ئێوە وەردەگرم. و بۆنی ماسیەکانی ئێوە خۆشحاڵم دەکات، کاتێکیش ماسی فرۆش و وڵاخدارەکان گوێیان لەم قسانە بوو، بەترسەوە لێی دور کەوتنەوە. بەڵام"باکتامون"لەناوەڕاستی بازاڕی ماسی فرۆشان جلە کەتانەکەی بەری کردەوە و جەستەی ڕوتی پیشانی پیاوەکان دا و وتی: مەگەر نابینن من چەنێك جوانم؟ لەکوێ دەتوانن ژنێکی لەمن جوانتر بەدەست بهێنن؟ وەرن و لەکەنار ڕوباری"نیل"لەژێر چڕەدارەکاندا لەگەڵ مندا ڕابوێرن و منیش لەبەرامبەر ئەم ڕابواردنەدا تەنها بەردێکم بەدیاری لێتان دەوێت، بەڵام ئەگەر چێژتان لەم ڕابواردنەی من وەرگرت ئەوا بەردێکی گەورەم وەك دیاری بۆ بهێنن.

لەمێژوی میسردا، هیچ کەسێك نەیبینیوەو نەیبیستووە کە شتێکی ئاوا ڕویدابێت. پیاوەکان کە لەسەرتادا لە"باکتامون"هەڵدەهاتن، کاتێك چاویان بەجەستەی ڕوتی کەوتو بۆنی عەتری لاشەیان کرد، وتیان: ئەم شازادە خانمە خودای "سخ مت"ە و کاتێك خودایەك بێتە ناو پیاوانەوە و پێیان بڵێت لەگەڵ مندا ڕابوێرن، ناتوانین سەرپێچی لەفەرمانەکانی بکەین، ئەگینا دوچاری توڕەیی خودایان دەبین...... چونکە جۆری مرۆڤ بەشێوەیەك دروست کراوە کە بەبەردەوامی بۆ ڕازی کردنی غەریزەکانی بەڵگەگەلێکی گونجاو بۆ شەهوەت و کینە و تەماعی و خۆ ویستی خۆی بەناوی خودا یان بەناوی نیشتیمان، یان بەناوی بەرژەوەرندی مەزنی نەتەوەیەك هێور بکەنەوە.

هەندێك لەپیاوەکان دەیانوت سەرەڕای ئەوەی ئێمە دەبێت فەرمانەکانی خودای جەنگ جێبەجێ بکەین، ئەگینا دوچاری توڕەیی خوداکان دەبین هەروەها ئەو دیاریەی کە شازادە خانم لەئێمەی دەوێت هەرزانترین شتە کە لەمیسردا ژنێك بۆئەوەی خۆی بدات بە دەست پیاوێکەوە لێی داوا بکات، ئێمەش کاتێك دەڕۆین بۆ سۆزانیخانەیەك و بمانەوێت لەگەڵ ژنێکی ڕەشپێستدا ڕابوێرین، لانی کەم داوای ئەنگوستیلەیەکمان لێ دەکات، بەڵام ئەم شازادە خانمە کە لەنەوەی خودایانە، دەڵێت تەنها بەردێکم بۆ بهێنن، لەبەرئەوەی بەرد هیچ نرخێکی نیە، بێ لەبەرکاهێنانی لەکاتی خانو دروست کردندا، بەکەڵکی هیچ شتێکی تر ناخوات، بۆیە ئاشکرایە کە دەیەوێت پەرستگایەك بۆ خۆی یان بۆیەکێك لەخودایان دروست بکات.

شازادە خانم"باکتامون"پیاوانی بازاڕی ماسی فرۆشەکانی بردە کەنار ڕوباری "نیل"و ئەو ڕۆژە تا خۆرئاوابون لەگەڵ ئەواندا ڕایبوارد و هەموو ئەو پیاوانەی لەگەڵ"باکتامون"دا ڕایدەبوارد بەردێکی گەورەیان بۆ دەهێنا و بەخۆشحاڵیەوە بەوانی تریان دەوت کە هیچ گومانێك لەوەدا نیە کە"باکتامون"یەکێکە لەخوداکان، چونکە تەنها لێوی خوداکان وەك لێوی"باکتامون"وەك هەنگوین شیرینە.

لەخۆرئاوابوندا کاتێك شازادە خانم دەیویست بگەڕێتەوە بۆ کۆشکی زێڕین، کەشتیەکی گرت بەکریێ بۆئەوەی بەردەکان بەکەشتی بگوازێتەوە بۆ ئەو شوێنەی خۆی دەیویست‌و پیاوانی بازاڕی ماسی فرۆشانیش لەبەردەمیدا کڕنوشیان بۆ دەبردو دەیانوت ئەی خودای جەنگ، سبەینێش وەرە بۆئەوەی لەگەڵ ئێمەدا ڕابوێری‌و ئێمەش لەبەرامبەر ئەم ڕابواردنەدا بەردی گەورەترت بۆ دەهێنین.

بەڵام ڕۆژی دوایی شازادە خانم ڕۆشت بۆ بازاڕی سەوزی فرۆشەکان کە وەك بازاڕی ماسی فرۆشەکان لەکەنار ڕوباری"نیل"دابوو.

لادێییەکان بەرهەمی کشتوکاڵی خۆیان باری وڵاخ و"گا"کردبوو، هێنابویان بۆ بازاڕ و شازادە خانمیش پێی وتن: من"باکتامون"ژنی"هورم هب"ی فەرماندەی لەشکری مەزنی میسرم و دوو منداڵم لێی بووە، بەڵام"هورم هب"منی خۆشناوێت و لەگەڵمدا ڕانابوێرێت، بگرە ماڵێکی تایبەتی بۆ دروست نەکردوم، هەر لەبەرئەوەش من ئەمڕۆ هاتوم بۆ لاتان بۆئەوەی داواتان لێ بکەم لەگەڵ مندا بێن بۆ نێو چڕە دارەکانی کەنار ڕوباری"نیل"و لەگەڵمدا ڕابوێرن و ئەو دڵنیاییەتان پێ دەبەخشم کە هیچ ژنێك ناتوانێت ئەو چێژەی من پێتان دەبەخشم پێتان ببەخشێت‌و تەنها شتێك کە لەئێوەم دەوێت یەك بەردە.

لادێییەکانیش وەك ماسی فرۆشەکان، سەرەتا لێی ترسان، بەڵام شازادە خانم"باکتامون" جلەکانی بەری کردەوە و لاشەی ڕوت و جوانی خۆیی پێنیشان دان‌و دامێنی کراسەکەی خۆی تەکان دەدا بۆئەوەی شنەی با بۆنی عەتری ئەو بەو چواردەورەدا بڵاو بکاتەوە و لادێییەکانیش وتیان، نابێت ئەم هەلە لەدەست بدەین، چونکە لەسەرتاپای تەمەنماندا جارێك شتی وامان بۆ ڕێك دەکەوێت، کە شازادە خانمێك ڕازی بێت لەگەڵ لادێیەکی هەژاری وەك ئێمە ڕابوێرێت، ئێمەش هەرگیز ژنی

وامان نەبینیوە کە بەو شێوەیە جوان بێت و لەشی بۆنی خۆشی وای لێ بێت، چونکە تەنها بۆنی سەنێر لەلەشی ژنەکانمانەوە دێت.

دوای ئەوە لەکاتێکدا کە کۆمەڵێك لە پیاوە لادێییەکان لەگەڵ شازادە خانمدا لەکەنار ڕوباری"نیل"دا ڕایاندەبوارد، دەستەیەکی تر کەر و وڵاخەکانی خۆیان بەرەڵا کرد، بۆئەوەی بڕۆن و بەردێکی بۆ بهێنن، لەکۆتایی ئەو ڕۆژەدا شازادە خانم بەکەشتیەکی پڕ لەبەرد گەڕایەوە.

ڕۆژی سێیەم"باکتامون"ڕۆشت بۆ بازاڕی خەڵوز فرۆشەکان و ئەوەی لەدوو ڕۆژی ڕابردوودا باسی کرد دوبارەی کردەوە و خەڵوز فرۆشەکانیش سەرەتا لەوباوەڕەدا نەبون کە شازادە خانمێك لەگەڵ ئەواندا ڕابوێرێت و بەتۆز و غوباری خەڵوزەکەیان خۆی ڕەش بکات.

شازادە خانم ئەوەندە پیاوی ڕەوانەی چڕەدارەکانی کەنار ڕوباری"نیل"کرد کە کەناری ئەو ڕوبارە ڕەنگی ڕەشی لەخۆ گرت و لەکاتی خۆرئاوابوندا ئەگەر کەسێك گیای کەنار ئەو ڕوبارەی ببینیایە، وای دەزانی کە کۆمەڵێك ئەسپی ئاوی"غول" لەوێوە تێپەڕیون و گیای ئەو کەنارەیان پێشێل کردووە.

لەو ڕۆژەدا هاواری ناڕەزایی هەندێك لەمەی فرۆش و کاهینەکان بەرز بویەوە، چونکە خەڵوز فرۆشەکان، بەردیان نەبوو بۆئەوەی پێشکەشی شازادە خانمی بکەن، بۆیە بەردەکانی بەردەم مەیخانەو پەرستگاکانیان دەدزی و پێشکەشی شازادە خانمیان دەکرد.

لەخۆرئاوا بوندا، شازادە خانم بەکەشتیەکی تری پڕ لەبەرد ڕۆشت بۆئەو شوێنەی کە دەیویست بەردەکانی تێدا خاڵی بکات.

لەبەرئەوەی لەو ڕۆژەدا شازادە خانم بۆ سێیەم جار بەشێوەیەکی ئاشکرا خۆی پیشانی پیاواندا، لەو ڕۆژەدا لەسەرتاسەری"تبس"دا بێ لەو بابەتە باسی هیچ شتێکی تر نەدەکراو ئەو کەسانەی باوەڕیان بەخوداکان نەبوو، لێکدانەوەو ڕونکردنەوەیەکی جیاوازی ئەم ڕەفتارەیان دەکردو هەموو پیاوێك لە"تبس"دا ئارەزوی ئەوەی دەکرد لەگەڵ شازادە خانمدا ڕابوێرێت.

بەیانی ڕۆژی دوایی، پیاوەکان بگرە ئەو پیاوەنەش کە خاوەنی چەند ژنێك بون، بەهیوای ئەوەی لەگەڵ شازادە خانمدا ڕابوێرن، بەردێکیان بەدەست دەهێنا و لەو بازاڕانەی کە لەسێ ڕۆژی ڕابردوودا شازادە خانم دەرکەوتبوو چاوەڕێیان دەکرد.

ئەو کەسانەی خاوەنی زێڕ و زیو بون بەردیان لەفرۆشیارەکان دەکڕی و ئەوانەش کە خاوەنی هیچ کانزایەك نەبون، دەستیان دەکرد بەدزینی بەردی پەرستگا و سۆزانیخانەکان، ئەم حاڵەتەش گەشتە ڕادەیەك کە کاهینەکان ناچار بون، داوا لەپاسەوانە شەوگەردەکان بکەن پاسەوانی چواردەوری پەرستگاکەیان بکەن، بۆئەوەی دزەکان نەتوانن بەردی پەرستگاکەیان بدزن. بەڵام لەو ڕۆژەدا شازادەخانم "باکتامون" نەڕۆشت بۆ بازاڕو خۆیی پیشانی پیاوەکان نەدا، بەڵکو لەکۆشکی زێڕیندا حەوایەوە، بۆئەوەی ماندویەتی سێ ڕۆژی ڕابردوو لەلەشی دەربکات.

لەدواییدا نزیکی نیوەڕۆ ڕۆشت بۆ پشکنینی ئەو بەردانەی کە لەکەنار ڕوباری"نیل"دا هەڵپڕشتبون، ئەوکات وەستا دیواری گەوڕی فەرمانڕەوایی بانگ کردو وتی:

ئەم بەردانە دەبینی هەموو خۆم کۆمکردووەتەوە و تەواوی ئەمانە بەلای منەوە خۆشەویستن، چونکە بەتەماشاکردنی هەریەك لەم بەردانە یادگاریەکم بەبیر دەهێنێتەوە و هەر بەردێکیش گەورەتر بێت ئەوا یادگاریەکی مەزنتر لەخۆ دەگرێت، ئێستاش داوات لێدەکەم ماڵێکی گەورەم بۆ دروست بکەیت، بۆئەوەی من ماڵێکی تایبەتم بۆ خۆم هەبێت و بتوانم تێیدا بژیم، چونکە تۆ دەزانی "هورم هب"ی هاوسەرم، ڕقی لێمە و پشتگوێی خستوم و جارێك بۆ"کوش"و جارێکیش بۆ سوریا دەڕوات.

ئەو ماڵەی کەتۆ بۆم دروست دەکەیت دەبێت گەورە و فراوان بێت و بەهیچ شێوەیەك لەبەکارهێنان و دروست کردنی خانو مەترسە، چونکە دوبارە دەڕۆم و لەمجۆرە بەردانەت بۆ دەهێنم، تۆ بەهیچ شێوەیەك لەکاتی کارکردندا گرفتی نەبونی بەردت نەبێت.

وەستای گەوڕی فەرمانڕەوایی پیاوێکی سادە بوو، کاتێك گوێ لەپێشنیاری شازادەخانم بوو، وتی: شازادە خانم من لەسەرتاپای تەمەنمدا تەنها خانوی بچوکم دروست کردووەو ناتوانم کۆشکێکی جوانت بۆ دروست بکەم و تۆ کە دەتەوێت

خانویەکی گەورە و فراوان و جوان بۆخۆت دروست بکەیت، دەبێت سەردانی تەلار سازە مەزن و هونەرمەندانی بەناوبانگ بکەیت، بۆئەوەی ئەم ماڵەی تۆ بەهۆی نەشارەزایی و نەزانینەوە نەڕوخێت.

شازادە خانم"باکتامون"دەستی خستە سەرشانی کابرای وەستا و وتی: ئەی دروستکەری گەوڕی فەرمانڕەوایی، من ژنێکی هەژارم و هەر بەوشێوەی دەزانی" هاوسەرەکەم زۆر ڕقی لێمە و خاوەنی هیچ داراییەك نیم کە تەلارسازی مەزن و هونەرمەندەکان بەکرێ بگرم، چونکە ناتوانم لەبەرامبەر کارەکەیاندا کانزایان پێبدەم، بگرە ناشتوانم لەبەرامبەر ئەو ئەرکەی کە تۆ بۆم ئەنجام دەدەیت دیاریەکی مەزنت پێ ببەخشم، کاتێك دروست کردنی ئەم ماڵە تەواو بوو، من و تۆ پێکەوە دەچینە ناو ئەو ماڵەوە و پێکەوە لەگەڵ یەکتردا ڕادەبوێرین.

کابرای وەستا دیوار بەبیستنی ئەو قسانەی زۆر خۆشحاڵ بوو، چونکە دەیزانی کە شازادە خانم"باکتامون"یەکێکە لەجوانترین ژنەکانی میسر و بیستبووی کە ئەو لەم ڕۆژانەی دواییدا لە"تبس"لەگەڵ کۆمەڵێك پیاودا ڕایبواردووە.

ئەگەر"هورم هب"لە"تبس"دا بوایە، لەوانەبوو لێی بترسیایە و لەپێناو ئەوەی لەگەڵ شازادە خانمدا ڕابوێرێت خانوویەکی بۆ دروست نەدەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو پیاوە لەوێ نەبوو، لەدڵی خۆیدا وتی نابێت خۆی لەخۆشیەکی مەزنی ئاوا بێبەش بکات، وەستا دیواری گەوڕی فەرمانڕەوایی بەخۆشەویستیەوە کاری دەکرد و بەهیوای ئەوەی لەگەڵ"باکتامون"دا ڕابوێرێت، لەدڵی خۆیدا بەخۆی دەوت نابێت لەئارەقی نێوچاوان و سەختی کار بێزار بێت.

شازادە خانم"باکتامون"یش بۆ بەدەست هێنانی بەرد لەکۆشکی زێڕین دەڕۆشتە دەرەوە و نەك تەنها لەشەقامەکاندا بەپیاوەکانی دەوت کە بەردی بۆ بهێنن، بەڵکو لەناو پەرستگاکانیشدا داوای بەردی لە لەپیاوەکان دەکرد.

بەشێوەیەك کە ڕۆژێکیان کاهینەکان بەهاوکاری پاسەوانە شەوگەردەکان لەپەرستگایەکدا چون بەسەریدا، بەڵام"باکتامون"بەلەخۆبایی و سەربەرزیەوە وتی: ئایا دەزانن کە لەبەرامبەر چ کەسێکدا ڕاوەستاون، من"باکتامون"م کچی فیرعەونی مەزنم و خوێنی فیرعەون و خودایان لەخوێنبەرەکانمدا لەحاڵی خرۆشاندایە و لەمیسردا هیچ دادوەرێك نیە کە بتوانێت تاوانبارم بکات، بەڵکو من خودی

دادوەرەکان بەوە تاوانبار دەکەم کە ئێوە سوکایەتیتان بەمن کردووە و لەبەرامبەر ئەم کارەشتاندا سزاتان نادەم بەڵکو زۆر حەز دەکەم لەگەڵتاندا ڕابوێرم، چونکە ئێوە بەپیاوگەلێکی بەهێز دێنە بەرچاوم، چونکە ژیانێکی خۆشتان هەبووە و خواردنێکی باشیشتان خواردووە، لەبەرئەوە هیچ کاتێك کاهین و پاسەوانە شەوگەڕەکان برسیەتیان نەچەشتووە، بەڵام هەریەك لەئێوە لەبەرامبەر ئەوەی لەگەڵ مندا ڕادەبوێرن، دەبێت بەردێکم بۆ بهێنێن، لەبەرئەوە بڕۆن و دیواری پەرستگاو ماڵی دادوەرەکانم بۆ وێران بکەن، چونکە لەماڵی داوەر و پەرستگاکاندا لەهەموو شوێنێکی تر بەردی زیاتری تێدا بەکار هێنراوە.

پاسەوانەکانیش کە ئەرکیان ئەوە بوو نەهێڵن هیچ کەسێك ماڵی کەسانی تر وێران بکەن، خۆیان هێرشیان کردە سەر دیواری پەرستگا و ماڵی دادوەرەکان و بەردی ماڵەکانیان هەڵکەندن و هێنایان بۆ"باکتامون"و ئەویش بەڵێنی خۆی لەگەڵیاندا هێنایە جێ و لەگەڵ هەموویاندا ڕایبوارد.

ئەوکات بۆ بەدەست هێنانی بەرد ڕۆشتە سۆزانیخانەکان و لەگەڵ ئەو پیاوانەی کە لەو سۆزانیخانەدا بوون ڕایدەبواردو لەبەرامبەر ئەم ڕابواردنەدا داوای بەردی لێکردن و هەموجارێکیش بەشێوەیەکی تەواو خۆیی پێ دەناساندن، بۆئەوەی ئەو پیاوەی بەردی بۆ دەهێنا بزانێت کە ئەو شازادە خانم"باکتامون"ی هاوسەری"هورم هب"ی فەرماندەی لەشکری میسرە.

بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێم کە هەر ڕۆژێك شازادە خانم لەکۆشکی زێڕین نەڕۆشتایەتە دەرەوە، هیچ کەسێك ڕەفتارێکی ناشایست و پێچەوانەی کەسایەتی لێ نەدەبینی کە لەخۆی بنوێنێت، هەروەها ئەو کاتانەش کە لە"کۆشکی زێڕین" بۆئەنجامدانی هەندێك کاری تایبەت بەخۆی سواری کەژاوەکەی دەبوو و دەڕۆشتە دەرەوە، ئەوندە کەسایەتیەکی بەهێز و پایەداری هەبوو کە هیچ کەسێك نەیدەتوانی داوای ئەوەی لێ بکات لەگەڵیدا ڕابوێرێت، چونکە ژنانی کەسە مەزن و شازادە خانمەکان، لەبەرئەوەی ناچارنین بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانیان لەشیان بفرۆشن، بۆیە لەهەرکاتێکدا خۆیان بیانەوێت دەتوانن کۆتایی بەهەڕاج فرۆشی خۆیان بهێنن و کاتێکیش خەڵکی دەبینن شازادە خانمێك خۆی هەڕاج دەکات، سوکایەتی پێناکەن. چونکە لەدڵی خۆیاندا وا لێکی دەدەنەوە ژنێکی دەوڵەمەند و ڕەسەن نەبێت لەبەر

هۆكارو بەرژەوەندیەك كەئەوان ئەقڵیان پێی ناشكێت خۆی هەڕاج بكاتو بەدڵنیاییەوە جیاوازە لەگەڵ ژنی سۆزانیخانەكان كەلەبەر تیكە نانێك خۆی دەخاتە بەردەستی هەموو پیاوێكەوە.

بەهەرحاڵ چۆنایەتی كاركردنەكان یەكێكە و لەهەردوو حاڵەتەكەدا ژن خۆی هەڕاج فرۆش دەكات، ئیتر بۆ دابینكردنی تیكە نانێك بێت یان بەئارەزوی خۆی بێت یان لەپێناو تۆڵەسەندنەوەی هاوسەرێكی وەك"هورم هب"بێت.

هەتا لەم جیهانەدا ژن و مێرد هەبێت، ژنگەلێك هەن كە خۆیان هەڕاج فرۆش دەكەن، بەكورتیەكەی یەكێكیان لەپێناو تیكەیەك نان و ئەویتریان خۆی هەڕاج فرۆش دەكات و یەكێكی تر لەپێناو بەدەست هێنانی پارچە گەوهەرێك و چوارەمیشیان بۆ بەدەست هێنانی ماڵ و نۆكەر و كێڵگە و پێنجەمیشیان لەڕوی حەزو ئارەزووەوە لەگەڵ پیاوێكدا ڕادەبوێرێت، بەڵام لەنێوان ئەمانەدا ئەوەی لەهەمویان هەژارترە زیاتر سوكایەتی پێدەكرێت و خەڵكی هەمیشە بۆ ئەو ژنانەی كە دەوڵەمەندن بیانو و هۆكارێكیان بۆ دەدۆزنەوە و ئەوەیش ئەگەر شازادە خانم بێت سەرەڕای ئەوەی خۆی هەڕاج فرۆشیش بكات، لەسوكایەتی كردنی خەڵكی پارێزراو دەبێت.

هەموو ئەوانەی لە"كۆشكی زێڕین"دان دەزانن كە شازادە خانم"باكتامون"بەردی ماڵەكەی خۆی لەكوێوە بەدەست دەهێنێت.

ژنانی نیشتەجێی"كۆشكی زێڕین"كاتێك دەهاتن بۆئەوەی تەماشای ماڵەكەی "باكتامون" بكەن، ئەو بەردانەی كە لەوماڵەدا بەكار هاتبوو دەژمارد و دەنگی سەرسوڕمانیان لێ بەرز دەبویەوە و دەیانوت: ئایا دەتوانی باوەڕ بەوە بكەیت كە ژنێك بەژمارەی ئەو بەردانە لەگەڵ پیاواندا ڕایبواردبێت، بەڵام هیچ یەك لەم ژنانە نەیانوێرا ئەم بابەتە بەخودی"باكتامون"بڵێن.

بگرە"ئامی"فیرعەونی میسریش كاتێك ئاگاداری ئەو بابەتە بوو، لەباتی ئەوەی توڕە ببێت، خۆشحاڵ بوو، لەبەرئەوەی ڕقەبەرایەتی لەگەڵ"هورم هب"دا هەبوو و دەیزانی كە ئەو پیاوە هەركاتێك بەسەركەوتوویی لەسوریاوە بگەڕێتەوە و شكست بە"هاتی"ەكان بهێنێت، چیتر ئەو لەفیرعەونی میسری لادەبرێت.

هەرلەبەرئەوەش خۆشحاڵی خۆی دەردەبڕی كە"باكتامون"بەشێوەیەك"هورم هب"ی لەبەرچاو خەڵكیدا بەدناوكردوە كە ئەگەر ئەو پیاوە دوای گەڕانەوەی لەسوریا

بیەوێت ئەو لەفەرمانڕەوایی میسر بەرکەنار بکات، ئەویش بەشێوەیەك باسی ڕسواییەکانی دەکات کە وەك کەسێکی دڕندەی لێ بێت. بەڵام"هورم هب"لەسوریادا سەرقاڵی جەنگ بوو و توانی شاری"سیدون"و "ئزمیر"و "بیبلوس" لەژێردەستی "هاتی"یەکان داگیربکات و لەو وڵاتەشەوە دەستکەوتگەلێکی زۆری ناردەوە بۆ میسر، هەروەها دیاریگەلێکی بەهاداریشی نارد بۆ ژنەکەی، لە"تبس"یشدا هەموویان دەیانزانی کە لەکۆشکی زێڕیندا چیێ ڕوودەدات، بەڵام هیچ کەسێك ئەم ڕوداوانەی لەڕێی نامەوە نەدەگەیاند بە"هورم هب"، بگرە ئەو کەسانەی کە لەلایەن"هورم هب"ەوە هەڵبژێردرابون بۆئەوەی لە"تبس"دا پارێزگار لەبەرژەوەندیەکانی بکەن، ئەم هەواڵەیان نەدەنارد بۆ"هورم هب"و دەیانوت ئەو ڕەوشەی کە"باکتامون"گرتویەتە بەر کێشمەکێشێکی هاوسەریە و ئەگەر ئێمە دەستمان بخەینە نێوان بەردی ئاشەوە، بەدڵنیاییەوە زۆر باشترە لەوەی خۆمان بخەینە نێو ئەم کێشە خێزانیەوە.

بەمشێوەیە"هورم هب" بەتەواوی بێئاگابوو لەڕەفتارەکانی"باکتامون"و لەو باوەڕەدام ئەم بابەتە لەبەرژەوەندی میسردابوو، چونکە ئەگەر"هورم هب"ئاگاداری ئەم بابەتانە بوایە نەیدەتوانی بەخەیاڵێکی ئاسودەوە لەسوریادا سەرقاڵی کارە سەربازیەکانی بێت.

***

من لەمێژوی قۆناخی ئەم بەسەرهاتانەدا، لەبارەی فەرمانڕەوایی"ئامی"لەمیسر و ڕەفتاری شازادە خانم"باکتامون" لە"تبس"دا زۆر دوام، بەڵام بەهیچ شێوەیەك باسی خۆمم نەکرد، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆئەوەی هیچ شتێکی سەرنج ڕاکێشم لەبارەی ژیانی خۆمەوە شك نەدەبرد بۆئەوەی بۆتانی بگێڕمەوە.

چیتر ڕوباری ژیانم وەك جاران هەڵچون و داچونی نەبوو و مەنگ ئاسا و لەسەرخۆ دەڕۆشت و لەهەردوو کەناری ڕوبارەکەدا گۆماوی دروست دەکرد.

*بەشی پەنجا و چوارەم*

## ئـەنــدێشەکـانـم

من لەشاری"تبس"لەو ماڵەی کە"موتی"بەو کانزایانەی کە"کاپتا"بۆی ناردبوو نۆژەنی کردبویەوە دەژیام و حەزم نەدەکرد ئەو ماڵە بەجێ بهێڵم. پێکانم زۆر بەجیهاندا گەڕاوە بۆیە هەست بەماندویەتی دەکات و چاوەکانیشم ئەوەندە دزێوی و سوکایەتی و ناشیرینی بینیوە کە چیتر نایەوێت چاوی بەو جۆرە دیمەنانە بکەوێت. دڵیشم بەڕادەیەك لەخۆویستی و تەماعی مرۆڤەکان بێزار بووە کە نەمدەویست ببمەوە هاوبەشی خۆپەسەندی و تەماعیەکانیان.

هەرلەبەرئەوەش دور لەخەڵکی لەو ماڵەدا دەژیام و چیتر ڕێم نەدەدا کەسە نەخۆشەکان لەبەرامبەر زێڕ و زیو دا بێن بۆ لام بۆئەوەی چارەسەریان بکەم و تەنها هەندێکات ڕێم دەدا بەدراوسێ و ئەو کەسە هەژارانەی کە نەیاندەتوانی نرخی چارەسەریەکانیان بدەن بێنە ماڵەکەمەوە بۆئەوەی چارەسەریان بکەم.

من لەو ماڵەدا هەسێرێکم دروست کردبوو، چەند ماسیەکی ڕەنگاوڕەنگیشم خستبووە ناو هەسێرەکەوە، لەبەرئەوەی ئەو درەختانە لەڕابردوودا بەهۆی ئاگرەوە سوتێنرابوون دوبارە سەوز بونەتەوە-چونکە ڕیشکەکانیان هچی پێ نەهاتبوو-و لەژێر سێبەری ئەو درختانە و لەکەنار ئەو هەسێرە ئاوەدا دادەنیشتم و تەماشای جوڵەی ماسیەکانم دەکرد و گوێم دەگرت لە سەڕەی گوێدرێژ و گاڵەگاڵی ئەو منداڵانەی کە یاریان دەکرد.

"موتی"زۆر بەجوانی پەرستیاری لێ دەکردم و خواردنگەلێکی خۆشی بۆ لێدەنام، بەڵام من وەکو ڕابردوو چێژم لەخواردن وەرنەدەگرت، بەڵکو ئەو کرادار و ڕەفتارە

دزێوانەی لەڕابردوودا ئەنجامم دابون بەبیر دەهێنایەوە،چاوەکانی فیرعەون "ئەخناتون"م دەهێنایەوە یاد لەکاتی مەرگدا، ئەوکاتەی کاسە زەهرەکەی لەدەستم وەرگرت و خواردیەوە، هەروەها بەژن و بالآی لاو و دەم بەبزە و خۆشحالی"شوباتو"ی شازادەی"هاتی"م دەهێنایەوە بەرچاوم کە ئەویش بەدەستی من ژەهری نۆشی.

کردارە ناشیرینەکان ئەوەندە لەبەرچاوم دوبارە دەبویەوە کە چیتر بگرە خۆم لەچارەسەرکردنی دراوسیٚ و کەسە هەژارەکانیش دەپاراست، چونکە دەمزانی کە دەستەکانم نەفرەت لێکراون، لەبەرئەوەی لەباتی ئەوەی ببێتەی مایەی تەندروستی خەلکی، دەبێتە هۆی مەرگیان.

هەندێکات، لەکاتی دانیشتن لەپالٚ هەسێری مالەکەم و تەماشاکردنی ماسیەکاندا، ئارەزوی ئەوەم دەکرد منیش وەك ئەوان لەناو ئاودا بژیایەم، چونکە لەوکاتەدا ناچار نەدەبوم هەوای ئالودە بەتاوانەکانی سەرزەوی هەلمژم.

هەندێکاتیش لەگەلٚ ڕۆحمدا دەدوام و دەموت: بۆچی لەبەر ئەو کارانەی کە لەڕابردوودا ئەنجامت داون بەداخ و پەشیمانی؟ تۆ هیچ تاوانێکت نەکردووە، چونکە کردارەکانی تۆ بەشێکە لەکردارەکانی ژیان و ئەم جیهانە و لەم جیهانەشدا چاکە و بەزەیی هیچ واتا و ڕاستیەك لەخۆ ناگرێت و ئەوەی لەم جیهانەدا ڕاست و بەرجەستەکراوە"تەماعی و بێبەزەیی و خواستە سێکسیەکان و ستەم"ە و یاساکانی ژیانیش لەسەر بنەمای ستەم و تەماعی و بێبەزەیی و ئارەزووە سێکسیەکان بنیات نراوە و مەحالە کەسێك بتوانێت بەپێچەوانەی ئەم یاسا ڕەهایانە ڕەفتار بکات، ئەو کەسانەش کە خۆیان بەکەسێکی خاوەن بەزەیی و میهرەبان و مرۆڤ دۆست پیشان دەدەن، درۆ دەکەن، چونکە تەنها مەبەستیان ئەوەیە لەمڕێیەوە خەلکی فریو بدەن، بۆئەوەی بتوانن باشتر ستەمیان لیٚ بکەن و تەماعی خۆیان دامرکێننەوە و کارە سێکسیەکانیان بەجوانی ئەنجام بدەن. ئەگەر باوەڕیش ناکەیت سینەیان لەت بکە و دلیان دەربهێنە و تەماشای بکە بۆئەوەی بزانی کورەی دلیان چ ئاگرێکی توڕەیی و تەماعی و کارە سێکسیەکانی تێدا ئاخێنراوە.

ئەگەر ناشتەوێت سینەیان لەت بکەیت بۆئەوەی تەماشای دلیان بکەیت، ئەوا ئەو ڕەفتارو کردارانە لەخۆت بنوێنە کە پێچەوانەی بەرژەوەندیوئارەزوی سێکسیەکانیان

بێت، بۆئەوەی بزانی بەچ شێوەیەك هەوڵی لەناوبردنت دەدەن، چونکە تۆ وێراوتە بەربەستێکی بچوك لەسەر ڕێی تەماعی و ئارەزووە سێکسیەکانیاندا دروست بکەیت؟

"سینۆهە" تۆ بێهودە چاوەڕێی ئەوە دەکەیت کە مرۆڤ لەوە باشتر خۆی بنوێنێت کە خودایان هێناونیانەتە بون، چونکە خودایان مرۆڤیان لەپێناو تورەیی و کینە و کارە سێکسیەکاندا هێناوەتە بون و مەحاڵە گۆڕانکاری لەسروشتی مرۆڤدا دروست ببێت.

"سینۆهە"تۆ بێهودە چاوەڕێی ئەوە دەکەیت کە بەتێپەڕبونی کات و تێپەڕبونی دە کەڕتی دە کەڕەتی دەیان ساڵ ببێتە هۆی ئەوەی چاکسازی لەجۆری مرۆڤدا دروست بکات.

تۆ بێهودە چاوەڕێی ئەوە دەکەیت کە جەنگو برسیەتیو تاعون و ئاگر و کوشتو کوشتار، ببێتە ئەزمونێکی باش بۆ مرۆڤ و بەو هۆیەوە چاکسازی لەخۆیدا دروست بکات.

ئەم ئەزمونانە وەك جۆرێکی نوێ و هاوشێوەی ژەهرەکانی ترە کە بیڕێژیتە سەر ئەو ژەهرە کۆنەی کە کراوەتە ناو کاسەیەکەوە و لەباتی ئەوەی کاریگەری ژەهرەکەی تر لەناو ببات بەهێزتر و کوشندەتری دەکات، بۆیە جەنگ و تاعون و کوشت و کوشتار و سوتاندن و تالانی، جۆری مرۆڤ خراپتر و دەغەزنتر و تەماعتر و شەرواڵپستر دەکات.

"سینۆهە"تۆش وەك ئەوانی تر مرۆڤیت، گەرچی خوێنی خودایان لەشاڕەگی خوێنبەرەکانتدا دەخرۆشێت، بەلام شێوەی مرۆڤێکت هەیە و وەك ئەوان لەگۆشت و خوێن دروست کراوی، بۆیە وانەزانی کە تورەیی و کینە و ئارەزوی سێکسی لەتۆدا نەبێت.

تۆ چاوەڕێی ئەوە مەکە کە مرۆڤێکی باش بدۆزیتەوە، چونکە مەحاڵە مرۆڤێکی باش لەم جیهانەدا بونی هەبێت، چونکە خودایان سروشتی ئەویان بەتورەیی و کینەو تەماعی و ئارەزووە سێکسیەکانەوە هێناوەتە بون و تەنها کاتێك مرۆڤ دەمرێت و لاشەکەی دەبەن بۆماڵی ژیان بۆئەوەی مۆمیای بکەن چاك دەبێت. هەر لەبەرئەوەش مرۆڤێکی چاك لەم جیهانەدا بونی نابێت، مەگەر ئەوەی بمرێت، چونکە جگە لەمەرگ هیچ شتێکی تر ناتوانێت بەسەر کینە و تورەیی و شەهوەتدا زاڵ ببێت.

"سینۆهه"ئەو ڕاستیەش بزانە کە زانستی جۆری مرۆڤ چاکسازی لەجۆری مرۆڤدا ناکات، بەڵکو تەماعتر و بێبەزەیی تر و شەروالپیستری دەکات و ئەو کەسەی"زانا"یە دە کەرەتی دە بەتەماعترە لەمرۆڤێك کە هەڵگری هیچ زانستێك نیە و بەهەمان ئەو ڕێژەیەش لەپیاوی نەزان زیاتر هەڵگری کینە و ئارەزوی سێکسیە.

"سینۆهه"تۆ ئەگەر"دانا"نەبوایەیت دوچاری ئەم کارەسات و تاوانانە نەدەبویت کە بەدرێژایی ژیانت ئەنجامت داوە....هەزارها کەس، بەهۆی ئەم زانستەی تۆوە لەبرسیەتی و نەخۆشیدا مردن یان بەهۆی چەکەوە بەکوشت دران یان بون بەژێر گالیسکە جەنگیەکانەوە و گیانیان لەدەست دا، یان لەڕێگا بیابانیەکاندا لەماندویەتی و برسیەتی و تینویەتیاندا گیانیان لەدەست دا.

ئەی پیاوی تاوانبار ئەگەر تۆ"زانا"نەبویتایە، منداڵەکان لەسکی دایکیاندا نەدەمردن و تێلا نەدەکەوت لەپشتی کۆیلەکانەوەو هەزاران ژن لەڕێی سەربازە خوێنمژەکانەوە دەستدرێژیان نەدەکرایە سەر و هەزاران پیاو نەدەبونە کۆیلە و ستەم بەسەر دادپەروەری و فێڵ و ساختەکاریش بەسەر ڕاستیدا سەرنەدەکەوت و لەمڕۆشدا دزەکان فەرمانڕەواییان بەسەر جیهاندا نەدەکرد.

تۆ بویت کە بە"ژەهر"فیرعەون"ئەخناتون"ت لەناو برد، فیرعەونێك کە خوازیاری ئاشتی و یەکسانی بوو لەناوت بردودەروازەی جیهانت بەڕوی خوێنمژو شەروالپیس و دزدا کردەوە.

هەزاران کەس کە ڕەنگی پێستیان جیاواز بوو لەڕەنگی پێستی تۆ بەهۆی ئەم زانستەی تۆوە مردن و هەزارها کەس کە نەیاندەتوانی بەزمانی تۆ قسە بکەن، وەك ئەوانی تر بێتاوان گیانیان لەدەستدا و تۆش بەرپرسیاری مەرگی ئەوانیت. تەنها تۆ بەرپرسی مەرگی ئەوانیت، هەر لەبەرئەوەش دەنگە دەنگ و ناڵە و گریان و فرمێسکی ئەوان، ناهێڵێت شەو خەوت لێ بکەوێت و چێژ لەخواردن وەرگریت.

ئەو ڕۆژەی لەگەڵ دڵ و ڕۆحمدا گفتوگۆم دەکرد دڵ و ڕۆحم لەوەڵامدا پێی وتم: "سینۆهه" تاوانەکانت شایستەی لێبوردن نیە و ئێمەش تا ئەوڕۆژەی تۆ زیندویت، ناهێڵین بگرە بۆ شەوێکیش بێت بەئاسودەیی سەر بنێیتەوە و بخەویت، لەبەرئەوەی تۆ کەسێکی"دانا"بویت و دەتزانی چی دەکەیت و دەست لەچ کارێکەوە دەدەیت، لەبەرئەوەش تاوان و بەرپرسیاریەتیەکانی تۆ زۆر مەزنن و شایستەی لێبوردن نیە.

ئەوکات منیش جلەکانی خۆمم دڕی و هاوارم کرد، نەفرەت لەم زانستە، نەفرەت لەو ڕۆژەی لەدایك بوم. نەفرەت لەم دەستانەش کە دوچاری ئەو هەموو تاوانانە بووە و نەفرەت لەچاوەکانیشم، کە ئەو هەموو کارەساتانەی من ئەنجامم داوە بینیوە ..... ترازوی"ئۆزیریس"[52]"م بۆ بهێنن بۆئەوەی دڵی تاوانبارم کێشانە بکات و پێی بڵێن کە چل مەیمونەکە ڕای خۆیان لەسەر ئەم کێشانەیە بخەنە ڕوو، چونکە تەنها ئەوان دەتوانن بڵێن کە ئایا من دوچاری هیچ تاوانێك بوم یان نە.

بەهۆی ئەو هاوارانەی کە لێم بەرز بویەوە"مۆتی"لەچێشتخانەکە هاتە دەرەوە و منی لەسەر جێگە خەوەکەم ڕاکشاند و شتێکی کوڵاوی تاڵ و پارچە قوماشێکی تەڕی خستە سەر نێوچەوانم، بەڵام هێورکەرەوەی دەرخوارد دام و کاتێك دەمویست لەجێگەکەم هەستمە سەرپێ و بڕۆمە حەوشەی ماڵەکەمەوە، ڕێی لێگرتم و وتی: ئەم کارە مەکە، چونکە نابێت خۆر بدات لەسەرت.

من بۆماوەیەك نەخۆش بوم و لەبەرخۆمەوە وڕێنەم دەکرد، هەندێکاتیش دەربارەی "ئۆزیریس"و ترازووەکەی دەدوام و هەندێکاتیش باسی"مریت"و"تهوت"م دەکرد.

دوای ئەوەی لەو نەخۆشیەم چاك بومەوە چیتر باسی"ئوزیریس"و"مریت و تهوت"م نەدەکرد، بەڵام لەهەمان کاتدا نەمدەتوانی فەرامۆشیان بکەم، لەبەرئەوەی "تهوت" کوڕی من بوو"مریت"یش دایکی بوو.

من دەزانم ئەو دوانە لەبەرئەوە مردن بۆئەوەی من تەنها بم، چونکە ئەگەر ئەو دوانە نەمردایەن، من تەنها نەدەبوم و خۆشبەختیش دەبووم، بەڵام خودایان منیان بۆ ژیان بەتەنها دروست کردووە و هەر لەبەرئەوەش لەو شەوەی لەدایك بوم، منیان خستە ناو سەبەتەیەکەوە و دامیان بەدەم ئاوی ڕوباری"نیل"ەوە. بەڵام سەرەڕای ئەوەش من باسی کوڕەکەم و دایکی و هەروەها ئەو کارانەی کە لەڕابردوودا ئەنجامم دابوو بۆ هیچ کەسێك نەکرد، بۆیە هیچ کاتێك کارەکانی ڕابردوم فەرامۆش نەدەکرد. دواجار ڕۆژێکیان جلێکی هەژاریم لەبەرکرد و لەماڵ چومە دەرەوە و شەویش نەگەڕامەوە بۆماڵ.

---

[52] ئوزیرویس": یەکێکە لەخودا کۆنەکانی میسر کە بەترازوو، دڵی مرۆڤی کێشانە دەکرد، بۆئـەوەی بزانێت کێشی چەنێکە، بەواتا تا چ ڕادەیەك چاکە و تا چ ڕادەیەك خراپەی کردووە و ئەوکات چل"مەیمون"ڕای خۆیان لەسەر دڵی ئەو کەسە دەدا...... بیروباوەڕی کێشانەی چاکە و خراپە لەمیسرەوە گواسترایەوە بۆ هەندێك وڵاتی تر.

دوای ئەوەی لەماڵ دەرچوم ڕۆشتم بۆ لەنگەرگا و لەوێ دەستم کرد بەکۆڵبەری کردن و زۆر بەزویی پشتم بەهۆی هەڵگرتنی ئەو بارە قورسانەوە بریندار بوو و کەمەریشم ئازاری تێکەوت.

کاتێك برسیەتی زۆری بۆ دەهێنام دەڕۆشتم بۆ بازاڕی سەوزی فرۆشەکان و بەخواردنی سەوزیە خراپ و بێکەڵکەکان کە لەو بازاڕەدا فڕێیان دەدا سکی خۆمم تێر دەکرد.

کاتێکیش پەیم بەوە برد کە چیتر ناتوانم کۆڵبەری بکەم، ڕۆشتم بۆ لای ئاسنگەرێكو بەتەکاندانی هەواکێشی کورەکەی تا ئەو کاتەی برینەکانی پشتم نەما و بەتەواوی چاك بویەوە و ئازاری کەمەرم نەما لای ئەو کارم کرد.

بەهەژار و نۆکەر و کرێکارەکانم دەوت کە هیچ جیاوازیەك لەنێوان مرۆڤەکاندا نیە، لەبەرئەوەی هەموویان بەڕوتی لەدایك بون، نابێت هیچ کەسێك لەڕوی ڕەنگی پێست یان زمان و شێوازی قسەکردن یان لەڕوی جل و گەوهەرەکانیانەوە بڕیاریان لەسەر بدەین، بەڵکو تەنها دەبێت لەڕێی دڵی مرۆڤەوە هەڵسەنگاندن و پێناسەی هەموو کەسێك بکرێت، بەم شێوەیەش پیاوێکی چاك لە پیاوێکی خراپ و پیاوێکی دادپەروەر لەپیاوێکی ستەمکار باشترە. بەڵام نۆکەر و کرێکارەکان پێم پێدەکەنین و دەیانوت"سینۆهە" تۆ شێت بویت، چونکە تا ئەو کاتەی مرۆڤ شێت نەبێت، لەکاتێکدا کە دەتوانێت بخوێنێت و بنوسێت، وەك نۆکەر و کرێکارەکان کرێکاری ناکات یان ئەوەتا تاوانێکت کردووە و دەیانەوێت لەبەرامبەر ئەم تاوانەتدا دەستگیریت بکەن و بەسزای خۆت بگەیەنن، هەرلەبەرئەوەش هاتویت بۆ ئێرە بۆئەوەی خۆت لەنێو ئێمەدا بشاریتەوە، یان گریمانەیەکی تر لەئارادەیە کە زۆر لەتۆوە نزیکە، ئەویش ئەوەیە کە تۆ لایەنگری"ئاتون"یت، چونکە ئەم قسانەت ئەوە دەسەلمێنن کە تۆ باوەڕێکی تەواوت بە"ئاتون"ە، لەکاتێکدا دەزانی هیچکاتێك نابێت ناوی"ئاتون"بهێنیتە زمان، ئێمە دەتوانین تۆ پیشانی کاربدەستان بدەین بۆئەوەی دەستگیرت بکەن و لەکانە کانزاکاندا بێگاریت پێ بکەن، بەڵام ئەم کارە ناکەین، چونکە تۆ بەم قسانەت

خۆشیمان پێدەبەخشیت و لە"دەلقەك"[52]"ێك زیاتر دەمانهێنیتە پێکەنین، بەڵام بەمەرجێك نەڵێیت کە ڕەنگی پێستی کەسەکان نابێتە هۆی جیاوازی مرۆڤەکان، چونکە تۆ بەم قسانەت سوکایەتیەکی مەزن بەئێمە دەکەیت، لەبەرئەوەی دەتەوێت بڵێیت کە ئێمە لەگەڵ ڕەشپێستەکاندا یەکسانین، لەکاتێکدا، بێگومان ڕەشپێستەکان لەئێمە ڕسواترن و ئێمە کە خەڵکی میسرین شانازی بەوەوە دەکەین کە ڕەنگێکی کراوەمان هەیە و شانازی بە ڕابردوی خۆمانەوە دەکەین و هیوامان بەئاینده هەیە، چونکە دەزانین لەجیهاندا نەتەوەیەك لە نەتەوەی میسر مەزنتر نیە و نابێت، تا جیهانیش بەوشێوەیە بمێنێت هیچ کەسێك ناتوانێت کۆشککەلێکی وەك "قوچەکیەکان"دروست بکات و وەك ئێمە مردووەکان بەشێوەیەك مۆمیا بکەن کە بەزیندویی و جاویدانی بمێننەوە، هەموویان دەمرن و لەناو دەچن، بەڵام نەتەوەی میسر دەمێنێتەوە، لەبەرئەوەی ئێمە شتگەلێکمان هێناوەتە بون کە بەهیچ شێوەیەك لەناو ناچێت.

لەبەرئەوەی ئێمە نامانەوێت تۆ ئێمە لەگەڵ کەسانی تردا بەیەکسان لەقەڵەم بدەیت، ئەگەر دەتەوێت لەنێو ئێمەدا بژیت، دەبێت ئەوە پەسەند بکەیت کە نەتەوەی میسر بەرجەستەترین نەتەوەی ئەم جیهانەیە.

منیش پێم دەوتن: کە بەدبەختی ئێوەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە نەتەوەیەك لەنەتەوەیەکی تر مەزنتر و بەرجەستەتر و چینێك لە لەچینێکی تر واڵاتر بزانن، تا ئەوکاتەی کەسێك یان نەتەوەیەك خۆی بەپێشەنگی کەسانی تر بزانێت، بەهیچ

---

[53] دەلقەك: وشەیەکی فارسیە و بەواتای"مهرج"عەرەبی دێت، کەسایەتیەکە کە بەشێوەیەکی سەیر و پێکەناوی خۆی دەڕازێنێتەوە و ڕەفتارگەلێك لەخۆی دەنوێنێت کە خەڵکی چواردەوری دەهێنێتە پێکەنین، من لێرەدا وەك وەرگێڕ پێم باشە ئەم ناوە فارسیە بەکار بهێنم تا ناوە عەرەبیەکەی چونکە نەتەوەی فارسی زمانەکان سەرەڕای ئەوەی سەرچاوەی نەژادیمان دەگەڕێتەوە بۆ نەژادی"ئاری"، پێم وایە نەتەوەی فارسی زمان و کورد زمان لەڕەچەڵەکدا یەك نەتەوەن چونکە گەر بگەڕێینەوە بۆ زمانی ڕەچەڵەکی فارسی دەبینین بێ لە زمانی عەرەبی و فەرەنسی و تورکی کە ئاوێتەی زمانەکەی بووە، ئەوەی دەمێنێتەوە وشە و زمانی"پەهلەوی"ەکانە کە زمانی"ماد"ەکانی باوباپیرانی ئێمە بون، بێگومان یەکێکیش لەپێناسە و ڕەچەڵەکی وڵاتێك زمانە و زۆر کەلتور و فەرهەنگی تری هاوبەشمان هەیە کە دەیسەلمێنێت ئێمە لەسەردەمانێکدا یەك نەتەوە بوین و جارێکیان هاوڕێیەکی ئەمریکاییم وتی باسی کوردم بۆ ئێرانیەکی دانیشتوی ئەمریکا دەکرد، ئەو پیاوەش وتی تۆ چی دەڵێیت زمانی کوردی دایکی زمانی ئێمەیە....وەرگێڕ

شێوەیەك زنجیر بۆ بەستنی دەست و پێی کەسانی بێدەرەتان و لاواز و تێلا بۆ کورتانی پشتی هەژاران و کرێکاران و نۆکەران، لەناو ناچێت.

لەبەرئەوە ڕۆژێك کەسێك دەڵێت: لەبەرئەوەی من کوڕی خوداکانم، خۆم بەپێشەنگی ئەوانیتر دەزانم ..... ڕۆژێکی تر هەندێك کەسیش دەڵێن: لەبەرئەوەی ئێمە زێڕ و زیومان هەیە، خۆمان بەپێشەنگی کەسانی تر دەزانین و ڕۆژێکی تریش دەستەیەکی تر پەیدا دەبن و دەڵێن لەبەرئەوەی ئێمە لەمەزنترین قوتابخانەی میسر"ماڵی ژیان"خوێندنمان تەواو کردووە و بوینەتە کەسێکی دانا و پسپۆڕ، خۆمان بەپێشەنگی کەسانی تر دەزانین، بەڵام مەبەستی تەواوی ئەم جۆرە کەسانە، هەروەها مەبەستی تەواوی ئەو کەسانەی کە تا کۆتایی جیهان بەهۆی ڕەسەنی خێزانی یان درێژی ڕیش یان بەهۆی ئەوەی خوێندنیان لە قوتابخانەیەکی مەزندا تەواو کردووە و خۆیان لەکەسانی تر بەمەزنتر دەزانن ئەوەیە کە بەردەوام بکێشن بەنێوچاونی کەسانی تردا و بەتێلاکاری پشتیان بریندار بکەن و وەك چوارپێکان هانی کارکردنیان بدەن و دەرئەنجامی کاری ئەوانیش ئەوەیە بەخۆڕای لەبەرامبەر تیکەیەك نان و پێکێك ئاوجۆیان پێ بدەن کاریان بۆ بکەن.

تا ئەو ڕۆژەی کەسێك یان نەتەوەیەك دەڵێت من لەوانی تر پێشەنگتر و ڕەسەنترم، کوشت و کوشتار لەناوناچێت و داڵەکەرخۆرە و کەمتیارەکانیش تێر لەلاشەی کوژراوەکان ناخۆن.

بۆیە دەبێت مرۆڤ لەڕێی دڵیەوە هەڵسەنگێنین، ئەگەر دەتانەوێت بزانن بۆچی خەڵکی لەبەرامبەر یەکتردا یەکسانن و یەکێك هیچ تایبەتمەندیەکی لەوانی تر زیاتر نیە ئەوەیە کە لەکاتی بەدبەختی و بەتایبەت لەو کاتانەی کە نەخۆشدەکەون و ئازار دەکێشن هەڵسەنگێنن، بۆئەوەی بزانن هەمویان بەیەك شێوە دەناڵێنن و ئەو فرمێسکەی لەچاوی هەموویان دەچکێتە خوارەوە یەك جۆرە، بەواتا فرمێسکی هەموویان سوێراوەو فرمێسکی چاوی سپی پێستێك جیاوازی لەگەڵ فرمێسکی چاوی ڕەشپێستێکدا نیە.

ئەو کەسانەی گوێیان لەم قسانەی من بوو قاقا پێدەکەنین و دەیانوت"سینوهە" بێگومان تۆ شێتیت، چونکە تەنها کەسێکی شێت بەوشێوەیە بیر دەکاتەوە کە مرۆڤێك نابێت خۆی بەپێشەنگی ئەوانتر بزانێت، چونکە ئەگەر کەسێك بەهۆی شتێکەوە خۆی

بەپێشەنگی کەسانی تر نەزانێت، ناتوانێت بژیت، بگرە هەژارترین و بێدەرەتانترین کەس بەهۆی شتێکەوە خۆی بەپێشەنگی ئەوانیتر دەزانێت و هەر بەهۆی ئەوشتەوە بەدڵگەرمیەکەوە لەژیانیاندا بەردەوام دەبن.

ئەوانەی حەسیر دەچنن، شانازی بەوەوە دەکەن کە پەنجەکانیان لەپەنجەی کەسانی تر شایستەترو لێهاتووترە و کەسێکی تریش لەبەرئەوە شانازی بەخۆیەوە دەکات کەشانێکی پان و بەرجەستەی هەیە. کەسێکیش کە کاری دوړوییە، شانازی بە ئازایەتی و فێڵەکانی خۆیەوە دەکات هەروەها ئەو دادوەرەی کە سزای دزێك دەدات، شانازی بەوەوە دەکات کە کەسێکی دادپەروەرە و پزیشك شانازی بەوەوە دەکات کە کەسێکی دانایە، کەسێکی پارەپەرستیش، شانازی بەپارەپیسی خۆیەوە دەکات و ئەو کەسەش کە وێلخەرجە خۆی بەخۆشبەخت دەزانێت، لەبەرئەوەی پێشەنگی کەسانی ترە، چونکە دەتوانێت وێڵخەرجی بکات. ژنێکیش بەهۆی پاکیزەییەوە خۆی بەپێشەنگی کەسانی تر دەزانێت و ئەو ژنەش کە لەشفرۆشی دەکات، لەبەرئەوەی دەتوانێت لەگەڵ هەموو پیاوێکدا ڕابوێرێت، خۆی بەپێشەنگی ژنەکانی تر دەزانێت.

ئێمەش کە کرێکار و نۆکەرین خۆمان لەتۆ"سینۆهە"کە دەتوانیت بخوێنیتەوە و بنوسیت بەپێشنگتر دەزانین، لەبەرئەوەی دڵنیاین کە لەتۆ ئازاتر و فێڵبازترین، کەواتە ئەم ئەندێشە شێتانە لەهزری خۆت پاك بکەرەوە، بۆئەوەی مرۆڤ بتوانێت بەشێوەیەك بژیت کە خۆی بەپێشەنگی ئەوانی تر بزانێت.

وتم: بەم شێوەیەش دادپەروەری لە ستەم باشترە.

بۆجارێکی تر کرێکار و نۆکەرەکان قاقا دەستیان کردەوە بەپێکەنین و وتیان: "سینۆهە"تۆ بەڕادەیەك سادەیت کە وا دەزانی لەشوێنێکدا دەژیت کە مرۆڤی تێدا نەبێت، دادپەروەری و ستەم شتێك نیە کە بتوانرێت لەیەك جیابکرێنەوە و لەجیهاندا هیچ دادوەرێك نیە کە بتوانێت ستەم لەدادوەری جیابکاتەوە، بەڵکو ئەوەی لەم جیهانەدا بونی هەیە لاواز و بەهێزە.

ئێمە ئەگەر تۆڵەی خۆمان لەخاوەندارێکی بێبەزەیی کەبەبەردەوامی نان و گۆشتو ئاوجۆی ئێمە دەدزێت و ژن و منداڵەکانمان برسی دەکات و بەبەردەوامی بەدار و قامچی پشتمان بریندار دەکات بکەینەوە و بیکوژین، بەبۆچونی خۆمان واهەست دەکەین کە دادپەروەریمان ئەنجامداوە، بەڵام یەکسەر دەستگیرمان دەکەن و دەمانبەنە

لای دادوەرێك و ئەویش فەرمانمان بۆ دەردەکات کە هەردوو گوێ و لوتمان ببڕن و سەرەوخوار بەداردا هەڵمانواسن تا ئەوکاتەی گیانمان دەردەچێت، بەڵام هەمان ئەو دادوەری کە ئێمەی بەسزای کوشتنی خاوەنداری بێبەزەیی بەکوشت دەدات ئامادە نیە خاوەندار بەسزای ئەو ستەمەی کە لەبەرامبەر ئێمەدا کردویەتی بەسزای شایستەی خۆی بگەیەنێت، چونکە ئەو بەهێزە و ئێمە لاوازین.

منیش پێم وتن: دادوەر مافی خۆیەتی کە ئێوە بەسزای کوشتنی خاوەندارەکەتان بەکوشت بدات، چونکە کوشتنی کەسێك بەهەر ناونیشان و بۆ هەر مەبەستێك بێت، بەڕسواترین و دزێوترین ڕەفتاری مرۆڤ لەقەڵەم دەدرێت.

ئەوانیش وتیان ئەگەر"هورم هب"ئەم قسانە لەدەمی تۆوە ببیستێت دەتنێرێتە کانە کانزانەکان و لەوێ بێگاریت پێدەکات، چونکە بەبۆچونی"هورم هب"هیچ شانازیەك لەوە مەزنتر نیە کە مرۆڤ بتوانێت سەربازە دوژمنەکانی لەگۆڕەپانی جەنگدا بکوژێت، بەڵام ئەگەر تۆ بتەوێت چاکسازی لەجۆری مرۆڤدا بکەیت و ستەم لەناو ببەیت، لەباتی ئەوەی لەگەڵ ئێمەدا قسە بکەیت، باشتروایە بڕۆیتە لای کەسە دەوڵەمەندەکان و ئەم جۆرە قسانە لەلای دەوڵەمەند و دادوەرە میسریەکاندا بکەیت، چونکە ئەگەر ئێمە خراپیش بین، کەرەستەیەکی وامان بەدەستەوە نیە کە خراپەکاری‌و ستەمکاریەکانمان ئەنجام بدەین، لەکاتێکدا ئەوان هەم کەسانێکی خراپن‌و هەم ستەمیش لەخەڵکی دەکەن. بەڵام ئاگات لەخۆت بێت لەبارەی فیرعەونەوە لەگەڵ دادوەرو دەوڵەمەندەکاندا نەدوێیت، چونکە تۆبەوە تاوانباردەکەن کە لایەنگری "ئاتون"یت و گوێ و لوتت بۆ دەبڕن و دوای ئەوە دەتنێرنە کانە کانزاکانەوە بۆئەوەی بێگاریت پێ بکەن.

سەرەڕای ئەوەی کرێکار و نۆکەرەکان ترساندبومیان، بەڵام من لەکاتی خۆیدا ئەو ڕاسپاردەو ئامۆژگاریانەی ئەوانم جێبەجێکرد. لەکاتێکدا کە جلی هەژاریم لەبەردابوو، لەناو شاری"تبس"دا بەڕێ کەوتم بۆئەوەی لەگەڵ دەوڵەمەندەکاندا بدوێم و ئەم پەیامەی خۆمم لە بازرگانەکانەوە دەستپێکرد.

بەو کەسانەی خۆڵیان تێکەڵی ئارد دەکرد و بەخەڵکیان دەفرۆشت، وت: ئەم کارە مەکەن چونکە تاوانە.

ئەو کەسانەش کە ئاشیان هەبوو و لەئاشەکانیاندا کاریان بەنۆکەرەکان دەکرد، بەڵام دەمیان دەبستن، بۆئەوە گەنمەکەیان نەخۆن دەوت: نابێت وەك ئاژەڵ مامەڵە لەگەڵ مرۆڤدا بکرێت.

هەروەها ڕۆشتم بۆلای ئەو دادوەرانەی کە سامانی هەتیوەکانیان دەخوارد یان بەرتیلیان وەردەگرت و بڕیاری نابەجێیان لەبەرامبەر خەڵکی بێتاواندا دەردەکرد، پێم وتن: دەست لەم کارە دزێوانە بکێشنەوە.

من پەیوەندیم بەتەواوی کەسە دەوڵەمەندو دەستەڵاتدارەکانەوە کردو سەرزەنشتی هەموشیانم کردوئەوانیش سەریان لەبستنی ئەم قسانەمدا سوڕ دەماو تەماشای جلەشڕەکانی بەریان دەکردمو دەمبیست کە بەهاوڕێکانی خۆیانیان دوت ئەم "سینۆهە"یە کە پیاوێکی هەژارە بێگومان سیخوڕی فیرعەونە و فیرعەون ئەوی ناردووە بۆئەوەی ئاگاداری بارودۆخ و بیروباوەڕی ئێمە بێت، ئەگینا کەسێك کە بەو ڕادەیە هەژار بێت، ناوێرێت ئەم جۆرە قسانە بهێنێتە زمان.

بەڵام بەزوویی کاربەدەستان و وەجاخزادەکانی میسر پەییان بەوە برد کە من سیخوڕی فیرعەون نیم و ئەو منی ڕانەسپاردووە کە ئەم جۆرە قسانەیان بۆ بکەم، لەبەرئەوە لەڕێی نۆکەرەکانیانەوە تێڵاکاریان دەکردم و لەماڵەکەیان دەریان دەکردم، دوای ئەوەی چەند جارێك بازرگانەکان منیان بەجەستەیەکی برینداریەوە لەشەقامەکانی"تبس"دا بینی پێیان وتم"سینۆهە"ئەگەر تۆ جارێکی تر بێیت و بەو قسانەت تاوانبارمان بکەیت، کە خۆڵ تێکەڵی ئارد دەکەین و سرکە تێکەڵی شەراب دەکەین و گۆشتی بۆگەن دەفرۆشین و دەمی نۆکەرەکانمان دەبەستین بۆئەوەی گەنمەکەمان نەخۆن، ئەوا ئێمە بەتاوانی درۆ و ناکۆکی نانەوە و تێکدانی ئاسایشی شار دەڕۆینە لای دادوەری شار و سکاڵایەك دژت بەرز دەکەینەوە.

کاتێك بینیم بانگەشەکانم بێسودن و ناتوانم ستەم لەناو ببەم و یەکسانی لەنێو خەڵکیدا بەرقەرار بکەم، هەروەها کەسێکیش نەبوو کە هەوڵی کوشتنم بدات، چونکە کوشتنی من سود بەهیچ کەسێك ناگەیەنێت، بۆیە گەڕامەوە بۆماڵ و لەژێر سێبەری درەختی پاڵ هەسێرە ئاوەکەدا دانیشتم و خۆم سەرقاڵی تەماشاکردنی ماسیەکان کرد و گوێم دەگرت لە سەرە سەرەی گوێدرێژ و گاڵەگاڵی منداڵان کە لەکۆڵاندا یاریان دەکرد،، تا ڕۆژێك"کاپتا"لەسوریاوە گەڕایەوە بۆ"تبس"و هات بۆ لام.

ئەو ڕۆژەی نۆکەرە پێشووەکەم خۆی کرد بەماڵدا، بەشکۆمەندیەکەوە لەسەر کەژاوەیەك کە دەوانزە کەس هەڵیانگرتبوو دانیشتبوو و عەتریشی دابوو لەجلەکانی بۆئەوەی کاتێك لەکۆڵانی هەژارانەوە تێپەڕێ هەست بەبۆنی بۆگەنی ئەو ناچەیە نەکات.

"کاپتا"قەڵەو ببوو و بینیم کە چاوێکی زێڕین و بەگەوهەر ڕازاوەی لەسەر چاوە کوێرەکەی داناوە، بەڵام کاتێك دانیشت لەبەرئەوەی ئەو چاوە زێڕینە ئازاری پێ دەگەیاند لایبرد و بەهۆی ئەم چاوپێکەوتنەی منەوە دەستی کرد بەگریان، دوای ئەوە هاتە گۆ و وتی: لەسوریادا خەریکە کۆتایی بەجەنگ دێت، چونکە"هورم هب"تەواوی ئەو شارانەی کە لەژێردەستی"هاتی"دا بوو داگیرکردەوە، تەنها شاری"کادش"ماوە کە لەئێستادا گەمارۆی داوە.

دوای ئەوە وتی: لەبەرئەوەی مافی کڕین و فرۆشتنی دەستەکەوتی جەنگەکان هەروەك خۆت دەزانی تایبەتن بەخۆم بوو، من لەکڕین و فرۆشتنی ئەم دەستکەوتە جەنگیانەدا سامانێکی زۆرم بەدەست هێنا و ئێستاش کە گەڕاومەتەوە لە"تبس"دا کۆشکێکم کڕیوە، ئێستا چەندین نۆکەر لەکۆشکەکەمدا سەرقاڵی نۆژەنکردنەوە و ڕازاندنەوەی کۆشکەکەمن، منیش چیتر فرۆشتنی مەی و مەیخانە لەم شارەدا ناکەمەوە، چونکە بەڕادەیەك دەوڵەمەند بوم کە چیتر پێویستم بەو جۆرە کارانە نیە.

ئەوکات دەربارەی من دەستی کرد بەقسە کردن وتی: "سینۆهە"گەورەم لەم شارەدا شتگەلێکی هەڕەشەئامێزم لەبارەی تۆوە بیستووە، پێیان وتم کە تۆ هانی هەژاران و نۆکەران و کرێکاران دەدەیت دژی دەوڵەمەندەکان ڕاپەڕن و بازرگان و دادوەرەکانی ئەم شارە بەکارگەلێکی دزێوەوە تاوانبار دەکەیت و منیش ئامۆژگاری ئەوەت دەکەم کە ئاگات لەخۆت بێت، چونکە ئەگەر بەردەوامی بەم ڕەوشەی خۆت بدەیت، ئەوا دەتنێرنە کانە کانزاکانەوە بۆئەوەی بێکاریت پێ بکەن، ئەگەر دەبینی تائێستا هیچ دەردیسەرییەکیان بۆ دروست نەکردوویت لەبەرئەوەیە کە تۆ دۆستی"هورم هب"یت و کەسە دەوڵەمەند و وەجاخزادە و کاهینەکانیش لە"هورم هب"دەترسن. ئێستاش پێم بڵێ چی بوە هۆی ئەوەی کەتۆ دوبارە دەست لەم کارە شێتانەوە بدەیت، لەوانەیە بتوانم هۆکاری ئەم شێتیەی تۆ لەناو ببەم.

منیش هاتمە گۆ و وتم: کە لەبەرچی بڕیارم دا بانگەشەی خۆم بەنێو خەڵکیدا بڵاو بکەمەوە.

"کاپتا"وتی: "سینۆهە"من لەڕابردوودا دەمزانی کە تۆ پیاوێکی سادە و بەلایەنی کەم شێتیت، بەڵام وام دەزانی کە بەتێپەڕبونی کاتو زۆری تەمەنت ببێتە هۆی ئەوەی چاکسازی دەرونی لەتۆدا بێتە بون، ئێستاش دەبینم کە تۆ کەسێکی بەتەمەنی و شێتیەکەشت لەباتی ئەوەی لەناو بچێت پەرەی سەندووە. لەکاتێکدا بەچاوی خۆت بینیت کە"ئاتون" چ بەدبەختیەکی لەم شارەدا هێنایە بون و بەچ شێوەیەك خەڵکی گرفتاری وشکەساڵی و نەخۆشی و نائارامی کرد. لەو باوەڕەدام ئەم ئەندێشانەی لەتۆدا دێنەبون، لەبەتاڵی و بێکاریتەوە سەرچاوە دەگرێت، لەبەرئەوەی چتیر کەسە نەخۆشەکان چارەسەر ناکەیت دوچاری ئەم جۆرە ئەندێشە و خەیاڵپلاویانە بویت، بۆیە ئەگەر وەکو ڕابردوو نەخۆشەکان تیمار بکەیت، تێدەگەیت کە چارەسەرکردنی نەخۆشێك زیاد لەسەد هەزار وشەی ئالەم جۆرە-کە هەم بۆ تۆ هەڕەشە ئامێزە و هەم بۆ ئەوانەی کە فریوی قسەکانی تۆ دەخۆن-چێژ و ڕازی بون لەتۆدا دروست دەکات.

ئەگەر نەتەوێت کاری پزیشکی بکەیت، خۆ دەتوانی وەك تەواوی دەوڵەمەندە بێکارەکانی تر خۆت بەکارەکانی ترەوە سەرقاڵ بکەیت. ئەگەر حەزت لەڕاو بکردایە، ئەوا لەمکاتەدا پێم دەوتی بڕۆ بۆ ڕاوکردنی ئەسپی ئاوی"غول"، بەڵام دەزانم کە ڕاوچی نیت و ئەگەر حەزیشت لە پشیلە بکردایە، پێم دەوتی وەك"پیپ ئامون"پشیلە بەخێو بکەو لەمڕۆدا ئەم پیاوە لەڕوی پەروەردەکردنی پشیلەی جوانەوە لە"تبس"دا ناوبانگیەکی تەواوی بەدەست هێناوە، بەڵام دەزانم کە تۆ ڕقت لەبۆنی پشیلەیە. بێ لەڕاو و بەخێوکردنی پشیلە دەتوانی کاتی خۆت بەچەند شتێکی ترەوە سەرقاڵ بکەیت، بۆنمونە لەبەرئەوەی تۆ دەزانیت بخوێنیتەوە و بنوسیت، دەتوانی کاتەکانی خۆت تەرخانی نوسین بکەیت، یان کتێبە کۆنەکان کۆبکەیتەوە، یان خۆت سەرقاڵی کۆکردنەوەی ئەوشتانە بکەیت کەتەمەنیان دەگەڕێتەوەبۆسەردەمی "قوچەکیەکان"یان ئامێر موزیکیە سریانیەکان کۆبکەیتەوە یان پەیکەرگەلێکی بچوكو بوکەڵەی ڕەشپێستەکان کە لەوڵاتی"کوش"وە دەهێنرێن کۆبکەیتەوە و لەهەموو ئەم شتانە باشتر ئەوەیە کە پاشماوەی تەمەنت بەئاسودەیی و خۆشیەوە تێپەڕێنی، ئەوکات

دەبینی کە ساڵێك لەتەمەنت بەئەندازەی مانگێك و مانگێکیش بەئەندازەی ڕۆژێك تێدەپەڕێت.

وتم: "کاپتا"تەماشاکردنی ئەو ستەمگەریانەی کە دژی مرۆڤ ئەنجام دەدرێن ناهێڵێت تەمەنم بەئاسودەیی تێپەڕێنم.

"کاپتا"وتی: گەورەم لەم جیهانەدا هیچ شتێك نابینم کە تەواو بێت و هەموو شتێکیش هەڵگری کەموکورتی تایبەت بەخۆیەتی و کاتێکیش نان لەتەنور دەهێنیتە دەرەوە، دەبینی کە لێوارەکانی سوتاون و کاتێکیش میوەیەك دەکەیت بەدوو لەتەوە بۆئەوەی بیبەیت بۆ دەمت دەبینی کە کرمێك لەناو میوەکەدایە و شەرابیش دوای ئەوەی شەو دەیخۆیت، لەبەیانی ئەو شەوەدا سەرئێشەیەکی ئازاربەخش و تەمەڵیەکی زۆر بەهێز لەتۆدا دروست دەکات، بۆیە چاوەڕێی ئەوە لەم جیهانە نەکەیت کە هیچ شتێکی تێدا نیە کە تەواو بێت، دادپەروەریەکی تەواوی تێدا بەدی بکەیت یان لەوانەیە مەبەستێکی چاکیش مەبەستێکی خراپی لێبکەوێتەوە، ئێمە بینیمان کەلەسەردەمی"ئەخناتون"دا سەرەڕای ئەوەی ئەو فیرعەونە مەبەستێکی باشی بۆ خەڵکی هەبوو، لەبڕیار و بیروباوەڕەکانی ئەو چ دەرئەنجامێکی زیانبەخش هاتە بون.

"سینۆهە"من کەسێکی ئاسایی و نەخوێندەوارم و شارەزای هیچ شتێك نیم، بەڵام لەبەرئەوەی چاوەڕێی ئەوە ناکەم دادپەروەریەکی تەواو لەم جیهانەدا بونی هەبێت، سود لەژیان دەبینم و ئەمڕۆش دادپەروەرانی ئەم شارە کڕنوشم بۆ دەبەن، چونکە دەزانن سامانێکی زۆرم هەیە، بەڵام"سینۆهە"تۆ سەرەڕای ئەوەی یەکێك بویت لەکەسایەتیە مەزنەکانی ئەم شارە و ئێستاش هەر هەیت و بەپزیشکی فیرعەون لەقەڵەم دەدرایت، ئەمڕۆ لەم وڵاتەدا بەئەندازەی نۆکەرێك ڕێز و گرنگیت پێ نادرێت، چونکە تۆ بەشێوەیەك ڕەفتارت کردووە کە بووەتە هۆی ئەوەی هەموو شتێکت لەخۆت بێبەش کردووە. گەورەم ئەگەر تۆ بەرپرسی بارودۆخی ئەم جیهانە بویتایە، مافی ئەوەت هەبوو کە خەمگین بیت، بەڵام تۆ کە جیهانت بەوشێوەیە دروست نەکردووە بۆچی خۆت وا ڕەنجاندووە کە بۆ لەم جیهانەدا دادپەروەری نیە، بۆیە گوێم لێبگرە و ئەم جۆرە قسانە وەلا نێ بۆئەوەی گرفتاری ئەم جۆرە ئەندێشانە نەبیتەوە، خۆت سەرقاڵی شتێکی تر بکە، ئەگەر بتوانی بەکارە پزیشکیەکانتەوە خۆت سەرقاڵ بکەیت، چی لەوە باشترە، چونکە من تۆ باش دەناسمو دەزانم کە چێژ

لەچارەسەرکردنی نەخۆشەکان وەردەگریت و ئەو خۆشیەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم جۆرە ئەندێشە و خەیاڵپلاویانە لەتۆدا نەیەنە بون.

وتم: "کاپتا"ئەم قسانەت کاریان تێکردم و ڕاستدەکەیت ئەگەر خۆم بەکاری پزیشکیەکانمەوە سەرقاڵ بکەم، چێژ لەچارەسەرکردنی نەخۆشەکان وەردەگرم و ئەم چێژوەرگرتنە لەڕوی دەرونیەوە هێورترم دەکاتەوە، بەلاّم تۆ لەکاتی قسەکردنەکانتدا ناوی"ئاتون"ت هێنا، لەکاتێکدا قەدەغەیە ناوی ئەم خودایە بهێنیت، ئایا کەسانێك هەن کە هێشتا باوەڕیان پێی هەبێت؟ چونکە ئەگەر ئەو جۆرە کەسانە نەبونایە، لەوباوەڕەدا نەبوم کە تۆ ئەم خودایەت بکەوتایەتەوە بیر.

"کاپتا"وتی: گەورەم خودای"ئاتون"وەك شاری"ئاسۆ"فەرامۆش کراوە، بەواتا چیتر کەسێك ئەو وەك خودایەك بەبیر ناهێنێتەوە، بەلاّم هێشتا هونەرمەندانێك هەن کە پەیڕەوی شێوازی هونەری سەردەمی"ئاتون"دەکەن و کەسانێکیش هەن کە چیرۆکەکانی سەردەمی"ئاتون"بۆ خەڵکی دەگێڕنەوە، هەندێکاتیش لەسەر خۆڵی زەوی یان دیوارەکان"خاچی ژیان"بەواتا خاچی"ئاتون" دەبینرێت. بۆیە سەرەڕای ئەوەی هیچ کەسێك باوەڕی بە"ئاتون"نەماوە بەلاّم هێشتا فەرامۆش نەکراوە.

وتم: "کاپتا"من لەسەر قسەکانی تۆ سەرلەنوێ دەست بەکارە پزیشکیەکانم دەکەمەوە و لەبەرئەوەی وتت بۆ تێپەڕاندنی تەمەن، دەبێت خۆم بەشتێکەوە سەرقاڵ بکەم و هەندێك شت کۆبکەم، منیش دەستەیەك لەو کەسانە کە هێشتا"ئاتون"یان فەرامۆش نەکردووە کۆدەکەمەوە.

"کاپتا"وای زانی گاڵتەی لەگەڵدا دەکەم، خۆی سەرقاڵی خواردنەوەی ئەو شەرابەی کە "موتی"بۆی هێنابوین کرد و منیش دەستم کرد بەشەراب خواردنەوە و بۆماوەی چەند ترازویەك سەرقاڵی گفتوگۆ بوین.

"کاپتا"سەرخۆش بوو، لەبەرئەوەی قەڵەو بوبو، نەیتوانی لەجێی خۆی هەستێتە سەرپێ، بۆیە نۆکەرەکانی هاتن و هەڵیانساند و لەسەر کەژاوەکەی دایاننیشاند و بردیان. بەلاّم ڕۆژی دوایی"کاپتا"بەدیاریگەلێکی گرانبەها کە بۆ منی هێنابوو خۆی کرد بەماڵدا و بڕێکی زۆر زێڕی پێدام و وتی: گەورەم هەرگیز مەهێڵە لەڕوی خۆشگوزەرانیەوە کەموکورتیت هەبێت، چونکە من ئەوەندە داراییم هەیە کەهەرچەنێك

زێڕت بوێت پێتی دەدەم و هەر لەبەرئەوەش ئەمڕۆ لەوە زیاتر زێڕت نادەمێ، چونکە لەوە دەترسم ئەوەی کە هەتە بیبەخشیتە هەژار و کرێکارەکان.

***

بەوشێوەیە لەو ڕۆژە بەدواوە تابلۆی پزیشکیەکەم بەدەرگاکەمەوە هەولواسی و نەخۆشەکانیش سەردانیان کردم و هەموو کەسێکیش بەئەندازەی توانای خۆی شتێکی پێدەدام، چونکە خۆم داوای کرێم لێ نەدەکردن، بەلآم بەئاگاوە دەربارەی "ئاتون" قسەم لەگەڵدا دەکردن.

لەبەرئەوەش بەئاگاوە لەبارەی"ئاتون"ەوە قسەم لەگەڵدا دەکردن چونکە نەمدەویست لێم بترسن‌و وا هەست بکەن کە من دەمەوێت هانیان بدەم باوەڕ بەخودای"ئاتون"بهێنن، چونکە ئەگەر لێم بترسانایە، ئەوا لەبارەی منەوە کە بەڕادەی پێویست لە"تبس"دا بەدناو بوبوم چەند هەواڵێکیان لەبارەی منەوە بلآو دەکردەوە.

بەلآم زۆر بەزوویی ئاگاداری ئەوەبوم کە"ئاتون"بەناونیشانی خودایەك بەتەواوی فەرامۆش کراوە و هیچ کەسێك باوەڕی پێی نیە، جگە لەو کەسانەی ستەمیان لێ دەکرێت و ڕێگایەکیان بەدەستەوە نیە کە مافی خۆیان وەرگرنەوە یان تۆڵەی خۆیان بکەنەوە، ستەم بەخاچی"ئاتون"دەسپێرن کە ئەو خاچە یان خودی"ئاتون"تۆڵەیان بکاتەوە، لەکاتێکدا دەیانزانی کە نە"ئاتون"تۆڵەیان دەکاتەوە و نە"خاچ"ەکەی.

دوای هەڵچونی ڕوباری"نیل"لەوەرزی پاییزدا"ئامی"فیرعەون"ی میسر کۆچی دوایی کرد و دوای مردنیشی ئەوە بەنێو خەڵکیدا بلآو بویەوە کە لەبرساندا مردووە، چونکە بەڕادەیەك لەژەهراوی کردن دەترسا کە بگرە ئەو نانەش کە لەبەرچاویدا دەیانبرژاند نەیدەخوارد، چونکە وای دەزانی کە گەنمی ئەو نانە ژەهراوی کراوە کە لەکێڵگەکاندا دەڕوا و گوڵی دەکرد.

*بەشی پەنجاو پێنجەم*

# "هورم هب" بو بە فیرعەونی میسر

**کاتێك "هورم هب"[٥٤] هەواڵی مەرگی"ئامی" پێدەگات، سەرەڕای ئەوەی گەمارۆی "کادش"ی دابوو دەستی لەو گەمارۆدانە کێشایەوە و ئەو شارەی بۆ"هاتی"ەکان بەجێ هێشت و لەسوریاوە گەڕایەوە بۆ میسر، بۆئەوەی لەمیسردا بگات بەدوا ئارەزوی خۆی و ببێتە فیرعەون.**

**هروم هب"ئامی" بە فیرعەونێکی ڕاستەقینە نەدەزانی و بەپێی ئەو پلانەی پێشتر دایڕشتبوو، دوای ئەوەی لەسوریا گەڕایەوە بانگەوازی ئەوەی کرد کە"ئامی" فیرعەونێکی درۆینە بووە و جگە لەجەنگ و خوێنڕشتن و بەدبەختکردنی میسریەکان ئارەزویەکی تری لەخۆیدا شك نەدەبرد، لەبەرئەوەی ئەو فیرعەونێکی درۆینە بووە،**

---

[54] ئـەم پیـاوە لەهەنـدێك فەرهەنگدا بـەناوی"هـورم هـب"نوسـراوە و خوێنـەرانی پێـشووی ئـەو لـەم کتێبـەدا کـە بەپێنوسـی"سـینۆهە"خوێندویانەتـەوە دوای مـەرگی"ئـامی" و گەڕانـەوەی لـە سوریا، دەبێتـە فیرعـەونی میـسر و لەمێژوی میسردا بنیاتنەری زنجیرەی نۆزدەیـەمی فیرعەونـەکانی میـسرە و لـەو زنجیرەیـەدا بێ لـەناوی"هورم هـب" زنجیـرە نـاوی تـری وەك"ڕامـسیس"ی کـوڕی"هـورم هـب" هـەر لەوکاتـەی کـە لەسـکی دایکـی"باکتـامون"دا بـووە نـاوی"ڕامـسیس"بـووە و لەمێـژووی میـسر یـازدە فیرعـەون بـەناوی"ڕامـسیس" بـانکراوە کـە هەنـدێکیان لـەزنجیرەی نۆزدەیەمی فیرعەونەکان بون و هەندێکیشیان لەزنجیرەی بیـستەم، پـسپۆڕانی مێـژوو دەزانـن کـە لەمیـسری دێرینـدا بیست و چوار زنجیرە لەفیرعەونەکان فـەرمانڕەواییان کـردووە کـە سـەردەمی فـەرمانڕەوایی هەنـدێك لـەو زنجیرانـە-بۆنمونـە وەکـوو زنجـیرەی نۆزدەیـەم کـە"هـورم هـب"بنیاتنـەری بـووە-درێـژەی کێـشا و "سـینۆهە" مێـژوی سـەرەتای فەرمانڕەوایی"هورم هب"ی لەم کتێبەدا دیاری نـەکردووە و وەرگێـڕی ئـەم کتێبـە لـەزمانی هێرۆگلیفیـەوە سـەرەتای فەرمارەوایی"هورم هب"دەگەڕێنێتەوە بۆ١٣٥٠ی پـێش زایـەن و خۆزگـە لەسـەرەتای زنجـیرەی هـەر فەرمانڕەواییـەکی فیرعـەونی کۆنـدا"سـینۆهە"یـەك ببوایـە و کتێبێکـی ئـا لەوشـێوەیەی بنوسـیایە بۆئـەوەی خـەڵکی بەباشـی ئاشـنای هەریەك لەزنجیرەی فەرمانڕەوایی فیرعەونەکان بونایە.

نابێت خەڵکی لەبەر مەرگی ئەو ماتەمینی گشتی بگێڕن، هەروەها ناشبێت لاشەکەشی لە دۆڵی فەرمانڕەواياندا بنێژرێت.

"هورم هب"دەرگای پەرستگای خودای جەنگی بەست و وتی: چیتر سەردەمی جەنگ کۆتایی پێهات و منیش هەرگیز خوازیاری جەنگ نەبوم، بەڵکو لەبەرئەوەی بەسەربازێك لەقەڵەم دەدرام، ناچاربوم ملکەچی فەرمانەکانی میسر بەتایبەت"ئامی" بومایە، کاتێکیش خەڵکی زانیان کە چیتر کۆتایی بەجەنگ دێت، هەلهەلیان بۆ"هورم هب"لێدا و گەڕانەوەی ئەو بۆ میسر بەخۆشبەختی خۆیان لەقەڵەم دا.

دوای گەڕانەوەی بۆ"تبس" هورم هب بانگی کردم و وتی: "سینۆهە"ی هاوڕێم، من لەوباوەڕەدام کە من و تۆ لەچاو ئەوکاتەی کە بۆ دوایین جار یەکتریمان بینی پیرتر بوین و منیش هیچ کاتێك قسەکانت فەرامۆش ناکەم کە دەتوت من پیاوێکی بێبەزیی و خوێنمژم، بەڵام دوای ئەم جەنگە، چیتر هیچ جەنگێکی تر بەرپا ناکەم، چونکە بەمەبەستی خۆم کەپاراستنی میسر بوو گەشتم و چیتر لەمەودوا هیچ بیانیەك ناتوانێت هەڕەشە لەمیسر بکات، چونکە من توانیم نێزەی"هاتی"ەکان تێك و پێك بشکێنم.

گەرچی"کادش"هێشتا لەدەستی"هاتی"ەکاندایە،بەڵام دوای ئەوەی "ڕامسیس"ی کوڕم گەورە بوو ئەو شارە داگیر دەکاتەوە و دوای ئەو کارە، لەمیسردا کارم ئەوە دەبێت کە تەختی فەرمانڕەوایی کوڕەکەم بتەوتر و بەهێزتر بکەم.

ئەمڕۆ"میسر"وەك گەوری پیاوێکی هەژار، پیسە، بەڵام دەبینی کە من ئەم گەورە بەجوانی پاك دەکەمەوە و ستەم لەناو دەبەم و لەباتیدا دادپەروەری بەرقەرار دەکەم، هەموو کەسێك لەمیسردا بەئەندازەی توانا و سەلیقەی خۆی پاداشت وەردەگرێت، بەواتا خەڵکی میسر دەبنە خاوەنی بارودۆخێکی وەك ڕابردوو کە سەردەمێکی درێژخایەنیان بەخۆشبەختیەوە تێپەڕاندووە، لەبەرئەوەی ئەم نەتەوەیە لەسەردەمی "توت ئانخ ئامون"و"ئامی"دا ئازارو ڕەنجێکی زۆریان بینیوە و برسیەتیەکی زۆریان کێشاوە، من ناوی ئەم دوو فیرعەونە لەمێژوی میسردا پاك دەکەمەوە، بەشێوەیەك کە وەك بڵێی ئەم دوو فیرعەونە هەر لەبنەچەوە بونیان نەبوبێت و لەم وڵاتەدا فەرمانڕەواییان نەکردووە، چونکە ناوی"ئەخناتون"یش خۆی بۆخۆی پاککراوەتەوە و فەرامۆشکراوە،بۆیە من دەستپێکردنی فەرمانڕەوایی خۆم لەوڕۆژەوە دەژمێرم کەبە

"شەهێن"ەکەی خۆم گەڕامەوە بۆ"تبس"و چاوم بەتۆ کەوت، بۆیە سەرەتای دەستپێکردنی فەرمانڕەوایی من لە"ئامن هوتب"ی سێیەمەوە دەست پێدەکات، چونکە"ئامن هوتب"ی سێیەم لەشەوێکدا کە بەیانی ڕۆژی دوایی، من لە"تبس"دا چاوم بەتۆ کەوت، ئەو ئەم جیهانەی بەجێهێشت.

ئەوکات"هورم هب" بەهەردوو دەستی سەری گرتو بینیم کە جەنگە درێژخایەنەکان و تێپەڕبونی ساڵەکان، چەند چرچ و لۆچیەکی لەڕوخساریدا دروست کردووە، ئەوکات"هورم هب" بەخەمێکەوە وتی:

ئەمڕۆ بارودۆخی میسر، جیاوازە لەسەردەمی لاویەتی ئێمە، لەسەردەمی لاویەتی ئێمەدا، هەژاران تێری سکی خۆیان نانیان دەخواردو لەماڵە گڵێنەی کۆیلە و کرێکارەکاندا ڕۆنی ڕووەکی بەدی دەکرا، بەڵام ئەمڕۆ، ڕۆنی ڕووەکی بۆ هەژاران وەکو زێڕی لێهاتووەو دەستیان پێی ناگات، بەڵام"سینۆهە"من سەردەمانی کۆن دەگەڕێنمەوە و کێڵگەکانی میسر ئاوەدان دەکەمەوەو لەکانە کانزاکاندا دەست بەکارکردن دەکرێتەوە و کەشتیە میسریەکانیش، دەڕۆن بۆ هەموو شوێنێك و زێڕ و زیوو مس خەزێنەی فیرعەون واتا خەزێنەکەی من پڕ دەکەن و منیش پەرستگاگەلێکی مەزن بنیات دەنێم و بەشێوەیەك ئەم وڵاتە ئاوەدان دەکەمەوە کە دە ساڵی تر ئەگەر زیندوو بیت، لەمیسردا هەژارێك و دەستەپاچەیەك نابینیت.

من لەم وڵاتەدا، کەسانی لاواز و گەندەڵەکان دەردەکەم، چونکە نابێت بونی ئەم جۆرە کەسانە، خوێنی نەتەوەی میسر ئالۆدە بکات و کوڕەکەم پێویستی بە پیاوگەلێکی بەهێزە کە دوای گەورەبونی بتوانێت هەموو جیهان بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

ئەم قسانە هیچ کارێکیان لەمن نەکرد و خۆشحاڵیشی نەکردم، بەڵکو بەپێچەوانەوە ڕۆحی خەمگین کردم و سەرم دانەواند و هیچ وەڵامێکی"هورم هب"م نەدایەوە.

ئەویش کاتێك تێگەشت کە من لەقسەکانی ناڕازیم، وتی: "سینۆهە"تۆ وەك ڕابردوو وایت و هیچ نەگۆڕاویت، هەروەك چۆن لەکۆندا ئەوکاتانەی بەچاوپێکەوتنت سەرم سوڕ دەماو تۆش کەرەستەی ئازاردانی منت فەراهەم دەکرد، ئێستاش هەروەکو ڕابردوو ئازارم دەدەیت، لەوکاتەدا چەنێك گەمژە بوم کە وام دەزانی بەبینینت خۆشحاڵ دەبم و دوای گەڕانەوەم بۆ"تبس"تۆ یەکەمین کەسبویت کە بانگم کردە لای

خۆم، بۆئەوەی بەبینینی خۆشحاڵ بم، هێشتا ژن و منداڵەکانی خۆمم نەبینیوە، بەڵام تۆ بەم بێدەنگی و بەو بەژن و باڵا خەمگینەتەوە، خەمی منت زیاتر کرد.

من لەسوریادا زۆر خەمگین بوم، چونکە کەسێکم شك نەدەبرد کە بتوانم بەئازادی گفتوگۆی لەگەڵدا بکەمو هەرجارێك لەگەڵ هەر کەسێکدا بدوێم، دەبوو بەخۆپارێزیەکەوە قسە لەگەڵدا بکردایە بۆئەوەی شتێکی نەگونجاو لەدەمم نەیەتە دەرەوە، بەڵام لەبەرئەوەی تۆ بەنهێنی پارێزی خۆم لەقەڵەم دەدەم، لەلای تۆ هەرچی بێت بەدەممدا دەیڵێم و لەوە ناترسم کە بەچ شێوەیەك لەگەڵ تۆدا قسە دەکەم، "سینۆهە"من جگە لەهاوڕێیەتی هیچ شتێکی ترم لەتۆ ناوێت، بەڵام تۆ ئەم هاوڕێیەتیە سادە و خۆڕا و بێدەردیسەریە لەمن تەنگ دەکەیت، چونکە دەبینم کە بەدیداری من خۆشحاڵ نیت.

منیش لەو کاتەدا هەردوو دەستم خستە سەر ئەژنۆم و لەبەرامبەریدا کوڕنوشم بۆ برد و پێم وت: "هورم هب"من تاکە کەسێکم لەهاوڕێیانی سەردەمی لاویەتیت کە تائیستا ماوم و بێ لەمن تەواوی هاوڕێیانی سەردەمی لاویەتیت مردون، باوەڕبکە کە من تۆم زۆر خۆشدەوێت. تۆ دەزانی کە هاوڕێیەتی من لەگەڵ تۆدا لەپێناو زێڕ و زیو نەبوو، هەروەها داوای پلەوپایەم لێ نەکردویت، لەڕابردوشدا بێئەوەی مەبەستێکی مادیم لەبەرامبەرتدا هەبوبێت تۆم خۆشویستووە و لەئایندەشدا بێئەوەی چاو ببڕمە سامان و داراییەکەت هەر خۆشم دەوێیت.

"هورم هب"تۆ لەمڕۆدا بەهێزترین پیاوی میسریتو هیچ کەسێك ناتوانێت ڕکابەریت بکاتو دەزانم کە بەم زوانە تاجی فەرمانڕەوایی دەکەیتە سەرتو لەسەرتەختی فیرعەونە مەزنەکانی ئەم وڵاتە دادەنیشیتو هەموو ناچار دەبن گوێڕایەڵی فەرمانەکاتن بن، لەبەرئەوەی دەستەڵاتت لەدەستدایە، داوات لێدەکەم کە سەردەمی خودایی و فەرمانڕەوایی"ئاتون"بگەڕێنیتەوەو تۆش گەر سەردەمی خودایی "ئاتون"بگەڕێنیتەوە"ئەخناتون" فیرعەونی کۆچکردوو لەخۆت ڕازی دەکەیت و قەرەبوی تاوانەکانی ڕابردومان دەکەیتەوە، خودای"ئاتون"بگەڕێنەرەوە بۆئەوەی هەموو خەڵکی لەبەرامبەر یەکتردا یەکسان بن و چیتر جەنگ لەناو بچێت.

"هورم هب"وتی: "سینۆهە"تۆ ئەگەر شێت نەبیت، ئەم قسانە ناکەیت، چونکە مەحاڵە خودای"ئاتون"بگەڕێنرێتەوەو ئەگەری گەڕانەوەشی ببوایە ئەوا هیچ سودێکی

نەبوو، ئەو قسانەی کە"ئاتون"دەیکردن وەك بەردێکی گەورە وابوو کە هەڵیدەنە ناو گۆمێکەوە کە بێ لە کەمێك دەنگ و شەپۆلان هیچ شتێکی تری لەدوای خۆیەوە ناهێنێت، بەڵام ئەم دەنگ و شەپۆلانە سود بەهیچ کەسێك ناگەیەنێت."ئەخناتون"کە لایەنگری"ئاتون"ی دەکرد وەك هەر کەسێکی تر لەژیانی سەردەمانی خۆی بەواتا سەردەمی هەنوکەی ڕازی نیە و دەیویست گۆڕانکاری بەسەردا بهێنێت، چونکە مرۆڤ بەوشێوەیە دروست کراوە کە لەژیانی سەردەمی هەنوکەی ناڕازی بێت و خۆزگە بۆ ژیانی سەردەمی ڕابردوش بخوات یان واهەست دەکات ژیانی ئایندەی لەژیانی هەنوکەی باشتر دەبێت، بۆیە "ئەخناتون"یش بەهۆی ئەم شێوازی بیرکردنەوانەیەوە بەڕادەیەك میسری هەژار کرد کە لەهیچ سەردەمێکدا هاوشێوەی نەبووەونابێت. بەڵام من بێئەوەی سەردەمی خودای"ئاتون" نوێ بکەمەوە، کارێك دەکەم کە جیاوازی نێوان هەژار و دەوڵەمەند، زۆر کەمتربێت لەو جیاوازیەی لەمڕۆدا هەیە و بۆ ئەو مەبەستەش فشار دەخەمە سەر دەوڵەمەندەکان کە سامان و دارایی خۆیان لەدەست بدەن، بگرە لەگوشینی خودایانی میسریش کە زۆر قەڵەون دەستپارێزی ناکەم.

لەبەرامبەردا بەشێوەیەك پیشەسازی و کشتوکاڵ و بازرگانی بۆ خەڵکانی هەژار ڕەواج دەکەم کەبتوانن خۆیان بگەیەننە ئاستی کەسەدەوڵەمەندەکان و بەمشێوەیە بێ ئەوەی"ئاتون" بگەڕێنرێتەوەو لەوڵاتی دوزمانی و دوڕویی و نائارامیدا بێتەبون، مەبەست و ئاواتەکانی بهێنرێنە دی.

بەڵام بەهیچ شێوەیەك لەقسەکانی من تێناگەیت، چونکە پیاوێکی لاوازیت، پیاوی لاوازیش ناتوانێت پەی بە بڕیار و پلانی پیاوێکی بەهێز ببات و پیاوی لاواز وەك نەتەوەیەکی لاواز بۆئەوە هاتووەتە بون کە پێشێل بکرێت و تا جیهانیش بەو شێوەیە بمێنێت، ئەم بنەمایە فەرمانڕەوایی خۆی دەکات و دوای ئەوەش هەر وا دەبێت.

من زۆر لەدواین گوتەکانی"هورم هب"دڵگیربوم و پەیم بەوە برد کە لەخۆبایی سەرکەوتن و دەستەڵاتەکانی بەشێوەیەك ئەوی سەرمەست کردووە کە چیتر پاشماوەی هاوڕێ کۆنەکانی سەردەمی لاویەتی خۆی کە لەکۆنەوە بۆی ماوەتەوە ناناسێت و قسەی ناشیرینیشی پێدەڵێت و زۆر بەسەختیش توانیم خۆمی لێ دور بخەمەوە، هەروەها پەیم بەوە برد کە چیتر، لەنێون من و ئەودا دۆستایەتی کۆنمان شایەنی بەردەوامی نیە.

دوای ئەوەی ڕۆشتم، بەو شێوەی کە بیستم"هورم هب"ڕۆشت بۆ لای ژن و منداڵەکانی و بە"باکتامون"ی وت: ئەی ژنە شاهانەکەم، لەو ماوەیەی کە من لەسوریا بوم، هەموو شەوێك ئەندێشەی تۆ وەك ڕوناکی مانگە شەو منی ڕوناك دەکردەوە و منیش دەمویست کارێك بکەم کە شایستەی هاوسەریەتی ژنێکی وەك تۆ بم، بەڵام دوای ئەوەی بەو شێوەی خۆشت لایەنگری دەکەیت، من ئەو توانایەم تێدایە و تۆش لەتەنیشت منەوە لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی میسر دادەنیشی، بۆیە قەدری ئەم فەرمانڕەواییە بزانە، چونکە من بۆئەوەی تۆ لەسەر ئەم تەختە دانیشێنم، خوێنێکی زۆرم ڕشتووە و شارگەلێکی زۆریشم وێران کردووە، بۆیە ئێستا چاوەڕێی پاداشتی خۆم دەکەم.

"باکتامون"زەردەخەنەیەکی کردو دەستی خستە سەر بازوی بەهێزی"هورم هب"و وتی: ڕاستە کە تۆ پاداشتت لەمن ورگرتووە و هەر لەبەرئەوەش ئەوکاتانەی تۆ لێرە نەبویت، کۆشکێکم بۆ خۆم دروست کردووە و لەبەرئەوەی منیش لەتەنهاییدا بێتاقەت بوم، بۆیە خۆم بەردی ئەو کۆشکەم فەراهەم کردووە، ئێستاش وەرە بڕۆینە ناو ئەو کۆشکەوە، بۆئەوەی پاداشتی خۆت لەباوەشی مندا وەرگریت، "هورم هب"یش زۆر دڵی بەو قسانە خۆش بوو و شازادە خانمیش ئەوی لەباخەوە تێپەڕاند.

کاتێك دانیشتوانی کۆشکی زێڕین بینیان"باکتامون"ئەو دەبات بۆ لای ئەو کۆشکەی کە خۆی دروستی کردووە، بەڕادەیەك ترسیان لێ نیشت کەبووە هۆی ئەوەی هەموویان خۆیان بشارنەوە، بگرە نۆکەر و خزمەتکاری گەورەکانیش هەڵهاتن، چونکە پێشبینی ئەوەیان دەکرد، کاتێك"هورم هب"بزانێت کە ئەو کۆشکە بەچ شێوەیەك دروست کراوە، خوێن هەڵدەستێت.

کاتێك گەشتنە لای ئەو کۆشکەوە"هورم هب"ویستی شازادە خانم لەباوەش بگرێت، بەڵام ئەو ژنە وتی: "هورم هب"کەمێك خۆت ڕابگرە، بۆئەوەی من بتوانم پێت بڵێم کە ئەم کۆشکە بەچ شێوەیەك دروست کراوە، ئایا لەبیرتە کە دواهینجار بەزۆر لەئامێزت گرتم، چیم پێ وتی؟ئایا لەبیرتە کە لەوە ئاگادارم کردیتەوە خۆم دەدەمە دەست هەموو پیاوێکەوە؟منیش لەبەرامبەردا بەڵێنەکەی خۆم بەجێ هێنا و تۆش ئاگاداری ئەوە بە کە هەر یەك لەو بەردانەی لەم کۆشکەدا بەکارهێنراوە، لەلایەن پیاوێکی بێگانەوە کە لەگەڵ مندا ڕایبواردووە بۆم هێنراوە و هەریەك لەبەردەکانی ئەم

کۆشکە یەکێك لەیادگاریەکانی پەیوەندی سێکسی من لەگەڵ پیاوێکی بێگانە و نەناسراو بەبیر دەهێنێتەوە و من ئەم کۆشکەم بۆتۆ دروست کردووە بۆئەوەی تۆڵەت لێ بکەمەوە و هەرکاتێکیش یەکێك لەو بەردانەی کە لەبەرامبەر ڕابواردنێکدا لەپیاوێکم وەردەگرت، بەتەواوی خۆم و ناو و ناوبانگی خۆمم پێ دەناساند، بۆئەوەی بزانێت هاوسەری"هورم هب"ی فەرماندەی لەشکر و سوپاسالاری مەزنی میسری لەباوەش گرتووە، بگرە بۆ جارێکیش بابەتی ئەو خۆپێناساندنەم لەبیر نەدەچوو.

بۆنمونە ئەم بەردە سپیەی کە دەیبینی، پیاوێکی ماسیگر بۆی هێناوم و ئەو بەردە سەوزەش دەبینی خەڵوز فرۆشێك بۆی هێناوم و ئەم حەوت بەردە خورماییەش دەبینی سەوزە فرۆشێکی بەهێز پێشکەشی کردوم، "هورم هب"ئەگەر تۆش تاقەتت هەبێت، هەموو ڕۆژێك سەرگوزەشتی یەکێك لەم بەردانەت بۆ دەگێڕمەوە و هەر شەوێکیش سەرگوزەشتی یەکێك لەو بەردانەت بۆ دەگێڕمەوە و لەوە دڵنیات دەکەمەوە کە هەر سەرگوزەشتێك لەسەر گوزەشتەکەی تریان خۆشترە، منیش لەبەرئەوەی هەر جارەو لەباوەشی یەکێك لەئاشقە کاتیەکانمدا کاتم بەسەر دەبرد، هەستم بەخۆشی و چێژێکی جیاواز دەکرد و دڵنیاشم کاتێك تۆ سەرگوزەشتی ئەم بەردانە لەدەمی منەوە ببیستی، زیاتر چێژ لەڕابواردنی من وەردەگریت، چونکە ئەم جۆرە داستانانە بۆ ئەو پیاوەی دەیەوێت لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ڕابوێرێت، وەك خوێی چێشت وایە و ئێستا چاوێك بەم کۆشکەدا بخشێنە و بزانە چەند بەرد لەم کۆشکەدا بەکار هێنراوە و بیانژمێرە بۆئەوەی بزانی ئەوکاتانەی تۆ لێرە نەبویت لەگەڵ چەند کەڕەتی چەند پیاودا ڕامبواردووە، هەروەها بەشێوەیەکی گریمانە بیانژمێرە و ئەگەر من سەرگوزەشتی ئەم بەردانەت بۆ بگێڕمەوە، داستانەکانم بۆ ماوەی چەند ساڵێك درێژە دەکێشێت.

من لەوباوەڕەدام کاتێك دەست بەگێڕانەوەی داستانەکانی خۆم بکەم، سەرگوزەشتی ئەم بەردانە ئەوەندە درێژە بکێشێت کە لەوانەیە پیر بین، بەڵام من هێشتا کۆتاییم بەداستانەکانی خۆمم نەهێنابێت.

"هورم هب"وای زانی کە شازادە خانم گاڵتەی لەگەڵدا دەکات، بەڵام کاتێك تەماشای چاوانی"باکتامون"ی کرد کە لەچاوانیدا کینەیەکی ترسانکتری وەك تۆڵەی کوشتی هەست پێدەکرا.

ئەوکات تێگەشت کە ئەو ژنە ڕاست دەکات و چەقۆی ئاسنینی خۆی کە لەوڵاتی "هاتی"دروستیان کردبوو بەدەستەوە گرت، بۆئەوەی"باکتامون"ی پێبکوژێت.

بەڵام شازادە خانم جلەکانی بەری تاخوار هەڵدڕی و سینە ڕوتی پێنیشان دا و هاواری کرد لێی بە...دەلێیبە.. چەقۆکەت بچەقێنەرە ناو سینەمەوە بۆئەوەی ئارەزوی فەرمانڕەوایی میسر ببەیت بۆ جیهانێکی تر، چونکە من هەم کچی"فیرعەون"م و خودای پەرستگای"سخ مت"م و ئەو کەسەی کچێکی فیرعەون و خودایەك بکوژێت، هیچکاتێك بەدەستەڵات و فەرمانڕەوایی خۆی ناگات.

"هورم هب"دوای بیستنی ئەو قسانە هێور بویەوە، چونکە تێگەشت کە شازادە خانم ڕاست دەکات و فەرمانڕەوایی خۆی بەبونایەتی ئەوەوە پەیوەست کراوە و ئەگەر ئەو ژنە بکوژرێت، هەرگیز نابێتە فیرعەونی میسر.

شازادە خانم"باکتامون"بەشێوەیەك تۆڵەی لەهاوسەرەکەی کە بەزۆر کردبویە هاوسەری خۆی کردەوە، کە هەرگیز نەبیستراوە کە ژنێك بەزۆر کرابێت بەهاوسەری پیاوێك بەو شێوەی تۆڵەی خۆی لەهاوسەرەکەی بکاتەوە و بگرە"هورم هب"یش نەیوێرا ئەو کۆشکە وێران بکات و بەردەکەشی بۆ شوێنێکی تر بگوازێتەوە. چونکە ئەگەر ئەو تەلارەی بڕوخاندایە و بەردەکانی بگواستایەتەوە بۆ شوێنێکی تر، ئەوەی بۆ خەڵکی دەسەلماند کە دەزانێت ئەو کۆشکە بەچ شێوەیەك بنیاتنراوە.

ئەوەبوو خۆی بە بێئاگا لەقەڵەم دا و واخۆی نیشان دا کە نازانێت ژنەکەی ئەو کۆشکەی بەچ شێوەیەك دروست کردووە و توانج و گاڵتەپێکردنی خەڵکی بە بەهای گیانی خۆی کڕی.

بەڵام لەو ڕۆژە بەدواوە، لەگەڵ "باکتامون"دا نەخەوت، هەروەها دەبێت ئەوەشتان پێ بڵێم کە شازادە خانم بەتەواوی گۆڕانکاری لەڕەوشی خۆیدا دروست کرد و چیتر کەسێك نەیبینی لەگەڵ پیاوێکی بێگانەدا ڕابوێرێت.

ئەوکات"هورم هب"بەشێوەیەکی ئاشکرا بوو بە فیرعەونی میسر و لەپەرستگادا تاجی میسری کردە سەر، بەڵام من پەیم بەوە برد کە لەهەمان ئەو کاتەی کە کاهینەکان ڕۆنیان لەسەر و جەستەی دەماڵی و تاجی فەرمانڕەواییان دەکردە سەر لەناخەوە خەمگین بوو، چونکە دەیزانی هەموو ئەو کەسانەی لەو پەرستگایەدا ئامادەن، لەناخەوە گاڵتەی پێدەکەن و پێی پێدەکەنن و چاویان بەهیچ یەك لەشانازیە

سەربازیەکانی ناکەویت، بەلام لەباتی ئەو شانازیانەدا بەردی کۆشکی"باکتامون" لەهزری خۆیاندا دەژمێرن.

دوای ئەوەی"هورم هب"بوبە فیرعەونی میسر، بەلایەنی کەم لەهەموو کەسێك بەدگومان بوو، لەبەرئەوەی لەهزریدا وا لێکی دەدایەوە کەلەپشتیەوە هەموویان گاڵتەی پێدەکەن و ئەم بابەتەش وەك تیرێك وابوو کە چەقیبێتە کۆمیەوە و نەتوانێت دەری بهێنێتەوە، بۆئەوەی ئەم خەمەی فەرامۆش بکات خۆی بەکارێکەوە سەرقاڵ دەکرد، هەروەها بەوشێوەی خۆی دەیوت: بڕیاری دا کە گەورێکی پیس بگۆڕێت بەشوێنێکی پاك و ستەم لەناو ببات و دادپەروەری لەجێگەیدا نیشتەجێ بکات.

منیش بۆئەوەی نادادپەروەرانە لێکدانەوەکانی خۆم نەکەم، دەبێت بڵێم سەرەڕای ئەوەی کاتێك"هورم هب"لەدایکبوو نێوان پەنجەی پێکانی پڕبوو لەسەنێری چوارپێکانو سروشتێکی فەرمانڕەوایی نەبوو، بەلام دوای ئەوەی بو بە فیرعەونی میسر خۆی وەك فیرعەونێکی شایستە نیشانداو هێشتا چەندساڵێك لەفەرمانڕەواییەکەی تێنەپەڕیبوو، دەستکرا بە سوپاسگوزاری کردنی و ئەویان بەیەکێك لە فیرعەونە مەزنەکانی میسر لەقەڵەم دا.

یەکێك لەوکارانەی کە"هورم هب"ئەنجامی دا کە هیچ یەك لەفیرعەونەکان بیریان لەوکارە نەکردبویەوە ئەوەبوو کە ڕوکەشپەرستی لەنێوان کاربەدەستان و کارمەندانی دەوڵەت و لەشکرەدا بەتەواوی لەناو برد.

"هورم هب"تێگەشت هۆکاری گەندەڵی کاربەدەستانی میسر و کارمەندانی دەوڵەت ئەوە نیە کە پێویستیان بە گۆشتو نان بێت، بەڵکو لەبەرئەوە گەندەڵ بون کە لەبواری ڕوکەش پەرستیدا ڕکابەری یەکتریان دەکردو هەرکەسێك دەیویست کۆشکێکی جوانتری لەفەرمانڕەواکانی تر هەبێتو لەماڵەکەی خۆیدا نۆکەرو کەنیزەکێکی زۆرتر ڕابگرێتو هەموو ڕۆژێك یان هەمووشەوێك سەرگەرمیەکی نوێ بۆخۆی فەراهەم بکات.

ئەو زانی تائەوکاتەی ڕکابەری ڕوکەشپەرستی لەنێو کاربەدەستانی میسرو کارمەندانی دەوڵەتو لەشکردا هەبێت، مەحاڵە بتوانرێت گەندەڵی لەناو ببرێت، چونکە پێویستیەکانیان سنورێك لەخۆناگرێت کەبتوانین بڵێین کاتێك پێویستیەکانیان دابین کرا، چیتر دزی لەخەڵکی دەوڵەت ناکەن یان بەرتیل لەخەڵکی وەرناگرن.

"هورم هب"لەمیسردا یەکەمین فیرعەونە کە موچەی کۆکەرەوانی باج و سەرانە و دادوەرانی لەخەزێنەی دەوڵەتدا دیاری کرد، نەك لەو برە پارەیەی کە لەسەرانە یان لەخەڵکی وەریاندەگرت و کۆیاندەکردەوە.

پێش"هورم هب"نەریت وابووە کە کۆکەرەوانی باج و سەرانە، بەپێی ئەو بەڵێنامەیەی کە لەگەڵ دەوڵەتەدا دەیبەست چەنێك باج لەناوچەیەك کۆ بکاتەوە، ئەوکات چەند ئەوەندەی ئەو باجەی کە دەوڵەت بۆی دیاری کردبون لەخەڵکیان دەسەند.

"هورم هب"ئەم نەریتەی لەناو برد و باج و سەرانەی هەر ناوچەیەکی بەشێوەیەکی یەکلایی کەرەوە دیاری کرد و موچەی کۆکەرەوانی باج و سەرانەشی لەخەزێنەی دەوڵەتدا دیاری کرد و پێی دەدان، بۆئەوەی نەتوانن لەبەرامبەر مافی ماندوبونیاندا فشار بخەنە سەر خەڵکی.

دەربارەی دادوەرانیش هەمان بڕیاری لەسەردان و بۆهەر چینێکیان موچەیەکی دیاری کرد کە لەخەزێنەی دەوڵەت بۆیان خەرج دەکرا، هەروەها دادوەرانیش مافی ئەوەیان نەبوو لەبەرامبەر ئەو کارەی ئەنجامی دەدات زێڕ و زیو لەوکەسانەی سەردانیان دەکرد وەرگرێت.

"هورم هب"بۆئەوەی ئەم ڕوکەشپەرستیە لەناو ببات، لەخۆیەوە دەستی پێکرد، چونکە دەیزانی تاخودی فیرعەون دەست لەم ڕوکەشپەرستیە هەڵنەگرێت، میسریەکان دەست لەڕوکەشپەرستی هەڵناگرن‌و بەسادەیی لەگەڵ کۆمەڵێك لەسەربازەکانی خۆی بەبەردەوامی لەناو میسردا دەسوڕایەوەو لەدوایەوە گوێ و لوتێکی زۆری کۆکەرەوانی باج و سەرانەو دادوەرانی نادادەوەریان فڕێدرایە سەر زەوی، چونکە"هورم هب"بێ بەزەییانە گوێ و لوتی ئەم جۆرە کەسانەی دەبڕی و دەیناردن بۆ کانە کانزاکان بۆئەوەی بێکاریان پێ بکات.

کارەکانی تر کە"هورم هب"لە میسردا ئەنجامی دان ئەوەبوو، لەکاتێکدا بەبەردەوامی لەناو شاردا دەسوڕایەوە، ئازادی دا بەخەڵکی کە هەرکەسێك سکالایەکی لەدادوەر و کۆکەرەوانی باج و سەرانە و کارمەندەکانی تری دەوڵەت هەیە، ڕاستەوخۆ سەردانی خۆی بکات و هەژارترین جوتیار دەتوانێت بێ هیچ تکایەك لە"هورم هب"نزیك بێتەوە و سکالای خۆ بکات و کاتێك فیرعەونیش سکالای کەسێکی

پێدەگەشت، لەو شوێنە نەدەڕۆشتە ناوچەیەکی ترەوە، مەگەر ئەوەی کاتێك لێپێچینەوەیەکی تەواوی لەسکاڵای جوتیارێك کردبێت ئەو کات دەڕۆشت بۆ شوێنێکی تر.

کاریگەری ئەم ڕەوشەی"هورم هب"لەیەك ڕۆژ و دوو ڕۆژێکدا دەرنەکەوت، بەڵکو وردە وردە کاریگەری ئەم ڕەوشە لەمیسردا دەرکەوت وچیتر کۆکەرەوانی باج و سەرانە نەیاندەوێرا بەزیانی خەڵکی و بەتایبەت جوتیاران دەوڵەمەند بن، چیتر دادوەرانیش نەیانتوانی بە وەرگرتنی بەرتیل بڕیارگەلێکی ناحەق لەسەر کەسانی بێتاوان دەربکەن و فەرمانڕەوایانی میسریش وەك کۆکەرەوانی باج و سەرانە و دادوەران ناچارکران کە کەمێك لەتەماعیەکانی خۆیان کەم بکەنەوە. لەلایەکەوە سامانی کاربەدەستانی دەوڵەتی میسر و وەجاخزادە و دەوڵەمەندەکان کەم دەبویەوە و لەلایەکی تریشەوە خەڵکی هەژار لەبەرامبەر ئەوەی چیتر ستەمیان لێ ناکرێت و کەسێك سامانەکانیان لێ زەوت ناکات دەستڕەنجی کارەکانیان بۆ خۆیان دەگەڕایەوە و وردە وردە گەشەیان بەخۆیانەوە دەبینی و دەبونە خاوەن سامان و دارایی دەستڕەنجی خۆیان. کەشتیەکانی میسریش بەبەردەوامی لەنێوان نیشتمانی ڕەش و شانشینەکانی تردا لەحاڵی هاتوچۆدا بون، ئەگەر لەدە کەشتی کە دەڕۆشت بۆ ناو دەریا پێنج کەشتیان نوقم ببوایە، ئەوا ئەو پێنج کەشتیەکەی تریان بەڕادەیەك کاڵای گرانبەهای لەگەڵ خۆیدا دەهێنا بۆ میسر کە سەرەڕای قەرەبوی زیانی پێنج کەشتیە نوقمبوەکەی تری دەدایەوە، قازانجێکی زۆریشی لەو کاڵایانە بۆ دەمایەوە.

"هورم هب"بەڕادەیەك هەوڵی لەناوبردنی ستەم و ئاوەدانکردنەوەی میسری دا کە لەپەرستگای"هت نت سوت"ئەویان وەك خودایەك دەپەرست و"گا"یان بۆ دەکرد بەقوربانی و دواجار"هت نت سوت"و"هورم هب" بون بەیەکێك.

"کاپتا"نۆکەری پێشوم، لەکاتێکدا وەجاخزادە و دەوڵەمەندەکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەژارتر دەکەوتن، ئەو تا دەهات شتێکی زیاتری دەخستە سەر داراییەکەی خۆی و کەسێك نەیدەتوانی ڕێی دوڵەمەند بونی لێ بگرێت، چونکە ئەو کە هیچ کوڕێکی نەبوو"هورم هب"ی کردە میرات گری خۆ، بۆئەوەی بتوانێت بەئاسودەیی بژیت و هەرلەبەرئەوەش"هورم هب"ڕێی لەدەوڵەمەندبونی نەدەگرت و کاربەدەستانی باج و سەرانەش فشاریان نەدەخستە سەری.

"کاپتا" زۆرجار بانگێشتی کۆشکەکەی خۆی دەکردم کە دەکەوتە گەڕەکی کەسە دەوڵەمەندو وەجاخزادەکانەوە و لەبەرئەوەی خاوەنی باخێکی مەزن بوو، دراوسێکانی نەیاندەتوانی ببنە مایەی سەرئێشەبۆی.

"کاپتا"کۆشکەکەی خۆی لەشێوەی ئەو کۆشکانەی کە ئێمە لە"کریت"دا بینیبومان ڕازاندەوە، لەژورەکانی کۆشکدا، ئاو بەنێو لولەیەکدا تێدەپڕی و لەسەرئاوەکانی کۆشکدا وەك سەرئاوی ماڵەکانی"کریت"بەبەردەوامی ئاو دەڕۆشت، و هەرجارێك کاتێك من دەڕۆشتم بۆ کۆشکەکەی ئەو، دەمبینی کە ئەو لەقاپی زێڕیندا نان دەخوات و لەکاتی نانخواردنیشدا سەماکەرانی"تبس"سەمایان بۆ دەکردین وئێمەیان بەخۆیانەوە سەرقاڵ دەکرد.

سەرەڕای ئەوەش"کاپتا"هەندێك لەخووی سەردەمی کۆیلایەتی خۆی پاراستبوو، چونکە دوای هەر نان خواردنێك، چەند جارێك بەدەنگێکی بەرز قوڵپێنەی دەدا و هەندێکاتیش پەنجەی دەکرد بەکونە لوتیدا، هەرکاتێك میوانداری بەکۆمەڵی دەکرد کەسە دەوڵەمەندو وەجاخزادەکان لەم میوانداریەدا پێکەوە کۆدەبونەوە، چونکە "کاپتا"دیاریگەلێکی گرانبەهای وەردەگرت و ڕێنمایی کاروباری داراییانی دەکردن.

هەرجارێك کە"کاپتا"میوانداریەکی ئاوا بەکۆمەڵی دروست دەکردو کەسە وەجاخزادە و دەوڵەمەندەکان لەماڵەکەیدا کۆ دەبونەوە، بۆسەرگەرم کردنیان خۆی وەك نۆکەرێك پیشان دەدان و ڕۆڵی نۆکەرێکی فێڵباز و دزێك کە دەیەوێت بڕێك سامان لەخاوەنەکەی بدزێت دەبینی و هیچ کاتێك شەرمی لەوە نەدەکرد کە پێشینەی ژیانی خۆی بۆ میوانەکانی بگێڕێتەوە، چونکە "کاپتا"بەڕادەیەك دۆڵەمند و ناودار بوبو کە هیچ شەرمی لەباسکردنی پێشینەی خۆی بۆ ئەوانی تر نەدەکرد.

پێی وتم: "سینۆهە"کاتێك سامانی کەسێك سنوری تایبەتی خۆی تێپەڕاند، چیتر هەژار ناکەوێت و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ سامانەکەی زیاتر دەبێت، ئەگەر خودی ئەو کەسەش نەیەوێت سامانەکەی لەوە زیاتر ببێت، بەڵام ئەو سامانەی کە من هەمە لەتۆی دەزانم و هەرلەبەرئەوەش سەرەڕای ئەوەی لەمیسردا کەسێك لەمن دۆڵەمەنتر نیە، بەڵام من هێشتا تۆ بەگەورە و خاوەنی خۆم دەزانم و تا ئەوڕۆژەی کە تۆ زیندویت ناهێڵم پێویستت بەهیچ شتێك ببێت، بەڵام ناتوانم سامانەکەی خۆمت پێبدەم، چونکە دەزانم ئەگەر تۆ تەواوی سامانەکەم بخەیتە ژێر ڕکێفی خۆتەوە. دوای

سالێك هەژار دەکەویتەوە، تۆ پیاوێك نیت کە بتوانێت پارێزگاری لەسامانەکەی خۆی بکات، ئەگەر تۆ دارایی خۆت بپاراستایە و لەڕێی خودای"ئاتون"دا نەتبەخشیایە، لەمڕۆدا دۆڵەمەنترین پیاوی میسر و سوریا و بابل و هاتی بویت بەڵام خەم بۆ لەدەستدانی دارایی و سامانەکەت مەخۆ، چونکە من تا دوایین ڕۆژی ژیانت، هەرچەنێك زێڕ و زیوم لێ داوابکەیت پێتی دەدەم.

"کاپتا"سەرەڕای ئەوەی خوێندەواری و نوسینی نەدەزانی، هونەرمەندانی بۆ پارێزگاری کردنی خۆی دیاری کردبوو، پەیکەرتاشەکانیش چەند پەیکەرێکی ئەویان دروست کردبوو. لەو پەیکەرانەدا"کاپتا"پیاوێکی تاڕادەیەك جوان و کۆشمەند نیشان درابوو، هەردوچاوەکەی دەبیینی و تەختەیەکی لەسەر ئەژنۆیەکی دانابوو و بەدەستەکەی تریشی نوکی تیرێکی بەدەستەوە گرتبوو. هەرکەسێك چاوی بەو نوکە تیرانە بکەوتایە وای دەزانی کە"کاپتا"پیاوێکی دانایەو دەتوانێت بنوسێتو بخوێنێتەوە، خودی"کاپتا"ش کاتێك چاوی بەپەیکەرەکان دەکەوت پێدەکەنی و لەبەرئەوەی دیاریگەلێکی گرانبەهای پێشکەشی خودای"ئامون"کردبوو، کاهینەکانی ئەو خودایە یەکێك لەوپەیکەرانەیان لەپەرستگای مەزنی خودای"ئامون"دا دانا. "کاپتا"لەشاری مردووەکاندا"مەبەست گۆڕستانی تبس"ە، گۆڕێکی مەزنو جوانی بۆخۆی دروست کردو فەرمانی دا کە هونەرمەندان لەسەر دیواری ئارامگاکەیدا وێنەگەلێکی ئەوی لەسەر بکێشن. لەم وێنانەدا "کاپتا" بە بەژنو باڵایەکی لاوو چاوێکی بیناو بارودۆخێکی شکۆمەندەوە سەرقاڵی کاری ڕۆژانەی خۆی بوو، قوربانی پێشکەشی خوداکان دەکرد. "کاپتا" لەبەرئەوەی لەسەرزەمی ژیانیدا مرۆڤی فریودابوو، دەیویست لەدوای مەرگیشی لەڕێی وێنەکانەوە خوداکانیش فریو بداتو لە جیهانی خۆرئاوا بەئاسودەیی و شکۆمەندیەوە بژی.

یەکێك لەوشتانەی کە لەگۆڕەکەیدا دانرابوو کۆپییەك بوو لە کتێبی مردووەکان کە من کۆکراوەیەکی ئاوا جوانم تائێستا نەبینیوە[55].

---

[55] کتێبی مردووەکان: کۆنترین کتێبی ئاینی و ڕەوشتیە کە بەدەستی مرۆڤ نوسرابێتەوە و لەمڕۆشدا دەست دەکەوێت و یەکێك لەکۆپی ئەم کتێبە بەدەستی جاڵهەڵکەنە دێرینناسەکان دۆزراوەتەوە و لەمۆزەکانە جیهانیەکاندا دەست دەکەوێت.

ئەم کتێبە کاهین و هونەرمەندانی میسر دوانزە دانەیان لێ تۆمارکردووە و یەکێك لەتۆماری ئەم کتێبە پەیوەست بوو بەوەی کەبەچ شێوەیەك دەبێت شەهێن ترازوی"ئۆزیریس"لەجیهانەکەی تردا لەبەرژەوەندی"کاپتا"دا تەکان بدات و بەچ شێوەیەك لەرێی بەردی ساختەوە تایەکی ئەو ترازووە لەبەرژەوەندی نۆکەری پێشوی من قورس بکرێت، هەروەها بەچ شێوەیەك چل مەیمونەکە فریو بدرێن.

من ئیرەییم بەسامانی"کاپتا"نەدەبرد، بەڵام نەك لەبەرئەوەی ئەو وەك رابردوو من بەگەورە و خاوەنی خۆی دەزانێت، بەڵکو لەبەرئەوەی هیچ کاتێك ئیرەیم بە سامان و خۆشبەختی و خۆویستی کەسانی تر نەبردووە.

کاتێك کەسێکم بینی کە خۆویستەو بەشتگەلێکی سست و بێبنەما لەخۆبایی دەبێت، هەوڵی ئەوەم نەداوە لەو هەڵەیەی ئاگاداری بکەمەوە و پێی بڵێم نابێت دڵی بەو شتانە خۆش بکات کە هیچ بنەمایەکیان نیە. چونکە دەزانم کە راستی بەرادەیەك تاڵە کە هەندێکات لەکوشتنی کەسێك بەلای بیسەرەوە بێزارکەرترەو خەڵکی دەتوانن تەمەنێك دڵی خۆیان بەئەندێشەو خەیاڵپڵاویەکانیانەوە خۆش بکەن و لەخۆیان بایی بن، بەڵام ناتوانن بۆماوەی رۆژێك لەگەڵ راستیەکاندا بژین.

لەوسالانەی"هورم هب"فەرمانرەوایی میسری دەکرد، من لە"تبس"دا سەرقاڵی تیمارکردنی نەخۆشەکان و کونکردنی کاسەی سەربوم، لەبەرئەوەی کۆمەڵێك لەو کەسانەی کە کونم کردە سەریان چاك بونەوە، لەرێگا دورەکانەوە کەسە نەخۆشەکان دەهاتن بۆلام، بۆئەوەی چارەسەریان بکەم.

بەڵام دوای چەند ساڵێك، چیتر کاری پزیشکی منی رازی نەدەکرد، جارێکی تریش پەیم بەوەبرد کەمن دڵگرانی هەلومەرجی دەورروبەرم، بۆیە بە"کاپتا"م وت: زۆر رقم لەم روکەش پەرستی و زۆر خۆریەی تۆیە، گوتەگەلێکی خراپیشم لەبارەی زیادەرەوی لەخواردن و خواردنەوە و سەرگەرمی کاهینەکان دەهێنایە زمان. یەکێك لەوشتانەی زۆر مایەی رقی من بوو ئەوەبوو کە بەچاوی خۆم دەمبینی کە"هورم هب"ئازادیەکی بێسنوری دابوو بەسەربازەکانی خۆی و ئەوانەی بەتاڵن و هیچ کارێکیان نیە، لەبەیانیەوە تا ئێوارە لەمەیخانەکاندا دەمێننەوەو لەشەوەوە تا بەیانیش لەسۆزانی خانەکاندا رایاندەبواردو لەبەرئەوەی لەهیچ کەسێك نەدەترسان، لەشەقامەکانی

"تبس"دا ڕێیان لەژن و کچی خەڵکی دەگرت و بەزۆر ئەوانیان لەشەقامەکانەوە دەبردە ناو سۆزانی خانەکانە یان مەیخانە یان کەنار ڕوباری نیلەوەو لەگەڵیاندا ڕایاندەبوارد.

ئەگەر کەسێك سکاڵای لەسەربازەکانی"هورم هب"بکردایەو بیوتایە ئەو بەزۆر لەگەڵ ژن یان کچەکەیدا ڕایبواردووە، "هورم هب"لەوەڵامدا پێی دەوت: خۆشحاڵبە کە سەربازی من لەگەڵ ژن یان کچەکەتدا ڕایبواردووە، لەبەرئەوەی کۆرپێکی تر بۆ منداڵەکانت زیاد دەکرێت و منیش لەمیسردا، بۆ سەربازی پێویستم بەکەسانێکی زۆرە. ئەو وەڵامەی کە"هورم هب"بەکەسی سکاڵاکاری دەدایەوە، لەنەفرەت و ڕقی ئەو بۆ ژنان سەرچاوەی دەگرت، چونکە دوای ئەوەی شازادە خانم"باکتامون"بەوشێوەی پێشتر بۆم باسکردن تۆڵەی لە"هورم هب"کردەوە، چیتر ئەو نەیدەتوانی چاوی بەهیچ ژنێك بکەوێت و لەبەرامبەر هەموو ژنەکاندا هەستی بەڕق دەکرد. بەڵام من نەمدەتوانی ئەوە بەچاوی خۆم ببینم کە"هورم هب"بەناونیشانی ئەوەیکە ڕۆژێك لەسوریادا دژی هێزی سەربازی"هاتی"دا جەنگاوە، لەمیسردا ئەو هەموو تاوانانە ئەنجام بدات و بدات لە خەڵکی و بریندایان بکات، بەئاشکراش باج لەتەواوی بازرگانەکان وەرگرێت و هەر بازرگانێکیش باجی پێنەدات، هێرشی بۆ بکات و فرۆشگاکەی وێران بکات و سامانەکەی بەتاڵانی ببات.

منیش بەئاشکرا دەموت: سەرباز بۆ ئەوە هاتوەتە بون کە دژی دوژمنی دەرەکی بجەنگێت و ئەو سەربازەی کە لەناو وڵاتدا بکەوێتە گیانی هاوڵاتیانی خۆیەوە، لەنەخۆشی تاعون هەڕەشئامێزترەو هەر فەرماندەیەکیش کە بەرگری لەسەربازگەلێکی ئاوا بکات، دەبێت لەسێدارە بدرێت، ئەگەر ئەو فەرماندەیە فیرعەونی میسریش بێت.

ئەم ڕەخنانەم بەدەنگێکی بەرز دەهێنایە زمان و سەربازەکانیش دەیانبیست بەڵام نەیاندەوێرا پەلامارم بدەن، چونکە دەیانزانی کە من لەبەرئەوەی کەسانی هەژار بەبێ بەرامبەر چارەسەر دەکەم، منیان زۆر خۆشدەوێت هەروەها ئاگاداری ئەوەش بون کە من لەهاوڕێی کۆن و نزیەکانی"هورم هب"م.

*بەشی پەنجاو و شەشەم*

## "هورم هب"بەچ شێوەیەك منی لەمیسر دور خستەوە

کاتێــك وەرزی بــەهار هــات، ئــاوی ڕوبــاری"نیــل"کــەم بویــەوەو نیــشتەوەو پەڕەسێلکەکان دەستیانکرد بەسەماو فڕین، ڕۆژێکیان کۆمەڵێك لەسەربازەکانی"هورم هــب"خۆیــان کــرد بەماڵەکــەی منــداو ئــەو نەخۆشــانەی کــە لەوێــدا چــاوەڕێی چارەسەرکردنیان دەکرد لەماڵ دەریانکردن و منیان بردە لای"هورم هب".

چەندساڵێك بوو کە من"هورم هب"م نەبینیبوو و ئەو ڕۆژە کاتێك چاوم پێی کەوت، پەیم بەوە برد کە پیر بووە و چرچ و لۆچیەکی زۆر بەڕوخساریەوە دەبینم، هەروەها ماسولکەی گەردنی دەرپەڕیبوو و کەمێکیش پشتی کوڕ بوبو.

کاتێك"هورم هب"چاوی پێم کەوت وتی: "سینوهە"من چەند جارێك هۆشداریم پێدایت کە باسی هەندێ شت نەکەیت و نەیهێنیتە زمان، بەڵام تۆ هیچ گرنگیەکت بەهۆشداریەکانی من نەدا و منت کردووەتە گاڵتەجاڕی خۆت.

تۆ بەخەڵکی دەڵێیت کە لەمیسردا کاری سەربازی ڕسواترین کارە، ئەگەر منداڵێك لەسکی دایکیدا بمرێت، زۆر لەوە باشترە کە لەدایك بێت و ببێتە سەرباز، سەرەڕای ئەوەی تۆ دەزانی کە من حەز بەوە دەکەم ژمارەی دانیشتوانی میسر ڕوو لەزیاد بون بکات بۆئەوەی بتوانین سەربازگەلێکی زیاتر دامەزرێنین، تۆ دەڵێیت کە بۆ هەر خێزانێك دوو یان سێ منداڵ بەسە، ئەگەر هەر ژن و پیاوێك، بەدوو یان سێ منداڵ خۆیان ڕازی بکەن و بەجوانی پەروەردەیان بکەن، زۆر باشترە لەوەی کە دە منداڵی کۆڵبەر یان سەربازیان هەبێت و خودی ژن و پیاوەکەش بەهەژاری و کوێری ژیان بەسەر ببەن، تۆ دەڵێیت کە تەواوی خودایانی میسر وەکو یەکن و تایبەتمەندی هیچ

کامێکیان لەویتریان زیاتر و باشتر نیە و لەتەواوی پەرستگاکاندا تەنها کاهینگەلێکی تەمەڵ و چڵێس و زۆر خۆر بەدی دەکرێن.

تۆ بەخەڵکی دەڵێیت کەهیچ کەسێك مافی ئەوەی نیە پیاوێکی تر بکرێت و بیکاتە نۆکەری خۆی، سەرەڕای ئەوەش دەڵێیت کە لەسەرتاسەری میسردا ئەو جوتیارەی کە زەوی دەکێڵێت و تۆوی تێدا دەچێنێت دەبێت ببێتە خاوەنی ئەو زەویە، سەرەڕای ئەوەی ئەو زەویە هی"هورم هب"ی فیرعونیش بێت.

تۆ بەخەڵکیت وتووە کەفەرمانڕەواییەکەی من هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ فەرمانڕەوایی "هاتی"ەکاندا نیە، چونکە هەروەك چۆن"هاتی"ەکان خەڵکی بەکوشت دەدەن و بەزۆر لەگەڵ کچ و ژنانی خەڵکی ڕادەبوێرن، سەربازەکانی منیش بکوژی میسریەکانن و ژنان و کچانی میسر دەفرێنن. من تەواوی ئەم شتانەم لەسیخوڕەکانی خۆمەوە بیستووە، بەڵام تا ئەمڕۆ هیچ هەڵوێستێکم لەبەرامبەر تۆدا نەنواندووە، من تۆم بەیەکێك لەهاوڕێ کۆنەکانی خۆم لەقەڵەم دەدا. تا ئەو ڕۆژەی"ئامی"زیندووبوو، من پێویستم بەبونی تۆ بوو، بۆئەوەی تۆ لەکاتی پێویستدا گەواهی ئەوەم بۆ بدەیت کە"ئامی"دوچاری چ کردار و ڕەفتارگەلێك بووە، بەڵام چیتر لەمەو دوا"ئامی"مردووە و منیش پێویستم بەتۆ نەماوە و هیچ سودێك بەمن ناگەیەنیت، بەڵکو بەهۆی ئەو شتانەی کە دەیزانی لەوانەیە ببیتە مایەی سەرئێشەم.

تۆ ئەگەر دەمی خۆتت بگرتایە و باسی خراپەی من و سەربازەکانم نەکردایە، دەتوانی تا دوایین ڕۆژی تەمەنت لەم شارەدا بەئاسودەیی بژیت، هەروەها لەبەرئەوەی پزیشکی، لەڕێی چارەسەرکردنی نەخۆشەکانەوە بژێوی ژیانی خۆت دابین بکەیت، بەڵام "سینۆهە"تۆ ناتوانیت بەئارامی دانیشیت و وەك ئەوەی ناچاربیت بەبەردەوامی باسی خراپەی من و سەربازەکانم بکەیت، منیش ناتوانم لەوە زیاتر گوێم لەباسی خراپەی فەرمانڕەواییەکەی خۆم بێت.

دوای ئەم گوتەیە"هورم هب"کە بەهۆی گوتەکانی خۆیەوە توڕە بوبو، چەند جارێك قامچیەکەی کوتا بەڕانی خۆیدا و وتی: "سینۆهە"... ئەمڕۆ تۆ وەك کرمێکی زەویت لێهاتووە کە زەوی باخەکەی من هەڵدەوەشێنیت و خراپی دەکەیت و دەبیتە ڕێگری

گەشەی گیاکان، تۆ ئەمڕۆ وەك "خەرەنگەز"[56]"یکت لێهاتووە کەبەسەر شانمەوە دەنیشیتەوە و دەمگەزیت و خوێنم دەمژیت. تۆ ئەمڕۆ وەك گیایەك وایت کە لەباخەکەی مندا ڕوایت، بەڵام لەباتی گوڵ یان میوە، دڕکت دەرکردووە و من ئەم گیا زیانبەخشە لەڕیشەوە هەڵدەکێشم و فڕێی دەدەم.

ئێستا وەرزی بەهارە و پەڕەسێلکەکان دەست بەسەماو فڕین و بەئاسمانەوە جیکە جیك دەکەن و لەکلەکەکانیشش"لقلق"دەنوکیان دەدەن لەیەکتری و درەختی "ئەقاقیاش" گوڵەکانیان شکۆفە دەکەن، وەرزی بەهار بۆ گیانەوەران و لاوان وەرزێکی وروژێنەرە، چونکە لەم وەرزەدا بەهۆی گەرمای هەوا و پێویستیەکانی سروشت حەزدەکەن لەگەڵ یەکتردا جوت بن، بەڵام پیرەمێردانی وەك تۆ کە چیتر ناتوانێت لەگەڵ هیچ کەسێکدا جوت بێت، لەوەرزی بەهاردا بەهۆی ئەو توانایەی بەدەستی دەهێنن، کەسێکی زۆر بلێیان لێ دەردەچێت و لەوباوەڕەدام بەهۆی ئەو زۆر بلێیانەی تۆوە بێت کە لەهەندێك پەرستگادا وێنەکانمیان قوڕاوی کردووە و لەپەرستگایەکی تردا بەبەرد گوێ و لوتی پەیکەرەکەمیان شکاندووە.

بۆیە ناچارم تۆ لەمیسر دور بخەمەوە، چونکە ئەگەر لەمیسردا بمێنیتەوە، ئەوا من بەشێوەیەك لەتۆ توڕە دەبم کە هزر و مێشکی خۆم لەدەست دەدەم و لەوانەیە هەوڵی کوشتنیشت بدەم، منیش نامەوێت بەفەرمانی من بکوژرێیت، لەبەرئەوەی تاکە هاوڕێی کۆن و سەردەمی لاویەتی منیت کە تا ئێستا بەزیندوویی ماوە.

"سینۆهە"من تۆ لەمیسر دور دەخەمەوە و تا ئەو ڕۆژەی من فیرعەونی میسر بم، ناهێڵم بگەڕێیتەوە بۆ میسرو چیتر ڕەنگی"تبس"بەچاوانی خۆت نابینی، چونکە گوتەکانت وەك ئاگرێك وایە کەبکەوێتە ناو پوشێکی وشك یان نەیجەلانێکی وشکەوەو یەکسەر گڕی تێبەردەدات، کاتێك ئاگری گرت خامۆشکردنی مەحاڵ دەبێت. تێگەشتم کە هەندێکات گوتار لەنێزە هەڕەشەئامێزترە، ئەوکەسانەی کە گوتەگەلێکی هەڕەشەئامێز بەزماندا دەهێنن دەبێت لەناوببرێن، هەر لەبەرئەوەش دانیشتوانی وڵاتی

---

[56] خەرەنگەز: ناوێکی پاراوی کوردیە کە بەواتای مێشك دێت کە بەگوێدرێژەوە دەنیشێتەوە و وەك مێشولە خوێنی دەمژێت، ئەم مێشە دەقاودەق وەك مێشی ئاسایی وایە بەڵام بەئەندازەی هەنگێك دەبێت.......وەرگێر.

"هاتی" جادوگەرەکان لەسیخ هەڵدەکێشن، چونکەدەزانن ئەمانەبەهۆی گوتەکانیانەوە دوڕوویی و دوبەرەکی لەنێو خەڵکیدا دروست دەکەن.

من نامەوێت وڵاتی میسر بەهۆی دوبەرەکی و دوزمانی تۆوە جەنگێکی تر لەگەڵ خوداياندا بەرپا بکرێت، هەرلەبەرئەوەش"سینۆهە"لەمیسر دورت دەخەمەوە، چونکە تۆ سەرەڕای ئەوەی شێت نیت، بەڵام پیاوێکی ئاساییش نیت، وەك بڵێی لەجیهانێکی جیاواز لەم جیهانەدا دەژیت.

لەوانەیە"هورم هب"ڕاست بکات کە دەیوت: من کەسێکی ئاسایی نەبم و لەوانەیە لەبەرئەوەش پیاوێکی ئاسایی نەبم کە خوێنی خودایان لەڕەگی خوێنبەرەکانمدا بێت، بەواتا خوێنی فیرعەونەکانی میسرو خوێنی شازادەخانمی"میتانی" لەخوێنبەرەکانمدا هاوتوچۆ بکات.

سەرەڕای ئەوەش کاتێك گوێم لەگوتەکانی"هورم هب"بوو پێکەنین گرتمی و"هورم هب"یش بەهۆی ئەم پێکەنینەمەوە زیاتر لێم تورەبوو و قامچیەکەی دەستیشی بەبەردەوامی دەدا لەڕانی و وتی: "سینۆهە"سوپاسی خوداکان بکە کە دۆستی دێرینی منیت، ئەگینا هەرئێستا دەمکوشتیت، هەورەها پێشینەی تەمەنێك هاوڕێیەتی ڕێگرە لەبەردەم ئەوەی تۆ لەسێدارە بدەم، بەڵام بەدڵنیاییەوە دورت دەخەمەوە و ڕێنادەم کە دوای مەرگیشت لاشەت بگەڕێتەوە بۆ میسر، بەڵام دەتوانی پێش مەرگت بڵێیت کە لاشەکەت مۆمیا بکەن و لەهەمان ئەو شوێنەی کە تێیدا دەژیت بەخاکی بسپێرن.

ئەو شوێنەی دوای دورخستنەوەت بۆ نیشتەجێ بونت دەستنیشانم کردووە، لەکەنار دەریا ڕۆژهەڵاتەوەیە-مەبەستی دەریا سورە-کەشتیەکانیش لەوێوە بەرەو هیندوستان دەڕۆن و من ناتوانم تۆ بۆسوریا دور بخەمەوە، لەبەرئەوەی هێشتا ئاگر و خەڵوزگەلێکی ڕابردو لەژێر خۆڵەمێشەکەیدا شاردراوەتەوە و بونی تۆ لە سوریادا لەوانەیە ببێتە هۆی ئەوەی ئەو خەڵوزە لەژێر ئەو خۆڵەمێشە بێتە دەرەوە و دوبارە ئاگر بەربداتە ئەو ناوچەیەوە، هەروەها ناشتوانم بۆ وڵاتی"کوش" کەدەکەوێتە باشوری میسر دورت بخەمەوە، چونکە کاتێك تۆ ڕۆشتیتە ئەوێوە، بەڕەشپێستەکان دەڵێیت کە تەواوی مرۆڤەکان لەبەرامبەر یەکدا یەکسانن و سپی و ڕەش هیچ تایبەتمەندیەکی جیاوازیان نیە و ڕەشپێستەکانیش لەبەرئەوەی لەڕوی پێکهاتەی

سروشتیانەوە سادە و گەمژەن زۆر زوو باوەڕ بەم قسەیەت دەکەن و لەوانەیە لەوێدا ڕاپەڕینێك بەرپا بکەن.

بەڵام ئەو بەشەی کەنار دەریای ڕۆژهەڵات کە تۆ دەنێرمە ئەوێ، دانیشتوانی تێدا نیە و تۆش هەرچەنێك قسە بکەیت بێ لەتاوێرە بەردی سور و قەلەڕەش و چەقەڵ و مارەکان هیچ کەسێکی تر گوێت لێناگرێت و منیش بەو بۆنەیەوە ئاسودە خەیاڵ دەبم، لەبەرئەوەی ئەو جۆرە گیانەوەرانە ناتوانن ببنە مایەی سەرئێشەی وڵاتی میسرو منیش بەچواردەوری ئەو شوێنەی کە تۆی تێدا نیشتەجێ دەکەم چەند پاسەوانێکی تێدا دادەنێم، ئەمانە ئەرکی ئەوەیان لەسەر شانە ئەگەر تۆ بتەوێت ئەو شوێنە بەجێ بهێڵیت، بتکوژن. بەڵام لەبەرئەوەی ئەو دور خراوەی تۆ دەنێرمە ئەوێ، دانیشتوانی تێدا نیە، و لە"تبس"یشەوە زۆر دورە، هەروەها ئاگادارم چەنێك بەم شارەوە پەیوەستی بۆ تۆ وەك سزایەکی مەزن وایە، منیش لەڕوی پێویستی و کەرەستەی ژیانەوە بێکەموکورتیت ناکەم و ئەو دڵنیاییەت پێدەبەخشم کە لەوێدا ماڵێکت پێ بدەن و داوای هەرچیەکیش بکەیت بەمەرجێك گونجاو بێت، بۆتی فەراهەم دەکەم و تەنها یەك شت لەو شوێنەدا قەدەغەیە ئەویش ئەوەیە کە ناتوانی بڕۆیتە دەرەوەی ئەو ناوچەیەی کە تێیدا دەژیت. من لەتەنهایی شوێنی نیشتەجێبونم نەدەترسام، چونکە لەژیاندا زیاتر هەستم بەتەنهایی دەکرد، بەڵام هەر بەوشێوەی کە"هورم هب"وتی: بە"تبس"ەوە زۆر پەیوەست بوم و کاتێك بیرم لەوە کردەوە کە چیتر خاکی میسر لەژێر پێمدا هەست پێناکەم و چێژی ڕوباری"نیل"لەدەممدا بەرجەستە ناکەم و نایخۆمەوە و بۆنی "تبس" ناکەم، خەمگین بوم، دوای ئەوە بە"هورم هب"م وت: من لەم شارەدا هاوڕێیەکی ئەوتۆم نیە و لەبەرئەوەی خەڵکی لەزمانی قسەکردنی من دەترسن و خۆیان لێم دورەپەرێز دەکەن، بەڵام لەنێو چینی هەژاراندا چەند کەسێك هەن کە بەیەکێك لەهاوڕێکانی من لەقەڵەم دەدرێن، منیش حەز دەکەم بۆ دوایین جار چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا بکەم و ماڵئاواییان لێ بکەم، یەکێکی تر لەو شتانەی دەمەوێت ئەنجامی بدەم ئەوەیە کەمێك بەنێو شاری"تبس"دا پیاسە بکەم و لەم وەرزی بەهارەدا بۆنی شکۆفەی درەختی سەرشەقام و کۆڵانەکان و بۆنی بخوردی هەیوانی پەرستگاکان بکەم و کاتێکیش شەو داهات بەنێو ناوچە هەژار نشینەکان کە ماڵی منیش لەوێیە تێپەڕم، بۆئەوەی بۆنی ئەو ماسیانەی کە لەبەرنەم

ماڵەکانیاندا سوریان دەکەنەوە بکەم و تۆش"هورم هب"نازانی کە تەماشاکردنی ئەو ژنانەی کە لەبەردەم ماڵەکەیاندا خەریکی لێنانی خواردنن، هەروەها ئەو پیاوانەی کە بەماندویی و شەکەتیەوە لەکارەکەیان دەگەڕێنەوە و ئەو منداڵانەی کە چاوەڕێی خواردنی نانی ئێوارەن، لەبەردەم ماڵەکەیاندا سەرقاڵی یاری کردنن، تاچ ڕادەیەك چێژم پێدەبەخشن، لەوباوەڕەدام هیچ کەسێك بەئەندازەی من چێژ لەگەڕان بەنێو شەقام و کۆڵانەکانی "تبس" لەکاتی خۆرئاوابون و سەرەتای شەودا وەرناگرێت.

ئەگەر من ئەم گوتانەم بەئاوازێکی خەمگینەوە بهێنایەتە زمان و تکام لە"هورم هب"بکردایە کە چەند ڕۆژێك ماوەم بدات بۆئەوەی بتوانم ماڵئاوایی لە"بتس"بکەم، بەدڵنیاییەوە ئەو تکایەی منی پەسەند دەکرد، بەڵام بێ پاڕانەوە و دەستەپاچەیی، وەك ئەوەی لەگەڵ کەسێکی هاوشان و هاوئاستی خۆمدا قسە دەکەم، ئەو داوایەم لە"هورم هب"کرد، لەبەرئەوەی ئاگاداری ئەوەبوم کە زانست نابێت لەبەرامبەر دەستەڵاتدا سەری ڕێزو نەوازش دانەوێنێت، هەرلەبەر ئەو هۆیە فیرعەون ئەو داوایەی منی پەسەند نەکردو وتی: من کەسێکی سەربازیم، بۆیە ڕقم لەدواخستنی کارو پیشاندانی سۆزو بەزەییە، لەبەرئەوەش هەر ئێستا بڕیار دەدەم بەکەژاوەیەك تۆ لە"تبس"دەربکەن، ئەگەر کەسێك لەخزمانت بیەوێت لەگەڵ تۆدا بێت، من ڕازی دەبم، ئەویش بەمەرجێك چیتر نەگەڕێتەوە بۆ میسر و لەلای تۆ بمێنێتەوە و بگرە دوای مەرگی تۆش نابێت بگەڕێتەوە بۆ میسر، چونکە دەزانم کە ئەو هەرکەسێك بێت، لەلای تۆ بێت دەکەوێتە ژێر کاریگەری گوتەکانتەوە و دوای ئەوەی گەڕایەوە بۆ میسر بیروباوەڕەکانی تۆ بەنێو خەڵکیدا بڵاو دەکاتەوە، بیروبۆچونە هەڕەشەئامێزەکان لە تاعون خێراتر بەنێو خەڵکیدا بڵاو دەبێتەوە، بەڵام لەبارەی ئەو هاوڕێیانەت کە وتت لەچینی هەژارانن، دەزانم کە یەکێك لەوانە نۆکەرێکە کە لەئێستادا بەرداشی پێ دەسوڕێننەوە و ئەویتریان وێنەکێشێکە کە بەردەوام سەرخۆشە و وێنەی خودایان دەکێشێت، دوو هاوڕێکەی تریشت لەڕەشپێستەکانە، لەئێستادا هەرچواریان بەسزای ئەوەی کەوتونەتە ژێر کاریگەری بیروبۆچونەکانی تۆوە گەشتێکی دور و درێژیان گرتووەتە بەر کە گەڕانەوەیان تاڕادەیەکی زۆر مەحاڵە.

کاتێك ئەم گوتانەم لە"هورم هب"بیست، نەفرەتم لەخۆم کرد، چونکە بۆ جارێکی تر کەسانی بێتاوان، تەنها لەبەرئەوەی هاوڕێی من بون، دوچاری بەدبەختی هەمیشەی

کراون و ئەوکات بێئەوەی لەبەرامبەر"هورم هب"دا کڕنوش بەرم، ویستم بڕۆم، "هورم هب"یش بۆئەوەی پیشانی بدات کە چیتر هیچ کارو گوتەیەکی بەمن نەماوە، بەلاسایی کردنەوەی فیرعەونە مەزن و ڕابردووەکانی میسر وتی: کۆتایی بەگوتەکانی فیرعەون هات.

سەربازەکانی"هورم هب"یش منیان خستە سەر کەژاوەیەك کە پەردەکانیان دادابویەوەو ڕێگای ڕۆژهەلاتمان گرتەبەر. بۆماوەی بیست ڕۆژ لەو جادەیەی کە"هورم هب"بەرەو ڕۆژهەلات دروستی کردبوو تێپەڕین، تا ئەوکاتەی گەشتینە لەنگەرگایەك کە لەوێوە گەشتیەکان بەرەو هیندستان دەڕۆشتن. بەلام لەبەرئەوەی ئەو لەنگەرگایە دانیشتوانی تێدابوو، سەربازەکانی"هورم هب"لەوێدا ڕانەوەستان و منیان لە لەنگەرگاکە دور خستەوە و دوای سێ ڕۆژ گەشتینە شوێنێکەوە کە لەڕابردووا ئەو شوێنە لادێیەکی تێدابووە، بەلام جوتیارانی ئەو لادێیە ئەوێیان بەجێهێشتبوو بۆیە هیچ کەسێك لەوێدا نەدەژیا. لەوێدا شوێنێکیان بۆ نیشتەجێبونی من دیاری کرد و لەناوەڕاستی ئەو شوێنەدا خانویەکیان بۆ دروست کردم، ئەوکات قۆناخێکی تری ژیانم لەو مالەدا دەستی پێکرد. من هیچکاتێك لەو مالەدا بۆ هیچ شتێك تەنگەلان نەبوم. چونکە هەر خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و کەرەستەی نوسینێکم لێ داوا بکردنایە بۆیان دەهێنام.

من چەندسالێکم لەومالەدا بەسەر بردو چەندکتێبێکم لەبارەی زانستی پزیشکیەوە نوسی، دوای ئەوەی کۆتاییم بەهەر کتێبێك دەهێنا دەمخستە ناو سنوقێکی بچوکەوە.

بەلام ئەم کتێبە، دوایین کتێبە کە من نوسیومەو هەرلەبەرئەوەش تایبەتم کرد بەسەرگوزەشتەی ژیانی خۆمەوە، دوای ئەم کتێبە، ئەگەر زیندوش بمێنم، چیتر هیچ کتێبێکی تر نانوسم، چونکە ڕوناکی چاوم زۆرکەم بووەو چیتر چاوەکانم جولانی پێنوسەکەم بەسەر "پاپیرۆس"ەوە نابینن.

من لەوباوەڕەدا بوم ئەگەر هەولی نوسینی سەرگوزەشتی ژیانی خۆم نەدایە، نەمدەتوانی لەو چەند سالە بەولاوە بەرگەی قورسی باری ژیان بگرم، من لەبەرئەوە یادگاری سەرگوزەشتی ژیانی خۆمم نوسی، بۆئەوەی بتوانم ڕوداو و ڕاستیەکانی ژیان، هەلبەت لەو ڕۆژەوەی خۆمم ناسی تا ئەمڕۆ بەبیر خۆم بهێنمەوە، هەروەها

بیشزانم لەپێناو چیدا ژیام. بەڵام ئێستا کۆتایی بەنوسینی یادگاریەکانم هاتووە، نازانم کە لەپێناو چیدا ژیاوم‌و مەبەستی من لەژیان چی بووە.

لەسەردەمی لاویەتیدا بەو شێوەیە لێکم دەدایەوە کە لەبەرئەوە دەژیم بۆ ئەوەی پیر بم و هەنوکەش کە پیربوم سەرم لەوە سوڕماوە کە ئەوە چ ئارەزوویەك بوو کە لەسەردەمی لاویەتیدا هەمبووە و مەگەر گەشتن بەتەمەنی پیری ئەوەندە ئارەزوویەکی بەهاداره کە مرۆڤ بتوانێت لەپێناویدا بژیت و بەرگەی سەختیەکانی ژیان بگرێت.

هەموو ڕۆژێك تەماشای دەریام دەکرد. هەندێجاریش وێنەی کێوە سورەکانی چواردەوری دەریا لەدەریاکەدا ڕەنگی دەدایەوە و ڕەنگێکی سوری بەدەریا دەبەخشی، هەندێجاریش لافاو هەڵدەستا و ئاوی دەریا ڕەش دادەگەڕا و لەکاتی شەویشدا ڕەنگی دەریا لەبەرچاوم سپی دەنواند.

ئەو ڕۆژانە ئاو هەوا لافاوی و باراناوی نەبوو و ڕەنگی شینی دەریا، لەبەردە شینەکان ڕەنگیان تێرتر بوو، بەڵام من لەتەماشاکردنی دەریا بێزار بوم، چونکە دەریا بەڕادەیەك مەزن و ترسناکە کە مرۆڤ ناتوانێت تا کۆتایی تەمەنی، خۆی سەرقاڵی تەماشاکردنی بکات. من ئەوەندە لەسەر زەوی بیابانی کەنارەکانی ڕۆژهەڵات- مەبەستی دەریای سورە- لەپاڵ دوپشك‌و مارەکاندا دانیشتم کە چیتر ئەوان لەمن نەدەترسان، بەڵام من حەزم لەهاوڕێیەتیان نەبوو، چونکە ئەگەر ببنە هاوڕێشم، ئەوا هاوڕێیەکی نەزان یان شێتن و ڕۆژێك دێت چزی خۆیان ڕۆ دەکەنە جەستەمەوە. ساڵێك دوای ئەوەی منیان لە"تبس"دور خستەوە، کاتێك کاروانی هیندستان لە"تبس" دەکەوتە ڕێ، بۆئەوەی خۆی بگەیەنێتە دەریای ڕۆژهەڵات"موتی" خزمەتکارم کە لە"تبس"بوو لەگەڵ ئەو کاروانەدا هات و پەیوەندی پێوە کردم.

کاتێك"موتی"چاوی پێم کەوت، دەستی خستە سەر ئەژنۆی و کڕنوشێکی بۆ بردم، کاتێکیش بینی ڕوخسارم کەمێك لاواز بووە و ورگیشم وەکوو جاران نەماوە دەستی کرد بەگریان.

وتم: "موتی"بۆچی دەگریت؟

"موتی"یش وتی: لەبەرئەوە دەگریم کە لەوکاتەوەی دور خراویتەتەوە لاواز بویت‌و هیچ کەسێکت نەبووە خواردنی خۆشت بۆ لێبنێت.

وتم: "موتی"ژیانی من گەشتووەتە قۆناخێك كە قەڵەوی و لاوازی بەلامەوە ئەو گرنگیەیەیان نەماوە.

"موتی"وتی: "سینۆهە"ئایا چەند جارێك پێم نەوتی ئاگات لەسروشتی خۆت بێت فریوت نەدات و دەمت بگرە، نازانم بۆچی پیاوان دەبێت بەوشێوەیە بن كە وەك بەردێك هیچ قسەیەك كاریان تێناكات، سەرەڕای ئەوەی دەزانن هەركەسێك سەری بەدیواردا بكوتێت سەری دەشكێت و دواجاریش دەمرێت، بەلام سەرەڕای ئەوەش هەر سەریان دەكوتن بەو دیوارەدا. بەلام تۆ"سینۆهە"گەشتویتەتە قۆناخێكی تەمەنتەوە كە چیتر دوای ئەوە دەبێت ژیر بیت، چونكە چیتر گرفتاری دڵەڕاوكێگەلێك -كە لەئەندامێكی بچوك كە لەسینەمانداجێگیرەو تەواوی بەدبەختیەكانی جیهان لەوە سەرچاوە دەگرێت- نابیت.

وتم: "موتی" تۆ هەڵەت كرد كە"تبس"ت بەجێهێشت و هاتیت بۆئێرە بۆئەوەی بێیت بۆ لای من، چونكە پیاوێكی دەركراوم و هەركەسێك بیّ لە پاسەوانەكانم كە سەربازی"هورم هب"ن، لەگەڵ مندا بژیت، چیتر نەك تەنها ڕیّ لەمن دەگرێت بگەڕێمەوە بۆمیسرو"تبس"، بەڵكو ناهێڵت ئەو كەسەی لەگەڵ مندا دەژیت بگەڕێتەوە بۆ میسر.

"موتی"وتی: من لەوباوەڕەدام ئەوەی بەسەر تۆدا هاتووە زۆر لەبەرژەوەندی تۆدایە، لەبەرئەوەی فیرعەون"هورم هب"تۆی ناردووەتە شوێنێكی چۆڵەوە بۆئەوەی سەردەمی پیری خۆت لەوێدا بەسەر ببەیت. منیش لەگاڵەگاڵی"تبس"و دەردیسەری دراوسێكان بێزار بوم، چونكە بەبەردەوامی كەلوپەلی چێستخانەكەم بەسوڕ لیّ وەردەگرن و دوای ئەوەش چیتر بۆم ناگەڕێننەوە و كاتێك منیش بەبیریان دەهێنمەوە، كەئەوەی بردویان بۆم بگەڕێننەوە لێم توڕە دەبن و دەڵێن مەگەر ئێمە دزین كە واهەست دەكەیت قابلەمە و تاوەكەت بۆ ناگەڕێنینەوە.

هەروەها لە"تبس"دا ناچارم ڕۆژی دوو جار بەردەرگاكەم گسك بدەم، بەلام سەرەڕای ئەوەش پاك نابێتەوە،چونكە دراوسێكانم بە بەردەوامی خۆڵی ناوماڵیان دەڕێژنە كۆڵانەوە و هەرچی هاوار دەكەم كە ئەم كارە نەكەن، گوێم لێناگرن.

یەكێكی تر لەو شتانە ئەوەبوو كە ماڵەكەی"تبس"مان بچوك بوو و نەماندەتوانی سەوزەی تێدا بكەین؛ لەكاتێكدا لێرەدا زەوی پێویستمان بۆ چاندنی سەوزە و

بەتایبەت کەرەوز کە تۆ زۆر حەزت لێیەتی دەچێنم، هەروەها ئەم سەربازە تەمەڵ و بێکارانەش کە فیرعەون بۆ پاسەوانی تۆ دەستنیشانی کردون هاندەدەم ئەوانیش سەوزی بچێنن و بۆ ڕاوکردنیش بڕۆن بۆ بیابان و لەدەریاشدا ڕاوەماسی بکەن، وەك بڵێی ئاگاداری ئەوە نیم کە ماسی سوێراوی دەریا وەك ماسی ئاوی شیرینی ڕوباری"نیل"شیرینە. یەکێکی تر لەوانە ئەوەیە کە دەمەوێت لێرەدا شوێنێك بۆ گۆڕەکەم دەستنیشان بکەم و گۆڕێك بۆ خۆم دروست بکەم و دوای مەرگیشم لێرەدا ئارام بگرم، چونکە هەرگیز پێم نەناوەتە دەرەوەی شاری"تبس"ەوە، دوای ئەم کۆچەم تێگەشتم کە خراپترین شت کۆچە و حەزیش ناکەم دوای مەرگیشم ناڕەحەتم بکەن و بۆ بەخاك سپاردنم لیرەوە بمبەنەوە بۆ"تبس". بەمشێوەیە "موتی" لێرە لەگەڵ مندا نیشتەجێ بوو، چیتر دوای ئەوە بوبە پەرستیارم، منیش لەوباوەڕەدام ئەگەر توانیبێتم دوایینساڵی تەمەنم بەئاسودەیی بژیم و ئەم کتێبە بنوسم، لەبەرئەوە بووە کە"موتی" بەبەردەوامی پەرستیاری لێدەکردم‌ونەیدەهێڵا هیچ کەموکورتیەکم هەبێت، "موتی"یش زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی خۆم سەرقاڵی نوسین کردووە و ناهێڵێت دوچاری ئەندێشەگەلێك ببمەوە، بەڵام دەمزانی کە لەناخیەوە زۆر گوێ بەم نوسینەم نادات و ئەوکارەی من بە بێسودترین کار دەزانێ. "موتی"خواردنگەلێکی خۆشی بۆ لێدەنام و دەقاودەق بەپێی ئەوەی بۆی باسکردم، سەربازەکانی هانی ئەوەدەدا زەوی بکێڵن و تۆوی تێدا بچێنن و ئاودێری بکەن، هەروەها بڕۆن بۆ ناو بیابان بۆئەوەی شتێك ڕاوبکەن، لەهەمان کاتدا لەدەریادا خۆیان سەرقاڵی ڕاوەماسی بکەن.

سەربازەکانیش لەبەرئەوەی بۆماوەی ساڵێك تەنها کاریان خواردن و خواردنەوە و خەوتن بوو، تێگەشتن کە چیتر لەمەودوا دەبێت کار بکەن، بۆیە دەستیان بەکێڵانی زەوی کرد، بەڵام نەیاندەوێرا بەرگەی کارکردن بگرن، چونکە"موتی"بەزمانی خۆی کە لەشاخی"مانگا"تیژترە ئازاری دەدان و قسەی ناشیرینی پێدەوتن، هەندێکاتیش بەو چیرۆکانەی کە بێ هیچ پەردە پۆشێك بۆی دەگێڕانەوە سەربازەکانی دەهێنایە پێکەنین. بەڵام وردە وردە سەربازەکان کە بەهۆی بێکاریەوە تەمەڵ بوبون، کاتێك بینیان کارێکی سودبەخشیان گرتووەتەبەر، زۆر خۆشحاڵبون و ڕاوی بیابان و دەریا و سەوزەی نوێ، خواردنی ئەوانی زۆرتر و جۆراوجۆرتر کرد هەروەها"موتی" فێری شێوازی لێنانی چێشتی خۆشی دەکردن.

هەموو ساڵێك هەركاتێك كاروانی هیندستان لە"تبس"ەوە لەكەناری دەریای ڕۆژهەڵاتەوە بهاتایە"كاپتا"باری چەند وڵاخێك كەلوپەل و دیاری جۆراوجۆری وەك زێڕ و زیو و تەواوی ڕوداوەكانی"تبس"ی لەڕێی نوسەرەكانیەوە بۆ دەنوسیم و بۆی دەناردم، بەشێوەیەك كە من لەڕوداوەكانی"تبس"بێئاگا نەبوم و دەمزانی لەوێ چی ڕوو دەدات. ئەو سەربازانەی پاسەوانی من بون، بەشێوەیەك خوویان بەژیانی ئەو ناچەیەوە گرت و لەبارودۆخی خۆیان ڕازی بون، وتیان ئەگەر دوای مەرگیشیان، ئەگەر بتوانن ناگەڕێنەوە بۆ"تبس"، چونكە ژیانی ئێرەیان زۆر خۆشە و هیچ خەمێكیان نیە. سەربازەكان بەهۆی ئەو دیاریانەی من پێمدابون، مەڕ و مانگایان پێ كڕی و لەڕێ پەروەردە كردنی ئاژەڵەوە بۆنە خاوەنی سەروەت و سامانێكی باش.

ئێستاش لەنوسین ماندو بوم، چونكە چاوەكانم چیتر بەجوانی چاوی بەهێمای نوسینەكان ناكەوێت و كاتێك بەچكە پشیلەكانی"موتی"لێم نیزك دەكەونەوە و لەسەر ئەژنۆم ڕادەوەستن، من سەرم لەوە سوڕ دەمێنێ چۆن لەكاتی هاتنیاندا چاوم پێیان نەكوتوە. ڕۆحم لەوەیكە گێڕامەوە و نوسیم ماند و شەكەت بووە و تێدەگەم كە جەستەم پێویستی بە حەوانەوەیەكی هەتاهەتاییە.

من ئێستا پیاوێكی خۆشبەخت نیم، بەڵام لەم گۆشەگیرەیەدا خۆم بە بەدبەختیش نازانم. خۆشحاڵم كە"پاپیرۆس"و پێنوس هەیە، ئەگەر ئەم دوانە نەبونایە، نەمدەتوانی لەڕێی نوسینی ئەم كتێبەوە سەردەمی منداڵی خۆم بەبیر بهێنمەوە و لەجیهانی ئەندێشەدا جارێكی تر لەگەڵ"مینا"لەشەقامی"بابل"ەوە تێپەڕم وهەست بەبونی میهرەبانی"موتی"كە بەچواردەورمدا دەسوڕێتەوە بكەم، هەروەها لەبەدبەختی ئەو كەسانەی كە برسیان بوو بگریم و گەنمی خۆم پێشكەشی كەسە برسیەكان بكەم.

دەزانم كە دوای مەرگم پاسەوانەكان، بەپێی فەرمانەكانی"هورم هب"تەواوی نوسینەكانم لەناو دەبەن و ئەم ماڵەش وێران دەكەن، بۆئەوەی نەوەك شتێكم لەسەر دیوارەكان نوسیبێت. بەڵام"موتی"بۆ هەر پانزە بەشی ئەم كتێبە كیفێكی لەپەلی خورما بۆ چنیبوو و منیش هەریەك لەو بەشانەم خستە ناو یەكێك لەو كیفانە، دوای ئەوە هەر پانزە بەشەكەم دەخەمە ناو سنوقێكی زیوینەوە و ئەو سنوقەش دەخەمە ناو سنوقێكی تەختەی بەهێز كە لە داری"سدر"دروست كراوە كە تەختەكەی لەدەرەوەی میسرەوە هەناردە دەكرێت، بەكورتیەكەی ئەو سنوقە دارینەش دەخەمە ناو سنۆقێكی

مسینەوە و"موتی"دوای مەرگم دەبێت ئەو سنوقە بخانە ناو گۆڕەکەمەوە، چونکە ئەو منی لەوە دڵنیا کردەوە کە پاسەوانانەکان بەشێوەیەك فریو دەدات، بۆئەوەی ئەو سنوقە بخاتە ناو گۆڕەکەمەوە. منیش لەبەرئەوەی مرۆڤم، لەناخی هەر مرۆڤێك کە پێش من لەجیهانەدا ژیاوە، ژیاوم و لەناخی هەر مرۆڤێکیش لەدوای منەوە دێتە ئەم جیهانەوە دەژیم.

لەبەرئەوەی مرۆڤم، چیتر لەمەودوا لەخەندە و گریان لە خۆشی و ناخۆشی و لەچاك سروشت و خراپ سروشت و لەلاوازی و بەهێزی مرۆڤەکاندا دەژیم و بەزیندوویی دمێنمەوە. ئەو مرۆڤەی هەزاران ساڵ لەدوای منەوە لەدایك دەبێت جگە لەمن هیچ کەسێکی تر نیە، چونکە ئەویش وەك من هەناسە دەدات و نان دەخوات و پێدەکەنێت و دەگریت و توشی چەند تاوانێك دەبێت و وا هەست دەکات ئارەزوی هەیە و فریوی یەك یان چەند ژنێك دەخوات و چێژ لەبۆنی خۆش وەردەگرێت و دەنگی موزیك بزەی پێ دەبەخشێت و ڕۆژ و هەفتە یان لەوانەشە ساڵها ڕۆ بچێتە ناو خەمەکانیەوە و هاوڕێکانی خیانەتی لێ بکەن یان خۆی خیانەت لەهاوڕێکانی بکات و سامان و دارایی خۆی بەهۆی بەخشین یان بەهۆی یاری قوماری زارەوە لەدەست بدات و وەك منیش شکست دەخوات و لەدواین ڕۆژ و ساتی تەمەنیدا لەگۆشەگیریدا یان لەنێو ئەندامانی خێزانەکەیدا دەمرێت.

هەرلەبەرئەوەش خەمی لەناوچونی ئەم کتێبە ناخۆم، چونکە هەرکە ئەم کتێبە لەناو چوو، من لەمرۆڤانی تردا زیندوو دەبمەوە.

ئەوە دواین گوتەی"سینۆهە"ی میسری بوو کە لەسەرتاپای ژیانیدا، هەستی بەوە دەکرد کە تەنهایە.

***کۆتایی کتێبی"سینۆهە" پزیشکی تایبەتی فیرعەون***

| تەواوکەری پێشەکی کتێبی"سینوهە"پزیشکی فیرعەون لە لاپەڕەی ئایندەدا دەکەوێتە بەرچاوی خوێنەر. |
|---|

## ڕونکردنەوەی وەرگێڕ

کاتێك دەستم بەوەرگێڕانی ئەم کتێبەی"سینۆهە پزیشکی تایبەتی فیرعەون"ە کرد، پێشەکی ئەو کتێبەم بەکورتی وەرگێڕا، بۆئەوەی خوێنەر وا هەست نەکات کتێبێکی ڕەوشتی"ئەخلاق" یان فۆلکلۆری دەخوێنێتەوە، بەلاّم ئەو دلّنیاییە بەخوێنەران دەبەخشم کە ناوەڕۆکی سەرەکی ئەم کتێبە بگرە وشەیەکی لیّ لا نەبراوە، کتێبی سینۆهە نەك تەنها ڕستە بەڕستە بەلّکو وشە بە وشەش وەرگێڕدراوە.

ئێستا کۆتایی بەم کتێبە هاتووە و خوێنەرە بەرجەستەکانیشی پەییان بەم کتێبە مێژوویی و دێرینە بردووە.

ئێمە ناوەڕۆکی تەواوی پێشەکی ئەم کتێبە دەخەینە بەردەست خوێنەران بۆئەوەی باشتر پەی بەناسنامەی کاری نوسەری"میکا ڤالّتاری"ببەن.

## پاشماوەی پێشەکی کتێبی پزیشکی مسری"سینوهە"

من"سینۆهە" کوڕی"سن موت"و هاوسەرەکەشی ناوی"کیپا"یە ئەم کتێبە دەنوسم. من ئەم کتێبە بۆ ئەوە نانوسم کە ستایشی خودایانی سەر زەوی بکەم، چونکە لەخودایان بێزارم، من ئەم کتێبە بۆئەوە نانوسم کە ستایشی فیرعەونەکانی میسری پێ بکەم، چونکە خودی فیرعەونەکانیش ئازاریان داوم. من ئەم کتێبە نانوسم بۆئەوەی چەورەیی بۆ خودایانی میسر بکەم، ئەوەی هانیدام ئەم کتێبە بنوسم، ترس لەئاینده یان هیوای ئاینده نیە.

من لەماوەی ژیانمدا ئەوندە ئەزمونی تاڵم بەدەست هێناوە و بەرادەیەك گرفتاری گرفتەکانی بوم کە چیتر لە شتگەلە خەیاڵاوی و ئاینده نادیارەکان ناترسم.

من لەهیوای مانەوەی ناوو ناوبانگیەکی جاویدانە وەڕەس بوم، بەهەمان شێوە لەخودایان و پادشاکانیش وەڕەسم.

من ئەم کتێبە تەنها بۆ خۆم دەنوسم و هەر لەبەرئەوەش واهەست دەکەم کە جیاوازیەکی تەواوم لەگەڵ نوسەرانی ڕابردوو ئاینده‌دا هەیە، چونکە ئەوەی تا ئەمڕۆ لەلایەن نوسەرانی ڕابردووەوە نوسراوەتەوە یان بۆ خۆشحاڵکردنی خودایان بووە یان بۆ ڕازیکردنی پادشا و مرۆڤەکانی تر. من فیرعەونەکانیش بەبەشێك لەمرۆڤەکان لەقەڵەم دەدەم، چونکە هیچ جیاوازیەکیان لەگەڵ ئێمەدا نیەو هەرکاتێکیش هەزارنجار بیانخەنە ڕیزی خودایانەوە، سەرەڕای ئەوەش پادشایەکی وەك ئێمەن، چونکە وەکو ئێمە هەڵگری خۆشەویستی و کینەن و وەك ئێمەش هەڵگری هیوا و نائومێدین.

گەرچی ئەمانە دەستەڵات و هێزی ئەوەیان هەیە کە ڕق و کینەی خۆیانی پێ کپ بکەنەوە، کاتێکیش دەترسن بیر لەڕێگەچارەیەك دەکەنەوە بۆئەوەی ئەو ترسەیانی پێ

لەناو ببەن، بەڵام ئەم هێز و دەسەڵاتە ناتوانێت ئەوان لەبەرگەگرتنی ئازارەکان بپارێزێت، بۆیە وەك ئێمە ئازار دەچێژن و وەك هەموو مرۆڤێکی تر خەمگین دەبن.

تا ئەمڕۆ، ئەوەی تائێستا لەجیهاندا نوسراوەتەوە یان بەفەرمانی دەسەڵاتدارەکان تۆمار کراوە، یان بۆ زمانچەوری و چەورەیی کردن بۆ خودایان یان بۆ فریودانی خەڵکی یان خستنە ڕوی ئەو ڕوداوانەی کە هێشتا ڕویان نەداوە یان بۆ ئاوەژوو کردنی ڕاستیەکان یان بۆ پینەکردنی ڕوداوە گۆمانلێکراوەکان نوسراوەتەوە.

ویستیان ئەوە بەخەڵکی ڕاگەیەنن کە ئەوەی بەچاوی خۆیان بینیان، هیچ ڕاستیەك لەخۆ ناگرێت و ڕوداوە ڕاستەقینەکان زۆر جیاوازە لەوەی ئێوە بیری لێدەکەنەوە. ویستیان خەڵکی بهێننە سەر ئەو باوەڕەی کە لە فلان ڕوداودا بەشی فلان پیاو زۆر کەم بووە، لەکاتێکدا بەپێچەوانەوە کە فلان پیاوی هیچ و پوچ بەشێکی مەزنی بەرکەوتووە.

من بەبوێریەوە پێتان دەڵێم، چونکە دڵنیام کە لەو ڕۆژەوەی مرۆڤ هاتووەتە ئەم جیهانەوە تا ئەمڕۆ ئەوەی نوسراوەتەوە، یان بۆئەوەبووە کە خوداکان لەخۆی ڕازی بکات یان بۆ ڕازیکردنی خەڵکی نوسیویەتەوە، ئیتر ئەو کەسانە، پادشا بن یان هەر کەسێکی تر.

من لەوباوەڕەدام لەئایندەشدا هەر وادەبێت، هەرکەسێك لەئایندەدا پێنوس بەدەستەوە بگرێت، یان بۆئەوەیە کە چەورەیی بۆ خوداکان بکات یان ئەوەی فەرمانڕەواکان یان خەڵکی لەخۆی ڕازی بکات ئیتر ئەو خەڵکە نەتەوەیەك بن یان کۆمەڵگا و چینێکی تایبەتی نەوەیەك بن.

من هەر لەبەرئەوەش واهەست دەکەم کە لەئایندەشدا تەواوی نوسەرەکان بۆ ڕازیکردنی خودایان و فەرمانڕەوایان و خەڵکی دەنوسن، چونکە لەم جیهانەدا هیچ شتێکی نوێ نایەتە بون و هەموو شتێك دوبارە سەرلەنوێ خۆی نوێ دەکاتەوە و ئەوەی لەڕابردوودا بونی هەبووە، دوبارە دەردەکەوێتەوە.

مرۆڤ لەژێر خۆردا بەشێوەیەکی گشتی هیچ گۆڕانکاریەکی بەسەردا نایەت و سەد هەزار ساڵی تریش کاتێك مرۆڤ دێتەبون، هەمان ئەم مرۆڤەی ئەمڕۆیە، بەڵام لەوانەیە گۆڕانکاری لە جل و شوازی ڕازاندنەوەی قژ و ڕیش و وشەدا دروست ببێت.

بەڵام تەنها شتێك لەمرۆڤدا گۆڕانكاری بەسەردا نایەت و ئەو شتەش گەمژەییەتی، گەر سەد هەزار ساڵی تر مرۆڤ بێتە بون، وەك مرۆڤەكانی سەردەمی ئێمە و ئەوانەی پێش ئێمە لەسەردەمی"قوچەكیەكان"دا دەژیان گەمژە دەبن و دەتوانرێت ئەویش بە درۆ و بەڵێنی بێ بنەمان فریوبدەیت، لەبەرئەوەی مرۆڤ بۆئەوەی بتوانێت بەردەوامی بەژیانی بدات پێویستی بەدرۆ و بەڵێنی بێبنەمایە و سروشتی ئەو وا دەخوازێت كە بۆ بەردەوامی زیاتر باوەڕی بەدرۆ بێت تا ڕاست، باوەڕی بە بەڵێنی بێ بنەما بێت كە هەرگیز ناچێتە واری كاركردنەوە تا ئەوەی باوەڕ بە بەڵێنە ڕاستیەكان بهێنێت.

تا ئەم جیهانەش بەم شێوەیە هەبێت جۆری مرۆڤیش هەر بەگەمژەیی دەمێنێتەوەو فریوی درۆ و بەڵێنە بێبنەماكان دەخوات، بەكورتیەكەی لەهەر قۆناخێك لەقۆناخەكاندا بەپێی پێویستی كات و سەردەم جۆرێك دۆری لەگەڵدا دەكرێتو جۆرێك بەڵێنی بێبنەمای نوێشی پێ دەدرێت، ئەویش بەخۆشیو هیوایەكەوە درۆو بەڵێنە خەیاڵپڵاویەكان پەسەند دەكات، ئەگەر كەسێك هەوڵی ئەوە بدات ئەو لەم گرفت و هەڵەیە دەربهێنێت و پێی بڵێت ئەوەی بەتۆیان وتووە درۆیەو دەیانەوێت تۆ بەم قسانە فریو بدەن و وەرە با من ڕاستیەكانت بۆ بخەمە ڕوو، هەمان ئەو مرۆڤە لێی توڕە دەبێت و ئەو كەسە بەتاوانی ئەوەی خیانەتكارو تاوانبارە بەكوشت دەدات.

باوەڕهێنان بەدرۆ و بەڵێنە بێ بنەماكان و ئەو مژدانەی كە هیچ كاتێك كرداریكردن بەخۆیانەوە نابینن، بەشێوەیەك ئاوێتەی سروشتی مرۆڤ بووە كە مرۆڤ ئەفسانە لە ڕاستی حاشاهەڵنەگر بەباشتر دەزانێت و هەرئەوەی گێڕەرەوەیەك دەمی دەكاتەوە و دەست بەگێڕانەوەی دەكات خەڵكی لەچواردەوری كۆدەبنەوە، سەرەڕای ئەوەی بەچاوی خۆیان دەبینن كە ئەو لەسەرسوچێكی كۆڵاندا لەسەر زەوی دانیشتووە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش كاتێك باسی ئاشكرا كردنی گەنجینەیەكیان بۆ دەكات و مژدەی ئەوەیان پێ دەدات كەزێڕ و زیوێكی زۆر دەبێتە بەشی ئەوانەی گوێ لێدەگرن، ئەوانیش یەكسەر باوەڕی پێدەكەن.

بەڵام من"سینۆهە"نوسەری ئەم كتێبە لەدرۆ ئەویش لەم قۆناخەی پیریەمدا زۆر بێزارم و لەم كتێبەشمدا ئەوەی درۆ بێت نایینوسم.

لەوانەیە ئەگەر لاو بومایە و ئەم کتێبەم لەسەردەمی لاویەتیمدا بنوسیایە، منیش وەك نوسەرەکانی تر درۆم دەکرد و شتێکم دەنوسی کەشایەنی پەسەندی خودایان یان فەرمانڕەوا و پادشاکان یان خەڵکی بێت.

بەڵام لەم سەردەمی پیریەمدا کە لەخودایان و پادشاکان و تەواوی مرۆڤ بێزاربوم، بۆیە نەحەزم لەدرۆیە و نە پێویستیشم پێیەتی.

چونکە من ئەم کتێبە بۆ خەڵکی نانوسم و نامەوێت هیچ کەسێکیش لەخۆم ڕازی بکەم، بۆیە ناچارم ئەم کتێبە بۆخۆم بنوسمەوە.

ئەوەی من لەم کتێبەدا دەینوسم شتگەلێکە کە بەچاوی خۆم بینیومە یان دەزانم کە ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە سەرەڕای ئەوەی بەچاوی خۆم نەمبینیبێت، هەرلەبەرئەوەش من لەگەڵ ئەو نوسەرانەی پێش خۆم بون یان لەدوای منەوە دێن زۆر جیاوازم، چونکە نوسەرانی ڕابردوو ئایندە-لەبەرئەوەی هەموو شتێك لەم جیهانەدا دوبارە دەبێتەوە- بەبەردەوامی ئەوەی بەچاوی خۆیان بینیویانە یان دەیبینن نایانوسنەوە، هەندێکاتیش لەژێرپێی دەنێن و پشتگوێی دەخەن و لەباتی ئەو ڕاستیانە شتگەلێك دەنوسن کە هاوکاریان بکات لەوەی ناوبانگ بەدەست بهێنن.

ئەو کەسەی شتێك دەنوسێت، یان بەو هیوایەوە نوسینەکانی خۆی لەسەر بەردێك هەڵدەکۆڵێت، بۆئەوەی ئەوانەی لەئایندەدا دێن نوسینەکانی بخوێننەوەو دەستخۆشی لێ بکەن و کار و بەرهەمە بەرجەستەکانی بەرز ڕابگرن.

بەڵام ئەو وشانەی من دەمویت بیانوسم شتێکیان تێدا بەدی ناکرێت کە شایستەی دەستخۆشی بێت و ئەو کارانەش کە من ئەنجامم داوە، شایستەی ڕێزلێگرتن نیە و من پیاوێکی ژیر و دانا نیم، بۆئەوەی ئەوانەی لەئایندەدا دێن پەند لەنوسینەکانم وەرگرن و منداڵەکانیش لەقوتابخانەدا هەرگیز ئەو ڕستانەی من وتونم لەسەر تەختە قوڕی خۆشەکراو نایانوسنەوە، بۆئەوەی مەشقی نوسینی خۆیانی لەسەر بکەن و لەڕێی ڕستەکانی منەوە بەباشی خۆیان فێری نوسین بکەن و پیاوانی باڵخیش لەکاتی گفتوگۆکردندا بۆئەوەی ڕۆشنبیری و زانیاری خۆیان بۆخەڵکانی تر بخەنەڕوو، ڕستەکانی من دوبارە ناکەنەوە، چونکە من ئومێدی ئەوەم نیە کە کەسێك کتێبەکەی من بخوێنێتەوە و ناوم بەبیر خۆی بهێنێتەوە.

گریمان من پیاوێکی پیرمەندم و بیروباوەڕێکی دروستیشم هەبووە، ئەوا لەم کاتەدا ئۆمێدی ئەوەم هەبوو کە لەئایندەدا کتێبەکەم بخوێننەوە، سەرەڕای ئەوەش ژیری و پلانەکانم هیچ سودێکیان بەنەوەکانی ئاینده نەدەگەیاند، چونکه مرۆڤ بەبیستنی پەندو خوێندنەوەی کتێبی ژیرانه چاك نابێت.

لەبەرئەوەی مرۆڤ ئەوەنده شەڕەنگێز و بێبەزەیی و ئازاربەخشه کە تیمساحی ڕوباری"نیل" لەچاو ئەودا بەبەزەیی و کەمئازار دێتەبەرچاو و دڵیشی کە لەبەرد ڕەقترە، هەرگیز نەرم نابێت، مەحاڵە ڕۆژێك بێت لەخۆبایی و خۆپەسەندی و خۆویستی ئەو لەناو بچێت، مرۆڤێك هەڵدەرە ڕوباری"نیل"ەوە کە لەوانەیە نوقم بونی لەناو ئاودا گۆڕانێك لەودا دروست بکات، دوای ئەوە لەناو ئاوەکە دەریبهێنە، بەڵام هەر ئەوەی جلەکانی بەری وشك بونەوە دەگەڕێتەوەی هەمان دۆخی جارانی.

مرۆڤێك دوچاری مەزنترین و توندترین بەدبەختی بکە، لەوانەیە چاکسازی تێدا بکرێت، بەڵام هەر ئەوەی بەدبەختیەکانی لەناو چوون و خۆی لەخۆشحاڵیدا بینیەوە، دوبارە دەگەڕێتەوە هەمان ئەو دۆخەی پێشتر بووە.

من لەماوەی ژیانمدا گۆڕانکاری و کودەتاگەلێکی زۆرم بینیوە و لەهەر جارێکدا وام دەزانی کە دوای ئەم گۆڕان و کودەتایە گۆڕانکاری لەمرۆڤدا دروست دەبێت، بەڵام بینیم کە هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهات، لەبەرئەوە بەچ شێوەیەك دەتوانی بەهیوای ئەوەوە بیت کە خوێندنەوەی کتێبێك گۆڕان و چاکسازی لەجۆری مرۆڤدا بکات.

کەسانێك دەڵێن ئەوەی ئەمڕۆ ڕودەدات بێوێنەیە و هەرگیز لەجیهاندا ڕوینەداوە، بەڵام ئەم گوتەیە گوزارشت لەڕوکەشپەرستی و بێئەزمونی مرۆڤ دەکات، چونکه هەموو ڕوداوێك کە لەجیهاندا ڕوو دەدات، پێشنە و هاوشێوەی هەیە.

من کە ناوم"سینۆهە"یە بەچاوی خۆم ئەوەم بینیوە کە لەکۆلاندا کوڕ باوکی خۆی کوشتوەتەوە، چونکه کوڕەکە هێمای"خاچی"بەسینەیەوە هەڵواسیبوو و باوکیشی هێمانی"شاخ".

بەچاوی خۆم بینیومە کە نۆکەران و کرێکاران دژی دەوڵەمەند و وەجاخزادەکان ڕاپەڕیون هەروەها ئەوەشم بینیوە کە خوداکان شەڕیان لەگەڵ یەکتردا کردووە.

هەروەها ئەوەم بەچاوی خۆم بینیوە کە پیاوێك بەردەوام لەکاسەی زێڕیندا شەرابی خواردووەتەوە، لەکاتی تەنگدەستیشدا لەکەنار ڕوباری"نیل"دا بەمشت ئاوی

دەخواردەوە. من ئەوانەشم بەچاوی خۆم بینیوە کەسەردەمانێك بەترازوو کێشانەی زێڕ و ئاڵتونی خۆیان دەکرد، لەچواڕیانەکاندا سواڵیان دەکرد و ژنانی هەمان ئەم جۆرە پیاوانەش لەپێناو پارچە نانێکدا خۆیان بە ڕەشپێستەکان دەفرۆشت، بۆئەوەی نان بۆ منداڵەکانیان پەیدا بکەن، ئەوانەی من بەچاوی خۆم بینیومە، پێش منیش ڕویانداوە و دوای منیش ڕوو دەدەنەوە.

لەسەردەمی مندا، خەڵکی پەندیان لەڕوداوەکانی ڕابردوو وەرنەگرت، لەمحاڵەتدا بەچ شێوەیەك دەتوانم بڵێم: ئەوانەی لەئایندەدا دێت، پەند لەو ڕوداوانەی کە لەم کتێبەی مندا نوسراوەتەوە وەردەگرن.

هەروەك چۆن تائێستا هیچ گۆڕانکاریەك لەمرۆڤدا دروست نەبووە، ئەوا لەئایندەشدا هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نایەت.

هەرلەبەرئەوەش ئەم کتێبە تەنها بۆ ئەوە نانوسم کە کەسێك ئامۆژگاری بخوێنێتەوە و پەند لەڕابردوو وەرگرێت.

من ئەم کتێبە بۆ خۆم دەنوسم، چونکە دانایی ئازارم دەدات و وەك تێزابێك دڵم دەخوات و منیش ناچارم ئەوەی دەیزانم، بینوسم بۆئەوەی کەمێك لەئازارەکانم کەم بێتەوە.

من لەسێیەمین ساڵی نیشتەجێ بونم، لەشوێنێك کە دەکەوێتە کەنارەکانی دەریای ڕۆژهەڵاتەوە کە شوێنی دورخراوەکەی منە دەستم کرد بەنوسینی ئەم کتێبە، ئەو شوێنە ناوچەیەکە کە ئەو کەشتیانەی بەرەو هیندستان بەڕێ دەکەون لەوێوە تێدەپەڕن، لەچواردەوری شوێنی نیشتەجێ بونم زنجیرە شاخێکی سورباو هەیە و لەڕابردوودا فەرمانڕەوایانی میسر، بۆ دروستکردنی پەیکەرەکانی خۆیان، سودیان لەبەردی ئەم شاخانە وەردەگرت.

من لەبەرئەوە ئەم کتێبە دەنوسم کە چیتر شەراب لەدەممدا هیچ تامێکی نیە و حەزیش بەوە ناکەم لەگەڵ ژناندا ڕابوێرم، هەروەها تەماشاکردنی ماسی هەسێراوەکان و بینینی گوڵ لەباخەکاندا چیژم پێ نابەخشێت و لەشەوانی ساردی زستاندا، کچێکی لاوی ڕەشپێست، لەتەنیشتەمەوە دەخەوێت و جێگە خەوەکەم گەرم دەکاتەوە، بەڵام خۆشحاڵ نیم بەوەی ئەو لەتەنیشتمەوە خەوتووە.

ماوەیەکە گۆرانی بێژەکانم دەرکردووە، چونکە نە چێژ لەگۆرانیەکانیان وەردەگرمو نە لەئاوازی ژەنیارەکان، بەپێچەوانەوە دەنگی موزیك، و ئاهەنگی ئاوازەکان، دڵگرانترم دەکەن. چیتر زێڕ و زیو و گەوهەر و پێکی ئاڵتونی و عەنبەر و عاج و داری "ئابنوس"[٥٧] سەرنجم ڕاناکێشێت.

سەرەڕای ئەوەی لەدورخراوەدا دەژیم، هەموو ئەو شتانەی باسم کردن هەمە، چونکە ئەوەی هەمبوو لێیان نەسەندم، لە"تبس"ی پایتەختی میسر، ئەو پیاوەی لەڕابردوودا کۆیلەی خۆم بووە و ئێستا زۆر دەوڵەمەندە، شتگەلێکی زۆر گرانبەهای بۆ ناردوم.

هێشتا نۆکەرەکانم لەگاڵۆکەکەم دەترسن و ئەو سەربازانەی پاسەوانی منن، کاتێك چاویان پێم دەکەوێت دەستیان دەخەنە سەر ئەژنۆیان و سوژدەم بۆ دەبەن. بەڵام ئەو ناوچەیەی کەمن دەتوانم پیاسەی تێدا بکەم سنوردارە و هیچ کەشتیەك ناتوانێت لەڕێی دەریاوە، لەو کەنارە نزیك بێتەوە کە منی لێ نیشتەجێم و لەبەرئەوەی هەموو شتێکم لەبەرچاو کەوتووە، چیتر ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ میسر و لەژێر پێمدا هەست بەزەوی ڕەش بکەم و بۆنی شەوانی"تبس"بکەم، هەر لەبەرئەوەش ئەم کتێبە دەنوسم.

ئەمڕۆ من لێرەدا پیاوێکی گۆشەگیرم، بەڵام لەڕابردوودا، ناوم، لەکتێبی ئاڵتونی فیرعەندا تۆمار کراوە و لەکۆشکی زێڕین کە یەکێکە لەکۆشکی فەرمانڕەوایی میسر، لەتەلارێك کە دەکەوتە لای ڕاستی شوێنی نیشتەجێبونی فیرعەوندا دەژیام.

لەوکاتەدا، گوتەکانم لەگوتەی بەرجەستەترین پیاوانی میسر بەهادارتربوو، کەسە وەجاخزادەکانیش دیارییان پێشکەش دەکردم و ملوانکەی زێڕینیان لەگەردنم دەئاڵاند.

من لەوکاتانەدا ئەوەی مرۆڤ ئارەزوی بکات، هەمبوو، بەڵام شتێکم دەویست کە هیچ مرۆڤێك نەیدەتوانی بەدەستی بهێنێت، ئەو شتەش ڕاستی بوو، بەواتا ڕاستی "ئازادی و یەکسانی و دادپەروەری".

هەرلەبەرئەوەش، لەمڕۆدا لەم شوێنە دورەدا، لەکەنار دەریای ڕۆژهەڵاتدا دەژیم، چونکە لەشەشەمین ساڵی فەرمانڕەوایی"هورم هب" فیرعەونی میسردا، منی بەسزای

[٥٧] برۆ بۆ پەراوێزی ژمارە"٢٥"ی بەرگی یەکەمی سینۆهە

ئەوەی بانگەشەی ئازادی و یەکسانی و دادپەروەریم کردووە، لەمیسر دوری خستمەوە و "هورم هب"فەرمانی دا ئەگەر بمەوێت بگەڕێمەوە بۆ میسر، وەك سەگێکی هار فەرمانی کوشتنم بدات و هەرکاتێکیش پێ بنێمەی خاکی میسرەوە، وەك بۆقێق بەیەك لەقە بەسەر خۆڵ و بەردی میسرەوە بمفلیقێنن و فەرمان بەو پاسەوانانەی کە لەلایەن فیرعەونی میسرەوە دەستنیشان کراون پاسەوانی من بکەن بدات کە نەهێڵن سنوری ئەو شوێنەی بۆ پیاسەکردنم دەستینشان کراوە ببەزێنم.

لەکاتێکدا فیرعەون سەردەمانێك هاوڕێم بووە و وام دەزانی ئەوکاتەی بانگی کردمە لای خۆیی کاری پێمە و منیش چەند کارێکی بۆ ئەنجام بدەم. بەڵام لەپیاوێکی وەك"هورم هب"فیرعەونی میسر کە لە نەژادێکی ڕسوا لەدایك بووە و هیچ ڕەسەنایەتیەکی نیە، نابێت جگە لەوە چاوەڕێی هیچ شتێکی تری لێ بکەیت، ئەم پیاوە، دوای ئەوەی بەفەرمانڕەوایی خۆی گەشت، ناوی فەرمانڕەوایانی ڕابردوی بەسەر دیواری پەرستگاکانەوە پاك کردەوە و لەباتی ئەوانە ناوی باوك و دایك و باپیرانی خۆی نوسی، ئەو ڕۆژەی لەپەرەستگادا تاجی فەرمانڕەوایی لەسەرکرد، من لەوێ بوم و بینیم کە تاجی سور و سپی میسری لەسەری خۆی نا و شەش ساڵ دوای ئەو مەراسیمی تاج گوزاریە منی لەمیسر دور خستەوە و ئەمەش بەڵگەیەکی ترە، کەمن دەزانم ئەو لەچ مێژوویەدا بو بە فیرعەونی میسر، سەرەڕای ئەوەش نوسەرەکانی لەوە ئاگادار کردەوە سەردەمی فەرمانڕەواییەکەی درێژتر بکەنەوە و بەو شێوەیە بینوسن کە ئەو کاتێك منی دور خستەوە سی و دوساڵ لەتەمەنی فەرمانڕوایی ئەو تێدەپەڕێت.

من ئەوەم بەچاوی خۆم بینی کاتێك منی دور خستەوە ئەوەندە لەخۆی بایی و بەهێز بوو کە هیچ گرنگیەکی بەوە نەدەدا کە مێژوی دورخستنەوەی من لەشوێنێکدا تۆمار بکات، بەڵام دەمەوێت ئەوە بڵێم لەبەرئەوەی"هورم هب"مێژووی فەرمانڕەوایی خۆی ساختە کرد، ئەو کەسانەی کە لەئایندەدا مێژووی فەرمانڕەوایی ئەو دەخوێننەوە وا دەزانن کاتێك من لەمیسر دور خرامەوە، سی و دوو ساڵ لەتەمەنی فەرمانڕەوایی ئەوە تێدەپەڕێت، لەکاتێکدا لەشەش ساڵ زیاتر تێنەپەڕیوە.

بۆیە ئەو پیاوە مێژووی فەرمانڕەوایی خۆی لەو ڕۆژەوە دەژمێرێت کە لەسەردەمی لاویەتیدا، کاتێك شەهێنێك لەپێشیەوە دەفڕی و خۆی کردووە بەناو شاری"تبس"دا.

پادشایەکی میسر بەوشێوەیە مێژوی فەرمانڕەوایی خۆی تۆمار بکات، ئایا لەم حاڵەتەدا دەتوانرێت متمانە بەمێژوی فەرمانڕەوایی فەرمانڕەوایانی ڕابردوو بکەیت؟

وەك بڵێی لەسەردەمی لاویەتیدا کوێر بوم و چاوم بەڕاستیەکان نەدەکەوت، هەر لەبەرئەوەش زۆر ڕقم لەو پیاوە بوو کە لەپێناو ڕاستیەکاندا زیندوو بوو، چونکە ئەوەم بەچاوی خۆم بینی کە ڕاستیەکانی ئەو لەوڵاتی میسردا ترس و بێبەندوباری هێنایە بون.

ئەو دەیویست لەگەڵ خودای خۆیدا، بەواتا لەگەڵ ڕاستیدا بژیت و منیش قەدری ئەوم نەدەزانی، خودی خۆشم هەوڵی لەناوبردنیم دا و ئەمڕۆ دەبێت سزای کار و ڕەفتارەکانی خۆم ببینم، چونکە منیش دەمەوێت لەگەڵ ڕاستیەکاندا بژیم، بەلام ناتوانم.

ڕاستی وەك چەقۆیەکی تیژ و برینێکی تیمار نەکراو وایە، هەرلەبەرئەوەش هەموو کەسێك لەسەردەمی لاویەتیدا لەڕاستیەکان هەڵدێت و هەندێك تریش خۆیان بەخواردنەوە و ڕابواردن لەگەڵ ژنەکاندا تێدەپەڕێنن و هەندێ کەسیش بەهەموو توانایەکیانەوە هەوڵی کۆکردنەوەی سامانێکی زۆر دەدەن، بۆئەوەی ڕاستیەکان فەرامۆش بکەن، هەندێکی تریش لەڕێی قومارکردنەوە خۆیان سەرگەرم دەکەن و تەنها بۆ هەڵهاتن لەڕاستیەکانیش گوێ لەئاوازە موزیکیەکان دەگرن.

تا لاویەتی هەبێت، سامان و دەسەڵات دەبێتە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی مرۆڤ پەی بەڕاستیەکان ببات، بەڵام کاتێك پیر بوو، ڕاستی وەك نێزەیەك کە هیچ کەسێك نازانێت لەکوێوە دێت و دەچەقێتە ناو جەستەیەوە و کۆنێکی تێدەکات دوای ئەوە هیچ شتێك سەرنجی مرۆڤ ڕاناکێشێت و لەهەموو شتێك بێزار دەبێت، لەبەرئەوەی دەبینێت هەموو شتێك یاری منداڵانەو درۆو ساختە بووە، ئەوکات لەجیهاندا لەنێو هاوڕەگەزەکانیدا خۆی تەنها دەبینێت، چیتر دوای ئەوە نە هیچ مرۆڤێك دەتوانێت هاوکاری بکات و نە خوداکانیش دەتوانن ڕزگاری بکەن.

من کە"سینۆهە"م و ئەم هێمایانە لەسەر پاپیرۆس وێنە دەکێشم، دان بەوەدا دەنێم کە بەشێك لەکارەکانم زۆر خراپ بووە و من بگرە چەند تاوانێکیشم ئەنجام داوە، لەبەرئەوەی وام دەزانی ئەو جۆرە تاوانانەم ڕەواو و پێویستە، بەڵام ئاگاداری ئەوەشم

ئەگەر بەڕێکەوت لەئایندەدا لەڕێی کەسێکەوە ئەم ڕوداوانە خوێندرایەوە، ئەو کەسە هیچ پەندێك لە خوێندنی ئەم کتێبەی من وەرناگرێت.

کاتێک کەسانی تریش تاوانێک دەکەن، دەڕۆن بۆ پەرستگای"ئامون"و ئاوی پیرۆزی "ئامون"بەسەر لەشیاندا دەڕێژن و واهەست دەکەن بەم کارەیان، هەموو تاوان و گۆناهێکیان لەخۆیان پاکردووەتەوە.

بەڵام من کە لەم کۆتایی تەمەنمدام باوەڕم بەخوداکان نیە، لەبەرئەوەی دەزانم ئەمانیش وەك مرۆڤەکان حەز لەدرۆ و دوڕویی و ساختەکارین، هەرلەبەرئەوەش بەئاوی پیرۆزی"ئامون" لەشپیسی خۆم دەرناکەم و دەزانم کە هیچ هێز و توانایەك ناتوانێت دڵی مرۆڤێك بگۆڕێت و ئەو پیاوەی کە تاوانێك ئەنجام دەدات، لەدڵی خۆیدا خۆی بەتاوانبار دەزانێت. بەڵام لەهزری خۆمدا بیرم لەوە کردەوە، ئەگەر ئەم کردارانەی خۆم بنوسمەوە، تۆ بڵێی کەمێك لەم فشارە دەرونیەکانم کەم بێتەوە؟

کەسانی تر، بەدرۆ دیمەنی کرداروڕەفتارە چاکەکانیان بەسەر دیواری گۆڕەکانیانەوە وێنە دەکێشن، بۆئەوەی لەجیهانی خۆرئاوادا"ئوزیریس"ی پێ فریوبدەن و ئەو جۆرە کردارانەی کە لەسەر دیوای گۆڕەکانیاندا وێنەیان کێشاوە بیخاتە تای ترازووەکەیەوە، بۆئەوەی تای ترازوی چاکەی قورستر ببێت.

من نامەوێت هیچ کەسێك فریو بدەم و ترازوی منیش ئەم"پاپیرۆس"ەیە و شەهێنی ترازوش ئەم پێنوسەی دەستمە کە لەئێستادا هەندێك هێما لەسەر "پاپیرۆس"ەکە دەکێشێت.

بەڵام لەوانەیە بمەوێت خۆم فریو بدەم...پەنا بەخوداکان...کە مرۆڤی ئەوەندە درۆزن و فێڵباز دروست کراوە، بێئەوەی خۆی بزانێت خۆدی خۆشی فریو دەدات.

ئەگەر واش بێت، ئەوا نوسینی ئەم کتێبە بەلای منەوە وەك تلیاك وایە کە هێمنی و هێوریم پێ دەبەخشێت.

تلیاك ئازارەکان هێور دەکاتەوە، بەڵام ناتوانێت بەتەواوی ئەو ئازارە لەڕیشەوە هەڵکێشێت، ئەم کتێبەش هێورم دەکاتەوە، بەڵام ناتوانێت کارە ناشیرینەکانم لەناو ببات و بەتەواوی لەهەموو گوناهێك پاکم بکاتەوە.

پێش ئەوەی دەست بەنوسینی ئەم کتێبە بکەم، دەمەوێت دڵم ئازاد بکەم بۆئەوەی کەمێك هاوار بکات و بگریت، چونکە دڵی پیاوێکی دەرکراو و کۆچکردووە و پێویستی بەهاوار و گریانە.

دڵم بەئارەزوی هەوای میسر و نیل و تبس دەگریت، چونکە هەرکەسێك بۆجارێك ئاوی ڕوباری "نیل"ی خواردەوە، بەبەردەوامی ئارەزوی خواردنەوەی ئەو ئاوە دەکات و هیچ ئاوێکی تر تینوی ناشکێنێت.

کەسێك لە"تبس"دا چاوی بەجیهان هەڵهێنابێت، ئارەزوی بینینی"تبس"دەکات، چونکە لەجیهاندا شارێکی وەك"تبس"بەدی ناکرێت.

کەسێك لەکۆڵانێکی"تبس"دا گەورە بوبێت، ئەگەر دوای ماوەیەك بگوازرێتەوە بۆ ناو کۆشکێك کە بەداری"سدر"دروستیان کردبێت، سەرەڕای ئەوەش ئارەزوی ئەو کۆڵانەی تێیدا گەورە بووە دەکات، بۆئەوەی بتوانێت بۆنی سوتانی تەپاڵەی مانگا بکات لەو ئاگردانانەی کە لەبەردەم ماڵەکاندان دروستی دەکەن و لەسەر هەمان ئەو ئاگردانەدا ماسی دەبرژێنن.

ئەگەر بمتوانیایە تەنها جارێکی تر پێ بنێمە سەر زەوی ڕەشی کەنارەکانی ڕوباری"نیل"و پیاسە بکەم، ئامادەم پێکێکی ئاڵتونی شەرابەکەی خۆم بەپێکێکی گڵینی جوتیارەکان بگۆڕمەوەو ئەم پۆشاکە کەتانیەش کە لەبەرمدایە فڕێ بدەم و شەرواڵی نۆکەرەکان لەکەمرم ببەستم.

ئەگەر بمتوانیایە بۆ تەنها جارێکی تر دەنگی شنەی بای نێو نەیجەلانی کەنار ڕوباری نیل ببیستم و فڕینی پەڕسێلکە بەسەر ئاوی نیلەوە ببینم، بۆ جارێکی تر هەموو دارایی خۆم بەنێو خەڵکی هەژاردا دەبەخشی.

من بۆچی پەڕەسێلکەیەك نەبوم، بۆئەوەی بێئەوەی پاسەوانەکان بتوانن ڕێم لێبگرن، لێرەوە بفڕیمایە و بەرەو وڵاتی میسر بڕۆشتمایە و لەوێ بەسەر یەکێك لە پایە بەرزەکانی پەرستگای "ئامون" لەکاتێکدا گومەزەی ئاڵتونی و بەرزی لەژێر ڕوناکی خۆردا دەدرەوشێتەوە، هێلانە بکەمو بۆنی بخوردی پەرستگا و خوێنی قوربانی پەرستگاکان بکەم.

بۆچی باڵندەیەك نەبوم بۆئەوەی بەسەربانی پەرستگای"ئامون"ەوە خۆم بەتەماشاکردنی چواردەورەوە سەرقاڵ بکەم و بزانم بەچ شێوەیەك گالیسکە قورسەکان

لەکۆلانەکانی "تبس"دا ڕادەکێشرێن و پیشەگەرەکانیش لە فرۆشگاکانی خۆیان بەچ شێوەیەك سەرقاڵی دروست کردنی گۆزە و چنینی حەسیر و نان دروست کردنن و میوە فرۆشەکانیش بەدەنگێکی خۆش، میوەکانی خۆیان پیشانی ڕێبوارەکان دەدەن.

ئاه....ئەی خۆری درەوشاوەی سەردەمی لاویەتی...ئەی شێتیە چێژبەخشەکانی سەردەمی لاویەتی...لەکوێن و بۆچی بەجێتان هێشتوم؟

ئەمرۆ من نانێك کە لەناوکی گەنم دروست کراوە دەخۆم و دەتوانم هەر تیکە نانێك نوقمی کاسەی پڕ لەهەنگوین بکەم، بەلاّم ئەم نانە لەدەمی مندا تامی تاڵی دەدات و چێژی ئەو نانە وشکەی لەسەردەمی لاویەتیمدا پڕ بوو لەسوس نادات.

ئەی سالانی ڕابردوو کە تێپەڕیون، ڕاوەستن...و بگەڕێنەوە..ئەی "ئامون"- مەبەستی خۆرە- کە بەردەوام لەئاسماندا لەڕۆژهەلاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەڕۆیت، بۆ جارێکیش بێت لەخۆرئاواوە بەرەو خۆرهەلات بڕۆ، بۆئەوەی من لاویەتی لەدەستچوم بەدەست بهێنمەوە، لەکوێن، بۆچی لەباوەشی ژناندا هەست بە لەرزە چێژ بەخشەکان ناکەم، ئەی ئەو پێنوسە قامیشیەی کە بەدەستمەوەیت و لەسەر "پاپیرۆس"دێیت و دەڕۆیت، ئێستا خودایان ناتوانن سەردەمانی منداڵی و لاویەتیم بۆ بگەڕێننەوە، تۆ بەنوسین یادگاری ڕابردوو سەردەمی منداڵیم و ئەو لەرزینە چێژبەخشەی سەردەمی لاویەتیم بۆ بگەڕێنەرەوە، بۆئەوەی "سینۆهە"کە لەمرۆدا لە جوتیارێکی سەرزەمینی ڕەش بەدبەختره، خۆی بەڕابردووەوە سەرقاڵ بکات و خەمی بونایەتی فەرامۆش بکات.

****

ئەو پیاوەی وام دەزانی باوکمە بەناوی "سن موت"بانگ دەکرا پزیشك بوو و لەگەڕەکی هەژار نشینەکانی "تبس"دا دەژیا و خەلکانی هەژاری تیمار دەکرد.

ژنێکیش بەناوی "کیپا" کە من بەدایك بانگم دەکرد، هاوسەری ئەو بوو.

ئەم دوو کەسە سەرەڕای ئەوەی پیر بون، منداڵیان نەبوو، هەر لەبەرئەوەش لەسەردەمی پیریاندا منیان کردە کوڕی خۆیان.

"سن موت"و"کیپا"لەبەرئەوەی کەسێکی سادەبون، وتیان خوداکان منیان بۆ ئەوان ناردووە و پێشبینی ئەوەیان نەدەکرد کەمن بەچ شێوەیەك دەبمە مایەی چارەڕەشیان.

"کیپیا"کە زۆر حەزی لەئەفسانەکان بوو، منی بەناوی یەکێك لەپاڵەوانی ئەفسانەکانی بەناوی"سینۆهە"بانگ دەکرد و"سینۆهە"پیاوێك بوو کە بەپێی ئەو داستانە، ڕۆژێکیان لەچادرێکدا فیرعەون گوێی لەنهێنیەکی ترسناك دەبێت و لەترسی ئەوەی نەکوژرێت، هەڵهات و ساڵها لەولاتانی بێگانەدا ژیانی بەسەر برد و چەند کارەساتێکی ترسناکی بەسەردا هات کە لەهەمویاندا توانی بێ هیچ زیانێك خۆی دەرباز بکات.

"کیپیا"کە ژنێکی سادە بوو، وای دەزانی کە منیش وەك ئەو فیرعەونە لەهەموو کارەساتەکاندا بێ هیچ زیانێك خۆم دەرباز کردووەو بەو گەشتوم، ئەگەر ناوی "سینۆهە"شم لێ بنێت ئەوا لەئایندەشدا دەتوانم خۆم لەهەموو کارەساتەکان ڕزگار بکەم. بەڵام کاهینەکانی خودای"ئامون" دەڵێن کە ناو کاریگەریەکی زۆر دەخاتە سەر ژیانی مرۆڤ و لەوانەیە هەر لەبەرئەوەش بوبێت کە گرفتاری ئەو هەموو ڕوداوانە بوبێتم و ماوەیەك لەولاتانی بێگانەدا ژیاوم، لەوانەیە لەبەرئەوەی ناوم"سینۆهە"بووە، پەیم بەنهێنیگەلێکی مەزن، بەواتا نهێنی پادشا و ژنەکانیان کە دەبووە هۆی مەرگی کەسانێك بردووە، بەکورتیەکەی ئەم ناوە منی دەربەدەر کردودوچاری دورخستنەوەی کردم.

من لەوباوەڕەدا نیم لەبەرئەوەی"کیپیا"ئەو کەسەی ناوی لێنام، منی بەناوی "سینۆهە"بانگ کردووە، بووبێتە هۆی ئەوەی لەسەردەمی ژیانمدا دوچاری ئەو هەموو ڕوداوانە ببم.

ئەگەر ناوم"کپرو"یان"کفرن"یان"موسی"بوایە، ئەوا چارەنوسم هەر ئەوە دەبوو کە بینیم، بەڵام ناتوانرێت نکوڵی لەوە بکرێت کە"سینۆهە"کەسێکی ڕەتکراو و دەرکراو بووە، بەڵام پیاوێك بەناوی"هورم هب" بەواتا"کوڕی شەهێن[58]"بەپلەی فەرمانڕەوایی گەیشت و تاجی پادشایی میسری لەسەرنا.

---

[58] بەزمانی کوردی دەبێت بڵێین"بەچکە شەهێن" نەك"کوڕی شەهێن" بەڵام ئێمە هەوڵمان داوە بەئەمانەتەوە شێوازی دەربڕینی میسری ئەو سەردەمە وەرگێڕینە سەر زمانی کوردی.....

بۆیە هەندێجار ڕوداوی ژیانی کەسێك بەشێوەیەك لەشێوەکان لەگەڵ ناوەکەیدا دەگونجێت کە خەڵکی وابیری لێ دەکەنەوە کە ناو کاریگەری بەسەر چارەنوسی ژیانی ئەو کەسەوە هەیە.

هەندێ کەس بۆئەوەی لەکاتی بەدبەختیەکانیاندا دڵنەوایی خۆیان بدەنەوە دەڵێن، ئێمە گرفتاری ناوی خۆمانین، لەکاتێکدا کەسێکی خۆشبەخت بن، شانازی بەوەوە دەکەن کە هەر لەسەرتاوە ناویان خۆشبەختی بۆ هێناون.

من لەسەردەمی فەرمانڕەوایی "ئامون هوتپ"ی سێیەم لەدایك بوم و لەهەمان ئەو ساڵەدا، کەسێك لەدایك بوو کە لەدواییدا ناوی چوارەمی "ئامون هوتپ"و لەدواییدا ناوی "ئەخناتون"ی لەخۆی نا، بەڵام ئەمڕۆ کەسێك ئەم ناوە ناهێنێتە زمان. لەبەرئەوەی ناوێکی نەفرەت لێکراوە، چونکە "ئامن هوتپ"ی چوارەم دەیویست لەپێناو ڕاستیەکاندا بژیت.

کاتێك لەدایك بوو، لەکۆشکی فەرمانڕەوایی میسر دا خۆشی باڵی بەسەر ئەو کۆشکەدا گرت و فیرعەون بەخۆشی ئەو ڕوداوەوە لەپەرستگای "ئامون" قوربانی پێشکەش کرد و نەتەوەی میسریش، خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی، چونکە نەیاندەزانی سەردەمی فەرمانڕەوایی "ئەخناتون" دوچاری چ بەدبەختیەکیان دەکات.

"تی ئی"هاوسەری فیرعەون کە بۆماوەی بیست و دوو ساڵ ژنی بوو و لەتەواوی پەرستگاکاندا ناوی لەتەنیش ناوی فیرعەونەوە نوسیبوو، تا ئەو بەروارە نەیتوانی کوڕێکی پێ ببەخشێت.

ئەوبوو دوای لەدایك بونی ئەو کوڕەی فیرعەون، زۆر خۆشحاڵ بوو و هەرئەوەی کاهینەکانی ئەو کوڕەیان خەتەنە کرد، ئەوی بەجێنیشنی خۆی لەقەڵەم دا. ئەو کوڕە لەوەرزی بەهار و ئەو کاتەی جوتیاران، دەست بەکشتوکاڵی دەکەن، لەدایك بوو، و من لەوەرزی پایزی پێشودا، کاتێك کە ڕوباری "نیل"هەڵدەچێت، لەدایك بوم. بەڵام دەقاودەق ئاگاداری ڕۆژ و ساتی لەدایکبونم نیم، چونکە کاتێك زڕدایکەکەم "کیپا"چاوی پێم کەوت، من لەناو سەبەتەیەك کە کون و کەلەبەری بە"جەوگ"[59]

---

[59] جەوگ: مادەیەك کە درەختی چواڵە و قەیسی و هەڵوژە چەند دارێکی تر دەریدەکات و لەکوردەواری خۆماندا زۆرجار لەباتی چەسپ بەکاریان هێناوە......وەرگێڕ.

گیرابوو، بەسەر ئاوی"نیل"ەوە بوم و ڕەوتی ئاو ئەو سەبەتەیەی هێنابووە ناو نەیجەلانەکانی کەنار ڕوباری نیل و لەنزیك ماڵی "کیپا"وە ڕایگرتبوو.

پەڕەسێلکەکان بەلاسەرمەوە دەفڕین، بەڵام هیچ دەنگێك لەمن بەرز نەدەبویەوە، بەوشێوەی کە دایکم لێکی دەدایەوە من مردوم، بەڵام کاتێك دەستی خستە ڕوخسارم پەیی بەوە برد کە زیندوم و منی هێنایەوە بۆماڵی خۆی و لەکەنار ئاگردانەکەدا دایانام بۆئەوەی گەرمم ببێتەوە و بەدەمی فوی دەکردە دەممەوەن بۆئەوەی دەست بەگریان بکەم.

دوای ئەوەش زڕباوکەکەم"سن موت"کە ڕۆشتبوو بۆئەوەی چارەسەری نەخۆشەکان بکات، بەدوو مراوی و کاسەیەك ئاردەوە کە لەبەرامبەر چارەسەر کردنەکانیدا پێیان دەدا گەڕایەوە بۆ ماڵ و گوێی لەدەنگی من بوو و وای زانی "کیپا" بەچکە پشیلەیەکی هێناوەتەوە بۆماڵ و ویستی بەسەریدا هاوار بکات. بەڵام دایکم پێی وت: ئەوە پشیلە نیە، بەڵکو منداڵە و تۆ دەبێت خۆشحاڵ بیت، چونکە خوداکان منداڵێکیان بەئێمە بەخشیوە.

باوکیش ڕەنگی گۆڕا و زڕدایکەکەمی بەناوی"تاقلە بوو"بانگ کرد، بەڵام ئەو منی پیشانی هاوسەرەکەیدا و کاتێك"سن موت"چاوی بە بەچاو و لوت و دەم و دەستە بچوکەکانم کەوت، سۆزی بەسەرمدا توایەوە، هەر لەوکاتەدا ئامادە بوو من بەکوڕی خۆی بانگ بکات.

دوای ئەوە ئەو ژن و پیاوە، بەدراوسێکانیان وت کە"کیپا"منی بووە و من نازانم ئایا دراوسێکانیان باوەڕیان بەو قسەیە کرد یان نە؟

زڕدایکەکەم کە من ئەوم بەدایکی ڕاستەقینەی خۆم دەزانی، منی خستە ناو بێشکەوە و ئەو سەبەتەی کە بەسەر ئاوی ڕوباری"نیل"بەلەمی من بوو، بەلاسەری بێشکەکەوە هەڵیواسی، زڕباوکەکەشم کە من ئەوم بەباوکی ڕاستەقینەی خۆم دەزانی، باشترین کاسەی مسینی ئەو ماڵەی برد بۆ پەرستگا، بۆئەوەی وەك دیاریەك پێشکەشی کاهینەکانی بکات و ئەوانیش من بەناونیشانی کوڕی"سن موت"و "کیپا"لەڕیزی زندووەکاندا تۆمار بکەن و کاهینەکانیش هەمان کاریان ئەنجام دا.

دوای ئەوەی ناوم لەژمارەی زیندووەکاندا تۆمار کرا، باوکم کە خۆی پزیشك بوو، خەتەنەی کردم، چونکە لەچەقۆی پیسی کاهینەکان زۆر دەترسا و ترسی ئەوەی هەبوو چەقۆی کاهینەکان، برین و نەخۆشیم بۆ دروست بکەن.

من لەوباوەڕەدام کە ئەو لەهەمان کاتدا بۆئەوەی پارەیەکی کەمتر خەرج بکات، خۆی ئەمکارەی ئەنجام دا، چونکە پزیشکی هەژاران بوو و دەرامەتێکی ئەوتۆی نەبوو، نەیدەتوانی بۆ خەتەنە کردنیشم دیاریەکی تر پێشکەشی کاهینەکان بکات.

دیارە من لەوکاتەدا نەمدەتوانی چاوم بەم ڕوداوانە بکەوێت یان بیانبیستم، بەڵام کاتێك کەمێك گەورە بووم، ئەو ژن و پیاوەی دڵنیابووم دایك و باوکی منە، باسی ئەم بەسەرهاتانەیان بۆکردم، بەڵام لەوباوەڕەدا نیم کە درۆیان لەگەڵدا کردبێتم، چونکە زۆر لەدرۆکردن دەترسان.

دوای ئەوەی پێم نایە سەردەمی لاویەتیەوە و قژی سەردەمی منداڵیمیان کورت کردەوە، ڕاستیەکانیان پێ وتم و پێیان ڕاگەیاندم کە من کوڕی ڕاستەقینە ئەوان نیم، بەڵام منیان وەك کوڕی خۆیان پەسەند کردبوو.

ئەوان لەبەرئەوەی لەخودایان دەترسان، نەیاندەویست من لەبارودۆخی ڕاستەقینەی خۆم بێئاگابم و بێدەنگی وەك درۆکردن لەگەڵ خودایان لەقەڵەم دەدا.

من هەرگیز نەمزانی لەکوێوە هاتوم و دایك و باوکی ڕاستەقینەی من کێن، بەڵام دوای ئەوەی پێم نایە قۆناخی ژیریەوە و لەڕوی هەندێك لەو بەڵگە و هێمایانەی لەکاتی ئەم سەرگوزەشتەیەدا بۆیان گێڕامەوە، لێکم دایەوە کە دایك و باوکی من کێن، بەڵام ئەم لێکدانەوەیەم تاچ ڕادەیەکیش بەهێز بێت، بەڵام وەك گریمانە و ئەگەرێك لەقەڵەم دەدرێت.

ئەوەی بەلای منەوە ڕاستیە ئەوەیە کە من تاکە منداڵێك نەبوم کە لەناو سەبەتەیەکدا کە کون و کەلەبەریان بە"جەوگ"گرتبێت و لەبەشی سەرەوەی ڕوباری نیلەوە بەرەو بەشی خوارەوەی ڕوباری نیل بیدەن بەدەم ئاوەوە.

لەوکاتەدا شاری"تبس" خاوەنی چەند پەرستگاو کۆشکێکی مەزن بوو، چواردەوری ئەم کۆشك و پەرستگایانەدا ماڵی هەژاران بەدی دەکراو لەسەردەمی فەرمانڕەوایی فیرعەونەکاندا چەند وڵاتێك لەگەڵ میسردا ڕێککەوت و دوای ئەوە میسر بوبە یەکێك لە وڵاتە دەوڵەمەندەکانی جیهان.

لەبەرئەوەی هەندێك وڵات لەگەڵ میسردا یەكی گرت، برێكی زۆر لەدانیشتوانی ئەو وڵاتانەی كە لەگەڵ میسردا یەكیان گرتبوو هاتن و لەوێ كۆشك یان ماڵێكیان بۆخۆیان دروست كرد و پەرستگایەكیشیان بۆ پەرستنی خوداكانی خۆیان بنیاتنا، دەستەیەك لەدانیشتوانی وڵاتی بیانیش كە هەژاربون، لە"كەیەڵ[60]"ێكی بچوكدا دەژیان.

بیانیەكان دوای ئەوەی لە"تبس"دا نیشتەجێ بون، نەریت و بیروباوەڕی خۆیان لەو ناوچەیەدا بڵاوكردەوە، گەرچی بیروباوەڕەكانیان كاری لەتەواوی خەڵكی میسر نەكرد، بەڵام كاری لەهەندێكیان كرد و یەكێك لەو نەریتانە ئەوەبوو، كە خێزانە هەژارەكان نەیاندەتوانی ئەركی بەخێوكردنی منداڵەكانیان لەئەستۆ بگرن، بۆیە دەیانخستنە ناو سەبەتەیەكەوە و دەیانداون بەدەم ئاوی ڕوباری"نیل"ەوە و هەندێك لەژنە دەوڵەمەندەكانیش كە هاوسەرەكانیان لەكۆچ و گەشتدابوون، بەرهەمی ئیشقبازی و ڕابواردنە نایاساییەكانیان دەدا بەدەم ئاوی ڕوباری"نیل"ەوە.

لەوانەیە منداڵی ژنی یەكێك لەدەریاوانەكان بوبێت كە لەكاتێكدا ئەوان لەماڵدا نەبون، لەگەڵ سەوداگەرێكی سریانیدا ڕایبواردبێت و بەهۆی ئەو پەیوەندیەوە من لەدایك بوبێتم، بۆیە دوای لەدایك بونم بێئەوەی خەتەنەم بكەن منیان دا بەدەم ئاوی ڕوباری نیلەوە، چونكە ئەگەر باوكم میسری بوایە، ڕازی نەدەبوو بەوەی خەتەنە نەكرێم.

دوای ئەوەی پێم نایە یەكەم قۆناخی لاویەتیمەوەو قژی منداڵیمیان بڕی، "كیپا" قژی بڕاوو یەكەمین پێڵاوی منداڵیمی خستە ناو جانتایەكەوە، ئەو سەبەتەیەش كە لەڕوباری"نیل"دا بەلەمی من بوو، بەلاسەری ئاگردانی ماڵەكەمانەوە هەڵیواسیبوو، بۆیە ئەو سەبەتە بەهۆی دوكەڵی ئەو ئاگردانەوە ڕەنگی زەرد بوبوو هەندێك لەڕیشاڵەكانی بچڕابون، بەڵام من هەرجارێك ئەوەم بەبیرخۆم دەهێنایەوە كە بەو سەبەتەیەوە بەسەر ڕوباری"نیل"دا تێپەڕیوم، تەماشام دەكردو دەمبینی ئەو

---

[60] كەیەڵ: وشەیەكی پاراوی كوردیە كە بەواتای خانویەكی بچوك دێت كە زیاتر لەناو باخدا ئەم جۆرە خانوانە دروست دەكەن......وەرگێر.

ڕیشاڵانەی کە"جگن"[61]ەکانی بەیەکەوە بەستبویەوە، چەند گرێیەکی پێوەبوو کە بەگرێی پەڕەسێلکەکان بانگیان دەکرد.

من لەدایك و باوکی ڕاستەقینەو نادیاری خۆم جگە لەو سەبەتەیە، هیچ یادگاریەکی ترم نەبوو، بە تەماشاکردنی ئەو سەبەتەیە کە بەدایكو باوکمەوە پەیوەست بوو، یەکەمین برینی لەدڵی مندا دروست کرد.

هەروەك چۆن باڵندەکان دوای ماوەیەك کۆچکردنیان دەگەڕێنەوە بۆ هێلانە کۆنەکەیان، مرۆڤیش کاتێك پیر دەبێت، حەز دەکات سەردەمانی منداڵی خۆی بەبیر بهێنێتەوە.

من کاتێك دەگەڕێمەوە بۆ بیرەوەریەکانی خۆم، دەبینم کە سەردەمی منداڵیم هەڵگری درەوشانەوەیەکی زۆر بووە و وەك ئەوەی لەو سەردەمەدا هەموو شتێك لەڕۆژانی ئێستام درەوشانەوەیەکی زیاتریان پێوە دیار بووە.

هەر لەبەرئەوەش دەوڵەمەندو هەژار لەبەرامبەر یەکتردا یەکسانن و مرۆڤ هەرچەنێك هەژار بێت، بەدوبارە گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی خۆی دەتوانێت لەو سەردەمەدا شتگەلێکی شادی بەخش ئاشکرا بکات.

باوکم"سن موت" لەگەڕەکی هەژاران نزیك دیواری پەرستگا و لەقەرەباڵغترین ناوچەی "تبس"دا نیشتەجێ بووە.

لەنزیك ماڵەکەی ئەوەوە لەنگەرگای شاری"تبس"بوو کەتایبەت بوو بەو کەشتیانەی کە لەبەشی سەرەوەی ڕوبار"نیل"ەوە دەهاتن، و ئەو کەشتیە بازرگانیانەی کە لەبەشی سەرەی ڕوباری "نیل"ەوە دەهاتن بۆ پایتەخت، بەواتا"تبس" و لەوێ بارەکانی خۆیان خاڵی دەکرد.

دەریاوانانی ئەم کەشتیانە دوای ئەوەی بارەکانی خۆیانیان خاڵی دەکردەوە، خۆیان دەکرد بەکۆڵانی تەنگی هەژارەکاندا و لەمەیخانەی ئەو ناوچەیە ئاوجۆ یان شەرابێکیان دەخواردەوە و نانیان دەخوارد و لەهەمان ئەو ناوچەیەدا چەند سۆزانیخانەیەکی تێدابوو کەتایبەت بوو بەوەی پیاوان تێیدا ڕابوێرن و هەندێکاتیش

---

[61] جۆرێك گیایە کە زیاتر لەناو لیتە و قوڕاوی کەنار ڕوبارەکاندا دەڕوێن.....وەرگێڕ...سەرچاوە"فەرهەنگی عەمید".

نەوڵەمەنـدەکانی شـاریش بەسـەر کەژاوەکانیانـەوە خۆیـان دەکـرد بـەم جـۆرە سۆزانیخانانەدا بۆئەوەی تێیدا ڕابوێرن.

دراوسێکانیـشمان بـریتی بـون لـە کاربەدەسـتانی کۆکردنـەوەی بـاج و سـەرانە و ئەفسەرانی بەش و ئەو خاوەن کەشتیانەی لەسەر ڕوباری"نیل"کاریان دەکرد و چەند کاهینێکی پلە پێنجیش لەوێدا نیشتەجێ بوبون.

هەروەك چۆن، دوای هەڵچونی ڕوباری"نیل"ئەو دیوارانەی کە لەئاوەکە بەرزتربون سەرنجی خەڵکیان ڕادەکێشا، ئەم کۆمەڵە کەسە و باوکی منیش بەهەمان شێوەی ئەو دیوارە بەرزە سەرنج ڕاکێش بون و بەکەسە دیارەکانی ئەم ناوچەیە لەقەڵەم دەدران.

مـاڵی ئێمـە لەچـاو ماڵـەکانی چـواردەورمان و بەتایبـەت"کەیـەڵ"ە گڵێنـەکان کـە لەکەنار کۆڵانەکانی ئـەم ناوچەیەدا بـەدی دەکـران، ماڵێکی پـان و فـراوان بـوو و ئێمە بگرە لەماڵەکەماندا باخچەیەك و ڕیزێك درەختـی"ئەقاقیا" مـاڵی ئێمـەی لەدراوسێکان جیادەکردەوە.

لەناوەڕاسـتی ماڵەکـەی ئێمـەدا هەسـێرێکی گـەورە و بـەردینمان هـەبوو، بـەڵام ئـەم هەسێرە تـەنها لـەوەرزی پـاییز بەولاوە، بەهۆی هەڵـچونی ڕوبـاری"نـیل"ەوە پڕ دەبوو لەئاو.

مـاڵی ئێمـە لەچـوار ژور پێـك هـاتبوو کـە لەیـەکێك لـەو ژورانـە دایکـم چێـشتی تێدا لێدەنا و ئێمـەش نـانی خۆمـان لەهەیوانـدا دەخـوارد چـونکە لـەوێوە هـەم دەمـانتوانی خۆمان بکەین بەچێشتخانەکەدا و هەم خۆمان بکەین بەژوری پزیشکیەی باوکمدا.

هەفتەی دووجار ژنێك دەهات بۆماڵمان و لەپاککردنەوەی دەرودیـواری ماڵەکەمانـدا یارمـەتی دایکمـی دەدا، چـونکە"کیپـا"زۆر حـەزی لـەپاك و خـاوێنی بـوو و هەفتـەی جارێکیش ژنێکی جل شۆر دەهـات بۆماڵمـان و جلـە پیسەکانی ئێمـەی دەبـردە کـەنار ڕوباری"نیل"و بۆی دەشۆردین.

لەو ناوچە هەژار نیشین و قەرەباڵغ و پڕهەراوهوریا و بۆگەنەدا، کە من تـەنها دوای تێپـەڕبونی سـەردەمی منـداڵیم و گەشـتنم بەتەمـەنی لاویـەتی، پـەیم بەگەنـدەڵی ئـەو ناوچەیە برد و زانیم کە هۆکـاری ئـەو گەندەڵیـە کۆمـەڵێکی زۆری بێگانـەکان بوون کـە لـەو ناوچـەیە و تـەواوی ناوچـەکانی تـری"تـبس"دا نیـشتەجێ بـون، بـاوکم و دراوسێکانمان، بەدیمەنی نەریت و دروشمی شایستەی ڕێزی میسر لەقەڵەم دەدران.

سەرەڕای ئەوەی لەشاری"تبس"دا پەیوەست بونی خەڵکی- بگرە وەجاخزادە و دەوڵەمەندەکانیش- بە نەریتی کۆنی میسرەوە سست بوبو و دراوسێکانی ئێمەش وەك میسریە کۆنەکان باوەڕیان بەخوداکان هەبوو و زۆریش باوەڕیان بەپاکی ڕۆح بوو، لەژیانیشدا خۆیان لەگەڵ کەمدەستیدا دەگونجاند و خۆیان لەڕوکەشپەرستی دورەپەرێز دەکرد، بۆئەوەی ناچارنەبن لەڕێی ڕاست لابدەن.

وەك بڵێی ئەم کۆمەڵە کەسەی لەو ناوچەیەدا دەژیان و لەهەمان ئەو شوێنەشدا بەردەوامیان بەکارەکانی خۆیان دەدا، دەیانویست بەخۆپارێزی و پەیوەست بون بەدروشمە کۆنەکانەوە خەڵکی لەوە تێگەیەنن کە ئەمان لەوان نین و نایانەوێت وەك ئەوانیش بن.

بەڵام نازانم بۆچی ئەم بابەتانە کە لەسەردەمی منداڵیمدا لێیان تێنەدەگەشتم، بەڵام دوای ئەوەی گەورە بوم پەیم پێبردن، و سەردەمی ژیانی گەنجیەتیم بوو بۆ ئێوەی باس دەکەم.

ئایا باشترنیە بڵێم لەماڵەکەماندا ئەو درختەی سێبەری بۆماڵەکەمان دروست کردبوو قەدێکی ئەستوری هەبوو و من لەسەردەمی منداڵیمدا لەبەر گەرمی خۆر پەنام بۆ ژێر ئەو درەختە دەبرد و پاڵم پێوە دەدا؟

ئایا باشتر نیە ئەوە بەبیرخۆم بهێنمەوە کە لەسەردەمی منداڵیمدا باشترین یاری منداڵیم بریتی بوو لەتیمساحێکی دارین کە دەمێکی سوری هەبوو، بەپەتێکەوە بەسەر بەرد پۆشی کۆڵانەکادا بەدوای خۆمدا ڕامدەکێشاو جارجارێکیش دەمی دەکردەوە، قورگیشی سور بوو.

کاتێك من بە تمساحەکەی خۆم لەکۆڵاندا یاریم دەکرد، منداڵی دراوسێکانمان بەسەرسوڕمان و ستایشەوە تەماشایان دەکرد، بۆیە نانی هەنگوینی و بەردی ڕەنگاوڕەنگ و پەتی مسینیان بۆ دەهێنام، تەنها بۆئەوەی ڕێیان پێبدەم کەمێك بەتیمساحەکەی من یاری بکەن.

چونکە تەنها منداڵە وەجاخزادە و دەوڵەمەندەکان یاریەکی وایان هەبوو، منداڵی کەسە هەژارەکان نەیاندەتوانی ئەم جۆرە یاریانە بدەست بهێنن و باوکی منیش توانای کڕینی ئەم جۆرە یاریانەی نەبوو، بەڵکو دارتاشی فەرمانڕەوایی ئەو تیمساحەی بۆ باوکم دروستکرد و وەك دیاریەکی پێی بەخشی، چونکە باوکم پزیشك

بوو و چارەسەری دومەڵێکی ئازاربەخشی ئەو دارتاشەی کرد کە نەیدەهێڵا لەسەر زەوی دانیشێت.

دایکیشم هەموو بەرەبەیانێك دەستی دەگرتم و لەگەڵ خۆیدا دەیبردم بۆ بازاڕ.

"کیپا"زۆر شتی لەبازاڕدا نەدەکڕی، بەڵام حەزی دەکرد بۆماوەی یەك"ترازوو" بۆ کڕینی دەسکێك پیاز چەنە بدات و بۆماوەی یەك هەفتە هەموو ڕۆژێك بڕوات بۆ بازاڕ، تەنها بۆئەوەی جوتێك پێڵاو بکڕێت.

دایکم بەشێوەیەك لەگەڵ فرۆشیارەکاندا گفتوگۆی دەکرد کە وەك بڵێی ئەو ژنێکی دەوڵەمەندە و گومانی ئەو لەکڕینی هەر کاڵایەك لە کەمدەستیەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو دەیەوێت کاڵایەکی باش بکڕێت.

من ئەوەم بەچاوی خۆم بینی کە دایکم حەزی لەهەندێك شت بوو، بەڵام نەیدەکڕین و بەو شێوەیە منی تێدەگەیاند کە مەبەستی ئەوەیە من کەسێکم لێ دەربچێت کە دەست بەپارەوە بگرم و ئەوەی پێویست نەبێت نەیکڕم و دەیوت: دەوڵەمەند ئەو کەسە نیە کە زێڕ و زیوێکی زۆری هەبێت، بەڵکو کەسێك دەوڵەمەندە کە بەکەم ڕازی بێت.

کاتێك ئەم قسانەی بۆ دەکردم، ئاگاداری چاوەکانی دایکم بوم کە خوازیاری پارچە قوماشی ڕەنگاوڕەنگ و ناسکی "سیدون"و"بیبلوس"ە کە لەسوریادا دەیانچنی و وەك پەڕی مراوی کێشی سوك بوو و بەدەستەکانی کە بەهۆیماڵداریەوە زبر و ئەستور بوبو نەوازشی پەڕی نەعامە و خشڵ و جوانکاریە عاجەکانی دەکرد.

کاتێك بەنێو بازرگان و فرۆشیارەکاندا تێدەپەڕین، دایکم دەیوت تەواوی ئەوانەی ئێمە لەبازاڕدا بینیمان، شتگەلێکی زیادەڕۆیە و بەکەڵکی ژیان نایەت، تەنها کەمێك لەخۆبایی بوونی خۆیستەکان هێور دەکاتەوە.

بەڵام من کە لەوکاتەدا منداڵ بوم، لەدڵەوە لەگوتەکانی دایکم تێنەدەگەشتم و زۆریش حەزم دەکرد کە دایکم مەیمونێکم بۆ بکڕێت، بۆئەوەی لەباوەشی بگرم و ئەو گیانەوەرەش باوەش بەملمدا بکات، زۆریش حەزم دەکرد یەکێك لەو باڵندە ڕەنگ جوانانەی کە لەبازاڕدا چاوم پێی کەوت هەبوایە، بۆئەوەی بەزمانی سریانی یان میسر قسەم بۆ بکات.

من نەمدەتوانی باوەڕ بەوە بهێنم کە گەردنبەنی جوان و پێڵاوگەلێك کە پولەکی زێڕینی پێوە چەسپێنراوە بەشێك بێت لەزیادەڕۆییەکان.

دوای ئەوەی گەورە بوم، تێگەشتم کە دایکیشم خوازیاری ئەو شتانەیە و ئارەزوی ئەوەی دەکرد کە کەسێکی دەوڵەمەند بوایە و بیتوانیایە ئەو شتانەی حەزی لێیەتی بیانکرێت، بەڵام لەبەرئەوەی هاوسەرەکەی پزیشکێکی کەمدەست بوو، دایکیشم ناچاربوو بەبەشی خۆی ڕازی بێتو ئارەزووەکانی خۆی کە دەیزانی هیچ کاتێك ناچێتە بواری کردارەوە، بۆیە هەمیشە لەڕێی ئەندێشە یان لەڕێی گێڕانەوەی ئەفسانەکانەوە کپی دەکردنەوە.

شەو، پێش خەوتن، دایکم بەدەنگێکی لەسەرخۆ ئەو ئەفسانانەی کە دەیزانین بۆی دەگێڕامەوە.

یەکێك لەئەفسانەکانی ئەو داستانی "سینۆهە"بوو و لەئەفسانەیەکی تردا باسی پیاوێکی دەکرد کە نوقمی دەریا بووە و کەوتووەتە دورگەیەکەوە کە لەو دورگەیەدا پادشای مارەکان فەرمانڕەوایی ئەو شوێنەی دەکرد و لەو دورگەیەوە گەنجینەیەکی زۆری لەگەڵ خۆیدا هێنا.

لەو ئەفسانانەی کەبۆی دەگێڕامەوە، دایکم باسی خوداکان و"ست"و دێو و جادوگەر و مارگیرو فیرعەونە کۆنەکانی بۆ دەکردم.

هەندێك کات باوکیشم گوێ لەم ئەفسانانە دەگرت و بەسەر دایکمدا دەیقیڕاند و دەیوت ڕۆحی ئەم منداڵە بەم شتە پڕوپوچانە پەرێشان مەکە، دایکیشم لەوکاتەدا بێدەنگ دەبوو، بەڵام هەرئەوکاتەی ئاگاداری ئەوە دەبوو کە باوکم خەوی لێکەوتووە، چیرۆکەکەی لەو شوێنەوە دەست پێدەکرد کە ڕاوەستابوو و منیش هەستم بەوە دەکرد کە دایکم تەنها بۆ سەرگەرم کردنم ئەم چیرۆکانەی بۆ نەدەگێڕامەوە، بەڵکو خودی خۆشی چێژی لەگێڕانەوەی ئەم داستانانە وەردەگرت.

لەشەوانی گەرمی هاوین کە بەڕەی ژێرمان وەك ئاگری لێهاتبوو و بەو هۆیەوە بەڕوتی دەخەوتین و گەرمی هەوا نەیدەهێڵا خەومان لێ بکەوێت، دەنگی لەسەرخۆی دایکم بەشێوەیەك خەوی لێدەخستم کە تا بەیانی چاوم نەدەکردەوە، لەمرۆشدا کاتێك ئەو دەنگە کە کەمێك گڕبوو بەبیرخۆم دەهێنمەوە هەست بەئارامی و دڵنیایی دەکەم.

لەوباوەڕەدام کە دایکی ڕاستەقینەم بەئەندازەی "کیپا" خۆشەویستی لەبەرامبەرمدا نەدەنواند و ئەو ژنە ئەندێشە پەرستە کە گوێی لەئەفسانەی چیرۆکبێژە کوێر و شەلەکان دەگرت و ئەوانیش دڵنیابون لەوەی هەرکاتێك چیرۆکێکی بۆبگێڕنەوە لەخواردنە خۆشەکانی بێبەشیان ناکات، زیاد لەدایکێکی ڕاستەقینەی خۆشی دەویستم.

ئەو ئەفسانانەی کە دایکم بۆی دەگێڕامەوە دەبووە مایەی خۆشحاڵیم و منیش وەك دایکم لەژیانی ئێمەی منداڵاندا کەلەکۆڵانە پیسەکاندا بەردەوام بۆنی پیس و بۆگەنیان لێدەهات وبنکەی هەموو جۆرە مێش ومەگەزێکی پیس بوو، لەکاتی یاریکردنەکانماندا پەنامان بۆ ئەو جۆرە ئەفسانانە دەبردو دەمانکردنە سیناریۆی یاریەکانمان. بەڵام هەندێجاریش کاتێك ئێمەی منداڵ لەکۆڵانەکاندا سەرقاڵی یاریکردن بوین بۆنی داری "سدر" یان "جەوگ" مان دەکرد کەلە گەرگاکانەوە دەهات، یان کاتێك یەکێك لەژنە وەجاخزادەکان بەسەر کەژاوەیەکەوە لەو کۆڵانەوە تێپەڕیایە و سەری لەکەژاوەکەی بهێنایەتە دەر و تەماشای ئێمەی بکردایە، لەوکاتەدا بۆنی عەتری ئەویشمان دەکرد.

لەکاتی خۆرئاوابوندا، کاتێك کەشتی زێڕینی "ئامون" -بەواتا خۆر- بەرەو تەپۆڵکەکانی خۆرئاوا دەڕۆشت و لەپشت ئاسۆوە ون دەبوو، لەتەواوی ماڵی ناوچە هەژار نشینەکانەوە دوکەڵ بەرز دەبویەوە و بۆنی ماسی برژاوو نانی تازە دەهات، منیش لەسەردەمی منداڵیمدا بەشێوەیەك خووم بەوجۆرە بۆنانەوە گرتبوو کە لەهەموو تەمەنمدا، لەهەر شوێنێك بومایە، حەزم لەم جۆرە بۆنانە دەکردو ئەمڕۆش کە پیربوم و دەزانم کە مەرگم نیزك بووەتەوە، تامەزرۆی ئەو جۆرە بۆنانە دەکەم و ئاهێکی خەمگینیان بۆ هەڵدەکێشم.

ئێستا ساڵی ١٣٦٤ سەدەی چواردەیەمی پیرۆزی ئیسلامە و لەوباوەڕەدا نیم کە تا کۆتایی ئەم سەدەیە، لەبازاڕی وێژە"ئەدەب"ی جیهاندا کتێبێك بڵاو بکرێتەوە کە لەڕوی مێژووی دێرینی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لێکدانەوەی کۆمەڵایەتی و دەرونناسی ئەو مێژووەوە، بتوانێت لەبەرامبەر ئەم کتێبەدا کە "١٣٥٠ ساڵ پێش لە دایکبوونی مەسیح" نوسراوەتەوە بوەستێت.

ئێمە ئەم مێژووە لەسەرەتای دەستەڵاتی زنجیرەی نۆزدەیەمی فیرعۆنەکانی میسرەوە دەرمانهێناوە و بەشێوەیەك کە"سینۆهە"نوسەری ئەم کتێبە باسی دەکات شەش ساڵ دوای دەستپێکردنی دەستەڵاتی ئەو پیاوە لەمیسردا دور دەخرێتەوە و دەست بەنوسینی ئەم کتێبە دەکات و بۆئەوەی ئێمە دوچاری هیچ هەڵەیەك نەبین مێژووی نوسینی ئەم کتێبە لەساڵی١٣٥٠ی پێش زاین، کە بەساڵی فەرمارەوایی و دەستەڵاتی زنجیرەی نۆزدەیەمی فیرعەونەکانی لەقەڵەم دەدەین و ئاشکرایە بۆ بەدەست هێنانی مێژووی ڕاستەقینەی سەرەتای نوسینی ئەم کتێبە دەبێت ماوەی شەش ساڵ لە مێژووی هاتنە سەر تەختی ئەو پیاوە کەم بکەینەوە.

خوێنەرانی ئەم کتێبە ئیتر چ لاو بن یان بەتەمەن، سود لەخوێندنەوەی ئەم مێژووە دێرینە وەردەگرن کە لەهەمان کاتدا هەوێنێکە لەهەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی کۆمەڵایەتی و دەرونی.

بەڵام ئەگەر لاون من ئەوەتان پێ ڕادەسپێرم دوای خوێندنەوەی، ئەو کتێبە لەدەست نەدەن و لەلای خۆتان هەڵی بگرن و بیپارێزن، بۆئەوەی کاتێك تەمەنتان گەشتە شەست ساڵی یان زیاتر، سەرلەنوێ ئەم کتێبە بخوێننەوە و لەوکاتەدا هونەری"سینوهە"نوسەری ئەم کتێبەتان جوانتر بۆ دەردەکەوێت و زیاتر پەی بەلێکدانەوەی کۆمەڵایەتی و دەرونی ئەم کتێبە دەبەن.



لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما


نرخ (6500) دینار